# ژیانەوەی زانستەکانی ئاین



## إحياء علوم الدِّين

بەرگی دووهەم

پەڕاوەکانی بنەماکانی باوەڕو نهێنیەکانی ڕاگرتنی پاک و خاوێنی و نوێژو نهێنی و گرنگییەکانی

دانراوی

## ئیمامی غەزالی

﴿خوا لێی ڕازی بێ﴾

وەرگێڕانی

## شێخ موحسینی موفتی

# ژیانەوەی زانستەکانی ئاین

# (إحياءُ علومِ الدِّين)

دانراوی

## ئیمامی غەزالی

خوای لێ ڕازی بێت

بەرگی دووهەم

وەرگێڕانی

## شێخ موحسین ی موفتی

کوردوستان - هەولێر

مزگەوت و مەدرەسەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی
لە بڵاوکراوەکانی پەیڕەوانی طەریقەت
ئەهلی سوننەت و جەماعەت
(٣٢)

ناوی کتێب: ژیانەوەی زانستە ئاینییەکان
دانەر: **ئیمامی غەزالی**
وەرگێران و تایپ کردن :
**شێخ موحسین ی شێخ خالدی موفتی**
بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگی: دووهەم
دیزاین: أحمد فاتح
چاپی یەکەم
شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلاّت– هەولێر
تیراژ: ١٥٠٠



**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٨٦) ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ

لَأَسْقَيْنَاهُمْ مَاءً غَدَقًا * لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ

وَمَنْ يُعْرِضْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِ

يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا

# پێشکەشە بە:

- گیانی پاکی حەزرەتی فەخری عالەم محمد المصطفی ﷺ
- ئال وئەصحابی کیرام(رضوان الله تعالی علیهم أجمعین)
- ڕۆحی پڕ شکۆی حەزرەتی ئیمامی غەزالی (قدَّسَ اللهُ سِرَّهُ العزیز).
- گیانی شیرینی مورشید و ڕابەری طەریقەتم:

  حەزرەتی شیخ محمد عوسمان سیراجەددین. (قَدَّسَ اللهُ سِرَّهُ )
- باوکی دڵسۆزم (أعلی الله مقامه) و دایکی بەسۆزم و،خانەوادەکەم
- هەمو ڕێبوارانی ڕێگای طەریقەت و خوداناسی.
- هاوڕازانی ڕێگا پیرۆزەکەی حەزرەتی غەزالی(خوا لێیان ڕازی بێت)
- وە بەهەمووە ئەو ڕۆشنبیرە خوێن گەرمانەی کە دەیانەوێت لە پەیرەوی ڕاستەقینەی ئەهلی تەصەووف شارەزاو ئاگادار ببن و خۆیانی لێ بەهرەمەند بکەن.

# ژیانەوەی زانستەکانی ئاین
# پێشەوا ئیمامی غەزالی

غەزالی بوو بە چاو بینی، هەموو دەردی کوشندەی دڵ
کەپێشکەشمان بکا ئەمڕۆ (پەڕاوی خۆی)ی وەك بەرکوڵ
ئەوە سـوارچاکی مەیدانە، لە نێو سـارایی سینەمدا
بە ئەسپی خۆی کە تاویدا، بفەرمـوێ بێتە نێـو مەنزڵ
دڵ و گیانم ئەمن ئەمڕۆ هەمـووی نەزری دڵ و گیـانی
بەهۆی (ئیحیا) ژیاندی ئەو، صەدان باخات و چەپکی گوڵ
لەپاش ئـەو بـەرگی زانسـتە، بناغـەی (بیـر و بـڕوا)یە
کە نـۆبەی دێ بەیـانیکا، بە نەغمەی بوڵبـوڵی سـەرچـڵ
سەرێ بۆ خزمەتی تـۆبێ، دەشـێ وەك سەر لە نێو کۆ بێ
ئەنا وەك جوو، دەبێ ڕوی ڕەش، بێ هەروەك بێ مـەنجـەڵ
سـەرو ماڵم فیداکـارە لە بۆ (ئیحـای علـومی دیـن)
دەبێ (ئەحسەن) لەسـەر عەهدت بمێنی قـەت نـەبی دوودڵ
دەبێ ڕێبازی سەروەرمان لەنێـو دڵـدا وەکـو گـوڵ بێ
بـژی و بژێتـەوە دیسـان هـەتا مـن دەچمە نێـوی گـڵ
سـڵاوی خوا لە ئوستـاد و لـە شاگـردی غـەزالـی بـێ
غـوڵامـی بـەردەری تـۆبێ، سـوپا سـالاری وەك چێرچـڵ

مەولانا ١٤٣٧/٤/٥ / ٢٠١٦/١/١٥

# غەزالی خاوەنی فەزڵی

لە دوای پڕ بــوونی ئیمان و کــەمــاڵی پورتــەوی ئــەقــڵی
لە دوای ڕۆچوونی ناو دەریا، بەهــێزو بەڵــگــەیی نەقــڵی
گومـــان لاچـــوو لـە ناو دڵیا، سەراپـا نـــووری یــەزدانە
بە هــۆی زانست و دانایی، گەڕاوە مــەنبەعی ئــەصـــڵی
وەکو پسپۆڕ و دانامە، کە قـــووڵ داچـــوبێ لـــەو باســە
وەها بەڵگەی بەدەستۆ بێ، بە عەزم و صیحەتی قـــەولی
کەلاکـــــی نەفســـی نـاپاکی، بەسەر سەحرایی سینەیدا
کە ڕای کێشـــابێ ئەو مـــارە، فرێی دا کـــارژو کـــــەوڵی
لە بـــۆتەی (طـــوری) سینـــادا گــڕی بەردایە ناو سینـە
دەروونـــی بـــۆکرۆزی دێ، بســـوتێ زۆنگـــــەوو زبـــڵی
دەیان ساڵ بوو لە ناو سۆنگەی، جیهادی ئەکبەری نەفسی
بە زەبری هیمــــــەتی بەرزی، بە کـامی کۆشش و هـەوڵی
چرای ئیمان لە ناو دڵیا، بووە نـــــووری تەجـەللای حەق
لە بۆ بوژانەوەی (ئیحیا)، بە بەڵگـــەی نەقڵـــیی وعـــەقڵی
کە خاوێنی دڵ و جەستە، لەگـەڵ ئەزموونی چەند ساڵە
لە بۆ ئەســـــراری میعـــراجی، ئەڤینی سونبولی وەصـڵی
بناغەی بیـــر و بـــــاوەڕمـــان، لە بـــۆ دانێ بـــە بـــەرنامە
چـــــــرای زانســــــتی ئیمـــانەو، غـــەزالی خاوەنـــی فـەزڵی

له خەرمـــــانی خرۆشـــاوی، چرۆی بوژانـــەوەی ئیحیا
له چاوگـــــەی نـــووری ڕەببانی پڕی کا دوێڵچـــەوو سەتڵی

به ئاوی مەعـــــریفەت ئاواشتـــەبێ ئەو نـــووری ئیـمانه
که تام و تـــۆوی ئەم دینه، بنێـژێ، دەرکـــەوێ شـــەتڵی

قیـــاسی حاڵـــی ئـــەزمـــوونی زەمـــانی ئالی عوسمانی
له چـــــەرخی بەختیـــاریی کـــە،که ڕێگەو پێگەیی عەدڵی

وەکو ئەو ڕۆژە دەســـتی دا، به دەســـتی حەزرەتی فەوزی
که سێ صەد ئـــەولیا کـــردی، موبارەك بـادیی(وەزڵی).[1]

به وەصڵی نووری ئیرشادی جـەماڵی شـــەوکەتی طـــەلـعی
چرای شەوقی ضیاو نەجم و عەلاو عوسمانه چوار فەصڵی

ئەوەی مەیـــلی له ڕێبـــازی حەقیـــقەتـــدایه سەربەسته
دەبێ نەفســـــی تـــەوەللا کـا، که فـــەتوای داوه بۆ قەتڵی

ئەوەش مەیلی دڵی حیـــله و بەهـــانـــەی نەفس و شـــەیتانه
به تیری بەڵگـــــه بیپێکـــێت، ببێته جێـی ڕم و نـــەصـــڵی

دەبێ (ئەحســـەن) له پاڵ کێوی کەمـــاڵی نـووری ئیحیادا
بنـــازی بـــەم (چـــرای دیـــنه)، ئەنـــا بێچـــارەوو عەزڵی

٦-٥ -٢٠١٦، ٢-شەعبانی ، ١٣٤٧هەڵەبجە . مزگەوتی جامیعه

---

(١) سەچاوەی مەعریفەتی هەموو دۆستانی خودا هەر یەکێکە، کاتێکیش زانای ناودار مامۆستا مەلا عەبدوڵلای نیزلی (وەزلی) بەیعەتی کرد بە حەزرەتی ضیاءالدین سێصەد لە ئەولیاکان بۆ ڕۆژی دوایی پیرۆزباییان لە شێخ کرد.

# پێشەکی بەرگی دووەم

بسم الله الرحمن الرحيم

خوێنەری بەڕێز:

پشت بە خودای گەورە، ئەوا بەرگی دووهەمی وەرگێڕان و توێژینەوەو لەسەر نوسینی کتێبی پیرۆزی ئیحیای ئیمامی غەزالی (قدّسَ الله سرّه) (ژیانەوەی زانستەکانی ئاین)، دەخەینە بەر چاوو دیدی ئێوەی بەڕێز، بە ئومێدی ئەوەی پەڕاوی زانستی کە لەبەرگی یەکەمدا کەوتە بەردیدی بەڕێزتانەوە، تام و چێژێکی تایبەتی بە دڵ و دەرونتان گەیاندبێت و، خوای دلۆڤانیش هاوکار بێت بۆ تەواو کردنی ئەم پرۆژە پیرۆزەیە.

ئەم بەرگەش کە لە بەردەستی ئێوەی بەڕێزدایە سێ پەڕاوی ئیحیای غەزالی (ژیانەوە) دەگرێتە خۆ:

**یەکەمیان پەڕاوی (بنەمەکانی باوەڕ)ە**، کە هەموو ئەو باس و بابەتانە شیتەڵ دەکاتەوە، کە پەیوەندیان بە بنەماکانی بیرو باوەڕەوە هەبێت، بۆ دامەزراندنی عەقیدەی بڕوادار و، تێگەیشتن لە ڕاستییەکانی ئیمان و بڕوا و ، باسکردنی تاکوتەنهایی خودا و باسکردن و ڕونکردنەوەی صیفەتە پیرۆزەکانی، وە بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو بیروڕا نادروستانەی کە ئەهلی بیدعە هێناویانەتە ناوەوەو ڕیزی موسوڵمانانیان پێ تێك داوەو ، هەوڵیان داوە لە صیفاتی کەماڵی خودا کەمبکەنەوەو، هەندێك صیفەتی کەمی بۆ بڕیار بدەن، وەك جیسم و جەوهەر و شوێن و زەمان، کە پێویستی بە تێڕامان و لێکدانەوەی بابەتیانە هەیەو، پسپۆڕی ئەو مەیدانەیش (حەزرەتی) ئیمامی غەزالی یە، کە دەتوانێت بابەتەکان شیتەڵ بکاتەوەو گومانەکان بڕەوێنێتەوەو، ڕاستییەکان بخاتەوە بەرچاو، وە بەبەڵگەی ئەقلی و نەقلی ڕاستییەکان بسەلمێنێت.

## وه له پەڕاوی دووهەممدا

(پەڕاوی نهێنییەکانی ڕاگرتنی پاکوخاوێنی وئەرك و بابەخەکانی)دا، له چوارەکی بەندایەتی، له پەڕاوەکانی ژیانەوەی زانستەکانی ئاین ، که هەرچی باس و بابەتێك پەیوەندی به تەهارەت و پاك و خاوێنی هەبێت، ئەوه به تێرو تەسەلی چارەسەر ی کراوەو، گرنگترینی بابەتەکانی شیتەڵ کراوەتەوه.

که بەڕاستی زۆر پێویسته خوێنەری بەڕێز له سەرچاوەیەکی زانست و مەعریفییەوه بگاته ئەو دەرەنجامەی، که مەبەست له پاك و خاوێنی چییه؟ ئایا هەر ڕووه زاهیری و ڕواڵەتیەکەیەتی، یان پاك و خاوێنی دڵ و دەروون مەرجی سەرەکییه بۆ ڕێبوارانی ڕێگەی ئاخیرەت.

ئەوەی زیاتر که شارەزاو زانایانی (ئەهلوڵلا) گرنگی پێ دەدەن، لایەنه دەروونیەکەیە، که لەم چەرخەدا یەکجاری ئیهمال کراوەو ،خەریکه لەبیری خەڵکی دەچنەوه.

بۆیه به دڵنیاییەوه ئەم توێژینەوەی ئیمامی غەزالی ، هەموو بۆشاییەکان پڕ دەکاتەوەو، پرسیارەکان بێ وەڵامی پڕ له سەلماندن ناهێڵێتەوه.

## پەڕاوی سێیەم:

وه دوا پەڕاویش که لەم بەرگەدا دەخرێته بەرچاوی بەرێزتانەوه، له چوارەکی بەندایەتی، له پەڕاوەکانی ژیانەوەی زانستەکانی ئاین(إحياء علوم الدين). پەرتووکی نهێنی و ئەسرارەکانی نوێژو گرنگییەکانیەتی .

که بەڕاستی هەرکەسێك به ئامادەباشی تەواوەوه، خۆی بۆ ئەم زانسته پڕ له ئەسراری عیبادەته یەکلا نەکاتەوه، تام و چێژی بەندایەتی ڕاستەقینه ناکات و ، ناشتوانێت له فەرموودەکەی حەزرەتی پێغەمبەری خودا ﷺ حاڵی ببێت که فەرموویەتی:

عن أنس بن مالك قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:

((راحةُ نَفسي مع أَصحابي، وقُرة عَيني في الصَّلاة، وثمرة فؤادي ذكر الله، وغمِّي لأجلِ أُمَّتي، الَّذين يكونُون في آخِرِ الزَّمان، وشَوقي إلى مَولاي)) ثم قرأ {فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَوْلَاكُمْ نِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ (الأنفال/٤٠) }[1].

واته لەگەڵ هاوەڵەکانمدا ژیانم ئاسوودەیەو، دڵم ئارام و بە شەوقە، وە نووری چاوەکانیشم لە نوێژەکانمدا دەبینمەوە، چونکە هەمیشە میعراجی حزوری خودای بۆ بەدەست دەهێنێت، بەرهەمی تەقوای دڵیشم کە هەمیشە لە حاڵەتی ئامادە باشیدایە، لە وەدا ڕەنگ دەداتەوە، کە ئالوودەیە بە زیکری خوداوە، بۆ چرکەیەکیش لێی جودا نابێتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو پەیوەندییە ئیمانییەیدا لە حزوری پەروەردگاری، نەخۆی لە بیر دەچێت کە هەمیشە شانازی بەوەوە دەکات کە بەندەیەکی خودایە، وە نە ئوممەتەکەیشی بیر دەچێت، کە هەمیشە لە غەمیاندا دەژی و خەفەتیان لێ هەڵدەگرێت و بایەخیان پێ دەدات و هەرگیز لە بیریان ناکات، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە ئاخر زەماندا ژیان بەسەر دەبەن، لەگەڵ ئەم هەموو سەرقاڵی و دڵسۆزییەشدا بەردەوام شەوقی لیقای خودا و ، گەیشتن بە نوری تەجەللیاتی پەروەردگاری، لە هەموو ئامانج و مەرامەکانی لە پێشترەو، هەرگیز لێی بێ ئاگا نابێت.

ئەمەی باسمانکرد: ناوکرۆك و پوختەی حاڵەتی دۆستانی خودایە لە حزوری مەولاو گەورەیاندا، تەصەوفیش ڕاستە شەقامی گەیشتنە بەو ئاواتە مەزنانە، چونکە طەریقەت خزمەتگوزاری شەریعەتەو، پەڕاوی بوژانەوەی زانستەکانی ئاینیش،هەوڵێکە لە لایەن ئیمامی غەزالییەوە بۆ گەیشتنی موریدی ڕێگای ئاخیرەت بە چڵەپۆپەی ئیمان و، تام و چێژی بڕواو، چەشتنی محەببەتی خوداو پێغەمبەر ﷺ ، کە پشت بەخودا لەم خوێندنەوەدا پێی دەگەن.

---

(١) معجم ابن عساكر ج/١/١٤٦.

# كِتابُ:

# قَواعِدُ العَقائد

## پەڕاوی

# بنەماكانی باوەڕ

## ئەمەیش پەڕاوی دووەمە

## لە چواریەکی بەندایەتیەکان

## لەپەڕاوەکانی

## ژیانەوەی زانستەکانی ئاین

## إحياء علوم الدين

دانراوی

## ئیمامی غەزالی

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای مەزن و بەخشندەو دلۆڤان

# كتابُ قَواعِدُ العَقائِد

پەڕاوی

(بنەماكانی باوەڕ)

لەچوار بەش

پێك دێت:

# بەشی یەکەم

## پێناسەو ڕونکردنەوەی بڕوای ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە سەر دوو کەلیمەی شەهادەت کە یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام.

**پشت بەخوداوەندی بالا و سەرچاوەی ڕێنومایيەکان دەڵێین:**

هەرچی ستایش و سوپاسە، تایبەتە بەو خودایەی کە هەموو شتێك دێنێتە بـــوون و دەیبـــاتەوە، مەیلـــی هەرچییەکـــی هەبێـــت دەیکـــات و، خـــاوەن و درووســتکەری عەرشـی بەرزـن و بـالایەو، تـۆڵەو سـزای تونـدی بەدەسـتەو، ڕێنومایی بەندە پاڵفتەو صەفادراوەکان دەکات، بۆ سەر ڕێگاو ڕێبازی ڕاست و، ڕچەو پەیڕەوی دروست و پەسەند، کە لەدوای شایەتیدانیان بە یەکتاییان، ئەو نیعمەتەیشی پێ بەخشیون:

کە بـڕواو عەقیـدەیانی لە تاریکسـتانی گومـان و دودڵیـی پاراسـتووە، وە ڕایکێشاون بەرەو شوێن کەوتنی ڕەسوڵی خودا حەزرەتی (محمد المصطفی) ﷺ و، گـرتنەبەری ڕێبـازی پیـرۆزی ئەصحابی کیـرام،(خودایـان لێ ڕازی بێـت) بە پشتگیری خودایی و لانەدانیان لەسەر ڕاستە شەقامی هیدایەت.

کە خودای گەورە؛ بە فەیزو تەجەللییات و کردار و خەصڵەتە جوانەکانیەوە خۆیی نیشـانداون، مەگـەر ئەو کەسـە لەم ڕاسـتیانە بگـات و لێـی حـاڵی ببێـت کەخـاوەنی دڵێـکی وریا بێت و باش گوێی گرتبێت و دڵی بۆ کردبێتەوە (١)،

---

(١) هیچ دروست کراوێك ناتوانێت لە حەقیقەتی زاتی خودا تێ بگات و پێی ئاشنا ببێت، کە تووشــی شــۆك و سەرســوڕمان نەبوبێــت، مەگەر لە ڕێگــای فــراوان کردنــی

# یەکتاپەرستی: (التوحید)

ئەوەی بۆ هەموانی ئاشکراو نمایان کردووە، کە هیچ گومانێکیان لەبارەیەوە نەبێت ئەوەیە: کە خودا لە زاتی خۆیدا تاك و بێ هاوەڵە ، تەنها وبێ شەریك و بێ وێنەیە .(١) گەورەو بێ نیازە لەهەموان و، کەسیش ناتوانێت دژو ڕکابەری بێت، تەنهای بێ وێنەیە، هەر بووە و ئەزەلییە و سەرەتا و دەسپێك بۆ بوونی نییە، بەردەوامە لە بووونداو هەرگیز ئەمپەڕو ئەوپەڕی نایەت، هەتاهەتاییەو هەرگیز کۆتا بە بوونی نایەت، پارێزەرو ڕاگری هەموو کارەکانەو لە فەرمانی جودانابنەوە، وەخاوەنی بوونێکی بەردەوامەو پچڕانی بەسەردا نایەت، بەردەوام لەمەوپێش و لەمەولایش بە هەموو صیفەتێکی جوان و باڵاو کەماڵەوە وەصفداردەکرێت، هیچ کات و زەمانێکی درێژ و تووڵانی ناتوانێت کۆتا بە بوون و دەستەڵاتی بهێنێت.

بەڵکو بۆ خۆی سەرەتایەو کەس پێشی نەکەوتووەو، کۆتایەو کەسیش ناکەوێتە دوایەوە، هەموو فرمانێکیش بۆ لای خۆی دەگەڕێتەوە، خۆی زاهیرەو ئاشکرا بوونی خۆی بەهۆی خۆیەوە بووە و هەموو شتێکیشی ئاشکرا

---

شارەزاییەکانی خۆی، لە زیاتر ناسینی ناوو صیفەتە پیرۆزەکانی خوداوە، کە هەر یەکێك بە پێی تواناو شایستەیی و ئامادەباشی و ئاستی دڵسۆزی خۆی پێی دەدرێت و، لەو ناسینی خودایە بەهرەمەند دەبێت.

(١) ئەبو مەنصوری بەغدادی فەرمویەتی: خودای گەورە تاك و تەنهایە. واتە وەك زانایان فەرمویانە : تاکی ڕەهاو فەردی موطلەقە لە خودایەتیدا، وە تەنهای بێ هاوەڵە لە تاکی و بێ وێنەییدا. بنوارە إتحاف السادة المتقين بشرح إحياء علوم الدين ل/١٩، بەرگی دوو دانراوی: محمد حسين الزبيدي.

کردووە، باطین و شاراوەیشە لە خەڵکی[1] . کە خودا زانا و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

# پاك و بێگەردی : (التنزیه)

دەبێت بڕوای وابێت کە خودا (ﷻ) جەستەیەکی وێنە کێشراو نییە، وە جەوهەرێکی (٢) سنووورداری دیاری کراو نییە، (٣) وە هەرگیز ناشوبهێت بەهیچ تەن و جەستەیەکەوە کە بارسایی و قەبارەیان هەبێت، نە لە پێوانەو سنوور بۆدانان و، نەلەوەشدا کە قەبوڵی دابەشبوون بکات، وە دەبێت بڕوای دامەزراوبێت کەخودا جەوهەر نییەو، هیچ جەوهەرێکیش لەخۆ ناگرێت و

(١)بۆ ئەوانەی دەیانەوێت بەهۆی خەزێنەی خەیاڵ و حاسسە هەستیاریەکانیەوە بیناسێت و دەرکی خودناسی بکات ئەوە باطین و شاراوەیە، وەئەگەر بیەوێت بە هۆی بەڵگە عەقڵییەکانەوە بیناسێت ئەوا خودای گەورە زاهیر و ئاشکرایە.

(٢) **جەوهەر**:شتێکە بەخۆیەوە ڕادەوەستێت و شتی تر بەوەوە ڕابووەستێت، هەروەها خۆبەخۆ شوێن داگیربکات. بنوارە: عەقیدەی مەرضییە دانراوی سید عبدالرحیمی مەولەوی، شەرح و لێکدانەوەی ملا عبدالکریمی مودەریس ل: ٨٤٨ چاپی یەکەم سالأی ١٩٨٨ چاپخانە نیشتیمانی بەغداد

(٣) **جەوهەر** واتە: ئەو پارچەیە کە قەبوڵی دابەشکردن ناکات . کە ئەصل و بنەمای ئەوشتەیە تەن و جەستەی لێ پێك دێت.

**مەحدوود**: واتە سنوورێك نەبێت لە سەری ڕابووەستێت و ئامنجێکیش نەبێت کە پێی بگات و کۆتایی پێ بێت.

**موقەددەر**: ئەوەیە کە بچێتە ژێر کێشانە و دیاریکردنی ئەندازەکەیەوە، کەدەبێت خودا ﷻ لەو جۆرە وەصفانە بپارێزرێت و گەردی جەوهەرو سنووورداری و تەقدیر و دیاری کردنی پێوە نەلکێت. بنوارە: إتحاف ٢/ ٢٤.

تێکەڵی نابن، هەروەها ماددەیەکی عەرەضی نییەو(١)هیچ عەرەضێکیش لەخۆ ناگرێت و تێکەڵی نابن، بەڵکو هاو وێنەی هیچ بوون و بوونەوەرێك نییە و، هەرچییەکیش کە بوونی هەیە هەرگیز لەوناچێت، وە هیچ شتێکیش نییە کەلەخودا بچێت، هیچ وێنەیەکی نییەو ئەویش وەك هیچ شتێکی تر نییە، وەهیچ ئەندازەو برو پێوانەیەك سنووری بۆ دانانێت، وەهیچ سووچ و گۆشەو تەنیشتێك ڕوماڵی ناکات و نایگرێتەوە، وە هیچ لایەنێك لە هەر شەش لایەنەکە دەورو گەمارۆی نادات.

وەخودای گەورە هیچ جێگەو شوێن و لایەك نییە لە حەوت تەبەقەی زەوی و ئاسمانەکان کە پێویستی پێی هەبێت، وەخودای تەعالا تەواوی دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەرشی باڵادا، بەو شێوەیەی کە شیاوی ڕێزو پیرۆزی و بەهای زاتی ئەقدەسی پەروەردگار بێت،

وەك فەرمویەتی: ﴿**الرَّحمنُ عَلَى العَرشِ استَوَى**﴾.(٢)

بەو واتایەی کە خۆی مەبەستیەتی و شیاوە کە بۆ خودای بڕیاری بدەیت، کە دەسەڵاتدارەو گەمارۆی هەموو عەرش و گەردیلەکانی داوە، بە شێوەك کە دووربێت لە هەموو شێوەیەکی پێوەلکاندن و لە تەنیشت بوون و تیاجێگیر بوون و حەوانەوەو تێکەڵبوون و گواستنەوە، نەك ئەوەی کە عەرش هەڵیگرتبێت،

---

(١) **عەرەزی** بەرامـــبەری جەوهەرە، کە بە خـــۆیەوە ڕاناوەســـتێت و بە شـــتی تـــرەوە ڕادەوەستێ، خـۆ بەخـۆ جێگـا ناگرێـت و بەهـۆی ئەو شـتەوە پێـیەوە ڕاوەسـتاوە جێگـا دەگرێت، وەك سپیەتی ، ڕەشیەتی، کورتی، تاد....بنوارە: عەقیدەی مەرضییە ل٨٥.

(٢)وەك لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا زانایان تەنزیهی خودایان کردووە لە هەمو شوێن و جێگەو پێوەلکاندن و لێکچواندن و تێکەڵبوون و جێبوونەوەو جیابوونەوەو هەر جۆرە واتـایەکی تـر کە واتـای حلـول و پەیـدابوون و لێکچوانـدن ببەخشـێت، دەبێـت خـودای گەورە بپارێزرێت لەهەموو گەردو واتایەکی تر کە ئەو مانا پەیدابووانە بگەێنێت.

بەڵکو عەرش و هەڵگرانی عەرش {فریشتە تایبەتیەکانیش} بەهۆی لوطف و میهرو دەستەڵات و تەوانایی خوداوە ڕاوەستاون و ڕاگیربوون.

وە هەمویان لەبەردەم دەستەڵاتی پڕ لە تەوانایی دوودەستەی قودرەتی ئەودان، وە خودای گەورە لە سەرو عەرش و ئاسمانەکان و لەسەروو هەموو شتێکەوەیە، تا دەگات بە ئەملاولاو سنووری زەوی و هەموو جێگاکان، بەرزییەکەی بە شێوەیەکە؛ کە لە ئاسمان و عەرش نزیکی ناکاتەوە، وەك چۆن لە زەوی و کەنارەکانیشی دوری ناخاتەوە.(١)

بەڵکو خودای گەورە پلەو پایەی مەعنەویی لە ئاسمانەکان و عەرش بەرزترە، وەك چۆن پلەوپایەی خودا لەئەرز و کەنارەکانی زەوی بەرزترە.(٢)

چەندێك لەڕوی پلەی مەعنەوییەوە بەرزو باڵایە، لەڕوی زانایی و ئاگاداریشەوە بە هەموو بوونەوەرێك ئەوندە نزیك و فریادڕەسە، بۆ بەندەکانیش زۆر لەڕەگی بناگوێ نزیکترە بۆیان.(١)

---

(١) ئەبوئیسحاقی شیرازی فەرموویەتی: ئەگەر بەرزی خودا بەمانای بەرزی جێگەو لاسەروبوون بێت، ئەوا نەدەگونجا وەصفی نزیکی بەندەکان بکەین، کە لە حاڵی سەجدەدا لەهەموو کاتێك لەخوداوە نزیکترن، وەك خودای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ ی فەرمووە: واسجد واقترب، واتە لەحاڵی سەجدەدا زیاتر لەمن نزیك دەبیتەوە.. بنوارە: إتحاف ٢٥/٢

(٢)بەرزی پلەی پەروەردگار بەواتای ڕێزو پلەی مەعنەوی و قەدرگرانییەتی، نەك بەواتای پلەپلەی دونیایی، کەهەرگیز پێویستی بە شوێن و جێگا نییە، وەهەرگیز درووست نییە ئەو پلەکارییە ماددییە بۆ زاتی بێ گەردی خوداوەند ﷻ بەکار بهێنرێت، بەڵکو دەوترێت: لەسەرو عەرشەوەیە ، کەواتە عەرشەکەی زۆر بڵندو باڵایە، لە جێیەك خاوەنی عەرشێکی ئاوا باڵا بێت، باشتر دەتوانێت خودای جێگا نزم و بەرەوخوارەکانیش بێت.

وە خوای گەورە ئاگادارو ئامادە و زاناو شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

نزیکبوونی خودا لە شتەکان، وەك نزیکی تەن و جەستە نییە بەیەکتری، نەنزیکی خودا دەشوبهێت بە نزیکی جەستەکان لە یەکتری، وەنە زاتی خۆیشی دەشوبهێت بە تەن و جەستەکان، وە هەرگیز زات و صیفاتەکانی خودا ناچنە ناو هیچ شتێکەوە، وە هیچ شتێکیش ناچێتە ناویانەوە، خودا زۆر لەوە بەرزو بالاترە کە جێگایەك بتوانێت بیگرێتە خۆی، وە لەوەش موقەددەس و بێ گەرد ترە، کە کات و زەمان سنوورداری بکات و، هێمای بۆ بکرێت بۆ ئەو کات و جێگایە.(٢) بەڵکو خودا پێش ئەوەی کات و زەمان درووست بکات هەر بووە، ئێستاش بەردەوام لەسەر حاڵەتی بوونی ئەزەلی خۆیەتی.

وەخودای گەورە بە صیفەتە ئەزەلییەکانی لە دروستکراوانی جودا دەبێتەوە، غەیری خودا کە بە (ماسوی الله) ناودەبرێت، تێکەڵ بە خودا نابێت، زاتی خودا قەبووڵی هیچ شتێکی تر ناکات کە بێتە ناوی، وە زاتی خودایش لە غەیری خودادا نییەو نابێت. وە پاك و بێگەردی بۆ خودایەو،

---

(١) حبــل الوریــد: ڕەگــێکە لەمیــانی قــوڕگ و ئەو ڕەگە زەردەی کە لە گەردنــیەوە درێـژدەبێتەوە تـا بنـاگوێ، کە هەمیشـە لێ دەدات، لەو بۆریـانەیە کە هەمیشـە ژیـانی تێـدایەو خوێنیشـی تێـدا نیـیە، بەهـۆی جـوڵەو بزوانـدنەوە لەگەڵ هەناسـەدا ژیـانی تێـدایە. ﴿**ونحـنُ أقـربُ إليـهِ مـن حبـلِ الوريـد**﴾ نزیکی مەنـزیلە و مەقـامی مەعنەویی مەبەستە، نەك نزیکی جەستەیی و ئاشکرا.

(٢) وەك چۆن نوێژ دەکەیت و ڕوو لە کەعبە دەکەیت و، کەسیش نەیوتووە کە خودا لە جیهەتـی کەعـبەوەیە (نعوذُبـالله)! بەڵکـو قیـبلە بە فرمـانی خـودا بـووەتە ڕووگەی موسوڵمانان ، هەروایش کە لە دۆعا و نزاکردندا دەست بۆ ئاسمان بەرز دەکەیتەوە، خـودا لە ئاسـمان نیـیە، بەڵکـو لە سـەر فەرمـانی خـودا ئاسـمانیش بـووەتە قیـبلەی دۆعاکردن.

هەرگیز گۆڕان بەسەر حاڵی دا نایەت و، گواستنەوە لە جێگایەکەوە بۆ جێگا یەکی تر ڕوی تێ ناکات، وەهیچ یەکێك لە ڕوداوو پێشهاتەکان تێکەڵی نابن و، ڕوبەڕوی هیچ ئافەت و بەڵاو تەنگژەیەکیش نابێتەوە.

بەڵکو صیفەتە بەرزو باڵاکانی هەرگیز تووشی لاچون و نەمان نابن و، ئەوندەش کەماڵی بەرزە، پێویستی بە هیچ زیادە تەواوکارییەك نییە.

وە بوونی زاتی خودا بەهۆی ئەقڵ و بەڵگەکانەوە زانراوو سەلمێنراوە، وە لە ڕۆژی دواییشدا ڕێگە بە ئیمانداران دراوە، کە بە چاوی خۆیان ببینن و لەو دار و دیار و نیشتیمانی هەتا هەتاییەدا بەری زیادە لوطف و نیعمەتی پەروەردگار بکەون، بۆ تەواوکرنی نیعمەتی بەردەوامی خودایی لە سەریان، وە شادبوونیان بە سەیرکردنی ڕوخساری جوان و بەڕێزی پەروەردگاریان.

# ژیان و تەوانایی

وەدەبێت بزانین کە خودا ﷻ زیندووەو، ژیانێکی ئەزەلی و ئەبەدی هەیەو، تەوانایە و دڵی دڵشکاوان دەداتەوەو، (جەببارەو)پشتی زاڵم و یاخی و ملهوڕان دەشکێنێت و، (قەههار)ە و دەتوانێت ئەوەی بیەوێت دەیکات و ئەنجامی دەدات، هیچ کەموکوڕی و نەتوانینێك ڕوی تێ ناکات و، هەرگیز خەوو خەوەنوچکە نایباتەوەو، هیچ جۆرە مردن و تیاچوون و فەوتانێکیش ڕوی تێ ناکات، خاوەنی موڵك و جیهانی بینراوی دونیایەو، خاوەنی مەلەکووت و جیهانی نادیاری غەیبییە، کە تایبەتە بە (عالەمی ئەرواح)، خاوەن موڵکی ڕاستەقینە هەرخودایەو، ئەوانی تر بە ئیزنی خودا دەبنە خاوەن موڵکێکی مەجازی کاتیی، وەخودا خاوەنی عیززەت و تەواناى بەرهەڵستیکردنەو، دارای جەبەرووت و گەورەییە، سوڵتەو دەستەڵات و توانای دروستکردن و فەرمانی ڕاستەقینە هەر لای خۆیەتی، هەموو ئاسمانەکان و ناواخنەکانیشیان پێچراونەتەوە و بەدەستی قودرەتی خوداوەن، وە هەموو دروستکراوانیش کۆکراونەتەوەو خزێنراونەتە ژێر

چەپۆك و دەستەڵات و قەهرو زەبری خوداوەندەوە، وە تەنها خۆیەتی کە خاوەنی فەرمانی هێنانەبوون و درووستکردنەو ،هەموو پەیداکردن و داهێنان و کارسازییەکیش لەبن دەستیدایەتی، وە دەستەڵاتی پەیداکردن و داهێنانی پڕ لە جوانکاریش تەنها لە ژێر دەستەڵاتی قودرەتی خۆیدایە(١) هەموو درووستکرا وانیشی هێناوەتە بوون، خۆیان و کردارەکانیشیان.(٢)

وە ڕزق و بژێوی و ئەجەل و کاتی مردنیشیانی بۆ دیاری کردووە، هیچ کارێکی بڕیار بۆدراو لە بن دەست و دەستەڵاتی ئەو دەرناچێت. وەهیچ کاروو تەگبیرو فرمانێك لەو زاتەیە ون نابێت، وەکەسیش ناتوانێت ڕوداوو قەدەرەکانی خودا سەرژمێر بکات، وە هەرگیزیش زانیاری و زانستەکانی بە کۆتا ناگات و کەسیش ناتوانێت سنوورێکیان بۆ دیاری بکات.

---

(١) لێرەدا ئیمامی غەزالی دەیەوێت ئەوە ڕابگەێنێت: کە هەموو جۆرێکی دروست کردن و پەیداکردن و هێنانەبوون و داهێنان و جوانکاریەکان تایبەتن بەخوداوەو، خالیقی هەموو کردەوەکان تەنها خودایەو، کەسی تر ناتوانێت خاوەنی هیچ یەکێك لەو کردارانەبێت. خەلق و دروستکردن بەومانایەیە: کە بەشێوەیەکی موتڵەق و ڕەهایی شتەکان دروست بکات، بەڵام داهێنان و ئیختیراع ئەوەیە: کە شتێك بهێنێتە بوون نەك لەسەر شێوەی دروستکراوێکی پێشوو، واتە: بەنموونەیەکی جیاواز لەوانی پێشتر دروستی کردبێت. بۆ زیاتر بنواڕە: إتحاف ٢/٢٧.

(٢) وەك خودا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ﴾ **الصافات ٩٦**، خەلقیش بەواتای ئەوەیە: شتێك لە نەبوونەوە بهێنێتە بوون، ئەمەش جگە لە خودا کەسێکی تر ناتوانێت شتێك دروست بکات، بۆیە خودا خاوەنی گیان لەبەرەکان و کردارەکانیشیانە.

# زانسـت:

وه دەبێت بزانیت: کە خودا زانایە بەهەموو زانیارییەك (لە حاڵەتی بوون یان نەبوون دابێت)، وە هیچی لێ ون نابێت، لە کەنارەکانی سەرەوەو ناوەوەی حەوتەبەقەی زەوییەوە، تا بەرزایی هەموو ئاسمانەکان، ئەو زۆر زانایە و هیچی لێ ون نابێت، ئەگەر پارچە گەردیلەیەکیش بێت لەناو ئاسمانەکان و زەویدا:
﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ ٣/ سبأ.

وە زانایەو گوێی لە جووڵەو ترپەی پێی مێرووییەکی ڕەشە، لەسەر بەردێکی کەڕی بێ گیيان لە شەوێکی تاریکدا، وە ئاگای لەو جوڵەی تۆسقاڵە گەردیلەیە. کەبەدەم هەوایەکی کەمەوە جێ بەخۆی ناگرێت و، لەبەر تیشکی هەتاودا دەردەکەوێت، بەڵکو زانایە بەسەر هەموو نهێنیەکاندا، تەنانەت لەو سیرەیش شاراوەتریێت، کە وەکو ئەو خورپەیەی دەکەوێتە ناو دڵی خۆیەوەو کەس پێی نازانێت و لە هەموانیشی دەشارێتەوە.

وە ئاگادارە بەسەر ئەو خورپەیەی دەکەوێتە ناو ویژدان و خەتەراتی دڵ و نهێنییە شاراوەکانیشی، بەزانینێکی ئەزەلی بێ سەرەتاو بێ کۆتایی، کە بەردەوام خودای گەورە لە دێرو دێرین زەمانی بێ سەرەتاوە هەر زانیویەتی، نەك بە زانینێکی پەیدابوو کە بۆی تازەبوبێتەوەو (پەنا بەخودا) زانستەکە چوبێتە ناو زاتی پەروەردگارەوە، لە ڕێگای حلوول و تێکەڵبوون و گواستنەوەوە.(١)

---

(١) **حلولییەکان** هەندێك گومراو سەرلێشێواون، وا گومان دەبەن کە خودا هەندێك لە بەندە تایبەتیەکانی پاڵفتەدەکات و، یەکێك لە صیفەتەکانی دەچێتە ناو ڕۆح و جەستەیەوە، ئەو کەسەش بەشێك لە خودایەتی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت. نازانن خودا کە جەستەیەك پاك دەکاتەوە، بۆ ئەوەیە بەندایەتی

# ئیراده و ویستی خودا:[1]

وە بزانە! کە خودای گەورە بەویستی خۆی ئەم بونەوەرو دروستکراوانەی هێناوەتە بوون، پلان و تەگبیری هەموو ڕوداوەکانی داڕێژاوە، هەرگیز لە ژێر دەستەڵات و مەلەکووتی پەروەردگاردا شتێك ڕوونادات بەبێ قەزاو بڕیاری دیاریکراوی خۆی، وە ئەوەی بیەوێت ئەوا بە پێی مەیل و ویست و پەندیاری پەروەدگار دەبێت، کەم بێت یان زۆر، بچوك بێت یان گەورە، خێر بێت یان شەڕ، سوودبەخش بێت یان زیانبەخش، ئیمان و بڕوا بێت یان کوفرو بێ دینی، ئەوەش مەیلی لێ نەبێت، ئەوە هەرگیز نەبووەو ناشبێت، تەنانەت تروکاندنی چاوێك کەسەیری شتێکی پێ بکات، یان خورپەی دڵێك کە بیری لە شتێك پێ کردبێتەوە، هیچی لەمەیل و ئارەزووی خودا دەرناچێت.[2] بەڵکو

---

ڕاستەقینەی بۆ بکات و خزمەتی فەرمانەکانی بکات، نەك خۆیی لێ ببێت بە خودا!! الموسوعة الصوفية:٩٢٤ **ئینتیقالیش** گواستنەوەی ڕۆحەکانە لە لاشەو جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر، کە لەکاتی خۆیدا بەدرێژی باسی دەکرێت.

(١) صیفەتێکی ئەزەلی خودایيە، لەوەدا کاریگەردەبێت کە یەکێك لەدوو لایەن هەڵدەبژێرێت بەسەر لاکەی تردا، وەك هەڵبژاردنی بوون بەسەر نەبوون دا، یان لە میانی کورتی و درێژی و هاو وێنەکانیان. کە صیفەتی سێیەمی مەعنەوی خودایە، لەو حەوت صیفاتەی کە هەیەتی، وە هیچ کات بەبێ مەیل و ئیرادەی خودا کارێك لە بوون و نەبوون ڕونادات.

(٢) ئەمەش ناودەبرێت بە ئیرادەی کەونیی خودا، واتە: بیەوێت شتێك ببێت دەیکات، بەپێی فەرمودەکەی ئیمامی غەزالی (خودای لێ ڕازی بێت) ئیرادەی چاکەو خراپەش دەکرێت بیخەیتە پاڵ خوداوە، هەندێك لە زانایان بەکورتی ئەوەندە باس دەکەن: کە ئەوەی خودا ویستی دەبێت، ئیتر بەدرێژی ناچنە ناو

خوای گەورە هەموو شتێکی لە سەرەتاوە درووست کردووەو دەیشیانگێڕێتەوەو ئەوەش بیەوێت دەیکات و جێ بەجێی دەکات، کەس ناتوانێت دەس بهێنێتە ڕێگای، وەکەس بۆی نییە پێداچوونەوە لەسەر قەزاو بڕیارەکانی بکات، یان هەڵی بوەشێنێتەوە، یان بەدواداچوونی لەسەربکات، وە هیچ بەندەیەکیش بە بێ یارمەتی و ڕەحمەت و پشتگیری خودا ناتوانێت لە تاوان و یاخی بوون خۆی لابدات، وەهێزی ئەوەیشی نییە گوێڕایەڵی بکات بەبێ خۆشەویستی و مەیل و ئیرادەی خودا.

ئەگەر هەموو مرۆڤ و جنۆکەو فریشتەو شەیتانەکانیش کۆببنەوە و هەماهەنگی یەکتری بکەن، کە تەنها گەردیلەیەك لەم جیهانەدا بجوڵێنن یان بیوەستێنن بەبێ ئیرادەو ویستی پەروەدگار، ئەوە ناتوانن و دەستەوستان دەبن.

---

بابەتەکانەوە، ئەمەش وەك ئەوە وایە کە موسوڵمانێك ڕو لە خودا بکات و بڵێت: (ئەی دروستکەری تەن و جەستەکان)! خۆ ناوی سەگ و بەرازیش نابات و نزاکەیشی ئەوانیش دەگرێتەوە، کە لە ڕاستیدا خودا خالیقی ئەوانیشە، هەر بەو شێوەیش دەڵێت: خودا ئیرادەی هەموو شتێك دەکات کە پەیدابووبێت، بەڵام ناوی ئیرادەی کوفر و تاوانەکان نابات، ئەگەرچی ئەوانیش بە بێ ئیرادەی خودا نابن، ئەمەش ڕای زانا ئەشعەریە کۆنەکانە، بەڵام بە پێی فەرموودەی شێخ أبوالحسن ی ئەشعەری (خوای لێ ڕازی بێت) ئەم وتنە دەبێت : دروستە ئیرادەی خێرو شەڕ بدەیتە پاڵ خودا، بەڵام پێویستە کە قەرینەو نیشانەیەك هەبێت عەمەل و کردارەکە بخاتە پاڵ عەبدەکەوەو، ئیرادەکەش بخاتە پاڵ خوداوە، کە خۆی ئارەزوی خستۆتە دەستی بەندەکانەوە، کە ئەگەر نەیەوێت، ئەوانیش نەیاندەتوانی کاری خراپە بکەن، بەڵام ئارەزووی پێداون و پێیشی ڕازی نییە، ﴿**وَلَنْ يَرضَى لِعِبادِهِ الكُفر**﴾، بۆ ئەوەی کەسێك بە هەڵە وا تێ نەگات کە خودا بە کاری خراپە و کوفری بەندەکانی ڕازییە. بنواڕە إتحاف: ٢/٢٨.

بەڕاستی ئیرادەی خودا تەنها بەخۆیەوە ڕاوەستاوەو لەگەڵ هەموو صیفەتەکانی تریدا لە ئەزەلەوە پێی وەصفدارکراوە، وە لە ئەزەلەوە بڕیاری ئەوەی داوە کە شتەکان لە کات و شوێنی خۆیاندا بیانهێنێتە بوون و، چۆنی دیاریکردووە، ئاوا لەکات و ساتی خۆیدا درووست بوون و دەبن، بەبێ ئەوەی بۆ چرکەیەك پێش بکەون یان دوابکەون، بەڵکو بە پێی ویست و زانینی خودا ڕوویانداوە و ، هیچ شێواندن و هەڵگۆڕانێکیشیان بەسەردانەهاتووە، ڕاپەڕاندنی کارەکانی خودا، پێویستی بەبیرکرنەوە و چاوەنواڕی نییەو، هیچ ڕێگرێکیش ناتوانێت دەستی بگرێت و لە ڕێگەیدابووەستێت.

## بیستن و بینین:

دەبێ بزانیت! کە خودای گەورە بیسەرەو بینەر و بینایە[1]، دەبیستێت و دەبینێت، وە هیچ شتێکی بیسراوی لێ شاراوەنییە با زۆر نهێنیش بێت، وەهیچ بینراوێك لەبەرچاوی ون نابێت، هەرچەندە ورد و بچوکیش بێت، دووریی نابێتەپەردەی نەبیستن و، تاریکی نابێتە هۆکاری نەبینین و، بەبێ گلێنەو پێڵوی چاوان دەبینێت و دەبیستێت، بەبێ گوێچکەو کرکراگەو کونی گوێ و هۆکاری بیستن، وە هەموو شت دەزانێت بەبێ ئەوەی دڵی هەبێت، تۆڵەو سزایش دەدات بەبێ کۆئەندامەکانی جەستە، شتیش دروست دەکات؛ بە بێ ئـامێرو

---

(١) حەقیقەتی بیستنی خودا ئەوەیە: کە صیفەتێکی ئەزەلییە و بەخوداوە ڕاوەستاوە و پەیوەندارە بە هەموو دروستکراوەکانەوە، کەبەتەواوی دەرك بەهەموو شتەکان دەکات، بەبێ هۆکاری خەیاڵ و گومانبردن، وەبێ ئەوەی کاریگەری حاسسە وهەستیارەکانی لەسەر بێت، یان بەهۆی هەواوە پێی گەیشتبێت، هەروەها حەقیقەتی بینینیش بەم شێوەیە دەبینێت، بێ ئەوەی پێویستی بە هیچ هۆکارێك هەبێت، یان لە ڕێگەی گەیاندنی تیشکەوە بێت. إتحاف ٢/٢٩.

هۆکار، چونکە صیفەتەکانی وەك صیفەتی خوورەوشتی دروستکراوەکانی نییە، وەك چۆن زاتی خودا ناشوبهێت بەجەستەی هیچ دروستکراوێك.

## وتەو قسەکرن:

وەخودا خاوەنی کەلامە و قسەدەکات و فرماندەدات و رێگری ونەهی لە شت دەکات، بەڵێن دەدات و هەرەشەش دەکات، بە کەلامێکی ئەزەلی کە هەر بوبێت و بەزاتی خوداوە راوەستابێت، وەك وتەو گوفتاری خەڵکی نییە، کە بەهۆی دەرچوونی هەواوە ئەو دەنگەی دەرکردبێت، یان لکابێت بە تەن و جورمی ترەوەوە، وە ئاخاوتنی خودا بە پچڕانی پیتەکان نییە، کە بەهۆی لێو لەسەریەکنان و هەڵسوڕان و جوڵەی زوبانەوە دروست بووبێت[1]

---

(١) ئەبو حەسەنی ئەشعەری فەرموویەتی: کەلامی خودا لە جینس و رەگەزی قسەی خەڵکی نییە، هەروەها لە رەگەزی دەنگ و پیتەکان نییە، بەڵکو قسەکردنی خەڵکی بە پیت و بەدەنگ، نیشانەن لەسەر جۆرێکی قسەکردن کە بە نەفسی قسەکەرەکەوە وەستابێت، بەڵێ کەلامی خەڵکی لە پیت و دەنگ پێك هاتووە، وەقورئان کە کەلامی خودایە لە بنەڕەتدا دەنگ و پیت نییە، هەرچەندە لەکاتی خوێندنەوەدا دەبێتە دەنگ و پیت، بەڵام ئەصڵی کەلامە ئەزەلییەکەی خودا نە دەنگە و نە پیتەو، نە پێویستیشی بە چۆنیەتی دەربڕینی پیتەکان هەیە.

ئەمەش رای زۆربەی ئەهلی حەدیسە و ئەبو مەنصوری بەغدادیش لەسەرهەمان رایە ، وە پێشەوا ئەبولمەعالیش دەفەرموێت: مەزهەبی ئەهلی حەق لەسەر ئەوەن: درووستە قسەیەك ببیستی کە لە ئەصڵدا نەدەنگ بێت و نە پیت، چونکە کەلامی خودا قەدیمەو نابێت بە هیچ صیفەتێکی پەیدابوو وەصفدار بکرێت، وە ئێمە ناتوانین باسی چۆنیەتیەکەیشی بکەین، ئەویش وەك زات و صیفەتەکانی تری خودا شاراوەیە و، کەس لە حەقیقەتیان حاڵی نییەو،

وەباوەڕمان وایە: قورئان و تەورات و ئینجیل و زەبوور، ئەو کتێبانەن کەخودا ناردوونیەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکانی (سەلامی خودایان لەسەر)، قورئانیش بە هۆی زوبانەوە دەخوێنرێتەوە و، لە نێوانی دووتوێی مەصحەفێکدا نوسراوەتەوە و، لە دڵەکاندا هەڵدەگیرێت و لەبەر دەکرێت.

لەگەڵ ئەمەشدا بڕوامان وایە کەقورئان:

کەلامێکی قەدیمەو، ڕاوەستاوە بەزاتی خودای گەورەوە، بەوەی کە دەگوێزرێتەوە بۆ ناو دڵەکان و پەڕاوەکان، قەبوڵی پچڕاندن و جیابوونەوەش ناکات و ،(ئەصلی کەلامەکە بەخوداوە لکاوەو، هەرگیز نافەوتێ و ناشسڕێتەوە).

وە بڕوایشمان دامەزراوە: کە حەزرەتی موسا (سەلامی خودای لەسەر) گوێی بە وتەو فەرموودەی خوداوە بووە، بە بێ بەکارهێنانی دەنگ و پیت، وەك چۆن پیاوچاکە هەڵبژێرراوەکان لە دواڕۆژدا زاتی خودای گەورە دەبینن، بەبێ ئەوەی کە ماددەو جەوهەرێکیان بینیبێت، یان شتێکی عەرەزی کە بە جەوهەرەوە دەلکێت. دوای ئەوەی سەلماندمان کە خودا ﷻ ئەم صیفەتانەی هەیە، کەواتە دەبێت بزانین:

کە خودا زیندووە و زانایەو بەتوانایەو، خاوەن مەیل و ئیرادەیەو، دەبیستێت و دەبینێت و قسەدەکات، وە بڕوامن هەیە بەوەی کە ژیانی هەیەو، خاوەنی تەواناو زانست و ئیرادەو بیستن و بینین و کەلامەو، هەموو صیفەتەکانیشی ئەزەلین و، ئەم صیفەتانە پێیان دەوترێت:

---

باوەڕیشمان پێیان هەیە. وەدوای ئەوەی کەلامی خودا دێتە خوارەوە،دەبێت بە یەکێك لە زوبانەکان تەعبیربداتەوە و، بەو زوبانە تایبەتە دەخوێنرێتەوە. بنوارە: إتحاف ٢/٣٠

صیفاتی مەعانی، لە زاتی خودا جودا نابنەوەو، نەشلکاون بە خوداوە[1].

---

(١)هێمایە بۆ ئەوەی کە صیفەتی مەعانی زیادن لە زاتی بەرزی خودا، بەو واتایەی کە ئەو مانایەی لە صیفەتی عیلم لێی تێ دەگەیت، بەلیغ و بەهێزترە لەوەی کە لە صیفەتی قودرەت لێی تێ دەگەیت. کە صیفەتی تەوانایی یە بەسەر جێبەجێکردن یا نەکردنی کارێکدا، هەروەها صیفەتەکانی تریش، کە بۆ خۆیان بەسەربەخۆیی بوونیان هەیەو، قەدیمیشن و. ڕاوەستاون بە زاتی خوداوەو، لێیشی جودانابنەوە، کە قبولی نوقسانی و کەمی ناکەن و، هەموویان صیفاتی کەمالی خوداین، وە بشزانە کە بوونی کۆمەڵێ صیفەتی قەدیم، هیچ زیانێك نابەخشێت، لە کاتێکدا کە صیفەتی یەك زات بن، ئەوەی کە هەرگیز ڕونادات، بوونی چەند زاتێکی خوداوەندە، کە ئەمە محاڵە، ئەینا خودایەك کۆمەڵە صیفاتێکی قەدیمی هەبێت، هیچ زیانێك ناگەێنێت، وە هەرچەند ئیمام باسی حەوت صیفەتی نووسیوە، بەڵام لەپاڵ صیفەتی قودرەتدا صیفەتی حەیاتیشی بەیان کردووە، لەسەر ئەو بنەمای کە توانایی و زانایی و ئیرادە جێبەجێ نابێت بەبێ بوونی ژیان.

ئەوەش بزانە! کە صیفەتەکانی خودا نە زاتی خودان، وە نە لەخودایش جودان، چونکە ئەگەر صیفەتەکان عەینی خودابن، ئەوە واجب دەگەڕێت کە لە مەفهوم و واتادا یەك شت بن و جیاوازیان نەبێت، وە ئەگەر غەیری خودایش بن، ئەوە پێویست دەگەڕێت کە لێی جودابن، کە ئەمەش محاڵە. کە دەڵێین ئەگەر صیفەتەکان عەینی خودابن: ئەوە لازم دەبێت یەك واتاو مەفهومیان ببێت، بەو مانایەی کە عیلم و زانست بیستن و تەواناو قودرەتیش بێت، وە کەلام بینیش بێت، بەوشێوە تێکەڵکاریەکی سەیر ڕودەدات . هەروەها ئەوەش پێویستە کە بیزانیت:

صیفاتی مەعانی چوار بەشی لێ دەکەوێتەوە:

# خاوەنی کردار:

وەبزانە! کە هەرشتێك جگە لە خودا بوونی هەبێت، ئەوا دڵنیابە کە خودای گەورە و باڵادەست بە کرداری خۆی پەیدای کردووە و بوونی پێ بەخشیوە[1]، وە لە دادگەری خودایی بەجوانترین و کامڵترین و تەواوترین و دادوەرترین شێوەوە سەرچاوەی گرتووە، وەبزانن کە خودا پەندیارو حەکیمە

---

بەشێکیان پەیوەست نابن بە هیچ شتێکەوە، کە ئەمەیش صیفەتی حەیاتە. وەبەشێکیشیان پەیوەستن بە کارە مومکینەکانەوە، کە ئەمەش صیفەتەکانی قودرەت و ئیرادەیە، وەبەشی سێهەمیان پەیوەندییان بە هەموو بوونەوەرەوە هەیە، ئەمانەش هەردوو صیفەتی بیستن و بینینن، وەبەشی چوارەمیشیان پەیوەندارن بە هەموو بەشەکانی حوکمی عەقڵییەوە، ئەمانەش هەردوو صیفەتی عیلم و کەلامن. بۆ زیاتر ڕونکرنەوە بنوارە: الإتحاف ٢/٣١.

(١) تاکوتەنهایی خودا بە چەندین جۆر باسی هەیە، وەحدانییەتی زات، کە ڕێگەنادات زاتی خودا چەندخودایەکی پێکوە لکاو بن، بە شێوەیەك کە زاتێك بێت پێکهاتبێت لە چەندین جەوهەرو ماددەی عەرەزی، هەروەها ڕێگە بە چەندین خودای جوداو لێکترازاو نادات، وەك ئەوەی لە پاڵ خودادا خودایەکی تریش هەبێت، هەروەها ڕێگە نادرێت بە چەندین صیفاتی پێکەوە لکاو، وەك ئەوەی کە خودا دوو جۆر قودرەت و تەوانایی هەبێت، یان چەند زانست و چەندین ئیرادە. هەروەها وەحدانییەتی زات ڕێگە بە بوونی چەندین صیفاتی لەیەك جودانادات، وەك ئەوەی کە جگە لە صیفەتی ئەزەلی خودایی یەکێکی تر بەهەمان شێوە ئەو صیفەتەی هەبێت، وەحدانییەتی کرداریش بەهەمان شێوە: ڕێگە نادات کەسێکی تر جگە لەخودا خاوەنی داهێنان و دروستکردن و پەیداکردن بێت، تەنها خودا شت دروست دەکات.

له کردارەکانیدا، دادپەروەرە لە هەموو قەزاوەتەکانیدا، عەدالەتی خودا ناپێورێت بەدادگەری بەندەکانی، چونکە دەگونجێت بەندەیەك لەموڵکی یەکێکی تردا زوڵم بکات، بەڵام هەرگیز ناگونجێت خودا زوڵم بکات، چونکە کەسێکی تر موڵکی نییە بەرامبەری، تا خودا دەستی تێ وەربدات و بە زوڵم بۆی بژمێررێت.

کەواتە هەموو ئەوانەی تر غەیری خودا لە جنۆکەو ئینسان و شەیتان و فریشتەو ئەرز و ئاسمان و گیانلەبەر و ڕووەك و جەماد و بێگیان و، جەوهەر و مادده عەرەزییە پێکەوەلکاوەکان و ئەوانەی دەزانرێن و هەستیان پێ دەکرێن هەموو ئەمانە پەیدابوون و بەدەستی قودرەتی خۆی داهێناون و لە نەبوونەوە هێناونیەتیە بوون، وە لەسەرەتاوە دروستی کردوون بە بێ ئەوەی پێشتر هیچ بنەماو سەرەتایەکیان بووبێت.

چونکە لە ئەزەلدا تەنها خودا بۆ خۆی بەتەنهایی بووەو کەسی تری لەگەڵدا نەبووە، خەڵکی دروستکردو داهێنان بۆ ئەوەی توانای خۆی ئاشکرابکات، وە بڕیارو ئیرادەی پێشتریشی بهێنێتەجێ کە لە ئەزەلدا ئەو بڕیارەی هەبووە کە هەرگیز گۆڕان بەسەر وتەو کەلیمە و بەڵێنی خودادا نایەت، ئەم پەیداکردنەش هەرگیز بۆ ئەوە نەبووە کە خودا پێویستی بە دروستکراوەکانی خۆی هەبێت.

وە دەبێ بڕوامان دامەزراو بێت لە سەر ئەوەی کە خودا لە فەزڵ و میهری خۆیەتی، کە خەڵکی دروست کردووە یان داهێنانی کردووە، یان فرمانی بە خەڵکی سپاردووە، نەك هیچی لەسەر واجب بووبێت، وە دەستی ڕەحمەت و چاکەی درێژە بەسەر خەڵکییەوە، بە ڕژانی نیعمەت و ڕۆزی و چاکسازی، نەك بەوەی کە پێویست بووبێت لە سەری.

کەواتە هەموو فەزڵ و سەرچاوەی چاکە و ئیحسان و نیعمەت و منەتباری تەنها تایبەتە بەخۆیەوە، چونکە دەیتوانی هەموو جۆرێکی سزای سەخت بڕژێنێت بە سەر بەندەکانیدا، وە بیشیانتلێنێتەوە بە جۆرەها بەڵاو ئێش و ئازار و نەخۆشییەوە، کە ئەگەر کاری وایشی بکردایە، ئەوە بە عەدالەت و دادگەری بۆی دەنووسرا، نەك بە کردەوەیەکی ناشیرین و ستەمکاری.

وەدەبێت بزانین! کە خودای میهرەبان پاداشتی بەندە بڕوادارەکانی دەداتەوە لە سەر گوێڕایەڵی و بەندایەتییان، تەنها بە لوطف و کەرەم و بەڵێن و گفت و چاکەی خۆی، نەك بە حوکمی ئەوەی کە ئەو بەندانە شیاوی ئەو پاداشتەن، یان پێویستە کە خودا بەو شێوە پاداشتیان بداتەوە، چونکە هیچ کارێك لەسەر خودا واجب نییە، وە هیچ کاتێکیش گومانی زوڵم کردن بە خودا نابرێت، وە هەق هیچ کەسێکیش لە سەری واجب و پێویست نابێت.

بەڵام دەبێت بزانین کە ماف و حەققی خودا بەسەر بەندەکانیەوە چەسپاوەو، پێویستە لە سەریان بەندایەتی بۆ بکەن و، لە سەر زوبانی پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لەسەر) پێیان گەیشتووە نەك تەنها بە هۆی ئەقڵەوە، بەڵکو پێغەمبەرانی ڕەوانەکردووەو، بە موعجیزە ئاشکراکانیان ڕاستگۆییانی پشتڕاست کردۆتەوە و، ئەوانیش فرمان و قەدەغەکراوەکانی خودای پێ ڕاگەیاندوون و، بەڵێن و هەڕەشەی خودای پێ گەیاندوون، بۆیە لەسەر خەڵکیش پێویست بووە کە بڕوایان پێ بکەن و شوێنیان بکەون.

# واتای وشەو کەلیمەی دووهەم:

## کە شایەتیدانە بە گیانی حەزرەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ

وە بزانین کە خودا ﷻ پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری قورەیشی ڕەوانە کردووە، کەناوی (حەزرەتی)موحەممەدە ﷺ، بە پەیامێکی گشتگیر بۆ هەموو عەرەب و نەتەوەکانی تر، وە بۆ مرۆڤ و جنۆکە، کە بە شەریعەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ هەموو ڕێبازەکانی تر هەڵوەشاونەتەوە و حوکمیان پێ ناکرێت، مەگەر ئەو فرمانانەی کە دووبارە پەسەندو ئیقراری کردبێتنەوە.

وە فەزڵی ئەم پێغەمبەرەی داوە بەسەر هەموو پێغەمبەراندا، وە گێڕاویەتی بە سەیید و گەورەی هەموو ئادەمیزاد، وە لە دوای وتنی کەلیمەی (لاإلهَ إلاَّ الله) بەوەش لێی قەبووڵ نەکردوون و، کەماڵی ئیمان و بڕوای بەستۆتەوە بەوەی کە لەگەڵ یەکتاپەرستیدا، شەهادەتی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله) ی پێوە بێت و پێکەوە بیانڵێت.

وە پێویستی کردووە لە سەر هەمو خەڵکی بە گشتی، کە بڕوای پێ بهێنن، لە سەر هەموو ئەو هەواڵانەی کە پێی داون، لە کارو باری دونیاو ئاخیرەت، وەدەبێت بشزانن: کە ئیمان و بڕوای هیچ بەندەیەك وەرناگیرێت، هەتا بڕوا نەکات بە هەموو ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەر ﷺ داویەتی لەدوای مردن کە چی ڕودەدات، کە یەکەم ڕوداو ڕوبەڕوی دەبێتەوە، پرسیاری هەردوو مەلائیکەی (نەکیر و مونکەر) ە، [1]،ئـەوانەش دوانـن: ڕەشتـاڵەو چـاوشین و ترسنـاك و

(١) پێشتریش دەبێ دڵنیا بێت: کە مەلائیکەی گیان کێش ڕۆحی دەکێشێت، ڕۆحیش جەستەیەکی لەطیف و ناسکە، تێکەڵی ناو لاشە دەبێت، بە ڕۆشتنی ڕۆح ژیانیش دەڕوات، وە (ئیزرائیل) یش گیان دەکێشێت، مانای ناوەکەی (عەبدولجەببارە)

ڕەزاقورسن، (قژو پرچی سەریان تا بن پێیان دێت و، ئاگر لە میانی چونگوڵ و نینۆکەکانیان دەردێت، زەوی دەکێڵن پێیان، قسەکانیان وەك هەورەگرمەوایەو، چاوەکانیان وەك هەورە بزیسکەوایە و، چەندین پارچەی قورسی ئاگرینیان پێیە) ئەو بەندەیە ڕاستدەکەنەوە و دایدەنیشێنن، بە تەواوی ڕۆح و جەستەی خۆیەوە، پرسیاری لێ دەکەن لە بارەی تەوحیدو یەکتاپەرستی و پەیامی پێغەمبەران و پێی دەڵێن:

خوای تۆ کێ یە ؟ دینت کامەیە؟ پێغەمبەری تۆ کێیە؟ [1]،

---

سەری لە ناو ئاسمانی بەرزدایەو، پێیەکانی لە کەنارەکانی زەویدایە و، ڕوخساریشی لەبەرامبەری (لوح المحفوظ) دایە، هەموو خەڵکی لە بەردەمی چاوەکانیایەتی، وە یارمەتی دەرەکانی بە ئەندازەی ژمارەی مردووان دەبن، بەنەرم و نیانی لەگەڵ ئیمانداردا دەجوڵێتەوەو، بەڕوخسارێکی جوان خۆیانیان نیشان دەدات، وەدەبێت باوەڕت وابێت کە ئەجەل بە پێی عیلمی خودا تەنها یەکێکەو زیاد ناکات، وە هەموو کوژراوێکیش بە ئەجەلی خۆی دەمرێت، لەو کاتەدا کە خودا لە ئەزەلدا بڕیاری بۆ دیاری کردووە، وە دەبێت دڵنیابیت کە پرسیاری ناو گۆڕیش ڕاستەو،خودا ڕۆحەکەی دەگێڕێتەوەو زیندودەبێتەوەو، پرسیاری لێ دەکرێت و، خوای گەورە ئەقڵ و زانست و هەستەکانی بۆ دەگێڕێتەوەو،وەڵامی ئەو دوو مەلائیکە دەداتەوە. بنواڕە : إتحاف ٢/٣٦.

(١) وەك لە فەرموودەی ژمارە (٣٢٢٠)ئیمامی تورمذی ڕیوایەتی کردووە. كتاب الجنائز، في ما جاء في عذاب القبر، (١٠٧١) وصححه ، وابن حبان في صحيحه ٣٦٨/٧(٣١١٧) من حديث أبي هريرة إذا قُبر الميت - أو قال: أحدكم- أتاه ملَكانِ أسودان أزرقانِ يُقال لأحدهِما المُنكر وللآخر النكير، وفي الصحيحين[البخاري، كتاب الجنائز، باب الميت يسمع خفق النعال، (١٣٣٨)، ومسلم كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها، باب عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه، .. (٢٨٧٠( من حديث أنس ((إنَّ العبدَ إذا وُضِعَ في قبره وتولّى عنه أصحابه وإنّه ليسمع قرع نِعالِهم أتاه ملَكان فيقعدانه .الحديث. وأخرجه أحمد في مسنده، (٦٥٦٧)وابن حبان في صحيحه،

که ئەوانە هەردوو تاقیکەرەوەکـــانی نـــاو قەبـــرن، یەکەم فیتـــنەو تاقیکردنەوەش دوای مردن بە پرسیاری ئەم دوانە دەست پێ دەکات.
وەدەبێت بڕوای دامەزراوی هەبێت بە سزای قەبرو (گۆڕەوشار) [1]،کەڕاستەو پڕ لە حیکمەت ودادگەرییە، (چونکە هەمووی موڵکی خۆیەتی، هەرچۆنیان پێ بکات،یان چۆن بجوڵێتەوە لەگەڵیاندا ئەصڵی دادو عەدالەتی بەجێ هێناوە)[2]، کەئەو سزاو ئازارە بۆ ڕۆح وجەستەی مرۆڤە بە گشتی.
وە دەبێت بڕوای بە کێشانەو پێوانەی کردەوەکان هەبێت[3]، کە میزان دووتای ترازووی هەیە، لەگەڵ زوبانێکدا، (تایەکیان بۆ چاکەیەو لە نوور دروستکراوە، ئەو تاکەیشی لە تاریکییەو بۆ کێشانەی خراپەکانیەتی، ئەوەش کە میزانی ڕاگرتووە حەزرەتی جوبرەئیلە (سەلامی خودای لەسەر) لە

---

٣٨٤/٧(٣١١٥)، من حديث عبالله بن عمر أنَّ رسول اللهِ ﷺ ذكَرَ فتَّاني القبر فقال عمر: أتُرَدُّ عَلَينا عُقولنا....الحديث.

(١) أخرجاه البخاري ،كتاب العلم، باب من أجاب الفتيا بإشارة اليد والرأس، (٨٦) ومسلم ، كتاب الكسوف، باب ما عرض على النبي ﷺ في صلاة الكسوف من أهل الجنة...(٩٠٥) من حديث عائشة: ((-- إنكم تفتنون وتعذبون في قبوركم... الحديث.

(٢) وەك ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە صەحیحەکەیدا بە مەرفوعی: إنَّ هذهِ الأُمَّة تُبتَلى في قُبورِها، فلَولا ألا تَدافَنوا، لَدَعوتُ اللهَ أَن يُسمِعَكُم مِن عَذابِ القَبرِ الذي أسمَعُ مِنــهُ) بەژمــارە ٢٨٦٧، واتە: ئەم ئــوممەتی مــنە تاقیــدەکرێنەوە و، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبــوایە کە لە ترســی عەزابــی قەبــر مردووەکانتــان نەدەناشــت، ئەوا داوام لە خــودا دەکرد کە وەك من چۆن گوێم لە سزای ئەهلی گۆڕستانە، ئێوەش ئاوا گوێتان لێـوە بوایە. وە بنوارە: فیض القدیر/٧٥١٦.

(٣)وەك خودای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾ الأنبياء/٤٧.

گەورەیشدا بە ئەندازەی حەوت تەبەقەی ئەرز و ئاسمانەکان دەبێت[1]، بە توانای بێ سنووری خودا کردەوەکانی پێ دەکێشرێت، تەنانەت مسقاڵە زەڕەو گەردیلەیەك و بە ئەندازەی خەردەلێکیش نابوێرێت و هەمووی دەکێشێت و، دادگەری ڕاستەقینەی خودایی جێبەجێ دەکات. وە تەواوی پەڕاوی گەورەی چاکەکان، کە کردەوەکانی تێدا نوسراونەتەوە، بە شێوازێکی جوان دەخرێنە ناو تای ترازووی نوورەوە، کێشانەکەی بە فەزڵی خودا و بە پێی پلەکانیان قورس دەبێت، وە پەڕاوە خراپ و پڕ لە تاوانکارییەکانیش، بە شێوەیەکی ناشیرین دەیانهاوێنە ناو ترازووی تاریکییەوە، کێشانەکە لای چاکەکانی سووك دەکات بە پێی عەدالەتی خودایی.[2]،

---

(١)فراوانیەکەیشی ئەوەندەگەورەیە، هەموو ئەرزو ئاسمانەکان بخەیتە ناوی جێگای دەبێتەوە، وەك فەرموودەی حەزرەتی سەلمان ڕیوایەتی دەکات: (**توضَعُ المَوازينُ يَومَ القِيامةِ ولو وُضِعَت فِيهِنَّ السَّماواتُ والأرضُ لوَسِعَتهُنَّ**) وەلە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە بەهەشت لە لای ڕاستی عەرشەوە دادەنرێت، ئاگری دۆزەخیش لە لای چەپیەوە، میزانیش لە میانی دوودەستەی قودرەتی خوادا دادەنرێت، تایەکی کێشانەکە لەلای ڕاستی عەرشەوەیە بۆ چاکەکان، وەتاکەی تریش بۆ کێشانەی خراپەکانە لەلای چەپی ئاگری دۆزەخەوەیە، ئەوەش کە مەشهورە، یەك میزان هەیە بۆ هەموو ئوممەتەکان، بۆ کیشانەی هەموو کردەوەکان، ئەوەی بە صیغەی کۆ وتراوە، بۆ گەورەیی و هەیبەتەکەیەتی. إتحاف٢/٣٨.

(٢) أخرجه البيهقي في البعث (١٣٤) من حديث عمر قال: **الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله، وتؤمن بالجنة والنار والميزان**... الحديث، وأصله عند مسلم كتاب الإيمان( ٨) ليس فيه ذكر الميزان، ولأبي داود كتاب السنة باب في ذكر الميوان(٤٧٥٥)، من حديث عائشة (**أمَّا في ثلاثة مَواطِنَ لايذكُر أحدٌ أحداً، عند الميزان حتى يعلم أيخف ميزانه أم يثقل**) واتە: لە لای میزاندا هیچ کەسێك ئاگای لە کەسی تر نییە، تا دڵنیا نەبێت ئایا کردەوەکانیان سووك بووە یان قورس، ئیبن و مەردەویە لە

وەدەبێت باوەڕدار ئیمانی دامەزراوبێت کە پردی صیراط (پەڕینەوە) ڕاستەو پردێکە ڕاکێشراوە بەسەر ناوەڕاستی دۆزەخدا، لە شمشێر تیژترەو لە موویش باریکترە[1].

---

تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: (حەزرەتی) عائیشە فەرمویەتی: ئەی خۆشەویستم زانیومانە کە کێشانەکان دوو تای ترازوویان هەیە، لەمیاندا شتێك دادەنرێت و لەویشیاندا شتێك دادەنرێت، یەکێکیان بارسەنگی زیاتر دەبێت و ئەویان نزم دەبێتەوە. وە تورمذیش دەیگێڕێتەوە لە (کتاب صفة القيامة والرقائق والورع) باب ماجاء في شأن الصراط، (٢٤٣٣) وحسنه من حديث أنس: ((**واطلُبني عند الميزان**)) ومن حديث عبدالله بن عمر كتاب الإيمان باب ما جاء فيمن يموت وهو يشهد أن لاإله إلا الله (٢٦٣٩) من حديث البطاقة ((**فتوضع السجلات في كفة والبطاقة في كفة أخرى**...الحديث)). وروى ابن شاهين في كتاب السنة عن ابن عباس: ((**كفة الميزان كأطباق الدنيا**)).

(١) لەمیانی سارای مەحشەرو بەهەشتدایەو، هەموو ئوممەتەکان دەبێ بەسەریدا بپەڕێنەوە، مەزهەبی ئەهلی سوننە وایە، کە لەسەر زاهیری خۆی دەمێنێتەوەو زانیاری لە بارەی حەقیقەتەکەیشی ڕوبەڕوی عیلمی خودا دەکرێتەوە، بەپێی زیادو کەمی بڕواکەیان تەسك و فراواندەبێتەوە، بڕواداری واهەیە کەبەسەریدا تێدەپەڕێت، جەهەنم هاواری لێ هەڵدەستێت: (**یامؤمن جُزْ فإنَّ نُورَكَ قد أطفأ ناري**) واتە: خێرا بپەڕەوە ئەی باوەڕدارا نوورەکەت خەریکە ئاگرەکەم دەکوژێنێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: درێژیەکەی سێ هەزار ساڵە، هەزار ساڵ بەرەو ژور دەڕۆن، وە هەزار ساڵیش بەرێکی دەڕۆن لە ناوەڕاستیدا، وە هەزار ساڵیش دادەبەزن لێی، جوبرەئیل لە سەرەتاکەیەتی، وە میکائیلیش لە ناوەڕاستەکەیەتی، (سەلامی خودایان لەسەر)، وە لە ئەملاو لایدا قولاپی تیا هەڵواسراوە، فرمانیان پێدراوە ئەهلی ئاگر ڕاکێشنە ناویەوە، وە حەوت دەروازەی تایبەتی تێدایە، لە هەریەکەیاندا پرسیاری جۆرێك لە عیبادەتیان لێ دەکەن، وە

پێی کافرەکانی لەسەر دەخلیسکێت و، بە پێی حوکمی خودا شۆڕدەبنەوە بۆ ناو دۆزەخ،وە بە فەزڵی خودایش پێی بڕوادارانی لەسەر ڕاگیر دەبێت و بە سەلامەتی دەپەڕنەوەو بەڕێدەخرێن بەرەو جێگای مانەوەی هەتاهەتایی[1]،

وەدەبێت بڕوای هەبێت بە حەوزی کەوسەر، کە هەموویان دەچنەسەری، کە پێی دەوترێت حەوزی حەزرەتی موحەممەد ﷺ، ئیمانداران پێش ئەوەی بچنەناو بەهەشتەوەو، دوای ئەوەی لە پردی صیراط دەپەڕنەوە لەو ئاوە

---

هەرکەسێك بە گوێرەی کردەوەکانی خۆی خێرا دەڕوات و دەپەڕێتەوە، یان بە خاوی و لە سەرخۆیی، یان دەکەوێتە ناویەوە ، إتحاف السادة ٢/٣٩.

(١) أخرجه الشيخان البخاري، (٧٤٣٨)كتاب التوحيد. باب قول الله تعالى **وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ القيامة ٢٢ .ومسلم كتاب الإيمان، باب معرفة طريق الرؤية(١٨٢) من حديث أبي هريرة (ويضرب الصراط بين ظهراني جهنم ) وورفعه أحمد في مسنده (٢٤٢٨٩)من حديث عائشة، والبيهقي في الشعب، ٣٣٢/١(٣٦٧).**

وەدەبێت بڕوای بە عەرش هەبێت، کە جەستەیەکی گەورەی نوورانی یەو لەبەرزیدایە، گەمارۆی داوە بەدەوری هەموو جیسمەکانی تردا، وەبڕوای بەڕاستی بوونی (کورسی) هەبێت، کە جیسمێکی گەورەی نورانییە، لە بەردەمی عەرشدایەو پێیەوەلکاوەو، لە سەرو ئاسمانی حەوتەمەوەیە، هەروەها دەبێ بڕوای بە (قەڵەم) هەبێت کە زۆر گەورەیەو نوورانییەو . خوا ﷻ درووستی کردووە پێی سپاردووە هەموو شت بنوسێت تا ڕۆژی قیامەت ڕویانداوە یان ڕودەدەن ، هەروەها بڕوای بەوەش هەبێت، چەند مەلائیکەیەك لەدونیادا هەمووشتێکت لە سەر تۆماردەکەن و مەلائیکەی (لەوحی مەحفوز)یش بەهەمان شێوە، وە مەلائیکەی تایبەتیش کە نوسراوەکانیان لە ژێر عەرشدا هەڵدەگیرێت دەبێ باوەڕی بەمانە هەمووی هەبێت.

دەخۆنەوە، هەرکەسێك قومێکی لێ بخواتەوە هەرگیز دوچاری تینوێتی نابێت[١]، پانیەکەی مانگێك ڕێگەیە، ئاوەکەی لە شیر سپی ترە، وە لەهەنگوین شیرین ترە، بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان جام و دەفری جـوانی لێیە، دوو پلـوسکی ئـاوی لەسەرە، لە ناو کەوسەرەوە دەڕژێتە ناویەوە[٢].

وەدەبێت بڕوای بە لێپێچینەوە و لێپرسینەوەی خودایی هەبێت، وە جیاوازی خەڵکی تیایدا، هەندێکی موناقەشە و لێپێچینەوەی لە گەڵدا دەکرێت، وە هەندێکیشی چاوپۆشی لێ دەکرێت، وەهەندێکیان لەو ئاستەدان بەبێ لێپرسینەوە بەرێ دەخرێن بۆ بەهەشت، ئەوانە بە نزیك و موقەڕەبین ناسراون، وە خوای گەورە بە پێی ئارەزوی خۆی پرسیار لە هەندێك پێغەمبەر دەکات دەربارەی گەیاندنی پەیام و ڕیسالەکانیان[٣].

---

(١) أخرجه مسلم كتاب التوحيد....في بيان نزول إنا أعطيناك الكوثر، هو: **(حوض ترد عليه أمتي يوم القيامة آنيته عدد نجوم السماء.**

(٢) له صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هـاتووه : **(حوضي مسيرة شهرٍ، زواياه سواءٌ، ماؤه أبيض من اللبن، وريحهُ أطيب من المسك، وكيزانه أكثر من نجوم السماء، من شربَ مِنهُ لايَظمأُ أبداً)** بنواڕە: إتحاف الساده المتقين ٢/٤٠.

وە لە جامیعی صەحیح دابە ژمارە ٤٦١٤ و ڕیوایەتی تورمزی ژمارە ٢٥٤٢و الصحيحة دا بە ژمارە ٢٥١٤هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

(مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، فِيهِ أَبَارِيقُ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ شَرْبَةً ، لَمْ يَظْمَأْ بَعْدَهَا أَبَدًا.

(٣) أخرجه البيهقي في الشعب،(١٦٢) من حديث عمر فقال: **يارسول الله ﷺ :ما الإيمان ؟ قال: أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله وبالموت والبعث والحساب والجنة والنار والقدر كله**، ومسلم من كتاب الإيمان (٢٢٠) من حديث ابن عباس **(( عرضت على الأمم فقيل: هذه أمتك ومعهم سبعون ألفا يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب).**

وە لە کافرەکانیش دەربارەی بەدرۆخستنەوەیان بۆ پێغەمبەران لە وانەی دەیەوێت پرسیاریان لێ دەکات: وە پرسیاریش لە بیدعەچییەکانیش دەکات دەربارەی سوننەت،[1]

(ئەگەر پێچەوانەی سوننەت ڕایەکیان دەربڕی بێت، یان بیدعەیەکیان دامەزراندبێت، ئەوا ڕادەوەستێنرێن و تۆڵەیان لێ وەردەگیرێت) وە پرسیاریش لە موسوڵمانان دەکرێت لە بارەی کردارەکانەوە.[2] .

وەدەبێت باوەڕی دەمەزراو بێت بە ڕزگاربوونی گوناهبارانی یەکتاپەرستان لە ناو ئاگردا، لەدوای تۆڵە لێ سەندنەوەو پاکبوونەوەیان[3] ، تاوای لێ دێت بە فەزڵی خودا تەنها یەکتاپەرستێك لە ناو ئاگردا نامێنێتەوە، چونکە خودا پەرستەکان بۆ هەتاهەتایی لە ئاگردا نامێننەوە.[4]

---

(١) أخرجه ابن ماجه من حديث عائشة. (في المقدمة باب في القدر): **من تكلم بشيئ من القدر سُئل عنه يوم القيامة** ومن حديث أبي هريرة في المقدمة باب من سنَّ سنَة حسنة أو سيئة. (٢٠٨). (**مامن داع يدعو إلى شيئ. إلا وقف يوم القيامة لازما لدعوة ما دعا إليه. وإن دعا رجل رجلاً** )... وإسنادهما ضعيف.

(٢) أخرجه أصحاب السنن، أبوداود كتاب الصلاة (٢٠٨): ((أبوداود(٨٦٤) والتردذي (٤١٣)، والنسائي( ٤٦٦) ، وابن ماجه (١٤٥٢)، من حديث أبي هريرة (( **إنَّ أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة من عمل صلاته**)) الحديث.

(٣) بۆ بڕواداری گوناهبارکە دەخرێنە ناو ئاگرەوە وەك حافیظی زوبەیدی دەفەرموێت: ئیتر خودا دەیانمرێنێت تا کاتی پاکبوونەوەیان دێتە پێشەوەو دەیانهێنێتە دەرەوە. إتحاف٢/٤٠.

(٤) أخرجه الشيخان البخاري (٧٤٣٨) ومسلم (١٨٢) في حديث طويل ((**حتى إذا فرغ الله من القضاء بين العباد، وأراد أن يخرج برحمته من أراد من أهل النار، أمر الملائكة أن يخرجوا من النار من كان لايشرك بالله شيئاً، ممن أراد الله أن يرحمه، ممن يقول لاإله إلا الله**...الحديث.

وه دەبێت بڕوای تەواوی بە شەفاعەتی پێغەمبەران هەبێت [1]،لەپاشان شەفاعەتی زاناکان و پاش ئەوانیش شەهیدەکان، لەپاش ئەوانیش هەموو ئیمانداراێك، هەریەکە بەپێی پلەی خۆی، یان مەقام و مەنزیلەی خۆی لە حزوری پەروەدگاری، وە ئەگەر کەسانێکیش لە بڕواداران بمێننەوە و کەس شەفاعەت و تکای بۆ نەکردبن، ئەوا بە فەزڵی خودا لە ئاگر دەردەهێنرێن ، وە لەناو ئاگردا بڕوادار بە ئەبەدی نامێنێتەوە، بەڵکو ئەوی مسقاڵە زەڕەیەك لە ئیمان لە دڵیدا هەبێت لەناو ئاگر دەریان دەهێنن[2].

---

(١) شەفاعەت لە زمانەوانیدا بە واتای وەسیلەو داواکردن دێت، لە عورف و زاراوەی شەرعیشدا بە داواکردنی خێر دێت بۆ یەکێکی تر. وەدەبێ بزانیت و بڕوات هەبێت کە پێغەمبەری خۆمان ﷺ شەفاعەت دەکات، وە شەفاعەتیشی لێ وەردەگیرێت، وە لە پێشەوەی هەموو پێغەمبەران و مەلائیکەکانەوە ڕێگەی شەفاعەتکردنی پێ دەدرێت.
وەدەبێت بزانیت: کە گەورەترین شەفاعەتی حەزرەت ﷺ ئەوەیە کە داوا دەکات درێژی ڕۆژی مەحشەر کۆتایی بێت و، لێپرسینەوە دەست پێ بکات، هەروەها لە شەفاعەتکردنی بۆ کۆمەڵێك بۆ چوونە ناو بەهەشت بەبێ لێپرسینەوە، وە هەندێك لەوانەی ئەهلی ئاگرن شەفاعەتیان بۆ دەکات کە نەخرێنە ناوی، وەدەرکردنی یەکتاپەرستەکان لە ناو ئاگردا، وە لە زیادکردنی پلەو مقامی ئەهلی بەهەشت، وەداوای لێ خۆشبوون بۆ هەندێك لە پیاو صاڵحان کە کەموکوڕیان هەبووە لە عیبادەتا، تەنانەت بۆ هەندێك لە بێ باوەڕانیش شفاعەتی وەردەگیرێت، بۆ سووککردنی سزا لەسەریان. وە سزانەدانی منداڵی بێ باوەڕەکان ، وەك ئیمامی سیوطی فەرموویەتی، وەهەرگیز نابێ بیر لەوە بکەیتەوە کە پێغەمبەرمان ﷺ شەفاعەت بۆخاوەنی گوناهی کەبیرە ناکات لە هەموو کاتەکاندا. بۆ زیاتر بنوارە: إتحاف ٤١/٢.
(٢) أخرجه البخاري ٢٤٤/٤ وأبو داود ٤٧٤٠ والترمذي٩٩/٢ وصححه وابن خزيمة ١٧٨-١٧٩ والآجري ٣٤٤ وأحمد ٤٣٤/٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: **"يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ**

وه دەبێت بڕوای وابێت، كه صەحابەی كیرام له هەموان بەڕێزترن، (رضي الله عنهم) وه گەورەترین كەس له دوای حەزرەتی پێغەمبەرەوه ﷺ به پێی ڕێزبەندییه له گەورەو بەڕێزان: ئەبوبەكری صددیق و عومەری كوڕی خەطاب و عوسمانی كوڕی عەفان و عەلی كوڕی ئەبی طالیب،(خوایان لێ ڕازی بێت)وه دەبێت گومانی باش بێت بەرامبەر هەموو صەحابەكان، وه دەبێت ستایشیان بكات وەك چۆن خوداﷻوه پێغەمبەرەكەی و هەموو بڕواداران ستایشی هەموویانیان كردووه .

هەموو ئەمانەی كه باسمانكردن، هەواڵ و فەرموودەیان لەسەر هاتووه، وه ئاساری پێشینەكان شایەتییان له سەر دەدەن، هەركەسێك به دڵنیاییەوه بڕوای دامەزراو بێت پێیان ، ئەوه له ئەهلی حەقق و ڕاستی دەژمێردرێت، وه له كـۆمەڵی سـونتەپارێزو پەیڕەوانـی حەزەتـی پێغەمـبەر ﷺ دادەنرێـت، كه به دڵنیاییەوه جیادەبێتەوه له ئەهلی گومڕاو سەرلێشێواوان و پێڕی بیدعه چییه ناجۆرەكان. داواو نزامان له حزوری خودایه، كه كەماڵی متمانەو یەقینمان پێ ببەخشێت، وه به باشترین شێوه ڕاگیرمان بكات لەسەر پەیڕەوكردنی ئاینی ئیسلام و، بۆ خۆمان و هەمووگرۆی موسوڵمانان به ڕەحم و بەزەیی خۆی، بەڕاستی تەنها خودای میهرەبانه كه سۆزو ڕەحمی له هەموان زیاتره.

وَصلَّى اللهُ عَلَى سَيّدِنا مُحمَّدٍ وعَلَى كُلِّ عَبدٍمُصطَفى

---

**مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدِ اسْوَدُّوا فَيُلْقَوْنَ فِي نَهْرِ الْحَيَاءِ أَوِ الْحَيَاةِ شَكَّ مَالِكٌ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحَبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ ملتوية؟** ".بەم شێوەیەش خودای گەوره لوطف دەنوێنێت و كۆمەڵێكی زۆر ڕزگار دەكات. وەك لەفەرموودەی صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووه: **فيقول الله تعالى شفَعَت الملائكةُ وشفعَت النَّبيُّون وشفع المؤمنون ولم يبق إلا أرحم الراحمين. فيقبض قبضةً من أهل النار فيخرج قوما لم يعملوا خيرا قط** الحديث.. بنواڕه: الإتحاف ٢/٤١.

# بەشی دووەم

## ڕونکردنەوەی باری پلەکاری و

## چۆنیەتی پەلەنەکردن لە بارەی ڕێنومایی و ئیرشادەوە

## وە باسی ڕیزبەندی و یەك لەدوای یەکی پلەکانی بیروباوەڕ

بزانە: ئەوەی باسمان کردووە لە ڕونکردنەوەیەکی کورتی بابەتی پەیوەندار بەعەقیدەو بیروباوەڕەوە، دەبێت هەر لەسەرەتای پێگەیشتنی منداڵەوە بووترێتەوە پێیان، تا بە جوانی لەبەری بکەن و، وەك مەلەکەی لێ بێت بۆیان و، لە ناو دڵیاندا نەقش ببەستێت، لە پاشان بەردەوام لەگەڵ گەورە بوونیدا واتای ئەو وانە عەقیدەییانە لەلای ڕون و ئاشکراتردەبێت، لەسەرەتاوە لەبەریان دەکات و، لە قۆناغی دووەمیشدا لێیان تێ دەگات و، دواجاریش بڕواو متمانەی لەسەری دەبێت و هەمیشە پشت ڕاستی دەکاتەوە، ئەم ئەندازەیە بە بێ بەڵگە بۆ منداڵ و نەخوێندەواریش پەیدا دەبێت.

یەکێ لە دیاریترین فەضڵی خودا بەسەر بەندەکانیەوە ئەوەیە کەوا:

هەر لەسەرەتای گەشەکردنی بڕواوە لە دڵیاندا، دڵ و سینەیان گوشاد و فراوان دەکات، بێ ئەوەی پێویستییان بە نیشانەو بەڵگە هەبێت.

چۆن نکولی لە ڕاستی ئەم دەستەواژەیە دەکرێت، کە دەزانین تێکڕای بیروباوەڕی عەوام و بنەماکانی تێگەیاندنیان تەنها لەسەر تەڵقینکردن و شوێنکەوتن و تەقلیدکردنە و بەس؟!

بەڵێ، ئەوەش ڕاستە کە ئەو بیروباوەڕەی تەنها بە هۆی تەقلیدو شوێنکەوتنەوە پەیدادەبێت، لە سەرەتاوە خاڵی نییە لە جۆرێك لاوازی، بەو

مانایەی کە ئەگەر دژەکەیی بۆ باس بکرێت، بیروباوەڕە پێشووەکە دەسڕێتەوە لە مێشکیدا، بۆیە پێویستە ئەو بڕوایە لە ناخی منداڵ و نەخوێندەوارەکەدا بەهێز بکرێت، تا جێگای خۆی دەکاتەوە و هیچ لەرزەیەکیش نایهەژێنێت.

وە ڕێگەی پێ سەلماندنی بڕوا و بەهێزکردنیشی، ئەوە نییە کە فێری زانستی کەلام و دەمەدەمێ و قسەکردنی بکرێت، بەڵکو دەبێت زیاتر ئاشنای فێربوونی قورئان و تەفسیری ئایەتەکان و خوێندنەوەی فەرموودەکان و واتاکانی ببێت، وە سەرقاڵی بکەن بە ئەنجامدانی فەرمانی بەندایەتی، تا بە بەردەوامی و بەهۆی ئەوەی کە گوێی هەمیشە دەزرنگێتەوە بە قورئانی پیرۆز و حوججەو بەڵگەکانیەوە، بیروباوەڕیشی لە بەهێزی و جێگیربووندادەبێت و زیاتریش سوودمەند دەبێت بەو هەموو بەڵگانەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە بۆی باس دەکرێت و لێی بەهرەمەند دەبێت، لەگەڵ داباریی ئەوتیشکە نوورانییەی بەهۆی بەندایەتی و ئەنجامگەیاندنی فرمانەکانەوە دڵی دادەگرێت و، ڕوخسار یشی جوان و نوورانی دەکات، (وەك دەڵێن: ئەوەی عیبادەتی شەوی زۆر بێت، ڕوخسارو ناخی دڵیشی جوانتر دەبێت) هەروەها بەهۆی ئەو هەموو بینین و بەیەکەوە بوون و هاونشینییەی لەگەڵ پیاوچاکاندابووە، وە بینینی ڕوخسارو سیمای صاڵحان و هەڵس و کەوتکردن و گوێبیستی فەرموودەکانیان، کە کاریگەری زیاتریان لەسەر درووست دەکات، بۆ زیادبوونی گەردنکەچی لە حزوری خوداداو، زیادبوونی ترس و خۆف و گەڕانەوە بۆ حزوری ئەو، کە بەڕاستی لەگەڵ یەکەم تەڵقینی ئیمانیدا، وەك وەشاندنی تۆوی بڕوایە لەناو سینەیاندا، وە ئەم هۆکارانەش وەك ئاودێری دەرون و پەروەردەکردنیەتی، تا ئەو تۆمە پێدەگات و بەهێز دەبێت، وەدەبێتە درەختێکی پاك و پوختی دامەزراو، کە بنەڕەت و بنەماکەی جێگیرە و لق و پۆکانیشی لە ئاسماندایە.

وە پێویستە بە ئەوپەڕی توانا منداڵ و نەخوێندەوار بپارێزرێن، لەوەی کە گوێ

بیستی دەمەقاڵێ و قسەبەزۆراندان و دەمەدەمێ بین، چونکە بەڕاستی ئەوەندەی بەهۆی جەدەل و دەمبازییەوە سەریان لێدەشێوێت، زۆر زیاترە لەوەی کە ڕێنوێنیان دەکات، وە ئەوەندەی کە حاڵیان تێکدەدات، زیاترە لەو ئەندازەی کە چاکیان دەکات.

(لەوانەیە ئەو ڕق و کینەی بچێتە ناو دڵیەوە، ماوەیەکی زۆری بوێت تا سارێژ ببێت و وەك خۆیی لێ بێتەوە)، بەڵکو بەهێزکردنی دڵیان بە هۆی فێربوونی دەمبازی و موجادەلەوە، وەك ئەوە وایە کە درەختێك بە ئاسن بزمارڕێژ ی بکەیت و، واش بزانیت کە چاکت کردووە، کە زۆر لەوانەیە پرت و بڵاوی بکات و بیپوکێنێتەوەو لەیەکی بترازێنێت و، زیاتریش بەرەو فەوتانی ببات، ئەوەش کە بەچاوی خۆت دەیبینیت لەوە ڕون و ئاشکراترە کە بەڵگەی بوێت.

فەرموو عەقیدەو باوەڕی تەقواکار و پیاوصاڵحێکی نەخوێندەوار لەو ڕەشە خەڵکە، بیپێوە بە بیروباوەڕی زانایەکی زانستی کەلام و موجادەلەچییەکان، دەبێنیت بە دڵنیاییەوە عەقیدەی کابرای عەوام لەڕوی بتەوی و خۆڕاگرییەوە، وەك چیابەرزە سەرکەشەکان وایە، کە سەختی و هەورەگرمەو مەترسییەکان نایلەرزێنن، وە بیروبڕوای ئەو زانا موتەکەللیمەی کە بڕواکەی بەهۆی بەشەکانی زانستی جەدەل و دەمەدەمێوە دەپارێزێت، وەك دەزوویەك وایە کە هەوا یاری پێ بکات و، دەمێك بەملاو دەمێکیش بەولایدا ببات، کە لە ئەوپەڕی بێ هێزی و لاوازیدایە، مەگەر کەسێك بەڵگەی تەواوی بیروباوەڕی لێ بیستبێتن، ئەویش بە تەقلیدو شوێنکەوتن بەڵگەکەی لێ وەرگرتبێت، وەك چۆن ئەصڵی عەقیدەکەیشی بە شوێنکەوتەیی وەرگرتووە، چونکە هیچ جیاوازییەك نییە لە تەقلیدکردندا، لە میانی کەسێکدا کە فێری بەڵگەکە بووبێت، یان فێری واتاو ناوەرۆك و مەبەستی بەڵگەکە بووبێت، (کە پێی دەوترێت مەدلول، ئەوەی کە بەڵگەکەی لەسەر ڕاوەستاوە)کەواتە جیاوازی هەیە لە میانی کەسێکدا کە

بەڵگەکەی دەخرێتە بەرچاوو فێری دەکرێت، وەکەسێکیش کە ڕاستەوخۆ بەڵگەی بۆ بهێنێتەوەو بەهۆی سەرنجدانی خۆیەوە بەڵگەی تر بدۆزێتەوە، کە ئەم دووبابەتە دوورن لەیەکەوە.

# منداڵ و پەروەردەبوون

لە پاشان بزانە: کە ئەگەر منداڵ لە سەر ئەم بیروباوەڕە پەسەندە دڵی دامەزرا و گەشەی کرد، ئەگەر خۆی سەرقاڵی کەسابەتێکی دونیایی بکات، (بۆ نموونە: وەك بازرگانی و جوتیاری) ئەوا جگە لەو کارەیە، هیچ دەروازەیەکی تری لەسەر ناکرێتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە لە دواڕۆژدا دووچاری هیچ کێشەیەك نابێت و، لە سەر عەقیدەی ئەهلی ڕاستی حەشر دەکرێت، چونکە عەرەبە دەشتەکییە وشکە خێڵەکییەکان، تەنها ئەوندەیان لێ داوادەکرا، کە بڕوای تەواویان هەبێت بە زاهیری ئەو بیروباوەڕانە، ئیتر لەمە زیاتر داوای هیچ جۆرە باس و لێکۆڵینەوەو بەڵگەهێنانەوەیەکیان لێ نەکراوە.

وە ئەگەر ئەو کەسەیە ویستی ڕێگای بەختیاری دواڕۆژ بگرێتە بەر و، تەوفیق و یارمەتی خودایشی بۆ کەوتە کار ، وە دەستی بەکار و هەوڵدانکردوو، ڕێگای تەقواکاری گرتەبەر و، ڕێگری کرد لە نەفسی خۆی کە شوێن هەواو ئارەزوات بکەوێت، وەخۆی خەریك کرد بە موجاهەدەی نەفس و ڕیازەتکێشانەوە، ئەوا دەروازەی ڕێنومایی لەسەردەکرێتەوە، ئەوا بەهۆی ئەو ڕیازەت کێشان و هەوڵدانەوە، نوورێکی خودایی دەهاوێژرێتە ناو دڵیەوەو، ڕاستی نهێنیەکانی ئەو عەقیدە درووستەی بۆ ئاشکراواو نمایان دەبێت و، بەڵێنەکەی خودای (عزَّوجَلّ)ی بە دەستەڵاتی بۆدێتەجێ کە فەرموویەتی:

﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ عنكبوت٦٩.

(واتــە: ئەوانەی لەڕێگای ئێمەدا تێکۆشان و خوداپەرستــی ڕاستیـــان کــردووە و ئێمە لەپاداشـــتی چاکەیاندا شـــارەزای ڕێگاکانی خۆمانیان

دەکەین[1]،

گەیشتن بەم مەقامەش، بەهادارترین گەوهەری گرانبەهایە، کە دەسخستنی، نەوپەڕی ئومێدو بڕوای صددیق و ڕاستگۆو نزیکانی دەرگای خودایە، هەر بۆ ئەمەشە کە هێما کراوە بەو سیرەی کە خراوەتە ناو دڵی حەزرەتی ئەبوبەکرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە بەهۆیەوە فەزڵی هەیە بەسەر هەموو کەسێکدا[2].

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی/٤٠٤ ملا عبدالكريم مدرس چاپی ئارا.

(٢) دوای پلەی ئیمانی ئاسایی، ئیمانی متمانەدارییە، بەبەڵگەو ڕاستەقینە دێتە پێشەوە، لە پاش ئەمەیش قۆناغێکی بەهێزترە لە ئیمانداری و، بۆ ئەوانە پەیدا دەبێت کە ڕیازەتی تەواویان کێشاوە وەك ئیمامی غەزالی باسی کردوون، کە پێیان دەوترێت:

**موقورەبین:** کە پلەی سێیەمی مەقامی تەوحیدیان بڕیوە، ئەمانە چاویان بە پوچەڵی و بێ بەهایی دونیا بڕیوەو، دەزانن کە زۆر پێویستیان بە خودایەو، بە بڕوای دڵیان خودایان پێ بینیوە، بە غەیب و نادیاری ڕۆحەکانیان چاویان بەخودا کەوتووەو، بە سیری شاراوەی ئیمانیان، جوانی جەلالی خودایان پێ بینیوە، بەپێی صەفای دڵ و ڕاستی و پلەی مقام بەرزییان لە یەقیندا، تا بێت لە نزیك بوونەوەدان لەحزوری پەروەردگاریاندا.

**صددیقەکان**: پلەی ئەمانیش لە غۆناغی چوارەمی یەکتاپەرستی دان، ئەمانە خودایان بینیوە و لە پاشاندا شتەکان دەبینن، لەهەردوو دونیادا جگە لە خودا هیچی تر نابینن، بوونی ڕاستەقینەیان لەهیچ بوونەوەرێکدا بەرچاو ناکەوێت جگە لە خودا نەبێت، موریدەکانیش دەبێت پلەی موقورەبین ببڕن، لە دواییدا بەرزتر ببنەوە بۆ پلەی ڕاستگۆیان و صددیقەکان.

**مورادەکانیش**: زیاتر لە پلەی چوارەمی ئیمانی ئەهلی تەوحیدەوە دەست پێدەکەن، هەموو پلەبەرزەکانیش لەناو ئەواندا دیاریدەکرێت، وەك: قوطب و ئەوتادو ئەبدالەکان. وە خاوەن مەقامەکانی : نوقەبا و نوجوبا و شوهەدا وصاڵحەکانیش لە ئیماندارانی پلەی سێیەمی موقورەبین دابین دەکرێن. بنوارە: إتحاف ٤٦/٢.

وه ئاشکراکردنی ئەو سیڕەیە، بەڵکو هەمووسیڕو نهێنیەکان، هەریەکەیان بە پێی ئاستی موجاهەدە و تێکۆشان، پلەی باطین و شاراوەیان دەبێت، لە پاکوخاوێنی دەروون و گیان و ڕۆحیان و، خاڵییان بکەنەوە لەغەیری خوداو هەموو (ماسوی الله)، وە ڕۆشنیان بکەنەوە بە نووری متمانەو ئەقڵ و مەعریفەتەوە (وە ئاوەدانکردنەوەی سیڕی دڵیان بە بینینی خۆشەویستە کەیان) ئەمەش وەك جیاوازی پلەی زانستی خەڵکییە، لە شارەزاییان لە نهێنیەکانی پزیشکی و، زانستی فیقهو پاشماوەی زانستەکانی تر، ئەم ئاستەش جیاوازە بە پێی جیاوازی ئیجتهاد و تێکۆشان و، جیاوازی فیطرەتی هەرکەیان و، زیرەکی و بیرتیژییان لەگەڵ یەك، وەك چۆن ئەو جۆرە پلەو ئاستانە سەرژمێرناکرێن، هەروایش ناتوانین جیاوازی لە نێوانی پلەی خاوەن پلە ئیمانییە بەرزەکاندا بکەین[١]

---

(١) پـوختەی قسـە ئەمەیە: کە منـداڵ و عەوام نابێـت لەوە زیاتریـان پـێ بووترێـت دەربـارەی ئەو عەقیـدەیە کەباسـمانکردن، نەکەم و نەزیـادیش کە سـەریان لـێ بشـێوێت، وە بە پێـی ڕای درووسـتی ئەهلی حەق، کە هەمـوان لەسـەری هـاوڕان و مەزهەبی سەلەفیشە، کە دەبێت نەخوێندەواران وعەوامەکان لەبارەی بیروباوەڕەوە بڕوادار بن بە حەوت خاڵ و پێیشی ئاشنابن:

**یەکەم**: تەقـدیس و تەنزیهـو دورخسـتنەوەی خـودا لە هەمـوو شـتێك کە بـۆنی تەن و جەستەو هاووێنەکانی بدات.

**دووهەم**: تەصدیق و باوەڕ کردن بە هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا.

**سێیەم**: دەبێـت دان بنێـت بە نەتـوانینی خۆیـدا، کە ئەوەی دەیەوێت بیزانێـت لە سـەرو توانای خۆیەوەیەتی و دوورە لە پیشەو ئاستی ئەو.

**چـوارەم**: دەبێـت بێـدەنگی هەڵبژێرێـت و. لەهەمـوو واتـایەك نەکۆڵێتەوەو . ڕۆچـوون لەو بابەتانە بە بیدعەیەکی خراپ بزانێت، کە لەوانەیە تووشی کوفرو لەڕێلادانی بکات.

# پرس و ڕونکرنەوەیەك

## دەربارەی حوکمی فێربوونی جەدەل و زانستی کەلام

ئەگەر بڵێیت:

فێربوونی شەڕەقسە و زانستی کەلام ئایا وەك فێربوونی ئەستێرەناسی نەشیاوو ناپەسەندە، یان ئاساییەو دروستە، یان کارێکی پەسەندو باشە؟

کەواتە بزانە: بەڕاستی خەڵکەکە لەم بارەوە لەسنووریان تێپەڕاندووە و، لە حەقی خۆی دوورکەوتوونەتەوەو، هەریەکە کەوتۆتە کەنارێکەوە:

هەیە دەڵێت: ئەوە بیدعەو داهێنانێکی حەرامە، ئەگەر بەندە بێجگە لە شەریك بۆ خودا بڕیاردان بەهەر گوناهێکی تر بەخوادا بگات، بە قەدەر ئەوە گوناهبار نییە کە بە گوناهی زانستی کەلامەوە پێی گەیشتبێت.

هەشیانە دەڵێت: فێربوونی زانستی کەلام فەرزەو دەبێ بزانرێت، یان بە فەرزی کیفایە، کە ئەگەر کۆمەڵێك پێی هەستان لەسەر ئەوانی تر دەکەوێت، یان بە فەرزی عەین، کە دەبێت هەموان فێری ببن، وە گەورەترین کردارەو مایەی زۆر نزیك بوونەوەیە لە خوداوە، چونکە جێ بەجێ کردن و جەسپاندنی زانستی تەوحید و یەکتاپەرستییە، وە بەرگریکردنیشە لە دینی خودا.

---

**پێنجەم:** دەبێ بە خۆبەسەری گۆڕین و دەسکاری ئەو وتەو زاراوانە نەکات کە بۆی دانراوە و نەزیادو نەکەمیان بکات و نەدەسکاریشیان بکات.

**شەشەم:** دەبێ وازبهێنێت لە هەمووڕوویەکەوە تەنانەت لەڕوی دەروون و باطینیشیەوە لە باسکردن و بیرلێ کردنەوەو دەستێوەردانی ئەو وتانەی بۆی دیاری کراوە.

**حەوتەم:** دەبێت تەسلیمی ئەهلی خۆی ببێت و بشزانێت کە ئەگەر خۆی ئەو نهێنیانە نەزانێت، ئەوا لە خۆی لەپێشتر هەیە کە حەزرەتە ﷺ دەیزانێت و پێی تەسلیم بێت. وەك لە ئیتحافدا باسی کردووە، إتحاف ٤٦/٢.

# پێڕی یەکەم کە جەدەلیان حەرام کردووە

بەلای ئیمامەکان (ئەبوحەنیفەو) شافیعی و مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و سوفیان و هەموو زانایانی ئەهلی حەدیسەوە فەرموویانە حەرامە.

کوڕی عەبدی ئەعلا (رحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: بیستم لە شافیعی (رضي الله عنه)ئەو ڕۆژەی مونازەرەی لەگەڵ (حەفصی فەرد)دا دەکرد کە لە زانایانی موتەکەللیمین بوو(١)، فەرمووی: ئەگەر بەندەیەك بەهەر گوناهێکی گەورە بەخودا بگات بێجگە لە شەریك بۆ خودا بڕیاردان، باشترە بۆی لەوەی کە پێی بگات بە لە زانستی کەلام، بەڕاستی قسەیەکی وام لە حەفص بیستووە، هەرچی دەکەم ناتوانم باسی بکەم!!(٢) وە دەیفەرموو:

هەندێك ڕای ئەهلی کەلامم بیستووە و ئاگاداریانم، هەرگیز بڕوام نەدەکرد بەو شێوە قسەبکەن، بەڕاستی جگە لە شەریك بۆ خودا بڕیاردان، هەر بەندەیەك بەهەر گوناهێکی ترەوە بگات بە خودا باشترە لەوەی کە خۆی سەرقاڵی عیلمی کەلام کردبێت! هەروەها کەرابیسی دەیگێڕێتەوە (٣)،کە حەزرەتی شافیعی (رضي الله عنه) لە بارەی هەندێك پرسی کەلامەوە پرسیاری لێکرا، توڕەبووفەرمووی:

---

(١) فەرد: واتە بێ هاوتا لە زیرەکیدا، لە ئەبوو یوسفەوە فێری (فیقە) بووە، لە پاشان بوو بە موعتەزیلە و لە حەق لایدا، وای لێهات بەناوی ئەوانەوە قسەی دەکردو بەرگری لە بیروڕای موعتەزیلەکان دەکرد، ڕەبیع دەفەرموێت: شافیعی پێی دەووت (مونفەرید) واتە: تاك کەوتو و تاکڕەو، نەك فەرد. إتحاف ٤٧/٢.

(٢) کە باوەڕی وابوو پەنا بەخودا قورئان مەخلوق و پەیدابووە ، کە بەندەی پێ کافر دەبێت. بنوارە: جامع بيان العلم وفضله ١٧٨٨.

(٣) حوسەینی کوڕی عەلی کەرابیسی لە زانا موتەکەللیمەکانی ئەهلی سوننە بووە، مامۆستای عیلمی کەلام بوو، وەك چۆن مامۆستای زانستی فیقە و حەدیس بوو، ئیمام ئەحمەد ڕەخنەی لێ دەگرت بۆیە خەڵکەکە زۆر گوێیان بۆ نەدەگرت. إتحاف ٤٨/٢.

لەمبارەوە پرسیار لەحەفصی فەردو هاوڕێکانی بکەن خودا ڕسوایان بکات!(١)

وەلە کاتێکدا شافیعی (خوای لێ ڕازی بێت)نەخۆش کەوت، حەفصی فەرد چووە ژوورەوە بولای و وتی: من کێم؟ فەرمووی تۆ حەفصی فەردی خودا نەتپارێزێت و چاودێریشت نەکات تا لەو قسانەت پەشیمان دەبیتەوە(٢).

دیسان دەفەرموێت: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە چ هەواو ئارەزواتێك لە کەلامدا هەیە، ئەوا چۆن لە شێر ڕادەکەن ئاوا لە عیلمی کەلام ڕایاندەکرد(٣)

دیسان فەرموویەتی: ئەگەر بیستتان یەکێك دەیووت: ئیسم واتە: (ناو) عەینی موسەمماو ناوبراوەکەیە، یان غەیری ناوبراوەکەیە، ئەوە شایەتی بۆ بدەن کە لە ئەهلی کەلامە و شایەتی بێدینیشی بۆ بدەن.(٤)

حەسەنی کوڕی عەلی زەعفەرانی دەفەرموێت: شافیعی فەرموویەتی:

حوکمی من بەسەر ئەوانەدا کە خۆیان سەرقاڵی عیلمی کەلام دەکەن:

بۆ ئەدەبدادانیان دەبێت بە لاسکی خورما لێیان بدرێت، وە بیانگێڕن بە دەوری هۆزو عەشرەت و تیرەکاندا، ڕایبگەیێنن کە ئەمە تۆڵەی ئەو کەسەیە کە وازی لە کیتاب و سوننە هێنابێت و دەستی بە عیلمی کەلامەوەگرتبێت(٥) .

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویەتی: هەرگیز سەرفراز نابێت ئەوەی خەریکی عیلمی کەلام دەبێت، وە هەرچی سەرنجم داوە: کەم وادەبێت یەکێك لەوانە ببینیت کە سەرقاڵی کەلامن و، گەردو فەساد ڕوی لە دڵیان نەکردبێت.

ئەوەندە بەخراپی باسی ئەوانەی دەکرد کە خەریکی کەلام بوون، تەنانەت

---

(١) جامع بيان العلم .....١٧٨٩

(٢) هەمان سەرچاوە /١٧٩٠.

(٣) هەمان سەرچاوە /١٧٩١.

(٤) هەمان سەرچاوە /١٧٩٢

(٥)هەمان سەرچاوە /١٧٩٣

ئیمام حارسی موحاسیبیش کە شێخی جونەیدی بەغدادییە و خاوەنی زوهدو خۆپارێزییە، لەبەر ئەوەی کتێبێکی دانابوو ڕەددی بیدعەچییەکانی دابوویەوە(١)

وەپێی دەفەرموو: مەگەر تۆ لە پێشەوە باسی بەڵگەو قسەو شوبهەکانی ئەوان ناکەیت و لە پاشان ڕەدیان دەدەیتەوە؟ ئیتر خەڵکی ناچاردەکەیت کە سەرنجی بیرو ڕای ئەوان بدەن و، بیر لە قسەکانیان بکەنەوە کە زیاتر ڕایاندەکێشێت بو باس و لێکدانەوە و ڕادەربڕین لە سەری (٢).

هەروەها ئیمامی ئەحمەد (رضي الله عنه)دەیفەرموو: زانایانی عیلمی کەلام زیندیقن و لەدین دەردەچن.

وەئیمامی مالیکیش (رضي الله عنه) دەیفەرموو: باشە ئەگەر کەسێك هات لە شەڕەقسەدا لەوەی پێشو سەرکەوتو و دەمباز تربێت ، ئایا دەبێت هەموو ڕۆژێك واز لە ئاینەکەی بهێنێت بۆ ئاینێکی نوێ؟! واتە قسەی ئەهلی جەدەل بەیەك شێوە نامێنێتەوە(٣). هەروەها ئیمام مالیك(رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: نابێت شەهادەتی ئەهلی بیدعەو ئارەزوو پەرستانوەربگیرێت.

---

(١) بۆ ڕەددی موعتەزیلەو ڕافیزەکان، بۆیە ئینکاری دەکردن، دەترسا کە سەربکێشێت بۆ خراپتر.

(٢) اللالکائي ریوایەتی کردووە، بنوارە : (إعتقاد أهل السنة)٢٩٤. ئەمانە سەرکردەی خواناسانن، بەڵام هەریەکەیان جۆرێك دڵسۆزییان دەربڕیوە،ئەینا گومانی باشمان هەیە بە ڕاو هەڵوێست و نوسینەکانی ئیمامی موحاسیبی،ئەویش مەبەستی ڕەددانەوەی ئەو گومڕایانەبووە، کە لە دواییدا زانا و واریع و تەقواکارەکانیش هەموو ناچار بوون کە بەرپەرچی ڕافیزی موعتەزیلەکان بدەنەوەو. وەك و موحاسیبی دەیان نوسراویان لەسەر بنووسن، کەواتە هەریەکەیان بە گوێرەی نییەتی پاکی خۆیان پاداشتیان وەرگرتووەو کەسیان نییەتی خراپیان بەرامبەر ئەوی تر نەبووە بۆ زیاتر . بنوارە: إتحاف ٤٩/٢.

(٣) واتە پشت بەڕاو بۆچونیان نابەسرێت، چونکە هەموو ڕۆژێك بە پێی بەڵگەو قسەی نوێ هەڵوێستەکانیشیان دەگۆڕن،ئەگەر ڕایەکی بەهێز ترهات پێشووەکە لادەدەن،

(ئەگەر بیدعەکەیان سەر لە کوفرەوە دەربکات)(١).

هەندێك لە هاوڕێکانی لە بەیانی مەبەستەکەیدا فەرموویانە:

مەبەستی بە ئەهلی هەواو ئارەزوات ئەوانەن: کە ئەهلی کەلام و شەڕەقسە و دەمەدەمێن، ئیتر لەسەر چ مەزەبێك بن جیاوازی نییە.

ئەبو یوسفیش(خوای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی: هەرکەسێك لەڕێگەی عیلمی کەلامەوە بیەوێت زانستی وەربگرێت، ئەوە دەبێتە کەسێکی بێ دین و زەندیق(٢).

حەزرەتی حەسەنی بەصری (خوای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی:

لەگەڵ ئەهلی هەواو ئارەزواتدا دامەنیشن، شەڕەقسەیشیان لەگەڵدا مەکەن، وە گوێیشیان لێ مەگرن (٣) وقسەکانیان زیانبەخشن.

هەموو ئەهلی حەدیس لە زانایانی سەلەف هاو ڕان لەسەر ئەمەی کە باسمان کرد، وە تەنها ئەوندە نییە کە بە توندی و هەڕەشەوە باسی خراپەی زانستی کەلام کراوە، وەدەڵێن:

بۆیە صەحابەی کیرام بێدەنگ بوون لە باسکردنی ئەم زانستە، لەگەڵ ئەوەشدا شارەزاتربوون بە حەقیقەت و ڕاستیەکان، وە زوبان پاراوتریش بوون لە خەڵکی تر لە ڕێکخستنی وتەو ڕستەکان، چونکە زانیویانە کە شەڕێکی خراپی لێ دەبێتەوە، هەربۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

---

وەك ئیسحاقی کوڕی عیسا دەیگێڕێتەوە کە ئیمامی مالیك دەفەرموێت: ئایا دەبێت وامان لێبێت هەرجارێك یەکێکی بەهێزترمان بۆ هات لە جەدەل و دەمبازیدا بەهێزتربوو لە پێشووەکە ئیتر ئێمە واز لەو دینە بهێنین کە جوبرەئیل (علیه‌السلام) لە ڕێگەی حەزرەتەوە پێی گەیاندوین. إتحاف ٤٩/٢.

(١) جامع بيان العلم وفضله. (١٨٠٠)

(٢) قوت القلوب ١٣٩/١.

(٣)الدارمي ریوایەتی کردووە لە (السنن) (٤١٥)وە: ابن عبدالبر لە (الجامع دا ١٨٠٣).

((هَلَكَ المُتَنَطِّعونَ، هَلَكَ المُتَنَطِّعونَ، هَلَكَ المُتَنَطِّعونَ ))(١)، واتە: بەهیلاکدا چوون و فەوتاون، بەهیلاکدا چوون و فەوتاون، بەهیلاکدا چوون و فەوتاون، ئەوانەی کە بە قووڵیی دادەچن و ئەو پەڕی توانا بەکار دەهێنن و دەگەڕێن بەدوای باس و خواسەکاندا(٢).

---

(١) موسلیم ریوایەتی کردووە (٢٦٧٠). لە فەرمودەی ئیبن و مەسعودەوە.

(٢)نەهی کراوە لە دەمپانکرنەوەو درێژدادڕی لە قیرائاتی جیاوازی قورئاندا، ئیمامی نەوەویش دەفەرموێت: کەراهەتی هەیە بەقووڵی بچیتەناو وتووێژو، پڕبەپڕی گەرووت قسەبکەیت و. بەزۆر فەصاحەت و ڕەوانبێژی بهێنێت بەسەر قسەکانتداو، وشەی شازو نامۆو گران بەکاربهێت، بەتایبەتی کە لەگەڵ نەخوێندەوارو عەوامەکاندا قسەدەکەیت. هەندێکی تر دەفەرمووون: مەبەستی فەرموودەکە ئەوانەن، کە ڕۆدەچن لە باس و بابەتێکدا کە پەیوەندی بەوانەوە نییە، یان لە پرس و بابەتە قورس و گرانەکاندا پرسیاردەکەن، یان زۆر خۆیان دەشکێننەوە لە بەندایەتیداو. وەسوەسەیش سواری ملیان بووە.

ئیبن و حەجەری عەسقەلانی دەفەرموێت: هەندێك لە زانایانی ئەهلی تەحقیق فەرموویانە:

**باسکردن لەوبابەتانەی دەقێکیان لەسەر نەهاتووە دووبەشە:**

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە بگەڕێت بە دوای دەلالەتی نەصەکەدا، کە بزانیت ئەودەقە لە ناو واتا جیاوازەکاندا چی دەگەێنێت و کام واتایانی مەبەستە. ئەوە کارێکی باش و پەسەندە. نەك مەکروە بێت، بەڵکو لەوانەیە بۆ هەندێکیش فەرزبێت کە بەم شێوە لەسەری بدوێت.

**دووهەم:** ئەوەیە کە بەوردی سەرنج بدات لە جۆری شێوە جیاجیاکان، کە جیاوازی بخاتە میانی دوو نموونەی هاووێنەوە، بە جیاکارییەك کە لەسەر هیچ بنەمایەکی شەرعی نەبێت، کە دەشگونجا بەوەصفێکی تایبەتی هەردوو بابەتەکە کۆبکرێتەوە بەیەکەوە، یان بە پێچەوانەی ئەم نموونەوە، کە دوو شتی جیاواز کۆبکاتەوە بە وەصفێکی طەردی، کە زانایانی سەلەف زەمیان کردووە، واتای (هَلَكَ المُتَنَطِّعُون)یان بەو شێوە لێکداوەتەوە. کە زایەکردنی کاتە زترپنەکانی ژیانە، بە باسی لابەلا، یان دەیان لق و پۆ لە تەنها مەسەلەیەك بکاتەوە، کە هەندێکیان تا کۆتایی زەمان لەوانەیە لە واقیع و ڕاستیدا نەیەتەدی، کە لە کیتاب و سوننەت و ئیجماعدا باسیان نەهاتووە، یان باسی چەندین بابەت بکات کە لەشەرعدا فرمان دراوە کە بڕوامان پێیان هەبێت، بەڵام باسی چۆنیەتیی ئەو بابەت و بڕوابوونە

وه ئەوەشیان بە بەڵگەداناوە کە ئەگەر ئەو بابەتی (کەلامە) بەشێك بوایە لە دین، ئەوا گرنگترین فرمان دەبوو کە پێغەمبەر ﷺ بایەخی تەواوی پێدەداو، فێری خەڵکی دەکردو، ڕێنمایی لەسەر بڵاودەکردەوەو ستایشی کارەکە و هەڵگران و لایەنگرانیشی دەکرد، دەزانین خودا ﷻ خەڵکەکەی فێری خۆپاککردنەوەکردووە، **علَّمَهُمُ الإستِنجاء**(١)، **ونَدَبَهُم إلى حِفظِ الفَرائِض وأَثنى عَلَيهِم**.(٢) ، واتە: هانی خەڵکەکەی داوە کە فێری زانستی میراتگری (عیلمی فەرائیز) ببن و لە بەری بکەن(٣) ، وە نەهی لێ کردوون و ڕێگەی پێنەداون باسی

---

نەکراوە، وە زۆر بابەتی تر کە پێویستە بڕوامان پێیان هەبێت و نابێت بچینە درێژی باسکردنیانەوە. بۆ زیاتر ڕوونکرنەوە بنوارە: إتحاف ٢/٥٠.

(١) فيما اخرجه مسلم في صحيحه عن سلمان رضى الله عنه (٢٦٢)باب الإستطابة

(٢) كما في الترمذي (٢٠٩١)، وابن ماجه (٢٧١٩).

(٣) فەرمودەی :(**وندَبهُم إلىَ علِمِ الفَرائِض**) فيما أخرجه ابن ماجه والحاكم والبيهقي عن أبي هريرة رضي الله عنه **تعَلَّمُوا الفَرائِضَ وعلِّموهُ الناس فإنَّه نِصفُ العِلم وهُوينُسَى، وهُو أول شئ ينزَع مِن أُمَّتى**. واتە: فێری زانستی فەرائیز ببن (بەشکردنی میرات)، وەخەڵکیشی لێ فێربکەن، ئەوە نیوەی زانستەو هەرزوو لەبیردەکرێت، یەکەم شتە لەناو نوممەتەکەمدا هەڵدەگیرێت. قال الحافظ الذهبي: فيه حفص بن عمر ابن أبي العطاف واهٍ بمرة، وقال ابن حجر الحافظ مداره على حَفص وهُو متروك، وقال البيهقي تفرَّد به حَفص وليس بقَوي، وفي رواية: **فإنَّه من الدِّين**، وأخرج أحمد والترمذي والنسائي والحاكم وصحيحه بلفظ: **تعلَّموا الفَرائِض وعَلِّمُوها الناس، فإني امرؤٌ مَقبُوضٌ، وإنَّ العِلمَ سَيُقبَضُ حتىً يَختلِفَ اثنانِ في الفَريضةِ فلا يَجدان مَن يَفصِلُ بَينَهُما**. واتە: فێری بەشکردنی میرات ببن و خەڵکیش فێر بکەن، من کەسێکم کە خودا دەمباتەوە ڕۆحم دەکێشێت، وە ئەو زانستەش هەڵدەگیرێت و تاوای لێ دێت دووکەس لە دابەش کردنی بەشە میراتدا جیاوازی دەکەوێتە میانیانەوە و کەسیش نییە کە پێکیان بهێنێت. قال الحافظ في الفتح: رواتُهُ مُوثَّقون إلا أنه اختلف فيه على عوف الأعرابي، وأخرج الترمذي من حديث انس:

قەزاو قەدەری خودایی بکەن، وە فەرموویەتی: أَمسِكوُا واتە: باسی قەدەری خودا هاتە پێشەوە خۆتان بگرن و تێکەڵی ئەوباسە مەبن و بێدەنگ بن(١).

وە لەسەر پەیڕەو کرنی ئەم ڕێبازە درووستە صەحابەکان (رضي الله عنهم) بەردەوام بوون، هەرکەسێك بەسەر مامۆستادا شت زیاد بکات، ئەوە بە یاخی بوون و ستەم دەناسرێت، ئەوان مامۆستاو پێشرەوی خێری ئێمەن، ئێمەش شوێنکەوتەو شاگردی ئەوانین.

---

**وأَفرضُهُم زيدُ بن ثابت** (وأثنَى علَيهِم) حيث قال: **خَيرُ الناس قَرني ثمَّ الّذينَ يلُونَهُم ثمَّ الذينَ يلونَهم، وقال في افتراقِ الأُمَم الناجيةِ منهُم واحِدَة، فقيلَ مَن هُم ؟ فقال: ما أنا عَليهِ وأَصحابي.** واتە: زەید لە هەموویان شارەزاو زاناتربووە لە عیلمی فەرائیزدا، وەباشترین چەرخ ئەو سەدەیە کە منی تێدام، لەپاشان ئەوەی دێت بەدوایدا، وە ئەوەش بەدوای ئەواندا دێت. یەك تاقمیش لەو حەفتاو سێ تاقمە لە ئوممەتم دەربازدەبن، کە ئەوانەن پەیڕەوی بکەن لەو ڕێبازەی من و صەحابەکانی لەسەرە.

(١) طەبەرانی ڕیوایەتی کردووە، لە (الكبير)دا، (٩٦/٢)، وأبو نعيم لە (الحلية)دا (١٠٨/٤)وە حافزی زوبەیدی دەڵێت: (**وفيما أخرجه الطبراني في الكبير عن ابن مسعود وعن ثوبان وابن عدي في الكامل عن عمر بن الخطاب رفعوه: إذا ذُكر أصحابي فأمسكوا، إذا ذُكرتِ النُّجوم فأمسكوا، وإذا ذُكر القَدر فأمسكوا، أى لِما في الخَوض في الثلاثة من المفاسد التى لا تُحصى**، وقدم هذا الحديث في كتاب العلم واشبعنا الكلام عليه من جهة الصناعة الحديثية . بەغەوی دەفەرموێت: قەدەر نهێنیەکی خودابیە، تەنانەت مەلائیکە نزیکەکان و پێغەمبەرە مورسەلەکانیش لێی ئاگادار نین(مەگەر خرابێتە بەرچاویان) وە هەرگیز درووست نییە بەهۆی ئەقڵەوە بە قووڵی ڕۆبچیت لە باسی قەدەردا،بەڵکو ئەوکەسە نەبڕوای دامەزراو بێت کەخودای گەورە خەڵکی درووست کردووە. کردوونی بە دووتاقمەوە،ئەوانەی لای ڕاستن و نامە بەدەستی ڕاستیان دەدرێت بە فەزڵی خودا دەخرێنە بەهەشتەوە، وە ئەوانەش کە تاقمی چەپەکانن، کە نامەی ئەعمال دەدرێت بەدەستی چەپیانەوەو بەهەقی خۆیان دەخرێنە دۆزەخەوە. إتحاف ٥١/٢.

# پێڕی دووهەم کە جەدەلیان بەلاوە پێویستە

تاقمیێکی تر لە زانایان، عیلمی کەلامیان بەلاوە پێویستەو دەڵێن:

ئەوانەی حەرامیان کردووە، لەبەر ئەوەیە کە ئەم زانستە کۆمەڵێك وشەو زاراوەی بەکارهێناوە وەك: (جەوهەرو عەرەز و ماهییەت و هیولا) و هاووێنەکانی کەنامۆیەو پێشتر صحابەی کیرام(رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُم)بەکاری نەهێناوون [1]

ئەمەش بابەتێکی ئاسانە، چونکە هیچ زانستێك نییە کە هەندێك زاراوەی تایبەتی تیا بەکار نەیەت بە مەبەستی تێگەیشتن، کە پێشتر بەکار نەهاتوون، وەك: زانستەکانی فەرموودەو تەفسیری قورئان و فیقهـو ئصول، کە چەندین دەستەواژەی تایبەتی بەکاردەهێنن، وەك: نەقض و کەسرو تەرکیب و تەعدییەو فەسادی وەضع و هەموو ئەو پرسە تایبەتیانە، بە پێی قیاس و پێودری زانستی هێناویانن و، ئەگەر پیشینەکانمان بەرچاویان بکەوتایە ئەوا وەریان نەدەگرتن و لێیشیان تێنەدەگەیشتن، داهێنانی ئەم وشەو دەستەواژانە بۆ ئەوەی واتاو مەبەستێکی درووست بگەیێنن، وەك ئەوە وایە کەجۆرە جام و پەرداخێکی تر دابهێنن بۆ ئەوەی لە کارێکی موباح و شەرعی و پەسەندد‌ا بەکاریان بهێنن، کە هیچ ڕێگرییەکی لەسەر نییە.

وەئەگەر ڕێگرییەکە بەهۆی واتاکەیەتی، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئێمە مەبەستمان لەم وشەو زاراوانە، تەنها بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر حدوس و پەیدابوونی جیهان لە نەبوونەوە، لەگەڵ سەلماندنی یەکتایی خولقێنەری ئەم بوونەوەرە و یەکبوونی صیفەتەکانی، وەك لە شەریعەتدا هاتووە.

---

(١) هەروەها زاراوەکانی مەحمول و مەوضوع و مورەککەب و صوغراو کوبراو نەتیجەو نەشکالەکان نامۆن و صەحابەو تابیعیەکانیش بەکاریان نەهێناون، بۆیە پێی ڕازی نین و قەدەغەیان کردووە.

کەواتە لەکوێوە دەتوانن بیسەلمێنن ناسینی خودا بە بەڵگە حەرام بکەن؟ بەڵام ئەگەر ئەوەی ڕێگەی پێ نەدراوە، لەبەر ئەو قرەو هەراو ئالۆزی و دەمارگیری و ڕق و کینەو دوژمنایەتیەیە، کەبەهۆی شەڕەقسەی زانستی کەلامەوە ڕوبەڕوی دەبنەوە، ئەوە ڕاستە حەرامەو پێویستە هەموانی لێ دور بخرێتەوە، وەك چۆن فیزو دەمارو خۆپەسەندی و ڕیاکاری و ڕیاسەت طەلەبی بەهۆی زانستەکانی حەدیس و تەفسیر و فیقهەوە پەیدادەبێت ، ئەمەش حەرامەو پێویستە هەموانی لێ دوور بخرێتەوە.

بەڵام نابێت ڕێگری لە ئەصڵی زانستەکان بکرێت، بەو بەهانەی کە ئەو دەرەنجامەی لێدەکەوێتەوە، چۆن دەکرێت باسکردن و داواکردنی بەڵگەی بەهێزو گەڕان بەدوای بەڵگەدا قەدەغەبێت کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (١١١البقرة) واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن ئیسباتی بکەن بەڵگەی لەسەر بهێننەوە خۆ بەتەنها قسەو گەزاف نابێت[1] ، کەواتە داوای بەڵگەیان لێ دەکات. هەروەها خوداﷻفەرموویەتی:

﴿ لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَنْ بَيِّنَةٍ ﴾ (الأنفال٤٢)

( واتە: تا ئەوەی دەمرێت و دەلیلەکە ببینێت و هیچ ماوەی بەهانەی نەمێنێت، دیارە شەڕی بەدر و سەرکەوتنی بەرەی ئیسلام دەلیلێکی ئاشکراو نومایان بوو[2]، بۆیە لێرەشدا بەهیلاکداچوون، کە کینایەیە لەڕوخاندن و ژیان کە نیشانەی سەرکەوتنە، هەردوکیانی بەستۆتەوە بە بەڵگەوە)[3]، هەروەها خودا فەرمویەتی: ﴿إِنْ عِنْدَكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ بِهَذَا﴾ یونس/ ٦٨ واتە: ئێوە هیچ

(١) خولاصەی تەفسیری نامی/١٧.

(٢) هەمان سەرچاوە/١٨٢.

(٣) إتحاف : ٢/٥.

بەڵگەیەگتان لەسەر ئەم قسە بێ جێ یەتان نییە[1] ، واتە: ئایا هیچ بەڵگەو دەلیلێکتان هەیە. وە فەرموویەتی: ﴿فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ ﴾الأنعام ١٤٩. واتە: هەموو بەڵگەیەکی واتا بەخشی مەبەست گەیێن، هەر لەلای خوداو بۆ لای خودایە.

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ، إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ، قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ، قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ، فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ ﴾ ٢٥٨/البقرة.

کەواتە حەزرەتی ئیبراهیم بەڵگەی بۆ دەهێنایەوە کە خودای من زیندوو دەمرێنێت و مردوویش لە قیامەتدا زیندوو دەکاتەوە، وتی: منیش ئەوە دەکەم، ئەوەی فرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە دەیکوژم، دەشتوانم بیبەخشم و زیندووی بکەمەوە، ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: خودای من خۆر لە رۆژهەڵاتەوە دەهێنێت، تۆ ئەگەر ئازایت لە خۆرنشینەوە بیهێنەوە[2]،کەواتە خودای گەورە باسی بەڵگەکانی ئیبراهیمی هێناوەتەوە و موجادەلەکردنی لەگەڵ نەمرووددا، کە بەهۆی بەهێزی بەڵگەکانیەوە سەرسام و بێدەنگی کردو سەرکەوت بەسەریدا.

وە دیسان فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ﴾ الأنعام/ ٨٣

(کەواتە خودا ئەو بەڵگانەی بە حەزرەتی ئیبراهیم داوە کە بیهێنێتەوە لەسەر قەومەکەی ، هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿قَالُوا يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا﴾ هود/٣٢. کافرکان وتیان ئەی نوح، بەڕاستی جەدەل و شەڕەقسەی زۆرت لەگەڵ کردین. دیارە موجادەلەی پێغەمبەران لەگەڵ کافراندا باسی پرسە تایبەتیەکانی ئەحکامی شەرعی نییە، بەڵکو لەسەر پرسی تەوحید و

---

(١) خوڵاصە: ٢١٦.

(٢) بنوارە: خوڵاصە/٤٣.

سـەلماندنی پێغەمبەرایەتی یە. هەروەهـا خـودای گەورە لە چیرۆکی حەزرەتی موسادا لە قسەکردن لەگەڵ فیرعەوندا باس لەوە دەکات کە لێی پرسی:
﴿وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ، قَالَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ مُوقِنِينَ﴾ ،
فیرعەون دەڵێت: کام خودایە باس دەکەیت، ئەویش بەڵگەی یەکتا پەرستی بۆ دەهێنێتەوە، لە پاشـان بەڵگەی پێغەمبەرایەتی بـۆ دەهێنێتەوەو دەفەرموێت:
﴿قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُبِينٍ﴾، ئەی چی دەڵێیت کە بەڵگەیەکی ڕون و ئاشکرات بـۆ بهێنم. پـوختەی قسـە ئەمەیە: قورئـان لە سـەرەتایەوە تـا کۆتـایی، پڕیەتی لەهێنـانەوەی بەڵگە ڕوبەڕووی کافرەکان، گەورەتـرین بەڵگەی زانایـانی کەلام دەربارەی تەوحید، ئەم فەرموودەیەی خودایە:
﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾ ٢٢/الأنبياء.واتە: ئەگەر لەغەیری خـودای ڕاستەقینە خـودایەکی تـر لە ئاسـمانەکان و لە ئەرز ببـوایە، ئەوا ئەرزو ئاسـمان تێك دەچـوون[١]،وەلە بـارەی بەڵگە هێنـانەوە لەسـەر پێغەمبەرایەتی، قورئـان فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوابِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾ البقرة/ ٢٣ ، دەی ئەگەر دوودڵـن لە ڕاسـتی ئەو قورئـانەی کەناردوومـانەتە خـوارەوە بۆسەر بەندەی خۆمان (موحەممەد)، ئێوە بەهەمووتانەوە تاقە سوورەتێك لە وێنەی ئەو قورئانە بهێنن[٢]،وە لەبارەی زیندووکردنەوەیشەوە فەرموویەتی:
﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ، یس/٧٩.
واتە: تۆیش ئەی موحەممەد لەوەڵامیاندا بڵێ: ئەو کەسە زیندووی دەکاتەوە کە یەکەم جار دروستی کردووە، کە خودای[٣] ،

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی، ٢٢٣.
(٢) هەمان سەرچاوە البقرة/٤.
(٣) هەمان سەرچاوە /٤٤٥.

وه چەنـــدین ئـــایەتی تـــر کە هەمووپـــان بەبەڵگەدەژمێـــررێن، وه بەردەوام پێغەمبەرەکانیش (صەڵات و سـەلامی خودایـان لەسـەر بێـت)ڕوبەڕوی مـونکیرو بێباوەڕەکـان دەبـوونەوە و، بەڵگەیـان بـۆ دەهێنـانەوە، وەك خـودا فەرمـانی پێداوون: ﴿ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾النحل/١٢٥

(بەبەڵگەو شـێوازی بـاش و کاریگەر قسـەیان لەگەڵدا بکەو، ڕایـان بکێشـە بـۆ سـەر ڕێگەی حەق و ڕاستی) هەر بەم شـێوەیش صەحابەکان (خودایان لێ ڕازی بێـت) ڕوبەڕوی بێ بـاوەڕو ئەهلی ئینکـاری دەبـوونەوە، وەلەکـاتی پێویسـتدا بەربەرەکانێیـان دەکـردن و بەڵگەشـیان بـۆ دەهێنـانەوە ، بەڵام لەو کـاتەدا ئەوەندەیان پێویست بەو موجادەلەو شەڕەقسەیە نەدەبوو کە دواتر پێویستیان پێی هەبووە.

وه یەکەم کەسێك کە چوو بەدەم بانگەشەی بیدعەچییەکانەوە کە موجادەلەی لەگەڵدا بکەن لە پێناوی گەیشتن بە ڕاستیدا، حەزرەتی عەلی بو (خودای لێ ڕازی بێت) کە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسی نارد (خوایان لێ ڕازی بێت) بۆ لای خەواریجەکان کە قسەیان لەگەڵدا بکات، ئەویش ڕۆشت و فەرمووی پێیان: دەتانەوێت چ تۆڵەیەك لە ئیمامەکەتان بسەنن‌ەوە؟

وتیان: شەڕی کردووەو وازی لە دەسکەوتوو سەبایا و تاڵانی ئەوان هێناوه[1]، ئیبن و عەباس فەرمووی:

دەسکەوتی حەڵاڵی جەنگ بۆ شەڕی کافرەکانە، باشە ئەگەر لە شەڕی (جەمەل) دا دایکی موسوڵمانان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) بکەوتایەتە ناو بەش و سەهمی یەکێکتانەوە، ئامادەبوون کەوەك موڵکی خۆتان بەحەڵاڵی بزانن بۆ خۆتان، کە بە دەقی قورئان ئەو دەبێتە دایکی ئێوه؟!

---

(١) واتەئەگەر ڕاستە شەڕدەکەن بۆچی سەبایاو کەنیزەك و دەسکەوتەکانی شەڕ هەڵناگرنەوە.

وتیان: نەخێر نەماندەکرد. بەمشێوە بە هۆی بەڵگەی شیاوەوە، دوو هەزار کەسیان گەڕانەوە ژێر فەرمانی خەلیفە.[1]،

---

(١) بنوارە (جامع بیان العلم وفضله) (١٨٣٤). هەروەها ئەبوو نەعیم لە (حلیة الأولیاء) (٣١٨/١) بەدرێژی ئەم بابەتە دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی عەبدوولڵای کوڕی عەباسەوە کە دەفەرموێت: کاتێك حەرورییەکان کەناریانگرت. چووومە لای فەرمانـدەی باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی طالیب وتم: دەکرێت بچم قسەیان لەگەڵدا بکەم، فەرمووی: دەترسم لە هەڵوێستیان بەرامبەرت، وتم: نەخێر پشت بەخوا! جوانترین بەرگی خۆمم پۆشی و چوومە لایان، ناو لەپیان ئەستوور وزبرو ڕوخساریشیان دەدرەوشایەوە لە ئاساری سوجدەبردن، بەخێرهاتنیان لێ کردم، وتیان بۆچی هاتوویت؟ وتم هاتووم باسی صەحابەکانتان لەگەڵدا بکەم کە شارەزای قورئان و نیگا و تەئویلەکانن، چ ڕەخنەییەکتان لە ئامۆزاو زاوای پێغەمبەر هەیە. کە یەکەم کەس بووە بڕوای بە پێغەمبەر هێناوە؟ وتیان: سێ ڕەخنەی گەورەمان لێی هەیە ، یەکەمیان لەجیاتی بە حوکمی خودا ڕازی بێت هەندێك پیاوی قەبوڵکرد بە حەکەم، وە شەڕی کردو دەسکەوتەکانی کۆنەکردەوە، ئەگەر ئەوانە کافرن ئەوا دەسکەوتەکانیان بۆ حەڵاڵە، ئەگەر بڕواداریشن چۆن درووستە خوێنیان بڕژرێت؟ سێیەمیش: ئەو خۆی لە فەرمان و خەلافەت دارنیوەو، ناوی خۆیی سڕیوەتەوە، ئیتر بە خەلیفە نەماوە.
وتم ئەگەر بە بەڵگەی ڕاست و درووستی قورئان و حوکمی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەکەتان قسەتان لە گەڵدا بکەم گوێم لێ دەگرن، وتیان بەڵێ. وتم: وەڵامی ڕەخنەی یەکەمتان: خودا دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ المائدة/٩٥. ئەگەر یەکێك نێچیرێکی لە حەرەمی مەککەدا کوشت، دەبێت بیبژێرێت و بەهاکەیشی با دوو کەسی عادل دیاری بکەن، یان ئەگەر دوبەرەکی کەوتە میانی پیاوو ژنەوە، فەرمانـدەدات: ﴿فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا﴾ النساء/٨٤. سوێنتان دەدەم بەخودا، ئایا حوکمێك پەیوەندی بە صوڵح و نەڕژانی خوێنەوە بێت گرنگترە، یان چارەسەری کێشەیەك لەسەر پرسی خوێنی کەروێشکێك، کە نرخەکەی چارەکە دیرهەمێکە؟

وه دەگێڕنەوە حەزرەتی حەسەنی بەصریش ڕوبەڕوبوونەوەی لە گەڵ کابرایەکی (قەدەری) دا کردو هێنایەوە سەر ڕێگەی ڕاست.[1] ،

هەروەهــا حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی طالیبیش (رضي الله عنه) لـەگـــەڵ (قەدەری) یەکدا ڕوبەڕوبوونەوەیەکی زانستی کردووە[2] ،

---

وتیـان : خـوێن نەڕژان گرنگتـرە. فەرمـووی: بـۆ مەسـەلەی دەسـکەوتی شـەڕو سـەبیی ئافرەتـانیش، ئایـا ئێـوە قەبوڵی دەکەن ئەگەر دایکی موسـوڵمانان کەوتە نـاو شـەڕەوە و گیـرا، ئەگەر بڵـێن: وەك سـەبی و دەسـکەوتی شـەڕە ئەوە پێـی کافردەبن چـونکە ئەوە دایکی ئیمانـدارانە، وەك قورئـان فەرمـوویەتی: ﴿ النَّـبِيُّ أَوْلَى بِالْمُـؤْمِنِينَ مِـنْ أَنْفُسِـهِمْ وَأَزْوَاجُـهُ أُمَّهَـاتُهُم ﴾الأحزاب/٦. وەك باسـمانکرد، بـابەتی ئەوەش کەحـوکمی خەلافەتی لەســەر خــۆی دارنیــوە، وەڵامـی ئەمەش ئەوەیە: کە لە (حەزرەتی)عەلی گەورەتــر کە پێغەمـبەری خـودایە لە صـوڵحی حـودەیبیيەدا ڕازی بـوو کە نەنووسـێت (مِـن مُحمـدٍ رَسـولِ الله) بەڵکو لەسـەر ڕای سـەرۆکی وەفـدی قورەیشـیەکان گۆڕانی بەسـەرداهێنا و فەرمووی: وەڵلاهی من ڕەسـولی خودام با بەدرۆیشـم بخەنەوە، بنووسـە: موحەممەدی کـوڕی عبـدالله! لەبەر بەرژەونـدی گشـتی، خـۆ ئەو لە عەلی گەورەتـر بـوو، ئایـا بەم هەڵوێستەی لەدین دەرچوو ؟! وتیان وەڵلاهی دروستەو بەڵگەکانت بەهێزن،وە بەهۆی ئەم ڕوبەڕوبــوونەوەوە قایــل بــوون و ،بیســت هەزار کەســیان لــێ دەرچــوون و لە ڕەخنەکانیـان پاشـگەز بـوونەوە و، تەنهـا چـوار هەزار کەس لەسـەر یـاخی بـوونی خۆیـان بەردەوام بــوون و ، ناچــار شــەڕی کــرد لەگەڵیانــدا و لەنــاوی بــردن.. وە ئەوەش کە پێویستە بە بیری بهێنینەوە: حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێـت) پێشتر ئەم جەدەل و عیلمی کەلامەی بەکار هێناوە. بنوارە: إتحاف ٢/٥٥.

(١) قەدەری بەوانە دەڵێن کە بڕوایان بە تەقدیری خودا نییە و ئیناکری قەدەر دەکەن.

(٢) شێخی زوبەیدی دەیگێڕێتەوە: کە پیاوێکی ئەهلی شـام پرسیاری لێ کرد: ئایا هـاتنی ئەو بۆ لای ئەمیر بە قەزاو تەقدیری خـودا بووە؟ حەزرەتی عەلی یش فەرموی: سـوێند بێت بەو زاتەی کە هەمــوو تــۆمێکی تەقانــدووە و ، گیــانی کــردووە بەبەری هەمووخــاوەن

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خودای لێ ڕازی بێت)لەگەڵ یەزیدی کوڕی عەمیرەدا لە بارەی ئیمانەوە بەم شێوە مونازەرەیەك کەوتە بەینیانەوە:
ئەگەر بڵێم من بڕوادارم، دەشڵێم من ئەهلی بەهەشتم! یەزیدی کوڕی عەمیرەش فەرمووی:

ئەی هاوڕێی پێغەمبەر! ئەوەی فەرمووت لەزوبانت دەرچووە، ئەی نازانیت بڕوای تەواو ئەوەیە کە بڕوات بەخودا و مەلائیکەکان و کتێبەکان و

---

ڕۆحێکدا، هیچ شیوو دۆڵ و بەرزاییەکمان نەبڕیوە بە بێ قەزاو بڕیارو دیاری کردنی خودا. کابرا وتی: کەواتە من هیچ پاداشتێکم دەس نەکەوتووە، فەرمووی بەڵی ئەی شێخ! زۆر بەگەورەیی بۆتان نووسراوە کە هاتوون و ئەو کاتەش کە دەگەڕێنەوە، وە لە هاتن و چوونتاندا ناچار نەکراون و زۆریشتان لێ نەکراوە، شێخەکە وتی: ئەمە چۆن دەبێت؟ خۆ قەزاو قەدەری خودا ئێمەی داوەتەبەر و گەیاندویی بە ئێرە؟ حەزرەتی عەلی فەرمووی: لەوانەیە تۆ وابزانیت قەزایەکی لازم و لکاو بووە، وەقەدەرێکی حەتمی بووە، خۆ ئەگەر بەم شێوەیە بێت ئەوا پاداشت و تۆڵە سەندنەوە پوچەڵ دەبێتەوە، گفت و بەڵێن و هەڕەشە و ئەمر و نەهی بایەخێکی نامێنێت، وەهیچ کارێك لەلای خوداوە بەچاك دانەدەنراوە و هیچ فرمانێکیش زەمکراو نابێت، وە چاکەکار بە پۆشاکی چاکەوە لە خراپەکار چاکتر نەدەبوو، وەخراپەکاریش بە بەرگی خراپەوە لە چاکەکار چاکتر نەدەبوو، ئەوە قسەو وڕاوەی بت پەرست و یاخییەکانە، وە بزانە کەخودا ﷻ کەس نەیتوانیوە بیبەزێنێت و خراپەی لەگەڵدا بکات، بەزۆریش بەندایەتی بەکەس نەکردووە، پێغەمبەرانیشی بە هەوانتە نەناردووە، ئەرزو ئاسمان و ئەم بوونەوەرە سەرسوڕهێنەرەیشی لەسەر بنەمایەکی باطیل درووست نەکردووە، وەیل بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕن. کابرای پیر بۆ دواجار پرسیاری کرد: کەواتە ئەوقەزاو قەدەرە چۆنە کە بەبێ ئەوان نەمانتوانی هەنگاوێك بنێین یان بگەین بە بێ ئەو؟! فەرمووی: بە ئەمرو فەرمان و حوکمی خودایە، نەك بە زۆرو ناچاری پێکردن. واتە بە بێ ئیرادەی خودا کارێك ناکرێت و بەزۆریش بەکەسی ناکات. بنواڕە إتحاف./٥٦.

پێغەمبەران و زیندوبوونەوەو کێشان و پێوانی کردەوەکان و ئەنجامدانی تەواوی نوێژ و ڕۆژو و زەکاتدان و چەندین گوناهیشمان هەیە ئەگەر دڵنیابین کە خودا لێمان خۆش دەبێت ئەوا دەمانزانی کە ئێمە لە ئەهلی بەهەشتین، لەم پێناوەدایە کە دەڵێین ئێمە بڕوادارین، ناڵێین کە ئێمە ئەهلی بەهەشتین. عەبدوڵلای کوڕی مەسعود یش فەرمووی: وەڵلاهی ڕاست دەکەیت، ئەوە هەڵەو لەدەم دەرچوونێکی من بوو.[1]،

دەبێت ئەو ڕاستیەش بووترێت:

کە ئەوانە کەمتر خۆیان بە شەڕەقسەو مونازەرەوە خەریك دەکرد، وە بەکورتی باسیان دەکرد نەك بەدرێژی، وە لەکاتی پێویستدابوو نەك نوسراوو پەڕاوو دانراوی لەسەر پڕبکەنەوەو بیکەنە کارێکە پیشەیی، لەمبارەوە دەوترێت:

**بۆیە بەکەمی ڕۆدەچوون تیایدا:**

چونکە کەمتر لەوکاتەدا خەڵکەکە پێویستیان بەو باس و بابەتانە هەبووە، ئەوکاتە کاری بیدعەسازی ئاوا بڵاو نەبوبوویەوە.

**بۆیە بەکورتیش لێی دەدوان:**

چونکە ئەوپەڕی ئاواتیان ئەوەبووە: کە خەصم و بەرامبەرەکەیان لە هەڵە بگێڕنەوەو دانی پێ بنێن بە ڕاستیدا، ڕاستیش ئاشکرا ببێت و ئەو شوبهەو گومانەیش بڕەوێتەوە. خۆ ئەگەر شوبهەو شەڕەقسەو ڕوبەڕوبوونەوەکانی ئەوان درێژتربێتەوە، ئەوا بێگومان پێ سەلماندن و ئیلزامکردنیشیان زیاتری دەخایاند. وە نەیشیاندەتوانی دوای ئەوەی کە دەستیان بە باسەکان کرد، ئەندازەی کێشانەو پێژانەی قسەو گفتوگۆکان بەپێی پێویست دیاری بکەن و نەدەبوونە

---

(١) بنواڕە :تـأريخ دمشـق، (٤٦١/١١). سەیرکە ئەم صەحابیيە گەورەیە چۆن لە قسەکەی پەشیمان دەبێتەوەو دان بەڕاستیدا دەنێت، خوایان لێ ڕازی بێت.

خاوەنی کات و وشەکانیان.

**ئەوەش کە بۆچی بە نوسراوو دانراوی تایبەتی ڕوبەڕویان نەبوونەتەوە:**

لە بابەتی زانستی فیقە و تەفسیر و حەدیسیش هەر بەو شێوەیە بوون، خۆ ئەگەر درووست بێت کتێبێکی فیقهی دابنرێت و، هەموو پرس و وێنە دەگمەن و نادیارەکانیشی تێدا باس بکرێت، کە زۆر بەدەگمەن هەندێکیان ڕوودەدات، بەو بیانووەی کە ئەم وەڵامە ئامادە دەکرێت بۆ ڕۆژی خۆی، کە لەوانەیە ڕوبدات با زۆر دەگمەنیش بێت، یان بە مەبەستی تیژکردنەوەی بیرو هزریان، ئێمەش بەهەمان شێوە ڕێگەی ڕوبەڕوبوونەوە و مونازەرە ڕێك دەخەین و، وای دەخەملێنین کە لەوانەیە ئەو گومان و شوبهانە ڕوبدەن و، پێویستیمان بەوەڵامی شوبهەکان هەبێت، کە لەوانەیە شوبهەیەك سەرهەڵبدات، یان بیدعەکارێك بیخرۆشێنێت و بیخاتە ناو باسەوە. یان باسکرنی ئەو وەڵامدانەوە بۆ بیرتیژی و ئامادەسازی و ئامادەکاری بێت، بۆ هەر ئەگەرێك کە پێویستی بەوەڵام دانەوە هەبێت. بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا یەکسەر وەڵامی سەرپێی و بە پەلەی پێ بێت و ئامادەباش بێت، وەك ئەو کەسەی کە چەکەکەی پاك دەکاتەوە و ئامادی دەکات، تا ڕۆژی شەڕ دانەمێنێت بە دەستیەوە.

هەر ئەوەندە دەتوانرێت کە باسی ڕای هەردوو تاقمەکەبکرێت.

**ئەگەر بڵێیت:** کەواتە کام ڕایان لە لای تۆ پەسەندە؟

**بزانە:** کە ڕاستی بەو شێوە نییە کە بە ڕەهایی و موطلەق بەهەموو حاڵەتێکەوە زەممی ڕایەکیان بکەیت، یان ستایشی یەکێکیان بکەیت، بەڵکو پێویستی بە ڕوونکردنەوەهەیە:

**کەواتە یەکەمجار بزانە:**

هەندێك شت هەیە کە حەرام دەکرێت لەبەر خودی خۆیەتی، وەك ئارەق و مردارەوەبوو، کە دەڵێم: لە بەرخودی خۆیەتی، مەبەستم ئەوەیە هۆکارو

عیللەتی حەرامبوونەکەی وەصف و حاڵەتێکە لە خودی خۆیدایە، کە سەرخۆشکرنە بە نیسبەت ئارەقەکەوە و مردنیشە بە نیسبەت مردارەوە بووەوە، ئەمەش لە کاتێکدایە ئەگەر لە بارەیەوە پرسیارمان لێ کرا ئێمەش بەڕەهایی بڕیاری حەرام بوونی ڕادەگەیێنین، وەلا ناکرێتەوە بەلای ئەو حاڵەتەشدا، کە لە کاتی پێویستیدا مردارەوەبوو حەڵاڵ دەبێت، وە خواردنەوەی ئارەقیش بە پێی پێویست حەڵاڵ دەبێت، ئەگەر پارووێەك لە قوڕگی گیرابێت و هیچی لە بەردەستا نەبێت کە بیخواتەوەو پاڵی پێوە بنێت جگە لەو ئارەقە.[1]

شتی وایش هەیە هۆکارێکی دەرەکی حەرامی دەکات، وەك ئەوەی کاڵایەك بفرۆشیت بەسەر فرۆشتنی برایەکی موسوڵمانتدا، لەکاتێکدا کە بۆی دروستە پەشیمان ببێتەوە، واتە کاتی (خیار البیع)، یان فرۆشتنی هەر کاڵایەك لە کاتی بانگداندا، یان وەك ئەوەیە کەسێك گڵ بخوات، ئەوە حەرامیەکەی ئاشکرایە، چونکە زیانی پێ دەگەیێنێت.

ئەمەش دەکرێت بە دووبەشەوە: یان کەم و زۆری زیانبەخش دەبێت، ئەو کاتە دەتوانرێت بە ڕەهایی حەرامبوونی ڕابگەیێنرێت، وەك ماددەی ژەهر، کە زۆروکەمیشی لێ بخۆیت دەتکوژێت.

وە بەشی دووهەم ئەوەیە: بۆ کەسێك کە تای هەبێت و لە وڵاتێکی

---

(١) ئەمەش وەك ئەوەوایە کەوەڵامی ئەگەری پرسیارێك بداتەوە کە بڵێت: چۆن دروستە بە موطڵەقی حوکمی حەرامی ڕابگەیێنێت، کە ئارەق و مردارەوەبوویش لەهەندێك کاتدا حەڵاڵ دەبن ؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە ئەم ئەگەرە هەموو کاتێك نییە، بەڵکو بە دەگمەن ڕێدەکەوێت، شتی نادیرو دەگمەنیش حوکمی لەسەر بینا ناکرێت. بنواڕە: الإتحاف٢/٥٧.

گەرمدابێت، ئەوە زۆرخواردنی زیان بەخشە. هەروەها وەك گڵ خواردنیش ، وەك ئەوەی حەرام بوونەکە بە ڕەهایی و موتڵەق تایبەت بێت بە گڵ و ئارەق خواردنەکەوە، وە حەڵاڵ بوونەکەش کە دەدرێتە پاڵی هەنگوینەکەوە. ئەمەش بۆ هەمیشەیی نییە، بەڵکو بە زۆری وادەبێت، ئەگەر شتێکی جیاواز ڕوی دا، ئەوا حوکمەکەیش وەردەگەڕێت و حاڵەتەکەش دەگۆڕێت، کەواتە بۆ ئەوەی حوکمەکەی تێکەڵ نەبێت چاکتر وایە کە درێژەی پێ بدرێت و، هەروا بە کورتی باسی حەرامی و حەڵاڵی نەکرێت:

**کەواتە دەگەڕێینەوە بۆ لای زانستی کەلام و دەڵێین:**

بەڕاستی سوودیشی تێدایەو زیانبەخشیشە، بە پێی سوود و قازانجەکەی، لە کاتی سوود گەیاندنیدا ئەوە حەڵاڵەو ڕێگەپێدراوە، یان سوننەتەو ئەنجامدانیشی خێرە، یان پێویستە وەك چۆن حاڵ و مەقام دەیخوازێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەو پێیەی کە زیانبەخشیشی هەیە، ئەوە لە کات و شوێنی زیانگەیاندنەکەیدا حەرام دەبێت.

## زیانەکانی عیلمی کەلام

ئەو زیانانەی لێی چاوەنواڕدەکرێت :

وروژانـــدنی گومـــان و درووســـتکردنی دوودڵـیـــیە، وە بزوانـــدنی بـــاوەڕی نادروستە لە دڵداو، شێواندنی عەقیدەی ڕاستەقینەیە، کە لە سەر جەزم و دڵنیایی لایدات و گومانی بۆ درووست بکات، کە لە سەرەتاوە ئەم حاڵەتەی بۆ درووست دەبێت، وە هەرکەسێکیش بە ئەندازەی خۆی گومانی بۆ پەیدا دەبێت لە بەڵگەکاندا، ئەمەش ئەو زیانەیە کە لە باوەڕو عەقیدەی درووستی دەدا.

زیـانێکی تریشـی هەیە، کە بیروبـاوەڕی بیدعەسـازان دووپـات دەکاتەوە و، گومـان و بیـدعەکانیان لە دڵەکانـدا جێگیـر دەکات و، خواسـتیان لەسـەر ئەو لادانە زیـاد دەکـات و، تینیـان پـێ دەبەخشـێت کە زیـاتر سـووربن لەسـەری،

نەونـدە هەیە ئەو زیـانە بەهـۆی دەمـارگیرییەوە و لە ئاسـەواری شەڕەقسـەوە پەیدادەبێت، بۆیە دەبینیت ئەو بیدعەکارەی نەخویندەوارە، ئەگەر بە نەرمی و هێمنی بدوێیت لە گەڵیدا، زووتر ئەو باوەڕە نادرووستە لەدڵیدا لادەچێت ، مەگەر لە شارێکدا گەورە بووبێت کە لەسەر جەدەل و دەمبازی و دەمارگیری پەروەردەکرابێت[١]،

بەڕاستی ئەو جۆرە کەسانە، ئەگەر هەموو دونیایان لەسەر کۆببێتەوەو، تاکۆتایی زەمانیش لەگەڵیاندا خەریك بن، ناتوانن ئەو بیدعەو بەدگومانییە لە دڵیاندا هەڵبکەنن، بەڵکو هەواو ئارەزوات و دەمارگیری و ڕق بوونەوە لە خەصم و ڕکەبەرەکانیان و، دژایەتی پێرەجیاوازەکان گەمارۆی دڵی داون و، ناهێڵن بە هیچ شێوەیەك لە حەقیقەت و ڕاستی نزیك ببێتەوە، تەنانەت ئەگەر پێی بوترێت:

ئایا دەتەوێت خودای گەورە پەردەی تاریکی لەسەر دڵت لا بدات و، بەچاوی دڵ و دڵنیایی تەواوەوە ڕاستیەکانت بۆ دەربکەوێت، کە تۆ لەسەر حەق نیت و خەصمەکەت لە سەر ڕاستییە، ئەوە پێی ناخۆش دەبێت، لە ترسی ئەوەی نەوەکو دڵی ڕکابەرەکەی خۆش بکات، بەڕاستی ئەمە دەردێکی کوشندەیە کە پرش وبزیزکی ئەم ئاگری فیتنەیە، هەموو شارو خەڵکێکی گرتۆتەوە، کە جۆرێکە لە فەسادو تێکدان و دەمارگیریی، کە دەمبازەکانی ئەهلی جەدەل و لووت بەرزی ناویانەتەوە، وەئەمەی کە باسمان کرد زیانەکانیەتی.

---

(١) بەنموونە وەك ڕافیزەو نەجدییەکان کە بیری دەمارگیری و توونـدڕەوەی لە ناویاندا درووست بووەو قسەی کەس ناچێت بە مێشکیاندا، قورقوشمی تـوواوەش بکەیت بە گەروویاندا هێشتا لەسەر قسەی خۆیان دانابەزن و پەشیمان نابنەوە. خوا لەناویان ببات، ئامین.

# سوودی عیلمی کەلام:

واگومـان دەبرێـت کە سـوودی ئەوەی هەبێـت لەڕێـگەی ئەم زانسـتەوە حەقیقەتە شاراوەکانی پێ دەربخرێت و، ڕاستییەکان وەك خۆیان چۆنن ئاوا بناسرێن و بزانرێن، بەڵام ئەمە زۆر دوورە!

زانستی کەلام ناتوانێت بتگەیێنێت بەم خـواستە پیرۆزەو، لـەوانەیە زیاتر ڕوبەڕوی لێشێواندن و تێکەڵکردنت بکات، لەوەی کە بەرچاوت ڕون بکاتەوەو ڕاستیەکانت پێ ئاشنا بکات، بەتایبەتی ئەگەر ئەم هەڵسەنگاندنە لە زانایەکی ئەهلـی حەدیسـەوە ببیسـتیت، یـان لە کەسـێکەوە بەدوای ڕواڵەتـی فەرموودەکاندا دەگەڕێت، لەوانەیە یەکسەر ئەو گومانەت بۆ درووست ببێت: کە هەمیشـە خەڵکیی نەیارو دوژمنی شـتێکە کە نەیزانێت، بۆیە گـوێ لەو کەسە بگرە کە زۆر شارەزاو پسپۆڕە لە کەلامدا، لەدوای ئەوەی بەتەواوی لێی حاڵی بوو ئیمجا وازی لێ هێنا، دوای ئەوەی بەتەواوی ڕۆچوو لە ناویدا، تا ئەوپەڕی سـنووری زانایـانی کەلام کە پێـی دەگەن، وە ئەوەیشـی تێپەڕانـد بـۆ چەندین زانستی تر، کە هاو تەریبە لەگەڵ جۆرێك لە عیلمی کەلامدا، (وەك زانستەکانی فەلسەفەو ژیریێژی) وەبەتەواوی دڵنیا بوو کە هەرگیز لە ڕێگەی زانستی کەلامەوە ناتوانیت بکەویتە سەر ڕێگەی حەقیقەت و مەعریفەتی خودایی.[1]

---

(١) ئیمامی غەزالی لە کتێبەکەی تری دا (المُنقـذ مِنَ الضَّـلال)دا ئەو ڕاستیەی ڕوون کـردۆتەوە کە دوای لێکـدانەوە و تـوێژینەوەی بابەتیـانەو، ڕۆچـوون لە هەمـوو زانستەکانداو، مەلەوانی لە قـوڵایی هەمـو زانستەکاندا، ئیمجا ئەو ڕاستیانە تۆمار دەکات و دەفەرموێت: لە سەرەتای گەنجێتیمەوە و پێش باڵغ بوونم و تا ئێستا کە نزیکی پەنجا ساڵم کردۆتەوە، لەناو ئەو دەریا پان و بەرینە بێ پەیەدا، بە بوێری و چاو

سوێندبێت! زانستی کەلام بە شێوەیەکی دەگمەن ڕێدەکەوێت کە هەندێك فرمـان و پێناسـەو ڕوونکـردنەوەت پـێ بـدات، لەو کـارو فرمـانە ڕوون و ناشـکرایانەی کە ئەگەر بیـرو مێشـکیان بـۆ بخەیـتە کـار، پـێش ئەوەش کە ڕۆ بچیـت لە ناویانـدا، لەوانەیە لێیـان حـاڵی ببیـت، بەڵکـو ئەوەی ڕاسـتی بێـت سوودی زانستی کەلام تەنها لەیەك شتدایە؛ کە پاراستنی عەقیدەو بیروباوەڕی ڕەشەخەڵك و عەوامەکانە، کە بۆیانمان ڕونکردونەتەوە، وە باوەڕیان دەپارێزێت لەو گومـان و هانیهـانییەی کە بیـدعەچییەکان درووسـتی دەکەن و بانگەشـەیان بـۆ دەکەن، بە ڕاسـتی کابرای نەخوێنـدەواری ڕەشـۆکی بۆخـۆی لاوازەو، هەمـوو جەدەل و گومـانێکی ئەهلـی بیـدعە، بـا باطیـل و بـێ بـایەخیش بێـت دڵـی دەلەرزێنێت و شـوبهەی بۆ درووسـت دەکات، بەربەرەکانێی ئەم کارە فاسـیدەش، دەبێت بە شـتێکی وەك خـۆی فاسـید بەرپەرچی بـدەیتەوە، خەڵکەکەش لەسـەر ئەم بیروبـاوەڕە درووسـتە عەقیـدەیان دامەزراوەو بەنـدایەتیانکردووە کە پێشکەشـمانکردووە ، چـونکە شـەریعەتی پیـرۆز پاڵپشـتی گرتـووەو، صـەلاح و خێرو چاکەی دین و دونیایشیانی تێدایەو، کۆدەنگ و بڕیاری سـەلەفی صاڵیح و پێشـینە چاکەکـانی لەسـەرە، وە ئەرکـی بەنـدایەتی زاناکـانە کە دەبێـت ئەو

---

نەترسی مەلەی تێدا دەکەم و، بە دوای ڕاسـتیەکاندا دەگەڕێم، وە لێکۆڵینەوە لەسـەر هەمـوو گومـان و شـوبهەیەك دەکەم و، بیـروڕای هەمـوو تـاقم و گـرۆ جیاجیاکان لێك دەدەمەوەو، نهێنـی مەزهەب و بۆچوونەکانیـان لێکـدەدەمەوەو، شـارەزای حەق و باطیڵیـان دەبـم و، سـوننەو بیـدعە بەتەواوی لە یەك جـودا دەکەمەو، کە گەیشـتن بە ڕاستی و حەقیقەتی فرمانەکان، فیطرەتێکی خـودایی بوو لەسـەری گەورەبووبـوم، تا بە هەوڵـدان و سـەیرکردنی کتێبـی زانـا پێگەیشـتووەکان و ئەحـواڵی زانـا ڕەببانییەکـان گەیشتمە ئەو سەرچاوە ڕەسـەنەی کە بە دڵنیاییەوە دەتوانم دەستنیشـانی بکەم و بە هەموانی بگەێنم، بنوارە : الإتحاف ٥٩/٢، وە المنقذ من الضلال ، سەرەتاکەی.

بیروبـاوەڕە درووسـتە بە خەڵـکەکەی ڕەوان بـکەن و، پێیـان لەبەربـکەن و، ڕێگەش نەدەن تێکەڵی گومـان و شـوبهەی بیـدعە چییەکان ببنەوە، وەك چـۆن ئەرکی سـوڵتان و دەسـتەڵاتدارەکانە کە پارێزگاری لە مـاڵ و سـامانیان بـکەن و لەدەم و دەستی هێرشبەرو داگیرکەرەکان بیپارێزن.

کـاتێکیش ڕوی ڕاسـتیەکانمان لەبـارەی سـوودو زیـانی ئەو زانسـتەوە بـۆ دەرکەوت، ئیمجـا پێویسـتە وەك پزیشـکێکی شـارەزا ،چـۆن دەرمـانێکی ترسـناك دەنوێنێـت و ، بـۆ شـوێنی پێویسـتی خـۆی نەبێـت بەکاری ناهێنێـت، ئـاوا لەکاتی پێویستدا و بە ئەندازەی پێویست لێی بەکار بهێنین.

**درێژەی ئەم بابەتە:**

ئەو عەوامـانەی سـەرقاڵی سـنعەت و پیشەسـازین، پێویسـتە وازیـان لـێ بهێنرێت، با دامەزراوبن لەسەر باوەڕە سادەو صافەکەی خۆیان بن، هەرچەندە ئەو عەقیـدە ڕاستانەشـیان بـۆ باسـکرابێت کەوتمـان، بـا ئەوان لەسـەر بـاوەڕی یەکەمی خۆیان بمێننەوە، با زانستی کەلام  فێری ئەوانە بکرێت تەنها زیانیان لێ دەدات، چـونکە لەوانەیە کـۆمەڵە گومانێکیـان بـۆ پەیـدا بکـات، کە پێشـتر نەیـانبووەو، بـاوەڕە سـادە دامەزراوەکەیـان لێ بشـێوێنێت، کە دوایی نەتوارێت بخرێنەوە سەر حاڵی پێشووی خۆیان.

بەڵام ئەو ڕەشـەخەڵکە عەوامە کە بـڕوای بە هەنـدێك بیـرو بۆچـوونی بیـدعەکاران کـردووە، دەبێـت بە نەرم و نیـانی هەوڵـی لەگەڵـدا بـدرێت و بگێڕرێتەوە بۆ سەر ڕێگای حەق و ڕاستی، بە قسەو وشەی نەرم و متمانەدار کە کاریگەری لە سەر دڵی بکات، وە بەڵگەکان نزیك بن لە ناوەرۆکی بەڵگە قورئانی و فەرموودەییەکـان، کە تـێکەڵ کرابێـت لەگەڵ هـونەری ئامۆژگـاری و بێـدارکردنەوەوە، ئەم شـێوازە زیـاتر کـاریگەری لەسـەر پەیـدادەکات، لە شەڕەقسەو جەدەلی زانا موتەکەللیمەکان، چونکە کەسێکی ئاسایی ئەگەر ئەم

شێوازی جەدەل و شەڕەقسەیە ببیستێت وادێتە دڵیەوە کە ئەمەش جۆرێکە لە پلان و ڕاکێشان ، کە زانای کەلام دەیەوێت ئەمانی پێ ڕاو بکات و، ڕایانبکێشێت بۆ لای بیروباوەڕەکەی خۆیان، خۆ ئەگەر نەشتوانێت وەڵامی بداتەوە، یان بەرپەرچی بداتەوە، وای دادەنێت کە زاناکانی عیلمی کەلام کە سەر بەمەزهەبەکەی خۆینی ئەوان دەتوانن بەرپەرچی بدەنەوە.

کەواتە شەڕەقسەو موجادەلە لەگەڵ ئەم کەسە نەخوێندەوارەداو، لەگەڵ کەسی یەکەمیشدا کەبڕوای بە بیدعە هەیە حەرامە[1]، وەئەوەش کە تەنها گومانێکی بۆ درووست بوبێت، دیسان درووست نییە جەدەلی لەطەڵدا بکرێت، مەگەر بە قسەی نەرم، کە گومانەکەی بە نەرمی و هێمنی ئامۆژگاری بڕەوێنیتەوە، یان بەڵگەی نزیکی پەسەندی وەرگیراو، کە دووربێت لە قووڵبۆداچوونی عیلمی کەلام.

**ئەی لە چ کاتێکدا دەبێت هەموو توانا جەدەلییەکان بخرێنە گەڕ؟**

تەنها لە یەك جێگەدا، کە کەسێکی عامی و ڕەشۆکی بڕوای بە یەکێ لەو بیدعانە پەیداکردبێت و، بە شێوەیەکی تایبەتی لە موجادەلەکردندا بەرگری لێ بکات، ئەوە دەبێت بەهەمان شێوازی جەدەل و شەڕەقسەی خۆی ڕووبەڕوی ببنەوە، تا دەگەڕێتەوە بۆ بیروڕا درووستە ئەصڵییەکەی پێشووی.

ئەمەش بۆ کەسێکە کە ئەوەندە دڵی بە قسەو دەردەشەو شەڕەقسەوە داکەوتبێت، ئامۆژگاری و هەڕەشەو بێدارکردنەوە کاری تێ نەکات، ئیتر حاڵی وای لێ هاتووە کە تەنها بە موجادەلەو ڕووبەڕووبوونەوە تیماری دەردی دڵی

---

(١) چونکە عەوامەکە گومانی بۆ دروست دەبێت و، عەقیدەکەی دەهەژێت و تێك دەچێت، وە ئەهلی بیدعەیش بۆیە درووست نییە موجادەلەیان لەگەڵدا بکرێت لەبەر دەمارگیرییەکەیان.

دەكات، بۆ ئەو كەسەو بۆ ئەوحاڵەتە تايبەتيانە، درووستە جەدەليان لەگەڵدا بەكار بهێنرێت. ئەمەی كە دەيڵێن لە وڵاتێكدايە كە بيدعەی تێدا كەم بێت، جياوازی مەزهەبی لە ميانی خەڵكەكەدا نەبێت. ئەوە دەبێت تەنها بيروباوەڕە درووستەكەيان بۆ ڕونبكرێتەوەو باسی بەڵگەكانيشی بۆ نەكرێت، وە چاودێری بكرێت ئەگەر شوبهەو گومانێكی بۆ درووست بوو، بەئەندازەی ڕەوينەوەی گومانەكەی قسەی بۆ بكرێت.

ئەگەر بيدعەكە زۆر بەر بڵاو بوو، وە دەترسان كە منداڵەكان فريوخواردووی ببن، ئەوە ئاساييە بەو ئەندازەی كە لە پەڕاوی (الرِّسالةُ القُدسيَّة)دا هاتووە ڕاستی بيروباوەڕ فێری منداڵان بكرێت، بۆ ئەوەی هۆكارو قەڵغانێكيان بۆ درووست بووبێت، كە ڕوبەڕوی ئەو جۆرە موجادەلەو قسانە ببن ئەگەر ڕێی پێگرتن. ئەوەش ئەندازەيەكی كەمە بۆ خۆپارێزی، كە خستوومانەتە ناو ئەم پەڕاوەوە، لەبەر كورتييەكەی بڵاومانكردۆتەوە[١]

ئەگەر ئەو كەسە جۆرە زيرەكی و وردبينييەكی تێدا بوو، كە بەهۆی وەڵامدانەوەكانی زيرەكييەكەی بۆ دەركەوتبوو، يان گومان و شوبهەيەك گيانی هەژاندبوو، كەواتە هۆكارە قەدەغەكراوەكەی تێدا دەركەوتبوو، ئەوە دەردەكەی ئاشكرابووەو پێويستی بە دەرمان و چارەسەری زياتر هەيە، بۆيە بۆ ئەو جۆرە نەخۆشە ڕێگەدراوە كە ڕونكرنەوەكەيان زياتر بۆ بكرێت و، وەك پەڕاوی( الإقتِصادُ في الإعتِقاد) كە ئەندازەی پەنجا پەڕەيەك دەبێت بۆی ڕونبكرێتەوە، كە لە سەرنج و بەڵگەكانی بنەما ئاينييەكان (قواعد العقائد) دەرچوونی تێدا نييە بۆ هەندێك باس و بابەتی تر، كە زانايانی كەلام ڕۆچوون

---

(١) بنوارە بەشی سێيەمی ئەم كتێبی (قواعدالعقائد) بنەماكانی بيروباوەڕ. كە بەدەستمانەوەيە، كە شەرحێكی ئەو عەقيدە كورتكراوەيە كە لە سەرەتاوە باسمان كردووە.

تیایانـدا[1]، جـا ئەگەر ئەو بەڵـگەو پەڕاوە ڕازی کـردو بێـدەنگی کـرد، بـا وازی لێ بهێنێـت، ئەگەر دڵـی ئـاوی نەخـواردەوەو متمـانە بـۆ درووسـت نەبـوو، ئەوە وادەردەکەوێـت کە عـیللەتەکە تیایـدا جێگیـر بـووەو، دەردەکە تەشـەنەی کـردووەو، نەخۆشـیەکە بە جەسـتەیدا بڵاوبووەتەوە، با پزیشـکەکە بەنەرمی و بە پێـی توانـا بە هێمنـی لەگەڵیـدا بجـوڵێتەوەو، چـاوەنوارێ قەزاو بڕیـاری خودایش بکات دەربارەی ئەو، تا ئەو کاتەی بە بێدارکردنەوەیەکی خودایی حەق و ڕاسـتی بـۆ ڕون دەبێـتەوە، یـان هەروا لە شـك و گومانـدا بە فەرمـانی خـودا دەمێنێتەوە.

ئەو ئەندازەی پەڕاوی(الإقتصاد)و هاوێنەکانی گرتوویانەتەخۆیان، ئەوەندە بەسەو، هیوامان وایە کە سوود بگەیێنێت بەوانەی سالیکی ڕێگەی حەقیقەتن.

**بەڵام ئەوەی لە دەرەوەی ئەو ئەندازەو سنوورەیە کەباسمان کرد ئەوە دووبەشە:**

**بەشی یەکەمیان**: باسێکە لەوبابەتانەی کە پەیوەندار نین بە بنەماکانی بیرو باوەڕی ئیسلامییەوە، کە هەندێك باس و بابەتی تر دەگرێتەوە؛ وەك ڕۆچون لەو بابەتە ناهەموارانەی کە بەکات بە فیڕۆ دان و تورەهاتێکی گومڕاکەر دانراون، وەك بابەتی: ئیعتیمادو پشتبەستنەکان و بوون و ئەکـوانەکانە (٢)

---

(١) کتێبی (الإقتصاد في الإعتقاد) وەك شەرحێکی پەڕاوی (الرسالة القدسیة)وایە هەرچەندە دواتریش دایناوە، شـێخی زوبەیدی دەفورموێت: کتێبێکی زۆر بەنـرخە چەنـدین کەس ڕاڤەیان کردووە. الإتحاف ٦١/٢.

(٢) واتە: ئیعتیمـادو پشـت بەسـتن بە هەنـدێك بـابەت کە وەك پێویسـت تیایانـدا نـاگەیتە ئەنجـام، وەك ئەبـی هیشـام لە بـارەی ئیعتیمـادەوە دەڵێـت: هۆکـاری سـەرەکی و ئەصڵی، بۆ دابەزینی جەستەو تەنێك قورسـاییەکەیەتی، واتە پشـت

وه هەروەها باس لەو بابەتانەی کەپەیوەندارن بە ئیسبات بوون یان نەفی کردنی دەرککردن و هەستکردن ( کە هێزێکی تایبەتییەو خودای گەورە لە مرۆڤدا درووستی کردووە، کە بە پێی مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەت، ئەو بابەتە هەستیارانە، هەمووی لە کردارو فیعلی خودایە ﷻ وە هیچ یەکێك لەو کارو کردارانە کاری مرۆڤ نییە، بەڵکو لە کەسبی ئەویش نییە ) وەهەروەها رۆچوون لە بابەتی بینین، کە ئایا دژی بینین هەیە؟

وە دەبێت دژەکەی چی بێت؟ ئایا ئەوەیە کە ناودەبرێت بە (مەنع) واتە:

ڕێگەنەدان، یان (کوێری) کەدژی بینینە، ئەگەر وتمان دژی هەیە، ئەوە یەکێکە کە وشەی (مەنع)ە، واتە: قەدەغەکردنی بینین لە هەموو ئەو شتانەی کە نابینرێن، یان سابت و جێگیربوونی بینینە، بۆ هەموو ئەو شتانەی کە دەگونجێتو مومکینە ببینرێت، یان مەنع و ڕێگەنەدانی بینینە بە پێی ژمارەکەی[1]

---

بەستنە بە قورساییەکەی نەك بە جووڵەو حەرەکەکەی، بۆ نموونە گەردیلەیەکی بەچاو نەبینراو کاتێك لە ناو فەزایەکدا هەمیشە دەجوڵێتەوە، بەڵام چونکە قورسایی نییە، دەبینین هیچ ئیعتیمادێکی نییە کە پشتی پێ ببەستێت بۆ دابەزین. کە لە باسی لەدایك بوونی ووزەو توانادا هێمای بۆ کردووە، ئەکوانیش کۆی: کەونە، واتە بوونەوەرەکان، لێرەدا بەو واتایە دێت کە کە هەرگیز ڕونادات جەوهەرێکی تایبەتی گۆڕانی بەسەردابێت بۆ باشتر لە خۆی، یان بەرامبەری کەون، کە فەسادە، واتە: جەوهەرێك لە حاڵەتێکی باشەوە بگۆڕرێت بۆ حاڵەتیکی خراپتر، کە زانیشمان جەوهەر ئەوەیە بە خۆیەوە ڕادەوەستێت و ماددەی عەرەزی پێوە هەڵدەواسرێت. وە چەندین لێکدانەوەی تریان لە سەر کەون و هاووێنەکانی هەیە.

(١) پێویستە بزانیت : ئەوەی ڕێگەی بیستن و بینینی پێنەدراوە، ئەوە بەهۆی بوونی

## بەشی دووهەمیان:

زیادە نوسین و ڕاپۆرتێکە لە سەر ئەو بەڵگە ئەقڵییانەی کە جیاوازن لەو پەڕاوی بنەما باوەڕیانە  کە باسیان کراوە، بەڵکو زیادە پرسیارو وەڵام و گومان دروستکردنێکە، کە لە هزرو بیریکرنەوەوە سەریان هەڵداوە، کە ئەمەش بەدوادا گەڕانێکی درێژدادڕییە، ئەوەی خۆی بهاوێتە ناویەوە، تەنها بەرەو گومڕایی و هەڵدێرەی زیاتری دەبات. وەئەوەش کە بەو هەموو ڕونکرنەوانە متمانەی پەیدا نەکردبێت، بەم زیادە بەیانەیە تەنها جەهل و نەزانینی بۆ زیاد دەبێت. چونکە زۆر جار درێژکردنەوەی هەندێك قسەو بابەت ئەوەندەی تر واتاکەی ئاڵۆزو نادیاردەکات.

ئەگەر کەسێك وتی: ئەو باسانەی کە پەیوەندارن بە حوکمی ئیدراکە هەستپێکراوەکان و پشت بەستنەکانەوە، ئەوە سوودێکی زۆریان تێدایە بۆ

---

صیفەتی کەڕێتی و کوێریەتییەوەیە، ئەمانە دوو واتان کە هەردووکیان دەرکپێکردن و زانینی حەقیقەتی بیسراوو بینراوەکەیە، وە هەردوو صیفەتی بینراوو بیسراوەکە ئەصڵ و زاتی دوو صیفەتی کەڕێتی و کوێریەتییەکەنین، چونکە کەڕێتی و کوێریەتی عەدەمن، وجودی خاریجی یان نییە، عەدەمیش نابێتە ئەصڵ بۆ شتێکی تر کە بوونی چاوو گوێیە. ئەگەر موعتەزیلەکان وتیان: کوێرێتی و کەڕیەتی ڕێگرن بۆ خارەنەکەی کە ئیدراکی هەردوو مەعنای بینین و بیستن بکات، وەڵامیان بەوە دەدرێتەوە کە : مانای چییە کە مەنعیان دەکات، کە ئیدراك و هەستپێکردنی هەبێت، ئایا ئەو ڕێگەگرتنە لە نەفس و خودی خۆیەتی، یان لە مەعنایەکی ترە کە جیاوازە لە خودی خۆی، دیارە ناگونجێت کەڕێتی و کوێرێتی کە دوو صیفەتی عەدەمین، ببنە خاوەنی دەرك و هەستیاری، کەواتە دەبێت غەیری ئەو دوانە شتێکی تر ببێتە ڕێگر، کە ئەمەش پێی دەوترێت ئیدراك، ئیدراك واتە: زانین و هەست پێکردن، دەی شتێك کە بوونی نەبێت چۆن دەکرێت هەست و ئیدراکی هەبێت.

بیرتیژی و ئارامی دڵ، وە بێدارکرنەوەی لە خەوی غەفڵەت، وە بیرتیژیش ئامێرێکە بۆ خزمەتی دین، وەك چۆن شمشێر ئامێرێکە بۆ ئەوەی جیهادی پێ بکرێت، چۆن شمشێر تیژ دەکرێتەوە، هەروا ئاسایشە کە بیرو خاطیرەی مرۆڤیش تیژ بکرێتەوە، (ئەم قسەیە بەڕواڵەت ئەگەر جێگەی خۆی لە ڕوکەشی دڵدا بکاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم نموونە ) وەك ئەوەوایە کە بڵێت:

یاری کردن بە شەطرنج بیر تیژدەکات و مێشك دەکاتەوەو پلانی زیاتری فێردەکات، کەواتە ئەم یارییە بەشێکە لە دین، ئەمەش جۆرێکە لە ئارەزوو کاری و تێکەڵکردن، چونکە خاطیرەی مرۆڤ بەهەموو زانستە شەرعییەکانی تریش تیژو بەهێز دەبێت، وە ترسی هیچ زیانگەیاندنێکیشی نابێت.

کەواتە بەم ئەندازەی کە باسمانکرد، زانستی زەمکراوو ناپەسەندی عیلمی کەلام، و زانستی پەسەندو شیاوت بۆ دەرکەوت، وە زانیت لە چ حاڵەتێکدا کەلامی تێیدا زەمکراو دەبێت، وە لە چ کاتێکیشدا عیلمی کەلام پەسەندو ستایشکراودەبێت، وە چ کەسێك سوود لە زانستی کەلام وەردەگرێت، وە کێ سوودی لێ نابینێت.

********

**ئەگەر بڵێیت:**

مادام ئەوەندەت دان پێداناوە کە بۆ ڕەواندنەوەی گومان و بەرپەرچدانەوەی بیدعەکاران پێویستیمان بەم زانستە هەیە ، وە ئێستەش وەك دەبینین کاری بیدعەچییەکان گەشەی سەندووەو بەڵا و موصیبەت هەموو لایەکی گرتۆتەوە، وە هەموو ئەگەرێکی ناخۆشی لەئارادایەو، کە پێویستە بە خێرایی ڕوبەڕوی بیدعەچییەکان ببینەوە، کەواتە دەبێت بڕیاری ئەوە بدەین، کە هەڵسان بە زیندوکرنەوەی ئەم زانستە فەرزی کیفایەیەو، دەبێت پشت گوێ نەخرێت، وەك چۆن پێویستە پاسەوانیی بۆ پارێزگاری

لەماڵەکان و دەستەبەرکردنی هەموو مافەکان دابین بکەین، وە ئەرکی پاراستنی دادگاو ویلایەت و سەرپەرشتیاری هەمووکارەکانی تر لە ئەستۆ بگرین، وەئەگەر زانایان خۆیان خەریك نەکەن بە بڵاو کرنەوەی ئەم زانستانەو، بە دەرس و وانە نەیانڵێنەوە و باس و لێکۆڵینەوەی لە سەر ئەنجام نەدەن، ئەوا بەردەوام نابێت، بەڵکو ئەگەر بە یەکجاری وازی لێ بهێنن، ئەوا ئەم زانستە نامێنێت و لەبیردەچێتەوە.

وە تەنها ئەوەبەس نابێت کە هەندێ کەس بە سرووشتی خۆی دەتوانێت چارەسەری شوبهەو گومانی بیدعەکاران بکات ئەگەر فێریان نەبێت، کەواتە دەبێت دەرس وتنەوەش بۆ پاراستن و فێربوونی کەلام پێویست و فەرزی کیفایە بێت، پێچەوانەی سەردەمی صەحابە ی کیرام (خودایان لێ ڕازی بێت) چونکە ئەوکاتە خەڵکی ئەوەندەیان پێویست پێی نەبوو.

**کەواتە بزانە:**

ئەوەی ڕاستی بێت، دەبێت لە هەموو شارێکدا کەسانێك هەبن بە شێوەیەکی سەربەخۆ هەڵبستن ، بە فێرکردنی ئەم زانستەو بەرپەرچدانەوەی گومان و شوبهەی بیدعە چییەکان، کە لەو شارەدا ڕەواجیان پێداوە، ئەمەش بەفێربوون دەبێت، بەڵام کارێکی هەڵەبە وەك دەرسی فیقە و تەفسیر بووترێنەوە، چونکە زانسی کەلام وەکو دەواو دەرمان وایە، بەئەندازەی پێویست بەکار دەهێنرێت، بەڵام عیلمی فیقە وەك خواردەمەنی وایە، زیانی خۆراك ئەوەنییە کە مەترسی لێ بکرێت، بەڵام زیانی دەرمان مەترسیدارەو، خەڵکی لە ئاسەواری بێداردەکرێنەوە، چونکە باسی ئەوەمان کرد جۆرەها زیانی لێ دەکەوێتەوە.

**کەواتە ئەوەی زانایە بەم زانستە، دەبێت سێ جۆرە کەس تایبەتمەند بکات بە فێرکردنیان بە عیلمی کەلام:**

**یەکەمیان:** دەبێت خۆی تەرخان بکات تەنها بۆ فێربوون و سووربێت لەسەری، لە بەرئەوەی هەرکەسێك پیشەیەکی هەبێت ڕێگەی پێنادات زانستەکەی تەواو بکات و ئەگەر گومانێکی بۆ هاتە پێش بەرپەرچی بداتەوە.

**دووهەم:**

دەبێت زیرەك و بیرتیژ و زوبانپاراو بێت، چونکە مرۆڤی تەنبەڵ و کەودەن سوود لە تێگەیشتنەکەی وەرناگیرێت، ئەوەش کە بێ زانست و بەڵگەو دەمپاراوی قسەبکات، مونازەرەو ڕوبەڕوبوونەوەکانی سوودناگەیێنێت، ترسی ئەوەی لێ دەکرێت کە دووچاری زیانەکانی کەلام ببێت، بەڵام هیوای ئەوەی لێ ناکرێت کە سوود بگەیێنێت.

**سێیەم:**

دەبێت هەر لە سروشتی خۆیداحەزی بە دیانەت و تەقواو چاکی و خۆپارێزی ببێت، نابێت، ئارەزوات زاڵ ببێت بە سەریدا [1].

چونکە کەسێکی فاسق و لەڕێگەدەرچوو بە کەمترین گومان و شوبهە لە ئاین وەردەگەڕێتەوەو، بۆ خۆیشی ئەو پەردەی لە سەر لادەدرێت کە لەگوناه دووری بخاتەوە و، هیچ کۆسپێکیش نامێنێت لە میانی ئەوو هەواو چێژو ئارەزواتدا، ئەوکاتە سوورنابێت لە سەر لادانی شوبهەکان، بەڵکو بە فرسەتی دەزانێت لە پاڵ ئەو گومان و بیدعانەدا خۆی لە گەردنکەچی قورسایی تەکلیف و ئەرکی شەرعی ڕزگار بکات، ئەو کاتە ئەم جۆرە فێرخوازە زیانی زیاتر دەگەیێنێت لەوەی بە هیوای سوود گەیاندنی بێت.[1]

---

(١) هەروەها دەبێت دوور بێت لە دەمارگیری و خۆهەڵکێشان و خۆپەسەندی. الإتحاف: ٦٣/٢.

ئەگەر ئەم دابەشکردنانەت زانی، بۆت ڕوون دەبێتەوە کە بەڵگەی پەسەنکردنی زانستی کەلام، هاوڕەگەزی بەڵگەکانی قورئانە، کەدەبێت بە وشەی جوان و نەرم و کاریگەر دەست پێ بکات کە دڵەکان بهەژێنێت، وەمتمانە بەبەرامبەرەکەی بدات، بێ ئەوەی ڕۆبچێت لە دابەشکردنی بابەت و باسکردنیان بە وردەکاری زیاتر کە زۆربەی خەڵکەکە لێیان خاڵی نابن، ئەگەر لێیشیان تێبگەن وادەزانن ئەوە شتێکی پووچ و بێبنەمایەو شەعوەزەیەو ئەصڵی

(١) لە کتێبی (إلجامُ العَوامْ) ی ئیمامی غەزالیدا فەرموویەتی: زانا کە لە بارەی ئەم زانستەوە قسە بکات دەبێت لە چوار جۆرو حاڵەتدا بێت:
یان لەگەڵ خۆیدا بێت، یان کەسێکی تر وەك خۆی بەرچاو ڕون و زانا بێت، یان لەگەڵ کەسێکدا کە بە زیرەکی خۆی ئامادە بێت چاوی بکاتەوەو ڕاستییەکان ببینێت، کە خۆی یەکلایی کردبێتەوە بۆ فێربوونی (مَعْرِفَـةُ الله)، یان لەگەڵ کەسێکی ئاساییدا بێت لە عاممەی خەڵکەکە. جا ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی دڵنیابوو لە خۆی کە جڵەوی نەفسی خۆیی لەبەردەستدا بوو، بە پێی گومانت حوکمی نەدەدا، ئەوە دەتوانێت لەگەڵ خۆیدا گفتوگۆو دەردەشە بکات، وە دەشتوانێت لەگەڵ ئەوەشدا بدوێت کە وەکو خۆیەتی، کە بەدوای بەرچاوڕونیدا دەگەڕێت و ، خۆی یەکلایی کردۆتەوە بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیەکانداو، دووربێت لەهەموو دەمارگیری و خودپەسەندی و خۆ گیف کردنەوەی بەسەرخەڵکیدا، چونکە ئەوەی زیرەك و بیرتیژبێت و بەدوای مەعریفەتدا بگەڕێت، نەك بۆ مەبەستێکی لابەلا، بەڵکو لە پێناوی گەیشتن بە ڕاستیدا، ئەوە دەشێت هەموو قسەیەکی لە گەڵدا بکرێت، بەڵام کەسێکی عامی نابێت ئەو قسانەی لەگەڵدا بکرێت، وە کەسێکیش گومانی لە خۆی هەبێت و ئەگەری سیلبی تێدا بەدی بکرێت، ئەوە لە حاڵەتی ناچاریدا دەتوانێت قسە لەگەڵ نەفسی خۆی دا بکات. بۆ زیاتری ئەم بابەتە بنواڕە سەرچاوەی سەرەوە. هەروەها الإتحاف ٢/٦٣.

نییە و داڕێژراوێکی ئەهلی کەلامەو خاوەنەکەی تەنها بۆ سەرلێشێواندن و تێکەڵکاری ڕاستییەکان فێری بوون، کەواتە ئەگەر بە نموونەی ئەم جۆرە زانستە بەرامبەری لەگەڵدا کرد، ئەوا دەتوانێت ڕوبەڕوی ببێتەوەو بەرهەڵستی بکات. [1]، کەواتە بەم زانینەت بۆت دەرکەوت کە ئیمامی شافیعی و زۆربەی زانایانی سەلەف (خودایان لێ ڕازی بێت) بۆیە ڕێگەیان نەداوە کە زیادەڕەوی

(١) ئیمامی غەزالی لە (إلجام العوام)دا ئەم بابەتەی زیاتر ڕونکردۆتەوەو دەفەرموێت: کەسێکی عامی ئەگەر لێی قەدەغە بکرێت کە باس و گفتوگۆ بکات، وە ئاگای لە بەڵگەهێنانەوەیش نەبێت، کەواتە ئەوە نەشارەزایە بەو بابەتانەی کە پێویستییان بە بەڵگەهەیە، وەدەزانین کە خودا ﷻ فرمانی داوە لەبارەی ناسینی خۆیەوە بەڵگەو متمانەی تەواومان هەبێت، بڕوامان دامەزراو بێت بە بوونی خوداو دورخستنەوەی لە هەموو نیشانەییکی پەیدابوو، وەنابێت بشوبهێت بە هیچ یەکێك لە مەخلوقاتی، وە بڕوای بە تاك و تەنهایی خودا و بە صیفەتەکانی هەبێت، وە دەشزانین ئەم فەرمانانە بەبەڵگە نازانرێن، وە پێویستیشە بزانرێن، کەواتە پێویستیان بە بەڵگە هەیە، ئەمەش گەڕانی دەوێت بەدوای بەڵگەکاندا بە سەرنج و تێڕامان، کە بەڵگەکان چۆن مەبەستەکان دەگەیێنن، کەواتە پێویستە مەرجی هێنانەوەی بەڵگەکانیش بزانرێت، بە داڕشتنی دەستپێکەکانەوە گەیشتبێتە ئامانجەکان. ئەمەش بەپێی زەروورەت بە بێ عیلمی کەلام ناکرێت و بەدی نایەت، هەروەها پێویستە کابرای عامی تەصدیقی پێغەمبەر ﷺ بکات، وە جیای بکاتەوە لە گەڵ ئەوانەدا کە بە درۆ دەعوای پێغەمبەرایەتییان کردووە، وە بە ناسینی موعجیزەکانی ڕاستی بۆ دەربکەوێت، ئایا بەبێ بەڵگەو زانستی کەلام دەتوانێت بگاتە ئەو دەرەنجامە.

کەواتە پەیداکردنی تەصدیق و متمانە بە شەش قۆناغدا تێدەپەڕێت:

بکرێت له ڕۆچوون له کەلامدا و، نەهاتوون خۆیانی بۆ یەکلایی بکەنەوە، لەبەر ئەو هەموو زیانەی کە لێیەوە چاوەنوار دەکرێت، وەك ڕونمان کردەوە.

وە دەبێ بشزانین: ئەوەی باسکراوە کە حەزرەتی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس مونازەرەی لەگەڵ خەواریجەکاندا کردووە، وە حەزرەتی عەلی لەگەڵ قەدەرییەکاندا کردوویەتی، ئەوە لە و بەشەی کەلام بووە، کە بە پێی بەڵگەی

---

**پلەی یەکەمی ئەوەیە:** کە گەیشتبێتە ئەوپەڕی متمانەوە کەهیچ دەرفەتێکی نەهێڵابێتەوە کە شك و گومان و تێکەڵکردن ڕو لە دڵی بکات.

**دوهەم:** ئەوەیە متمانی بە هۆی بەڵگە درووستەکانەوە بۆ پەیدا بروبێت، بەو فرمان و بناغە زانستیانەی کە بووەتە سەرچاوەی وەدەستهێنانی ئەو زانست و تەصدیقە،

**سێیەم:** ئەوەیە تەصدیقەکەی بە بەڵگە خیطابییەکان بۆ پەیدابووبێت، کە بە عادەت لە میانی حیوارو قسەکردندا بەکار دەهێنرێن، ئەگەر لەسەر بنەمایەکی دەمارگیری پەیدانەبوبێت، ئەوا تەصدیقی پێ درووست دەبێت. **چوارەم:** باوەڕپەیداکردن بە بیستنی قسە لەیەکێکەوە کە هەموان بە چاکی ناوی دەبەن، **پێنجەم:** ئەو قسەی بەرگوێت دەکەوێت و یەکسەر بەپێی قەرینەو بەڵگەی حاڵ و مقام تەصدیقی دەکەیت. **شەشەم:** قسەیەك دەبیستێت و لەگەڵ سرووشت و ڕەوشتیدا دەگونجێت و بڕوای پێ دەکات، نەك لەوەی بڕوای باش بێت بەرامبەر بوێژەکەی، یان قەرینەیەك بیدا بەلای ئەو لایەدا کە دەیەوێت، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ تەبیعەتی خۆیدا دەگونجێت، بۆیە وەری دەگرێت. کەواتە دەبێت بە پێی ئەم پلە کارییە سەیری پلەکانی تەصدیق بکات و، هەر بەم شێوەش هەڵس و کەوت لەگەڵ عامییەکەدا بکات. بۆزیاتر ڕونکردنەوە بنوارە: الإتحاف ٢/٦٤.

ڕوون و ئاشكراو بێ گرێ و گۆڵ و لەكاتی پێویستیدا بووە، كە ئەم شێوە مونازەرەو جەدەلە كارێكی شیاوو زانستێكی پەسەندكراوە.
بەڵێ : بەپێی گۆڕانی بارودۆخ و چەرخە جیاوازەكان، كەمی و زۆری پێویستی بوون بە عیلمی كەلامیش گۆڕانی بەسەرداديێت، كەواتە دوور نییە حوكمە كانیش لەم بارەوە گۆڕانیان بەسەردابێت.
ئەمەیە حوكمی درووستی ئەم عەقیدەیە كە سپێرراوە بە هەموان كە پابەندی لێ بكەن، وە حوكمی ڕێگەی تێكۆشان و هەوڵدان بۆ پێگەیشتنی یان لەبەركردنی، ئەوەش كە پەیوەنداره بەلادانی شوبهەو گومانەكان و ئاشكراكردن و دەرخستنی حەقیقەت و ڕاستییەكان، وە زانینی شتەكان لەسەر ئەو حاڵەتەی كە لەڕاستیدا خۆیانی لەسەرن، وە هەستكردن و دەرككردن بەو نهێنیانەی كە ڕواڵەتی وش ەكانی ئەم بیروباوەڕە دەیانگرێتەوە.
كەواتە هیچ كلیلێك نییە بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە، بێجگە لە تێكۆشان و موجاهەدەی نەفس و كپكردنەوەی ئارەزواتەكان و ڕووكردنە خوداوەندی جیهان بەهەموو توانای جەستەیی و ڕۆحییەوە، وە دەبێت بیرو ئەندێشەكانی پاك و صاف و پوخت بكاتەوە لە هەموو گەردێكی شەڕەقسەو دەمەدەمێكردن، كە ئەمەش بەڕاستی دەبێتە ڕەحمەتێكی تایبەتی خوایی كە دەڕژێتەسەر دڵی هەموو ئەوانەی كە دڵیان دەكەنەوە بۆ نەفەحات و فیوضاتی خودایی، بەپێی ئەو بەشەی كەخودا پێی داون، یان بەپێی ئەوەی كە ڕوبەڕووی دەبنەوە، هەروەها بە گوێرەی قەبوڵكردن و توانای وەرگرتنی ئەو جێگایەی كە خۆی دەخاتە بەر ئەو ڕەحمەت و میهرەبانییە، لەگەڵ دڵنیابوون لە پاكی وخاوێنی دڵەكانیان، بۆ وەرگرتنی فەیزومیهری تایبەتی خودایی، لەو دەریا بێ پەیەی كە كەس نازانێت و ناتوانێت بگاتە قووڵایی، یان ئەمپەڕەوپەڕی كەنارەكانی.

# ڕونكردنەوەی پرسێكی گرنگ

## ئایا ڕاستە عەقیدەیەكی ئاشكراو زاهیری و بڕوایەكی شاراوە هەیە

**ئەگەر بڵێیت:** ئەم قسانە وادەگەیێنێت: ئەم زانستانە ڕوویەكی ئاشكرایان هەیە، كە بەیەكەم سەیركردن لێیان تێدەگەیت، وە ڕوویەكی نهێنیشیان هەیە، كە بەهۆی هەوڵ وتێكۆشان و ڕیازەتكێشان وهەوڵدانێكی زۆر چڕوپڕەوە، وە بە بیرێكی صاف و سیرو نهێنییەكی خاڵی لە هەموو سەرقاڵییەكی دونیایی لێی حاڵی دەبێت، جگە لەو ئامانجەی كە بەدوایدا دەگەڕێت، خەریكە بە پێچەوانەی شەرع دابنرێت، چونكە شەرع زاهیرو باطین ی نییە، نهێنی و ئاشكرای نییە، بەڵكو لە ئیسلامدا: زاهیرو شاراوەو نهێنی و ئاشكرا هەمووی هەر یەكێكە؟

**كەواتە لەوەڵامدا بزانە:**

بەڕاستی دابەشكردنی ئەم زانستیانە بۆ زانستی شاراوە و ئاشكرا، ئەمە هیچ كەسێكی بەرچاوڕوون نكوڵی لێ ناكات، ئەوەی باوەڕی بەو بابەتە نییە، لە كورتبین و بەرچاو تەنگەكانە، كە هەر لەمنداڵییەوە وا فێركراون و لەسەری گەورەبوون و پێی داهاتوون و، زانستێكی نوێیان وەرنەگرتووە، تا پلەیەكی تازەو ئەندازەیەكی تر لە زانستدا پێشبكەون و شارەزاییان زیاتر ببێت، تا بگەنەوە بە پلەو مەقامی زاناگەورەكان و ئەولیاكانی خودادا، ئەمەش كە دەیانڵێین لە بەڵگەكانی شەرعەوە سەرچاوەیان گرتووە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((إنَّ للقُرآنِ ظاهِراً وباطِناً.[1] وحَدّاً وَمَطلَعاً))**

---

(١)قال العراقي: وأورده ابن الأثير في نهايته في موضعين، قال في (حدد) حديثٌ في صفة القرآن له حد أي غاية، وحدُّ كلِّ شئ منتهى أمره وقال في (طلَع) وعليه علامة السين المُهملة أي إنَّ هذا الحديث من كتاب أبي موسى المديني: **لكل حَرفٍ حَدٌّ ولكلِّ**

**حَدِّ مَطلَع، أي لكُلِّ حَد مَصعَدٌ يَصعَدُ إليه مِن مَعرفةِ عِلمهِ والمَطلعُ مكانُ الإطلاع مِن مَوضِع عالٍ**، قال ويجوز أن يكون مطلع كمصعد زنة ومعنى، وقال المصنف في آخر كتابه (مشكاة الانوار) حديث: للقرآن ظاهر وباطن، وحدٌّ ومَطلعٌ وربَّما نُقل هذا عَن عَلي مَوقوفاً.الإتحاف ٦٥/٣. ورواه ابن حبان في (صحيحه) ٢٧٦/١(٧٥) من حديث ابن مسعود بلفظ: **أُنزل القرآن على سبعة أحرف، لكُلِّ آيةٍ منها ظَهرٌ وبَطنٌ**، وهو عند عبدالرزاق في (المصنف) (٣٥٨/٣) بلفظ: (**والذي نفسي بيده مامنه آيةٌ إلاَّ ولها ظهرٌ وبطنٌ وما فيها حرفٌ إلاَّ ولهُ حَدٌّ، ولِكُلِّ حَدِّ مَطلَع**) له وتەی حەسەنی بەصریيە، ئیمامی غەزالیش لە (قوت القلوب) ی وەرگرتووە ٥١/١، کە دەڵێت: قورئان پشتی هەیە، ئەوە بۆ ئەهلی زمانەوانی عەرەبی، وە باطینەکەیشی بۆ ئەهلی یەقین، وە حەددو تاریفەکەی بۆ ئەهلی زاهیرە، وە ئەو شوێنەیشی کە لێی دەردەکەوێت(مەطڵەعەکەی)بۆ ئەهلی ڕێزو شەرەفدارەکانە، ئەوانە عاریف و خواناسەکانن، کە خودایان خۆشدەوێت، ئەوانەش کە لە خودا دەترسان ئاگاداربوون بەسەر لوطفی ئەو زاتە کە ئاگاداریانە، دوای ئەوەی کە ترسان لە ترسناکی ئەو هەڵهاتنە، سیرەکانیان بە ئەمانەت دایە پاڵ مەقامێکی ئەمین، وە ڕاوەستان لە سەر ئەو هەواڵە لە حاڵێکی پڕ لە توانابیدا، تاوایان لێ هات لەلای خودا بوونە نزیك و موقەرەبین، وایان لێهات بە هۆی پەروەردگارەوە لە شاهیدو ئاگاداران دەژمێرران، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**یری الشاهد ما لایری الغائب**)ئەوەی ئاگادار دەیبینێت غائیب و نادیار نایبینێت، کەواتە: ئەوەی ئامادەبوو بینی، ئەوەی بینی دەستی کەوت و وەجدیشی پەیدا کرد، ئەوەی دەستی کەوت خودای بەتەنهایی ناسی، ئەوەش تەنهایی بڕیاردا عەزیزو بەرزبوو، بەڵام ئەوەی ئامادەنەبوو، واتە غائب بوو ئەوە کوێر دەبێت، ئەوەی کوێر بوو ون دەبێت، ئەوەی ون بوو لەبیر دەکات، ئەوەش لەبیر بکات لەبیردەکرێت. وەك خودا دەفەرموێت: ﴿**كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنْسَى**﴾ ١٦٢/طه، واتە وازت لێ هێناو بایەخت پێی نەدا وە سەیرت نەکرد، ئەمڕۆیش تۆ لەبیر دەکرێیت و وازت لێ

واته قورئانی پیرۆز زاهیری هەیەو واتای باطیـن و شـاراوەیشی هەیە، کە زاناپێگەیشتووەکان لێی حاڵی دەبن، هەروەها سنورو نهایەت و ئەوپەڕی هەیەو مەطلەع و سەرەتایشی هەیە. وەهەروەها (حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) هێمای کرد بۆ سینەی خۆی و فەرمووی:

(( إنَّ هٰهُنا عُلوماً جَمَّة، لَو وُجِدَت لَها حَملة))[1]واته:

(له ناو دڵ و سینەم دا زانستێکی زۆری تێدا کۆبۆتەوە، خۆزگە کەسانێك ببونایە فێری ببن و هەڵیان بگرن و لێی تێ بگەن و کاری پێ بکەن).

هەروەها پێغەمبەری خودا فەرموویەتی:

((نَحنُ مَعشِرَ الأنبياء أُمِرنا أن نُكَلِّمَ الناسَ علَى قَدْرِ عُقولِهِم ))[2].

واته: ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران، فەرمانمان پێدراوە کە بەپێی ئاستی ئەقڵ و تێگەیشتنی ئەو خەڵکەیە قسەیان لە گەڵدا بکەین،

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی :

((ما حدَّثَ أَحدٌ قَوماً بِحديثٍ لَم تَبلُغهُ عُقُولُهُم، إلاَّ كانَ فِتنةً عَلَيهِم)) [3]

---

دەهێنرێـت، بەچـاوی ڕەحـمەتەوە سـەیرت ناکرێـت، بە لـوطفەوە قسـەت لەگەڵ ناکرێـت، وە بەهرمەنـدنابیت لە نزیکی.) إحيـاء علـوم الـدين طبعـة خاصـة ٢٠١١ بمناسبة مرور تسعمائة سنة على وفاة الإمام الغزالي—دار المنهاج. ٣٦٣/١.

(١) أخرجـه أبـو نعـيم في الحليـة، (٧٩/١-٨٠) رواه الخطيـب في تـأريخ بغـداد، ٣٧٦/٦، ضـمن حـديث كُميـل المشـهور، والـذي سـبق ذكـره، وانظـر قـوت القلـوب ١٤٢/١-١٤٣) وإتحـاف السادة المتقين ٤٠٦/١. وە بنوارە بەرگی یەکەمی (ژیانەوەی زانستەکانی ئاین) ل/٤١٣

(٢) رواه العقيلي في الضـعفاء، ١٥٣٤/٤) بلفـظ: ( **إنـا معشـر الأنبيـاء كـذلكَ أُمرنـا أن نكلـمَ الناس على قدر عقولهم).**

(٣) رواه مسـلم في مقدمـة (صـحيحه)(١١/١) بنحـوه موقوفـا على ابـن مسـعود(رضى الله عنه)، ورواه العقيلي في الضعفاء(٩٣٧/٣) و٢٠١/٣(١٢٠٠)مرفوعا بنحوه. وابن السني

واتە: (هەرکەسێك وتەیەکی باس کرد بۆ کۆمەڵێک و ئەوانیش, لێی حاڵی نەدەبوون و لەواتاکانی نەدەگەیشتن، ئەوە ئەو قســانە دەبێتە فیتنەو مـایەی تێکدان و بشێوی بەسەریانەوە)

وەخودای گەورە فەرموویەتی:

﴿**وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ**﴾ (عنكبوت/٤٣) واتە: ئێمە ئەو جۆرە نموونانە دێنینەوە بۆ خەڵك لێیان ورد ببنەوەو ، پیاوانی زانا نەبێت کەس فامیان ناکات و لێیان تێ ناگات و لەکرۆکیان حاڵی نابێت.[١]

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((**إنَّ مِنَ العِلمِ كَهَيئَةِ المكنُونِ لا يَعلَمُهُ إلاَّ أهْلُ المَعرِفَةِ بالله تَعالى، فإذا نَطَقُوا بِهِ لَمْ يَجْهَلْهُ إلاَّ أهلُ الإغتِرارِ بالله تَعالى، فَلَا تُحَقِّروا عالماً آتاهُ اللهُ تعالَى عِلماً مِنهُ، فإنَّ اللهَ (عزَّ وجَلّ) لَم يَحْقِرهُ إذا آتاهُ إيَّاهُ**))[٢]واتە:

---

وأبو نعيم في الرباء، من حديث ابن عباس بإسناد ضعيف، [قال الزبيدي ٢٥٣/١: قال العراقي في التخريج الكبير: إنما يصح هذا الحديث موقوفاً على ابن مسعود كما رواه مسلم في مقدمة صحيحه، وساقه كسياق حديث ابن عباس بعينه]

(١) خولاصەی تەفسیری نامی/٤٠١.

(٢) بلفظه في ((قوت القلوب))(١٧٥/١) معلقا، و قال الحافظ المنذري في الترغيب والترهيب (١٣٥/١) رواه أبو منصور الديلمي في المسند(٨٠٢) و أبو عبدالرحمن السلمي في الأربعين التى له في التصوف. [وقال الزبيدي: أورده السيوطي في اللآلى المَصنوعة، وقد أورد القطب القصطلاني هذا الحديث في كتاب له في التصوف و قال: له شاهداً من مرسل سعيد بن مسبب، قال الحافظ العراقي و يذكر راوية آخر الحديث بسند فيه ضعف كما يقول: وقال الحافظ الزبيدى: وأخرجه ابن عدي في الكامل في ترجمة طلحة بن زبير من حديث أبو موسى الأشعرى رفعهُ: **إن الله تبارك وتعالى يقول: لا تحقروا عبداً آتيته علماً، فإنىّ لم أحقِرهُ حين علَّمته و**

(بەڕاستی هەندێك زانست هەیە، وەك گەوهەری شاراوە وایە، مەگەر كەسانێك بیانزانن كە خوداناسن و، لەو پێرەن كە بە(مَعرِفةُالله) ئاشنا بوون، ئەگەر بدوێن و بەو عیلمەوە قسە بكەن، تەنها ئەوانە نایزانن و لێ یان حاڵی نین كە سەركەش و مەغرور بوون ، بەسووك سەیری ئەو زانایە مەكەن كە خودا زانستێكی پێ داوە، خودای گەورە بۆیە ئەو زانستەی پێ داوە مانای وایە بە سووك سەیری نەكردووە.

وە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی:

**((لو تَعلَمونَ ما أعلَم لَضَحِكتُم قَليلاً ولَبَكيتُم كثيراً ))**[1]،

---

طلحة بن زيد متروك، و قال السيوطي وقد أخرجه الطبراني أيضا، وقد ذكروا له أسانيد أخرى، تقوى بعضها بعضاً ((الأتحاف)) (١/١٦٧).

(١) بوخاری ریوایەتی كردووە (١٠٤٤)، وە موسلیم / (٤٢٦). وقال العراقي اخرجاه من حديث عائشة وأنس اهـ قال الزبيدي: وأخرجه أيضا الإمام أحمد والترمذي والنسائي وابن ماجة كلهم عن أنس قال: خطب رسول الله ﷺ خُطبةً ما سمعت قط بمثلها ثم ذكره، وأخرج الحاكم في المستدرك من رواية يوسف بن حبان عن مجاهد عن ابى ذر رفعه: **لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلا ولبكيتم كثيرا ولما ساغ لكم الطعام والشراب**، وقال على شرطهما ولم يخرجاه وتعقَّبه الذهبي بانه منقطع، ورواه أيضا من طريقة ابن عساكر في التاريخ بتلك الزيادة. وأخرج الحاكم أيضا في كتاب الرقاق والبيهقي في الشعب عن أبى الدرداء رفعه: **لو تعلمون ما أعلم لبكيتم كثيرا ولضحكتم قليلا ولخرجتم إلى الصعدات تجأرون لا تدرون تنجون أو لاتنجون**، وقال الحاكم صحيح، وأقره الذهبي. وقال الهيثمي رواه الطبراني من طريق ابنة أبي الدرداء عن ابيها ولم اعرفها، وبقية رجاله رجال الصحيح، وأخرج الحاكم أيضاً في الأهوال عن أبي هريرة رفعه: **لوتعلمون ماأعلم لبكيتم كثيرا ولضحكتم قليلا يظهر النفاق وترفع الامانة وتقبض الرحمة ويتهم الأمين ويؤتمن غير الأمين أناخ بكم الشر، الجورُ الفتن كأمثال الليل المُظلم .**

ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بتانزانیبایە، کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان.

خۆزگە بتزانیبایە! ئەگەر ئەمە نهێنییەکی شاراوەنییە کە ڕێگری کراوە لە پێغەمبەر ﷺ بڵاوی بکاتەوە، لەبەر نزمی ئاستی تێگەیشتنی خەڵکەکە، یان لەبەر هەر حیکمەتێکی تر،ئەگەر وانییە ئەی بۆچی بۆی باس نەکردوون؟ خۆ بەدڵنیاییەوە باوەڕیان پێ دەکرد ئەگەر بۆی باس بکردنایە.

ئیبن و عەبباس(خوایان لێ ڕاوی بێت) لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ. ﴾ (١٢/ الطلاق). ئەگەر باسی تەفسیرەکەی بکەم ڕەجمم دەکەن!!

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: پێتان دەوتم : ئەوە کافر بووە![1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی(( **أَخذتُ مِن رسول اللهِ ﷺ وِعاءَينِ، أمّا أَحَدُهما..فَبَثَثْتُه، وأَمَّا الآخَرُ لَو بَثَثْتهُ لَقُطِعَ هذا الحُلقومُ**))[2].

---

وقال صحيح وأقره الذهبي. أُنظر: الإتحاف ٢/٦٦.

(١) رواه ابن الضريس في فضائل القرآن(٣) وابن جرير الطبري في تفسيره، (١٤/١٨٨)،بنحوه، وبلفظه في (قوت القلوب) ١/٢٥٣.

(٢)صەحیحی بوخاری/١٢٠. وە لەمبارەوە فەرموودەیەکی تر هەیە کە وتیان پێی: زۆرت وت! ئەویش فەرمووی: ئەگەر هەموو ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەرم بیستووە بۆتانی بگێرمەوە، ئەوا بەردەبارانم دەکەن. وعَنْ يَزِيدَ بْنِ الْأَصَمِّ ، قَالَ: قِيلَ لِأَبِي هُرَيْرَةَ : أَكْثَرْتَ أَكْثَرْتَ ، قَالَ : ( **فَلَوْ حَدَّثْتُكُمْ بِكُلِّ مَا سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَرَمَيْتُمُونِي بِالْقَشْعِ ، وَلَمَا نَاظَرْتُمُونِي** ) القشع : ما يقلع عن وجه الأرض من المدر والحجر. رواه أحمد في " المسند " (١٦/٥٦٣) وقال المحققون : إسناده صحيح .هەر چەندە هەندێك لە شارەزایانی حەدیس ئەو دەفرە پڕ لە زانستییەیان دابڕیوە بەسەر هەواڵی ئاخر زەمان و هەندیك فیتنەو ڕوداوی داهاتوو، کە لەوانە یە ئەم صەحابییە سڵی کردبێتەوە لە درکاندنیان، یان ناوی مونافقەکان و هاو وێنەمانیان. بەڵام لە ڕاستی دا هەندێك بابەتی تریش دەگرێتەوە، وەك فەرموودەکەی ئیبن و عەبباسمان

واته: دوو دەفری پڕ لە زانستیم وەرگرتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ تەنها یەکێکیانم بڵاو کردۆتەوە ئەوی تریان ئەگەر رایبگەیێنم ئەوا ئەم گەرووەم دەبڕن،

هەروەها پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: **((مافضَّلَكم أبو بكر بكَثْرةِ صَلاةٍ ولا صِيام، ولكِن بسرٍّ (بشئ) وقرَ في صَدرِه))**[1]. (گەورەیی حەزرەتی ئەبوبەکر [بەسەر هەموو ئوممەتدا] بە زۆریی نوێژکردن و بەڕۆژوبونی زیاترەوە نەبووە، وەبەهۆی زۆری ڕیوایەتی فەرمودە و قسەو فتوادانیشەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی شتێکەوە بووە (نهێنییەك) کە خراوەتە ناو دڵیەوە، وەك چۆن گەورەی ئادەمیزاد شایەتی بۆ داوە.)گومانی تێدا نییە کە ئەو سیڕو نهێنییە پەیوەنداربووە بە بنەمانی دینەوە، لە دەرەوەی ئادابی دین نەبووە، ئەوەش کە

---

ڕاگەیاند، کە نەیتوانیوە هەندێك ئەسرار باس بکات نەوەکو بە کافری بزانن، باشە ئەگەر تەنها باسی نیشانەکانی ئاخرزەمان بێت بۆ چی بەکافری دادەنێن، دیارە ئەم بابەتە پەیوەنداره بە هەندێك ئەسرارەوە کە ئەوانەی شارەزاییان لە (**مَعرِفـة الله**)دا هەیە حاڵی دەبن و، ئەوانەی تریش پابەندەی ڕاستەقینەش بن لەوانەیە بەرگەی ئەو جۆرە زانستە نەگرن، هەروەك چۆن حەزرەتی موسا بەرگەی بینینی تەجەللیاتی خودایی نەگرت، کەچی پێغەمبەری خۆمان ﷺ لەوە زیاتریشی بەرگەگرب و بەچاوی سەری خودایشی بینی،

(١)قال الحافظ العراقي: أخرجه الترمذي الحكيم في((نواد الأصول))(٣١) من قول أبى بكر بن عبدالله المزنى: إحياء علوم الدين: طبعة دار الأرقم بيروت. تحقيق: د عبدالله الخالدى، وقال الزبيدي في شرح الأحياء٣/٦٦-٦٧: قلت و لفظ الحكيم: **ما فضل أبوبكر بكثرة الصلاة، ولا بكثرةِ صيامٍ، ولكن بسرٍّوقرَ في صدره**. و بكر بن عبدالله المزنى ثقة، سمع من ابن عباس و ابن عمر و عنه سليمان التميمى. و مبارك، و خلف،توفي سنة ١٨٠هـ و عزاه ابن القيم إلى أبي بكر بن عياش من قوله: ولفظه: **ما سبقكم أبو بكر بكثرة صوم و لا صلاة، و لكن بشئ وقرَ في قلبهِ.**

لە بنەماکانی ئاین بژمێررێت، ناگونجێت بەواتا زاهیریەکانی شارارە بێت لە صەحابەکانی تر جگە لە حەزرەتی صددیق کە باسمانکرد.

سەهلی توستوری (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

زانای ڕاستەقینە سێ جۆر زانستی هەیە: زانستێکی زاهیرو ئاشکرا، کە بۆ ئەهلی زاهیرەو دەبێت لێیان نەشاررێتەوە. وەزانستێکی تریان شاراوەیەو ناکرێت بۆ هەموو کەسێکی بەکار بهێنیت، وە زانستەکەی تریش بە نهێنی دەمێنێتەوە لە میانی بەندەو خالیقەکەیدا، نابێت لای هیچ کەسێکی تریاسی بکات.[1]،

هەندێك لە عایف و دۆستانی خودا فەرموویانە:

ئاشکراکردنی سیڕو نهێنیەکانی پەروەردگاری بە کوفر دەژمێررێت.[2].

---

(١) بنوارە: قوت القلوب، وە بزانە کە سەهلی توستوری فەرموویەتی:

ئەو عیلمەی کە سیڕە لە میانی بەندەو خالیقەکەیدا ئەوە حەقیقەتی ئیمانە، کە نابێت نەبۆ ئەهلی زاهیرو نەبۆ ئەهلی باطین ئاشکرابکرێت. الإتحاف ٦٧/٢.

(٢) ئەبوطالیبی مەککی فەرموویەتی: حەقیقەتی عیلمی تەوحید، دیوی باطین و شاراوەی مەعریفەتە، کە زیادە چاکەو پاداشتدانەوەیە کە بۆ کەسێك کە زانیاری لە خەصڵەتێکی تایبەتیدا پەیدا کردبێت، بەهۆی خۆشەویستێکی نزیکخەرەوەی تایبەتییەوە، کە هەموو کەس توانای ئەوەی نییە لەو نهێنییە حاڵی ببێت، وە بۆیشی نییە ئەو نهێنییە لای هیچ کەس ئاشکرا بکات و، ئەگەر وابکات بە کوفرو سەرپێچی گەورە لەسەری دەژمێررێت. ئیمامی غەزالی لە ئەبوطالیبی مەککییەوە دەیگێڕێتەوە: کەهەرکەسێك بابەتە نهێنییەکانی تەوحید بە ڕاشکاوی باس بکات و، ئەو سیڕی یەکتاپەرستییە بەیانبکات، ئەوە کوشتنی ئەو چاکترە لە زیندووکرنەوەی کەسانێکی تر. لەسەر ئەم قسە ڕەخنەی زۆریان ڕوبەڕوی ئیمامی غەزالی کردەوە، کە بۆخۆی لە کتێبی (الإملاء)دا بەم شێوە ڕەدیان دەداتەوە:

واتای ئەم دەستەواژەیە کە ئاشکراکردنی سیڕی ربوبییەت کوفرە، دەکرێت لە ڕێگەی دوو ڕێگاوە ڕوونی بکەینەوە، **ڕێگەی یەکەمیان:** مەبەست کوفرانەی نیعمەتە نەك کوفری ڕاستەقینە، چونکە ئەو ئاشکراکردنە دژی ئەوەیە کەناوی کوفری لێ بنرێت، چونکە کوفر شت داپۆشینە، بەڵام ئەو کەسەی سیڕەکە دەردەخات بڵاوی دەکاتەوە نەك بیشارێتەوە، جیاوازییەکی زۆر هەیە لە میانی دەرخستن و شاردنەوەدا، یان ڕاگەیاندن و پەردەپۆشکردندا، بەم شێوەیە بەدرێژی ڕونی دەکاتەوە کە ئەمە کوفری حەقیقی مەبەست نییە، بەڵکو لەو ڕووەوە ئەگەر یەکێك فەرمانێکی پێ درابێت شتێك بشارێتەوە و ئەویش ئاشکرای بکات، ئەوە وەك ئەو کەسە وایە کە پێی وترابێت فەرمانێك ئاشکرا بکەو ئەو شاردبیەتیەوە، هەردوکیان یەك جۆر سەرپێچییان لەسەر دەنووسرێت، بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستییە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ **لاتُحَدِّثُوا النّاسَ بِما لَم تَصِلهُ عُقولُهُم**، واتە: قسەیەکیان بۆ مەکەن کە ئاستی ئەقڵی ئەوان پێی نەگەیشتبێت، کەواتە ئەمە جۆرێکە لە کوفرانەی نیعمەت، نەك کوفری ڕاستەقینە. وەك کەسێك کە خزمەتێکی باشی کرابێت و نەچێتە ژێر هیچ منەتێکەوە، یان ڕازی نەبێت بەبەشی خودایی، کە ئەمە بەکوفرانەی ئەو نیعمەتانەی لەسەر دەژمێررێت و پێشی ناوترێت کافر.

**ڕێگەی دووهەم:** ئەوەیە کە وا لێك بدرێتەوە کە ئەوە مەبەستی کافر بوونی گوێگرەکەیە نەك ئەوەی قسەکەی کردووە، بەڵگەشمان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **لاتُحَدِّثُوا النّاسَ بِما لَم تَصِلهُ عُقولُهُم أتُريدون أن يُكذبَ اللهُ ورسولُهُ**، واتە: ئایا دەتانەوێت کە خوداو پێغەمبەر بە درۆ بخەنەوە؟ چونکە ئەگەر ئەقڵی بەرتەسکی ئەوان وەری نەگرت، ئەوا بەدرۆی دەخەنەوەو پێی کافر دەبن، بۆیە ئەو کەسەی باوەڕ بە توانایی خودانەکات لەسەر کارێك کە نەچێتە ژێر عەقڵییەوە، با مەبەستیشی کوفر نەبێت هەر کافر دەبێت. خۆ جولەکەو

## هەندێکی تر لە عاریفەکان فەرموویانە:

ئولوهییەت و پەروەردگاریی نهێنییەکی تێدایە ئەگەر ئاشکرا بکرێت پێغەمبەرایەتی بەتاڵ دەبێتەوە، وە بۆ پێغەمبەرایەتیش نهێنییەك هەیە، ئەگەر ئاشکرابێت ئەوا زانست پوچەڵدەبێتەوە، زاناکانیش نهێنییەکیان هەیە، ئەگەر

---

گاورەکان لەو هەموو قسەکوفرانە بە دەمیاندا دێت، مەبەستی کوفرکردنیان نەبووە، بەڵام پێیشی کافر بوون. ئیتر نابێت گوێ بۆ کەسانێك بگرێت کە لە تەئویل و کینایەو واتا شاراوەکان ناگەن و سواری قسەی خۆیان دەبن، تەنانەت شەرم ناکەن دۆستانی خوداو (**الراسخون في العلم**)یش کافردەکەن و سڵ لەو قسانەش ناکەنەوە، ئەوانەی ئیشاراتەکانیان پڕیەتی لە مانای گرنگ، هەموو کەس لە زاهیری قسەکانیان حاڵی نەبووە، ئیتر چۆن درووستە بەوانە بووترێت کافر، کە یەکێك ئیمانی داماڵی بێت و وازی لێ هێنا بێت، ئەو کاتە پەنا بەخودا لەدین دەردەچێت. تەنانەت کەسێکیش کە جنێو بەخودای بێ باوەڕەکان بدات و ئەوانیش (پەنا بەخودا) جنێو بە خودای حەقیقی بدەنەوە، ئەوە پێچەوانەی فەرمانی خودا دەجوڵێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿**وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ**﴾.الأنعام /١٠٨. ئەوە نابێت بەو کەسەی بووەتە هۆکار بڵێیت کافربووە، بەڵکو گوناهبارە، مەگەر بەو نییەتە جنێوەکەی پێ دابێت ،کە گوێی لە جنێوی ئەوانیش بێت بیدەن بەخودا! (پەنا بەخودا) کە ئەمە بە دڵنیاییەوە بەکۆی ڕای زانایان پێی کافردەبێت.

بۆیە وتەو فەرموودەی دۆستانی خودا پڕیانە لە ئەسرار، ئەوانەی کە لە عیلمی لەدونی بەشیاندراوە، لە زاراوەو قسەکانیان حاڵی دەبن، ئەوانەش کە نەزان و بێ ئاگان و شارەزایش نین، ئەوە خۆیان تووشی هەڵدێرەی فیکری دەکەن و هەرگیز سەرفراز نابن. بۆ زیاتر بنوارە: الإتحاف ٦٧/٢.

ئاشکرابببێت ئەوا ئەحکامی شەرعی بەتاڵ دەبێتەوە.[1]

ئەگەر مەبەستی بەتاڵبوونەوەی پێغەمبەرایەتی لە حەققی ئەوانەدا نەبێت کە لاوازن و بەرگەی ئەو بارەگرانەیەناگرن، چونکە ئاستی تێگەیشتنیان کەمەو ناتوانن لەهەموو ڕاستییەکان وەك خۆی حاڵی ببن، ئەگەر خاوەنی ئەم قسەیە ئەمەی مەبەست بێت، ئەوە قسەکەی تەواو نییە، بەڵکو قسەی ڕاست ئەوەیە کە هێچ جۆرە ئاڵۆزی و دژایەتییەك نییە تیایدا، وە بەڕاستی ئەوەی کە خاوەنی پلەی کەماڵە، ئەوکەسەیە: کە نوورو ڕۆشنایی مەعریفەت و خوداناسییەکەی نووری وەرع و خۆپارێزی و تەقواکەی ناکوژێنێتەوە، وە بەڵگەو مایەی بوون و مانەوەی ئەو وەرعە پێغەمبەرایەتییەکەیەتی[2].

---

(١) بنوارە (قوت القلوب) ٢/٩٠.

(٢) ئەم بابەتەش پێویستی بەوەیە لەسەری ڕابووەستین و ئەوەی کە پسپۆڕانی ئەو مەیدانە ڕوونیان کردۆتەوە هەر لە دەمی خۆیانەوە گرێ کوێرەکان بکەینەوەو لە ڕاستییەکانیش حاڵی ببین.
بۆیە لەم ڕوانگەوە ئیمامی غەزالی ((قدّسَ الله سرّه) لە پەڕاوی (الإملاء)دا لاپەڕە ٣١ دەفەرموێت: ئەم باسە ئەگەر چی بە زاهیری قورسەو گرانە، بەڵام لەڕاستیدا خوێنەر بەکەمترین سەرنج و تێڕامان دەتوانێت بگاتە ڕاستییەکان، بەمەرجێك ئەوندە شارەزابێت کە لەسەرچاوەی قسەکانیان حاڵی ببێت و، لە ڕێبازەکەیان شارەزابێت و، لە سیڕی ئولوهییەت تێ بگات، وە بە ناسینی ئەو سیڕی ئولوهییەتەیە کە شیاو دەبێت بۆ وەرگرتنی پێغەمبەرایەتی، ئەو کەسەی کە بە هۆی عیلمی یەقینی دڵیەوە گەیشتووە بە خودا، ئەگەر خاوەنی ئەو یەقینە نەبوایە هەر لە سەرەتاوە نەدەبوو بە پێغەمبەر،
**ئەمەش لە دوو حاڵەت تێناپەڕێت:**
**یەکەم:** یان ئەو دەرکەوتنی نهێنیی ئولوهییەتە لە خوداوە بۆی ئاشکرابووە، کە لە

ئەنواری خودایی بەسەر دڵیدا دەڕژێت کە پێشتر لێی دوور بووە، بەو شێوەیەی کە دڵی ئەوەندە بێ هێز بووبێت کە بەرگەی ئەو حاڵەتە کوتوپڕییە نەگرێت و سەرسامی بکات و هێزی لەسەر خۆی نەهێڵێت، هەستیاری بۆ خۆی و دەوروبەری نەمێنێت، بە شێوەیەك لە جیهانی دونیای بپچڕێنێت، ئەوەش کە بگاتە ئەم حاڵەتە لە حەقی ئەودا پێغەمبەرایەتی پوچەڵ دەبێتەوە، چونکە ناتوانێت بیناسێت، یان بیخاتە مێشك و ئەقڵیەوە، چونکە شتێکی لەوە گرنگتر ڕوبەڕووی بووەتەوە، کەهەموو شتێکی لە بیر بردووەتەوەو، لەوانەیە هۆکاریش بێت بۆ مردنی، چونکە بەرگەی ئەوبارە قورسە ناگرێت، وەك دەگێڕنەوە گەنجێك سالیکی ڕێگای ئاخیرەت دەبێت، خستیانە بەرچاوی حەزرەتی ئەبایەزیدی بەسطامی کە ببینێت، ئەویش خۆیی نیشانداو گەنجەکە بەرگەی نەگرت و وەفاتی کرد، وتیان بۆچی وەفاتی کرد؟

فەرمووی: حاڵەت و سیڕو فرمانێك لە سینەی دابوو، کەمنی بینی ئیمجا حەقیقەتی ئەوحاڵەتەی بۆ دەرکەوت و بەرگەی حاڵەتەکەی نەگرت و مرد.

**دوهەم:** وەیا ئاشکراکردنی سیڕەکە لە کەسێکەوەبووە کە زانابووە بەو ئەسرارەو ئەو هەواڵی بەم دابوو، ئەوکاتە نبووەتەکە لە حەقی هەواڵدەرەکەدا باتڵ دەبێتەوە، چونکە نەهی لێکراوە کە سیڕ بدرکێنێت و ئەو درکاندوویەتی، فرمانی پێدراوە قسەنەکات و ئەو کردوویەتی، هەر بەم شێوەیەش ئەگەر سیڕی نبووەتیش بۆ دڵی زانایەك ئاشکرا ببێت، ئەوە لە حەقی ئەو زانایەدا سیڕی زانستی لەسەر پوچەڵ دەبێتەوە، چونکە حەقیقەتی پێغەمبەرایەتی کەس نایزانێت جە لە پێغەمبەر نەبێت، ئەگەر بۆ دڵی یەکێکی تر ئاشکرابێت، ئەوا عیلم پوچەڵ دەبێتەوە لەحەقیدا، چونکە ئیتر کاری بە سەرنجدان و بەڵگەو تێڕامان نامێنێت، بەڵکو هەمیشە وەك پێغەمبەرێك خۆی دێتەبەرچاو، دەبێت شتەکان بزانێت و یەکسەر بکەوێتە دڵیەوەو، خۆی بۆ هیچ فرمانێك ماندوو نەکات و ،چاوەنواڕی

# ڕونکردنەوەیەك

## لەبارەی باس و چۆنیەتی جیاوازی لە میانی زاهیر و باطین دا

ئەگەر بڵێیت: ئەم ئایەت و فەرموودەو هەواڵانە چەندین تەئویلی جیاجیا ڕویان تێ دەکات، کەواتە چۆنیەتی جیاوازیمان بۆ ڕوون بکەرەوە، لە میانی

---

کەشفی حەقائیق دەکات، ئەمەش دەبێتە ئەصڵێك بۆ کارەکانی و، هەمووکەسێکی تریشی پێدەپێورێت.

وەئەگەر ئاشکرابوونی سیڕەکە بەهۆی کەسێکەوە بوو خودا ڕزقی ئەو شارەزابوونەی پێدابوو، ئەوکاتە بەتاڵبوونی زانستەکە لەحەقیقی هەواڵدەرەکەدا دەبێت، چونکە هەواڵی بەکەسێك داوە کە نەشیاوە و ئەهلییەتی ئەو زانستەی نییە، **دواهەمینیشیان ئەوەیە:** کە ئەوەی سیڕی زانست بۆ کەسانی تر ئاشکرابکات، ئەوەحوکمە شەرعییەکانیش پوچەڵ دەبێتەوە، چونکە هەرکەسێك بەدڵنیاییەوە بزانێت بۆ کوێ دەڕوات و چی بەسەر دێت و تەقدیری خودایی چۆن دەبێت بەرامبەری، ئیتر بەندایەتی ناکات، ئەوەی کە بزانێت ئەهلی بەهەشتە نوێژو ڕۆژوناگرێت، چونکە ئەوەندە بەهێز نییە کەبڵێت **(أفلا أكون عبدا شكورا)** بەم شێوەیە ئەحکامەکان لەحەقیقیدا بەتاڵ دەبێتەوە، لەدوای ئەم شیتەڵ کارییە دەبێت بڵێین: فەرموودەکەی سەهلی توستوری (خوای لێ ڕازی بێت) باس لەوە ناکات کە ئەم کارە ڕوودەدات، بۆیە دەڵێت: ئەگەر ڕویدا!! وەك ئەوەیە کە بوترێت: ئەگەر مرۆڤ دووباڵی ببوایە دەفڕی! ئەگەر بەشەر فریشتەبوایە ئارەزواتی نەدەما، دەی خۆ تا قیامەت ئەو ئەگەرانە نایەنەدی، ئەویش ئەرموویەتی ئەگەر ئەو سیڕە کەشف ببێت، ئەمەش ڕونادات چونکە خودای گەورە یاساو ڕێساو سوننەتی خۆی بۆکەس تێك نادات. ئەوەش شایستەبێت کە سیڕی خۆیی بۆ ئاشکرابکات ئەوا دەبێتە ئەمینداری سیڕی خودایی کە هەرگیز ئاشکرای ناکات . بنواڕە: الإتحاف ٢/٦٨—٦٩

زاهیرو باطیندا، چونکە بەڕاستی باطین و شاراوە ئەگەر پێچەوانەی زاهیر و ئاشکرابوو، ئەوە بەرابەرە بە بەتاڵکرنەوەی ئەصڵی شەرعەکە، ئەوەش قسەی ئەوکەسانەیە کە دەڵێن: حەقیقەت پێچەوانەی شەریعەتە، کە ئەمەیش کوفرو بێ دینییە، چونکە شەریعەت بریتییە لە فەرمانە ئاشکراو زاهیرەکان، حەقیقەتیش بریتییە لە فەرمانە باطین و شاراوەکان، ئەگەر پێچەوانەی زاهیرەکە نەبێت و لێیشی جیاواز نەبێت، ئەوە هەردووکیان یەکێك دەبن و لەیەك جودانابنەوە، ئەو دابەشبوونەیشیان نامێنێت بۆ زانستی نهێنی و ئاشکرا، وە ئەو سیڕەیش نامێنێت کە پێویست بکات بشاررێتەوە ، بەڵکو ئەوکاتە زانستی ڕون و ئاشکرا هەر یەك زانست دەبن؟!

**بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بزانە:**

ئەم پرسیارە فرمانێکی سەخت و پرسێکی گرنگتر دەورووژێنێت، ڕاماندەکێشێت بۆ زانستی موکاشەفە،[1]، کە لامان دەدات لەو بابەتە سەرەکییەی کە باسی زانستی موعامەلەیە [2].

کە مەبەست لەم کتێبە تەنها باسکردنی (عیلمی موعامەلەیە).

---

(١)**عیلمی موکاشەفە**: بەدەرکەوتنی تەجەللیاتی زاتی خوداو دەرکەوتنی ئەو کردارانەی کە دەلالەت دەکەن لەسەر واتاکانی وەصفە شاراوەکان. ژیانەوەی زانستەکانی ئاین ٥٠٦/١

(٢) **عیلمی موعامەلە**، واتە: ئەو زانستەی کە پەیوەندارە بە ئەحواڵی دڵەکانەوە، ئەوەی کە ستایش دەکرێت وەك: خۆڕاگری و شوکرانەبژێری و، خۆف و ڕجاو، ڕەزامەندی و دونیا نەویستی و، تەقواکاری و قەناعەت و، سەخاوەت و زانینی فەزڵ و منەتی خودا لە هەموو حاڵەتەکاندا و، چاکەکردن و ، گومانی باش بردن و، خوڕەوشتی جوان و هەڵسوکەوتی شیرین و ڕاستگۆیی و ئیخلاص و دڵسۆزی. بنوارە: ژیانەوەی زانستە ئاینیەکان ٢٠٥/١.

چونکە بەڕاستی ئەو بیرو بڕوایانە کە باسمان کردن لە (ئەعمالی قلوب) و کردارە دڵیەکانن، ئەمەش بووەتە بەشێك لە دین، کە دەبێت بەڕەزامەندی تەواوەوە وەریانبگرین و دڵەکانیشمان لەسەری دابمەزرێنین. نەك بەوەی کە بگەین بەو ئاستەی کە حەقیقەت و ڕاستی هەموو شتەکانمان بۆ دەربکەوێت، تەواوی خەڵکەکە لەسەریان پێویست نییە کە زانستەکان بە شێوە حەقیقیەکەی بزانن، وە ئەگەر ئەو بابەتە عەقیدەییانە لەبەشی ئەعمال و کردارەکان نەبوایە، ئەوا لەم پەڕاوەشدا باسمان نەدەکرد، وە ئەگەر لەوانەش نەبوایە کە بە کرداری زاهیری دڵ دەناسرێت نەك بە ئەعمالی باطین، ئەوا هەرگیز نەماندەخستە بەشی یەکەمی ئەم پەڕاوەوە، وە ئەوەش بزانین کە کەشفی ڕاستەقینە[1]: صیفەتی سیڕو نهێنییە شاراوەکانی ناو دڵە، بەڵام کە قسەکان ڕامان بکێشێت بۆ جوڵانی خەیاڵ لەوەدا کە زاهیر جیاوازە و پێچەوانەی فرمانە باطینیەکانە، ئەوە پێویست دەکات کە وتەیەکی کورت لەمبارەوە باس بکەین و ئەو گومانە بڕەوێنینەوە.

**هەندێك دەڵێن**: حەقیقەت پێچەوانەی شەریعەتە، یان باطین جیاوازە و دژ بە زاهیرە، ئەوانەی خاوەنی ئەم قسانەن لە کوفروگومڕاییەوە نزیکترن لەبڕواو ئیمان[2] بەڵکو ئەسرارو نهێنییەکان تایبەتمەندن بە نزیکان و موقوڕەبینی دیوانی خوداوە، کە دەرکی پێ بکەن و لێی شارەزابن، زۆربەی زاناکانیش هاوبەشیان نین لەو زانست و شارەزابوونە، وە فێریشیان ناکەن،

---

(١) کەشفی حەقیقی: واتە ناسین و بینینی شتەکان لە سەر حەقیقەتی ئەو حاڵەی کە لەسەریی.

(٢) بنوارە: (مشکات الأنوار) ل/٦١، دانراوی ئیمامی غەزالی.

وە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێنج هۆکاری سەرەکی:

## بەشی یەکەم:

دەبێت ئەو شتە لە خۆیدا وردوو گران بێت و، زۆربەی خەڵکی نەتوانن لێی تێ بگەن، تەنها پیاوە تایبەتمەندەکان دەرکی پێ بکەن، کە ئەمانەش لەسەریانە پارێزگاری لەو نهێنیانە بکەن و، بۆ ئەهلی خۆی نەبێت بۆ کەسی تر باسی نەکەن، چونکە ئەو سیڕو نهێنیانە دەبێتە تاقیکردنەوەیەك بەسەریانەوە، نابێت بۆئەوانە باسبکرێت کە لەئاستی ئەو زانست و ئەسرارەدانین، چونکە لێی حاڵی نابن، وە شاردنەوەی نهێنییەکانی (ڕۆح) کە چەندجار جولەکەکانیش پرسیاریان لێ کردو وەڵامی نەدانەوەو وازهێنانی پێغەمبەر ﷺ لە باسکردن و ڕونکردنەوەی ئەو نهێنیانە بە هۆی ئەمەوەیە کەهەموو کەس توانای هەڵگرتن و تێگەیشتن و پاراستنی نییە[1]، چونکە بەڕاستی حەقیقەتی ڕۆح شاراوەیە، دەرك و توانای ئەو خەڵکە کۆڵە لە تێگیشتنی ڕۆح، تەنانەت گومان و بیرو هزریش کورتبین و کۆتا بینە لە تێگەیشتن لە حەقیقەتی ڕۆح.

هەرگیز وا گومان نەبەیت کە پێغەمبەریش ﷺ سیڕو نهێنی ڕۆحی نەزانیوەو بۆی کەشف نەکراوە، ئەگەر کەسێك ڕۆح نەناسێت و نەزانێت چییە، چۆن خوای خالیقی ڕۆحەکە دەناسێت؟!

دووریش نییە کە سیڕی ڕۆح بۆ هەندێك لە ئەولیاو زانا پێگەیشتووەکان ئاشکرا بووبێت، با پێغەمبەریش نەبووبن، بەڵام ئەوانە شیمەیان وایە ئادابی شەرع پەیڕەو دەکەن، ئەوەی شەرع و خاوەنی شەریعەت باسیان لێ نەکردبێت

---

(١) وەك لە ڕیوایەتی بوخاری دا هاتووە: (١٢٥) وە موسلیم: (٢٧٩٤).

ئەوانیش با پێیشیان وتبن هەر بێدەنگی لێ دەکەن[1]

بەڵکە لە باسکردنی صیفاتی خودا، چەندین زانیاری شاراوەی تێدایە، کە ئاستی پێگەیشتی خەڵکەکە بە گشتی کۆڵە لە زانینیان، وە پێغەمبەریش ﷺ تەنها باسی بابەتە زاهیری و ڕواڵەتیەکانی بۆ کردوون، ئەوەندەی لێی تێ بگەن، بەتایبەتی باسەکانی زانست و قودرەت و تەوانایی و صیفەتەکانی تری خودا، هەتا گەیشتە ئەو ئاستەی کە هەندێك کەس، وەك بەوشێوە تێگەیشتنەی کە لە واتای زانست و قودرەتی خۆیان حاڵی بوون، بەو شێوەو پێوەرەیە قیاسی صیفەتەکانی خودایان کردووە لە صیفەتەکانی خۆیان، تا هەندێکی کەم بۆ واتاو مەبەستەکەی بچن، زانست و تەوانایی خۆیانیان کردۆتە جۆرێك پێوەر بۆ ئەو حاڵی بوونە لە صیفەتی خودا، خۆئەگەر باسی هەندێك صیفاتی تری بکرایە، کە لە خەڵکیدا نمونەکەیشی نییە، ئەوا خەڵکەکە لێی حاڵی نەدەبوون. بەڵکو ئەو چێژەی پیاو و ژن لە درووست بووندا هەستی پێدەکەن، ئەگەر بۆ منداڵ و شلەپەتە باس بکرێت، تێی ناگان، مەگەر بە بۆنەی لێکچواندنی بە چێژی ئەو خواردەمەنییەی کە هەستی پێ دەکات، ئەمەش نێگەیشتنی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو نزیکبوونەوەیەکە لەوەی کەمترین ئاستی تێگەیشتنی

---

(١) کەواتە لەو ڕووەوە کە پێغەمبەر ﷺ سەرچاوەی هەموو مەعریفەت و زانستییەکە و بە ئەمری خودا باسی ڕۆح و ماهیەت و حەقیقەتی نهێنییەکانی بۆ نەکردوون، مانای وایە نابێت کەسانێکی تر ئەو باس و خواسانە بکەنەوە و ئاشکرای بکەن، بالە ڕێگەی پێغەمبەریشەوە ﷺ زانیبێتیان، کە دەشزانین ئەوەندەی زانایان لە بارەی ڕۆحەوە جیاوازی بیروڕایان دەربڕیوە، باوەڕناکەم هیچ پرسێکی تر ئەوەندە ڕای جیاوازی لە سەر بووبێت، بۆیە بێدەنگی لێ بکات و بڵێت: ئەوە فرمانی خودایە، باشترە لە قسە لە سەر کردنی. وەك قورئانی پیرۆز فورموویەتی: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (الإسراء/٨٥).

هەبێت بەرامبەری.

چونکە دەبێت ئەوە بزانین: کە جیاوازی صیفەتەمانی خوداو و تەوانایی ئەو زاتە، لەگەڵ زانستی دروستکراوەکانی و هێزی تەوانایان زۆر زیاتریشە لەو جیاوازییەی لە میانی چێژی درووست بوون و خواردندا هەیە.

**بەکورتی:** ئەوەی مرۆڤ دەتوانێت دەرکی بکات، تەنها خودی خۆی و صیفەتەکانیەتی، لەوەی کە ئێستا ئەوانەی تێدایە، یان لە پێشتردا ئەو صیفەتانەی تێدا بووە، لە پاشان بە پێوەری ئەوەی بۆ خۆیی زانیوە، صیفەتی خەڵکی تریش دەپێوێت و، بە قیاس لەسەر خۆی ئەوانیش دەزانێت،

لەپاشان لەوەش دڵنیادەبێت، کە جۆرە جیاوازییەك هەیە لە میانی خاوەنی صیفەتەکاندا، لە شەرەف و بەرزی و کەماڵدا، تەنها ئەوندە لە توانای ئادەمیزاددا هەیە کە هەموو ئەو صیفەتانەی کە خودا خۆیی پێ وەصفدار کردووە بۆ خودای بسەلمێنن ، یان بۆخودا بڕیاردراوە بۆی بڕیاربدەن، لە بوونی کردار و زانست و تەوانایی و باقی صیفەتەکانی تر، لەگەڵ داننان بەوەی کە صیفەتەکانی خودا لە هەموو ڕوویەکەوە گەورەو مەزنتر و بەرز و پیرۆزترن، کەواتە زۆربەی لادانەوەکەی کە شتێکی لێ حاڵی ببێت بە هۆی صیفەتەکانی خۆیەوەیەتی، نەك لەسەر ئەو تایبەتمەندییانە کە تەنها پەروەردگار تایبەتی کردوون بە خۆیەوە، لە صیفەتی جەلال و دەستەڵات. هەر لەبەر ئەمەیشە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((لاَ أُحصي ثَناءً عَلَيكَ، أَنتَ كَما أَثنَيتَ على نَفسِكَ))**[1] (واتە: ناتوانم ئەوەندەی شایستەیی تۆ، سەناو ستایشت بکەم بەو شێوەیش کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە). ئەمەش ئەوەناگەێنێت کەهیچ

(١)أخرج مسلم (٤٨٦)من حديث عائشة رضي الله تعالى عنها أنها سمعت رسول الله

پێ نەکرێت و بڵێت: من ناتوانم لەوەندەیش کە تێی گەیشتبێتم و دەرکم پێ کردبێت ئەوەندە ستایشت بکەم، بەڵکو بەو واتایەی کە ئیعتیراف و داننانە بە نەتوانیندا، بەوەی کە ناتوانێت وەك حەقیقەتی خۆی چۆنە ئاوا تاریف و ستایشی خودا بکات. بۆیە هەندێك لە عاریفان فەرموویانە:

کەس نەیتوانیوە حەقیقەتی خودا بناسێت و بزانێت جگە لەخودا خۆی.[1]

---

ﷺ يقول ذلك في سُجوده، قاله العراقي، قلتُ: قال مسلم حدثنا أبوبكر بن أبي شيبة حدثنا أبو أسامة هو جاد ابن أسامة عن عبد الله بن عمر عن محمد بن يحى بن حبان عن الأعرج عن أبي هريرة عن عائشة رضي الله عنها قالت: **فقدت رسول الله صلى الله عليه وسلم ذات ليلة من الفراش، فالتمسته فوقعتُ يدي على بطن قَدميه وهُو في المسجد، وهما منصوبتان وهو يقول: اللَّهم إني أعوذ برضاكَ من سخطك، وبمعافاتك من عقوبتِكَ، وأعوذ بكَ منكَ لا أُحصي ثناءً عليكَ أنت كما أثنيتَ على نفسِك**. وأخرجه الامام أحمد عن أبي أسامة قال الحافظ ابن حجر في تخريج أحاديث الاذكار: وفي السند لطيفة وهي رواية صحابي عن صحابي أبو هريرة عن عائشة. **الإتحاف ٧١/٢**.

(١) ئیمامی غەزالی فەرموویەتی: بەڵکو دەڵێم: هەرگیز ڕونادات کە غەیری پێغەمبەران کەسێکی تر پێغەمبەر بناسێت، ئەوەش کە پێغەمبەر نەبێت لە ناسینی پێغەمبەرایەتی تەنها ناوەکەی دەزانێت. تایبەتمەندییەك هەیە لە پێغەمبەراندا جگە لە پێغەمبەران کەس پێیان نازانێت، ئەوەش کە شتێکی لێ تێ بگات تەنها لە ڕێگەی بۆچون و تەشبیهەوەیە، وە هیچ کەسێك حەقیقەتی مردن و بەهەشت و دۆزەخیش نازانێت مەگەر بمرێت و بچێتە ناویانەوە، بۆیە جونەیدی بەغدادی ڕاستی فەرمووە کە دەڵێت: وەڵلاهی جگە لە خودا کەس حەقیقەتی خودای نەزانیوە، بۆیە قورئان ئەم ڕاستییە بەرجەستە دەکات و بە ئەشرەفی مەخلوقاتی خۆی ﷺ دەفەرموێت: **سَبِّحِ اسمَ رَبِّكَ الأَعلى !!** الأعلى/١.

**هەروەها ئەبوبەکری صددیق (رضي الله عنه) فەرموویەتی:**

حەمدوسەنا بۆ ئەو خودایەی ڕێگەی نەداوە بە دروستکراوەکانی کە بیناسن، مەگەر لە ڕێگەی ئەوەوە ستایشی بکەن، کە دان بنێن بە عیجزو نەتوانینی خۆیاندا.[1] با ئیتر جڵەوی قسەکانمان لەو شێوازەوە بگۆڕین و لەم

---

ناوی بەرزی خودای خۆت خاوێن ڕابگرە، واتە: تەسبیح و تەنزیهی زاتی خودای نەداوە بە خۆشەویستە بەڕێزەکەیشی، بەڵکو لە ڕێگەی ناوە پیرۆزەکانیەوە تەسبیحاتی خودا بکات!! هیچ کەسێك ناتوانێت لە خوداوە نزیك ببێتەوە، مەگەر بۆ موقەڕەبین لە ڕێگەی ئەسمائو صیفاتەوە، ناوە پیرۆزەکانی و صیفەتە بەرزەکانی. تەنانەت شێخ عبدالوهاب ی شەعرانی فەرمویەتی: ئەوەی بڵێت من زاتی خودام خۆش دەوێت لێی قەبوڵناکرێت، بەڵکو دەبێت بڵێت: من صیفەتی خودام خۆشدەوێت، زاتی خودا تەنها لە ڕێگەی ناوەجوانەکانی و صیفەتە پیرۆزەکانیەوە عاریفەکانن دەتوانن خۆشەویستی و پەیوەندی ببەستن، چونکە بەندە ناتوانێت ڕاستەوخۆ بە زاتی خودا ئاشنا ببێت، چونکە نیسبەت و تەناسوب و لێکچواندن لە میانی بەندەو خالیقدا نییە، بەڵام دەتوانێت صیفەتێکی خودای خۆش بوێت، یان هەمووی، چونکە صیفاتە مەعانییەکانی خودا، نەخودایەو نەغەیری خودایشە (لاهُوَ وَلا غَیْرُه) وەك ڕاڤەیان کردووە. بۆیە چرکەساتێك پێش وەفاتکردنی زەننونی میصری پرسیاریان کرد: حەزت لە چییە؟ فەرمووی:

حەزم لەوەیە کە بیناسم با تەنها بۆ چرکەیەکیش بێت. الإتحاف ٧١/٢.

(١) فەرموودەیەکی مەشهوری حەزرەتی صددیق (رضي الله عنه) هەیە:

( **العِجزُ عَن دَركِ الإدراكِ إدراكٌ**) ئیمامی غەزالی دەفەرموێت:

کە گەیشتیتە ئەو ئاستە لە مەعریفەتی خودادا کە بەدڵنیاییەوە بزانیت ئیتر

دەریا بێ پەیە بپەڕێینەوە بۆ کەناری دەریاو بۆ لای مەبەستی سەرەکی، ئەویش ئەوەیە کە هەر یەکێك لەو بەشانەی باسمانکردن، هەرگیز ناچنە ژێر بیرو توانای تێگەیشتنی هیچ کەسێکەوە، لەوانە (ڕۆحە)، وەهەروەها هەندێك لە صیفەتەکانی خودای گەورە، وە هەر لە وانەیە کە هێما کردن بۆ نمونەیەکیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((إن للـهِ سُبحـانَه سَبعيـنَ حِجـاباً مِن نُـور،لَو كَشفَها لأحْرقَتْ سَبَحاتُ وَجْهِه كُلَّ مَـنْ أدركَـهُ بَصَـرهُ))** [1]واته: خودای گەورە حەفتا پەردەو حیجابی هەیە لە نوور، ئەگەر ئاشکرایبکات

---

ایناسیت و تەوانات نییە و، هەرگیزیش ناتوانیت لە حەقیقەتی خودا حاڵی ببیت، ئەوە دوا پلەی بەرزبوونەوەی پلەی خوداناسەکانە، کە بە بەڵگەی درووست ئەم ڕاستییەیان بۆ دەرکەوتووە، ئەوە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە خودایان ناسیوە، بەڵام ناسینی خودا لە ڕێگەی ناسینی ئەسماء و صیفەتەکانیەوە، ئەو دەرگایە کراوەیەو هەرکەسە بە پێی تواناو شارەزایی و ئامادەباشی خۆی دەتوانێت لەو بازاڕەدا بەهرەمەند ببێت. بۆ زیاتر: بنواڕە الإتحاف ٧٢/٢.

(١)بەم شێوەیە ئیمامی غەزالی لە کتێبی (مشكاة الأنوار) دا باسی کردووە، بەڵام ئەوندە هەیە فەرموویەتی : **مـن نُـورٍ وظُلمـةٍ، والبـاقي سَـواء**، قـال وفي بعـض الروايـات **سَبعُمائة، وفي بَعضِها سَبعين ألفاً**. آه. وفي كتـاب الأسـماء والصـفات لابي منصـور التميمي أنه وصفَ ربَّه عزَّوجل فقال: **حِجابُه النُّور لو كَشفَه لأَحرقَت سَبحاتُ وجهِهِ كُلَّ شيء أدركَتْهُ، وفي رواية: دون الله سَبعونَ ألفٍ مِن نورٍ وظُلمة** آه.

وقال العِراقي: أخرَجَ أبو الشيخ بن حبان في كتاب العظمة مِن حديث أبي هريرة: **بينَ اللهِ وبينَ الملائكةِ الذين حَولَ العَرش سَبعونَ حجاباً مِن نُورٍ** وإسنادهُ ضعيف. وفيه أيضا مـن حـديث أنـس قـال قـال رسـول الله ﷺ لجبريـل: **هَـل تَـري ربَّـكَ؟ قـال إنَّ بَيني وبَينـهُ لسَبعين حِجاباً مِن نُورٍ**. وفي الكبير للطبراني من حديث سهل بن سعد:

**دونَ اللهِ تعالي سَبعون الفَ حِجاب من نورٍ وظُلمة**، ولمسلم من حديث أبي موسي **حِجابُه النُّور لَو كشفَه لأحرقَت سَبَحاتُ وَجهِه ما انتَهى إليهِ بَصَره مِن خَلقه**. ولابن

وڕوخساری پیرۆزی دەربخات، ئەوا نووری پرشنگداری ڕوخساری خودا هەموو ئەوانە دەسوتێنێت کە بەری بکەوێت.

## بەشی دووهەم:

لەو فرمانە شاراوانەی کە تەنانەت ڕێگەش نەدراوە بە پێغەمبەران و صددیق و ڕاستگۆکان کە باسی بکەن: هەندێکیان بەخۆیان واتاکانیان ئاشکرایەو بۆ لێ حاڵی بوون تووشی کورتی و ماندووبون نابن. بەڵام ئەوندە هەیە کە باسکردنی زیان بە زۆربەی گوێگران دەگەێنێت، بەڵام زیان بە پێغەمبەران و صدديقەکان ناگەێنێت، سیری (قەدەری خودایی) یەکێکە لەو بەشانەی باسمان کرد، کە ڕێگەنەدراوە ئەهلی زانست بڵاوی بکەنەوە، (نەك لەبەر ئەوەی کە نەیزانن، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ئەوانی تر ناتوانن خۆیان لە بەردەم ئاسەواری باسکرنی ئەو سیڕانە ڕابگرن)

دووریش نییە کە باسکردنی هەندێك لەو حەقایق و ڕاستیانە زیان بە هەندێك خەڵك بگەێنێت، وەك چۆن نووری تیشکی هەتاو زیان لە چاوی شەمشەمە

---

ماجە: **كل شيء أدركه بَصَره**، انتهى . ئەبو مەنصور التميمي لەوکتێبەدا دەڵێت:

هەر هەواڵێك باسی پەردەو حیجابی تێدا بێت، ئەوە واتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر خەڵك، چونکە هەر ئەوانن کە مەحجووبن لە بینینی خودا، خۆ خالیق داپۆشراو نییە لەوان، چونکە خودا ئەوان دەبینێت، وە هەرگیز درووست نییە بە حیجابێك خۆی داپۆشێت، چونکە ئەگەر بێجگە لە خودا هەرچییەك دایپۆشێت دەبێت داپۆشەرەکە لەو گەورەتر بێت، خۆ بە دڵنیاییەوە خودای گەورە سنوورو ئەمپەڕەو پەڕی نییە، کەواتە نابێت غەیری خودا هیچ شتێك بتوانێت خودا دا بپۆشێت، وەك فەرموویەتی: ﴿**كلاً إنَّهم عَن رَبِّهم يَومَئِذ لَمحجوبون**﴾، نەیفەرمووە خودا ئەوانی لێ دیار نییە، بەڵکو فەرموویەتی: **ئەوان خودایان لێ دیار نییە**. بۆ درێژتربنوارە:الإتحاف ٧٣/٢.

کوێره دەدات، وه هەروەها چۆن بۆنی گوڵ زبان له قالۆنچه دەدات!!

ئەمەی که باسی دەکەین هەرگیز دوور نییه، چونکه دەبینیت کەوتمان: کوفر و زینا و گوناهه گەورەکان و شەڕەنگێزی و خراپه بەگشتی هەمووی به قەزاو بڕیارو ئارەزوو ئیرادەو مەیلی خودادەبێت (سبحانه وتعالی)،ئەم وتنه له حەقیقەتدا قسەیەکی ڕاست و درووسته، لەگەڵ ئەوەشدا (چونکه هەندێك کەس توانای تێگەیشتنیان له هەموو قسەیەك نییه) زبانی زۆریان بەرکەوتووه له لێکدانەوەیان بۆ ئەو دەققه دروسته، دەزانین که (موعتەزیلەکان) دژ بەوەن که ئەم کردارانه بدەنه پاڵی خوداوه، چونکه وا گومان دەبەن که ئەمانه صیفاتی نەقص و کەمین و، مانای نەفامی و عیجزو نەتوانین و، نەبوونی پەندیاری و، ڕازی بوون به خراپه و ناپەسەندی و زوڵم کردن دەگەیێنێت، (چونکه له نهێنی ئەو بابەته عەقیدەییه تێنەگەیشتون و، به حیسابی خۆیشیان دەیانەوێت خودا لەو صیفەته نابارانه بپارێزن، بۆیه ئەو صیفەتانەیان داوەته پاڵ بەندەکان).

بۆ نموونه ئیبن و ڕەواندی [(١)]، وەکۆمەڵێك له ڕسوا و ناحاڵییەکان بەهۆی ئەو تێنەگەیشتنەوه بوون به بێ باوەڕ [(٢)]، هەربەمشێوەیه ئەگەر سیری قودرەت و تەوانایی خودا ئاشکرا بکرێت، لەلای زۆربەی ئەو خەڵکه ناحاڵییه وا

---

(١) ڕەوانـدی یەکـێکه له مولحیـده بەناوبانگەکـان، کتێبێکـی دانـاوه له پشـتگیری ڕای موعتەزیلەکـان، وه پڕیەتـی له کـوفرو بێـدینی، ئەم ڕاوەنـده گونـدێکه له ناوچەکـانی ئەصفەهان و خۆیشیان شیعەن، بنواڕە : الإتحاف ٧٤/٢.

(٢) زۆربەی موعتەزیله ڕای وایه هەرچی تاوانەکانەنابێت به ئیرادەی خودا بکرێت،وه باوەڕیان وایه خودا خەلقی کرداری بەندەکانی خۆی ناکات، بەڵکو خۆیان خاوەنی کردەوەکانینی. وه بەغـدادییەکانیان وا گومانیـان بـردووه: خـوای گەوره ئـارەزووی زینـا و تـاوانی له جەسـتەی مرۆڤدا خەلق نەکردووه، وه دروستیش نییه کاری وابکات! بنواڕە هەمان سەرچاوه ٧٤/٢.

گوماندەبەن کە ئەوە عیجزو نەتوانینە، چونکەئەوندە زانست و هێزی تێگەیشتنیان بەهێز نییە لەو ڕاستییە بگەن و ئەو گومانە لە دڵیاندا برەوێنێتەوە.

ئەر کەسێك پرسی: ئەگەر کاتی هاتنە پێشەوەی قیامەت باس بکرێت، کە دوای هەزار ساڵی ترە، یان زیاتر یان کەمتر، ئەوە قسەیەکی ڕوونەو لێی تێدەگەن، بەڵام بۆیە نەوتراوە، لەبەر بەرژەوەندی بەندەکان و، لە ترسی ئەوەی دوچاری زیان نەبن، چونکە لەوانەیە ئەو ماوەیە دوور بێت و تووڵی ئەمەلیان زیاد ببێت، دڵەکانیان ڕەق ببێت، وەئەگەر بەندەکان زانییان کە کاتی لێپرسینەوەو تۆڵە دوورەو زۆری ماوە، ئەوا پشتوێنی لێ دەکەنەوەو بە ئیهمالی دەیگرن و خۆیانی بۆ ئامادەناکەن، لەوانەیشە لە عیلمی خودادا زۆر نزیك بێت، وە ئەگەر بەو شێوە باسی بکرێت، ترس و خۆف دەچێتە دڵی بەندەکانەوەو، توانای کارو ژیانیان نامێنێت و دونیایش وێران ببێت. ئەگەر ئەم ڕونکردنەوە بەم شێوە درووست بێت، نموونەیەکە بۆ حیکمەتی بەشی دووهەم کە بۆچی دەیزانن و باسی ناکەن.

## بەشی سێیەم:

ئەو شتە بەو شێوە بێت کە ئەگەر بە ڕاستەوخۆیی و بێ پێچ وپەنا باسی بکەیت واتاکەی ئاسایی بێت و لێی تێ بگەیێن و زیانیش نەبەخشێت، بەڵام بە کینایە و بە شێوەی وشەئارایی و خواستن و ئیستیعارەو بەکارهێنانی ڕەمزی تایبەتی بگەیێنرێت، بۆ ئەوەی زیاتر کاریگەری لە سەر گوێگران هەبێت، گرنگی ئەو بابەت و فرمانەش باشتر بگەیێنێت، وەك ئەوەی کەسێك بڵێت:

( فڵان کەسم بینی ملوانکەی گەوهەری دەخستە ملی بەرازەکانەوە)، بە کینایە مەبەستی ئەوەبێت کە زانست و حیکمەتی بەکەسانێك دەوت و دەبەخشی، کە هەرگیز شایستەی نین، ئەوەی یەکەمجار گوێی لەم قسەیەبێت

لەوانەیە واتا زاهیریەکەی بچەسپێتە دڵیەوە، بەڵام زانایەکی لێکۆڵەر کە سەرنجی داو زانی ئەو مرۆڤە هیچ گەوهەرێکی بەدەستەوە نەبووەو، لەو جێگەیەشدا بەرازی تێدا نەبووە. بەبیرو زیرەکی خۆی ڕاستییەکەی بۆ دەردەکەوێت، کە مەبەستە نهێنی و شاراوەکەی چییە.( گەوهەر واتە: زانست، بەرازیش واتە نائەهل و نەشیاو) کەواتە: خەڵکەکە بۆ لێکدانەوە و ئەندازەی تێگەیشتنیان جیاوازن، هەر لەم بارەوەیە کە شاعیر دەڵێت:

رَجُــلانِ خَيَّــاطٌ وآخَــرُ حائِكُ　　　مُتَقابِـلانِ على السِّماكِ الأَعزَلِ
لا زالَ يَنسِجُ ذاكَ خِرقَـةَ مُـدبرٍ　　　وَيَخيطُ صاحِبُهُ ثِيــابَ المُقبِلِ

( واتە: دوو وەستا بەرامبەری یەك دانیشتوون و یەکێکیان کۆتایی بەکاری ڕستنەکەی دەهێنێت و ئەویشیان تازەکارەو خەریکی دورینی بەرگی نوێیە لە بەردەستیدا، یەکێکیان پینەو چنینی تایبەت بەخەرقەیەك دەکات کە لەبەری کەسێکدایە، کە پشتی تێ دەکات و بەجێی دەهێڵێت، وەك چون ئەستێرەی ڕیماح، لەگەڵ دەرکەتن و هەڵاتنی ئەستێرەی ڕوناکی، لەکاتی گزنگی بەرەبەياندا تاریکییەکە دەپێچێتەوەو ئەستێرەکەش پشت هەڵدەکات. کە وەستای دووهەمی بەرگدرووی شوبهاندووە بەو ئەستێرە پرشنگدارەی کە بەناوبانگە بە سیماکی ئەعزەل، جوڵەی دوو ئەستێرەی ئاسمان، کە یەکەمیان کاریگەری نییەو، وەك کاری چنین و ڕستنەکەوایە، ئەویشیان کاریگەری ڕواڵەتی هەیە، وەك ئەوەی بەڕواڵەت دەیبینیت، کە ستارەی سیماك هەڵدێت و، بە دوی خۆیدا ڕۆشنایی دێنێت و، تاریکاییش پشت هەڵدەکات و نامێنێت، کەسێکی نەشارەزا کە سەیری ڕواڵەتی ڕوداوەکان بکات، وادەزانێت ئیقبال و هەڵکشانی نوور، بەستراوە بە جوڵانەوەی ئەو ئەستێرەی سیماکەوە، وە ئیدبارو داکشانی زوڵمەت و تاریکیش، پەیوەستە بە جوڵانی ئەو ئەستێرەی ڕیماحەوە، بۆیە

لێرەدا تووشی سەرگەردانییەك دەبێت، نازانێت كـە كـارىگەری سـەرەكـی تەنها خودایەو، ئەستێرەكان لەم بوارەدا هیچ توانایەكیان نییە، جگە لە سەبەبییەت و هۆكار بوون نەبێت.

بۆیە لێرەدا ئیمامی غەزالی ئەو نموونە دەهێنێتەوە، تەنها بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو دوو جۆرە كەسەیە: یەكێكیان نەزانە و كشان و داكشانی ئەستێرەكان بە كارىگەر دەزانێت و، قودرەت و توانای خودای بیر دەچێتەوە، ئەوشیان زانای تێگەیشتووە، هەمووی هەر لە خوداوە دەیزانێت و پاشماوەی شتەكان هەمووی بە هۆكار دەزانێت و سەیر دەكات. بۆیە لە ڕاڤەی ئەو شیعرەدا دەڵێم :

**وەسـتای ڕسـتـن و چنیـن و خـەیاتێكی بـەرگ درووێ**

**ئەمیان لەگەڵ كشانەوەی ئەستێرەیەك خەرقەی درووێ**

**ئەویـان لەگـەڵ هەڵاتـن و ئیقبالی نووری سیمـەكی**

**كـاری دوریی بـەرگی نـوێ، بـۆ داهـاتوو دێنێتە ڕوو**

**نـەزان لـەبـەر ڕواڵـەتی ئـاسـاری ڕەوتی ئـەو دووە**

**لەبیـری چـوو، كارىگەری یەكەم، یەكەو نابێ بە دوو [1]]**

بەڕاستی شاعیر هۆكارێكی ئاسمانی لە هاتن و هەڵكشان و ڕۆشتن و داكشانی شوبهاندووە بە دوو پیاوی خاوەن پیشە.

ئەمەش جۆرێكە لە لێكدانەوە و تەعبیر لە واتایەك، بەو صورەت و وێنەیەی كە هەمان واتا، یان هاو وێنەكەیی تێدا جێگیرە، هاو وێنەی ئەمەش فەرموودەیەكی پێغەمبەرە ﷺ

**(( إنَّ المسجِدَ ليَنزَوي من النخامَةِ كَما تَنزَوي الجَلدةُ في النَّار))** [1]،

---

(١) (ئەحسەن موفتی) بۆ واتای شیعرەكە بنوارە: فضائح الباطنية ى نووسەرو، الإتحاف٢/٧٥ .

واته: مزگەوت خۆی دێنێتەوەیەك و ناڕەحەت دەبێت بە توڕدانی تف و بەڵغەم، وەك چۆن پێستی لەش گرژ دەبێت و خۆی هەڵدەقرچێنێت، کاتێك کە ئاگر بەری دەکەوێت. وە تۆ دەبینیت کە گۆڕەپانی مزگەوت بەهۆی تف و بەڵغەمەوە گرژ نابێت و نایەتەوە یەك، مانای وایە کە ڕۆحی مزگەوت لەبەر ئەوەی کە گەورەو ڕێزلێگیراوەو دەبێت هەرواش بمێنتەوە، کەواتە تف تێکردنی سووکایەتی کردنە پێی .

کەواتە وەك چۆن پێستی مرۆڤ دەبێت لە ئاگر بپارێزرێت، وە ئەگەر سووتێنرا، ئەوا لە هەیبەتی ئەو پێستە کەمدەکرێتەوەو هەڵدەقرچێت و گرژ دەبێت و دێتەوە یەك، هەروایش ئەگەر سام و هەیبەتی مزگەوتیان شکاندو تفیان تێ کرد گرژدەبێت و دێتەوەیەك، وەك ئەوەی زوبان حاڵی مزگەوت بێزاری لەوکارە دەربڕێت.

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەرﷺ:

---

(١) رواه عبدالرزاق في (المصنف) /٤٣٣، وابن أبي شيبة في (المصنف) (٧٥٥٠)و من قول أبي هريرة (رضي الله عنه) ، قال العراقي هذا لم أرله أصلا في المرفوع وإنما هو من قول أبي هريرة رواه ابن أبي شيبة في مصنفه في تاريخ المدينة اهـ . قلت: ورواه كذلك عبد الرزاق موقوفا على أبي هريرة وفي صحيح مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه أيضا أن رسول الله صلى الله عليه وسلم: **رأى نخامة في المسجد في القبلة، فقال ما بال أحدكم مستقبل ربه فيَتَنخَّع أمامَه أيُحِبُّ أحدكم أن يستقبل فيُتَنخَّعُ في وَجهِه.**
وللحديث شاهد عن أنس بن مالك: ((**إِذَا هَمَّ الْعَبْدُ أَنْ يَبْزُقَ فِي الْمَسْجِدِ اضْطَرَبَتْ أَرْكَانُهُ وَانْزَوَى كَمَا تَنْزَوِي الْجِلْدَةُ فِي النَّارِ فَإِنْ هُوَ ابْتَلَعَهَا أَخْرَجَ اللَّهُ مِنْهُ اثْنَيْنِ وَسَبْعِينَ دَاءً وَكَتَبَ لَهُ بِهَا أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ**)) أخرجه الديلمي في الفردوس(١١٤٥) وقال ابن عراق في تنزيه الشريعة١١٥/٢ طبعة الكتب العلمية : ((فِي سَنَده من لم أعرفهُ )) .

**((أمَا يَخشى الّذي يرفَعُ رأسَه قبلَ الإمام أن يَحولَ اللهُ رأسَهُ رأسَ حِمار))**(1)،

واتە: ئایا ئەوکەسەی کە لە پێش ئیمامەوە لە سەجدەدا یان لە ڕکوعدا سەر بەرز دەکاتەوە، ئایا ناترسێت کە سەری ببێت بەسەری گوێدرێژ، یان خودای گەورە شکڵ و وێنەی بخاتە سەر شێوەکەی.

ئەوەش بزانە! کە هەرگیز بە زاهیری و ئاشکرا ڕوی نەداوەو ڕونادات کە ئەم گۆڕانەی بەسەردا بێت، بەڵام گۆڕانەکە لە ڕوی مەعناوە دەبێت، واتە:

لەبەر ئەوە نییە کە بەحەقیقەت ڕەنگ و شکڵی وەك سەری گوێدرێژی لێ بێت، بەڵکو تایبەتمەندیەکانی ئەو وەردەگرێت، کە نەفامی و گەمژەییە، هەرکەسێکیش پێش ئیمام سەر بەرز بکاتەوە، وا لەو نەفامی و گەمژەیی و نەزانینەدا، مەبەستی فەرموودەکەش ئەمەیە کە گۆڕانکارییەك لە ناخ و ناوەرۆکیدا پەیدا دەبێت، نەك لەوشکڵ و وێنەیەی کە قاڵبی مەعناکە دەیگرێتەوە، چونکە یەکێك لە ئامانجەکانی نەفامی ئەوەیە:

کە هەردوو حاڵەتەکە بەیەکەوە کۆبکاتەوەو لە یەککاتدا لەدووی ئەویش نوێژ دادەبەستێت و، لە لایەکی تریشەوە پێشیشی دەکەوێت، کە ئەم دوو حاڵەتە دژ بە یەکن و نا بێت پێکەوە کۆببنەوە.

---

(١) رواه البخاري (٦٩١)، ومسلم (٤٢٧) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه رفعه وأخرجه أبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجه كذلك كلهم في الصلاة وفي رواية: **ألايخشي أحدكم اذا رفع رأسه أي من السجود** فهو نص فيه وعند أبي داود زيادة: **والإمام ساجد** وهو دليل علي التخصيص، وألحق به الركوع، لكونه في معناه، وإنما نص على السجود لمزيد مزية فيه. إذ المصلي أقرب ما يكون من ربه فيه، و هو غاية الخضوع المطلوب. كذا في الفتح. وعند ابن خزيمة قبل الامام في صلاته وقوله رأسه أي التي خبث بالرفع تعديا رأس حمار وفي رواية ابن حبان رأس كلب

**ڕونکردنەوەی ئەوەی کە بەچیدا دەزانێت کە ئەم سیڕو نهێنییە پێچەوانەی زاهیری ئەحکامە ؟**

**یان بە هێنانەوەی بەڵگەی عەقڵییە، یان بە بەڵگەی نەقڵییە:**

# بەڵگەی عەقڵی:

بە شێوەیەك هەرگیز نەگونجێت واتای ئەو دەققە یە لە سەر شێوەی زاهیری وشەکان لێك بدرێتەوە، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

((قَلبُ المؤمِنِ بَينَ أُصبُعَينِ مِن أَصابعِ الرَّحمن))[1]،

(واتە: دڵی باوەڕدار وا لە میانی دوو پەنجە لە پەنجەکانی خودا.) [2]،

خۆ ئەگەر دڵی هەر ئیماندارێك ببشکنین ئەو پەنجانە نابینین.

کەواتە دەزانین ئەو پەنجانە کینایەیە لە تواناو قودرەتی خودا، کە نهێنی پەنجەکان و ڕۆحە شاراوەکەیە لە ناو پەنجەکاندا، بۆیە بە پەنجە دەری بڕیوە، تا کینایە بێت لە توانا و قودرەتی تەواو، چونکە ئەم جۆرە گەیاندنە کاریگەری زیاترە لەسەر نەفسی مرۆڤ و تێگەیاندنی بەرابەرەکەی، لە گەیاندنی ئەوپەڕی توانایی.

---

(١) أخرجه مسلم، كتاب القدر، باب تصريف الله تعالى القلوب كيف يشاء، (٢٦٥٤) من حديث عبدالله بن عمر.

(٢) زانایانی سەلەف لەسەر واتای زاهیری خۆی هێڵاویانەتەوەو هیچ لێکدانەوەیەکیان بۆ نەکردووە، بەڵام زاناکانی پاش ئەوان فەرموویانە: ناگونجێت لە سەر زاهیرەکەی بڕۆین، بۆیە تەئویلیان بۆ کردووە، ئیمامی ئەحمەدیش تەنها لە سێ جێگەدا تەئویلی کردووە، کە نابێت ماناکەی لەسەر زاهیری لەفزەکە لێك بدرێتەوە، یەکێکیان ئەم جێگایەیە. بنوارە الإتحاف٢/٧٦.

(بۆنمونە: کە دەڵێیت:

ئەو شارە لەسەر پەنجەی ئەمیر دەسورێتەوە، بە دڵنیاییەوە مەبەست واتای حەقیقەتی لەفزەکە نییە، بەڵکو کینایەیە لەوەی بە هێزی ئەوودەجۆڵێتەوە و بێ فەرمانی ئەو کارەکانی هەڵناسورێت)

هەر لەم نمونەو شێوەیە کە کینایە بێت لە تەواوی تەوانایی، فەرموودەی خودا:

﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (النحل/٤٠)

واتە: ئێمە کە بمانەوێت شتێك لە نەبوونەوە درووست بکەین، تەنها ئەوندەیە پێیدەڵێین: ببەو دەبێت،

واتە: ماددەو زەمانی ناوێت، ئەوەی ئێستە دەیبینن بە مۆڵەت شتەکان پێ دەگات، هەر لەبەر چاودێری کردنی عادەتە[1]،

بە پێی زاهیرەکە فەرمانی وا ناگونجێت بێتە دی، چونکە کە دەفەرموێت: (کن) ئەگەر ڕوی خیطابەکە لە گەڵ شتێکدا یە کەپێش بوونەکەیەتی، ئەوە محاڵە؛ چونکە شتێك کە هەرنەبوبێت پێش ئەوەی بێتە وجوود چۆن دەتوانێت وەڵامت بداتەوە؟!

خۆ ئەگەر دوای ئەوەش قسەی لەگەڵدا کردووە کە ئەو لە حاڵەتی بووندا بووە، ئیتر چ پێویستێکی بە دروست کردن و تەکوین هەیە؟!

بەڵام دەبینین لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە خیطابە زیاتر کاریگەری لەسەر نەفسی ئینسان هەیەو، باشتر واتای تەوانایی و بەدەستەڵاتی خوداوەند دەگەێنێت، ئەوا بەم شێوەیە فەرموودەکەی دەردەبڕێت.

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی: ٢٧١.

# ئەوەیش کە بە هۆی شەرعەوە دەزانرێت

ئەوەیە کە بگونجێت واتاکەی دابڕیت بەسەر زاهیری لەفزو وشەکەدا، بەڵام ڕیوایەتێکی تر هەبێت کە دایبڕێت بەسەر واتایەکی تردا جگە لە واتا زاهیریەکەی، وەك لە تەفسیری ئەم فەرموودەی خودادا لە (ڕێگەی درووستەوە) هاتووە: ﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً، فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا﴾.(الرعد/١٧) خودا ئاو لە ئاسمانەکانەوە نازڵ دەکات و باران دەبارێنێت، جا شیوەکان لافاویان لێ هەڵدەستێت[1].لێرەدا واتای ئاو کە لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە قورئانە، وە مانای شیوەکان دڵەکانە، وە هەندێك لە دڵەکان بەشێکی زۆریان هەڵگرتووەو جێ بووەتەوە، وەك شیوێکی گەورەکان، وە هەندێکیشیان کەمیان هەڵگرتووە، وەك شیوێکی بچووك چۆن ئاوی کەم هەڵدەگرێت، وە هەندێکیش لە دڵەکان هەر نەیانتوانی کە هیچ بگرنە خۆیان، کەفی دەریایش وەکو کوفرو دوڕوویی وایە، هەرچەندە ئەو کەفی دەریایە کەوتۆتە سەرەوە و ئاوەکەی داپۆشیوە، بەڵام جێگیر نییەو ماوەیەکەو دەڕوات، کوفریش بەم شێوەیە، کە زانست دەرکەوت خۆی ڕاناگرێت، بەڵام ئەوەی سوودی بۆ خەڵك دەبێت، وەك کە ئیمان و هیدایەتە، ئەوە وەك زیخی دەریاو وەك ئاوە صافەکە دەمێنێتەوەو، هەمیشە سوودی خۆی دەگەیێنێت. وە لەم بەشەی کە باسمانکرد،کۆمەڵێك قووڵتر بۆی داچوون و بابەتەکانی دوارۆژیشیان تەئویل کردووە، وەك فرمانی کێشانەو پێوانە و پردی صیراط و ئەوانی تر، ئەمەش داهێنراوێکی نارەوایەو بەڕێگەی ڕیوایەتی درووست لە زانا باوەڕپێکراوەکانەوە پێمان نەگەیشتووە، وە محاڵ نییە وەك چۆن باسکراوە ئاوا بە زاهیریش بێتە جێ، کەواتە پێویستە هەر بەشێوەی زاهیرە واتاکانیان لێکدانەوەیان بۆ بکرێت.

---

(١) هەمان سەرچاوە،/٢٥١.

# بەشی چوارەم

ئەوەیە: کە لەسەرەتاوە مرۆڤ بە کورتی شتەکان وەربگرێت و، لە پاشان بە درێژی لێی حاڵی ببێت، بەهۆی لێکۆڵینەوەو وەرگرتنی چێژو تاقیکردنەوەی زیاترەوە ، وەك حاڵێکی تایبەتی لێ بێت، کە پێیەوە لکابێت و لێی جودا نەبێتەوە، کەواتە ئەم دوو جۆرە زانستە جیاوازن، یەکەمیان: کە تەنها بەکورتی و ڕواڵەتی لێی حاڵی بووە، وەك توێکڵەکەی وایە،بەڵام دووهەمەکەیان وەك کاکڵەوایە، واتە یەکەمەکە وەك زانستی زاهیر وایەو، دووهەمەکەیش وەك باطین وایە، نموونەی ئەمەش وەك ئەوە وایە کە لە تاریکاییدا یان لە دوورەوە کەسێکت بەرچاو بکەوێت، جۆرە زانیارییەکی لە سەر پەیدا دەکەیت، بەڵام ئەگەر لە نزیکەوە بیبینێت یان دوای لاچوونی تاریکی بیبینێت ئەمجارەیان بەشێوەیەکی جیاواز و بە تێروتەسەلی دەیبینێت، لەگەڵ ئەوەشدا بینینە دواییەکە دژ بە بینینە یەکەمەکە نییە، بەڵکو تەواو کەری دەبێت.

زانست و بڕواو تەصدیق و متمانەپەیداکردنیش هەر بەم شێوەیە، بۆ نموونە یەکێك باوەڕی بە عیشق و نەخۆشی و مردنیش هەیە پێش ئەوەی ڕوبدات، بەڵام لەدوای ڕودانی ئەو فرمانانە کە خۆی هاتبێت بەسەریداو لەو حاڵەدا بژی، ئەوە بڕواکەی کامڵ و تەواو تر دەکات، بەڵکو مرۆڤ لە بابەتی ئارەزوات و عاشق بوون و حاڵەتەکانی تردا، سێ جۆر حاڵەتی جیاواز ڕوی تێ دەکات و بە سێ شێوەی دژ بە یەك هەست و زانینی دەگۆڕێت:

**یەکەمیان:** باوەڕکردنی بە بوونی ئەو حاڵەت و فرمانە پێش ئەوەی ڕوی دابێت.

**دووهەمیان:** جۆری باوەڕەکەیەتی لە کاتی ڕودانەکەیدا.

**سێیەم:** دوای کۆتایی هاتن بە ڕودانی کارەکان، دیارە ئەو جۆرە دڵنیاییەت بە لاچوونی برسێتی و دوای تێربوونت،جیاوازە لەو حاڵەتەی کە هەتبووە لەکاتی برسی بوونتدا.

هەروەها زانستە ئاینیەکانیش هەر بەم شێوەیە ، هەندێکیان بە هۆی حەزوچێژ وەرگرتنی تەواوەوە لەو زانستەی کە بۆی جێبەجێ دەبێت، وەك ئاگاداربوونە لە حاڵەتە شاراوو باطینەکان کە پێشتر تەنها زاهیری شتەکانی زانیوە، دیارە جیاوازی زۆرە لە میانی کەسێکی نەخۆش کە زانیاری هەبێت لە بارەی لەشساغییەوە لەگەڵ کەسێکدا کە خۆی تەندرووست بێت.

لەم چواربەشەی کە باسمان کردن، جیاوازی لە میانی خەڵکەکەدا زۆرە، بەڵام لە هیچ کام لەو بەشانەدا باطینێکی تێدا نییە کە پێچەوانەی زاهیرەکەی بێت، هەروەها بە پێچەوانەیشەوە، بەڵکو هەمیشە باطین و واتا شاراوەکان واتای ڕستەو مانا زاهیریەکان تەواو ترو کامڵ تر دەکەن، وەك چۆن کاکڵەکان تەواو کەری توێکڵەکانن و تامو چێژو جوانکاری زیاتری پێ دەدەن.

## بەشی پێنجەم

ئەوەی کە بە زوبانی وتەو گفتوگۆ دەری دەبڕێت، تەعبیر لە زوبانی حاڵ بداتەوە، ئەوەی تێگەیشتنی کەمەو کورتبینە، لەسەر وشە و قسە ئاشکراکان ڕادەوەستێت و، وادەزانێت کە ئەوە تەواوی قسەو مەرامەکەیە، ئەوەش کە بەرچاوی ڕوونەو حەقیقەتی شتەکان وەك خۆیان دەناسێت ، ئەوە دەزانێت کە سیڕو نهێنیەك وا لە نێو قسەکانداو دەیدۆزێتەوە.

وەك ئەوەی کابرایەك دەڵێت: دیوارەکە بە مێخەکەی وت: بۆچی هەروا من کوندەکەیت و شەقم دەکەیت؟ ئەویش وتی: جابۆ پرسیار لەو کەسە ناکەیت کە دامدەکوتێت؟! ئەو بەردەش ببینە کە لە دوامەوەیە، ئەمەی وترا تەعبیر و دەربڕینێکی تایبەتییە، بەزوبانی حاڵ دەوترێت نەك بە زوبانی قسەو گوفتار.

هەر لەم ڕوانگەوە دەژمێررێت، کە خودا فەرموویەتی:

﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ (فصلت١١).

بە ئاسمان و زەوی فەرموو: بێن بۆ مەجالی بوون و ڕێك وپێکی، بە جۆرێك کە

سوودتان لێ وەربگیرێت، بەخۆشی و ڕەزامەندی خۆتان، یان بێ ڕەزامەندی؟ وتیان: بە ڕەزامەندی خۆمان هاتین[1]

ئەوەی تەمبەڵ و گەمژەیە، یەکسەر ئەوەندەی لێ تێدەگات، کە ئاسمان و زەوی پێویستیان بە ئەقڵ و ژیان و تێگەیشتنی خیطابی خودابیە، وە دەبێت ئەو قسە کردنەش بە دەنگ و پیت بووبێت، کە ئاسمان و زەوی گوێیان لێی بێت، بەڵام پیاوی داناو بەرچاو ڕوون دەیزانێت کە ئەوە مەبەستی پێی زوبانی حاڵە نەك گوفتار، وە ئەمەش هەواڵدانێکە کە ئەرزو ئاسمان ژێردەستەی قودرەتی خودان و ،ئیختیاریان لە دەستدا نییە، وەناچارن فەرمانی خودا جێبەجێبکەن. هەروەها ئەم ئایەتی خودایەش هەر لە مبارەوەیە کە فەرموودەی:

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ الإسراء/٤٤،

هیچ شتێك نییە لەم بوونەوەرە کە تەسبیحات و پاکوخاوێنی بۆ خودا بڕیار نەدات، ئەوەی ئاستی تێگەیشتنی نزمە، وادەزانێت کە مادده وشکەکانیش پێویستیان بە ژیان و ئەقڵ و قسەکردن هەیە، بە هۆی دەنگ و پیتەوە، بۆئەوەی کە بڵێت: **سوبحانەڵلا**! بەڵام پیاوی بەرچاو ڕوون دەزانێت کە مەبەستی ئایەتەکە ئەوە نەبووە کەوەك مرۆڤ قسەبکەن، بەڵکو ئەوانە بە ئەصڵی بوونەکەیان، پاکو مونەززەهی بۆ خودا بڕیاردەدەن، تەقدیس و بەرزی خودا ڕادەگەیێنن و، وەحدانییەت و یەکتایی خودا ڕادەگەیێنن، وەك وتراوە: [2]

**وَفِي كُلِّ شَيْءٍ لَهُ آيةٌ      تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ واحِدُ!**

---

(١) هەمان سەرچاوە: ٤٧٧.

(٢) شیعری (ئەبو لعەتاهیبە،) دیوانەکەی ل(١٠٤). سەرەتاکەیشی ئەمەیە:

**وا عَجَباً كَيفَ يَعصي الإلهَ      أم كَيفَ يَجحَدهُ الجاحِدُ**

لەو واتایەدا منیش دەڵێم:

**سەیرە ئەو توانی کە یاخی بێ بەدڵ یاخو بەزار**

**مولحیدە گەر ئەو نکوڵی کا، لە خوای پەروەردگار**

**هەرچی دەنوارێ نیشانە، بۆ نیشانی شانی ئەو**

**گشتی بەڵگەی تاك و تەنهایی خودایە بێ شومار**

**وەك وتراوە:** ئەم صنعەتکارییە جوان و نایاب و سەرسوڕهێنەرە، گەواهی ڕاستەقینەیە لەسەر جوانی تەگبیر و کەماڵی زانستی خاوەن و خالیقەکەی، نەك بەو واتایەی کە بە زوبان دەڵێن: شایەتی دەدەم بەم قسانە، بەڵکو بە بوون و زوبانحاڵی خۆیان ئەو شایەتییە دەدەن، وە بەردەوامی بە صیفەت و تواناکانی بدات، وە لە هەموو هەڵگۆڕانە جیاوازەکاندا پشتگیری لێ بکات، کەواتە بەوەی کە هەمیشە پێویستی بە یارمەتی دان هەیە، ئەوە نیشانەیە بۆ شایەتیدان بە تەقدیس و ڕاگرتنی بەها پیرۆزەکانی خودا، تەنها بەرچاو ڕوونە دڵ بێدارەکان هەست بە شایەتی دانی ئەوانە دەکەن و پێیان دەزانن، نەك ئەوانەی لەسەر ڕواڵەتی واتاکان ڕادەوستن و، هیچی تری لێ حاڵی نابن، بۆیە خوداوەندی مەزن دەفەرموێت:

﴿**وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ**﴾،(الإسراء ٤٤) . واتە: لە تواناتاندا نییە کە حەقیقەتی ئەو تەسبیحات و گەواهی دانەی دروستکراوانی خودا بزانن.

**بەڵام ئەوانەی کەناتوانن بگەن بە پلەی کەماڵ:** کە تێنەگەیشتوون و کەمتر لە شت حاڵی دەبن، هەر لە بنەڕەتدا لەم بابەتە حاڵی نین.

**بەڵام نزیکانی دیوانی پەروەردگار و زانا پێگەیشتووە تێگەیشتووەکان:** ئەوانیش ناتوانن بگەن بە حەقیقەت و، لە کەماڵی خوداوەندیان شارەزابین، چونکە لە هەموو شتەکان کە دەبینرێن یان بوونیان هەیە، چەندین شایەتیان تێدایە لەسەر تەقدیس و تەسبیحی پەروەردگاری باڵادەست ﷻ .

وە هەریەکەیان بە ئەندازەی کەمی و زۆری ژیری و بەرچاو ڕونییان ئەو شەهادەتانە دەبینن، وە سەرژمێرکردنی ئەو هەموو شایەتیانە لەگەڵ زانستی (موعامەلە) دا گونجاو نییە.

ئەم بەشەیشیان جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە لە زانینیدا، لە لایەن لایەنگرانی ئەهلی زاهیر و هەوادارانی ئەهلی باطینەوە، وە بەو هۆیەشەوە جیاوازی میانی باطین و زاهیر دەردەکەوێت.

وە خاوەنی ئەم پلەو مقامانەش هەیانە زۆر ڕۆچوون و لە سنوور دەرچوون، وەهەندێکیشیان لە حاڵی مام ناوەندیدان.

هەندێك لە سنوور بەزێنەکان ئەوندە لایانداوە، کە زاهیری زۆربەی هەموو دەق و بەڵگەکانیان گۆڕیوە، وە هەوڵیانداوە واتای تر بسەپێنن بەسەر ئایەتەکاندا، وەك لەواتای ئایەتی: ﴿وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ﴾ (يس: ٦٥).

واتە: ئەمڕۆ دەستیان قسەمان بۆ دەکات و پێیان شایەتیمان بۆ دەدات، یان ئایەتی: ﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنْطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنْطَقَ كُلَّ شَيْءٍ،﴾ (فصلت/٢١)،

واتە: کافرەکان بە پێستی لەشی خۆیان دەڵێن: بۆشایەتیتان لێ داین، ئەوانیش دەڵێن: ئەوە خودایە کە ئێمەی هێناوەتە گۆ. هەروەها هەموو ئەو جۆرە گفتوگۆو حیوارەی لە نەکیر و مونکەرەکانی قەبرەوە دەبیسترێت، وە لەکاتی کێشانەو پێوانەو لێپێچینەوەی کردارەکان و، قسەو دەمەدەمێی ئەهلی ئاگرو، باس و خواسی ئەهلی بەهەشت لەگەڵ یەکتری، لەوەدا کە دەڵێن:

﴿أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾، (الأعراف/٥٠)،

واتە: لەو ئاوو ڕزقەی خودا پێی داون، برژێنن بە سەرمانداو بەشمان بدەن، [١]

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی/١٥٦.

ئەو سنوور بەزێنانە وا گوماندەبەن کە هەمووی بە حەقیقەت نییەو ،بەزوبانی حاڵە! [1] ،( واتە دەستەکان قسەناکەن، بەڵکو زوبانحاڵیان وا دەڵێن!). هەندێکی تریشیان بەلای بەرزیدا تێیان پەڕاندووەو، دەیانەوێت ئەم دەرگایە دابخەن، لەوانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە (رحمەالله) کە قەدەغەی کردووە واتای (كُنْ فَيَكونْ) لێك بدرێتەوەو، هەوڵی داوە کە دەرگای تەئویل دابخات، وە ئەمانە وایان گومان بردووە: کە وتەی (ببە) لەلایەن خوداوە ، ئەوە گوتارێکی خودایيە، بە پیت و بە دەنگ، لە لایەن خوداوە (عَزَّ وجَلْ) لە هەموو چرکەیەکدا بە ئەندازەی بوونی هەموو بوونەوەرەکان ، تەنانەت بیستوومە لە هەندێك لە هاوڕێکانی، دەیووت: کە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کێشەی دەرگای تەئویلی نەهێڵاوەو حەسمی کردووە، جگە لە سێ وشە: یەکێکیان:فەرموودەی پێغەمبەرﷺ(**الحَجَرُ الأَسوَدُ يَمينُ اللهِ في الأَرضِ**) [2]واتە: بەردە ڕەشەکە دەستی ڕاستی خودایە لە زەویدا. وە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ :

---

(١) ئەمانە هەموو ئەو سەرلێ شێواوانەن کە لە هەموو کارێکدا عەقڵ و ژیری بە دەمڕاست و حەکەم دادەنێن و لە نەص و دەقەکان پێشی دەخەن، لە سەروی ئەم کۆمەڵانەوە فەیلەسوفەکانن، کە ئەوندە لە سنووربەزاندندا تێشپەڕیان کردووە، تەنانەت بڕوایان بە حەشر و زیندووبونەوەش نییە، وە هەندێکی تریشیان موعتەزیلەکانن کە ئەمانیش بە شێوەیەکی تر سەرگەردان بوون، وەك باسیان دێت.

(٢)قال العراقي أخرجه الحاكم في (المستدرك) ٦٢٧/١ وأيضاً(٤٥٧/١) (١٦٨١).وصححه من حديث عبد الله بن عمر وبلفظ: **الحجر يمين الله في الأرض** اهـ، والطبراني في (الأوسط) (٥٦٧)، عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) مرفوعاً، ورواه موقوفاً على ابن عباس (رضي الله عنهما) وعبد الرزاق في المصنف. (٣٩/٥). وأخرج الخطيب وابن عساكر عن جابر رفعه: **الحَجرُ يمينُ الله في الارض يُصافِحُ بها عِباده** قال ابن

(( **قَلبُ المُؤمنِ بَينَ أُصبُعَينِ مِن أَصابعِ الرَّحمن**))[1]، (واته: دڵی باوەڕدار وا لە میانی دوو پەنجە لە پەنجەکانی خودادا.) یان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:
((**إنِّي لأَجدُ نفسَ الرَّحمن مِن جانِب اليَمنِ**)) [2]،**مِنْ قِبَلِ الْيَمَنِ**.

[واته: مـن دەبیـنم دەروی خێـری خـودایی لەمـن دەکـرێتەوە، وە بتـوانم هەناسـەیەکی ئاسـوودەیی هەڵبمـژم و لە ناسـۆرو ناڕەحەتیەکانم ڕزگـارم ببێـت بەوە دەبێت کە خـودا سـەرم دەخـات، بە هۆکاری یەمەنییەکانەوە، کاتێکیش بە هـۆی موهـاجیرو ئەنصـارەکانەوە خـودا پێغەمـبەری سـەرخسـت، هەناسـەیەکی شـادومانی هەڵکێشا، زۆر جار تاریفی ئەهلی یەمەنی دەکردو دەیفەرموو: ئیمان و پەندیاری (یەمانییە). کەواتە: ئەمە هەناسـە دانی ئاسـایی نییە، چـونکە محاڵە خودا پێویستی بە هەناسەدان هەبێت، وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە:

---

الجوزي في العلل المتناهية ٢/٥٧٥(٩٤٤) في سنده إسحاق بن بشير كذَّبه ابن شيبة وغيره، و قال الدارقطني كما في (ميزان الإعتدال) للذهبي ٣٣٧/١، هو في عداد من يضع، وأخرج الديلمي في (مسند الفردوس) عن أنس رفعهُ: **الحَجرُ يمينُ اللهِ فمَنْ مسَحَه فقَد بايعَ الله**. و في سنده علي بن عمر السكري ضعفه البرقاني، وأيضا العلاء بن سلمة الروَّاس قال الذهبي في تلخيص كتاب الموضوعات ص/٢٥٤: مُتَّهم بالوضع ، ئەوەش پێویسـتە کە بیـزانین: واتـای کە مـاچ بکرێـت، وە هەر پادشـایەك کە یەکەم جـار زیارەتی دەکەیت دەستی ڕاستی یەمینی خودا(دەستی ڕاستی خـودا) واتە بەردە ڕەشەکە وەك ئەوە وایە؛ لە جێگەی دەستی قودرەتی خـودا بێت ماچ دەکرێـت، ئەمەش واتە خـودا ﷻ وەك ئەوەی کە زیـارەتی دەسـتی قودرەتیـت کردبێت ئاوایە. بنواڕە: الإتحاف ٢/٧٩- ٨٠.

(١)أخرجـه مسـلم في كتـاب القـدر، بـاب تصـريف الله تعـالى القلـوب كيـف يشـاء، ٢٦٥٤.)من حديث عبد الله بن عمرو وقد تقدم.

(٢) رواه الطبراني في الكبير، (٥٢/٧)، وأخرجه أَحمد في مُسنده: ٢/٥٤٠--٥٤١.

(( هَذَا نفس رَبِّي أَجِدهُ بَين كَتِفي أَتَاكُم السَّاعَة)).

واته: ئەمەیە کە خودا دەروی خێری لێ کردمەوەو بەو وەحی و نیگایەی کە بۆم هاتووە، غەم و پەژارەی پێچایەوەو دڵی کردمەوەو زیادە یەقین و ئاسوودەیی پێ بەخشیم، ئەمەش ناو دەبرێت بە نەفەسی خودایی، واتە:

تەنفیس و دەروی خێر لێ کردنەوە، چونکە هەناسەی حەقیقی بۆ کەسێکە کە جەستەیەکی بۆشی هەبێت و، بۆ بەردەوامی ژیان هەناسە بدات، کە ئەمە بۆ خودا محاڵەو، ئەوەی موجەسسیمەکان دەیڵێن هەمووی دوورە لە ڕاستییەوە. بەم شێوە زانایانی ئەهلی حەدیس ڕاڤەی ئەو فەرمودانەیان کردووە]

ئەوانەی تەنها زاهیری واتاکان لێك دەدەنەوە کۆتاییان بەم کێشە بەو شێوەیە هێناوە. وە چاك وایە گومانی باش ببەین بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (خوای لێ ڕازی بێت، کە پێشەوایەکی شەرع ڕەوی زانابووە) کەزانیویەتی ئایەتی ئیستیوا، بە واتای ئیستیقرارو جێگیر بوون نییە، وە وشەی (نزول)ودابەزین بە واتای گواستنەوەی جەستە نییە لە جێگەیەکەوە بە جێگەیەکی تر، بەڵام بۆیە ڕێگەی بە تەئویل کردن نەداوە تەنها لەبەر ئەوەی کە دەرگای فیتنەو کێشە دابخات، وە چاودێری بەرژەوەندی خەڵکی بکات، چونکە هەر دەرگایەکی لەو جۆرە ئەگەر کرایەوە ئەوا درزی گەورەتری تێ دەبێت لە ژێر کۆنترۆڵ دەر دەچێت، وە سنوری میانەڕەوی دەبە زێنێت، چونکە تاریف و پێناسەی میانەڕەوی (إقتصاد) بەو ئاسانییە ڕێك ناخرێت[1]، بۆیە ئەو دەرگا داخستنەی لێ ناگیرێت.

---

(١) بۆیە دەبینین ئیمامی غەزالی خوای لێ ڕازی بێت) پەڕاوێکی زۆر بەنرخی لەم بابەتە داناوە بەناوی: (قانون التأويل)و ئەم بابەتەی زۆر بە جوانی شیتەڵ کردۆتەوە.

ئەوەش کە دەبێتە پاڵپشتێك بۆی هەڵوێستی پێشینەکانە کە دەیانووت: بۆ واتاکەی وەك چۆن سەلەف و پێشینەکانمان مانایان لێك داوەتەوە ئێوەش هەر بەو شێوە بن، تەنانەت ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) کاتێك پرسیاریان لێ کرد لە بارەی واتای(إستواء)(١) (ئایا ئەمە گەماڕۆ دان و دانیشتنە یان دەستەڵات بەسەردا بوون و داگیرکردنە.) فەرمووی: ئیستوا شتێکی ڕون و ئاشکرایە، باسکردنی چۆنیەتییەکەی نەزانراوە، بڕوابوونیش بەم دەققە پێویستە، پرسیارکردنیش دەربارەی بیدعەیە.[١] وەهەندێکی تر بەلای ئەو ئەو ڕایەدا چووە کە بە میانەڕەو دەناسرێت و دەرگای تەئویل کردنیان کردۆتەوە

---

(١) لە ئایەتی: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ الأعراف /٥٤، واتە: بوو بە فەرمان ڕەوا بەسەر عەرشدا. هەروەها ئایەتی: ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾ (طه/٥) خودای گەورە عەرشی داگیرکردووە، واتە دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەرشدا، نەك لەسەری عەرش بێت، یان لەسەر کوسییەك دانیشتبێت، وەك ئەوانەی کە خودا بەخەڵکی دەشوبهێنن یان جەستەی بۆ بڕیاربدەن (پەنا بەخودا)، کەواتە ئەوانە بە تێکڕایی حەزیان نەدەکرد کەس خۆی بهاوێتە ناو ئەوباسانەوە، چونکە سەرگەردانیی لێ دەکەوێتەوە، بۆیە حەسەنی کوڕی ئیسماعیلی ضەرراب دەڵێت: پرسیارم لە پێشەوا مالیك و ئەوزاعی و سوفیانی سەوری و لەیث کرد (خودایان لێ ڕازی بێت) دەربارەی ئەو فەرمودانەی باسی بینین و صورەت و دابەزین و هاو وێنەکانیان دەکەن فەرموویان: چۆن زانایانی سەلەف لێکدانەوەیان لەسەر کردوون هەروای بکەن و لێیان زیاد مەکەن، وە دەربارەی حەزرەتی موسا(علیه السلام)عەبدوڵڵای کوڕی ئیمام ئەحمەد پرسیاری لە باوکی کرد ئایا قسەکرنەکە بەدەنگ بووە، ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ا نساء/١٦٤، وە فەرمووی: بەڵێ بە دەنگ بووە، بۆ درێژی ئەم بابەتە بنواڕە: الإتحاف ٢/ ٨٠ــــ٨٢.

سەر پشت دەربارەی هەموو بابەتێك كە پەیوەندارە بە صیفاتەكانی خودا ﷻ وە هەموو ئەو بابەتانەی كە پەیوەندارن بە دوارۆژەوە وازیان لێهێناون لە سەر زاهیری خۆیان بمێننەوە، وە تەئویلكردنیشیان قەدەغە كردووە كە ئەمانەیش ئەشعەریەكانن.

لە پاشان موعتەزیلەكان لەمانیش زیاتریان كردو گەیشتنە ئەو ئاستەی كە تەئویلیان بۆ ئەوەش كردووە لە صیفەتەكانی خودا، چۆن پەیوەندی بینینیان پێوە دەبێت، وە جۆری بیستن و بینینی خودا چۆنەو چ كاتێكە[2]،وە تەئویلی میعراجیشیان كردووەو، وایش گومان دەبەن كە بە جەستە نەبووەو تەنها بەڕۆح بووە، وە دەربارەی سزای ناو گۆڕیش ڕای جیاوازیان هەیەو، هەروەها تەئویلی میزان و پردی پەڕینەوەو تێكڕای ئەحكامەكانی دوارۆژیشیان كردووە، تەنها ئەوەندەی دانیان ناوە كە جەستەی مرۆڤ حەشردەكرێت و، بەتەواوی لاشەوە زیندو دەكرێنەوە، هەروەها بە بەهەشت و بوونی خواردن و خواردنەوەو، خواستن و مارەبڕاوو هەموو جۆرە چێژە هەستپێكراوەكانی تر،

---

(١) رواه اللاكلائي، عن أم المؤمنين أم سلمة (رضى الله عنها) في (إعتقاد أهل السنة) ( ٦٦٣) ثم ذكر مقالة مالك (رضيَ اللهُ عنه) (٦٦٤) وانظر مجمل رواياته (في الدُّرَر المَنثور) ٤٧٣/٣، وإتحاف السادة ٨٠/٢.

(٢) ئەبی هیشامی جیبائی لە موعتەزیلەكان دەڵێت:

مانای ئەوەی كە خودای زیندوو بیسەرەو بینەرە، واتە زیندوویەكە كە دەتوانێت شتی بیستراو ئەگەر بوونی هەبێت ببیستێت ، وە بینراوێك كە بوونی هەبێت ببینێت، وەهەركاتێك بینراوو بیستراو بوونیان هەبوو، وە خاوەن حەیاتەكە ئافەتێكی تووش نەبوبوو كە دەركیان بكات، ئەوە دەتوانێت ببیستێت و ببینێت، كە لە پاشاندا بیرۆكە نادروستەكانیان زیاتر ڕوندەبێتەوە. الإتحاف ٨٢/٢.

هەروەها بڕوایان بە ئاگری دۆزەخ هەیە، کە لاشەکان تیایدا دەسوتێن و، پێست و جەستەدەسوتێت و گۆشتەکانیشیان دەتوێتەوە.

وە لەمانیش زیاتر فەیلەسوفەکان هەموو سنوورێکیان بەزاندووە، تەئویلی هەموو باس و خواسەکانی دوارۆژ دەکەن و، تەنها بە هەندێك ئازاری ئەقلی و رۆحیی دادەنێن، یان تام و چێژێ ئەقلی کە وەری دەگرن، وە نکوڵییان لە زیندو بوونەوەی جەستەکان هەیە، وەبڕوایان وایە کە نەفسەکان دەمێننەوە (کە رووت بێت لە لاشە)وە، یان لە سزایەکی تایبەتیدان، یان لە خۆشیدا دەژین کە بە حاسسە هەستیارەکان نازانرێن، بەڕاستی ئەمانە رۆچوون لەئەوپەڕی گومراییدا.

وە سنوری میانەڕەو لە نێوانی ئەو هەموو داخزان و رۆچوونە و، ڕای چەقبەستووی حەنابیلەکانیشدا، زۆر وردو نادیارەو، کەسێك پێی دەزانێت کە خودا ڕێنمایی کردبێت و، بە نووری خودایی چاوی دڵی بینا کردبێت و دەرکی ڕاستییەکانی پێ بکات، نەك (سەرچاوەکەی تەنها لە ئەقڵەوەو)بە بیستنبێت.

لە پاشان ئەگەر بە هۆی ئەو نووری خوداوە، نهێنی فەرمانەکانیان وەك خۆی چۆنە ئاوا بۆ دەرکەوت، سەیری ئەو ریوایەت و هەواڵانە دەکەن کە لە متمانە پێکراوەکانەوە پێیان گەیشتووە، هەرچی لە گەڵ نووری یەقینەکەی خۆیان دەگونجا، ئەوا دەیسەلمێنن و بڕیاری لەسەر دەدەن، وە ئەوەی پێچەوانە بوو، ئەوا تەئویلی دەکەن، (بە پێی شێوازی قسەو زاراوەی زوبانی عەرەبی). بەڵام ئەوەی ئەم فرمانانە تەنها لە بیستنی ڕوتەوە وەردەگرێت و (سەرچاوەی نوری مەعریفی تری نییە) ئەوە هەرگیز پێی جێگیر نابێت و، ناتوانێت بڕیاری درووست بدات، وە هەڵوێستیشی لەگەڵ ناوکرۆکی شەریعەتدا یەکناگرێتەوە. کەواتە ئەوەی تەنها بەهۆی ئەقڵ و بیستنەوە شتەکان وەردەگرێت، ئەوا با لە مقامی (ئیمام) ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دابێت و، (چاو لەو بکات و لە سنوور

لانەدات، کە ئەمەش هەڵوێستی سەلەفی صاڵیحە، (خودایان لێ ڕازی بێت) [1].

---

(١) ئیمامی غەزای (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە پەڕاوی (إلجام العوام)دا ڕێگای سەلەفی لە حەوت خاڵدا ڕوون کردۆتەوە: **تەقدیس و، تەصدیق و، داننان بە نەتوانین و، بێدەنگی و، وازهێنان و، خۆگرتنەوەو، لەپاشان تەسلیم بوون بۆ ئەهلی مەعریفەت.**

وە یەکەیەکەیان بەم شێوەیە ڕوندەکاتەوە:

**تەقدیس:** واتە پاکی و خاوێنی بۆ خودا، لەوەی کە گەردی لاشەو جەستەبوون و هاو شێوەکانی پێوە بلکێت.

**تەصدیق:** بڕوابون بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ڕاستن و چی مەبەستە ئەوە ڕەوایە.

**داننان بە عەجزو نەتوانین:** واتە زانینی مورادی خودا، لە توانا و پێشەوی ئەودا نییە.

**بێ دەنگی:** واتە پرسیاری واتاکەی ناکات و بەدوایدا ناگەڕێت و دەزانێت کە پرسیارکردن بیدعەیە.

**خۆگرتنەوە: ئیمساك** واتە: لە خۆیەوە دەسکاری وشەو واتاکان نەکات، کە بیانگۆڕێت بە بە زوبانێکی تر، یان لێی زیاد بکات و لێی کەم بکاتەوە، بەشێوەیەك لە هەموو ڕویەکی زمانەوانی تەصریف و ئیعرابەوە وەك خۆی چۆن هاتووە ئاوا بمێنێتەوەو دەستێوەردانی تری تیا نەکات.

**وازهێنان (الکف):**واتە لە ناخیشیدا بەدوای باس و لێکدانەوە و بیرکردنەوەی ترنەگەڕێت.

**تەسلیم بوون:** دەبێت بڕوای وابێت، ئەو کە نەیتوانیوە بیزانێت،ئەوە لە لەلایەن پێغەمبەران و صددیق و ئەولیاکانەوە شاراوە نییە، ئەمەی باسکرا حەوت ئەرکی سەرەکییە، کە زانایانی سەلەف بە تەواوی پابەندبوون پێیانەوە. لە پاشان

ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: حەرامە لە سەر واعیزو وتاربێژەکان لەسەر میمبەرەوە وەڵامی هەر جۆرە پرسیارێك بدەنەوە، دەربارەی ئەو پرسانەی کێشەیان لەسەرە، دەبێ تەنزیهی خودا بکەن لە هەموو تەشبیهو تەجسیم و بابەتە کانی تر، کە هەرچی بێت بە خەیاڵیاندانەیەت کە کەمترین گومان درووست بکات، دەبێت تەنزیهی خودای لێ بکرێت. وە لەبارەی تەئویلیشەوە دەفەرموێت:

**دەبێت دوای لادانی مەبەستە زاهیریەکەی واتاکەی ئاشکرابکرێت** ، ئەمەش:

**یەکەم**: یان لەکەسێکی ئاسایی و عامی یەوە دەبێت:

کە بەسەر بەخۆیی بیەوێت بچێتە ناو ئەو دەریا بێ پەیەوە، بەبێ ئەوەی مەلەوانی بزانێت، کە ئەمەش حەرامەو نابێت کاری وا بکات، چونکە بەدڵنیاییەوە دەریای مەعریفەت ترسناکترەو دەیخنکێنێت.

**دووهەم** : دەبێت لە میانی زانایەك و عامیيەكدا بێت، ئەمەش قەدەغەكراوە، وەك ئەوە وایە کە مەلەوانێکی باش لە دەریادا، کەسێکی مەلە نەزان لەگەڵ خۆی رابکێشێت، کە لە شەپۆلە سەختەکاندا دوچاری خنکاندنی دەکات، وە بە گوێیشی ناکات کە لە کەناری دەرياكەدا بمێنێتەوە.

بەڵکو لەکاتی سەختیدا لەوانەیە زیانی گەورەش لە هاورێکەی بدات، چونکە دڵی بێ هێزەو لێزانیش نییە، وە بۆ ئەم بارودۆخە تەنانەت زانا ئەدیب و نەحوی و موحەددیس و موفەسسیر و فەقیهو موتوکەللیمینەکانیش، بەڵکو هەموو زانایەك، جگە لەوانەی کە بە تەواوی خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ مەلەوانیی دەریای مەعریفەت و خوداناسی و، خۆیان تەرخانکردووە بۆ بەندایەتی راستەقینەو، وازیان لە هەموو ئارەزواتێك هێناوەو، بە ئیخلاصەوە کار بۆ خودا دەکەن، جگە لەو زانا رەببانییانە، کەسی تر لەوانەی باسمان کردن بۆیان نییە رۆبچن لە باسی (معرفة الله)دا، ئەمانەش دەبێت وریابن، ئەینا رووبەرووی مەترسییەکی سەخت دەبنەوە، لەوانەیە لە دە کەسیان نۆ کەسیان

## ئێستاش گەیشتینە ئەوەی کە بڵێین:

لادانی پەردە لەسەر سنووری مامناوەندی و میانەڕەو، لە بەینی ئەو دوو لایەنە(ئیفراط و تەفریطەدا)ئەوە پەیوەنداری زانستی موکاشەفەیە، وە باس کردنی درێژە دەکێشێت، ئێمەش ڕۆناچین لەناویدا، مەبەستیش ئەوەبوو باس لەوحاڵەتانە بکەین کە زاهیر و باطین وەك یەك دەبن و دژ بەیەك نابن، یان پێچەوانەی یەك دەبن.

**بەم جۆرە شیتەڵکردنەوەیە هەموو پێنج بەشەکەت بۆ ئاشکرابوو.**

وە ئەگەر بمانەوێت تەواوی نەخوێندەوار و عەوامەکان لەسەر کورتکراوەیەکی عەقیدە دایانبمەزرێنین، ئەوەی کە نوسیومانەتەوە، بە کەڵکە بۆیان.

---

نەگاتە کەناری ئاسوودەیی و سەرفرازی. مەگەر یەك کەس لەو تاقیکردنەوە سەختە ڕزگاری ببێت و بگاتە پلەی سەرفرازان وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾ (١٠١) الأنبياء،

﴿ وربُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ، ( القصص٦٩﴾ .

**سێیەم:** تەئویلی کەسێکی عاریف و زانا و شارەزای (معرفة الله) لە گەڵ سیری دڵی خۆیدا، لە نێوانی خۆی و خودای خۆیدا بدوێت و تەئویل بکات، ئەمەش بابەتێکی زۆر گران و پڕ لە وردەکارییە، کەسێك لە دوورەوە بێت و هەرچەندێك تیایدا نەژی باسی بکات، هەروا بەسەرسامی دەمێنێتەوە و بەدرێژی مەرج و پێویستییەکانی باسکردووە، کە ئێستە زۆر بەدەگمەن ئەو کەسەش پەیدادەبێت کە لێی حاڵی ببێت هەتا بەوەدا دەگات کە لەناویدا بژی ، ئەوندە لق و پۆو مەرجی گرانی لێ دەبێتەوە، باس نەکردنی مێشك ئاسوودەتر دەبێت و، پەیوەنداریشە بە عیلمی موکاشەفەوە. بنوارە بۆ درێژی ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە: الإتحاف ٢/٨٣—٨٤.

که بەڕاستی ئەوانیش لە پلەی یەکەمدا جگە لەو ئەندازە زانینە ئەرکێکی تریان نەدراوە بە سەردا، مەگەر لە کاتێکدا ترسی هانی هانی و تێکدانی بیروباوەڕیان لەسەر بێت و، ئەهلی بیدعە بڵاو بووبنەوە، ئەوکاتە ناچار دەبین بابەتەکەیشیان بۆ بەرزو تۆکمەتر بکەینەوە بۆ پلەی دووهەم، بۆ حاڵی بوون لە عەقیدەیەك، کە پڕیەتی لە بەڵگەی بەهێزی پرشنگدار،بەڵام ئەویش هەر بەکورتی، نەك درێژکرابێتەوە،

کەواتە لەم پەڕاوەدا با ئەو تیشکە بەڵگەدارانە باس بکەین، وەتەنها ئەوەندەی بخەینەڕو کە بۆ ئەهلی (قودس)مان ڕونکردبوویەوە، [1]،

ئەمەشمان خستۆتە پاڵ بەشی سێیەمی ئەم کتێبە (پشت بەخودا).

---

(١) ئیمامی غەزالی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) چەندین نامەو پەیامی تایبەتی بە ئامۆژگاری و ڕێنومایی دەنارد زاناو مەشایەخ و موسوڵمانانی شارو وڵاتەکان، لەوانە پەیامێکی ترە کە بۆ (موصل)ی ناردووە ئەویش هەر بەناوی (قودسییە) وە هەر خۆیشی شەرحی ئەم پەیامەی داوە بۆ ئەوانی پلەیەك لە پێشترن و پێویستییان بە زانستی زیاتر هەیە، وەناوی نا: (الإقتصاد فی الإعتقاد)هەرچەندە لە پێشتر ئەم پەیامەی بڵاو کردبوویەوە، وە چەندین شەرح و بەسەرداچوونەوەو لێزیادکردنی بۆ کراوە لە لایەن زانا ناودارەکانەوە وەك: کەمالی کوڕی هومام و کەمالی کوڕی ئەبی شەریف و حافزی زوبەیدی ، (خودایان لێ ڕازی بێت) کە ئەم زانای زوبەیدییە وردەکاری زۆری لەسەر کردووە. بۆ زیاتر باسی ئەو نوسراوو پەڕاوو شەرح و ناوەرۆکانە بنوارە: إتحاف السادە المتقین ٢/٨٥—٨٦.

# بەشی سێیەم

# لە پەڕاوی (بنەماکانی باوەڕ)

## لە باسی بەڵگە تیشکدارەکانی باوەڕ

## کە ناومان لێ ناوە بە :

# (( پەیامی قودسی))

دەڵێین: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمْ

حەمدو سەنا بۆ ئەو خودایەی کە پارێزەرانی ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری جیاکردۆتەوە بە نووری پڕ لە متمانەیی، وە کۆمەڵی ڕاسترەوان و هەقویژانی هەڵبژاردووە، بە ڕێنماییان بۆ ڕێگای هیدایەت و گەیشتنیان بە مەبەست، بۆ جێگیر کردنی پایەو ئەرکانەکانی دین، وە پاراستوونی لەلادان بەلای بیدعە سازو گومڕایی بێ باوەڕە سەرلێشێواوەکان، وە ڕێنومایی کردوون بۆ شوێنکەوتنی گەورەی پێغەمبەران ﷺ، وە خستونیەتیە سەر هێڵی ڕاست. بۆ چاولێکردنی صەحابە بەڕێزەکان، وە بۆی ئاسان کردوون کە شوێن پێی سەلەف و پێشینە چاکەکان بکەون، تا گەیشتنە ئەو ئاستەی بەڵگە ئەقڵییەکان بە پەتی قایم و هێزی نەپچڕاوی خودایی پشتڕاست بکەنەوە، کە پێی دەوترێت(حەبلی مەتین)، وە لە ڕوانگەی ژیان و سیرەت و عەقیدەی چینی یەکەمەوە (جیلی ئەصحاب و تابیعینەوە)، بگەن بە پەیڕەوی ڕون و ئاشکرای دین، بوونە ئەڵقەی گەیاندن و پێکەوە بەستنەوەی ئەو ئەنجامانەی بەهۆی ئەقڵەوە پێی گەیشتوون، لەگەڵ هەموو باس و بابەتە شەرعییەکاندا. کە لە ڕێگەی بەڵگە نەقلییەکانەوە پێمان گەیشتوون، وە بە لێکۆڵینەوەی تەواوەوە گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەوەی، کە وتنی دووکەلیمەی شەهادەت(**لاإله إلا الله محمد رسول الله**) کە بڕوایان

لەسەری دامەزراوە، هیچ بایەخ و بەرهەمێکی نابێت، ئەگەر شەهادەتەکەی هەموو ئەو واتاو ئەرکان و مەعریفەت و زانستیانە نەگرێتەوە، کە وشەی شایەتومان دەیانگرێتەوە، وە زانیویانە کە دوو کەلیمەی شەهادەت لەگەڵ ئەوەدا کە چەندێك کورتن، سەلماندنی تەواوی بوونی خودا دەگرێتە خۆ، وە صیفەتە پیرۆزەکانی بۆ دەسەلمێنێت. وە کردارەکانی بۆ جێگیر دەکات، لەگەڵ سەلماندنی ڕاستگۆیی پێغەمبەری خودادا، بۆیە دڵنیا بوون، کە بینای ئیمان و ئیسلامەتی لەسەر ئەم ڕوکن و پایانە دامەزراوەو ڕاگیردەبێت، کە ئەو بنەمایانەیش دەکرێن بە چوار بەشەوە، کە هەریەکێك لەو چوارە لەسەر دە بنەما دامەزراوە:

**پایەو ڕوکنی یەکەم:** دەربارەی ناسینی زاتی خودا ﷻ : ئەم پایەیە دە بنەمای سەرەکی دەگرێتەوە کە ئەمانەن: زانین بە بوونی خودا، وە بە قەدیمی و ئەزەلییەتی، وە بە مانەوەو ئەبەدیبوونی، وە خودا جەوهەر نییە، وە جەستەو مادده نییە، وە عەرەزیش نییە، وە هەرگیز تایبەتمەند نییە بە لایەکەوە لە شەش لایەنەکە، وە جێگیر نییە لە شوێنێکدا وەك ئەوەی لە عەرشدابێت، وە خودای گەورە دەبینرێت، وە تاك و تەنهایە.

**پایەی دووهەم:** دەربارەی صیفەتەکانی خودا، کە دە بنەمای سەرەکی دەگرێتەوە و ئەمانەی خوارەوەن: بزانیت کە خودا زیندووە، زانایە، تەوانایە، خاوەن ئیرادەیەیە، بیسەرە، بینەرە، خاوەنی قسەو کەلامە، (پاك و پارێزراوە لەوەی کە تێکەڵ ببێت لەگەڵ هەموو پەیدابووەکاندا) خاوەنی کەلامێکی قەدیمەو بەخۆیەوە ڕاوەستاوە، وەخاوەنی زانستەو ، خاوەنی ئیرادەیە.[1]

---

(١) کە دەڵێین پاك و پارێزراوە لەوەی کە تێکەڵ ببێت لەگەڵ هەموو حەوادیس و پەیدابووەکاندا، (مُنـزهٌ عَـن الحُلـولِ في الحَـوادِثِ)ئەم قەیدە لە ڕوکنی یەکەم

## پایەی سێییەم: لە بارەی کردارەکانیەوە:

ئەم ڕوکـــنەیش پەیوەنـــدارە بە دە بنەمـــاوە، کە ئەمـــانەن: هەمـــووکرداری بەندەکان درووستکراوی خودای مەزنن، وە کرداری بەندەکان بەهۆی کەسب و هەوڵی بەندەکانەوە دەکرێن، وە بە ئیرادە و مەیلی پەروەردگار ئەنجام دەدرێن، وە هەمـــوو داهێنـــراوو دروســـتکراوێك بە منـــنەت و فەزڵـــی خـــودای گەورە پەیدادەبن، وە خودا بۆی هەیە کارێکیش بسپێرێت بەهەرکەسێك کە لە توانای ئەودا نەبێت، وە بۆی هەیە ئازاری بێ تاوانیش بدات، ( لەسەری پێویست نییە کە هەرچی زیـاتر لە بەرژەوەنـدی خەڵکـدابێت، ئەوە جێ بەجێ بکـات، واتە: (ڕیعایەتی ئەصڵەح) لەسەرخودا واجب نییە، وە بەبێ بڕیاری شەرع هیچ شتێك لەسـەر هـیچ کەسـێك نابێـت بە واجـب، وە نـاردن و ڕەوانەکردنی پێغەمـبەران فەرمـانێکی پێویسـت نیـیە، بەڵـکە جـایزو درووسـتە. وە پێغەمبەرێتـی حەزرەتی موحەممەد ﷺ سابت و سەلمێنراوە و بە موعجیزەکانیش پشتڕاستکراوەتەوە.

**پایەی چوارەم: دەربارەی بیستراوەکان**، کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیسترابێت:

ئەم ڕوکنەش پەیوەندارە بە سەلماندنی دە بنەماوە، کە ئەمانەن:

سـەلماندنی بـوونی حەشـرو زینـدوبوونەوەو، بـوونی سـزای گـۆڕو، پرسـیاری هەردوو فریشـتەی (نەکیـرومونکەرو)، کێشـانەو پێـوانەی کردەوەکـان و، پـردی صـیراط و، دروسـتکردنی بەهەشـت و دۆزەخ و ، ئەحکـامی پێشـەواو خەلـیفە حەققەکـان و،باسـکردنی گەورەترینـی صـەحابەکان بە پێـی پێشـکەوتن و ڕیزبەندی، وە مەرجەکانی ئیمامەت، وەباسی ئەوەی کە ئەگەر کەسێکی خۆپارێز و زانا دەست نەدەکەوت ئەوا حوکم بەدامەزرانی ئیمامەتی ناچاری دەدرێت.

---

وەرگیـراوە، کە نـاخرێتە نـاو ڕیزبەنـدی ئەو دە بنەمـایەی کە باسـیان کـراوە. چـونکە بەشێك نییە لە صیفەتە هەبوودکان، بەڵکو بەشێکە لە صیفەتە سەلبییەکان.

# پایەی یەکەم لە پایەکانی ئیمان و بڕوا
# لە باسی ناسینی خودای گەورەو تاك و تەنهایی خودا، کە ئەم پایەیە لەسەر(١٠)دە بنەما دامەزراوە

## بنەمای یەکەم : ناسینی خودای گەورە.

باشترین شت کە لەبەر ڕۆشنایی نووری ئەودا بین و، ڕێگای درووستی پەندو ئامۆژگاری پێ بگرینەبەر، ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز ڕێنماییمان دەکات، هیچ بەیان و ڕونکردنەوەیەك ناگاتە ئاستی ڕونکردنەوەی قورئان، کە خودا دەفەرموێت بەدەستەواژەیەکی پڕ لە ڕەوانبێژی:

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا، وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا، وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا، وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا، وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا، وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا، وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا، وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا، وَأَنْزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا، لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا، وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا﴾.(١٦--النبأ)

واتە: ئەوە بۆ ئەم زەویە پان و بەرینە ناکەن بە بەڵگەی توانایی خودا، کە هەموو شتێکی پێ دەکرێت و، دەتوانێت ڕۆژی قیامەتیش بهێنێت؟

ئایا ئێمە زەویمان نەکردووە بە ڕایەخ لە ژێر پێیاندا؟ کێوەکانیشمان نەکردووە بە مێخ و کوتاومانن بە زەویدا بۆ ئارامگرتنی؟ ئێوەشمان بە نێرو مێوە جووت درووست کردووەو نوستنیشتانمان کردووە بە مایەی حەسانەوەی لەشتان، شەویشمان کردووە بە پۆشاك، هەمووتان لە ژێر خۆیدا دادەپۆشێت، ڕۆژیشمان کردووە بە مایەی ژیان و پەیداکردنی گوزەران، حەوت ئاسمانی سەختیشمان بە ڕاسەرتانەوە درووست کردووە، چرایەکی تیشکدەرەوەیشمان درووست کردووە، مەبەست پێی ڕۆژە. لەهەوری گوشراویشەوە کە با دەیگوشێت، ئاوێکی بەخوڕ ڕژاومان ڕژاندووەو

داباراندووه، مەبەست لێی بارانە، بۆ ئەوەی دانەوێڵەی بۆ ئادەمیزاد و گژوگیای بـۆ گیانـداران پـێ دەرکەیـن لە زەوی بیـانڕوێنین، بـاخ و باخـاتی چڕوپـڕو بە یەکاچویشی پێ سەوز بکەین. هەروەها قورئانی پیرۆز فەرموویەتی[1].

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة/١٦٤)

واتە: (بێگومان لە درووست کردنی ئەرزو ئاسمان و دوابەدوای بەیەکاهاتنی شەووڕۆژو، جیاوازیان لە کورتی و درێژی و قازانج و مەبەستداو، لەدانی بیر و هۆشـدا بە بەنی ئـادەم ، بـۆ درووسـتکردنی کەشـتی هەمەجـۆر، کە لەدەریـادا هاتوچۆدەکەن و قازانج بەخەڵك دەگەیێنن، بەبازرگانی و شتی تر، هەروەها لەو ئاوو بـارانەدا کە خـودا لە ئاسـمانەوە دەیبارێنێـت و، زەوی پێ زینـدوو دەکاتەوە پـاش مردنـی، وە پـاش وشکبوونیشـی سـەوزی دەکـاتەوە، ئەو هەمـووە گیـان لەبەرانەی تێیـدا بـڵاوی کـردوونەتەوە، هەروەهـا لە ڕامکـردن و وەرچەرخانـدنی هەورو بـا لە نێـوان ئاسـمان و ئەرزدا، لە هەمـوو ئەمـانەدا نیشـانەو دەلیلـی گەورەیی دەسـتەڵاتداری و تاقـانەیی خـودا هەیە بـۆ ئەوانەی خـاوەنی ئەقڵـن و بیردەکەنەوە.[2]، وە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا . وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا، وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ، ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ (١٨/ نوح)

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی، ٥٨٢.

(٢) هەمان سەرچاوە/٢٥.

واته: نابینن چۆن خودا حەوت ئاسمانی درووستکردووە چین لەسەرچین، وە مانگیشی لە ئاسمانەکاندا کردووە بە مایەی ڕوناکی و، خۆری کردووە بە چرای جیهان ئارا ؟ خودا ئێوەی سەوزکردووە لە زەویدا بە سەوز بوون، پاشان دەتانخاتەوە زەوی و، دووبارە لەوێ دەرتان دەکاتەوە بە دەرکردن.

هەروەها خودا فەرموویەتی:

**﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ، أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ، نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ، عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنْشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ . وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ، أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ، أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ، لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ، إِنَّا لَمُغْرَمُونَ، بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ، أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ، أَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ، لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ، أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ، أَأَنْتُمْ أَنْشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنْشِئُونَ، نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعًا لِلْمُقْوِينَ﴾** ( ٧٣/الواقعة) واتە:

لە بارەی ئەو ئاوی تۆوەوە خەبەرم بدەنێ کە فڕێی دەدەنە منداڵدانی هاوسەرەکانتانەوە؟ ئاخۆ ئێوەن ئەو ئاوەتان لە سکی دایکدا کردووە بە ئادەمیزادێکی ڕێکو پێك و تەواو، یان ئێمەین دەیکەین بەو ئادەمیزادە؟ ئێمەین ئەجەل و کاتی مەرگمان لە نێوانتاندا بۆ هەر یەکێکتان دیاری کردووەو، لەوکاتە دیاریکراوەدا دەیمرێنین و کەس لێمان پێش ناکەوێت و لە دەستمان هەڵنایەت و، ڕێمان لێ ناگرێت، کەوا لە جیاتی ئێوە کەسانی تری وەك ئێوە درووست بکەین و پێیان بگەیێنین بە جۆرێك و، بە خووڕەوشتێکەوە کە خۆتان هیچتان ئاگاتان لێی نییە، بەڕاستی ئێوە دەزانن ئادەمیزاد یەکەمجار چۆن پەیدادەبێت، دەی بۆ بیر ناکەنەوە، کەوا کەسێك بتوانێت یەکەمجار ئادەمیزاد لە دڵۆپێك ئاو درووست بکات، دەشتوانێت جارێکی تریش پاش مردنی

درووستی بکاتەوەو ژیانی بکاتەوە بەبەردا، خەبەرم بدەنێ لەبارەی ئەو تۆوەی کە ئەرزی بۆ دەکێڵن و دایدەچێنن، ئێوەن دەیڕوێنن یان ئێمەین ڕواندوومانە؟ ئەگەر بمانویستایە ئەو تۆوە داچێنراوەمان کەوا سەوزبوو هەڵچوو، دەمانکرد بە پووش و پەڵاشێکی وشك، ئەوکاتە ئیتر ئێوە هەر باستان دەکرد، کە چۆن وای لێهاتووەو قسەوباسی جۆربەجۆرتان لێوە دەکرد، دەتانووت:

ئێمە زیان لێکەوتووین، کە ئەو گشتە ڕەنجەمانداو هەمووی بە فیڕۆ چوو، بەڵکە دەتانووت: ئێمە بێ بەش و نائومێد بوین لە بەروبوومی ئەو گشتە کشتوکاڵە. یان خەبەرم بدەنێ، لە بارەی ئەو ئاوەوە کە دەیخۆنەوە، ئایا ئێوە لە هەورەوە بارندوتانەتە خوارەوە، یان ئێمەین باراندوومانە؟ ئەگەر بمانویستایە تاڵ و تفتمان دەکرد، بە جۆرێك ئاگر بەربداتە دەمەوە و نەخورێتەوە، دەی سوپاسی خودا ناکەن کە وای لێ نەکردووە و، بە شیرینی بۆی باراندوون؟ یان خەبەرم بدەنێ، لە بارەی ئەو ئاگرەوە کە هەڵیدەگیرسێنن. ئایا ئێوەن ئەو درەختەتان درووست کردووە، کە چیلکەیەکی لێ دەدەن لە چیلکەی درەختێکی ترو، ئاگریان لێ دەبێتەوە، یان ئێمەین درووستمان کردووە؟ ئێمە ئەو ئاگرەمان کردووە بەمایەی بیرکردنەوە لە خودا، کە خودایەکە ئاگری لە دارێکی تەڕدا درووست کردووە، کە ئاگرو تەڕی یەکناکەون و ، کردوویشمانە بە مایەی قازانج و سوود. بۆ ئەو کەسانەی لە دەشت و چۆڵەوانیدا دەژین، تا ئاگری پێ بکەنەوەو دەوروبەری خۆیانی پێ ڕوون بکەنەوە، یان بۆ ئەوانەی سکیان خاڵییەو برسییانە، تا چێشتی پێ لێ بنێن و خویانی تێر بکەن.[1]

شاراوەنییە بۆ هەموو ئەوانەی کەمترین هێزی ئەقڵیان هەیە، ئەگەر

---

(١) هەمان سەرچاوە/٥٣٦.

بەکەمتـرین بیرکـرنەوە سـەرنج بـدات لە نـاوەڕۆکی ئەم ئایەتـانە، وە چـاویش بگێڕێت بە درووستکراوە سەرسوڕهێنەرەکانی خودادا، لە زەوی و ئاسمانەکاندا، هەروەهـا بەو بەدیهێـنەرە بە توانـایەی کەگیـاداران و ڕووەکەکانیشـی لە سـەر فیطرەتێکـی تـایبەتی بەدیهێنـاوە، بەڕاسـتی ئەم کـارە سەرسـوڕهێنەرەو، ئەم ڕیزبەندی و ڕێکخستنە پتەوو بەهێزە، هەرگیـز ناگونجێت بەبێ درووستکەرێکی خـاوەن تەگبیـر سـاز بکرێـت، کە دایمەزرانـدبێت و فرمـانڕەوایی بکـات و، خاوەنێتی لێ بکات، بەڵکو مرۆڤ هەر بە فیطرەتی خۆی، خەریکە متمانە بەوە بکـات کە دەبێـت خـۆی لەژێـر دەسـتەڵاتێکی بەتوانادابێـت، وەبەپێـی ئیـرادەو تەگبیری ئەو بجوڵێتەوە، بۆیە خوداوەندی گەورە فەرموویەتی:

﴿أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (إبراهيم/١٠).

(واتە: ئایا گومان هەیە لە بوونی خودایەکدا کە ئافەریدگای ئاسمانەکان و زەویـیە) هەر لەبەر ئەمەیشـە کەپێغەمبەرەکـان (صـەلات و سـەلامی خودایـان لەسەر) نێردراون بۆ بانگهێشتنی خەڵکی، بۆ تەوحیدو یەکتاپەرستی، بۆ ئەوەی بڵێن: لاإله إلا الله، تەنها خودایەك هەیە کە شیاوی پەرستن بێت، وە فرمانیان پێ نەدراوە کە بڵێن:

ئێمە خودایەکمان هەیەو خەڵکانیش خودایەکی تر، چونکە ئەم ڕاستییە هەر لە سـەرەتای پێگەیشتنیانەوە لەسـەر ئەم فیطـرەتە گەشـەیان کـردووە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ (لقمان/٢٥) ئەگەر لێیان بپرسیت کێ ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە؟ دەڵێن: خودا.

هەروەها خودا فەرموویوتی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا، لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ (الروم/٣٠) واتە:

(دەی ڕووتی خۆت ڕاست بکە بۆ ئاینی ئیسلام، بەحاڵێ کەلابدەی لە هەموو

کارێکی بە تاڵ، لەسەر ئەو فیطرەتە پاکەی خودا مەخلوقی لەسەر درووست کردووە،کەس ناتوانێت ئەوەی خودا کردی بیگۆڕێت، ئەمەیە ئاینی ڕاست.)
کەواتە لە فیطرەتی مرۆڤ و بەڵگە بەرجەستەکانی قورئاندا، ئەوە پردەکەنەوە کە پێویستی بە هێنانەوەی بەڵگەی زیاتر هەبێت، بەڵام لەسەر پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی زانا قسەزان و بیرمەندەکاندا ئێمەش دەڵێین:

لەو بابەتانەی کە ئەقڵ دەیانسەلمێنێت بە بێ بەڵگە، ئەوەیە کە شتێکی پەیدابوو، هەروا سەربەخۆ درووست نابێت و، پێویستی بە بەدیهێنەرێك هەیە، وە دەزانین کە ئەم بوونەوەرە پەیدابووە، کەواتە دەبێت هۆکارێکی پەیدابوونی هەبێت، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم پێشەکییە دەڵێین:

**(هەموو پەیدابوویەك بەبێ هۆکار پەیدانابێت)**، ئەمە وتەیەکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە، چونکە هەموو پەیدابوویەك دەبەسرێتەوە بە کاتێکەوە، کە لە ئەقڵدا کاتی پێشخستن و دواخستنی بۆ دیاری دەکرێت، کەواتە تایبەتدانی بەوکاتەوە کە نە پێشبکەوێت لەوادەی خۆی و، نەدوایش بکەوێت، ئەوە پێویستی بە کەسێك هەیە ئەو تایبەتمەنییەی پێ ببەخشێت و بڕیاری بەدەست بێت.

وە کە دەڵێین: **(ئەم جیهانە پەیدابووە)**.. بەڵگەکەی ئەوەیە: هەموو جەستەو پارچەکان کە جیهانیان لێ درووست بووە، لەجوڵەو وەستان خاڵی نین، ئەوانەش هەردوکیان پەیدابوون، هەر شتێکیش حادیس بێت و خاڵی نەبێت لە پەیدابوون، ئەوە لەم بەڵگەدا سێ داوای تێدایە، پێویستییان بە ڕوونکردنەوە هەیە:

**یەکەم:** جەستەو پارچەکان کە جیهانیان لێ درووست بووە، لەجوڵەو وەستان خاڵی نین، ئەمەش قسەیەکی ئاساییە کە تەنها بە سەیرکردنێك دەسەلمێت و یەکسەر دەچێتە ئەقڵەوەو، پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە نییە، وە

پێویستی بەهێچ تێڕامان و بیرکرنەوەیەکیش نییە، چونکە هەرکەسێك وابیر لە جەستەیەك بکاتەوە، کە نە دەجوڵێت و نەوەستاویشە، کەواتە سواری ئەسپی نەزانینی خۆی بووەو، هەموو پەیڕەوێکی ئەقڵ و تێگەیشتنی وەلاناوە.

**دووهەم:**

ئەو قسەشمان کە جوڵەو وەستانیش پەیدابوون، بەڵگە لەسەر ئەم دەعوایەش ئەوەیە کە بەدوای یەکدا هاتوون، واتە یەکێکیان دەبێت لە دوای ئەوی تریان هاتبێتە کایەوە، ئەمەش لە تەنها سەیرکردنێکی هەموو جەستەکاندا دەبینرێت، لەوەی دەکەوێتە بەرچاوەوە یان نابینرێت، چونکە هیچ جەستەیەکی وەستاو نییە لە ئەقڵدا نەسەلمابێت کە جوڵاندنی درووست بێت، وە هەموو جەستەیەکی جوڵاویش ئەقڵ حوکم دەدات بەوەی کە درووستە لە جوڵە بکەوێت، ئەو حاڵەتە جیاوازەی کە یەکەم جار ڕویداوە، دیارە کە حادیسەو پەیدابووە، چونکە گۆڕان بەسەر حاڵەتەکەیدا هاتووە، ئەوی پێشویش دیسان پەیدابووە، چونکە لەسەر حاڵەتی خۆی نەماوەتەوە، چونکە ئەگەر بیسەلمێنین کە ئەو جەستەیە قەدیم بووە، دەبوایە عەدەم و نەمانی نەهاتایە بەسەردا، وەك چۆن لەمەولا ڕونی دەکەینەوەو، بەڵگەکانی بۆ باس دەکەین، لە کاتی سەلماندنی مانەوەی دروستکەرو بەدیهێنەری حەقیقی ﷻ .

**سێیەم:** کە دەڵێین: (ئەوەی خاڵی نەبێت لە ماددەیەکی پەیدابوو، کەواتە خۆیشی حادیس و پەیدابووە) بەڵگەی ئەم دەرەنجامەش ئەوەیە: کە ئەگەر وانەبێت .. کەواتە دە بێت بیسەلمێنین: لە پێش هەموو پەیدابوویەك چەندین پەیدابوو حادیسی تری کۆتا نەهاتوو هەبووە، وە هەتا ئەو هەموو پەیدابووانە بەکۆتانەگەن، سەرەناگاتە ئەوەی پەیدابوویەکی نوێی تر کە ئێستە ئامادەیە پەیداببێت ، شتێکیش کە هەرگیز بە کۆتا نەگات کۆتایی نەیەت.

لەلایەکی تریشەوە سەرنجی ئەم فەلەکە بدەیت: ئەگەر چەندین سوڕانەوەی

کۆتانەهاتووی هەبێت، ئەوکاتە ژمارەکەی لەوە خاڵی نابێت: یان جوڵانەوەکانی فەلەك جووت دەبن یان تاك، یان لە یەك کاتدا جووتیش و تاکیش دەبن، یان نە جووت و نە تاك دەبن، دیارە محاڵە سوڕانەوەی فەلەك لە یەك کاتدا جووت بێت و تاکیش بێت، یان نە جووت بێت و نە تاك بێت؛ ئەو کاتەیە بەڕاستی جۆرێکە لە کۆکردنەوە لە میانی دو شتی دژ بەیەکدا، واتە: کۆکرنەوەی نەفی و ئیسبات لە یەك کاتدا، کە لە سەلماندن و جێگیر بوونی یەکێکیان، لادان و نەفی کردنی ئەوی تریانە، وە نەفی هەرکامێکیشیان بکرێت، ئەوە جێگیر بوون و ئیسباتکردنی ئەوی تریانە، وە محاڵە کە سوڕانەوەی فەلەك جووت بێت، چونکە هەموو شتێکی جووت لە سەرەتاوە دەبێت تاك بووبێت لەپاشان بە زیاد بوونی تاکێك دەبێت بە جووت، کەواتە شتێك کە وتبێتمان نهایەت و کۆتایی نییە چۆن دەبێت بووترێت کە پێویستی بە تاکێك هەیە ؟!

هەروەها محاڵیشە کە بوترێت تاکە، چونکە ژمارەیەکی تاك بە تەنها زیادبوونی تاکێکی تر دەبێت بە جووت، دەی چۆن دەبێت بڵێین پێویستی بە تەنها ژمارەیەك هەیە، کە لە پێشەوە وتمان نهایەت و کۆتایی نییە. کەواتە گەیشتینە ئەم دەرەنجامەی کە ئەم جیهانە خاڵی نییە لە شتە پەیدابووەکان، وە هەر شتێکیش کە خاڵی نەبێت لە حادیس و پەیدابوو، کەواتە بۆ خۆیشی پەیدابووە، کە سەلماندیشمان کە حادیسەو پەیدابووە، کەواتە پێویستی بە پەیداکەرێك هەیە کە لە نەبوونەوە بیهێنێتە بوون، ئەمەش لەو بابەتانەیە کە بە زەرورەت و بێ بەڵگە دەبێت بزانرێن و هەستیان پێ بکرێت.[1]

---

(١) بۆ درێژەی ئەم بابەتە بنواڕە: الإقتصاد فی الإعتقاد ی دانەرل/٩٩. وە تهافت الفلاسفة ل/٩٩. وە ئەمەش بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەیە کە وایان گومان بردووە کە شتێکی کۆتایی نەهاتوو نابێت وەصفدار بکرێت بە تاك و بە جووت.

## بنەمای دووهەم:

زانینە بەوەی کە خودای بەدیهێنەر هەربووەو قەدیمەو بێ سەرەتایە، ئەزەلییەو سەرەتایەك بۆ بوونی نییە، بەڵکە یەکەمینی هەموو شتەکانەو، هیچ نەبوونێك پێش بوونی نەکەوتووەو، پێش هەموو مردوو زیندوویەکیش هەر بووە. بەڵگەکەیشی ئەمەیە:

ئەگەر خودا قەدیم نەبێت و پەیدابوو بێت، ئەوە خۆیشی پێویستی بە کەسێك دەبوو کە بهێنێتە وجوودو پەیدای بکات، وە پەیداکەری ئەویش پێویستی بە پەیداکەرێکی تر دەبوو، ئەم زنجیرە پێویستییەش هەرگیز بە کۆتا نەدەهات، وە ئەوەش کە هەر نەبڕێتەوە ئەوا ناگاتە ئەنجام، یان دەبێت بگەینە ئەنجامێکی تر کە یەکێك هەموو ئەوانەی هێنابێتە بوون، کە خۆی قەدیمەو هەر بووە، بەم شێوەیە دەگەینە مەبەست، کە ناومان ناوە صنعەتکارو بەدیهێنەری جیهان، کە هەر لەسەرەتاوە هەمووشتەکانی درووست کردووە[1]

---

(١) ئیمامی غەزالی لە (الإقتصاد)دا ل/١٠٢ دەفەرموێت:

مەبەستمان لە قەدیمییەتی خودا، تەنها ئەوەیە کە بوونی خودا هیچ عەدەم و نەبوونێکی پێشنەکەوتووە، کەواتە لە ژێر وشەی قەدیم دا، تەنها سەلماندنی خودایەکی مەوجوود هەیە، وە نەفی بوونی عەدەمێك هەیە، کەواتە وا گومان مەبە کە قەدیمی خودا مانایەکی زیادی تێدایە لەسەر زاتی قەدیمەکە، تا ناچار بیت بەوەی کە بڵێیت: ئەو واتایەش هەر بەو شێوە قەدیمە، بە قەدیمییەك کە زیادە لەسەری، ئەمەش دوچاری تەسەلسول و زنجیربەندییەکی ترمان دەکات کە بە کۆتا نایەت.

# بنەمای سێیەم:

زانابیت بەوەی کە خودا ﷻ لەگەڵ ئەوەدا کە ئەزەلییە، ئەبەدیشەو هەردەبێت و هەرگیز کۆتایی بە بوونی نایەت، واتە هەرگیز عەدەمی بەسەردا نایەت.

خـودای گەورە یەکەمەو سـەرەتای هەمووبـوونێکەو، بەڵـگەی ئەوەیە کە ئەزەلیـیە، ئـاخرەو کۆتـای هەمـوویەتی و، بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی ئەبەدیـیە، زاهیــرە بە بەرزی و بڵنــدی و شــاراوە نیــیە، واتە جەلال و عیززەتــی خــودا شاراوەیی تێدا نییە. باطینە بە زانست و پەندیاری و حیکمەت و بوونی صیفەتی کیبریاء، کە هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ گەیشتن بە دەرککردن بە حەقیقەتەکەی. چـونکە ئەوەی قەدیمـی و ئەزەلییەتـی سـەلما، محـاڵە عەدەم و نەمـان بێـت بە سەریا. بەڵگەش ئەوەیە: ئەگەر بێت و زاتی خـودا نەمان بێت بەسەری دا، ئەوە لەیەکێك لەم دوو خاڵەیە بەدەر نییە:

یان بە نەفسی خۆی لەناو دەچێت، یان بەهۆی یەکێکی ترەوە کە لەناوی ببـات و دژایەتی بکـات. ئەگەر درووسـت بێـت شـتێك عەدەم و نەمـانی بەهـۆی خـۆیەوە پەیـدابێت، کە بەردەوامییەکەیشـی بەهـۆی خـۆیەوەیەتی، کەواتە درووستیشـە کە شـتێك پەیـدابێت گومـانی ئەوەی لێ بکرێـت کە نەمانیشـی بە نەفسـی خـۆی دەبێـت، کەواتە هەروەك چـۆن هەڵگـۆڕانی بـوون و پەیـدابوون پێویســتی بە هۆکارێــك هەیە، هەرواش گــۆڕانی بــوون بــۆ عەدەم و نەبــوون پێویستی بە هۆکارێك هەیە.

وەئەوەش باطیل و نـاجۆرە کە کە شـتێك لەناوبچێـت بەهـۆی لەنـاوبەرێکی ترەوە کە دژایەتی بکات، چونکە ئەو لەناوبەرە کە دەیفەوتێنێت ئەگەر قەدیمەو هەر بووە، ئەوە هەرگیـز ناگونجێت دوو قەدیم بەیەکەوە بووبن و دژ بەیەکیش بن، چونکە دوو شتی دژ بەیەك محاڵە بەیەکەوە کۆببنەوە، وە بە هۆی هەردوو بنەمــای پێشــووەوە کە باســمان کــردن بۆمــان ئاشــکرابوو کە بــوونی خــودا

وەستاوە بە نەفسی خۆیەوە و پێویستی بەهیچ ئامرازو هۆکارو کاریگەرییەکی تر نییە، وە قەدیمی خوایش هەروایە، کەواتە چۆن دەگونجێت شتێك لە قەدیمدا بووبێت و دژەکەیشی هەر بە قەدیمی لەگەڵیدا بووبێت.

وە ئەگەر دژە فەوتێنەرەکە کە عەدەمی بەسەردا هێناوە حادیس و پەیدابووبێت، ئەوە محاڵە شتی وا ڕو بدات، چونکە شتێکی پەیدابوو لە دژایەتی کردنیدا بۆ فەوتاندنی شتێك کە بوونی هەبێت، هەرگیز بەهێزتر نییە لە شتێکی قەدیم تا بتوانێت بوونی پەیدابووەکە لە ناو ببات، بەڵکو ئاسایی و بەڵگە نەویستە کە قەدیمەکە باشتر دەتوانێت بوونی دژەکەی خۆی لەناو ببات لە حادیسەکە، وە هەمیشە پاڵنان بە شتێکەوە ئاسان ترە لە بڕینەوەی شتێك، وە قەدیمیش ئەوبەرترو لە پێشترە لە حادیس و پەیدابوو.

# بنەمای چوارەم

زانینی ئەوەی کە خودای گەورە نە جەوهەرە کە لە جێگەیەکدا بگیرسێتەوە، بەڵکو زۆر بەرزو بالاو پیرۆزترە لەوەی کە بیخەیتە پاڵ جێگەیەکەوە، وە بەڵگەیشی ئەوەیە:

هەموو جەوهەرێك کە لە جێگەیەکدا بێت و بلکێت بە شتێکەوە، ئەوە تایبەتە بە جێگەکەیەوە، وە بەمحاڵەشەوە: یان ئەو جەوهەرە ناجوڵێت و ساکنە، یان تیایدا دەجوڵێت، کەواتە، لە جوڵەو وەستان خاڵی نییە، کە هەردووکیشیان حادیس و پەیدابوون، وە هەر ماددەیەکیش کە خاڵی نەبێت لەحدوس و پەیدابوون، خۆیشی تازەیەو پەیدابووە، ئەگەر ماددەیەکیش بۆ خۆی جەوهەری قەدیمی جێگیرو لکاو بە شوێنێکەوەبێت، وە وابچێتە مێشکتەوەو بیخەیتە خەیاڵتەوە، کە شتی وا دەگونجێت و بوونی هەیە، ئەو کاتە ئاساییە کە باوەڕیش بکەیت: کە هەرچی جەوهەرەکانی جیهان

هەیەهەموویان قەدیمن و هەر بوون[1]

کەواتە ئەگەر کەسێك ناوی برد بە جەوهەرو، مەبەستیشی ئەو جەوهەرە نەبوو کە دەلکێت بە ماددەیەکەوەو دەبێت لە شوێنێکدا بگیرسێتەوەو پێوەی ڕابووەستێت، ئەوە بە پێی (بەکارهێنانی لەفزیی) هەڵەی کردووە، بەڵام بە پێی بەکارهێنانی مەعنا و واتاکەی ئەوە هەڵەی نەکردووە[2].

---

(١) ئەمەش فرمانێکی محاڵە، هەرگیز ناگونجێت کە هەموو جەوهەرەکان قەدیم بن، چونکە بوونی جەوهەر لە خودی خۆیدا جایزەو واجب نییە، واتە ئەگەر نەبێت هیچ ڕونادات ، شتێکیش بوونەکەی واجب نەبێت، کەواتە قەدیم نییە، چونکە پێویستی بە کەسێکی ترە کە بیهێنێتە بوون.

(٢) بنواڕە (الإقتصاد) ل/١٠٧. واتە ئەگەر کەسێك ناوی خودای برد وەکو جەوهەرێك نەك بە واتای ئەوەی کە وەك جەوهەرەکانی تر پێویستی بە شوێن و جێگاو ماددەیەك هەبێت کە خۆی پێدا هەڵبواسێت، یان دوور بێت لە لەوازم و پێویستییەکانی جەوهەر، وەك جیهەت و لاو گەمارۆ دان و هاووێنەکانی، ئەوکاتە بەو واتایە درووستە، وە لەڕوی وشەوە هەڵەیە، بەڵام لەڕوی واتاوە هەڵەنییە، وەك لەمەدوا باسی دێت.

وە پێویستە بزانین: کە وشەی جەوهەر ،نە لەڕوی لەفزەوەو نە لە ڕووی زمانەوانییەوە درووست نییە دایبپرێت و ئیطلاقی بکەیت بەسەر خودادا، چونکە جۆرە کەمی و نەقصێکی تێدایە، کە بۆخودای بەکار بهێنیت، چونکە جەوهەر بە بەشی بەشنەکراو دەوترێت، کە قابیلی دابەشکردنی تر نەبێت، (جوزئی لایەتەجەزەء)کە لەڕوی قەبارەوە بێ بەها ترین شتە ، نەسەفی لە(شَرحُ العُمدَة)دا و نەصارا و ئیبنولکیرام دەڵێن: لەو ڕووەوە کە باسمانکرد، درووستە بەڕەهایی باسی جەوهەر بکەیت و خودای پێ وەصفدار بکەیت لەو ڕووەوە کە جەوهەر بە خۆیەوە ڕادەوەستێت و خودایش (**قائمٌ بالذَّات**)ە واتە: بە زاتی خۆیەوە ڕاوەستاوە، کەواتە بەم لێکدانەوەیە دەبێتە جەوهەر. بەڵام لەوەڵامدا دەڵێین: جەوهەر لە زمانی عەرەبدا بە واتای ئەصڵ دێت، ئەو جوزئەی کە قبوڵی دابەشکردن ناکات ناو دەبرێت بە جەوهەر چونکە ئەصڵی ئەو ماددانەیە کە

# بنەمای پێنجەم

زانینـت بەوەی کە خـودای گەورە جەسـتەو لاشـەنییە، وە هەرگیـز پێـك نەهـاتووە لە هـیچ جەوهەرێـك، چـونکە جیسـم بـریتییە لەوەی کە لە جەوهەر پێك هاتبێت، کاتێکیش سەلماندمان کە خـودا جەوهەر نییەو، ئەو بۆچـونەش پوچەڵبوویەوە کەجەوهەرێك بێت و لە شوێنێکدا بێت، کەواتە ئەوەش پوچەڵ دەبێـتەوە کە خـودا جەسـتە بێـت، چـونکە بـۆ پێکهـاتەی جەسـتە دەبێـت تایبەتمەندبێت بە جێگایەکەوە، وە پێکیشهاتبێت لە جەوهەرێك و جەوهەرێك، وە محاڵیشە خاڵی بێت لە جیابوونەوەو کۆبوونەوە، یان لە جوڵانەوەو وەستان، یان لە شێوەو شکڵ و ئەندازەو پانی و درێژی، ئەمانەیش هەموویان نیشانەکانی پەیـدابوون و حادیسـی جیسـمن. ئەگەر بگونجـایە کەوا گومـان ببرێـت، کە درووستکەری ئەم جیهانە جیسم و جەستەیە، ئەو کاتە درووستیش دەبوو کە بڕوا بەوە بکرێت، کە خۆر و مانگیش خودان!! یان هەر شتێکی تر لە بەشەکانی لاشـەو جەسـتەکان. ئەگەر کەسێکی جەربەزە جـورئەتی ئەوەی کـرد، کە نـاوی خـودا ببـات بە جیسـم، بەبێ ئەوەی هـیچ ئیـرادەیەکی ئەوەی کردبێـت کە لە

---

جەستەی لێ پێکدێت و جیسمی لێ تەرکیب دەکرێت، بەڵام خودای تاك و تەنها ئەصڵ نـیە بـۆ مـاددە تەرکیـب کراوەکان، کەواتە هەرگیـز نابێـت پێـی بوترێـت جەوهەر، وە زانیشـمان کە جەوهەر ئەو مـاددەیە کە لە جێگەیەکـدا جێگیـر و تەحەیـوز دەکات و دابەش نابێت، و خاڵیش نییە لە جووڵەو وەستان، کەواتە جەوهەر پەیدابووە، وە لە زمانەوانیدا بە جەوهەر ناوترێت کە بە خۆیەوە ڕاوەستاوە، بەڵکو پێی دەوترێت ئەصڵی شـتەکان، وە ئەم گـۆڕانەی بەسـەر واتـا زمانەوانییەکەیـدا هـاتووە، هەڵەیەکی حاشـا هەڵنەگـرە. وە شـێخی زوبەیـدی پێناسـەکانی جەوهەری هێنـاوە کە لەلایەن ئیمـامی سوبکی و زاناکانی ترەوە کراوە .بنواڕە: الإتحاف ٢/٩٩.

شـوێن و جەوهەر پێکهاتبێـت، ئەوە لەلەنـاوبردنەکەدا هەڵەی کـردووە، بەڵام لەوەدا کەنەفی جەستەبوونی لە خودا کردووە ئەوە پێکاویەتی.

## بنەمای شەشەم

زانینـت بەوەی کە خـودای گەورە عەرەزێـك نیـیە، کە بە جەسـتەیەکەوە ڕاوەستابێت، یان تێکەڵی شوێن و جێگایەك ببێت.

چـونکە مـاددەی عەرەزی ئەوەیە: کە بچێتەنـاو جیسـمەوە، هەمـوو جەستەیەکیش بێگومان حادیسەو پەیدابووە، وە ئەوەی کە پەیدای کردووە لە پـێش ئەوەوە بـوونی هەبـووە، کەواتە چـۆن دەبێـت ئەوەی درووسـتی کـردووە لەناویـدابێت و جێگیـر ببێـت تیایـدا؟! کە لە ئەزەلەوە خـۆی بە تـاك و تەنهـایی بـوونی هەبووە و، کەسـی تریشـی لەگەڵـدا نەبـووە، لە پاشـان جەسـتەو لاشـەو ماددە عەرەزییەکانیشی پەیداکردووەو هێناونیەتە بوون.

وە لەبەر ئەوەی ئەو خودایە زانایەو بە توانایە و، ئیرادەتمەندەو خولقێنەر و بەدیهێـنەرە، وەك لەمەودوا باسـیان دێـت، ئەم وەصـف و پێناسـانەش هەموویـان محـاڵە کە مـاددەیەکی عەرەزی پـێ وەصـفداربکرێت، بەڵکـو ئەم هەموو صیفەتانە ناچێتە ئەقڵەوە کە بدرێنە پاڵ کەسێکی تر، جگە لە زاتێك کە بەخۆیەوە وەستاوەو سەربەخۆیەو پێویستی بە هیچی تر نییە.

وەبە دڵنیـاییەوەو بەم بنەمایـانەی کە باسـمان کـرد، گەیشـتینە ئەو دەرەنجـامەی کە خـودا بـوونی هەیەو (واجـب الوجـود)ەو، وەسـتاوە بە زاتـی خـۆیەوە، نەجەوهەرەو نەجیسـمەو نە عەرەزیشـە، وە هەمـوو جیهـان بە گشـتی پێك هـاتووە لە جەوهەرەکان و مـاددە عەرەزی و جەسـتەییەکان، کەواتە هـیچ یەکێك لەمانە ناشـوبهێن بە خوداوەو، خودایش وەك هیچ شتێك لەمانە نییە، بەڵکـو خـودا وەك دروسـتکراوەکانی نیـیەو، قەییـومەو هەرگیـز نانوێـت و، خەوەنوچکەیش نایباتەوە، وە زیندووەو هەرگیزیش نامرێت، کە هێچ شتێك

هاووێنەی ئەو نییەو لەو ناچێت.

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ شوری/١١. هەرگیز ناگونجێت کە مەخلوقێك بشوبهێت بە خالیقەکەیەوە، هیچ شتێك هاووێنەی نییە،

هەروەها چۆن ئەوشتەی کە دیاری کراوە و وێنەی کێشراوەو ڕەنگی ڕێژراوە، وەك ئەوە بێت کە دیاری کردووەو وێنەی کێشاوە، کە دەزانین هەموو جەستەو ماددە عەرەزییەکان، هەر هەمویان لە درووستکراوو سنعەتکاریەکانی خودا بوون؟! کەواتە هەرگیز ناگونجێت و محاڵە، کە حوکم بدەین بەوەی شتێك هەبێت هاووێنەی بێت، یان لە خودا بچێت[١].

---

(١) بزانە کە هومو گرۆی ئیسلام، لەسەر ئەوە هاوڕان کە درووستکەری جیهان ناشوبهێت بە هیچ شتێك و،هیچ دژو وێنەو شەبهێکی نییەو، بوونی خودا بەبێ تەشبیهەو بێ صیفاتی کەموکوڕییە، بەڵام لە میانی خۆیاندا جیاوازی کەوتۆتە بەینیانەوە:

هەندێکیان لە درێژەپێدانی بابەتەکاندا، عەقیدەی لەسەر بنەماکانی تەوحید و باوەڕی تەواو لای نەداوەو، دژ بە ئەصڵ و فەرعی دین نەجوڵاوەتەوە، کە تێکڕای زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و ،ئەصحابی حەدیس و ئەهلی ڕەئین، کە پابەندییان بە بنەماکانی دینەوە کردووەو، مەزهەبەکەیان تێکەڵ بە هیچ یەکێك لە بیدعەکارانی وەك: قەدەرییەکان و مورجیئەو موشەببیهەو موجەسسیمەو ڕافیزییەکان هاو وێنەکانیان نەکردووە، وە بڕیای پێشەوایانی دین لە (فیقە) و حەدیس و ئیجتیهاد لە ئەحکام و فەتوادان و سەرمەزهەبەکان، پێشەوایان مالیك و ئەبو حەنیفەو شافیعی و ئەوزاعی و ئەوری و، فوقەهای مەدینەو هەموو ئیمامەکانی حەرەمی مەککەو مەدینەو ئەهلی زاهیر و، هەموو ئەو زانایانەی ڕاکانیان بە هەند وەرگیراوە لە فیقە دا، وەك عەبدوڵلای قەطان و موحاسیبی و عبدالعزیزی مەککی و حسەینی بیجلی و أبی عباس ی قەلانسی و ئەبی حەسەنی

ئەشـــــعەری و شـــــوێنکەوتوانیان، ئەوانەی کە دوورن لە موجەســــیمەو موشـــەببیهەکان، هەروەهـا زانایـانی ئەهلی تەصــەووف کە لەسـەر ئەم بـاوەڕە دامەزراون، وەك ئەبی سولەیمانی دارانی و، ئەحمەدی ئەبی الحواری و ، سەری سەقەطی و ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و، فوضەیلی کوڕی عەیاض و، جونەیدی بەغدادی و، ڕووەیم و، نەوەوی و، خەراز و، خەوواص و ، هاو مەسلەکەکانیان، نەك ئەوانەی خۆیان بەواندا هەڵسپاردووەو لێیان بەرین، وەك: حلوولیەکان ، هەروەها لەسەر ئەو عەقیدە هاتوونەتە خوارەوە پێشەوایانی ئەهلی حەدیس، وەك زوهەری و شـوعبە و قەتـادە و ئیـبن و عـویەینەو عبـدالرحمن ی کـوڕی مەهدی و، یەحیای کوڕی سەعید و، یەحیای کوڕی موعین و، عەلی مەدائینی و، ئەحـمەدی کـوڕی حەنـبەل و، ئیسـحاق و، یەحیـای تەمیمـی و، هەمـوو حوفـاظی حەدیسـەکانی پێغەمـبەرﷺ ، کە لە (جەرح و تەعـدیل)دا ڕیـوایەتی دروستـدا قسـەیان وەرگیـراوە، هەروەهـا ئەو پێشـەوایانەی زوبـان، و نەحـو و قیـرائات و ئیعرابی قورئانیـان لێ وەرگیـراوە، هەموویـان لەسـەر باوەڕی تەوحیـد بـوون، وە هیچیـان بڕوایـان بەوانە نەبـووە کە تەشـبیهی خـودا دەکەن بە مەخلوقاتەکانی، یان جیسم بۆ خودا بڕیار دەدەن، یان لاو شوێنی بۆ بڕیاردەدەن، پەنا بەخـودا، کە ئەمانە سەرگەردانەکانن، وە تـاقمی سەرلێشێواون، کە ئەمڕۆ لەهەمـوولایەکەوە سـەریان هەڵـداوە، ئەوانە لە گـرۆی ئیسـلام دەرچـوون، کە ئەمانەش دوو بەشـن: **یەکەمیان:** دەهریەکانن، کە نکوڵی لە خالقیەتی خـودا دەکەن و، هەمـوو شـتەکان دەبەسـتنەوە بە زەمـانەوە، ئەمـانە ئیسـباتی ئەوەدەکەن کە خـودا دەشـوبهێت بە درووسـتکراوەکانی، **تـاقمی دووهەمیـان:** دانـدەنێن بەوەدا کە ئەم بـوونەوەرە صـانعی هەیە، بەڵام ڕایـان جیـاوازە، هەنـدێکیان بـڕوای بە دوو صـانیع هەیە، وەك نـوور و تـاریکی، وەهەندێکیشـیان کـردارو ڕوداوەکـان دەداتە پـاڵ هەر چـوار طەبـیعەتەکە، وەهەندێکیشـیان دان

# بنەمای حەوتەم:

زانین بەوەی کە زاتی خـودا ﷻ پاك و پارێزراوە لەوەی کە بـدرێتە پاڵ هـیچ لاو جیهەتێکەوە، چونکە جیهەت یان لەسەرەوەیە. یان لە خوارەوە، یان لای ڕاستە یان لای چەپ، یا لە پێشەوە یان لە دواوە، ئەم لایانەش هەر خۆی درووستی کردوون ئەوانی هێناوەتە بوون، بەهۆی درووستکردنی مرۆڤەوە، چونکە دوو لای بۆ درووست کردووە، یەکێکیان دەخرێتە سەر زەوی و ناوی براوە بە پێ، ئەویشیان بەرامبەریەتی کەناوی سەرە، کەواتە ناوی سەروو بۆ ئەو جێگەیە دیاری کرا کە لە بەرامبەری سەر دایە، وەناوی خوارەوەش بۆ ئەو جێگایە دیاری کراوە کە لە ڕیزی پێ دایەو لە جیهەتی ئەودایە. تەنانەت ئەو میرووەی کە لەسەر سەقفی ناو خانووەکەدا دەڕوات، بەلای ئەوەوە سەر ئەوەیە کە لە خواریەوەیەو بەرامبەری سەریەتی، خواریش ئەوەیە کە لە خواریەوەیەتی، کە

---

دەنێن بەیەك صانع و درووستکەری قەدیمدا، ئەمانیش ڕای جیاوازیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن: وەك هیچ یەکێك لە درووستکراوەکانی نییە، نەفی صیفاتەکانیشی لێ دەکەن، کە زۆربەی فەیلەسوفەکان ئەمە ڕایانەو بە (موعەطیلە) ناودەبرێن، وەهەندێکیشیان هەموو سنورێکیان بەزاندووەو، ئیسباتی قاچ و دەست بۆ خودا دەکەن ! وەك جولەکەو هەندێك لەوانەی تەفسیری ئایەتەکان بە پێی زاهیرەکەی لەیەك دەدەنەوەو، تەشبیهی خالیق بە مەخلووق دەکەن، ئەمانەش دەیان کۆمەڵی گومڕایان لێ کەوتۆتەوە، وەك هاوڕێیانی هیشامی ڕافیزی و، جەواربییە و، حلولییەکان و، هاوڕێیانی ئەبی حەلمانی دیمەشقی و، بەیانییەکان و، تەناسوخیەکان و، موغیرییەکان کە وتارو گوفتارەکانیان کێوی لەبەردادەلەرزێت،خاوەنی (الملل والنحل) بە درێژی باسی کردوون،خوا بمانپارێزێت لە شەڕیان. الإتحاف : ٢/٢-١٠٢-١٠٣.

به پێچەوانەی سەرو خواری ئێمەوەیە، ئەوەی لای ئەو سەرە، لای ئێمە خوارەو ئەوەش لای ئەو خوارە لای ئێمە سەرە.

هەروەها دوو دەستی بۆ مرۆڤ دروست کردووە، زیاتر وایە کە یەکێکیان بەهێزترە لەویان، بۆیەناوی ڕاست دراوە بە دەستە بەهێزەکە، وە دەستی چەپیش بۆ بێ هێزەکە، ئەو لایەنەی کە لای دەستی ڕاستەوەیە پێی دەوترێت ڕاست، ئەویشیان ناودەبرێت بە چەپ، هەروەها دوو تەنیشتی بۆ دروستکردووە، کە لەو جێگەدا شتی تیا دەبینێت، کە بۆلای ئەوێ وە دەجولێت، پێی دەوترێت پێش، کەواتە بۆ کوێوە پێشڕەوی دەکات ئەوە پێشەوەیە، وە ناوی پشتەوەیش دانراوە بۆ دواو پشتی ئەوکەسە.

کەواتە لایەنەکان هەموو لەدوای پەیدابوونی مرۆڤ پەیدابوون و ناویان لێ نراوە، ئەگەر مرۆڤ بەم شێوەیە دروست نەکرایە، بەڵکو خڕ بوایە وەك تۆپ، ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە ئەم جیهەتانە بوونیان هەر نەدەبوو، ئیتر چۆن دەبێت بووترێت کە خودا لە ئەزەلدا تایبەت بە لاو جیهەتێك بووە، کە هەر شەش لاکە بۆخۆیان دوای دروست بوونی مرۆڤ پەیدابوون؟! یان چۆن دەبێت بوترێت کە خودا تایبەتە بە جیهەتێکەوە، کە هەر بوونیشی نەبووە؟

ئایا بەوەی کە خودا جیهانی لەسەر خۆیەوە دروست کردووە ، پاکی و بەرزی بۆ ئەو خودایەی کە هیچ شتێك لەسەری ئەوەوە نییە، خوای گەورەش بەرزترە لەوەی (سەر)ی بدرێتەپاڵ، کە ئەولایەی لە جیهەتی سەری خوداوە بێت(پەنا بەخودا) پێی بووترێت سەر، یان جیهانی لە خواری خۆیەوە دروست کردبێت، خودا زۆر لەوە بەرزو موقەددەس ترە، کە لای خواری هەبێت تائەوەی لە لای خواریەوەبێت بە خوار ناو ببرێت. خودا لەوە بەرزترە کە پێی بدرێتە پاڵ، تا ئەوەی لە حەنای پێیدا بێت(پەنا بەخودا) پێی بووترێت خوار، ئەمانە هەمووی لەڕوی ئەقڵیشەو محاڵەو هەرگیز ناگونجێت.

چـونكه ئەوەی لای ئەقـڵ سـەلماوە، ئەوەی لایەكی هەبێـت و تایبەتبێـت پێیەوە، دەبێت تایبەت بێت بە پەنایەكەوە كە تیایدا جێگیر ببێت، وەك چۆن جەوهەر پێویسـتی بەو پەنـایەك هەیە، یـان شـتێكی وابێـت كە پێویسـتی بە جەوهەرێك ببێت، وەك چۆن ماددەی عەرەزی پێویستی بە جەوهەر هەیە، وە بۆیشـمان دەركەوت، كە محـاڵەو هەرگیـز ڕوونـادات كە خـودا پێویسـتی بە جەوهەرو عەرەز بووبێـت، كەواتە محـاڵە كە خـودا پێویسـتی بە لاو جیهەتێـك هەبێـت. وە ئەگەر مەبەسـت لە وشـەی جـیهەت غەیـری ئەو دوو واتـایەبن، كە پەنـاو تـێكەڵ بـوونی تێـدا نەبێـت، ئەوە بەهەرحـاڵ هەڵەكە لە ناونـانەكەدایەو، لەگەڵ جۆرێك لە یارمەتی دان لە واتاكەیدا، [١]

وە بەڵگەیەكی تـر ئەوەیە كە ئەگەر خـودا لەسـەر جیهـانەوە بێـت، وەك موجەسسـیمەكان دەیڵـێن.. ئەو كاتە دەبێـت خـودا لە تەنیشـتیدا بێـت، وە هەر شـتێك كە لەپـاڵ جەسـتەیەكدا بێـت، ئەوە یـان دەبێـت وەك ئەو وابێـت، یـا بچـووكتر، یـان گەورەتـر، وەهەر یەكێـك لەم ئەگەرانە جـۆرە تەقـدیرو دیـاری كـردنێكە، پێویسـتی بە توانـاو دیاریكەرێـك هەیە، وە هەرگیـز خـودایەكی بەدەسـتەڵات پێویسـتی بەوە نابێـت و، لەوە مـوقەددەس و پیرۆزتـرە شـتی وای بدرێتە پاڵ.

---

(١) واتە: سـەیر دەكرێت ئەگەر مەبەستی تەنزیهی خـودا بێت، لە هەمـوو واتـایەكی خـراپ كە دێت بە مێشـكدا، ئەوە باشـتر وایە لەوحاڵەشـدا ئەو وشـەی جـیهەتە بەكار نەهێنرێت، تا ئەو گومانە بڕەوێتەوە، چونكە لە زمانەوانیشدا نەهاتووە بەو مانایە، وە ئەگەر واتـای تری لێ وەربگیرێت ئەوە بە دڵنیاییەوە دەبێت ئەو وشـەی جـیهەتە بەكار نەیەت، چـونكە سـەر لە گـومڕاییەوە دەردەكات. بنـوارە : الإتحـاف ١٠٤/٢.

ئەوەش کە لە کاتی نزاو پارانەوەدا دەستەکانت بەرزدەکەیتەوە بۆ لای ئاسمان، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئاسمان ڕوگەو قیبلەی دۆعاو نزایە، وە هێمای ئەوەیشی تێدایە، کە وەصفی ئەو بانگکراوە دەکرێت بە شێوەیەك، کە شایستە بێت بە بالاًیی و جەلال و دەستەڵاتی خودا، بۆ ئاگادارکردنەوە و بێداربوونەوەی هەموان، کە مەبەست لە ڕوکردنە بەرزایی و ئاسمان بۆ نزاکردن، تەنها بڕیاردانی خستنەپاڵی صیفەتی مەجد و بەرزی و بڵندییە بۆ خوداوەندی جیهان، چونکە خودا لەسەرو هەموو بوون و بوونەوەرێکەوەیە، بە تواناو بە زەبر و بە دەستەڵاتە [1].

## بنەمای هەشتەم:

زانین بەوەی کە خودای بالادەست لەسەر عەرشی خۆی ڕاوەستاوەو دەستەڵاتی بەسەریدا هەیە، بەو شێوەو واتایەی کە شیاو بێت و ئیرادەی خودای بە واتاکەی لە سەر بێت، کە نەگونجاوو دژ نەبێت لەگەڵ وەصفدارکردنی خودادا بە صیفەتی عەزەمەت و کیبریاء، وە دووریش بێت لە هەموو نیشانەکانی پەیدابوون و لەناوچوون [2].

---

(١) وە بنوارە دانەری بەڕێز لە باسکردنی ئەو نهێنییەی کە ڕوکردنە ئاسمان بۆ نزاکردنە، لە پەڕاوی (الإقتصاد /١٠٤) دا، وە بۆیە باسی صیفەتی قەهرو دەستەڵات و زەبری پەروەردگاری بەکارهێناوە چونکە خودا ﷻ بۆ خۆی ئەو صیفەتانە بەکار دەهێنێت و دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾ (الأنعام/١٨)یان دەفەرموێت: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ (طه /٥)، کە وشەی قەهر و ئیستیوای بەکار هێناوە.

(٢) بەلای زانایانی (ماتوریدی)یەوە درووستە بڵێت: خودا دەستەڵاتی ئیستیلای هەیە بەسەر عەرشی و ئاسماندا، بەڵام ئەمە مانای واجب نییە بۆی، بەڵام فەرموودەی

که مەبەست لە وشەی ئیستیوا بۆ ئاسمان ئەوەیە:
کە ئەو واتایە بگەێنێت، کە قورئانی پیرۆز باسی لێوە دەکات:
﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾ (فصلت/١١).(١)

---

غەزالی ئەوەدەگەێنێت: کە ئەو واتایە پڕ بە پێستی وشەکەیە، بەڵام نەك بەوەی تەنها حەصر بێت لەسەر عەینی ئەو واتایە، ئەگەر ترسی ئەوەمان نەبوو عەوامەکان واتاکەیان لێ تێك دەچێت و، مانای ئیستیوا بەو لێکدانەوەیە بەلای تەشبیە و لکاندن دەبەن، ئەوە ڕێگریان لێ ناکرێت کە وشەی ئیستیوا بەکار بهێنن، چونکە لە زمانەوانیشدا بە واتای سەیتەرەکردن و دەستەڵات هاتووە، وەك باسی دەکات، ئەگەر وتیان: خودا باڵادەستە بەسەر هەموو شوێنێکدا، بۆچی تەنها باسی عەرشی کردووە، لەوەڵامدا دەوترێت:
هەروەك چۆن خودای هەموو شوێنێکەو، بە تایبەتیش باسی خودای عەرش کراوەو دروستیشە. ﴿وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ (التوبة/١٢٩)، ئەگەر وتیان: مانای چییە کە دەڵێن عەرشی خودا، ئەگەر لەسەری دانەنیشتبێت؟!
لەوەڵامدا دەڵێین: تۆیش دەڵێیت (بیت الله)، کەچی خودایش لە ناویا دانەنیشتووە، عەرشیش لە ئاسماندا مەلائیکەکان بە دەوریدا دەسوڕێنەوە، وەك چۆن کەعبە وا لە سەر ئەرزدا خەڵکەکە بە دەوری دا دەسوڕێنەوە، ئەمە ڕای خاوەنی کتێبی (نهج السبيل)ە کە لەگەڵ ئەهلی سوننەدا دەگونجێت .
(١) لە إتحافدا هاتووە: ڕیوایەتێك دەڵێت: لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە کەواتای (إستوى)ی بە (إستولى) لێك داوەتەوە، ئیبن و تەیمییە لە کتێبی (العرش)داڕەدی جاحیظی داوەتەوە، کە پیاوێکی موعتەزلییەو متمانە بە ڕێوایەتەکەی ناکرێت، شێخی سوبکی دژ بە کتێبی (العرش) قسەی زۆر دەکات، کە باسی (إستوى) دەکات و دەڵێت: ئەگەر ڕاست بێت بە واتای ئیسیلا بێت، بۆچی حەوت جار إستوى هاتووە جارێك وشەی إستولى نەهاتووە؟

بەڵام ئەم قسەی إبن تیمیە مەرج نییە کەوابێت، جاری واهەیە زیاتر لە ڕستەدا مەجاز بەکار دەهێنن، وە وشەی (استوی) جوانترو کورتترو پڕ ماناترە، لە پاشان وەزنی ئیستەوا ئیفتەعەلەیە، پیتی سینەکەی ئەصڵییە، بەڵام وەزنی ئیستەولا ئیستەفعەلەیە، کە سینەکەی زیادەیەو بە واتای ویلایەتە، کەواتە دوو ماددەی جیاوازن لەڕوی وشەو واتاوە، وە هەندێك جار ئیستیلا و دەستبەسەراگرتن بە حەققی خۆی دەبێت و، هەندێك جاریش بە زۆرەملێ دەبێت، بەڵام وشەی (استوی) تەنها بە حەق دەبێت. وە لەفزی ئیستیوا صیفەتێکە بۆ ئەو کەسەی کە خۆی ڕێك و عەدل بێت، بەڵام ئیستیلا بۆ (تەعدییەو تەجاوز) هاتووە، کەواتە سیری بەکارهێنانی قورئان بۆ لەفزە (استوی) زۆر لەمە زیاترە....چونکە واتاکەی درووست نابێت ئەگەر بڵێیت (إستولی)، تا نەڵێیت لەسەر چی سەیتەرەی کردووە، بەڵام واتای (استوی) بە تەنهاییش بێت تەواوەو کەمی نییە، بەڵام کەسێك کەواتای (استوی) بە (استولی) لێك دەداتەوە، دەیەوێت واتای لەفزەکە لە ئەصڵە زاهیرەکەی خۆی لابدات بۆ مانایەکی تر، کە واتای تەشبیە و تەجسیم نەگەێنێت، دیارە لێرەدا بە مەجاز ئەو وشەی (استوی) بەکار هاتووە، لەبەر ئەوەی چەندین واتا دەگرێتەوە، وە وشەکەش کورت و شیرین و پڕواتایە، بەڵام هەمیشە چاودێری واتاکەی خۆی بکرێت کە قورئان مەبەستییەتی، ئەوە ڕاسترە کە مانای ناجۆر و نادروست ناگەێنێت، کەواتە بزانە: کە ئیستیوا لە لوغەتدا دوو واتای هەیە:

**یەکەمیان:** بە مانای ئیستیلاو دەستەڵات بەسەردا پەیداکردن و سەیتەرەکردن دێت بە حەقی خۆی، کە سێ واتای دەبێت، بەڵام ئیستەولا تەنها یەك مانای هەیە، ئەو زانا ی کەلامەی کەواتاکەی بەو شێوە لێك دەداتەوە کە هەرسێ ماناکەی بگرێتەوە، کارێکی قەدەغەکراوی نەکردووە و، وەصفی خودایشی بە شتێك نەکردووە کە درووست نەبێت، بەڵام ئەوەی لە واتاکردنیدا دەڵێت خودا

دەیزانێت و خۆبەسەری هیچ بڕیارێك نادات و، تەنزیهو تەفویض بەكار دەهێنێت، نەوەكو مەبەستی خودا واتایەكی تریان بێت، داینابڕێت بەسەر یەكێك لەو واتایانەدا، ئەمەش كارێكی خراپی نەكردووە.

**واتای دووهەم:** بۆ وشەی (استوی) جلوس و دانیشتنە، كە نە زمانەوانی و نە ئەقڵ و نە بەڵگەكان قایل نابن كە بەم شێوە تەفسیری ئیستەوا بكرێت، چونكە سەری لە كوفرو جەستە بڕیاردانەوە دەردەچێت بۆ خودا (پەنا بەخودا).

بزانە! خودا خاوەنی كەماڵی موڵكی خۆیەتی، لە ئەزەل و ئەبەددا، وەعەرش و هەموو ئەوەی لە ژێر عەرشدایە حادیسەو تازە پەیدابووە، بۆیە خودا ئەم ڕستەی هێناوە: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ لەبەر ئەوەی عەرشەكە تازە پەیدابووە، نەك لەبەر ئەوە بێت كە ئیستیواكە تازە بووبێت! بوخاری لە صەحیحەكەیدا لەسەر ئایەتی: **(وان عرشه على الماء)** لە كیتابی تەوحیددا یەكسەر ئایەتی:

**﴿وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾**ی هێناوەتەوە، تا گومان نەبرێت قسەی فەیلەسووفەكان ڕاستە كە دەڵێن: عەرش خالیقی هەموویەتی، یان هەندێكی تر دەڵێن:

عەرش بەردەوام لەگەڵ خودادا بووە، واتە هەر بووە، لە شەرحی ئەو فەرموودەدا: **( كانَ اللهُ ولَم يَكُن مَعَهُ شَيئٌ، وكانَ عرشُهُ على الماء)**، بۆ ئەوەی گومانەكەیان نەمێنێت، خودا فەرموویەتی: خودا پەروەردگاری عەرشی گەورەیە. كەواتە عەرش بۆخۆی ژێردەستەیە و خالیقی هەیە، ئیتر چۆن دەكرێت بە خودا، ئیبن و حەجەری عەسقەلانی شەرحی فەرموودەكە دەكات و ئەم فەرموودەیەش دەهێنێت: **﴿فَإذاً أنا بِموسى لآخِذٌ بِقائمةٍ مِن قَوائمِ العَرشِ﴾**

واتە بینیم موسا(علیه السلام) دەستی گرتووە بە یەكیك لە پایەكانی عەرشەوە، كەواتە عەرش جیسمێكەو شوێنی ئەوەی هەیە دەستی پێوە بگیرێت، وە هەمو

واتە: لە پاشان خودای گەورە ڕوی کردە ئاسمان، کە لەوکاتەدا ئاسمان گازێ

---

جەستەیەکیش حادیسە، ئیتر چون درووستە بکرێت بە خودا؟! ئیمامی بەیهەقی لە (الأسماء والصفاة)دافەرموویەتی:

ئەهلی تەفسیر یەك ڕان کە عەرش واتە: سەریر و شوێنی حەوانەوە، ئەوەش جیسمەو فریشتەکان بە فەرمانی خودا هەڵیدەگرن و ڕێزی لێ دەگرن و، طەوافیشی بەدەوردا دەگێڕن، وەك چۆن موسوڵمانان طەوافی ماڵی خودا دەکەن، لە پاشان بوخاری دەفەرموێت: ئەبولعالییە فەرموویەتی:

**استوى إلى السماء** واتە: إرتفع، بەرز بوویەوە ، موجاهید دەفەرموێت: واتە: (علا على العرش)، بڵندبوویەوە بەسەر عەرشدا،

ابن البطال فەرموویەتی: جیاوازی هەیە لە تەفسیری (استوى)، موعتەزیلەکان دەڵێن: بەمانای داگیری کردن و ئیستیلایە بە زەبرو قەهرو هێزەوە، ئەمەش ناگونجێت چونکە نیشانەی ئەوەیە کە خودا تازە دەستەڵاتی بەسەردا پەیدا کردووە کە لە ئەزەلەوە ئەو دەستەڵاتەی هەربووە، وە موجەسیمەکان دەڵێن: بەمانای ئیستیقرارو جێگیر بوونە!! ئەمەش بە تەواوی باطیلە، چونکە جەستە پێویستی بە ئیستیقرار هەیە لە جێگەیەکدا، ئەوەش صیفەتی پەیدابووەکانەو، دەبێت حلولی ببێت و تێکەڵی ببێت، کە لە حەقی خودادا محاڵە، (**تعالى الله عن ذلك علوا كبيرا**)، کەواتە تەفسیری إرتفع (بەرزبوویەوە) باش نییە، چونکە خودا بەو شێوە وەصفی خۆی نەکردووە، بەڵام مەزهەبی ئەهلی سوننە بە (علا) واتە: بەرزی مەعنەوی و قەدرو دەستەڵات و خاوەنیەتی وەصفی کردووە، ئەوە تەفسیرێکی درووستەو پەسەندە. بەڵام ئایا ئیستیواکە صیفەتی زاتی خودایە، یان صیفەتی کردارو فیعلی خودایە، ئەوەی دەڵێت صیفەتی زاتی خودایە، ئەوا مانای (عەلا) بۆی موناسبترە، ئەوەش دەڵێت: صیفەتی فیعلە ئەوە بەواتای بەرزیی لێکی داوەتەوە.

بــوو وەك و دوکەڵ[1]،ئەمەش تەنهــا بەڕێــگەی دەســتەڵات و گەمــارۆدان و دەستبەسەردا گرتنە، [2]. وەك شاعیر دەڵێت:

**قَدِ استَوى بِشرٌ عَلى العِــراقِ     مِن غَيرِ سَيفٍ وَدَمٍ مُهراق** واتە: [3]

**بەبێ شمشێرو خوێنڕشتنی کەس     (بیشر) عێراقی کەوتۆتە بەر دەس**

ئەهلی حەقق و ڕاستی ناچار بوون، کە تەئەیلی واتای ئەو دەققە پیرۆزە بکەن، وەك چۆن ئەهلی باطیل ناچاربوون کە واتای دەقێکی قورئانی لە سەر مانا زاهیریەکی لابدەن و تەئویلی بۆ بکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿**وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ**﴾، الحديد/٤. چونکە بە کۆدەنگی خۆیان بڕیاریانداوە کە مەبەست لە بوونی خودا لەگەڵ هەمووتاندا بوونی نزیکی نییە، بەڵکو بەزانست و بە چواردەور لێ گرتنتان لەگەڵتاندایە[4]،هەروەها ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ

(١) خولاصەی تەفسیری نامی٤٧٧.

(٢) ئیمامی غەزالی لە (الإقتصاد، ل/١٢٦)دا فەرموویەتی: بۆیە زانایەکی وەك سوفیانی سەوری دەفەرموێت : ئەوەی لە واتای **استوى على العرش** تێدەگەم، هەر ئەو واتایە کە لە ئایەتی: ﴿**ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ**﴾ تێی گەیشتووم.

(٣) خاوەنەکەی بەعیثی موجاشیعی یە بنوارە: الأزمنة والأمكنة ٤٩/١، ويتيمة الدهر ٥ /٢٧٦، و مرآة الجنان ١٤٨/١. وە بەندەش کردوومە بەکوردی (ئەحسەن)

(٤) ئەبو نەصری قوشەیری لە (التذكرة الشرقية) دا فەرموویەتی: ئەگەر وتیان : ئایا خودا نەیفەرمووە ﴿**الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى**﴾ کەواتە ئەبێ زاهیری واتای ئەم فەرموودە وەربگریت، نەك تەئویلی بۆ بکەیت. ئیمەش دەڵێین: خودا دەفەرموێت: ﴿**وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ**﴾ ، یان دەفەرموێت: ﴿ **أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ**﴾، کەواتە پێویستە بە پێی ڕواڵەتی واتاکەی کە خودا لەسەر عەرش بێت و، لای ئێمەش بێت و، لەگەڵماندابێت و، گەمارۆی هەموو جیهانیش بدات، بە زاتی خۆی

(( قَلْبُ المُؤمِنِ بينَ أصبعَيْنِ مِن أصابعِ الرَّحمن))(١).ئەمەیش بەو واتایە لێکیان داوەتەوە کە دڵی باوەڕدار لە میانی دوودەستەی (قودرەت و دەستەڵاتی) خودادایە، هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

(الحَجَرُ الأَسوَدُ يَمِينُ اللهِ فِي الأَرضِ)) (٢)

(واتە: بەردەڕەشەکە دەستی ڕاستی خودایە لە سەرزەویدایە، مەبەستی ئەوەیە کە بەردەڕەشەکە لەسەرزەویدا دانراوە بۆ ماچکردنی و ڕێز لێ گرتنی، لەلایەن خوداوە کە ڕێزی لێگیراوە بۆ ئەوەی لای خەڵکیش شەرەفیاب بێت، وەك چۆن ڕێزی زیاتر لەدەستی ڕاست گیراوە، بۆیە دەستی ڕاست خوازراوە بۆ ئەم مەبەستی ڕێزلێنانە). چونکە ئەگەر ئەو فەرموودە لەسەر زاهیری لەفزەکە بهێڵیتەوە، ئەوە شتێکی محاڵ ڕودەدات، چونکە خودا دەستی چەپ و ڕاستی ئاشکرای نییە. هەروەها وشەی (ئیستیوا) ئەگەر لێی گەڕێن لەسەر واتای (جێگیربوون و ئیستیقرار و زاڵبوون) لێك بدرێتەوە، ئەوکاتەش محاڵ ڕوو دەدات، چونکە ئەوەی جێگیر دەبێت و لەسەر عەرش دادەنیشێت، دەبێت

---

سەیری هەمووی بکات لە یەك حاڵەتدا،دەی چۆن دەگونجێت یەکێکی تەنها لەسەر یەك

حاڵەت لە هەموو جێگەیەکدا بێت. وتیان: (وَهُوَ مَعَكُمْ)،

واتە بە عیلم لەگەڵتاندایە، وە ﴿بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطٌ﴾ واتە:

زانستی خودا چواردەوری لێ گرتوون، ئێمەش دەڵێین:

﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾واتە بەقەهرو پاراستن و مانەوە .إتحاف١٠٨/٢.

(١) موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە صەحیحەکەی (٢٦٥٤).

(٢) حاکم لە (المستدرك) ٤٥٧/١، وە طەبەرانی لە (الأوسط) ٥٦٧، لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) بە مەرفوعی.

جەستەی هەبێت و بشلکێت بە عەرشەوە، جا یان لە عەرش گەورەترە، یان بچووکتر، ئەمەش محاڵە. هەرچیش بتگەێنێت بە محاڵ بۆ خۆیشی هەر محاڵە.

## بنەمای نۆیەم:

زانین بەوەی کە خودا ﷻ لەگەڵ ئەوەدا پاك و مونەززەهە لە وێنەو صورەت و ئەندازە و، نەدەشوبهێت بەکەس و نەهیچیش دەشوبهێت پێی، وە پارێزراوە لە وەی کە جیهەت و لایەن و کەنارەکانی زەوی و ئاسمان بدرێتە پاڵی، لەگەڵ ئەمانەدا خودا بە چاوی سەرو چاوی دڵیش لە دوارۆژدا و لە وڵاتی حەوانەی یەکجارەکی دا دەبینرێت، چونکە قورئان فەرموویەتی:

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ (القيامة/٢٣)،

واتە: لەو ڕۆژی قیامەتدا چەندین ڕوو جوان و گەشن،چونکە بۆ خودای خۆیان دەڕوانن (خۆلاصە/٤٧٨)

لەدونیادا نابینرێت بۆ ئەوەیە کە فەرمودەی درووستی خودا جێگیری و چەسپاویەکەی ئاشکراتر ببێت کە دەفەرموێت:

﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ﴾ (الأنعام/١٠٣).

واتە: چاوی مەخلوقات هێزی ئەوەی نییە خودا ببینن و کونهی خودایان پێ بزانرێت، خودا کونهی چاوەکان و خاوەن چاوەکانیش دەزانێت و بەوردی دەیانبین(خۆلاصە/١٤١)،وە خودای گەورە بە(حەزرەتی) موسای فەرموو:

﴿لَنْ تَرانِي﴾ ،

(واتە: تۆ ناتوانیت بمبینیت، بۆچی ئەم ئایەتەی بە بەڵگە هێناوەتەوە؟ چونکە ئەگەر ئەو پێغەمبەری خودایە بیزانیبایە کە بینینی خودا درووست نییە، چۆن داوای بینینی دەکرد، دیارە بە کۆی ڕای هەموو زانایان حەزرەتی موسا دەزانێت چی واجبە لە حەقی خودا بیزانێت و داوای بکات و چیش حەرامە، ئەگەر وانەبێت کەواتە بە نەزان دادەنرێت، کە ئەمەش محاڵە کە

پێغەمبەران ئەركی خۆیان بەرامبەر خودا نەزانن، وە ئەگەر بشزانێت كە بۆی نییە داوای بینین بكات، كەواتە داواكردنەكەی بێ هوودەیەو محاڵە پێغەمبەران قسەی بێسوود و بەتاڵ لە حزوری خودادا بكەن،)

خۆزگە دەزانرێت: چۆن كابرای موعتەزیلی لە صیفەتەكانی پەروەردگاری هەموان ئەوندە شارەزایە؛ كە بینینی خودا درووست نییە، كەچی(حەزرەتی) موسا (علیه السلام) نەیزانیوە؟!

یان چۆن حەزرەتی موسا داوای بینینی خودا دەكات، كە(وەك ئەوان دەڵێن) محاڵە ببینێت؟!

لەوە دەچێت كە جەهل و نەزانین بدرێتە پاڵ ئەهلی بیدعەو ئارەزوو پەرستە نەفامەكان،، باشترە لەوەی جەهل و نەزانین(پەنا بەخودا) ڕەواببینین بەپێغەمبەران(صەلات و سەلامی خودایان لەسەر)(١)، وە بەڵگەی عەقڵیش لە سەر درووستی بینینی خودا ، ئەوە ئایەتی بینین:

---

(١) پوختەی ئەم بەڵگە هێنانەوەیە لەبارەی بەسەرهاتی داواكردنی حەزرەتی موسا بۆ بینینی خودا، ئەمەیە: كە بڕوای وابووە درووستە خودا ببینرێت، بۆیە داوای بینین دەكات، بەڵگەی دووهەم ئەوەیە: خودا نەیفەرمووە كە محاڵە، بەڵكو بینینەكەی بەستۆتەوە بە خۆڕاگرتنی چیاو كەژەكەوە ﴿وَلَكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي﴾ كەواتە خۆڕاگری چیاكە محاڵ نییە، بەڵكو مومكین بوو ببوایە، بەپێی بنەمای زانستی: تەعلیق بە جایز محاڵ نییەو درووستە. هەروەها خودا فەرمووی : ﴿فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا﴾ (الأعراف/١٤٣)، كەواتە خودا چیاكەی ڕماندوو تواوەوە بەرگەی نووری تەجەللیاتی خودای نەگرت، نەیفەرموو خۆی وای لێهات، خۆ هیچ محاڵێك ڕوی نەدەدا ئەگەر خودا ئیرادەكەی بەولادا بوایە، كە كەژەكە خۆی ڕابگرتایەو، بینینەكەش جێبەجێ

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّ نَاظِرَةٌ﴾ (القيامة/٢٣)

كە بەزاهیری واتاكەی لێكی بدەیتەوە نیشانەیە كە بەپێی ئەقڵ درووستە ببینرێت، چونكە هیچ محاڵێك ڕوونادات.

بینین جۆرێكە لە كەشف و خۆدەرخستن و زانستی، بەڵام ئەوەندە هەیە لە ئەصڵی زانین بە بوونی خودا بینینەكە تەواترو ڕۆشن و ڕوناكترە[1].

---

ببوایە، وەك ئیمامی نەسەفی فەرمەویەتی، وەلەم ئایەتەدا بەڵگەی تری تیادەبینرێتەوە: چونكە خودا عیتاب و سەرزەنشتی نەكرد كە بۆچی داوای بینینی كردووە، تەنها ئەوەندە دەفەرموێت تۆ نامبینیت چونكە ناتوانیت بم بینیت!!

خۆ ئەگەر پرسیارەكەی لە نەزانینەوە بوایە، عیتابی لێ دەگرت، وەك چۆن سەرزەنشتی حەزرەتی نووحی كرد، كەداوای ڕزگاركردنی كوڕەكەی كردو فەرمووی:

﴿إِنِّي أَعِظُكَ أَنْ تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾ (هود/٤٦)

خۆئەگەر حەزرەتی موسا داوای بینینی یەكێك لە ئایەت و بەڵگەكانی خودای بكردایە، وەك هەندێك دەڵێن:

لەجیاتی: ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ﴾، (إلَيها) ی بەكاردەهێنا، وە خودا نەیدەفەرموو: لَنْ تَرانِي! بەڵكو دەیفەرموو: لَن تراها، تا ڕاناوەكە بۆ ئایەتەكان بچێتەوە! ئەگەر مەبەستی بە(ئایەتە) كە من نابینرێم دەیفەرموو:

(لَسْتُ بِمَرئِي) واتە من نابینرێم نەك تۆ من نابینیت، چونكە ئەو نەیبینی و هەر لەدونیایشدا پێغەمبەری خۆمان ﷺ بینی:الإتحاف ١١٤/٢-١١٥

(١)لە كتێبی (المسامرة /١٠٣)دا ئیبن و ئەبی شەریف دەڵێت: ئەگەر بۆ نموونە سەیری هەتاو مانكرد، بینیمان و، لە پاشان چاومان نوقاند، ئەوكاتە ئێمە بە زانست و زانینێكی ڕون و ئاشكرا بوونی خۆرو زانیاری تەواو لە بارەی بوونیەوە دەزانین، بەڵام لە كاتی ئەصڵی بینینەكەدا زیاتر بینینەكە چەسپاوترە لەدڵماندا، هەروەها

کەواتە لەکاتێکدا درووست بێت بەزانست بتوانیت خودا ببینیت (عیلم تەعەللوق بە بینینی خوداوە ببەستێت) و پێیەوەببەسترێتەوە، کە لەهیچ جیهەت و لایەکیشدا نەبێت، ئەوکاتە درووستیشە بینین بۆ خودا ببێت و پێیەوە ببەسرێت و هیچ لاو جیهەتێکیشی بۆ بڕیار نەدرێت، هەروەها چۆن درووستە خودا دروووستکراوەکانی خۆی ببینێت و لە بەرامبەریشیاندا نییە دروستیشە کە خەڵکەکە خودا ببینن و لە بەرامبەریشی نەبن! وە چۆن دروووستە خودا بناسرێت بەبێ چۆنیەتی و وێنەو شێوە، هەروایش دروووستە خودا ببینرێت بە بێ ئەوەی وێنەیەکی بۆ کێشرابێت یان چۆنیەتی و شێوەی بەیان بکرێت[1]

---

ئەگەر شتێکمان زانی بەجۆرێکی ڕون و ئاشکراو بە دڵنیایی، لە پاشان ئەو شتەی کە زانیومانە بینیشمان، کەواتە بە بێ ئەوەی پێویستمان بە بەڵگە هەبێت، دەزانین ئەم دوو جۆرە بینینە جیاوازیان هەیەو، بینینی دووهەم جێگیرو بەهێزترە، ئەم هەست پێکردنە زیادەیە ناومان بردووە بە (ڕوئیەت) بنوارە :إحياء دار المنهاج بەرگی یەك/٣٩٤.

(١) کە دەڵێین مەرجی بینینی خودا ئەوەیە کە لەبەرامبەری یەکدی نەبن و ئەو گومانەش نەبرێت، بۆ ئەوەیە ڕەددی قسەی موعتەزیلەکان بدرێتەوە کە بۆیە دەڵێن نابێت خودا ببینرێت چونکە بینین دەبێت کە بینەرو بینراو لە بەرامبەری یەکدی بن. هەروەها دەبێت بینینەکە هیچ نێوانێکیان بۆ بڕیارنەدرێت، چونکە بینینی زاهیری بە بێ مسافەو نێوان ئەنجام نادرێت، ئەگەر دوور بێت توانای نابێت، وە ئەگەر نزیکیش بێت و لەناو پێڵوی چاویدا بێت دیسان لە بەر نزیکی نایبینێت. وە بینینی خودایش بەو شێوەیە کە ئیحاطە نەدات بەسەریدا، کە مادەم خودا ئەقڵی داوە بە مرۆڤ دەتوانێت بە زانست و ئەقڵ خودای پێ بدۆزێتەوە ، ئەگەر هێزیش بکاتە ناو چاویەوە بەشێوەیەك کە چۆنیەتی و لاو جیهەت و مسافەی تێدا نەبێت و خودایش ببینێت چ ڕێگریەك هەیە؟ ئەی

# بنەمای دەیەم:

زانین بەوەی کە خودا ﷻ تەنهایەو لە کارو فەرمندانیدا بێ شەریکەو هاوبەشی نییە ، تاکەو هاووێنەو ڕکابەری نییە، بەبێ یارمەتی هیچ کەس و شتێك خەڵکی درووست کردووەو، هەموو داهێنراوێکی هێناوەتە بوون، وە تەنها خۆیەتی کە خاوەنی هەموو داهێنراوو دروست کردنێکە، نە وێنەو هاوکاری هەیە یارمەتی دەری بێت، یان یەکسانی بکات، نەدژو ڕکابەریشی هەیە دژایەتی و کێشەی بۆ درووست بکات و لە ڕێگەیدا بووەستێت.

بەڵگەی ئەم ڕاستییەش فەرموودەی خودایە:

﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾. (الأنبياء/٢٢)

واتە: ئەگەر خودای ڕاستەقینە لە زاتی خودا بەولاوە لەئاسمانەکان و لەسەر ئەرزدا ببوایە، ئەوا ئاسمان و ئەرز تێك دەچوون!

ڕونکردنەوەی ئەمەش ئەوەیە:

**ئەگەر دوو خودابن و یەکێکیان** بیەوێت کارێك بکات.

**دووهەمەکەیان:**

یان ناچارە بۆ یارمەتیدانی، کەواتە فەرمانبەردارە و بێ دەستەڵاتە لەبەرامبەریدا، وە ئەگەر بەتوانابێت لە بەرهەڵستی و موخالەفە کردنی، کەواتە: دووهەمەکەیان بەهێزەو یەکەمیان لاوازە تەوانای نییە، ئیتر دەبێتە خودایەکی بێ تەوانا، بۆیە محاڵە بیر لە بوونی دووخودایی بکرێتەوە.

---

ئەگەر ئێستا باوەڕ ناکەن ؟ئەی لە قیامەتدا چۆن بڕوا دەکەن ؟! کەواتە هەمووی پەیوەنداری دەستەڵاتی خودایە. بنوارە:الإتحاف٢/١١٥.

# پایەی دووهەم

# لەپایەکانی ئیمان و بڕوا

## زانین و شارەزایی لە صیفاتەکانی خودا

## کە لەسەر دە بنەما دامەزراوە

## بنەمای یەکەم:

**زانینی ئەوەی کە دروستکەری ئەم جیهانە بەتوانایە.**

وە خودای گەورە ڕاستی فەرمووەکە دەڵێت:﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍقَدِيرٌ﴾ (المائدة /١٢٠)،کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت و، بە شێوەیەکی زۆر بتەو دونیای درووست کردووە، ڕیزبەندی و ڕێك و پێکی لەناو دروستکراوەکانی هەیە.

وەك ئەوەی کەسێك بەرگێك ببینێت لە ئاوریشم چنرابێت و، جوان نەخشێنرابێت و یەکخرابێت و، بە نایابی پارچەکانی لێکدرابێت، چنین و ئێخەو جوانی کەنارو ئەملاولاکانی زۆر لەگەڵ یەك گونجاو بێت، لە پاشان وا گومان ببات کە ئەم هەموو جوانکاریە، لە کەسێکی بێ گیانی مردوو، یان مرۆڤێکی بێ تواناوە بووبێت، ئەو خۆی دارنیوە لە هەموو کاڵاو غەریزەیەکی ئەقڵ و تێگەیشتن، وە چووەتە ناو ڕیزی نەفام و نەزاندووە گەمژەکان

## بنەمای دووهەم:

زانین بەوەی کە خودای باڵادەست، زانایە بە هەموو ئەو شتانەی بوونیان هەیە، وە چواردەوری داوەو ئاگادارە بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا:

﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾،(سبأ /٣)

هیچ شتێکی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا لێ ون نابێت ، ئەگەر لە گەردیلەش

بچوکتر بێت. خودا ڕاست دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة/٢٩) کە زانایە بەسەر وردەکاری هەموو شتێکدا، وە ئەوەی ڕینوماییت دەکات بۆ دەرخستی ڕاستی، ئەو فەرموودانە ئەوەیە کە دەفەرموێت:

﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك/١٤) ئایا ئەوەی بۆخۆی ئەو خەڵکەی درووست کردبێت، بە خەیاڵاتی دڵیان نازانێت، کە زانستییەکەیشی دەگاتە هەموو دەروو ناوو نهێنی و ئاشکرای ئەو خەڵکە.

کەواتە خودا ڕێنەماییت دەکات بە بەڵگەهێنانەوە بە درووستکردنی خەڵك لەسەر بوونی زانستی، چونکە تۆ هیچ گومانێکت نییە لەوەی دروستکردنی ئەوخەڵکە، بەو نەرمی و ناسکی وردەکارییە، وە بە جوانی صنعەتکاری و ڕیزبەندی و، ڕێکخستنیان بە جوانتریت شێوە، با لەشتە وردە کەم بایەخ و بێ بەهاکانیش بێت، ئەوانە هەمووی بەڵگەن لەسەر زانایی صانیع و دروستکەرەکەی، وە شارەزایی ئەو زاتە بە ڕیزبەندی و ڕێکخستنی هەموو بەش و وردەکارییەکان، ئەوەی خودا بۆ خۆی باسی لێوە کردووە، ئەوپەڕی ناسین و پێناساندن و ڕێنومایی و هیدایەتە بۆ هەموان.

## بنەمای سێیەم:

زانینت بەوەی کە خودا ﷻ زیندووە:

ئەوەی سەلما کە خودا خاوەنی تواناو زانستێکی بێ وێنەیە، دەیسەلمێت کە خاوەنی ژیانە، ئەگەر بتوانیت کەسێکی خاوەن زانست و تەوانایی و بکەرو خاوەن ئیرادە و تەگبیر بچێتە ئەقڵتەوەو ژیانیشی نەبێت، ئەو کاتە درووستیشە کە گومانت هەبێت لە ژیانی ئەو گیاندارانەی کە دێن و دەچن بەبەرچاوتەوە لە جوڵەو وەستانەکانیاندا، بەڵکە گومانیش پەیدادەکەیت لە خاوەن پیشەو سنعەتکارەکانیش، ئەمەش بەڕاستی ئەوپەڕی ڕۆچونە لە نەزانین و گومڕایی و سەرلێ شێواندا.

# بنەمای چوارەم:

بزانیت کە خودا خاوەن ئیرادەیە لە کردارەکانی:

هیچ شتێك نییە بوونی هەبێت ئەگەر پشت بەستوو بە ئارەزوی ئەو نەبێت و، لە ئیرادەی ئەوەوە دەرنەچووبێت، کەواتە هەر خۆیەتی کە سەرەتایە بۆ هەموو کارو بڕیارێك، وە خاوەنی فەرمانی گێڕانەوەی هەمووشتێکە، وە ئەوەی بیەوێت زۆر بەتواناوە ئەنجامی دەدات، چۆن دەگونجێت بڵێن خاوەن ئیرادەنییە، کە هەموو کردارێك کە ئیرادەی لەسەری بووە، دەگونجا کە دژەکەیشی ئەنجام بدات، وە ئەوکردارەش کە دژی نییە دەگونجێت کەوەك خۆی پێشتر یان دواتر ئەنجامی بدایە، خۆ قودرەت و تواناکەیشی گونجاو و شیاوە لەگەڵ هەردوو حاڵەتی دژ بەیەك و هەردوو کاتە جیاجیاکاندا، بەیەك جۆر موناسەبە، کەواتە پێویستی بە ئیرادەو بڕیارێکی تەواوە، ئیرادەکە دابڕێت بەسەر یەکێك لەو دوو کارەدا، کە یەکێکیان بە پێی ویست و ئیرادەی خۆی ئەنجامی بدات.

کەواتە هیچ صیفەتێك زیاد نییە لەوی تر، وە جێگەی صیفەتێکی تر ناگرێتەوە، ئەگەر بگونجایە صیفەتی زانین جێگەی صیفەتی ئیرادەی بگرتایەتەوە، کە تایبەتمەندیکردنی زانراوەکەیە تاکو بڵێن: بۆیە ئەو کارە پەیدابووە، چونکە عیلمی خودا پێش پەیدابوونی ئاگادارو زانابووە بەسەر بوونەکەیدا، ئەگەر ئەمە بگونجێت، کەواتە:

زانست جێگەی قودرەت و توانایش دەگرێتەوە، تاکو بڵێن:

ئەو کارە بەدیهاتووە بەبێ بوونی تەوانایی، چونکە زانینی خودای پێشی کەوتووە کە ئەو کارە هەر دەبێت، بۆیە پێویستی بە بوونی تەواناو قودرەت نەماوە!!

# بنەمای پێنجەم:

زانینت بەوەی کەخودای گەورە بیسەر و بینایە، بینینی خودا هەموو شتێك دەگرێتەوە، تەنانەت خەتەرەو خەیاڵاتی دڵ و دەروون و ئەوەیش کە دێت بە مێشك و بیری مرۆڤدا، هیچی لە خودا ون نابێت. هەروەها هیچ دەنگێکی سووك و نەبیستراو وەك دەنگی جوڵەی پێی مێرووی ڕەش لەشەوێکی تاریکدا، لەسەر گابەردێکی کەڕ ، لێی ون نابێت و دەیبستێت.[1]

---

(١) بینینی خودا بەبێ ئەندام و گلێنەی چاوە، بیستنەکەیشی بەبێ بوونی گوێ یە، وەك چۆن زانایە بەبێ دڵ و دەماخ ، واتە: بیستنەکەی وەك بیستنی مەخلوق نییە، کە هێزێکە دەخرێتە ناو قووڵایی کاسەی سەریەوە، بەهۆی جوڵەی هەوای دەرەوە دەنگەکان دەگەیێنێت بە ئامێرە هەستیارەکان، گوێیش دەچێتە ژێر ئەو کاریگەریەوە، هەروەها وەك بینینی خەڵکی نییە، کە هێزێکی تایبەتە خراوەتە ناو ڕەگە وشکەکانی چاویەوە، کە لە دەماخەوە هاتوونەتە دەرەوە، بەڵکو مەبەستمان لە بیستنی خودا : صیفەتێکی وجوودییە، وەستاوە بە زاتی خوداوە، دەتوانێت هەموو شتێکی پێ ببیستێت، با وردو شاراوەش بێت، مەبەست لە بینینیش: صیفەتێکە بوونی بەزاتی خوداوەیەو، پێیەوە ڕاوەستاوەو، هەموو شتێکی وردو شاراوەیشی پێ دەبینرێت، بنوارە: الإتحاف١٤٢/٢.

**هەروەها ئەبولقاسمی قوشەیری لە کتێبی (الإعتقاد)دا فەرموویەتی:**

بەڵگەمان ئەوەیە: کە بیستن و بینین دوو صیفەتی پەسەندکراون و، بە بوونیان خاوەنەکەی ستایش دەکرێت و، بە نەبوونیشیان کەم و کوڕی ڕوی تێ دەکات، وە ئەو کەمی و نەقصە لاناچێت مەگەر بە بوونیان، وە خودایش شایستەی هەموو صیفەتێکی تەواوە، دەبێت ببینێت و ببیستێت، وەئەگەر ئەو صیفەتانەی نەبێت دەبێ هەڵگری دژەکەیان بێت، کە ئەمەش محاڵە لە حەق زاتی خودادا کە صیفاتی نەقصی هەبێت، وەك ئیمامی حەرەمەین فەرموویەتی. بۆ زیاتر بنوارە: إتحاف ١٤٣/٢.

چۆن دەبێت خودا بیسەر و بینا نەبێت، کە بیستن و بینین دووصیفەتی کەماڵن و بە بێ ئەوانە کەمی پەیدادەبێت، دەی چۆن دەبێت خەڵکە درووستکراوەکە ببیستن و ببینن و لە خالیقەکەیان کامڵ تربن؟! چۆن دەبێت دروستکراو تەواو و بەرزتربێت لە درووستکارەکەی؟! وەهەرگیز ناچێتە ئەقڵی هیچکەسێکەوە کە ئەم دابەشکردنە بە عەدل و دادگەری دابنرێت، کە کەم و کەسری بکەوێتە لای خوداوەو، تەواوی و کەماڵیش لای خەڵك و دروستکراوەکەیبێت ؟!

یان چۆن دەشێت بەڵگەکەی حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام) ڕاست بگەڕێت لەسەر ئازەری باوکی(واتە مامەکەی کە پێی دەوترێت باوك)چونکە ئازەر بەنەزانین و لادان لەڕێی حەق بت و پەیکەری دەپەرست، بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم پێی فەرموو: ﴿**يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا**﴾ (مريم/٤٢)، ئەی بابە بۆچی بەندایەتی بۆ شتێك دەکەیت، کە نابیستێت و نایشبینێت، وە ناشتوانێت هیچ سوودێکت پێ بگەیێنێت.

(کەواتە: ئەم صیفەتانە نابێت پەرستراوی ڕاستەقینە لێی بێ بەش بێت)، وە ئەگەر ئەم صیفەتانە هەڵگەڕێتەوە بەسەریدا، لەبارەی پەرستراوەکەیەوە، ئەوکاتە بەڵگەو حوججەتەکانی بێ هێزدەبێت و، هیچ بەهایەکیان نامێنێت، وە ئەم ئایەتەش بەڕاست ناگەڕێت کە فەرموویەتی:

﴿**وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ**﴾ (الأنعام/٨٣).

ئەوە ئەو بەڵگە بەهێزانە بوو کە فێری ئیبراهیممان کرد، کە بتوانێت موجادەلەی ئازەرو قەومەکەی بکات و بیانبەزێنێت. هەروەك چۆن سەلماندمان و دەشچێتە ئەقڵەوە کە کارەگان بکات و ئەندامەکانی جەستەیشی نەبێت، وە زانابێت و دڵ و دەماخیشی نەبێت، با ئەقڵیش قەبوڵی بکات کە بینا بێت و گلێنەو پێڵوی چاویشی نەبێت، وە بیسەربێت و گوێچکەیشی نەبێت، چونکە هیچ جیاوازییەك نییە لە میانیاندا.

# بنەمای شەشەم:

دەبێ بزانێت؛ کە خودا موتەکەللیمەو قسەدەکات، وە قسەکانیشی کەلامی نەفسیيەو ڕاوەستاوە بە زاتی خوداوە[1].

ئەم صیفەتەیش ئەوەیە:

کە ڕارەستابێت بە زاتی خوداوە، وە پێك نەهاتووە نە لە پیت و نە لە دەنگ، وە قسەکانی وەك قسەو کەلامی هیچ کەسێکی تر نییە، وەك چۆن بوونی خودا ناشوبهێت بە بوونی هیچ کەسێکی ترەوە، وە ئەو قسانە لەڕاستیدا کەلامێکی نەفسانییە، وە ئەو قسانەی بە پیت و دەنگ پچڕپچڕکراون، ئەوە دەنگەکانیان لێ پێك هاتووە، کە دەلالەت لەسەر واتاکان بکەن، وەك چۆن هەندێك جار بە جووڵەو هێما واتاکان دەگەیێنێت، (کەواتە کەلامی حەقیقی کەلامی نەفسیيەو ، ئەوەی دەیبیستیت ئەوە بۆ دەلالەتکردنە لەسەر کەلامە نەفسیيەکە) ئیتر نازانم چۆن هەندێك تاقمی نەفام و نەزان لێیان تێکچووە،

---

(١) کەلامی نەفسی: وەستاوە بە زاتی خوداوە، ئەوەتانێ خودا کەلامەکە دەداتە پاڵ خۆی و دەفەرموێت: ﴿قلنا اهبطو﴾ا، واتە: وتمان بەرەو خوارببنەوە، وە هەرکەس وا گومان ببات کە شتێکی خودا لە دەنگ و قسەو صیفەتەکانی تری دەشوبهێت بە صیفەتی یەکێکی تر، ئەوە پێی کافر دەبێت، وە کەلام دوو بەشی هەیە:

**یەکەمیان** ئەوەیە کە لە دەنگ و پیت پێك هاتووە، ئەوە کەلامی زوبانییە.

**دوهەم**: ئەوەیە کە مەعنایەکی تایبەتییە و وەستاوە بە نەفسەوە، ئەوە ناودەبرێت بە کەلامی نەفسانی، وە بەم ڕەهاییە باسی کەلام بە شێوەی هاوبەشی لەفزی هاتووە، وەك دەڵێیت: وتم،یان قورئان دەفەرموێت: **یسمعون کلام الله!** واتە کەلامی خودا دەبیستن،وە بەشێوەی مەجازو حەقیقەتیش بەکاردەهێنرێت وەك باسیان دێت.

بەڵام لە شاعیرە نەزانەكان تێك نەچووەو ئەوان ڕاستیان پێكاوە، كە باسی كەلامی حەقیقی بەكەلامی دڵ و نەفسی لێكیان داوەتەوە، تەنـانـەت یـەكیـك لـەبوێـژەكانیان

دەڵێت: **إنَّ الكَلامَ لَفي الفُؤادِ وَإنَّما جُعِلَ اللِّسانُ على الفُؤادِ دَليلاً**

واتە: **كەلامی ڕاستی لە دڵۆ دەردێت زوبان دەلیلەو پیا تێ دەپەڕێت،**[1]

وە هەركەسێك ئەقڵەكەی زڕی نەكات و، فام و تێگەیشتنیشی لە هەڵە نەیگێڕێتەوە، كە بە زوبانی خۆی دەڵێت:

زوبانی من كە قسەی پێدەكەم حادیسە و پەیدابووە، بەڵام ئەوەی ڕودەدات تیایدا، واتە: ئەو عەرەزەی پێیەوە ڕاوەستاوە و بەهۆی توانا پەیدابووەكەوە ڕویداوە، ئەوە قەدیمە!

كەسێك قسەی وا بكات ئومێدت ببچڕە لە ئەقڵ و تێگەیشتنی، وە ڕێگە مەدە ئیتر زوبانت قسەی لەگەڵدا بكات، چونكە هەركەسێك ئەوەندە نەزانێت كە قەدیم بریتییە لە شتێك كە لە پێشیەوە شتێك نەبێت، لەكاتێكدا دەڵێت: بسم الله، پیتی بێ كە، لە پێش پیتی سینەكەوەیە، كەواتە هەرگیز ناگونجێت سینێك كە لەدواوە هاتبێت، بڵێیت ئەو پیتە قەدیمە.

كەواتە دڵی خۆت بە پوختی و پاكی ڕابگرە، لەوەی كە لابكەیتەوە بەلای كەسێكی ئاوادا، دیارە خودای گەورە كە هەندێك لە بەندەكانی لە ڕاستی دووردەخاتەوە، نهێنییەكی زۆری تێدایە، چونكە كەسێك جیاوازی نەخاتە میانی قەدیم و حادیسەوە، نابێت گوێی لێ بگیرێت. چونكە ئەوەی خودا گومڕای بكات، بەهۆی نەفامی و عینادی خۆیەوە، ئەوە كەسێكی تر ناتوانێت ڕێنمایی

---

(١) دەڵێن شیعری نەخطەلە و لە دیوانەكەیدا نییە. وەدەڵێن شیعری نیبن و صەمصامی ڕەققاشییە. بنوارە: (ذيل مرآة الزمان)٣/١٨٩. و إتحاف٢/١٤٦ وەرگێڕی شیعرەكەیش (نەحسەن).

بکات، بۆیە دەبێت دووری لێ بگیرێت.

(هەندێك لە خاوەن ڕا جیاوازەکان دەیانووت، چۆن دەگونجێت کەلامێك هەبێت و نە پیت بێت و نە دەنگ بێت، لەوەڵامی ئەوانەدا دەفەرموێت):
ئەوەی کە باوەڕەکات و دووری دەخاتەوە کە حەزرەتی موسا (سەلامی خودای لەسەر)لە دونیادا کەلامێکی بیستووە، نە دەنگ بووەو نە لە پیت پێکهاتووە،
با باوەڕیش بەوە نەکات کە لە دوارۆژدا کەسێك بوونی هەبێت و ببینێت کە تەن و جەستەی نەبێت و ڕەنگیشی نەبێت.[1]

---

(١) ئەگەر بە دووری بـزانن کە جوبرەئیـل کەلامـی خـودای وەرگرتـووەو گەیاندویشیەتی، وە باوەڕداران لە قیامەتدا کەلامی خودا دەبیستن؟! ئەوە لە وەڵامیاندا دەوترێت: ئەوانە کەلامێکیان بیستووە نەحەرفەو نە صەوت، لە یەکێکەوە کەلێوو زوبانی نییە، هەرچەندە ئەم وەڵامەی غەزالی یەکێك لە حەنبەلیەکان بەناوی(الطوخی) بەرپەرچی داوەتەوەو دەڵێت: ئەوە جۆرێکە لە تەکەللوف و زۆر لە خۆکردن، لادانیشە لە زاهیری مەعنا، بەڵام ئەوەی ئەم زانا وتوویەتی ڕەدی دراوەتەوە، کە هەرکەسێك بیەوێت بابەتێکی مەعنەوی بسەلمێنێت، دەبێت شایەتێکی مەلموسی بۆ بهێنێتەوە تا بچێتە ئەقڵەوە، ئەگەر ئەوان بەلایانەوە درووستە کە مانایەك هەبێت بە زاتی خوداوە ڕاوەستابێت و، جیسمیش نەبێت! بابەدرووستیشی بزانن کە دەنگێك لە زاتێکی قەدیمەوە دەربچێت و، خاوەنەکەیشی جیسم نەبێت، چونکە هەردوو فرمان و بابەتەکە وەك یەك وان، پێچەوانەی ئەوحاڵەتەن کە دەیبینین، کەواتە هەرکەسێك کەلامێکی لەفزی گەیاند لە غەیری خاوەن جەستەیەکەوە، بابە درووستیشی بزانێت کە زاتێك ببینرێت و جیسمیش نەبێت؟! ئەوەش کە غەزالی فەرموویەتی کە کەلامی نەفسی دەبیسرێت ئەوە لەسەر ڕای ئەشعەریەکانە، قیاسی کردۆتە سەر بینینی خودا کە نە ڕەنگی هەیەو نە دەنگ و جەستە، کە ئەوانەی دژی

وەئەگەر بچێتە ئەقڵیەوە کە شتێکی وا ببینێت: نەڕەنگەو مەلموس بێت، وەنە جەستەیەو لە کەنارێکدا بێت، وەنە ئەندازەیەکەو دیاری کراو بێت، وەنە ژمارەو پێوانەیەکی هەبێت، وە هێشتا نەیشیبینیبێت و باوەڕیشی پێی هەبێت، ئەی بۆچی ناچێتە ئەقڵییەوە هەمان شت بە حاسسەی بیستن بتوانێت وەری بگرێت، وەك چۆن بەحاسسەی چاو چووەتە ئەقڵییەوەو باوەڕی پێ کردووە[1]

---

ئەهلی سوننەتن ئەوانەی پێ بەزاندووە، کە هەموو کۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی کە لە دونیادا جایزە خودا ببینرێت و لە دواڕۆژیشدا هەمووی خودادەبینێت. بنوارە الإتحاف٢/١٤٧.

(١) ئەوەی ئەم ڕاستییانەی لا بەرجەستە دەبێت، زیاتر لە ڕێگەی کەرامات و خەواریقەوەیە (خرق العادة)، وەك ئیمامی باقلانی بێداری داوە. وەلە پەڕاوی: ( لباب الحكمة الإلهية)دا غەزالی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: کەلامی خودا بریتییە لە ڕژاندنی سیڕو زانستە شاراوەکانی، بۆ دڵی ئەوانەی کە دەیانەوێت ڕێزیان لێ بگرێت، وەك خودا فەرموی: ﴿**وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ**﴾، ئیتر خودا شەرەفداری کرد بەکەلام و عیززەت و نزیککردنەوەی لە خۆی، لەسەر ڕایەخی قودسی داینیشاندو، بە بەرزو باڵاترین صیفاتی خۆی دواندی و، قسەی لەگەڵدا کرد، وەك چۆن ویستی ئاوا بەعیلمی زاتی خۆی قسەی لەگەڵدا کرد و، وەك ئیرادەیشی بوو ئاوا توانای پێدا، کە کەلامی خودا بەبێ چۆنیەتی و چەندێتی ببیستێت، وە پێویس ناکات پرسیاری عیلمییەتی لێ بکەیت و، وەصفداریش ناکرێت بە ماهییەت و چەندێتی، بەڵکو کەلامەکەی وەك عیلمەکەی وایەو، عیلمەکەی وەك ئیرادەی وایە و، ئیرادەکەی وەك صیفەتی وایە و، صیفەتی وەك زاتی وایە، وە زاتەکەیشی بەرزو موقەددەس ترە لەوەی پێویستی بە تەنزیە ببێت، صیفاتەکانیشی لەوە ئاشکراترن کە باسیان

وەئەگەر بچێتە ئەقڵییەوە کە بە یەك تاکە زانست کە هەیبێت، واتە بەو زانستە عیلمی بەهەموو بوونەوەرەکان دەبێت، کەواتە با بشچێتە ئەقڵێەوە کە بەتەنها یەكٛ صیفەتی پەیوەست بە زاتی خوداوە. ئەوە کەلامێکی خودایی یە بۆ هەموو ئەو شتانەی کەتەواوی دەستەواژەکان بگرێتەوە ( لە فەرمان و نەهی کردن و هەواڵدان، لەوەش کە لە بەرچاوتدایە درووستە یەك جۆرە فەرمان لە یەك کاتدا (ئەمر و نەهی و ئەخبار و هەواڵ وەرگرتنیش بێت)، هەروەها بۆ شتی نادیارو غائیبیش هەمان شت درووستەو محاڵ نییە، وە ئەو عیبارەتانەی باسمانکردن هەموویان حادیس و پەیدابوون، چونکە لەدەنگ و پیت پێکهاتوون، بۆیە ناو دەبرێن بە کەلامی خودا، چونکە دەلالەت دەکەن لەسەر کەلامی خوداو، بەهۆی ئەو وشانەوە دەگەیت بە کەلامی خودا، جیاوازی بیرو ڕایش لەسەر ئەو دەستەواژانەیە، کە دەمانگەیێن بەکەلامی خودا، نەك لەسەر ئەصلی کەلامەکە. وەك ئەوەی کەسێك قسەیەك لەدڵیایەتی و بیری لێ دەکاتەوەو بە وشەسازی دەری دەبڕێت، وە ئەوەی نکوڵی لە کەلامی نەفسی بکات، ئەوا نکوڵییش لە تایبەتمەندترین صیفەتی مرۆڤ دەکاتەوە، کە خودا بەهۆی ئەو تەوانایەی کە پێی داوە، کە دەتوانێت تەعبیر لە ویژدانی بکات و، لە مێشکیدا زانستەکان ئامادە بکات و، بەشێوەیەکی ڕێك دایبڕێژێتەوەو، بیکات بەقسەکردن، کە بەم صیفەتەیە لە گیانلەبەران جودا دەبێتەوە، ئەینا ئەوانیش دەتوانن هەست بە هەندێك شت بکەن، بەڵام ناتوانن تەعبیری لێبدەنەوە.[1]

---

بکرێت و پێویستییان بە درێژکردنەوە هەبێت، کە خالیقی هەموو شتێکەو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا. بنوارە بۆ ڕونکردنەوەی زیاتر الإتحاف ١٤٧/٢.

(١) لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو فەرمودانە وتەی ئیمامی غەزالی خۆیەتی، وە پەیوەندارن بە

وە ئەگەر چووە ئەقڵیەوە کە هەموو حەوت ئاسمانەکەو عەرش و کورسی و زەوی و بەهەشت و ئاگر نوسرابێتەوە لە پەڕەکاغەزێکی بچوکدا، وە لەبەرکرا بێت و پارێزرابێت لە جێگەیەکدا، کە بە ئەندازەی گەردیلەیەك دەبێت لە دڵدا، وە هەموو ئەو زانیاری و شتانە دەبینرێن لە ناو سۆمای چاودا، کە ڕەشێنە بچوکەکەیەتی و،بە ئەندازەی قەرەنی چاوە لە ناو گلێنەکەدا، بۆ ئەوەی کە ئەرزو ئاسمانەکان و بە هەشت و ئاگریش بچێتەناو چاوو دڵ و کاغەزەکەوەو لەگەڵیاندا تێکەڵ ببێت، ئەگەر ئەم بابەتە گرنگە وەربگرێت و بچێتە ئەقڵیەوە، با ئەوەش تێ بگات، کە کەلامی خودا دەکرێت بە زوبان بخوێنرێتەوەو، لە دڵیشدا پارێزراو بێت و، لە ناو مەصحەفیشدا نوسراوبێتەوە، بۆ ئەوەی ئەصڵی کەلامە نەفسییەکە بچێتەناویەوەو تێکەڵیان ببێت، خۆ ئەگەر درووست بێت ئەصلی کەلامەکە بچێتەناو کتێب و نوسراوەکەوە، ئەوا زاتی خودایش دەچێتە ناو کاغەزەکەوە کە ناوی پیرۆزی خودا لەسەری دەنوسرێت.[1]

---

باسەکەیەوە، بۆیە لە سەرەوە تۆمارمان کردن، بۆ ڕونکردنەوەی زیاتر بنوارە: سەرچاوەی پێشوو، ٢/١٤٧-١٤٨.

(١) وەهەروەها درووست بوو کە ئەصڵی ئاگرەکە بخرێتە ناو پەڕەی کاغەزەکەوە، کاتێك کەناوی ئاگری لەسەر دەنووسرێت و دەشسووتێت. وە ئەوی بە زوبانی باسی ئاگری بکردایە، بەو پێیە دەبوایە زوبانیشی بسووتایە، **بەڕاستی ئیمامی غەزالی جوانتر ئەم بابەتە لە (إلجام العوام)دا ڕون دەکاتەوە و دەفەرموێت:**

**بزانە:** هەموو شتێك لەم بوونەدا چوار پلەی هەیە: بوونێك لەناو ماددەو جەستەدا، بوونێکیش لەناو زیهن و مێشکدا، وە بوونێکیش لەسەر زوبان، وە بوونێکیش لەسەر ئەو پەڕە سپیەی کە لەسەری دەنووسرێت، وەك نموونەی ئاگر: کە بوونێکی هەیە و ئاگرەو دەسوتێت و بەرچاوە، وە بوونێکی تری هەیە کە

لە خەیاڵ و زیهندایە، مەبەست زانینیەتی بە بوونی ئاگرەکە با نەیشی بینێت، وە بـوونی ئـاگریش لەسـەر زوبـان ئەوەیە کە باسـی ئـاگر دەکـات، وە کـاتێکیش دەنووسـیت لەسـەر کاغەزێك، پیتەکان نیشـانەیەکی تـرن بـۆی، وە سـووتاندنیش صیفەتێکی تـایبەتە بە ئاگرەوە، وەك چـۆن قەدیمی صیفەتی قورئانە، ئەوەیش کە دەسـوتێت ئەوەیە کە لەناو تەنوورەکەدایە، نەك ئەوەی لە ناو زیهن و لەسـەر زوبان و لەسـەر لاپەڕەکەیە،چونکە ئەگەر سـوتاوەکە لەسـەر کاغەزەکە بوایە، بە ئەصـڵی نووسـینی ئـاگر دەبـوایە بسـووتایە، ئەگەر وتـرا باشـە ئـاگر سـوتێننەرە؟ دەڵێین: بەڵێ. ئەگەر وتیان وشەی ئاگر ؟ دەڵێین:

نەخێـر، نە وشـەکەی، وە نە پیتەکانی، وە نە نوسـراوەکەیش سـوتێننەر نین، بەڵام ئەوەی بە ئاگر ناو دەبرێت کە لەناو تەنوورەکەدایە، تەنها ئەوە سـووتێنەرە، هەر بەم شـێوەیە وشـەی قەدیمی، وەصـفی کەلامی خـودای پێ دەکرێـت، وەك چۆن سـوتاندن وەصـفی ئاگری پێ دەکرێت، **ئەوەش کە پێی دەوترێت قورئان، بـوونەکەی لە سـەر چـوار پـلەیە: یەکەمیـان:** کە ئەصـڵەکەیە، ئەوەیە کە ڕاوەسـتاوە بەزاتی خـوداوە، وەك بـوونی ئـاگرەکە لەنـاو تەنـوورەکەدا **(ولله المَثَلُ الأَعلَی)**، بەڵام پێویسـتە ئەم نمـوونە بەرجەسـتانە بهێنینـەوە، تـا نەزانەکان لێی حـاڵی بـبن، قەدیمـیش وەصــفێکی تـایبەتی ئەو بـوونەیە. **دووهەمیـان:** بـوونە فیعلییەکەیەتی لە نـاو مێشـکماندا، کاتێـك فێـری قورئـان دەبـین، پـێش ئەوەی بهێنـین بەسـەر زوبانمانـدا، **سـێیەمیان:** بـوونەکەیەتی کە دەیهێنـین بەسـەر زوبانمـاداو دەنگی لێ پەیدا دەبێـت، **چوارەمیش** بوونەکەیەتی لەسـەر کاغەز کە دەنووسرێتەوە، کەواتە ئەگەر پرسیارمان لێ بکەن لە بارەی ئەو قورئانەی کە لە نـاو زیهنمانـدایە پـێش ئەوەی دەربببـڕین، **دەڵێـین:** ئەوە صـیفەتەکەیەتی کە زانیومـانەو مەخلـووقە، بەڵام خـاوەنی صـیفەتەکە، کە ئەصـڵی قورئـانەکەیە قەدیمە، وەك چۆن عیلم و زانینمـان بە بـوونی ئاگرەکە، کە لەنـاو کوورەکەدایە

سـوتێنەر نیـیە، بەڵام ئەصـڵی ئـاگرەکەی نـاو تەنـوورەکە سـووتێنەرە، وە ئەگەر پرسـیارمان لێ بکەن لە بارەی دەنگ و جوڵەی زوبان و قسـەپێکردنەکانەوە، ئەوە دەڵێـین: هەموویـان پەیـدابوون، چـونکە صـیفەتی زوبانەکەمـانن، کە زوبـانەکە حادیس بێت صیفەتەکەیشی کە لەدوای ئەو پەیدا دەبێت، بە دڵنیایی حادیسە، بەڵام ئەوەی خوێندوومانەتەوەو ناومان بردووەو تیلاوەتمان کردووە، بە هۆی ئەو دەنـگە حادیسـانەوە، بە دڵنیـاییەوە قەدیمـن، وەك چـۆن بەزوبـان نـاوی ئـاگر بەرین، نـاوبراوەکە سـوتێننەرە، بەڵام دەنـگ و پیـت و قسـەکانمان قەدیـم نیـیە، مەگەر کەسـێك بڵێـت: حرووفی ئـاگرەکە عەینـی ئـاگرەکەیە!! ئەگەر ئەم قسـە محـاڵە درووسـت بێـت؟ ئەوا ئـێمەش دەڵێـین پیتەکـانی قورئـانیش عەینـی قورئـانەکەیە!! ئەگەر مەبەسـتی لە حرووفـی قورئـانەکە ئەصـڵی کەلامە خوێنـراوەکە بێـت، ئەوە ڕاستە قەدیمە، هەروەها ئەوەی نوسـراوەتەوە بە هێڵ و خەت و نووسینەکان، ئەصڵی نوسراوەکەیە کە سوتێننەرە، بەڵام ژمارەو پیتەکان خـۆ ئەصـڵی ئـاگرەکە نـین، ئیتـر چـۆن سـوتێننەر بـن؟! کەواتە ئەمە چـوار پـلەی جیـاوازە، عەوام دەکەوێـتە گومـانەوە لێیـان و، نـاتوانن حەقیقەتـی هەموویـان بزانن، بۆیە نابێت بۆ ئەوانی درێژ بکەینەوە، ئەگینا ڕاستییەکەی ئەمەیە:

ئـاگر لەو جیهەتەوە لە نـاو تەنـوورەکەدایە، سـووتاندن صـیفەتەکەیەتی، وە لەو ڕووەوە کە لە سـەر زوبـان دەوترێـت: ئـاگر، بەوە وەصـف دەکرێـت کە ئـاگر پیتەکـانی زۆرە یـان کەمەو، زمانەکەیشـی کـوردییە، یـان بەهەر زوبـانێکی تـر کە باسی بکرێت ، ئەوەی لە ناو تەنوورەکەدایە، بەش بەش ناکرێت بۆ زوبانەکان و کەمی و زۆریان، ئەوەش لەسەر زوبانە، ناوترێت ئەوە داگیرساوەو خامۆش بووە، یـان گـڕی گرتـووە. وە ئەگەر ئـاگرەکە لەسـەر پەڕەیەك نوسـرابێتەوە، دەڵێـین: خەتەکەی سوورە سەوزە ڕەشە، یا بە قەڵەمی جافە یان حیبرە یان ئووچە، یان خەتی ڕوقعەیە یان شێوەکانی ترە.

خۆ ئاگر کاتێك لەسەر زوبان بێت، ناتوانیت ئەم وەصفانەی بۆ بهێنیتەوە، بەڵام ناوی ئاگر دەوترێت بۆ هەرچوار بەشەکە، ئەوەی لە ناو تەنوورەکەدایەو، ئەوەی لە دڵدایە، یان لە سەر زوبانە، یان لەسەر کاغەزەکەیە، هەمووی ئاگری پێ دەوترێت، وەك لەفزێکی هاوبەش لەمیانیاندا، بەڵام ئاگری ناو تەنوور حەقیقەتی واتاکەیەتی، وەئاگر لە ناو زیهندا ئەوە بوونی عیلم و زانستییە پێی، نەك حەقیقەتەکەی بێت، بەڵکو بەو شێوەیە کە وێنەیەکیەتی و نموونەی ئەصڵەکەی بەیاندەکات، وەك ئەوەی کە ئەگەر کەسێك لە ناو ئاوێنەدا ببینرێت، ئەوە شکڵەکەیەتی نەك حەقیقەتەکەی، وە ئەوەش بەسەر زوبانندا دێت، ئەوە ناوی ئاگرەکەیە، کە دەلالەت دەکات لە سەر ئەو، دیمەنی ئاگرە کە لە زیهندابوونی هەیە، ئەوەش کە نووسراوەتەوە پێی دەوترێت ئاگر. بە واتای چوارەم، کە ژمارەو پیتێکەو، نیشانەیە لەسەر ئەو واتایەی بەسەر زوبانەوەیە.

کەواتە: ئەگەر بە باشی لەم چوار شێوەو بابەتە حاڵی بویت، ئیتر لەوە تێدەگەیت کە

ئەگەر وتیان: قورئان لە دڵی فلاندایە، یان لەسەر زبانی خوێنەرەکەیەتی، یان صیفەتی زاتی خودایە، ئەوە تەصدیقی هەموو واتاکان دەکەیت و لێیشیان تێدەگەیت، وەهیچ تەناقوض و دژایەتییەك نابینیت لە زاراوەکاندا، بەلای زانای زیرەکەوە ئەمە شتێکی ڕون و ئاشکرایە، تەمبەڵەکانیش چاوی خۆیانی لەحەنادا دەنوقێنن و تێی ناگەن، کەواتە نابێت ڕۆبچن لە ناویدا، تەنها ئەوەندەیان پێ بڵێن:

قورئان مەخلوق نییەو بەس، زیادو کەمی مەکەن، بەڵام بۆ زیرەکەکەی باس بکەو پێیشی بڵێ: با بۆ نەزانەکانی باس نەکات.

کەواتە زاناگەورەکان کە باسیان نەکردووە، لە نەزانینیان نەبووە، بەڵکو دڵیان بەنەزانەکان سووتاوە، کە لێی حاڵی نەبن و گومانیان بۆ درووست ببێت،

## بنەمای حەوتەم:

ئەو کەلامی خودایەی کە وەستاوە بە خۆیەوە و هەموو صیفەتەکانی تریشی قەدیمن، چونکە محاڵە خودا ﷻ جێگاو محەل بێت بۆ شتە پەیدابووەکان، کە بچێتە ژێر حوکمی گۆڕانکارییەکانەوە، بەڵکو دەبێت هەموو صیفەتێکی کەماڵ کە دەدرێتە پاڵ زاتی خودا، بۆ صیفەتەکانیشی دیاری بکرێت، کەواتە هیچ گۆڕانکارییەك ڕوی لێ ناکات، وە هیچ پەیدابوویەك ناچێتە ناویەوە، بەڵکو بەردەوام لەحاڵەتی قیدەم و ئەزەلییەتی خۆیدا بە هەموو صیفەتە جوان و پەسەندەکان وەصفدار کراوە.

وە بەردەوامیش هەتاهەتایە هەر وەك خۆی دەمێنێتەوەو، گۆڕان بەسەر کەماڵات و ئەحواڵیدا نایەت، چونکە تەنها ئەوانەی پەیدادەبن و، جێگەن بۆ شتەحادیسەکان، ئەوانە گۆڕانیان بەسەردا دێت.

بۆیە جەستەو لاشەکان سەلماوە کە پەیدابوون، چونکە ڕوبەڕووی گۆڕان و هەڵگۆڕان دەبنەوەو، صیفەتەکانیشیان گۆڕانیان بەسەردادێت، ئیتر چۆن دەبێت خالیقی ئەو گۆڕاوو پەیدابووانە، هاو بەشی ئەوان بن لە گۆڕانەکاندا؟!

لەسەر ئەم بنەمایە ئەوەش دەخرێتە سەری کە کەلامی خودا قەدیمەو وەستاوە بەخۆیەوە، پەیابووەکان ئەو دەنگانەیە کە دەلالەت دەکەن

---

وە ئەوکاتە بیدعە کەم بووە، ئەو بابەتانە نەوروژێنرێت باشترە، بەڵام ئێستا پێویستە زاناکان و خوێندەوارەکان لەم پرسە گرنگانە تێ بگەن و، وەڵامی بیدعەچییەکانیان پێ بێت. بۆ زیاتر بنوارە: إلجام العوام دانراوی ئیمامی غەزالی، /٧٦-٧٨. لە ناو کتێبی ( مجموعةرسائل الإمام الغزالي )مەجمووعەی سێیەم ڕسالەی چوارەم ل/٧٦-٧٨. دار الكتب العلمية/ بيروت ساڵی ٢٠٠٦ چاپی چوارەم .

لەسەریان.[1]

وەك چۆن باوكێك ئیرادەو فێربوونی زانستی كوڕەكەی دەچێتە زیهن و ئەقڵییەوە، تەنانەت پێش لە دایكبوونیشی، هەتا ئەوكاتەی كە منداڵەكەی دەبێت و ئەقڵیشی پەیدادەبێت، وە خودایش زانستێكی بۆ ئەو منداڵە خەلقكردووە، كە پەیوەندارە بەو داواو طەلەبەی وا لە دڵی باوكیدا، كە دەبێتە مەئموورو فەرمانبەردار بەو داواكردنەی بەسرابوویەوە بە زاتی باوكییەوە، وە بوونەكەیشی بەردەوام بوو، تا ئەوكاتەی كوڕەكەی زاناو شارەزایی پەیداكرد.. ئەگەر ئەم حاڵەتە چووەتە ئەقڵییەوە، با ئەوەش بچێتە ئەقڵییەوە، ئەو داوایەی خودا كە لەم فەرموودەی خوداوە وەردەگیرێت: (**فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ**)

واتە: سەرپاكانت دابكەنە، ئەو داواكردنە بە زاتی خوداوە ڕاوەستاوە، وە چارەنووسی حەزرەتی موسا(عليهِ السَّلام) كە ڕوی خیطابی بەو فەرمانە تێكردووە، دوای لەدایك بوونی موسا بووە، واتە:

دوای ئەوەی بوونی بۆ پەیدابووە، وە ئەو كاتە خودا خەلقی ئەو زانیارییەی بۆ كرد، كە بزانێت لە ئەزەلەوە ئەو طەلەبەی لێ كراوە، وە گوێ بیستی ئەو كەلامە قەدیمە بووە.[1]

---

(١) وە بزانەكە قورئان بە واتا ئەزەلییەكەی ناچێتە ژێر هیچ زەمانێكەوەو، وەصفداریش ناكرێت بە ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو، چونكە ئەزەلی لەگەڵ زەماندا نایكرێت، بەڵام كەلامی خودا بە واتا فیعلییەكەی، كە دەلاڵەت دەكات لە سەری، یان بە هەندێك لە پەیوەندارەكانییەوە، ئەوە لەو ڕووەوە دەبەسرێتەوە بە زەمانەوە، وەك ئەوەی خودا فەرموویەتی: **وقَالَ مُوسَى، وعَصَى فِرعَونُ**. كەواتە ئەوەی دەچێتە ژێر زەمانێكەوە دەلاڵەتكردنی ئایەتەكەیە لەسەر باسی ڕودانەكە. نەك مەدلوولە قەدیمەكەی كە كەلامە ئەزەلییەكەیەتی.

## بنەمای هەشتەم:

بەردەوام خودا زانایە بە زات و صیفاتی خۆیدا، وە زانایە بە هەموو ئەو شتانەی درووستیان دەکات، وە هەرچەندێك لە مەخلوقاتی خودا زیاتر پەیدا ببێت، نابێتە زانستێکی نوێ بۆ خودا، بەڵکو هەرلەئەزەلەوە ئاگای لە هەمووی بووە، وەهەمووی لەبەرچاوی قودرەتیدا ئاشکرابووە، ئەمەش وەك ئەوەوایە ئەگەر خودا زانینێکمان پێ بدات، کە لە کاتی هەڵاتنی خۆردا زەید دەگاتە بەرەوە، وە ئەو زانینە بە پێی تەقدیری خودا بەردەوام بوو تا خۆرهەڵات، ئەوکاتە هاتنی زەید، لەو کاتە دیاری کراوەدا هیچ جۆرە زانستێکی نوێی بۆ زیاد نەکردوین و، بە نیسبەت ئەوکەسەوە زانراو بووە، هەربەم شێوەیش دەبێت لە قەدیمی و ئەزەلییەتی زانست و عیلمی خودا تێبگەین.

## بنەمای نۆیەم:

ئیرادەی خودا قەدیمەو هەر پێ یەوەبووە، هەر لە کۆنەوە ڕودانی هەموو ڕوداوەکان کە لەکاتە دیاریکراوەکاندا پەیدادەبن، پەیوەندییان بەعیلمی خوداوە هەیە، چونکە زانینی ئەزەلی خودایی پێشکەوتووە لەسەر ئەو ڕوداوانە. چونکە ئەگەر ئیرادەکە حادیس بێت، کەواتە خودای گەورە دەبێتە شوێن و

(١) غەزالی فەرمـوویەتی: (وسـمع لـذلك) لە فەرموودەکەیـدا. وشـەی سَـمِعَ: بە حەرفی لام دەپەڕێتەوە بۆ سەر مەعمولەکەی، یان وەك: سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ ،إتحاف/١٥٢/٢. یـان سـیاق و دارشـتنی عیبـارەتەکە دەیخوازێت، وەك: وَسَـمِعٌ لِـذالكَ، کە عەطـف بکرێتەوە سـەر (وشـەی مەعـریفە) کە باسی کـردووە، واتە: هەرکەسێك کوێگرتنەکەی بۆ قورئان وەك گوێ گرتن وابێت بۆ کەلامێکی قەدیمی نەفسی ، ئەوە نەفی هەرجۆرە زیادەو مەزییەتێك دەکات، لەوەی کە تایبەتمەندە بە حەزرەتی موساوە (علیه السلام)،

جێگای شته پەیدابووەکان، وە ئەگەر شتێك لە غەیری زاتی خودادا ڕوبدات، ئەوکاتە بە پێی ئیرادەی ئەو نەدەبوو، وەك چۆن تۆ ناتوانیت لەگەڵ جوڵەی جەستەیەکدا بجوڵێیتەوە کە لە زاتی تۆدا نەبێت، کەواتە ئەگەر هەرچۆنێك ئیرادەی بۆ بڕیاربدەیت، ئەوا پەیدابوونەکەی پێویستی بە ئیرادەیەکی تر هەیە، وە هەروەها ئیرادەکەی تریش بە ئیرادەیەکی تر. بەم شێوە هەر دەڕوات و تەسەلسول ڕوودەدات، ئەگەر درووست بێت ئیرادەیەك بەبێ ئیرادەی خودا پەیدا ببێت، ئەوکاتە درووستیشە کە جیهانیش بە بێ ئیرادە پەیدابببێت.

## بنەمای دەیەم:

ئەوە بزانە؛ کە خودای گەورە بەهۆی صیفەتی زانستەوە زانایە، وە بە هۆی ژیانەوە دەژی، بەهۆی قودرەتەوە تەوانایە، بەهۆی ئیرادەوە خاوەن ئیرادەیە، بەهۆی کەلامەوە خاوەنی قسەیە، بەهۆی بیستنەوە دەبیستێت، وە بەهۆی بینینەوە دەبینێت. ئەو حاڵەتانەی کە هەیەتی، بەهۆی صیفەتە قەدیمەکانیەتی، کابرایش کە دەڵێت: خودا زانایە بەبێ زانست، وەك قسەی ئەوکەسەیە کە دەڵێت: (دەوڵمەندی بەبێ ماڵ، زانست بەبێ زانا، وە زانا بەبێ زانیاری) چونکە زانست و زاناو زانیاری سێ شتی پێکەوە بەسراون و بێ یەك نایانکرێت، وەك کوشتن و بکوژو کوژراو وان، هەر وەك چۆن تەصەووری قاتلێك ناکرێت بە بێ کوشتن و بەبێ کوژراو. وە تەصەووری کوژراوێکیش ناکرێت بەبێ بکوژو بەبێ کوشتن، هەروەها تەصەووری زانایەك ناکرێت بەبێ زانست، وە تەصەووری زانستێکیش ناکرێت بەبێ زانیاری، وە زانیاریش نازانی چییە بەبێ زانا، بەڵکو ئەم سیانە لە ئەقڵیشدا بەسراون بەیەکەوە و لەیەك جودا نابنەوە، هەرکەسێك بەلایەوە درووست بێت جیابوونەوەی زانا لەزانست، بابەلایشیەوە ئاسایی بێت کەزانا جودا ببێتەوە لە زانیاری و زانراوەکان، وە زانست جودا ببێتەوە لە زانا، چونکە هیچ جیاوازییەك نییە لە

میانی ئەم سێ صیفەتەدا [(١)]

# پایەی سێیەم

## لەپایەکانی

## ئیمان و بڕوا

## زانینە بە کردارەکانی خودا

## کە لەسەر

## دە بنەما دامەزراوە

---

(١) بۆیە ئیسباتی صیفەتەکانمان کردووە، کە زیاد بێت لە مەفهوم و مەعنای زات، چونکە خوای گەورە بۆ خۆی لە قورئاندا و لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەو ناوانەی ناوە لە خۆی، بە گوتارو خیطاب لەگەڵ زانایانی زمانەوانی دا، ئەوەش لە لای ئەهلی زمان زانراوەو لێکدانەوەیان بۆ وشەکان کردووە وشەی: **عەلیم**: واتە زاتێکی وا کە عیلم و زانستی هەبێت، وە (قەدیر) واتە قودرەتی هەبێت. کەواتە هەموو وەصفە موشتەققەکان دەلالەت دەکەن لەسەر زات و وەصفێکی سابت و جێگیر بۆ ئەو زاتە.

# بنەمای یەکەم:

دەبێت بزانیت:

کە هەمو کارێکی پەیدابوو لە جیهاندا ئەوە کردارو درووستکراوو بەدیهێنراوی خودایە[1]، جگە لە خودا هیچ درووستکەرێکی تریان نییە، وە هیچ کەسێکی تر ناتوانێت بەدییان بهێنێت و پەیدایان بکات، خەڵکەکەیشی درووست کردووەو صنعەت و پیشەکانیشیان، وە هەرچی تواناو جوڵەو بزاڤێکیان هەیە خودا بۆی بەدیهێناون، کەواتە هەموو کرداری بەندەکانی

---

(١) لەم بارەیەوە پێویستە بزانین: صیفەتەکانی خودا دووبەشن: صیفەتی زات و صیفەتی کردارەکان، جیاوازیش لە میانیاندا ئەمەیە: هەر شتێك کە وەصفی خودای گەورەی پێ کرابێت، وە درووست نەبێت کە غەیری خودای پێ وەصفدار بکرێت، بە خودی ئەو صیفەتانە یان بە دژەکانیان، ئەوە لە صیفەتەکانی زاتن، وەك: قودرەت و عیلم و عیززەت و عەزەمەت و گەورەیی خودا، وە هەموو ئەو صیفەتانەی کە درووستە خودای پێ وەصفداربکرێت و غەیری خودایشی پێ وەصفدار بکرێت، ئەوە لە صیفەتەکانی فیعل و کردار دەژمێررێت، وەك سۆزو ڕەحمەت و سوخط و تورەبوون و غەزەب . وە جیاوازی لە میانی صیفەت و ناودا (إسم) ئەوەیە:

صیفەت بریتییە لە تەنها زانست و تەواناىی، بە بێ لکاندنیان بە زاتەوە، بەڵام ئیسم بریتییە لە زاتەکە خۆی، بەلای ئەشعەرییەکانەوە صیفاتەکانی زات: بریتین لە حەیات و قودرەت و بیستن و بینین و کەلام و ئیرادە، کە هەموویان قەدیمن و ڕاوەستاون بە زاتی خوداوە، وە صیفاتی فیعل و کردارەکان حادیس و پەیدابوون و، نەوەستاون بە زاتی خوداوە، وە لەمبارەوە زۆر بەدرێژی باسیان کردووە کە توێژینەوەیەکی تایبەتی دەوێت. بنوارە: الإتحاف٢/١٥٧-١٥٨.

مەخلوق و درووستکراوی ئەون، وە پەیوەنداری قودرەت و تەوانایی خودان، بۆ ڕاستی و باوەڕکردن بەوەی کە تەنها خودایە خالیقی هەموو کردارەکان و کەسی تر نییە بۆیە دەفەرموێت:

﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ الزمر﴾/٦٣.

واتە خودا خالیقی هەموو شتێکە، وە لەم فەرموودەی خودادا باشتر ڕونی دەکاتەوە:

﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ (الصافات/٩٦)

واتە: خودا خۆتان و ئەو کردەوانەیش کە دەیکەن هەمویی درووستکردووە، وە لە فەرموودەی خودادا:

﴿وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ، أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك/١٤)

قسەی خۆتان بە نهێنی بکەن یان بە ئاشکرای بکەن، چۆنی دەکەن بیکەن، هەمووی لای خودایەوە خودا ئاگای لە هەرچی هەیە لە دڵی خەڵکی دا بێت، ئایا کەسێك ئەم خەڵکەی درووستکردبێت بە خەیاڵاتی دڵیان نازانێت، کە زانین و زانستیشی دەگاتە دەروو ناوو نهێنی و ئاشکرای ئەو خەڵکە [1]،

کەواتە خودا فەرمانی داوە بە بەندەکانی کە خۆیان بپارێزن لە بارەی گوفتار و کردارو نهێنییەکانیان و قسەشاراوەکانی ناو دڵیانەوە، چونکە خودا ئاگادارو شارەزایە بە سەرچاوەو جۆری کردەوەکانیان، وە بەڵگەی لەسەر زانستەکەی بەوە هێناوەتەوە، کە هەمووشێکی درووست کردووە، وەك لە ئایەتی ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ﴾ دا هاتووە.

---

(١) خولاصە: ٥٦٣.

کەواتە چۆن دەکرێت خودا خالیقی کردەوەکانی عەبد نەبێت، کە خاوەنی قودرەتێکی تەواوەو هیچ کەموکوڕییەکی تێدا نییە، وە توانایی خودا پەیوەندارە بە تەواوی جوڵەو حەرەکاتی جەستەکانی مرۆڤەوە، جووڵەکانیش چون یەکن ، وە پەیوەندی قودرەتی خودا پێیانەوە لەبەر شتێکی دەرەکی نییە، بەڵکو لەبەر زات و ئەصڵی قودرەتەکەیە.

کەواتە چی دەبێتە هۆکار بۆ پەیەست بوونی قودرەت و تەوانایی خودا، بە هەندێك لە حەرەکەو جوڵانی بەندەکانیەوەو، دووربێت لە هەندێکی تر، کە دەزانین هەموو جووڵەکانیان هاوشێوەی یەکترین و، قودرەتی خودایش هیچ کەمییەکی تێدا نییە، کە تەعەللوقی بە هەندێکیانەوە هەبێت و هەندێکیشیان وەلانێت؟

یان چۆن دەکرێت کە گیاندار خۆی بە سەربەخۆیی بتوانێت کردارەکانی خۆی درووست بکات و، داهێنانی تایبەتی بکات، کە هەندێکیان وەك جاڵجاڵۆکەو هەنگ و گیاندارە بەتواناکانی تر، کە زۆر وردەکاری و سنعەتکاری نایاب دەکەن، کە بیرو هۆشی مرۆڤ سەرسام دەکەن؟!

دەی چۆن ڕەوایە ئەو گیانلەبەرە بۆخۆی بەتەنها توانای ئەو هەموو داهێنانەی هەبێت، بەبێ خوداوەندی بە توانا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو گیانلەبەرەیە بۆخۆیشی ئاگای لە درێژی و وردەکاری هەموو کردەوەکانی خۆی نییە؟!

بەڕاستی زۆر دوورە زۆر دوور! هەموو دروستکراوەکانی خودا زەلیل و ژێردەستە و بێ دەسەڵاتن، وە تەنها دەستەڵاتداری بەزەبرو بەتوانای ئەم بوونەوە، خاوەنیەتی و مالیکی ئەم کەون و مەلەکووتە فراوانەیە دەکات.

# بنەمای دووهەم:

ئەوەی کە خودا بە تەنهایی، خاوەن و بەدیهێنەری کردەوەی بەندەکانە، ئەوە نابێتە ڕێگر لە بەردەمی بەندەکاندا، کە بتوانن کارەکان ئەنجام بدەن لەسەر شێوەی کەسب و هەوڵدان:

بەڵکو دەبێت بزانین؛ کە خودا خالیقی تواناو توانراوەکەیشە بەگشتی، واتە: ئەوەش کە تواناو قودرەتی پێوە ڕاوەستاوە بۆ بەدیهێنانی، وە خەلقی ئیختیارو ئارەزوی بەندە و کارە هەڵبژاردەکانیشی کردووە، کە وەصفی هەڵبژاردنەکەی پێوە ڕاوەستاوە، بەڵام صیفەتی قودرەت بە نیسبەت بەندەوە وەصف و پێناسەیەتی، وە بەنیسبەت خوداوە خەلق و دروستکردنیەتی، وە هەرگیز تەوانایی بەشێك نییە لە کەسبی بەندە.

بەڵام جوڵەو بزاڤەکان، ئەوە هەر لە بنەڕەتدا دروستکراوی خودایەو، کەسب و وەصف و پێناسەی بەندەیە، چونکە ئەو جوڵەیە بەهۆی قودرەتێکەوە توانای بۆ پەیدابووە، کە دەبێتە وەصف و ستایشکردنی تواناکە، کەواتە بۆ حەرەکەو جوڵەکە نیسبەتێکی هەیە بەلای صیفەتێکی ترەوە کە ناودەبرێت بە قودرەت، کەواتە بە ئیعتیباری بوونی ئەو نیسبەتەی کە هەیە لە میانی جوڵەو حەرەکەیەك بۆ صیفەتێکی تر، ئەوە بەکەسب ناودەبرێت.[1]،

---

(١) بەراستی باسکردنی کەسبی عەبد، لەوباسە تایبەتیانەیە کە زۆر وردەکاری لە سەر وتراوە، حەنەفییەکان بروایان وایە کردەوەکانی بەندە پێی دەوترێت ئیختیار، وەڕای درووستیش ئەوەیە کە کەسب و ئیختیاریش هەردوکی یەك واتایان هەیە. بەڵام شێخی ئەشعەریش وشەی کەسبی هەڵبژاردووە، چونکە قورئان بەو شێوە ناوی دەبات، وە زانایانی(ماتوریدی) ڕایان وایە ئیختیار پەسەند ترە، چونکە نیشانەی ئەوەی تێدایە کە توانای بەندە دەردەخات. وە جیاوازییەکیش لە میانی هەردوو وشەی کەسب و ئیختیار

دا هەیە، کەسب ئەوەیە: بەتەنها کاسبەکەو کار بەڕێخەرەکە سەربەخۆی تێدا هەیە. بەڵام خەلق ودروستکردن خودا بەسەربەخۆیی ئەنجامی دەدات! وە دەڵێن:

ئەوەی بە ئامێرێك ئەنجام بدرێت، ئەوە کەسبی عەبدەو، ئەوەش بەبێ ئامێرو هۆکاربێت، ئەوە پەیوەندی بە خەلقەوەهەیە. لەپاشان ئەوەی خودا پەیدایکردووەو هێناویەتیە بوون، بەبێ ئەوەی پەیوەندار بێت بە تواناو ئیرادەی هیچ عەبدێکەوە، ئەوە دەبێتە صیفەت بۆ خودا نەك کرداری خودا، وە ئەوەش کە بهێنێتە وجوود، وە لەگەڵیدا تواناو ئیختیاری بەندەی تێدا بێت، ئەوە بە صیفەت و فیعل و کەسبیش وەصفدار دەکرێت. جەبریەکان کە بڕوایان وایە عەبد خاوەنی کەسب نییەو، هەرچیش بکات بەزۆر پێی دەکرێت، نکوڵی دەکەن کە بەندە توانای هیچ کردارێکی هەبێت، وە ئەوانەش کە دەڵێن ئیختیار و کەسب لە بەردەستی عەبددایە، ڕای جیاوازیان هەیە: ئەشعەریەکان دەڵێن:

ئەو قودرەتی بەندەیە پەیوەندی هەیە بە کردارەکەوە، بەڵام کاریگەری نییە لەسەر بڕیاری خودا، چونکە کردارەکەی بەندە، تەنها بەفەزڵی قودرەتی خودا ئەنجام دەدرێت، وە ناگونجێت کارێك لە میانی دوو خاوەن تواناییدا ئەنجام بدرێت، وە ئەهلی حەدیس و ئەهلی عیرفانیش بەهەمان شێوە دەڵێن:

بەندە توانایەکی هەیە کە پەیوەندارە بە کردارەکەوە، کاتێك خودا ئەو توانایەی تێدا درووست دەکات، کە خەلقی فیعلەکەی بۆ دەکات و، دەست بۆ کارەکە دەبات، بێ ئەوەی هیچ کاریگەریەکی بەندە هەبێت تیایدا، بەڵکە گاریگەری تەنها بۆ خودا دەگەڕێتەوە، کە ئەمەش بە جەبری ناوەڕاست ناو براوە، کە ئیمامی جووەینی ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە،

لە (الإرشاد)دا، ئیمامی (ماتوریدی) ڕای وایە:

کە ئەصڵی کردارەکە بە فیعلی، کاری خودایە، وە ئەوەی کە وەصفدار بکرێت، کە ئەو کردارە طاعەتە، یان یاخی بوون و گوناهە، ئەوە بە قودرەتی بەندە دادەنرێت، لەپاشان ئیمامی غەزالی سەرنجی دا کە ڕای مامۆستاکەی (إمام الحرمین) لە جەبریەت دووری ناخاتەوە، چونکە بەندە ئەگەر نەتوانێت هیچ کارێك ئەنجام بدات،

چۆن دەکرێت کردارەکانی بەندە بە جەبرو زۆرەملێیەکی تەواو دابنرێت، کە هەموو بەندەیەك بە ڕاستی دەزانێت جیاوازییەکی زۆر هەیە لە میانی کەسێکدا کە جووڵەیەکی ئارەزومەندانە ئەنجام بدات، کە لەژێر توانای خۆیدا بووە، لەگەڵ لەرزین و کارێکی بێ ئارەزوومەندانە، (وەك لەرزین ی دەستی لەرزۆك)؟!

وە چۆن دەبێت کارەکە لە فیعلی بەندەکە بێت، کە ئەو بەندەیە ئاگاداری وردەکارییەکانی ئەو کارە نییە، وە ناتوانێت گەمارۆی هەموو ڕوداوەکان بدات، بەتایبەتی ژمارەو پارچەو وردەکاریی بەشەکانی ئەو حەرەکانەی کە دەیکات؟![1]

---

مەگەر خودا بۆی تایبەت و تەقدیر کردبێت، کەواتە ناتوانێت هیچ کارێك ئەنجام بدات بە بێ ئەو تەقدیرە، وەئەگەر خودا ئیرادەی وابوبێت کە ئەو کارە بکرێت، خۆ عەبدەکە بۆی نییە کە نەیکات، کەواتە زۆرەملێیی دێتە ئاراوەو ئیختیار کاڵ دەبێتەوە، بۆیە غەزالی لە مەتنەکەدا درێژە بەمبابەت دەدات:

بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی بابەتەکان بنواڕە: الإتحاف / ٢/ ١٦٦.

(١) ئەمەش کە بە صیغەو دەستەواژەی ئینکاری هێناویەتی، بەرپەرچدانەوەیەکە بۆ ڕاکانی موعتەزیلەو جەبرییەکان و، ڕێگە خۆشکەرێکە بۆ ئاشکرا کردنی ڕای ئەهلی سوننەت . ئەوەش کە جەبرییەکان دەیڵێن: موستەحیلە کۆبونەوەی دوو کاریگەر لەسەر یەك کار لێکراو، وەڵامەکەی ئەوەیە: کە دەشێت توانای ئەنجام دانی کارێك بکەوێتە ژێر دوو کاریگەرییەوە: **یەکەمیان** لەڕێگەی خەلق و توانا پەیداکردن، **دووهەمیان** توانای کەسب و ئیختیار، ئەوەی کە ناگونجێت ئەوەیە:

دوو کاریگەری سەرەکی و سەربەخۆ هەبن بەرامبەر یەك کارلێکراو.

(١) واتە: لە حاڵەتی ناوەڕاستدابێت، نەجەبری ڕووت و نە ڕای قەدەرییەکان و ئیعتیزال و ئیختیاری تەواو، کە غەزالی (خوای لێ ڕازی بێت) باسی دەکات .الإتحاف٢/١٦٧

کەواتە ئەگەر هەردوو لایەنەکە پوچەڵبوویەوە، واتە: (ئسباتی ئیختیاری تەواوی بەندە لەکارەکانیدا، یان زۆرەملێی تەواو کە بەبێ ئارەزوی خۆی کارەکانی پێ بکرێت): هیچ ڕێگەیەکی تر نامێنێت جگە لە میانەیی لە باوەڕدا

میانەییش ئەوەیە: ئەوکارانە لەتواناو قودرەتی خودادا دەبێت لەڕوی ئیختیراع و داهێنانەوە، وە لە ڕوویەکی تریشەوە لەژێرتواناو پەیوەندی بەندەدایە، کە بە کەسبی عەبد تەعبیری لێ دراوەتەوە. [1]

وە هیچ پێویستی و زەرووڕەتێك نییە کە پەیوەندی توانای خودا بە کارە تەقدیر لەسەر کراوەکە ببێت، تەنها بە داهێنان و ئیختیراع بێت، ئیمجا کاریگەری لەسەری هەبێت، خۆ قودرەتی خودا لە ئەزەلەوە پەیوەندار بووە بە درووستکردنی هەموو جیهانەوە و، هیچ جۆرە داهێنانێکیش لە ئارادانەبووەو جێبەجێنەکراوە، کەواتە لەکاتی ئەنجامدانی داهێنانەکە، جۆرێکی تر لە تواناو قودرەتی خودایی پەیوەندی پێوە دەبەستێت، وە بەوەدا دەردەکەوێت کە پەیوەندی بەستنی توانایی بەکارەکەوە، لەسەر ئەوە نەوەستاوە کە دەبێت ئەو کارە لەو کاتەدا ئەنجام بدرێت[2].

---

(١) بە پێی ناو لێنانی خودایی بۆ ئەم کەسبەیە کەفەرموویەتی: **لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ** البقرة/٢٨٥. بەڵام (ماتوریدییەکان) ناویان لێناوە ئیختیار، واتە جۆرێك تواناو قودرەتی عەبدیشی تێدا ئاشکراتر دەبێت.

(٢) ئەوەی پێویستە لە بارەی (کەسبەوە) بیزانین: ئەوە یەکێکە لە صیفەتەکانی عەبد، هەموو کەس هەست بە بوونی دەکات، وە جێگیربوونی لە جێگەکەیدا جیاوازی تێدایە لە میانی کردارە ئیختیاری و زەروریەکانەوە، بەڵام بەندە حەقیقەتیان نازانێت، بەڵام دڵنیایە کە تەنها خودا خالیقی بەندەو کردەوەکانیشە، پێویستی بە هێچ واتایەکی تر نییە، وە بڕوای هەبێت کە کەسبی عەبد جۆرە پەیوەندییەکی هەیە بە کردارەکانیەوە، بە شێوەیەك بەرتەنگیەك بۆ قودرەتی خودا درووست نەکات، کێ

# بنەمای سێیەم:

کاری عەبدەکان ئەگەر لە کەسبی بەندەکانیش بژمێررێت بەڵام لەوە دەرناچێت کە بەبێ مورادو مەبەستی خودا ی گەورە ناکرێن:

هیچ شتێك لەم بوونەوەر و موڵك و دەستەڵاتەدا بە ئەندازەی چاوتروکاندنێك یان بە قەدەر خەتەرەیەکی دڵ، یان تیلەیەکی چاو نابێت و رونادات بەبێ قەزاو قەدەری خودا[1]، بەبێ ئیرادەو ئارەزوی خودا نایەتەدی، خێرو شەڕ و قازانج و زیان و تاڵ و سوێر و موسوڵمانبوون و کافربوون، عیرفان و نوکرانەی چاکەو سەرکەوتن و خەسارەت مەندی و گومڕایی و ڕوشدو ڕێنمایی و گوێڕایەڵی و تاوان و یاخی بوون و هاوتا بڕیاردان و ئیمان و بڕوا، هەمووی هەر لەخوداوەیە، قەزای خودا گەڕانەوەی نییە.

---

بڕکێیشی لەگەڵدانەکات، وە بۆیشی دیاری نەکات، بەڵام نەمانتوانیوە دەرکی ئەم پرسانە وەك خۆی بکەین، وە ئەوەی کە خودا تێگەیشتن و زانستی و نووری بەصیرەتی پێدابێت، دەرکی حەقیقەتی ئەو مەسەلەدەکات، وەك چۆن عاریف و خوناسان بە حەقیقەتی شتەکانیان زانیوە، وە هەندێکی زۆر لە عالەمی غەیب و شەهادە ئاگادارکراون، کە زۆربەی خەڵکی نەیانتوانیوە دەرکی ئەو ڕاستیانە بکەن، کەواتە نابێت بە پەلە ئینکاری قسەی ئەو کەسانە بکەین، یان هێرشیان بکەینەسەر، کە قسەیەکی کردبێت محاڵ نەبێت و، لەگەڵ بیری تۆدا ناکۆکیەکی هەبێت، وەك فەرموودەکانی ئیمامی حەرەمەین و هاوێنەکانیان، مادام ڕایان لەگەڵ ڕای ئەهلی باطیڵدا یەکناگرێتەوە، کەواتە تا لێیان تێنەگەین یەکسەر بەرپەرچیان نەدەینەوە.

(١) بەلای ئەشعەریەکانەوە: قەزای خودا پەیوەستە بە ئیرادەوە، وە قەدەری خودایش پەیوەندی بە خەلقەوە هەیە، وەك لە (شرح مواقف)دا هاتووە، بەڵام بەلای (ماتوریدی)یەکانەوە، قەزاو قەدەر غەیری ئیرادەیە، قەزا بە واتای خەلق کردنە، وە قەدەریش بە واتای تەقدیر کردنی خودایە، بە پێچەوانەی (ئەشعەریەکان).

کەس ناتوانێت پێداچوونەوە لەسەر بڕیارێکی خودا بکات، هەریەکێ ئارەزوو لێ بێت گومڕای دەکات و، ئەوەیش مەیلی لێ بێت ڕێنومایی دەکات، کەس ناتوانێت پرسیاری لێ بکات کە چی دەکات، بەڵام هەموان بەرپرسیارن لەبەردەم خوداداو ڕووبەڕوی لێ پێچینەوە دەبنەوە [1]،

لە بەڵگە نەقلییەکان نیشانەن لەسەر درووستی ئەوقسانە، کە هەموو گرۆی ئیسلام لەسەریان یەکڕان: **(ماشاءَ اللهُ کانْ، وما لَم یَشَأْ لَمْ یَکُن)** (ئەوەی خودا بیەوێت دەبێت! وە ئەوەش کە ئەو نەیەوێت هەرگیز نابێت)[2]،

وە خودا فەرموویەتی:

**﴿أَنْ لَوْ یَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِیعًا﴾**، رعد/٣١.

ئەگەر خودا مەیلی لێ بوایە هیدایەتی هەموو کەسێکی دەدا.

هەروەها فەرموودەی خودا:**﴿وَلَوْ شِئْنَا لَآتَیْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا﴾**، سجدة/١٣.

ئەگەر مەیلمان لێ بوایە هیدایەتی هەموو کەسێکمان دەدا بێتە سەر ڕێی ڕاست.

وە بەڵگەی عەقڵیش بۆ ئەم مەبەستە ئەوەیەکە: گوناە و تاوان و یاخی بوونەکان ئەگەر خودا خۆشی لێیان نەیەت و، ئیرادەی لەسەریان نەبێت، بەڵام

---

(١) ناو بردنی هەندێ کردوە بە شەڕ بەنیسبەت ئەوەوەیە کە پێیەوە دەلکێت و زیانمان لێ دەدات، نەك بەنیسبەت ئەوەی کە لەلایەن خوداوە ئەو شەڕو خراپەیە دەرچوو بێت، چونکە دروستکردنی شەڕ خراپ نییە، چونکە هیچ شتێکی خراپ لە خوداوە نابێت، بەڵام ئەوەی ئیختیاری خراپەکە دەکات شەڕەکە بەوەوە دەلکێت. إتحاف/١٧٢/٢.

(٢) ئەم قسە مەشهورە. بەشێکە لەو فەرموودەی کە ئەبوداود بەژمارە(٥٠٧٥) ڕیوایەتی دەکات لە ناو کۆمەڵە وشەو کەلیمەیەکدا کە پیغەمبەر ﷺ فێری هەندێك لە کچەکانی کردووە. ئەم فەرموودە ڕەددانەوەی موعتەزیلەکانە کە دەڵێن: خودا شتێکی درووست کردووە وەك کوفرو تاوان کە ڕقی لێیەتی و خەلقیشی کردووە.

ئەوە بە پێی ئیرادەو مەیلی ئیبلیس و شەیتانە، (لەعنەتی خودای لێ بێت) کە دوژمنی خودایشە، کەواتە ئەوەی بە پێی ئیـرادەو ویســتی دوژمنـەکەیە زیــاترە لەوەی کە ڕوودەدات بە پێی ئیرادەی خوداوە.

خۆزگە دەمزانی: چۆن دەبێت موسوڵمان بە درووستی بزانێت، کە دەستەڵات و موڵکی خودای خاوەن هێزو بەتوانا (ذي الجلالِ والإكرام) بگەیێنرێتە ئاستێکی ئەوەندە نزم، کە ئەگەر سەرۆکی گوندو خێڵیکی لاواز ئاوا دەستەڵاتەکانی کەم بکرێتەوە، دەتەوسێتەوەو قەبوڵی ناکات؟!

چونکە ئەوەی دوژمنی سەرۆك خێڵەکە بۆی دەست دەدات، لە بینینی سەرۆکەکەی بەو لاوازی و بێ عیززەتییە، ئەوکاتە نەك خۆی ،دوژمنەکەیشی بەو دەستەڵات و کوێخایەتییەی ڕازی نەدەبوو، کە تاوان زاڵ ببێت بەسەر خەڵکەکەدا و، بەلای ئەهلی بیدعەیشەوە تاوان و گوناە بە پێچەوانەی ویستی خودا ئەنجامدەدرێت، بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی عەجزو نەتوانینە، کە بیدعەچییەکان بۆ خودای بڕیاردەدەن و، کەمی دەستەڵات بە خودا ڕەوا دەبینن.

خودای گەورە زۆر لەوە باڵاو بەرزو شکۆمەندترە، کە نەزانەکان بۆی بڕیار دەدەن.

**وە پێویستە بزانین:**

هەرچەندێك زیاتر ڕوون ببێتەوە کە کرداری عەبدەکان درووستکراوی خودان، (با هەندێکیشیان لە ڕێگەی کەسبەوە بدرێنە پاڵ بەندەکانی) ئەوە بە ڕاست دەگەڕێت، کە هەمووی مورادو مەبەستی خودا بووە.

ئەگەر وتیان: چۆن دەگونجێت نەهی لەشتێك بکات و خۆیشی ویستبێتی، یان فەرمانی پێ بدات و خۆیشی نەیەوێت؟!

دەڵێین: فەرمان کردن جیاوازە لە ئیرادەکردن، بۆیە دەبینین ئەگەر گەورەیەك لە ژێردەستەکەی بدات، سوڵتان سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەم لێدانە، ئەویش پۆزشی بەوە بۆ هێنایەوە: کە ئەو بەندەیە گوێڕایەڵ نییەو سنووری بەزاندووە، سوڵتانیش بە درۆی بخاتەوە، بۆیە گەورەکە بۆ ئەوەی خۆی دەرباز بکات و بەڵگەی درووستی لێدانەکەی ئاشکرا بکات، فەرمان بە بەندەکەی دەدات بەکردارێك کە بیکات و، پێیشی دەڵێت: دەبێت لە بەرچاوی سوڵتان پێچەوانەی فەرمانەکەی من بجوڵێیتەوە! فەرمانی پێ دەدات:

خێرا ئەو وڵاخە لە بەرچاوی سوڵتان زین بکە.

ئەوە دەبینین: فەرمانی بە کارێك پێ دەکات، کە نایشیەوێت جێ بەجێی بکات، چونکە ئەگەر فەرمانی پێ نەکات، ئەوە عوزرو پۆزشەکەی لای سوڵتان بێ هوودە دەبێت، خۆ ئەگەر بیەوێت فەرمانەکەی جێ بەجێ بکات، کەواتە دەیەوێت خۆی بەهیلاکدا ببات، ئەمەش محاڵە کەسێك بیەوێت خۆی بە هیلاکدا ببات.(١)

---

(١)کەواتە دەرکەت: کە درووستە فەرمانکردن بەشتێك و ئیرادەی کردن یان نەکردن بەو شتە جیاوازن، وە دەرکەوت کە ڕاست نییە ئەوەی وتوویانە: کە محاڵە یەکێك فەرمان بە بەندەکەی بدات و بیشیەوێت پێچەوانەکەی بکات، کەواتە گوناهو تاوان دەکرێت بە بێ ئیرادەو مەشیئەتی خاوەن فەرمانەکە، نەك بەفرمان و ڕەزامەندی ئەو بێت، وەك ڕونمان کردەوە.

بۆ نموونە حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی بە کوڕەکەی :

﴿قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾ (الصافات/١٠٢)واتە من لە خەودا بینیومەو فەرمانم پێدراوە، کە تۆ سەر ببڕم، بیری لێ بکەرەوە بزانە چی دەڵێیت؟ ئەویش خۆی تەسلیم کردو فەرمووی: فەرمانی خودا جێ بەجێ بکە، پشت بەخودا من صەبرم

# بنەمای چوارەم:

**بە ڕاستی خودای گەورە هەر بە چاکەی خۆی خەڵکی درووست کردووە وداهێنانی نوێی بۆ کردوون**، وە زیادە نیعمەتێکی تری پێداون، کەڕێگەی بەندایەتی بۆ کردوونەتەوە، کە شایستەی ئەوە بن ئەرکی بەندایەتی ڕویان تێ بکات، کە هەریەکە لە درووستکردن و تەکلیفی بەندەکان، پێویست نەبووە لەسەری کە بیانکات:

بەڵام موعتەزیلەکان دەڵێن: پێویستە لەسەر خودا کە ئەوکارانە ئەنجام بدات، وە چاودێری بەرژەوەندی خەڵکی بکات، ئەمەش محاڵە، چونکە هیچ شتێك لە سەر خودا واجب نییە، چونکە هەر خۆیەتی کە دەتوانێت شت لەسەر هەموان واجب بکات و، خاوەنی فەرمان و نەهی کردن بێت، ئیتر چۆن دەکرێت کە سێکی تر بیکاتە ئامانج و، شتی لە سەر پێویست بکات، یان ڕوی خیطاب و گوتاری تێ بکەن و لەسەری پێویست بکەن؟!

مەبەستیش لە واجب یەکێکە لەم دوو فەرمانە:

---

دەبێت و خۆڕاگردەبم بەرامبەر ئەو فەرمانە،. نەیووت خۆم ڕادەگرم بە بێ (**إن شاءالله**)! ئەگەر فەرمانەکەی خودا ئیرادەی خودایشی لەسەر بوایە کە هەردەبێت سەری ببڕێت، ئەوا فەرمانی بە حەزرەتی ئیبراهیمیش دەکرد، کە صەبری هەبێت و خۆ ڕاگریشبێت، چونکە دووچاری گەورەترین موصیبەت دەبێتەوە، دیارە فەرمانەکەی خودا بەسەربڕین بووە، بەڵام ئیرادەی خودایش جیاواز بووە، بۆیە مەیلی لە جێبەجێ بوونی کارەکە نەبوو، بۆیە فەرمانی صەبری پێ نەدا. کەواتە ئەگەر سەربڕینەکە لازم و پێویست بوایە، دەبوایە فرمانی صەبریشی وەربگرتایە! ئەمەش نموونەیەکی زۆر نایابە کەهێناویانەتەوە]. وەك لە إتحافدا ١٧٦/٢بە درێژی هاتووە:

**یان ئەو کردارەیە کە لە نەکردنیدا زیانێك دەگەیێنێت**، ئیتر لە داهاتوودا تووشی ببێت، وەك وتراوە: پێویستە لەسەر بەندە گوێڕایەڵی خودا بکات، تا لە دوارۆژدا دوچاری سزای ئاگر نەبێتەوە، یان زیانێکی خێرا؛ وەك دەوترێت: پێویستە لە سەر کەسێکی تینوو ئاو بخواتەوە تا کو نەمرێت.

یان ئەو کردارەی کە لە بارەیەوە بووترێت: نەبوونەکەی سەردەکێشێت بۆ حەرام، وەك دەڵێن: بوونی زانراوێك پێویستە کە عیلمی خودا بە بوونیەوە پەیوەست بووبێت، چونکە ئەگەری نەبوونەکەی سەردەکێشێت بۆ محاڵ ، کە عیلم و زانستەکە بگۆڕێت بۆ جەهل و نەزانین.

( واتە: خودا زانیویەتی دەبێت و، نەشبێت ئەوە زانستەکە دەبێتە نەزانین) جا ئەگەر ئەم ڕکەبەرانە لەم قسەیاندا مەبەستیان ئەوەبێت، کە درووست کردن واجبە لەسەر خودا، لەسەر واتا یەکەمەکە، کەواتە خودای دوچاری زیان و زەرەر کردۆتەوە، وە ئەگەر مەبەستی پێی واتای دووهەم بێت، کە عەدەم و نەبوونی ئەو کارە محاڵە، ئەوە ڕاستەو سەلمێنراوە، چونکە خودا بڕیاری دابێت شتێك درووست بکات، محاڵە جێ بەجێ نەبێت، چونکە دوای ئەوە زانینی خودا پێشکەوتووە بەسەر ئەو بوون و خەلقەدا، پێویستە مەعلوم و زانراوەکە بێتە دی، بەڵام ئەگەر مانایەکی سێیەمیان مەبەست بێت: کە سەرەتای خەلقی هەموان لە سەر خودا واجبە، ئەمە قسەیەکی بێ بایەخەو، ناکرێت هیچ کارێك لەسەر خودا پێویست بکرێت. کەواتە هەموو گومانەکان پوچەڵ بوونەوە و سەلما کە هیچ شتێك لەسەخودا پێویست نییە.

وە کەدەڵێن:

ئەوەی باشترە لەسەر خودا واجبە کە فەراهەمی بهێنێت، ئەمەیش هەر لە بنەڕەتەوە قسەیەکی پووچە، چونکە ئەگەر خودا بەوەی بەرژەوەندەی بەندەکانی ڕەچاو نەکردبێت زیانی پێ نەگات، ئیتر هیچ واتایەك نامێنێت بۆ

وشەی پێویست بوونی شتێك لەسەر خودا، (واجبە واتە: ئەگەر نەیکات بەرپرسیاردەبێت، دەی کێ دەتوانێت لێپیچینەوە لەخودابکات؟!)

(خۆ تەنها درووست کردن مەرج نییە) بەرژەوەندی بەندەکان لەوەدابوو کە یەکسەر بۆ بەهەشتیان درووست بکات، (واتە: ئەگەر ڕەچاوی حیکمەت بکرایە، دەبوایە یەکسەر لە بەهەشتدا درووست بکرانایە) نەك لە دونیای پڕ لە بەڵاو نارەحەتیدا درووستیان بکات و، دووچاری هەڵەو گوناە ببن و ڕووبەڕوی مەترسی و تۆڵەی خودایی ببنەوەو، ڕووبەڕوی ئەهوال و سەختییەکانی حەشر و حیساب و لێپیچینەوە سەختەکان ببنەوە، کەواتە: ئەم حاڵەتە سەختانەی کە لە پێشیاندایە، لای مرۆڤە خاوەن هۆش و بیرمەندەکان هیچ شاکامییەکیان پێ نابرێت. ( کەواتە هەرگیز نابێت هیچ شتێك لە سەر خودا واجب بکرێت).

## بنەمای پێنجەم:

درووستە خودا ﷻ ئەرکێك بسپێرێت بە بەندەکانی، باڵە توانای ئەوانیشدا نەبێت، (چونکە ئەو خەڵکە موڵکی خودان، خاوەن بۆی هەیە هەموو شتێك بەمەیلی خۆی ئەنجام بدات) بە پێچەوانەی ڕای موعتەزیلەکان، چونکە ئەگەر ئەمە درووست نەبوایە، محاڵ دەبوو کە داوابکەن لە خودا، ئەو جۆرە تەکلیفە سەختانەیان لەسەر هەڵبگرێت، بەڵام دەبینین، ئەم داوایان لە خودا کردووە، ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾.(البقرة/٢٨٦) (خودایە ئەوەی لە توانامان‌دا نییە جێبەجێی بکەین، مەیکە بەئەرك و پێویستی لە سەرمان و لە سەرمانی هەڵگرە.) وە لەبەر ئەوەی کە خودا هەواڵی بە پێغەمبەرەکەی داوە ﷺ کە ئەبوجەهل باوەڕی پێ ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا خودا فەرمانی پێداوە کە پیغەمبەر فەرمان بە ئەبوجەهل بدات بۆ ئەوەی لە هەموو شتێکدا تەصدیقی بکات و باوەڕی پێ بهێنێت، وە یەکێك لە قسەکانی ئەوەیە، کە باوەڕی پێ

ناهێنێت، دەی باشە چۆن باوەڕی پێ بهێنێت و، تەصدیقی بکات لەوەدا کە تەصدیقی ناکات؟! ئایا ئەمە جگە لەوەی کە محاڵە بێتە دی چی ترە؟![1]،

## بنەمای شەشەم:

خودا ﷻ بۆی هەیە سزاو ئازاری هەرکەسێك بدات لە درووستکراوەکانی، بە بێ ئەوەی تاوانێکی پێشتر لێی ڕوودابێت، وە بە بێ ئەوەی بە تەمای پاداشتێکی داهاتوو بێت.

ئەمەیش بە پێچەوانەی ڕای موعتەزیلەکانەوە، چونکە خودا دەستی قودرەتی والایە و کراوەیە لەموڵکەکەیدا، کەس ناتوانێت دەستی ببەستێت و ڕێگرییەکی بۆ درووست بکات، چونکە زوڵم بریتییە لەوەی کە دەستێوەردان لە موڵکی کەسێکی تردا بکەیت، ئەمەش لەسەر خودا محاڵە، کە هەرگیز ڕووبەڕووی کەسێکی خاوەن موڵك نابێتەوە بێتە بەرامبەری، هەتا دەستێوەردانەکەی بە زوڵم بۆی بژمێررێت، وە بەڵگەی درووستی ئەم

---

(١) خوای گەورە تەکلیفی ئیمانیشی کرد لە ئەبو لەهەب و، لە قورئانیشدا هاتووە کە ئیمان ناهێنێت،﴿سیصلى نارا ذات لهب﴾ ابن التلمسانی دەڵێت: خودا تەکلیفی لە هەموو کافرەکان کردووە بۆ ئیمان، وە لە هەندێکیشیان زانراوە کە ئیمان ناهێنن، وە هەواڵیش دراوە پێی کە بڕواناهێنن، وە ئەگەر بڕوایان هێنابایە ئەو عیلمی خودایە بە عەکسەکەی هەڵدەگەڕایەوە کە محاڵە شتی وا ڕو بدات، بەڵای ئیمام (ئەبی الحسن الأشعری) لە کتێبی (النوادر)دا دەڵێت: تەکلیفی (مالایطاق) درووستە. با لە توانایشیدانەبێت، تەنانەت خودا ئەگەر فەرمان بدات بە یەکێك، کە دووشتی دژ بەیەك کۆبکاتەوە، ناژمێررێت بە سەفەهو تێنەگەیشتن، ئەمەش لە شەرعدا ڕوی داوە، خودا تەکلیفی ئیمانی لە ئەبوولەهەبی کافر کردووە، کە کوفرو ئیمان بەیەکەوە کۆنابنەوە، کەواتە بۆ تاقیکردنەوەیە.الإتحاف٢/١٨١-١٨٣.

قسەیەش بوون و ڕودانی ئەو کارەیە، وەك دەبینین کە سەربڕینی گیان لەبەران ئازاریان پێدەگەیێنێت، وەئەو هەموو جۆری سزاو ئەشکەنجەی کە لەئادەمیزادەوە ڕوبەڕوی گیانداران دەبێتەوە، خۆ بەهۆی تاوانێکی پێشوەختەوە نەبووە کە کردبێتیان.

ئەگەر وتیان:

خودای گەورە زیندووی دەکاتەوەو، بە پێی ئەو ئێش و ئازارەی چەشتوویەتی پاداشتی دەداتەوە، ئەمەش کارێکی پێویستەو دەبێ خودا بیکات:

لەوەڵامدا دەڵێێین:

هەرکەس وا گومان ببات کە پێویستە لەسەر خودا کە هەموو مێروویەك زیندوو بکاتەوە کە کرابێت بەژێرپێوە، یان مێشوولەیەك کە فلیقێنرابێتەوە، (یان کێچ و ئەسپێ کە کوژرابن) تا لە بریتی ئەو ئازارەی دووچاری هاتوون پاداشتیان بداتەوە، ئەوە لەشەرعیش و لە ئەقڵیش دەرچووە، چونکە دەوترێت:

وەصفی پاداشت و زیدوکرنەوەو حەشرکردنیان بەوەی کە واجب بێت لەسەر خودا، ئەگەر مەبەستەکەیان ئەوەبێت کە بە نەکرنی ئەم کارانە زیانێك بە خودا دەگات (پەنا بەخودا)! ئەوە محاڵەو هەرگیز ڕاست نییە، ئەگەر مەبەستێکی تریشیان پێی هەیە، ئیتر لەو واتایە دەردەچێت کە وشـەی واجب دەیگرێتەوە.[١]

---

(١)وأما مارواه أحمد باسناد صحيح: **يقتَصُّ للخَلقِ بعضَهم مِن بَعضٍ حَتَّى للجَمَّاء مِن القَرناء وحتَّى للذرَّةِ مِن الذَّرَّة.** وهو في صحيح مسلم بلفظ: **لتؤدُّنَّ الحُقوقَ إلى أهلِها يَومَ القِيامَة حتَّى يُقادَ للشَّاةِ الجَلحاء مِنَ الشَّاة القَرناء** ، کەواتە بە پێی ئەم فەرموودانە تۆڵە لە گیانـدارانیش دەسـێنرێتەوە، بەئازاردانیـان بێـت یـان ئەو جـۆرە

# بنەمای حەوتەم

**ئەوەیە کە خودای گەورە دەتوانێت ئەوەی ئارەزوی لێیەتی بەبەندەکانی بیکات:**

هیچ شتێك پێویست نییە لەسەر خودا، وە لەسەری نییە چاودێری چاکترین کارو بەرژەوندی بکات بۆ بەندەکانی، وەك باسمان کرد، چونکە خودا هیچی لەسەر واجب نییە، بەڵکو ناچێتە هیچ ئەقڵێکەوە کە شتی لەسەر واجب بێت، ئەو هیچ کاتێك ڕوبەڕوی پرسیاری کەس نابێتەوەو هەموکەسێکیش ڕوبەڕوی پرسیاری خودا دەبێتەوە: ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ (٢٣/الأنبياء).

**خۆزگە دەمزانی:**

کەسێکی موعتەزیلی بەچی وەڵامدەداتەوە کە دەڵێت: پێویستە لەسەر خودا چی زیاتر شیاوو باشترەو لە بەرژەوەندی خەڵکدایە ئەوە بکات، دەربارەی ئەمە پرسیارێکی تایبەت دەخەینە بەرچاووی؟

ئەگەر گریمان ڕوبەڕوبوونەوەیەك لە دوارۆژدا کەوتە میانی منداڵێك و کوڕێکی باڵغ، کە بە موسوڵمانی مردبوون، ئەوە خودای گەورە لە پلەی باڵغەکە بەرز دەکاتەوە، وە فەزڵێکی زیاتری پێ دەدا بەسەر منداڵەکەدا، چونکە لە دوای باڵغ بوونی، زیاتر بە بڕواو تاعەتەوە ماندو بووەو، ئەم پاداشتەش لای موعتەزیلیەکان واجبەو دەبێت خودا پێی بدات.

بەڵام ئەگەر منداڵەکە وتی:

---

تۆڵەی خودا بۆیان دیاری دەکات، کە ئەقڵیش قەبوڵی دەکات، ئەوەندە هەیە بە واجمان نەزانیوە، وەك موعتەزلەکان بەلایانەوە پێویستە، ئەمەش باشترە کەوا بڵێین لەوەی کە بوترێت ئەم فەرمودانە خەبەری ناحادەو دەلالەتیان لەسەر واتاکانیان قەطعی نییە، چونکە بۆ بابەتی عەقیدە بەڵگەی قەطعی پێویستە.

بۆچی پلەی ئەوت بەرزکردۆتەوە بەسەرمدا؟!

لەوەڵامیدا خودا بفەرموێت: باڵغ بووەو کۆششی زیادی کردووەو طاعەتی کردووە.

منداڵەکە دەڵێت: تۆ لە منداڵیدا منت مراند، دەبوایە ژیانمت بەردەوام کردایە، تا منیش باڵغ ببوومایەو کۆششی خۆمم بکردایە، بەڕاستی لاتداوە لە عەدالەت کە زیادە فەزڵێکت لەگەڵ ئەودا کردووە، کە تەمەنت درێژ کردووە، بۆچی بایەخی زیاترت بەوداوە؟

خوای گەورەش بفەرموێت:

چونکە من دەمزانی ئەگەر تۆ گەورە ببویتایە یاخی دەبویت و شەریکت بۆخودا بڕیاردەدا! باشتر وابوو بۆتۆ کە بەمنداڵی بمردیتایە، (بەم شێوەیە موعتەزیلیەکان پۆزش دەهێننەوە بۆ خودای (عَزَّ وجَلْ)، لەمکاتەدا کافرەکانی ناو شیوو دۆڵەکانی خوارووی دۆزەخیش هاواردەکەن ئەی خودامان! ئایا نەتدەزانی ئێمە هەر کە باڵغ بووین دەبوینە گوناهبارێکی موشریك؟!

ئەی بۆچی لە منداڵیدا ئێمەتان نەکوشت؟ بابەم حاڵە نەگەیشتینایە و زووتر ئێمەت بمراندایە، کەمتر لەبەشی ئەو منداڵەیشت پێ بدایانایە ئێمە پێی ڕازی دەبوین؟

دەی باشە بەچی وەڵامی ئەو دۆزەخیانە دەدەنەوە؟!!

دیارە ئەوەی لەم حاڵەتەدا پێویستە کە بووترێت:

تەنها ئەوەیە کە دان بنێین بەوەدا، هەموو فرمانە خودایيەکان لەوە بەرزو شکۆمەندترن کە بچنە ژێر بیرو حوکم و پێوەری کەسانێکی ئەهلی ئیعتیزال، کە بۆ پرسە ئاساییەکانیش وەڵامیان پێ نییە، نەك بۆ ئەم بابەتە گرنگانە؟

**ئەگەرو تیان:**

هەرچەندێك خودای گەورە بتوانێت کە چاودێری بەرژەوەندی بەندەکانی بکات، لەپاشان هۆکاری سزادانی ئەوانی بەسەردا زاڵکردن، ئەوە بە کارێکی نەشیاو دادەنرێت، کە لەگەڵ حیکمەتی خوداییدا یەك ناگرنەوە.
ئێمەش دەڵێین: واتای قەبیح و ناپەسەند ئەوەیە:

کە لەگەڵ ئەو مەبەستەدا یەك نەگرێتەوە کە بەدوایدا دەگەڕێت. جاری واهەیە ئەوەی بەلای یەکێکەوە خراپە، بەلای یەکێکی ترەوە باشە، ئەگەر کارەکە گونجاو بێت لە گەڵ مەرامی یەکێکیاندا، نەك ئەوی تریان، تاوای لێ دێت هەندێك خاوەن کوژراوو دۆست و خاوەنەکانی کوژراوەکە پێیان ناخۆشە کابرای قاتڵ بکوژرێتەوە، وە دوژمنە کانیشی کوشتنی بکوژەکەیان پێ باش دەبێت.

کەواتە ئەگەر مەبەستیان لە وشەی قەبیح ئەوەبێت:

کە لەگەڵ ویستی خودادا یەك نەگرێتەوە، ئەوە کارێکی محاڵ و نەگونجاوە، چونکە خودا هیچ ویست و مەبەستێکی نییە، کەواتە شتی خراپ لەو ناوەشێتەوە، وەك چۆن کاری ستەمی لێ ناوەشێتەوە، چونکە هەرگیز لەموڵکی یەکێکی تردا

دەستێوەردانی نییە، تا بە ستەمکردن لەسەری بژمێررێت.

وە ئەگەر مەبەستیان لە وشەی ناشیرین و (قەبیح) ئەوەبێت:

کە لەگەڵ مەرامی کەسێکی تردا نەگونجێت و یەکنەگرێتەوە.. کەواتە بۆچی وتتان:

ئەوە بە ڕاستی بۆ خودا محاڵ دەبێت؟

ئایا ئەمە جگە لە بەجێ گەیاندنی حەزو ئارەزواتێك نەبێت، چی تری سەوزکردووە، کە لە هەموو ئەو ئەگەر و فەرەزیاتی ڕوبەڕوبوونەوەیەی لە موخاصەمەو شەڕەقسەی ئەهلی ئاگردا باسمان کرد، کە بە پێچەوانەی ئەو

مەبەستەوە شایەتی دەدەن؟

لەپاشان بزانە؛

کە واتای حەکیم: ئەوەیە کە زانابێت بە حەقیقەتی شتەکان، وە بەتوانا بێت لەسەر بتەوکردنی کردارەکانی بەپێی ئیرادەی خۆی، دەی ئەمە کەی لەسەری پێویست دەکات کە ڕیعایەتی باشترو (ئەصلەح)تر بکات بۆ بەندەکانی؟

بەڕاستی ئەوە حەکیمی ئێمەیە کە چاودێری باشترو ئەصلەح دەکات لەپێناوی نەفسی خۆیدا، بۆ ئەوەی سودێکی بۆ خۆی وەربگرێت و لە دونیادا ستایش بکرێت و لە دوارۆژیشدا پاداشت وەربگرێت، یان بەو هۆیەوە ئافەتێك لەخۆی دووربخاتەوە، کە هەموو ئەمانە محاڵن بدرێنە پاڵ خوداوە ﷻ .

## بنەمای هەشتەم:

بەڕاستی ناسینی خودای گەورە بە وە پێویست دەبێت کە خودا ﷻ بەخۆی و بەشەریعەتەکەی واجبیان کردووە نەك بەهۆی ئەقڵەوە.[1]

---

(١) ئەوەی پێویستە بڕوامان پێی هەبێت، کە ئەقڵ ناتوانێت سەربەخۆ دەرك بەو کردن و نەکردنی فەرمانە شەرعییەکان بکات، تۆڵەو پاداشتیش بەهۆی ئەقڵەوە وەرناگیرێن و نازانرێن، وە جوانی و ناشیرینی کردەوەیش (حوسن و قوبح) بەهۆی ئەقڵەوە دیاری ناکرێت. ئەشعەریەکان هەموو هاوڕان لەسەر ئەوەی کە کردارەکان کە بە جوان و ناشیرین وەصفدار دەکرێن، نەك لەبەر خودی کردار و صیفەتەکانیانە، یان لەبەرهەندێك مەرامی تر کە پەیوەستە پێ یانەوە، بەڵکو لەو لایەنەوەیە کە خیطابی شەرعی ڕویان تێدەکات، ئەگەر نەهی خودایی ڕوی تێکردن، ئەوە کارێکی ناپەسەندە، وەئەگەر نەهی لێ نەکردبێت ئەوە باشە،کە ڕای موعتەزیلەکان پێچەوانەیەو ڕایان وایە کە ئەقڵ جوانی و ناشیرین ی کردەوەکان دیاری دەکات. بنوارە: الإتحاف٢/١٩٠.

بە پێچەوانەی موعتەزیلەکانەوە ، هەرچەندە ئەقڵ بە پێویستی زانیوە کە بەندە گوێ ڕایەڵ بێت، ئەمەش لەم دوو خاڵەیە بەدەر نییە:

یان ئەقڵ طاعەتی واجب کردووە، بەبێ ئەوەی هیچ سوودێك بگەیێنێت، کە ئەمەش محاڵە؛ چونکە ئەقڵ بە هەوانتە و بەلاش شتێك واجب ناکات،بەڵکو لەبەر مەبەست و سوودێکی تایبەت پێویستی دەکات، ئەمەش بەدەر نییە لەم چەند ئەگەرە:

یان ئەو سوودێ گەیاندنە دەگەڕێتەوە بۆ پەرستراو(مەعبود)کە، ئەمەش محاڵە لەحەققی خودادا، (چونکە بە نیسبەت خوداوە هیچ شتێك ناتوانێت سوودی پێ بگەیێنێت، وەخۆیشی پێویستی بە یارمەتی هیچ کەسێك نییە) بەڵکو بەرامبەر بە خودای گەورە کوفر و ئیمان و، گوێڕایەڵی و تاوانکاری هەمووی یەکسانە.

یان سوود گەیاندنەکە دەگەڕێتەوە بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەندەکان، ئەمەش هەر محاڵە، چونکە لەو کاتەدا ماندو دەبێت و بە هۆیەوە وازیش لە ئارەزوات دەهێنێت نەك سوودی پێ بگەیێنێت، لە داهاتوویشدا تەنها پاداشت و تۆڵە چاوەنواڕی دەکات، دەی کێ ئەم زانیاییەی بەو بەندە داوە، کە خودا ﷻ لەسەر گوێڕایەڵی و ناسینی خۆی پاداشتی دەداتەوە و تۆڵەی لێ ناسەنێتەوە، خۆ بە زانیاری و زانستیش ئەم بابەتە نازانرێت، چونکە طاعەت و تاوان لە حەققی خودادا یەکسانن، چونکە خودا مەیل و حەزی تایبەتی بۆ هیچ یەکێك لەو دوانە نییە و، هیچ یەکێکیان تایبەتمەندییەکی نییە بۆ خودا، کەواتە ئەم زانیاریانە تەنها لە ڕێگەی شەرعەوە زانراوەو ئەقڵ هیچ زانیارییەکی پێ نادات.

بەڕاستی ئەو کەسە پێی خلیسکاوەو ڕۆچووە لە هەڵەدا، کە ئەم بابەتە بەو شێوە لێك بداتەوە، ئەوەی بۆ خودابڕیارە، بە هەمان پێوەر قیاسی خەڵکیشی لەسەر بکات، چونکە خەڵکی جیاوازی دەبینن لە میانی کوفرو ئیمانهێناندا، کە

بەیەکێکیان خۆشی وفەریحی ودڵهەژان و چێژی پێ دەگات نەك بەوی تریان،

ئەگەر وتیان: مادەم سەیرکردن و ناسینی خوداو زانینی ئەحکام بەبێ شەرع واجب نابێت، شەرعیش بەبێ سەیرکردن و لێکدانەوەی ئەقڵ بە ئەنجام ناگات، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ موعجیزەی خۆیی ئاشکراکردوو، داوایشی لە ئەهلی تەکلیف کرد کە سەرنجی بدەن و بڕوای پێ بکەن، ئەو کاتە موکەللەفەکە بە پێغەمبەر دەڵێت:

ئەقڵ واجبی نەکردووە لە سەرم سەیر بکەم، ڕاستی و درووستی شەرعیشم بۆ دەرناکەوێت بەهۆی ئەقڵەوە نەبێت، وە منیش ناگەڕێمەوە بۆ ئەقڵ مادام شەرع ئەو گەڕانەوەی بە پێویست نەزانیوە، کەواتە لەم بۆشاییەدا دەسوڕێنەوەو ناگەنە ئامانج و، یەك چاوەنواڕی یەك دەکەن و، بەم شێوە دەور ڕو دەدات و، بەمەیش پێغەمبەر ﷺ بێ بەڵگە دەمێنێتەوە!

**دەڵێین:** ئەمە وەك قسەی ئەوکەسەیە کە کابرایەکی ڕاوەستاو لە جێگەیەکدا دەڵێت: لە پشتی تۆوە دڕندەیەکی زیانبەخشی لێ یە، ئەگەر بە خێرایی جێگەکە چۆڵ نەکەیت دەتکوژێت، وەئەگەر لات کردوە بۆ دواوەو سەرنجت دا ئەوا ڕاستی قسەکەی منت بۆ دەردەکەوێت. کابرای وەستاویش لەوەڵامیدا بڵێت:

کەواتە تامن لانەکەمەوەو سەیری پشتی خۆم نەکەم ڕاستی قسەی تۆم بۆ دەرناکەوێت، وە تا بۆیشم دەرنەکەوێت کە تۆ ڕاست دەکەیت ئەوە نەدەگەڕێمە دواوەو نە لایشدەکەمەوە! بەڕاستی ئەم وەڵامدانەوەیە نیشانەیە لە سەر نەفاێتی ئەو کەسە، وە ئەو قسانەی سەری دەخوات، وە هیچ زیانێکیش بەو کەسە ناگات کە ڕێنمایی کردووەو ئەو بەگوێی نەکراوە.

هەر بەم شێوەیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

مردنێك لە دواتانەوەیە، وە لەو ڕێگایەشدا دڕندەی زیانبەخشی تێدایە، وە ئاگری سوتێنەریش لە دواتانەوەیە، ئەگەر فریای خۆتان نەکەون و ئامادەباشی

بۆ نەکەن، وە سەرنج نەدەن لە موعجیزەکانم تا ڕاستگۆیی منتان بۆ دەردەکەوێت،(ئەوا خەسارەت مەند دەبن) ئەوەی بەم شێوە سەرنجی داو باوەڕی کرد، ڕاستی دەزانێت و خۆیشی دەپارێزێت و ڕزگاریشی دەبێت، ئەوەش لانەکاتەوەو سووربێت لەسەر هەڵوێستی عینادیی خۆی، ئەوا لەناودەچێت و سەربەرەوخواردەبێتەوەو ملی خۆیشی بەشکاندەدات. [1]،

(١) ئیبن و هومام دەڵێت: بزانە کە شوێنی هاوڕایی(محەلی ئیتیفاق) لەمیانی زاناکاندا لە سەر حوسن و قوبحی عەقلی، زانینی ئەقڵ بە خراپی کارەکە بە واتای صیفەتی نەقص و کەمو کورییەکەیەتی، وە جوانییەکەیشی واتە: صیفەتی کەماڵی کارەکە، زۆر جار واڕێ دەکەوێت گەورە زانایانی ئەشعەریش دەکەونە سەرسوڕمان و هەڵەوە، کە محەلی نیزاعەکە لە مەسەلەی تەحسین و تەقبیحی ئەقڵیدا نازانن، لەبەر ئەوەی زۆریان دووبارە کردۆتەوە، کە لە هیچ شتێکدا بە ئەقڵ جوان و ناشیرینی نازانرێت، ئیتر ئەو جێگەیان لەبیر کردووە کە هەموان هاوڕان، کە ئەقڵیش ڕۆڵی هەیە تیایدا، تەنانەت هەندێکیان ئەوەندە سەرسام بوون لە بارەی ئەوەی کە محاڵە درۆ بدرێتە پاڵ خوداوە، چونکە ئەمە نەقصێکە ڕووبەڕوی دەبێتەوە، ئەوەش مەگەر بەڕای موعتەزیلەکان ئەم ڕاستییەمان بۆ دەر بکەوێت، کەمحاڵبوونی نەقص کە بدرێتە پاڵ خودای (عَزَّ وجَلْ) تەنها عەقڵ سەلماندوویەتی کە خراپە!
کەواتە ئەگەر وتیان کێشەکە لەوەدایە، کە حوسن و قوبح بەنیسبەت کرداری بەندەکانەوەیە نەك بدرێتە پاڵ خودا، دەڵێم: جیاوازی ڕا لە میانی ئەشعەری و ئەوانی تردا لەوەدایە، کە هەرچی وەصفی نەقص و کەمیی بووبێت لە حەقی بەندەکاندا، ئەوە خودای (عَزَّ وجَلْ) مونەززەهە لەو نەقصانە، وە محاڵە ئەو صیفەتەی بدرێتە پاڵ، درۆکردنیش صیفەتێکی نەقصە بۆ ئادەمیزاد، ئیتر چۆن دەکرێت بدرێتە پاڵ خودا(پەنابەخودا)؟!

**ئەگەر وتیان:** قایل نابین ، چونکە درۆ کردن صیفەتی نەقصە بۆ هەموویان، چونکە جاری واهەیە باشترو جوانتریش وایە کە درۆبکات، وە هەندێك جار درۆ نەقص نییە بەڵکو واجبە، بە تایبەتی لە هەواڵداندا، ئەگەر یەکێك خۆی کرد بە ماڵێکدا و کابرایەك بە دوایەوە بوو بیکوژێت و پرسیاری لە خاوەن ماڵ کرد دەربارەی ئەو ڕاکردووە، دەبێ درۆی لەگەڵ بکات، نابێت ڕاستی پێ بڵێت و کابرا بدا بەکوشت، کەواتە لەوحاڵەتانەدا درۆکردن بوو بەفرمانێکی واجب، خۆ ئاشکرایە درۆ صیفەتێکی نەقصە لەلای ئاقڵەکان، بەڵام لەم کاتەدا هۆکارێکی لاوەکی پەیدبوو، حوکمەکەی گۆڕیوە، چونکە ئەو شەخصە کە پرسیاری لێ دەکرێت و ناچار دەبێت کەدرۆ بکات، لەبەر بێ دەستەلاتییەتی، خۆ ئەگەر بیتوانیایە ڕاستیش بڵێت و بێ منەتیش بێت لەکابرای پرسیارکەر، ئەوا چاکتر وابوو درۆکەنەکات، بەڵام ئایا خودا قیاس دەکرێتە سەر ئەو بەندە لاوازە، کەواتە: خودا بێ ئیحتیاجە لەهەموان و، کەسیش ناتوانێت ناچاری بکات بۆ درۆ کردن(حاشا لەوزاتە)، بۆیە لە هەموو حاڵەتێکدا نابێت باسی ئەوە بکەین کە درۆ کردن صیفەتێکی نەقصەو، بەهۆی بەڵگەی موعتەزیلەکان نەبوایە ئەم بەرگریەمان لە خودا بۆ نەدەکرا، بەڵکە دەبێت بزانین کە محاڵە ئەو صیفەتە نەقصە هەر لەسەرەتاوە بدەینە پاڵ زاتی پەروەردگار. دووبابەتی گرنگ هەیە لەبارەی دامەزراندنی عەقیدەوە کە باسیان نەکەراوەو شێخی زوبەیدی بەدرێژی باسیان دەکات و ئێمەیش کورتیان دەکەینەوە:

**یەکەمیان:** بە بڕوای ئەهلی سوننەت و جەماعەت خودا ﷻ هیچ کارێك بۆ غەرەزێکی تایبەتی نایکات، ئەگەر وابکات کەواتە بەخۆی ناقیصەو دەیەوێت بەو کارە خۆی تەواو بکات، کە ئەمەش محاڵە لە حەقی خودادا. هەروەها کارەکانی خودا لە پێناوی ئەوەدا نییە کە بەندەکان بگەن یان نەگەن بە بەرژەوەندی خۆیان، چونکە ئەو دوو بابەتە لای خودا ئەگەر یەکسانە، کەواتە ناکرێت ببێتە

ئامـانجێکی خـودایی، چـونکه بەبـێ پێویسـت و (مورەججیح)بارسـەنگی لایەك بەسـەر لاکەی تـردا درووسـت نیـیه، وە ئەگەر کـرداری عەبـدەکە لای خـودا یەکسـان نەبێـت، بەو شـێوەی کە بەرژەوەنـدی بەنـدەکەی لاگرنگتـر بێـت، ئەوە دەبێـت بەرژەوەنـدییەکەی بـۆ تەواو بکـات، ئەمەش کۆتـا نـایەت . دەشـزانین کە خـودا بە بـێ بـوونی ئەو غەرەزەش دەتوانێـت ئەوەی بیەوێـت بکـات، کەواتە چپێویسـتی بەو هۆکـارە بـوو کە دەزانـین شـتی عەبەس و بێ بـایەخیش لە حەقی خودادا محاڵە.

**دووهەم:** دیسـان ئەهلی سـوننەت و جەمـاعەت هـاوڕان کە خـودا تەنهـا لەبەر ڕەحمەتـی خـۆی ئـێمەی درووسـت کـردووە، ئەوەی ئیطـاعەی هەبێـت دەیخـاتە بەهەشـتەوە، بە بێ ئەوەی طـاعەتەکە عیللەتـی چـوونە بەهەشـت بێـت، بەڵکـو تەنهـا بە فەزڵی خـودایە، وە ئەوەش بێگوێی بکـات، ئەوە دەخـرێتە نـاو ئـاگرەوە بە پێی عەدلی خودا، بەبێ ئەوەی کە طاعەتەکە هۆکاری چوونە ناو بەهەشت بێت ، یان بێ ئەمرییەکە عیللەتی چوونە ناو ئاگر بێت، بەڵکە هۆکاری هەمووی ئەوەیە کە خـودا ئەو حـاڵەتەی بۆ تـایبەت کـردوون، بە پێـی ئیـرادەو حیکمەت و ئارەزوی خـۆی، کەواتە کردەوکـان تەنهـا نیشـانەی ئەو حـاڵەتەن کە لەپاداشـت و تـۆڵە ڕوبەڕوی دەبـنەوە، لە بەختیـاری و بەدبەختـی، بـۆیە زانایـان کۆدەنگیـان هەیە لەسـەر ئەوەی کە هەرکەسێك بە کـرداری خۆیدا بنازێت ئەوە بە شـیرکی خەفی و شـاراوە لەسـەری حیسـابە، وە ئەگەر کردەوەکان مـوجیبی چـوونە نـاو بەهەشـت بن، ئەوا پێویسـت بـوو کە پشـتیان پێ بسـپێررێت، وەك شـێخی زوبەیدی نەقڵی فەرموودەکانیان دەکات و دەفەرموون:

**وفي الفقه الأوسط للامام أبي حنيفة رحمه الله تعالى: وحق الله عليهم أن يعبدوهُ ولا يشركوا بهِ شيئاً. فإذا فعلوا ذلك فحقُّهم عليه أن يُغفر لهم ويثيبَهم عليهِ فأشار بالجُملة الأخيرة إلى أن الاعمال لو كانت سبباً موجباً للاثابة والعقاب لما**

کەواتە شەرع دەزانێت کە دڕندە ترسناکە زیانبەخشەکان لە دوای مردن ئێخەی پێ دەگرن، بەهۆی ئەقڵەوە دەتوانیت بزانێت سوودی قسەکانی چییەو چۆن لە داهاتوودا دەتوانێت کارێك بکات کە سوود مەند بێت، سرووشتی مرۆڤیش هانی دەدات کە حەزەر وەربگرێت کە خۆی لەو زیانانە بەدوور بگرێت، وە دەزانێت: مانای ئەوەی ئەو شتە پێویستە کە بکرێت، واتە ئەگەر نەیکات زیانی پێ دەگات، مانای ئەوەیش کە شەرع شت واجب دەکات: چونکە شەرعەکە ئەو زیانەت دەخاتە بەرچاوو پێت دەناسێنێت کە چاوەنوارِ دەکات، بەڕاستی ئەقڵ هەرگیز بەو داهاتووە نازانێت کە لەدوای مردن چی بەسەردێت، ئەگەر شوێنی ئارەزوات بکەوێت. ئەمەیە مانای جیاوازی لە میانی شەرع و ئەقڵدا، وە کاریگەریەکانیان لە دیاری کردنی واجب و پێویستیەکان، وە ئەگەر ترسی تۆڵەی نەبوایە لەبەرامبەر وازهێنان لەو شتانەی کە فەرمانی پێ دراوە، ئەو کاتە فەرمانە واجب و پێویستەکە جێگیر نەدەبوو، چونکە هیچ مانایەك نامێنێتەوە بۆ وشەی واجب، مەگەر ئەوندە نەبێت کە نەکردنی ئەو واجبەخاوەنەکەی دووچاری زیانێك دەکاتەوە لە ئاخیرەتدا.

---

**تخلف، واللازم باطلٌ لثبوتِ العَفو والمَغفرة في البعض كما في التوبة اتفاقاً، وثبوت الهدم والاحباط عمَّن عاش على الكفر ثم أمن أو علَى الإيمان ثم كَفر، واشتراط المَوت على ذلك للاستحقاق يُبطل الاستحقاق أصلاً، لعدم الشرط عند تحقق العلة وانقضاء العلة عند تحققه كما في شرح المقاصد. والمحدِّث يتَمسَّك بقوله ﷺ إعملوا فكُلٌّ مُيسَّر لما خُلِقَ لَه، وقولُه ﷺ لَن يَدخُلَ أَحدكم الجنَّةَ بعَملِه قالوا ولا أنتَ يا رسُولَ الله قال وَلا أنا إلاَّ أَنْ يتَغمَّدَنيَ اللهُ برَحمَتِه. عورەفا دەڵێن: ئەوەی گەیشتە متمانە، کە بەهۆی بەندایەتییەوە هیچی نییە مەگەر بە فەزڵی خودا، ئەوە لە عبوودییەت تێ گەیشتووە، وإلاَّ لَو كانَ شئٌ يوجبُ الحظوة غير الفضل لكان مُنازعا للسيد في سِيادته. والله أعلم بنوارە: الإتحاف ٢/١٩٧.**

# بنەمای نۆیەم:

دەبێ بڕوای وابێت کە ناردنی پێغەمبەران(سەلامی خودایان لەسەر) محاڵ نییە:
بەپێچەوانەی ڕای (بەراهیمە)و صائیبەکانەوە [1]، کە دەڵێن:

ناردنی پێغەمبەران هیچ سوودێکی نییە، بەهۆی ئەقڵەوە دەتوانرێت بۆشایی ئەوان پڕبکرێتەوە، ئەم قسەشیان ڕەد دەکرێتەوە، چونکە ئەقڵ ناتوانێت ڕێنومایی مرۆڤ بکات بۆ ئەوکردارانەی کە دەبێتە مایەی ڕزگاربوونی لە دوارۆژدا، وەك چۆن لەدونیایشدا بەهۆی ئەقڵەوە دەرمانی سوودبەخشیشت دەسناکەوێت.

کەواتە پێویستی خەڵکی بۆ پێغەمبەران، وەك پێویستییانە بۆ دکتۆرو چارەسەریەکان، بەڵام ڕاستگۆیی پزیشك بەهۆی تاقیکردنەوەوە دەزانرێت ، وە ڕاستگۆیی پێغەمبەران بەهۆی موعجیزەوە دەزانرێت.

# بنەمای دەیەم:

بەڕاستی خودای گەورە ﷻ حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری ﷺ ڕەوانە کردووە بەکۆتا پێغەمبەران، وە ئاینەکەی هەموو شەریعەتە پێشووەکانی پێشووتر هەڵدەوەشێنێتەوە، وەك شەریعەتی جولەکەو گاور و صابیئەکان.
وە پشتڕاستی کردۆتەوە بە چەندین موعجیزەی ئاشکراو ئایات و بەڵگەی بەهێزو سەرسوڕهێنەر، وەك دوولەتکردنی مانگ و [2]،

---

(١)بەراهیمە: تاقمێکن لە حوکەما هیندییەکان، واگومان دەبەن کە لەسەر دینی حەزرەتی ئیبراهیمن.(سەلامی خودای لەسە)

(٢) کە مانگ بووبەدوو پارچەوە لە مەککەدا، عن ابن مسعود رضي الله عنه قال:
**انشق القمر على عهد رسول الله ﷺ بمكة فلقَتينِ أى شِقَّين مُتباعدَينِ بحَيثُ**

---

**كانَ الجَبل بينهما، و كان ذلك في مقام التَّحدي فكان معجزة** كما في شرح المواقف. و الحديث متفق عليه من حديث أنس و ابن مسعود و ابن عباس ،البخاري(٣٦٣٧) ومسلم(٢٨٠٢) قاله العراقي. قال الزبيدي٢/٢٠٤: وأخرجه أحمد وأبو داوود الطيالسي و ابو عوانة و إسحق و عبد الرازق و الطبراني و ابن مردويه من حديث ابن مسعود و ابن عباس و البيهقي و ابو نعيم من حديث ابن مسعود و في رواية عن انس: **أن ذلك كان بعد سؤال المشركين** و في رواية ابي نعيم عن ابن مسعود: **لقد رأيت أحدَ شِقيهِ علَى الجَبل الذي بمُنى ونَحن بمكَّة** وقال ابن السُبكى أنه متواتر

(١)قال العراقي أخرجه البيهقي في دلائل النبوة من حديث أبى زر وقال صالح ابن الأخضر ليس بالحافظ و المحفوظ رواية رجل من بنى سليم لم يسم عن أبى زر اهـ. قال الزبيدي٢/٢٠٥: عبارة البيهقي في الدلائل كذا رواه صالح بن أبى الأخضر و لم يكن بالحافظ عن الزهرى عن سويد بن يزيد السلمي عن أبي ذر، و المحفوظ ما رواه شعيب عن أبى حمزة عن الزهري قال و ذكر الوليد بن سويدإن رجلاً من بنى سليم كبير السن اهـ. قلت: و هكذا أخرجه محمد بن يحيى الذهلي في الزهريات قال أخبرنا أبو اليمان أخبرنا شعيب عن أبي حمزة عن الزهري قال ذكر الوليد بن سويدان أن رجلاً من بني سليم كبير السن كان ممن أدرك أبا زر بالربذة عن أبى زر قال: **هجرت يوماً من الأيام فاذا النبي ﷺ قد خرج من بيته فسألت عنه الخادم فاخبرني أنه ببيت عائشة، فاتيتُه و هو جالس و ليس عنده أحدٌ من الناس، و كأني أرى حينئذ أنَّه في وهَنٍ، وسلَّمت عليهِ فردَّ علَيَّ السَلام ثم قال: ما جاءَ بكَ؟ قلتُ الله ورسولُه أعلَم، فأمَرنى أن أجلِس، فجَلسْتُ إلى جَنبهِ لا أسأله عَن شَئ إلاّ و يذكُره لي، فمكثتُ غيرَ كثيرٍ فجاءَ أبو بكر يمشى مُسرعاً فسَلَّم فَردَّ عَليهِ السلام، ثم قال: ما جاءَ بك؟ قال جاءَ بيَ اللهُ ورسولُه، فأشار بيَده أن إجلس، فجلسَ إلى رَبوَة مُقابل النبيَ ﷺ ثم جاء عُمر ففعَلَ مِثل ذلِك، وقال لهُ رسول الله ﷺ مثلَ ذلِك وجَلَس إلى جَنب أبي بكر، ثم جاءَ عُثمان كذلك، وجَلس إلى جنب عمر، ثم قبض رسول الله ﷺ على حَصياتٍ سَبع أو تِسع أو ما**

وه قسەکردن و بەگۆهاتنی گیانداری بێ زوبان ، [(١)]

---

قرُب مِن ذلكَ، فسبَّحْنَ في يَدهِ حتى سَمِع لهُنَّ حَنيناً كحَنين النَّحلِ في كفِّ رسولِ الله ﷺ، ثمَّ ناولهُنَّ أبا بكر وجاوزني. فسَبَّحن في كفِّه، ثمَّ أخذهُنَّ مِنهُ فوضَعَهنَّ في الأرض فخَرسْن، ثم ناولهُنَّ عُمر، فسبَّحنَ في كفِّه، ثمَّ ناولهُن عُثمان فسبَّحنَ في كفِّه، ثمَّ أخذهُنَّ منه فوضعهُنَّ في الأرض فخرسْن اهـ . و قال الحافظ ابن حجر قد اشتهر على الألسنة تسبيح الحَصى في كفِّه ﷺ أخرجه البزار والطبراني في الاوسط(٤٠١٩) وفي رواية الطبراني فسمع تسابيحهن مِن فيَ الحلقة، ثم دَفعهُنَّ إلينا فَلم يُسبِّحْنَ مَع أحدٍ مِنا. ثم ساق كلام البيهقي الذى اوردناه بتمامه، ثم قال: و ليس لهذا الحديث إلا هذه الطريق الواحدة مع ضعفها، لكنه مشهور عند الناس. وأمَّا تسبيح الطعام فقد أخرج البخاري من حديث ابن مسعود قال: كُنا ناكل مع النبي ﷺ الطعام و نحنُ نسمَع تَسبيح الطعام و في الشفاء عن جعفر بن محمد عن أبيه مرض النبي ﷺ فأتاه جبريل بطبق فيه رمان و عنب فاكلَ منه النبي ﷺ فسبَّح وأقرَّه الحافظ ابن حجر في الفتح

(١)و منه حديث العَجماء جبار قال العراقي و أخرج أحمد و البهقى باسناد صحيح من حديث يعلى بن مرة في البعير الذى شكا إلى النبي ﷺ أهله وقد ورد في كلام الضبِ والظبية والذئب والحمرة أحاديث رواها البيهقي في الدلائل اهـ ، قلت سياق حديث يعلى بن مرة الثقفي على ما أورده البغوي في شرح السنة هكذا: بينا نحن نسير مع النبي ﷺ إذ مرَّ بنا بَعيرٌ يسنى عليه فلما رآه البعير جرجر فوضع جرانه فوقف عليه النبي ﷺ فقال أين صاحب البعير؟ فجاءه فقال بعينه فقال بلى نهبهُ لَك يا رسول الله، وإنه لأهل بيت ما لهُم معيشة غيره، فقال أما ذكرت هذا من أمره فانه شكا كثرة العمل و قلة العَلف فاحسنوا إليه وروى للامام أحمد قصة اخرى بنحو ما تقدم من حديثه وسنده الضعيف و أخرج إبن شاهين في الدلائل عن عبد الله بن جعفر قال: أردفني رسول الله ﷺ ذات يوم خلفه فدخل حائط رجلٍ منَ الأنصار فاذا جمَلٌ فلما رأى النبي ﷺ حنَّ فذرفَت عيناه فأتاه النبي ﷺ

فمسح ذفراتَه، فسكن ثم قال: مَن ربُّ هذا الجَمل فجاءَ فتًى من الأنصار وقال هذا لى يا رسول الله، فقال ألاَ تتَّقي اللهَ في هذهِ البَهيمة؟ التي ملكك اللهُ إياها، فإنَّه شكا إلى إنَّكَ تُجيعهُ وتُذيبُه و هو حديث صحيح و رواه ابو داود عن موسى بن اسماعيل عن مهدى بن ميمون و روى أحمد و النسائي من حديث أنس رضي الله عنه: كان أهل بيت من الانصار لهم جل يسنون عليه و إنه استصعب عليهم فمنعهم ظهره و إن الأنصار جائوا إلى النبي ﷺ فقالوا: إنه كان لنا جَملا نسني عليه وإنه استصعب علينا، و منعَنا ظَهرَه و قَد عَطَش النَّخل و الزَّرع، فقال رسول الله ﷺ لأصحابه قوموا، فقامُوا فدَخلَ الحائطَ و الجَملُ في ناحيةٍ فمَشَى رسولُ الله ﷺ نحوَه فقالت الأنصار يارسول الله! قد صارَ مثل الكلب الكلب و إنا نخافُ عليك صولته فقال رسول الله ﷺ ليس عليَّ منه بأس، فلما نظرَ الجَملُ إلى رسولِ الله ﷺ أقبلَ نحوَه حتَّى خَرَّ ساجِداً بينَ يَديهِ فأخذَ رسولُ الله ﷺ بناصِيتهِ أذلَّ ما كان قط، حتى أدخلهُ في العَمَل، فقالَ لهُ أصحابه: يا رسول الله! هذهِ بَهيمة لا تعقل تَسجُد لكَ، ونحنُ نَعقِلُ فنَحنُ أحَقُّ أن نسجُد لكَ، فقال ﷺ لا يصلُح لِبشَر أن يَسجد لبشَرٍ لو صَلحَ لبَشرٍ أن يَسجُد لبَشر لأمرتُ المرأةَ أن تَسجُد لزَوجِها، مِن عِظَم حَقِّهِ عَليها، وقد روى من حديث ابن عمران أن رسول الله ﷺ كان في محفل من أصحابه إذ جاء أعرابى من بني سليم قد صاد ضَباً جعلَه في كهفٍ ليذهبَ به إلى رحلهِ فيَشويهُ ويأكله، فلمَّا رآى الجماعة قال: مَن هذا؟ قالوا نبيُّ الله، فأخرج الضبَّ مِن كَمِّه و قال: واللَّات و العُزى لا آمنتُ بكَ أو يُؤمن هذا الضبُّ، فأجابه بلِسان يسمَعُه القوم جميعاً: لبَّيك وسَعدَيك يا زين مَن وافى القيامة، قالَ مَن تَعبُد قال الذي في السَّماء عرشُه، و في الأرض سُلطانه، و في البحر سبيله، و في الجنة رحمتُه، و في النار عقابه، قال فمَن أنا؟ قال: رسول ربِّ العالمين وخاتم النبيين، وقَد أفلح مَن صدَّقكَ و خابَ مَن كذَّبَك فأسلَم الأعرابى... الحديث بطوله، وهو مطعون فيه، و قيل إنَّه مَوضوعٌ لكنَّ مُعْجزاته ﷺ فيها ما هو أبلغُ مِن هذا وليس فيه ما ينكر شرعاً خصوصا، وقد رواهُ الأئمة، فنهايتُه الضعف لا الوضع وأما حديث الظبية فأخرجه

یان وەك ئەو ئاوەی كە لە میانی پەنجەكانیەوە هاتە دەرەوە، [1]

---

البيهقي من طُرقٍ وضَعّه جماعة مِنَ الائمَّة، و ذكره عياض في الشفاء و رواه أبو نعيم في الدلائل باسناد فيه مجاهيل عن حبيب بن محصن عن أم سلمة الحديث بطوله، وفيه قالت يا **رسول الله صادَني هذا الأعرابى و لي خشفان في ذلك الجبل فاطلقني حتى أذهب و أرضعهما و أرجع** الخ. ورواه الطبراني بنحوه و المنذري في الترغيب و الترهيب من باب الزكاة و قال الحافظ بن كثير إنّه لا أصل له، و قال الحافظ السخاوي لكنه ورد في الجملة عدة أحاديث يقوى بعضها أوردها الحافظ بن حجر في المجلس الحادى و الستين من تخرج أحاديث المختصر.

(١)هـذه المعجـزة في عـدة مـواطن في مشـاهدَ عظيمـة و وردت مـن طـرق كثيـرة يفيـد مجموعها العلم القطعي المستفاد من التواتر المعنوي ولم يسمع بمثل هذه المعجزة عن غير نبينا ﷺ **حيث نبعَ من بين عظمه و عصبه ولحمه و دمه**، قال القرطبي و نقل ابن عبدالبر عن المزني أنه قال: **هو أبلغ من المعجزة من نبعه من الحجر، حيث ضربَه موسى عليه السلام بالعَصا فتفجَّرت منه المياة**، لان خروج الماء من الحجارة معهودٌ بخلافهِ من بين اللحم و الدم اهـ. وقدفات العراقي هذا الحديث فلم يذكره في تخريجه، و نحن نذكر بعون الله تعالى من رواه من الصحابة و من أخرجه رواه أنس و جابر و ابن مسعود و ابن عباس و أبو ليلى الانصاري و أبو رافع، أما حديث أنس فأخرجه الشيخان و البيهقي وابن شاهين لفظ الصحيحين: **رأيت رسول الله ﷺ و حانت صلاة العصر و آلتَمس الناس الوضوء فلم يجدوه فأتى رسول الله ﷺ بوضوء فوضع يدهُ في ذلكَ الإناء فأمر الناسَ أن يتوضَّؤوا منهُ. فرأيتُ الماءَ ينبع من بَين أصابعهِ فتَوضَّأ النَّاس حتى توضَّئوا مِن عندِ آخرهم**، و في لفظ للبخارى: **كانوا ثمانينَ رجلا** وفي لفظ له: **فجعلَ الماء ينبع من بين أصابعهِ و أطراف أصابعه حتى توضَّأ القوم فقلنا لأنس: كَم كُنتم؟ قالَ كنَّا ثلثمائة** وفي الصحيحين قال: **عطش الناس يوم الحديبية وكان رسول الله ﷺ بين يَديه ركوة يتوضأ منها و جهش الناس نحوَه فقال: مالكُم فقالوا يا رسول الله ليسَ عندنا ما نتوضأ. و لا ما**

وە لە نیشانەو بەڵگە ئاشكراكان، كە بەربەرەكانێ و تەحەددای هەموان و تەواوی عەرەبیشی پێكردووە، موعجیزەی قورئانی پیرۆزە، چونكە عەرەبەكان لەگەڵ ئەوەدا كە لەهەموان جیا دەكرانەوە بە فەصاحەت و قسەزانی و ڕەوانبێژییەوە، خۆیشیان كردە ئامانجی ڕاستەقینە، بۆ بەدیل گرتن و تاڵان كردن و كوشتن و دەركردنی پێغەمبەر ﷺ، وەك چۆن خودا ﷻ هەواڵی لێ داون، وە نەیانتوانی بەهاووێنەی خۆی ڕوبەڕوی ببنەوە، چونكە هەرگیز لە توانای ئادەمیزاددا نەبووە، كە ئەو تواناو ڕەوانبێژی و كورتی لەفزو زۆری واتاو ڕێكخستنی بابەتەكانی وەك قورئان شتێكی نوێ بهێننە ئاراوە، جگە لەوەی كە قورئان ئەو هەموو هەواڵانەی ئوممەتە پێشووەكانی لە خۆ گرتووە، كە كەسێكی نەخوێندەوار و نەشارەزا لە پەڕاوو نوسراوەكان، بەو هەموو جوانكارییە و، پڕیشی بێت لە هەواڵە غەیب و شاراوەكان، لە چەندین كارو فەرماندا، كە ڕاستی هەموویان لە داهاتوودا دەركەوت، وەك ئەوەی كە خودا فەرموویەتی: ﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ،﴾ فتح/٢٧.( واتە: بێگومان خودا ڕاستی كرد لەگەڵ پێغەمبەرەكەی

---

نشربهُ، إلا ما بينَ يديكَ، فوضعَ يدَه في الركوة، فجعلَ الماء يفُور من بَين أصابعهِ كامثالِ العُيون، فشَربنا وتَوضَّأنا، قلت: كَم كُنتم؟ قالوا: لو كُنا مائَة ألفٍ لكَفانا، كُنَّا خَمْسَ عشَرةَ مائة و لفظ البيهقي كنا مع رسول الله ﷺ في سفر فأصابنا عطش فجهشنا الى رسول الله ﷺ قال: فوضع يده في تور من ماء بين يديه، فجعل الماء ينبع من بين أصابعه كأنه العيون، قال: خُذوا بسم الله، فشَربنا فوسعنا و كفانا ولو كنا مائة الف لكفانا، قلتُ لجابر: كم كنتُم؟ قال: ألفاً وخمسمائة، و اما حديث ابن مسعود فاخرجه البخاري من طريق علقمة عنه و لفظه بينما نحن مع رسول الله ﷺ وليس معنا ماء فقال لنا رسول الله ﷺ اطلبوا مَن معهُ فُضل ماء فأُتي بماءٍ فصبَّه في اناء، ثم وضعَ كفَّه فيهِ فجعَل الماءُ ينبُع مِن بينِ أصابعهِ.

خۆی، لەو خەوە ڕاستەیدا کە دیبوی، کە بە گوێرەی ئەو خەوە بەئیزنی خودا ئێوە ئەمین و بێترس دەڕۆنە ناو (مەسجیدی حەرامەوە) وە هەندێکیشتان سەرتان دەتاشن و هەندێکیشتان مووی سەرتان کورت دەکەنەوە) [1]، کە هەموو ئەم هەواڵانەیش لە چەرخی پێغەمبەر ﷺ خۆیدا ڕویداوە، هەروەها قورئان فەرموویەتی:

﴿**الم، غُلِبَتِ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ، فِي بِضْعِ سِنِينَ**﴾ ،(الروم/١-٣).واتە: ڕۆمییەکان تێکشکان، لە وڵاتێکی نزیك لە وڵاتی عەرەبەوە، ئەم ڕۆمییانە پاش ئەم شکاندنەیان زاڵ دەبنەوە بەسەر ئەوانەدا کە شکاندبونیان، کە فارسەکانن، لە ماوەی چەند ساڵێکدا.)[2]،

## ڕوی دەلالەتکردنی موعجیزەکان لە سەر ڕاستگۆیی پێغەمبەران:

هەموو ئەوانەی لە توانای ئادەمی دا نییە، هەمووی کارو فیعلی خودایە، هەرکاتێك باشتر پەیوەست بێت بە تەحەددا و ڕوبەڕوبوونەوەوە، ئەوە لە جێی ئەوەیە کە بوترێت: ڕاستت وتووە، ئەمەش وەکو کەسێك لەبەردەم پادشایەکی زۆر گەورەدابێت، وایش بگەیێنێت بە ژێر دەستەکانی، کە ئەو نێردراوی پادشایە بۆ لایان، ئەوە بەڕاستی هەرچەندێك بڵێت بە پاشاکەیان:

ئەگەر من ڕاستم کردووە.. ئەوا لەسەر تەختەکەت سێ جار هەڵبستە و دابنیشەرەوە، بە پێچەوانەی نەریتی خۆت، مەلیکیش بە هەمان شێوە ئەو کارەی کرد، کەواتە ئامادەبووان دڵنیاییەکی تەواو وەردەگرن، وە بەزەروورەت دەزانن کە ئەم کارەی پادشا لە بەرامبەری ژێردەستەکانیدا لە شوێنی ئەوەدایە کە شایەتی بدات بەڕاستگۆیی نوێنەرەکەیدا، واتە: ڕاستت وت.

---

(١) خوڵاصەی تەفسیری نامی، ٥١٤.

(٢) هەمان سەرچاوە/٤٠٣)

# پایەی چوارەم: بیسراوەکان

## وە باوەڕکردن بە پێغەمبەرﷺ لەو هەواڵانەی کە داویەتی و کەلەڕێگەی بیستنەوە نەبێت ئەقڵ پێ یان نازانێت،

## بنەماکەیشی لەسەر دە پایە دامەزراوە

## بنەمای یەکەم: حەشر و نەشر[1]

شەرعی پیرۆز باسی حەشر و زیندوبوونەوە دەکات، کەڕاستەو دێتەجێ، پێویستە باوەڕیان پێ بهێنرێت، چونکە لە ئەقڵیشدا بوونی ئەو حەشرە دەگونجێت، واتە: گەڕانەوەی مرۆڤە دوای بەفەناچوون بۆ دووبارە ژیان، ئەمەش لە توانای خودادایە، وەك چۆن لە سەرەتاوە درووستی کردووە، ئاواش دەتوانێت زیندووی بکاتەوە، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (یس/٧٩.)

دەڵێت: کێ ئەو ئێسك و پرووسکە ڕزیوانە زیندوودەکاتەوە؟ تۆ پێیان بڵێ: ئەوەی یەکەمجار درووستی کردووە، کۆیان دەکاتەوەو گیاندەکاتەوە بەبەریاندا. کەواتە: ئەوەی کە لەسەرەتاوە درووستی کردووە، دەیکاتە بەڵگەی دووبارە گەڕانەوەو زیندووبوونەوەی، هەروەهاخودای(عَزَّوجَلَّ)فەرموویەتی:﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ (لقمان/٢٨)، واتە: درووست کردن و زیندوو کردنەوەی ئێوە لای خودا هەر ئەوەندەی درووستکردی یەك کەسی تێدەچێت. گەڕانەوەیش دووبارە درووستکردنەوەیەکی ترەو کارێکی مومکینەو دەگونجێت.

---

(١)بەڕاستی جەستەی ئادەمیزاد جگە لە(عجب الذنب) نەبێت. وەك لە صەحیحی ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئەحمەد و ئیبن حبان ڕیوایەتیان کردووە. هەمووی دەڕزن.

## بنەمای دووهەم: پرسیاری (نەکیر و مونکەر):[1]،

بوونی ئەم مەلائیکانە فەرموودەی حەزرەتیان ﷺ لەسەر هاتووە، پێویستە بڕوات پێی هەبێت، چونکە کارێکی مومکینەو محاڵ نییە، چونکە تەنها ئەوندەی دەوێت ژیان بگەڕێتەوە بۆ بەشێك لە جەستەی مرۆڤ، تا بتوانێت لە خیطاب و لێ پرسینەوە حاڵی ببێت، کە ئەمەش بۆ خۆی شتێکی گونجاوەو دەکرێت کە ڕوبدات، ئەوەش نابێتە ڕێگر کە جەستەی مردوو بە خامۆشی دەبینرێت و ئەو دەنگی لێ پرسینەوەیشی لێ نابیستین کە پرسیاری لێ دەکرێت، چونکە دەبینین کەسێکی نوستوو بەڕواڵەت خامۆشە و بێ جووڵەیە، بەڵام لە ناخیدا وریایەو ئاگای لە خۆیەتی، وە هەست بە ئازار و خۆشی و تام و چێژ دەکات، کە بەئاگاش دێتەوە هەست بە ئاسەواری ئەو خۆشی و ناخۆشیانە دەکات.

حەزرەتی پێغەمبەری خودا ﷺ وتەکانی حەزرەتی جوبرەئیلی دەبیست و خۆیشی دەبینی، بەڵام ئەوانەی لە چواردەوری بوون، نەخۆیان دەبینی و نەگوێبیستی قسەکانیشی دەبوون[2]، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت گەمارۆی هەموو زانستەکانی خودا بدات و، زانیاری بەسەر هەموویاندا هەبێت، کەواتە ئەگەر چاوو گوێی بۆ درووست نەکردنایە نەیاندەتوانی هیچ شتێك بزانن.

---

(١)فەرموودەکان کەلەسەری هاتوون: فاخرج الترمزي وصححه وابن حبان من حديث أبي هريرة رضى الله عنه: **إذا قُبر الميت، أو قال: أحدكُم أتاه ملكان أسوَدان أزرقَان يُقال لأحدهما المُنكر و الآخرُ النكير... الحديث. وفي الصحيحين من حديث أنس رضي الله عنه:**
**إن العبد إذا وُضع في قَبره وتولًى عنه أصحابه وأنه ليسمع قرع نعالهم، أتاد مَلكان فيقعدانه، الحديث..** وفى رواية البيهقي أتاه منكر ونكير وغيرهما من الاخبار الصحيحة.

(٢) وقد أخرج البخاري ومسلم من حديث عائشة رضي الله عنها : أنَّ رسول الله ﷺقال يوما: **يا عائشة هذا جبريل يقرئك السلام،فقلت: وعليه السلام تَرى مالا أرى** قال العراقي وهذا هو الأغلب و إلا فقد رآى جبريل جماعة من الصحابة منهم عمرو بن عبدالله وكعب وغيرهم اهـ

# بنەمای سێیەم: سزای گۆڕ(عەزابی قەبر)[1]

شەرعی پیرۆز باسی سزای قەبری کردووە، خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ (غافر/٤٦)[2]، واتە: ئەو سزا بەدو ناهەموارەی کە ئاگری دۆزەخە، بەیانی و ئێوارە دەبرێنە سەیرو تەماشای و، لەبەردەم ئەو ئاگرەدا گوزەریان پێ دەکەن، کە ڕۆژی قیامەتیش دێتە پێشەوە، لەلای خوداوە فەرمانێك دێت: کەوا دەست و دائیرەی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە[3]

(کەواتە پێش سزای دۆزەخ، سزایەکی تر هەیە کە ڕۆژانە ڕوبەڕوی دەبنەوە لە پاشاندا سزای دۆزەخ دێتە پێشەوە). پەناگرتنی پێغەمبەر ﷺ و سەلەفی صاڵحین لە سزای ناو گۆڕ دەنگی بڵاوبۆتەوە[4]، ئەمەیش کارێکی گونجاوەو

---

(١)ئەوە سزای (بەرزەخە) کە بە عەزابی قەبر ناودەبرێت، چونکە زیاتر لەوێدا سزای دەدرێت، ئەینا هەر مردوویەك خودا بیەوێت سزای بدات لەناو گۆڕدا بێت یاننا هەر دەیدات، کە جەستەو ڕۆحی مردوو دەگرێتەوە بە پێی کۆدەنگی زانا پسپۆڕەکانی ئەم مەیدانە، بنواڕە: إتحاف٢/٣٧.

(٢) قورئانی پیرۆزیش فەرموویەتی: ﴿مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا﴾، کەواتە قەومەکەی حەزرەتی نوح (علیه السلام) خودای گەورە نوقمی ناوەکەی کردن و یەکسەری خرانە ناو ئاگرەوە، واتە هەر کە مردن سزای قەبریان یەکسەر بۆ دەبێتە دۆزەخ، بەپێی بنەمای زمانەوانی پیتی(فاء)بۆ تەعقیب و خێراییە، بنواڕە: إتحاف٢/٢١٨

(٣) خولاصە:٤٧٢.

(٤) ئیمامی موسلیم ئەو فەرموودەی ڕیوایەت کردووە کە پیغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **تعَوذوا باللهِ مِن عَذابِ القَبر. قالوا: نَعوذُ باللهِ مِن عَذابِ القَبر.** وأخرجه البخاري ومسلم من حديث عائشة وأبي هريرة رضي الله عنهما، ولهما ايضا من حديث عائشة رفعَتْه: **إنَّكم تُفتَنُون أو تُعَذَّبون في قُبُوركم**، وعند مسلم: **إنَّ هذهِ الامَّة تُبتلى في قُبورِها فلولا أنْ لا**

محاڵ نییە، کەواتە پێویستە بڕوا بە بوونی ئەو سزایە بکرێت، ئەوەش نابێتە ڕێگری سزا کەمردووەکە گیانی پارچە پارچە بووبێت و بڵاوبێت لە ناو سکی دڕندە و جیقڵدانی پەلەورەکاندا، چونکە ئەوەی لە گیانی مرۆڤدا هەست بە ئازار دەکات هەندێك پارچەیە، کە خودا بیەوێت دەرك و هەستکردنی تێدا درووست دەکاتەوە.

## بنەمای چوارەم: کێشانەی کردەوەکان (میزان)

کێشانەی کردەوەکان لە دوارۆژدا ڕاستەو دەبێت بڕوامان پێی هەبێت، وەك خودا فەرمووی:﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ (أنبياء/٤٨) کەواتە کێشانەی پڕ لە دادگەری دادەنێین بۆ کردەوەکانتان لە ڕۆژی قیامەتدا، وەخودا فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ، وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَظْلِمُونَ﴾ (الأعراف/٩) جا هەر کەسێك کێشی کردەوەی چاکی قورس بێت، ئەوە هەر ئەوانەیە کە ڕزگاردەبێت، ئەوانەیش کە کێشی کردەوەی چاکەیان سووکە، ئەوە خۆیانیان دۆڕاندووە.[(١)]

وە ئەو ڕووەی کە پەڕەی کردەوەکانی لە سەر دادەنرێت و دەکێشرێت، خودای گەورە بەپێی پلەکانیان لەلای خۆی کیشانەیان بۆ دادەنێت، ئەو کاتە ئەندازەی کردەوەکانیان لای هەموان ئاشکرا دەبێت، بۆیشیان دەردەکەوێت کە لە ئەو پەڕی دادگەریەوەیە: کە دوچاری هەر سزاو تۆڵەیەك ببن، وە لە تەواوی فەزڵو میهرەبانی خوداوەیە کە لێبوردنی خودا بیانگرێتەوە و پاداشتی چەندقات بدرێتەوە.

---

تَدافَنُوا لَدَعوتُ الله أن يسمَعكُم مِن عذابِ القَبر الذي أسمع منه. ثم أقبل النبي ﷺ بوجههِ عليه فقال تعوذوا بالله من عذاب القبر. الإتحاف ٢١٨/٢.

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی/١٥١.

# بنەمای پێنجەم: پردی پەڕینەوە(صیراط)

کە پردێکە ڕاخراوە بەدرێژی بەسەر دۆزەخدا، لە مووباریکترەو لە شمشێر تیژ ترە، [١].

قورئانیش فەرموویەتی: ﴿**فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ، وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ**﴾ (الصافات/٢٤) کەواتە: ڕێنومایيان دەکەن و پێشیان دەخەن بۆ سەر پردی صیراط و، لەسەر پردەکە ڕایان دەوەستێنن بۆ لێ پرسینەوە، ئەمەش کارێکی گونجاوەو محاڵ نییە، پێویستە بڕوای پێی هەبێت، ئەوەی کە بتوانێت پەلەورەکان بە سەر هەوادا بفڕێنێت و نەکەونە خوارەوە، دەشتوانێت کە مرۆڤ بەسەر پردی پەڕینەوەی صیراطدا بەڕێ بخات[٢].

---

(١) درووست نییە وەك ڕای موعتەزیلەکان لێك بدرێتەوە کە ئەو باریکی و تیژییە کینایەیە لە دادگەری خودا، نەخێر ئەوە ڕاستییەو بە پێی کردەوەکانی کەم و زۆر ئەو پردەییش باریك و پان دەبێت.

(٢) وەك لە فەرموودەی ئیمامی موسلیم (١٨٣) لە ڕیوایەتی ئەبی سەعیدی خودرییەوە (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە، ورجَّحَ القُرطبي: أنَّ الذي يوزن الصحائف التي يُكتبُ فيها الاعمال، ونقل عن ابن عمر قال: ( **تُوزن صحائف الأعمالِ قال: فإذا ثبتَ هذا فالصحف أجسام فيرتفع الأشكال**)، ويقويه حديث البطاقة الذى أخرجه الترمزي وحسنه، والحاكم وصححه وفيه: فتوضَع السجلاتُ في كفِّة والبطاقة في كفَّة اهـ. والصحيح أن الاعمال هي التي توزن، وقد أخرج أبو داوود والترمزي وصححه ابن حبان عن ابي الدرداء عن النبى ﷺ قال: (**ما يوضع في الميزان يوم القيامة أثقل من خلُقٍ حَسَن**، وفي حديث جابر رفعَهُ: **تُوضعُ الموازين يوم القيامة فتُوزن الحسناتُ والسيئات فمَن رجَّحَت حسَناتُه على سَيئاته، قال: أولئك أصحاب الأعراف**)، أخرجه خُيثمة في فوائده، وعند ابن المبارك في الزهد عن ابن مسعود نحوه موقوفا، وقد ذهب المصنف في العقيدة الصغرى وهنا إلى أنَّ الموزون صحائف الاعمال بنوارِه الإتحاف،٢١٩/٢.

# بنەمای شەشەم:

## بەهەشت و ئاگری دۆزەخ مەخلوقن و درووست کراون

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾(آل عمران/١٣٣).

واتە: باس لەوە دەكات كە خێرا بكەن بچن بەدەم ئەو بەهەشتەوە، كە پانتاييەكەی بە ئەندازەی ئەرزو ئاسمانەكان دەبێت و، ئامادەكراوە بۆ تەقواكاران، كە فەرموویەتی :(أُعِدَّتْ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە درووست كراوە. پێویستە واتاكەی بە پێی زاهیری وشەو لەفزەكەی لێكی بدەیتەوە، چونكە هیچ محاڵ بوونێكی تێدا نییە كە ئێستا ئامادەكرابێت.

وە نابێ بووترێت: پێش ڕۆژی جەزاو پاداشت، چ سوودێك هەیە لە دروستكردنی بەهەشتدا ؟ چونكە خودای گەورە خۆی خاوەنی بڕیارەو هیچ كەس ناتوانێت پرسیاری لێ بكات، بەڵام هەموبان بەرپرسیان بەرامبەر بەخودا.

# بنەمای حەوتەم:

## ئیمامەتی حەق و ڕاستی دوای حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ

یەكەمین پێشەوا حەزرەتی ئەبوبەكرە و لەدوای ئەو حەزرەتی عومەر و لەپاشان حەزرەتی عوسمان، لە پاشان حەزرەتی عەلی (خودایان لێ ڕازی بێت).

حەزرەتی پێغەمبەر بەدەقێكی ڕون و ئاشكرا، ئیمامی دوای خۆی دیاری نەكردووە، ئەگەر ئەو فرمانەی دیاری بكردایە، باشتر دەردەكەوت لەو هەموو فرمانە تایبەتیانەی كە بۆ تاكە كەسەكان دەری دەكردو دایدەنان بە فەرماندەی مەیدانیی سەربازەكان، یان والی و سەرپەرشتیاری هەندێك لە ناوچەو وڵاتەكان، كەواتە ئەگەر بە ئاشكرا ئیمامەتی دیاری بكردایە چۆن شارایەوە؟ وە ئەگەر دیاربوایە، چۆن ئەوندە لە بیر چوویەوە تاوای لێ هات ئەو

فەرمانە نەگەیشتە ئێمە، کەواتە حەزرەتی ئەبوبەکر نەبوو بە ئیمام بەبێ هەڵبژاردن و بەیعەت پێکردن[1]، ئەوانەش کە وای ڕادەگەیێنن کە دەقێك هەیە لەسەر غەیری ئەبوبەکر، ئەوە نیسبەتی بێ فرمانی و پێچەوانکاری دەدەن لە هەموو صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ، وە ئەوانەن کە خەرقی ئیجماع دەکەن، وە لە کۆدەنگی زانایانی ئوممەت لادەدەن . ئەمەش جگە لە ڕەوافیزەکان کەس ناتوانێت جەربەزەیی و بێ سەلیقەیی وەها بنوێنێت[2].

وە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە لەسەر ئەوە دامەزراوە، کە هەمو صەحابە بە پاك و پاڵفتەکراو بزانن و ستایشیان بکەن، وەك چۆن خودای گەورەو پێغەمبەری خودا (صەڵات و سەلامی خودای لەسەر بێت) ستایشیان کردوون.

---

(١)وإن قُلنا أنه لم ينص على إمامته على أنَّ في الأخبار الواردة ماهو صريح في إمامته وهو اشارة وتلويح، فالأول مافي صحيح مسلم من حديث عائشة رفعته:( **ائتوني بدواة وقرطاس أكتب لأبي بكر كتابا لا يختلف فيه اثنان، ثم قال: يأبى الله والمسلمون إلاّ أبابكر)** وهو في صحيح البخاري من حديثها بمعناه، واما الثاني: وهو الاشارة، فإقامته مقامه في إمامة الصلاة، ولقد روجِعَ في ذلك كما في الصحيحين، وعند الترمزي، من حديثها رفعتهُ: **(لا ينبغي لقوم فيهم أبو بكر أن يؤمهم غيره)**. وعلى تقدير عدم النصِّ علَى إمامتهِ، ففي إجماع الصحابة غِنى عنه، إذ هُو في ثبوت مقتضاه أقوى من خبر الواحد في ثبوت ما تضمنه، وقد أجمعوا عليه غير أن علياً والعباس والزبير والمقداد لم يُبايعوا إلا ثالث يوم، واعتذروا باشتغالهم في أنفسهم بما أهمَّهم من وفاة رسول الله ﷺ فتم بذلك الإجماع على أنَّ تخلُّفَ مَن تخلَّفَ لم يَكُن قادحا فيها.

(٢) **ئەم تاقمە بۆیە ناوبران بە: ڕافیزە؟ چونکە فەرمانبەرداری پێشەوا زەیدی کوڕی عەلی نەبوون، کە فرمانی پێدان ئیتر نابێت جنێوو قسەی ناشیرین بە صەحابە بڵێن، کاتێك بە قسەی ئەویشیان زانی، وە زانییان کە ئێخەی خۆی هەڵناتەکێنێت لە ئەبوبەکر و عومەر، ئیتر ڕەفزی هەڵویستی ئەویان کرد و ناونران بە ڕافیزی.**
بنوارە إتحاف ٢/٢٢٣.

وە ئەوەش کەڕویدا لە میانی (حەزرەتی) عەلی و (حەزرەتی) معاویەدا (خودایان لێ ڕازی بێت) لەسەر بنەمای ئیجتیهادبوو، خۆ (حەزرەتی) معاویە کێشەی لەسەر ئیمامەت نەبووە لەگەڵ (حەزرەتی) عەلی دا، بەڵکو تەنها ئەوە بوو کە (حەزرەتی) عەلی (رضي الله عنه)وای گومان دەبرد کە بکوژەکانی حەزرەتی عوسمان تەسلیم بکاتەوە، لەگەڵ زۆری عەشرەت و هۆزەکەیان و تێکەڵییان لە ناو سەربازگادا، ئەوندەی تر ئاڵۆزی پەیدادەبێت لە کاروباری ئیمامەتدا، کە هێشتا لە سەرەتادایەو نەگیرساوەتەوە، ڕای وابوو دوای بخات باشتر و ڕاسترە، وە (حەزرەتی) معاویەش وای گومان دەبرد کە ماتڵکردنیان و نەدان بەدەستەوەیان لەگەڵ گەورەیی تاوانیاندا، وای لێ پەیدا دەبێت کەهەر کەسێك هەڵسێت و بێڕێزی و دژایەتی بە پێشەواکان بکات، و زیاتر خوێن ڕێژی لێ دەکەوێتەوە، گەورە زانایانیش لەم بابەتەوە فەرموویانە:

هەموو موجتەهیدێك بەدڵنیاییەوە لەسەر حەق بوون، وە هەندێکیش وا بۆی چوون: کە یەکێکیان هەقیان پێکاوە. بەڵام هیچ کەسێکی تێگەیشتوو هەڵوێستی (حەزرەتی) عەلی بەلاوە هەڵە نەبووە[١].

---

(١) بەڵکو ڕەحمەتی خودای لێ بێت ئەو ڕاستی پێکابوو لە ئیجتیهادەکەیدا، حافیظی زوبەیدی لە شێخ شەهابەددینی سوهرەوەردی نەقڵی دەکات کەلە کتێبەکەی (أعلام الهدى وعقيدة أرباب التقى)دا فەرموویەتی: ئەی کەسێك کە لە دەمارگیری و هەواپەرستی پارێزراویت: بزانە کە صەحابە ((رضي الله عنهم) لەگەڵ ئەوەدا کە دڵ پاك و سینە صاف بوون، ئەوانە بەشەر بوون، نەفسیان هەبووە، نەفسیش هەندێ صیفاتی هەیە کە دەردەکەوێت، ئەوانە نەفسیان ئەگەر بە شێوەیەکیش دەرکەوتایە دڵیان پێی ڕازی نەدەبوو، بۆیە دەگەڕانەوە بۆ حوکمی دڵەکانیان، وە پشتیان دەکردە ڕای نەفسەکانیان، هەندێکی کەم لە ئاسەواری ئەو حاڵەتە نەفسیانەیان گوێزرایەوە بۆ ئەوانەی نەفس پەروەر بوون، وەدڵیان مردوو بوو، هەست و نیستی دڵیان

# بنەمای هەشتەم:
## فەزڵ و گەورەیی صەحابەکان بە پێی یەك لەدوای یەکی بە خەلیفە بوونیانە.

(واتە: حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی خوایان لێ ڕازی بێت) [1]، چونکە حەقیقەتی گەورەیی ئەوەیە کەلای خوداوە گەورە بن، ئەوەش تەنها پێغەمبەری خودا ﷺ پێی ئاگادار دەبێت[1].

---

نەدەزانی، وایان لێ هات کە صیفاتەکانی نەفسیان، دەرکی ڕەگەزنامەی نەفسیەتی خۆیانی دەکرد و لەسەر ئەم بنەمایە هەڵس و کەوتەکانیان بە پێی زاهیری کردەوەکان دەکرد و، نەدەگەڕانەوە بۆ ناخ و ناوەرۆکی دڵیان، بۆیە کەوتنە ناو کۆمەڵێك بیدعەی ناهەموار و، بەرەو ڕێگای بەدبەختی بردن، تاڵاوی شەربەتی ژیانی پێ نۆشین. جا ئەگەر قەبوڵی ئامۆژگاری دەکەیت، تکایە زوبانت بگرە لە باسکردنیان. وا بکە خۆشەویستییەکەت بۆهەموویان یەکسان بێت، لەوە زیاتر بەدوای هەواڵ و بابەتە ئاڵۆزەکاندا مەگەڕێ، بادڵی خۆت لەدەست نەدەیت!! بۆ زیاتر بنوارە: الإتحاف ٢/٢٢٩.

(١) وەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە حەدیسی (عمرو بن العاص) کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ کێ لەهەمووکەس لای تۆ خۆشەویست ترە؟ (**قال: عائشة. فقلت مِن الرجال؟ قال: أبوها. قلت ثم من؟ قال عمر بن الخطاب. فعدَّ رجالا**)، وەپێشخستنیشی بۆ ئیمامەت، وەك (نافع) دەفەرموێت: نیشانەیە کە ئەفزەلی هەموویان بوو.

**وفي الصحيحين من حديث ابن عمر (من نُخيرُ بينَ الناس في زمان رسول الله ﷺ نُخير أبا بكر ثم عمر ثم عثمان) زاد الطبراني (فيبلغُ ذلك النبي ﷺ فلا يُنكرُه).**

کەواتە: ئەم یەك لەدوای یەکە لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسکراوەو نکوڵی لێ نەکردووە، وفیه ایضا من حديث محمد بن الحنيفة:

دەشزانین کە لە قورئانی پیرۆزدا ستایشی هەموویان کراوەو چەندین فەرموودەش لەم بارەوە هاتووە، وە تەنها ئەوانەی کە ئاگاداری دابەزینی وەحی و نیگا و قورئان بوون، شارەزان لەو فەزڵ و پلەو پایەیە، بە هۆی قەرینەو نیشانەی حاڵ ومقام و وردەکارییەکانی ژیانی ئەو سەردەمە.

ئەگەر ئەوان باشتر لەو بابەتانە تێ نەگەیشتنایە ئەوا بە خۆبەسەری نەیاندەتوانی کارەکان و تەرتیبی هەڵبژاردنی خەلیفەکان بەو شێوە ئەنجام بدەن، چونکە ئەوانە لە لۆمەی لۆمەکەران نەدەترسان، وە هیچ کەس نەیدەتوانی لە حەق و ڕاستی لایان بدات.

---

**قلت لأبي: أيُّ الناس خيرٌ بعد رسول الله ﷺ؟ فقال أبو بكر، فقلت: ثم من؟ قال عمر، وخشيت أن يقول عثمان، قلت: ثم أنت، قال ما أنا إلاَّ واحدا من المسلمين،** فهذا على نفسه مصرح بأنَّ أبا بكر أفضل الناس. کەواتە بەشەهادەتی حەزرەتی عەلیش هەروابووە، بنوارە: الإتحاف ٢٢٨/٢.

(١) وەك بوخاری ڕیوایەتی کردووە(٣٦٧٣)، وە موسلیم(٢٥٤٠)، بەمەرفوعی:

**((لاتسبُّوا أصحابي لا تَسُبُّوا أصحابي، فوا الذي نَفسي بيَدهِ؛ لَو أنفقَ أحَدكم مثل أُحُد ذهَباً ...ما أدرَكَ مُدَّ أحَدِهم ولا نَصيفَهُ، ))** وفي الترمذي: (٣٨٦٢) مرفوعاً:

**اللهَ اللهَ في أَصحابي لاتَتَّخِذوهُم غَرَضاً بَعدى، فَمن أَحبَّهُم فَبِحُبِّي أحبَّهُم، ومَن أَبغَضَهُم فَبِبُغضي أبغَضَهُم، ومَن آذاهُم فَقد آذاني ومَن آذاني فَقد آذى الله، ومَن آذى الله .. يوشَكُ أَن يأخُذَهُ))**. واتە: بۆ خاتری خودا باسی صەحابەکانی من مەکەن وازیان لێ بهێنن، ئەگەر کەسێك ئەزێتیان بدات ئەوە ئەزێتی منی داوە، ئەوەش ئازاری من بدات ئازاری خودای داوە، ئەوەش ئازاری خودا بدات زۆر نزیکە بەغەزەبی خۆی بیگرێت، ئەگەر ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕو ئاڵتون ببەخشنەوە، ناگەن بە مشتێك لە خێری ئەوان وا نەگەن بە نیوەیشیدا....

# بنەمای نۆیەم:
# مەرجەکانی ئیمامەت

مەرجەکانی ئیمامەت لەدوای موسوڵمانێتی؛ پێنج مەرجە: ١_دەبێ نێر بێت، ٢_خۆپارێزی و وەرعکردن، مەبەستی عەدالەتە وەك زۆربەیان لەسەرینی، ٣_ زانین، واتە: توانای ئیجتیهاد کردن، ٤_ کەفائەت، یان کیفایەت کە توانای هەبێت کاری ئیمامەت بە ڕێوە ببات. ٥_نەسەبی قورەیشی بێت[1]، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**الأئمَّةُ مِن قُريش**))[2]، واتە: ئیمامەکان

---

(١) قـوریـیش پشـتی یـازدەهەمی پێغەمبەرە ﷺ ئەولادی فەهـری کوڕی مـالیکی کوڕی نەضرە.

(٢) ئیمـامی نەسـائی ڕیـوایەتی کـردووە، لە: (السـنن الكبـرى) (٥٩٠٩) قـال العراقي: أخرجـه النسـائي مـن حـديث أنـس والحـاكم مـن حـديث علي وصححه اه قلت: وكـذا أخرجـه البخـاري في التـاريخ وابـو يعلي كلهـم مـن طريـق بكيـر الجـزري عـن أنـس، وأخرجـه الطيالسي والبزار والبخاري في التاريخ من طريق سعد بن ابراهيم عن أنس وفيه زيادة : (**ما إذا حكمُوا فعَدلوا**)، وأخرجه أحمد من حديث أبي هريرة وأبي بكر الصديق رضي الله عنهم بهذا اللفظ من غير زيادة ورجالهُ رجال الصحيح، لكن في سنده إنقطاع، وأخرجه الطبراني والحاكم وعنده ايضا من رواية قتادة عن انس بلفظ: **إن الملك في قريش**. الحديث..

وأخرج يعقوب ابن سفيان وابو يعلي والطبراني من طريق سكين بن عبد العزيز حدثنا سيار بن سلامة ابو المنهال قال دخلت مع ابي على أبي برزة الاسلمى فسمعته يقول: رسول الله ﷺ يقول: **الأمراءُ مِن قريش** الحديث... وأخرج البخاري في الصحيح من حديث ابن عمرو رفعَه: (**لا يزال هذا الأمر في قريش ما بقي مِنهم اثنان**).

---

وعند مسلم: **ما بقي من الناس اثنان.** وفي رواية الاسماعيلي: **(مابقي في الناس اثنان واشار بأصبعيه السبَّابة والوُسطى)**. وأخرج البهيقي من حديث جبير بن مطعم رفعه: **قدموا قُريشا ولا تقدموها**. وفي الباب حديث أبي هريرة رفعه: **(الناس تبعٌ لقريش في هذا الشأن)**. أخرجه البخاري من رواية المغيرة بن عبد الرحمن ومسلم من رواية سفيان بن عيينة، كلاهما عن الأعرج عن أبي هريرة. وأخرجه مسلم أيضا من رواية همام عن أبي هريرة، ولأحمد من رواية أبي سلمة عن أبي هريرة مثله. لكن قال: **في هذا الأمر** .

قال الحافظ ابن حجر في فتح الباري عند قوله: **إن هذا الأمر في قريش** مانصه: قال ابن المنير: وجه الدلالة من الحديث ليس من جهة تخصيص قُريش بالذكر، فانَّه يكون مفهوم نعت، ولا حُجةَ فيه عند المحققين، وإنما الحجة وقوع المبتدأ معرَّفاً باللام الجنسية، لان المبتدأ بالحقيقة هُنا هو الأمر الواقع صفة لهذا. وهذا لايوصف إلاَّ بالجنس، فمُقتضاه حصرُ جنسِ الأمرِ في قُريش، فيَصير كأنَّه قال: **إلاَّ في قريش**، وهو كقوله: **(الشُفعة فيما لم يُقسَم)**. والحديث وإن كان بِلفظ الخبر، فهو بمعنَى الأمر، كأنَّه قال: **إئتمُّوا بقُريش خاصة**. ينظر :الإتحاف ٢٣١/٢. ئەوەی جێگەی باسە: وشەی **الأئمة** موبتەدایە و ئەلفلامەکەی بۆ جینسە، واتە: هەموو ڕەگەزی ئیمەکان نابێت پەیدابن جگە لەوانەی کە قورەیشین، خەواریج و هەندێك لە موعتەزیلەکان بڕوایان وایە ئەگەر عەبدێکی حەبەشیش بێت، دەکرێت ببێت بە ئیمام، نازانن ئەو فەرموودەیە بۆ ئەوەیە کە ئیمام ئەگەر عەبدێکی حەبەشی کرد بە فەرمان ڕەوا دەبێت گوێی لێ بگیرێت، نەك ئیمامەکە بۆخۆیشی بەندەبێت. قاضی ئەبوبەکری باقلانی فەرموویەتی: هەرگیز موسوڵمانان لەم فەرموودە لایاننەداوە، وە کۆدەنگی هەموو زانایان و ڕای موسوڵمانان لەسەر چەسپاوە. بنوارە: الإتحاف٢٣١/٢.

دەبێت لە قورەیش بن، ئەگەر کۆمەڵێکی زۆریش کۆبوونەوە کە هەموو ئەو وەصفانەیان تێدا بوو، ئەو کاتە ئیمام و پێشەوای موسوڵمانان بەو کەسە دەوترێت کە لەلایەن زۆربەی موسوڵمانانەوە متمانەی وەرگرتووەو بەیعەتی ڕاستەقینەی پێکراوە. ئەوەش کە پێچەوانەی ڕای زۆربەی موسوڵمانان بوو، پێویستە بگێڕرێتەوە بۆ حەقق و ڕاستی و ژێر دەستەڵاتی ناوەندی خەلافەت.

## بنەمای دەیەم:

ئەگەر نەدەگونجا زانست و عەدالەت لەو کەسەدا بێتەدی کە خۆی بۆ خەلافەت کاندیدکردووە، وە لەبەربەرەکانێکردنیشیدا فیتنەیەکی گەورەی لێ دەکەوتەوەو کەس نەیدەتوانی بەبێ خوێن ڕشتن ڕوبەڕوی ببێتەوە، ئەوا حوکم و فەرمان دەدەین کە ئەو ئیمامەتە دامەزراوەو، دەبێت قسەوحوکمی بڕوات، چونکە ئێمە بەڵگە بهێنینەوە بۆ پاراستنی ئەو مەرجانەی کە بەرژەوندی گشتییان پێوە بەستراوە و، ببینە هۆکاری هەڵگیرساندنی فیتنەیەك، ئەوە ئەو زیانەی بەر موسوڵمانان دەکەوێت، زۆر زیاترە لەو فرمانانەی کە بەهۆی نوقسانی مەرجەکانی خەلافەتەوە دێتە ئاراوە، خۆ ئەصڵی بەرژەوەندییەکە بە هۆی زۆری مەزییەت و چاکەکانیەوە ناڕوخێت، بەڵکو وەك ئەو کەسەی لێ دێتەوە کە کۆشکێك درووست دەکات و شارێك وێران دەکات.[(١)]

---

(١)تجب طاعة الإمام عادلا كان أو جائرا لقوله تعالى **(وأولى الأمر منكم)** مالم يخالف حكم الشرع لما أخرج مسلم **(من خرج من الطاعة وفارق الجماعة مات ميتة جاهلية)**، وله أيضا من ولى عليه فرآه يأت شيئا من معصية الله تعالى فليكره ما يأتيه من معصية الله، ولا ينزعن يدا من طاعته.

ئێمەش ئەگەر حوکم بەوە بکەین شارەکەمان فەرمانڕەوایەکی باشی تێدا نەبێت، وە بڵێین: هەموو قەزیەو ڕوداوەکان فاسیدو تێکچووە، ئەمەش لەڕاستیدا کارێکی محاڵە، خۆ ئەگەر ئێمە لە جێیەك حوکممان دابێت بە درووستی قەزاوەتی ئەهلی (بەغی)، لەبەر ئەوەیە کە لە وڵاتەکەی خۆیاندا خەڵکێکی زۆر پێویستییان بەو قەزاوەت و حوکمڕانییە هەیە، ئیتر چۆن حوکم نادەین بە درووستی ئیمامەتیش بۆ کاتی زۆر پێویست و زەروری کە ئەهلمان دەست نەکەوێت؟!.

بۆیە ئەم چوار پایەی کەباسمان کردن کە هەموویان چل پایەی تەواون لە بایەکانی بنەمای باوەڕ، هەرکەسێك باوەڕی لەسەریان دابمەزرێت، ئەوە هاوڕایە لەگەڵ ڕاوبڕوای ئەهلی سوننەداو پێچەوانەی تەواوی ئەهلی بیدعە و گومڕاییە، خودایش بە یارمەتی خۆی بمانپارێزێت ،وە ڕێنومایی ڕێگای حەق و ڕاستیشمان بکات، بە فەزڵ و فراوانی کەرەم و لوطفی خۆی.

**وصلى اللهُ علَى سيِّدنا مُحمَّد وعَلى آلهِ وكلِّ عَبْد مُصطَفى.**

---

وللشيخين من كره من أميره شيئاً فليصبر فانه من خرج من السلطات شبراً مات ميتة جاهلية، وأما إذا خالف أحكام الشرع فلا طاعة لمخلوق في معصية الخالق، كما في البخارى والسنن الاربعة السمع والطاعة على المرء المسلم فيما أحب وكره مالم يؤمر بمعصية، وإلاَّ فلا سمعَ ولا طاعة.الإتحاف٢/٢٣٣.

# بەشی چوارەم

## لە بنەماکانی باوەڕ

## لە بارەی ئیمان و ئیسلامەوە

**وە باسی ئەوەی کە ئەم دوانە یەکن یان جیاوازی لەمیانیاندا هەیە**
**وە ئایا زیادوکەمیی ڕوڵە ئیمان دەکات، وە بەیانی ڕای سەلەف**
**لەسەر وتنی: من بڕوادارم ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت،**
**ئەمەش چەند پرس و باس و ڕونکردنەوەی لێ دەکەوێتەوە:**

## پرسێك

### ئایا ئیسلام ئەصڵی ئیمانەکەیە یان جیاوازە لێی؟

زانایان لەبارەی ئیسلامەوە جیاوازی بیرو ڕایان هەیە، ئایا ئیسلام خودی ئیمان و بڕواکەیە یان شتێکی ترە؟ ئەگەر ئیمان غەیری ئیسلام بێت: ئایا لێی جودایەو بە بێ ئەویش بوونی هەیە ، یان پەیوەنداریەتی و لێی جودانابێتەوە؟

**دەوترێت**: ئیمان و ئیسلام هەردوکیان یەك شتن.

هەندێکی تر دەڵێن: دوو شتن و بەیەك ناگەن.

ئەبوطالیبی مەککی لەم بارەوە بەدرێژی باسی لەسەر کردووەو شپرزەیی بە قسەکانیەوە دیارە[1]، بۆیە با لەسەرەتاوە ڕاستەو خۆ بچینە ناو بابەتەکەو بەلاڕێیدا نەبەین و، قسەی بێ سوود بەیان نەکەین و بڵێین:

---

(١) بنوارە: قوت القلوب٢/١٢٩.

## ئەم بابەتە سێ باسی لێ دەکەوێتەوە:

باسێك بۆ واتای وشەکان لەڕوی زمانەوانییەوە، وە باسێکی تر مەبەست لە ئیمـان و ئیسلام لە ڕوی شـەرعەوە وە باسی سێیەم: دەربارەی حوکمی هەردوکیان لە دونیاو دوارۆژدا. **باسی یەکەم** زمانەوانییە، **وەباسی دووهەم** تەفسیری و شیتەڵکردنەوەیە، وە **باسی سێیەم** فیقهی و شەرعییە.

# باسی یەکەم: بەپێی زمان چ واتایەك دەگەیێنن

ئەوەی ڕاستی بێت؛ ئیمان لەم ڕووەوە بەواتای تەصدیق و دان پێدانانە، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿**وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ**﴾ (یوسف/١٧)، واتە هەرچەندە ڕاستیش بکەین تۆ هەر باوەڕمان پێ ناکەیت

ئیسلامیش بریتییە لە قایل بوون و خۆبەدەستەوەدان بەوەی کە بەدڵنیاییەوە بڕوای پێ بکات و مل کەچی بۆ ئەو فرمانە بکات، وە لەدڵیشەوە هیچ نارەزاییەکی نەبێت، وە واز لە لاساری و لووت بەرزی و ڕق لێبوونەوەو بەربەرچدانەوەش بهێنێت. تەصدیقیش شوێنێکی تایبەتی هەیە تیایدا جێگیر دەبێت کە دڵە، وە زوبانیش تەرجومانی دڵیەتی، بەڵام تەسلیم بوونەکە گشتییەو، خۆبەدەستوەدانی دڵ و زوبان و ئەندامەکانی جەستەیش دەگرێتەوە، چونکە هەموو بڕواکردنێك بەدڵ، واتە: خۆبەدەستەوەدان و واز هێنان لە نکوڵی کردن و لووت بەرزی، وە بەزوبانیش دەبێت ددانی پێدا بنێت و بەئەندامەکانی جەستەیشی ملکەچی و گوێڕایەڵی پێوە دیار بێت.

کەواتە بە پێی بنەماکانی زمانەوانی: ئیسلام گشتییەو ئیمان تایبەتی ترە، وەك ئەوە وایە: کە ئیمان بریتی بێت لە بەزترین و بەرێزترین پارچەکانی ئیسلام. کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هەموو تەصدیقکردنێك بە ئیسلام، ئەوە تەسلیم بوونە، بەڵام هەموو تەسلیم بوونێك بە ئیسلام تەصدیق و باوەڕ پێکردن نییە.

# باسی دووهەم:

## ڕونکردنەوەی واتای ئیمان و ئیسلام لەڕووی شەرعەوە

ئەوەی ڕاستی بێت؛ لە شەرعدا هەردوو وشەکە وەك هاوتاو هاو واتای یەکتری بەکاری هێنراون، وە هەندێك جاریش بە جیاواز لە یەکتری لێکدراونەتەوە.

### نموونەی یەك واتاییان:

ئەوەیە کە لە قورئاندا هاتووە . ﴿**فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ**﴾ (الذاريات/ ٣٦)،

واتە: لەو گوندەدا هەموو ئیمانداره‌کانمان دەرهێنا، وە تەنها یەك ماڵی موسوڵمانمان تێدا بینییەوە، کە بە ڕای هەموو زانایان تەنها یەك ماڵی تێدابووە، کەواتە: بە بڕوادارو بە موسوڵمانیش ناوی بردوون، وەك ئەوەی ئیمان و ئیسلام یەك واتایان هەبێت. هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُسْلِمِينَ**﴾ (يونس/٨٤)واتە:

ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخودا هەیە، ئەوە پشت بەخودا ببەستن ئەگەر ئێوە موسوڵمانن.(دەبینین وشەی ئیمان و ئیسلام بوونی بە یەك واتا بەکار هێناوە). هەروەها پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (**بُنِيَ الإسلامُ علَى خَمسٍ**)[١].

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایەدامەزراوە،هەروەهاجارێکی تر پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد دەربارەی ئیمان، بەهەمان شێوە وەڵامی دایەوە[٢]،

---

(١) رواه البخاري (٨)، ومسلم(١٦)، وتمام الحديث: **شهادة أن لا اله الا الله وأن محمدا رسول الله، وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة والحج وصوم رمضان** قال العراقي أخرجاه من حديث ابن عمر اهـ قلت: أخرجاه في كتاب الايمان والبخاري وحده في التفسير أيضا من طريق عكرمة بن خالد عن ابن عمر،الإتحاف٢/٢٣٥.

(٢) رواه البخاري في (السنن الكبرى) ١٩٩/٤، قال العراقي أخرجه أحمد والبيهقي في الاعتقاد

**نموونەی جیاوازی :** ئەوەیە کە خودا فەرموویەتی:

﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾ (حجرات/١٤)

(ئەعرابە دەشتەکییەکان دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، پێیان بڵێ: ئێوە بڕواتان نەهێناوە، بەڵکو بڵێن: ئێمە موسوڵمان بووین). واتە: بەزاهیر تەسلیم بوین و خۆمانمان بەدەستەوەداوە ، لێرەدا مەبەستی لە بەکارهێنانی وشەی ئیمان ئەوەیە: کە تەنها بەدڵ بڕوای کردووە، وە واتای ئیسلامیش ئەوەیە کە: بە زوبان و ئەندامەکانی جەستە تەسلیم بووەو پابەندی لێ کردووە.

وە لە فەرموودەیەکی (حەزرەتی) جوبرەئیلدا (علیه السلام) هاتووە کە کاتێك پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئیمانەوە پرسیاری لێ کرد کە فەرمووی:

**((أن تُؤمن بالله وملائكتهِ وكُتُبهِ ورُسلهِ وبالبَعثِ بَعدَ المَوتِ وبالحِساب والقدرِ خيرِهِ وشرِّهِ))** واتە بڕواو ئیمان هێنان ئەوەیە کە بڕوات هەبێت بە خوداو فریشتەکانی و کتێبە ئاسمانیەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی قیامەت و زیندوبوونەوەی پاش مردن و لێپرسینەوە و قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕیەوە.

فەرمووی: ئەی ئیسلام کامەیە؟ ئەو پێنج خەصڵەتەی باس کرد [1] کەواتە دەستەواژەی ئیسلامی بەکارهێنا، مەبەستی ئەوەیە کە زاهیری جەستەی مرۆڤ لە گوفتار و کردار خۆی بدات بەدەستەوەو تەسلیمی فرمانی خودا ببێت.

وە لە فەرموودەی (حەزرەتی)سەعددا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ شتێکی بەخشی بە یەکێك و بەوی تریانی دەدا، سەعد فەرمووی:

---

من حديث ابن عباس في قصة وفد عبدالقيس تدرون ما الايمان؟: **شهادة أن لا اله الا الله وأن محمدا ﷺ** رسول الله. **وأن تُقيموا الصَّلاة وتؤتُوا الزكاة وتصُومُوا رمضان وتحُجُوا البيتَ الحرام**، والحديث في الصحيحين لكن ليس فيه ذكر الحج، وزاد: **وأن تؤدوا خمسا من الغنم** اه قلت: أخرجه البخاري في عشرة مواضع من كتابه. الإتحاف ٢٣٥/٢.

(١) رواه مسلم: (٨).

ئەی پێغەمبەری خودا؛ وازت لە فڵان کەس هێناو هیچت بەشنەدا، کە بڕواداریشە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أَوْ مُسْلِمٌ) یان تەنها موسوڵمانە، واتە: ئیمان جێگیر نەبووە لە دڵی داو تەنها تەسلیم بووە، لێی دووبارە کردەوە حەزرەتیش ﷺ بەهەمان شێوە وەڵامی دایەوە. (کەواتە: جیاوازی هەبوو لە میانی بڕوادارو تەسلیم بووندا).

**نموونەی هاوبەشی:** واتە ئیمان و ئیسلام وەك یەك وشە بەکار هاتبن و چووبن بە یەکدا، وەك ئەوەی کە دەگێڕنەوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا چ کردەوەیەك باشترەو خێری زیاترە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((الإسلام))، واتە: ئیسلامەتی، پرسیاری کرد: ئەی کام ئیسلام چاکترە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((الإيمان)) واتە: ئیمانداری. کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەر جیاوازی واتاو، بەیەکدا چوونی هەردوو وشەی ئیمان و ئیسلامیشە، کە بە جیاوازی واتا بەکارهاتوون و، لە جیاتی یەکتریش بەکاری هێناون، ئەمەش سەرکەوتووترین جۆری بەکارهێنانەکانیەتی کە لە زانستی زماندا بەکار هاتووە، چونکە بڕوا کردارێکە لەناو کردارەکاندا، وە گەورەو باشترینیشیانە، وە ئیسلام بوونیش بەواتای تەسلیم بوونە، یان بە دڵ، وەیان بە زوبان، وەیان بە ئەندامەکانی جەستە، باشترین جۆری ئیسلامەتی ئەوەیە کە بە دڵ بێت، کە ئەوەش بەو بڕواو تەصدیق کردنە دەڵێن کە پێی دەوترێت: ئیمان.

وە بەکارهێنانی بۆ واتای جودا، لەسەر ئەوەی کە جیاوازن لەیەکتری، یان لەسەر ئەو شێوەی کە چوون بەیەکداو یەك واتا دەگەێنن، یان لەسەر ئەو شێوەی کە وشەکان مورادیفی یەکترین،

(واتە: یەك مانای هەبێت و دوو لەفزی بۆ بەکار هاتبێت) هەموو ئەو جۆرە بەکار هێنانانە لە زمانی عەرەبیدا بە هەر سێ شێوەکەوە، تەنها ئەوەندەیە بەدرووست زانراوەو لەو سنوورە دەرناچێت.

**یەکەمیان واتە: جیاوازبن لەیەك:** واتاکانی( ئیمان و ئیسلام) جیاواز بن لە یەکتری: بەوەیە کە ئیمان بریتییە لە تەصدیق و بڕواکردن تەنها بەدڵ، کە لەگەڵ زانستی زمانیشدا گونجاوە. بەڵام ئیسلامبوون بەو واتایە: کە بە ئاشکرا موسوڵمان بوونی ڕابگەیێنێت، ئەمەیش لەگەڵ زانستی زماندا دەگونجێت، چونکە تەسلیم بوون بە هەندێك لەو بەش و بابەتانەی کەواتای خۆبەدەستەودان دەیگرێتەوە، وەك ئەوە وایە تەسلیم بە هەموو بەشەکانی بووبێت.[1] ،کەواتە مەرج نییە ناونانی شتێك بۆ ناوبراوەکەی، تەواوی بەشەکانی ناولێنراوەکە بگرێتەوە، واتە: هەموو محەل و شوێنەکەش نەگرێتەوە هەر درووستە ئەو ناوەی لێ نرابێت، بۆ نموونە: کەسێك دەستی لە شتێك بکەوێت، پێی دەوترێت لەمسی کردووە، واتە دەستی لێ داوە، ئیتر مەرج نییە دەستی لە هەموو ئەو جەستەکە دابێت کە دەستی بەری کەوتووە، کەواتە ئەگەر یەکێك بە ڕواڵەت و زاهیری موسوڵمان بووبێت، ئیمانەکەش لە ڕاستی دا لە دڵیدا جێگیر نەبوبێت، ئەوا ئاساییە کە پێی بوترێت موسوڵمان، ئەوە بە پێی زمانەوانی ناوەکە وەردەگرێت، چونکە بەشێك لە مەرجی ئیسلامەتی تێدایە کە تەسلیم بوونەکەیە. وە هەر لە سەر ئەم شێوە لێکدانەوەیە. کە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە کراوە کە فەرموویەتی: ﴿**قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا**﴾ (الحجرات/١٤)(وەك باسمان کرد)، وەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : لە حەدیسەکەی سەعددا(**أَوْ مُسْلِمٌ**) واتە: یان موسوڵمانە،کە فەزڵی یەکێکیان دراوە بەسەر ئەوی تریاندا، کەواتە مەبەستی لە بوونی جیاوازی لە میانی هەردوو وشەی ئیمان و ئیسلامدا بارسەنگی یەکێکیانە بەسەر ئەوی تریاندا.

---

(١) وتمان ئیسلام بوون بەواتای ئیمان و ددانپێدانان و جێ بەجێکردنە بە ئەندامەکان ، کەواتە تەسلیم بوون بە یەکێك لەم واتایانە وەك تەسلیم بوونە بەهەر سێ بەشەکە.

**دووهەمیان: واتە بەیەکدا بچن:** ئەمیش لەگەڵ زانستی زماندا گونجاوە لەبارەی تایبەتمەندی ئیمانەوە، کە ئیسلام دابنرێت بە تەسلیم بوونی دڵ و قسەکردن و کردار بە گشتی، ئیمانیش بریتییە لە هەندێکی ئەو بەشانەی وشەی ئیسلام دەیانگرێتەوە، کە متمانەو بڕواهێنانە بەدڵ، کە لە وشەی تەداخولی واتاکان دەیانگرێتەوە، ئەمەش لەگەڵ زانستی زماندا دەگونجێت، لەواتایەکی تایبەتی ئیمانەوە کە بڕواهێنانە بە دڵ. وە واتا گشتییەکەی ئیسلامیش دەگرێتەوە کە: (بڕوابوونە بە دڵ و دانپێدانانە بە زمان و ، جێ بەجێکردنیشە بە کردار). وە فەرموودەکەی پێغەمبەر لەسەر ئەم بنەمایەیە لێکدراوەتەوەکە، پرسیاریان لێ کرد: چ ئیسلامێك گەورەترە؟ بە (الإیمان) واتە: بوونی بڕوا وەڵامی دایەوە، چونکە ئیمانی داناوە بە واتا تایبەتییەکەی ئیسلامەتی، بۆیە خستیە ناو ئیسلامەوە.

**سێیەم: بوونی چەند لەفزێك بۆ یەك واتا:** بەڵام بەکارهێنانی لەسەر شێوەی (تەرادوف)، کە واتایەك چەندین وشەی جیاجیای بۆ بەکار هاتبێت: بەوەی کە ئیسلام بەوە لێك بدرێتەوە، کە تەسلیم بوون بێت بەدڵ و بە ئەندامەکانی جەستەیش، هەروەها ئیمانیش بەهەردوو دەلالەتەکە لێك بدرێتەوە، بەو شێوەی کە بۆ (ئیمان) واتا تایبەتیەکەی لێ وەرگیرابێت و، گشتگیرکرابێت بەسەر هەمویدا، وە مانا زاهیریەکەیش خرابێتە ناو واتاکەیەوە، ئەمەش درووستە، چونکە تەسلیم بوونی زاهیر بە قسە و بە کردار بەرهەمی تەصدیقی دڵ و ئەنجامی درووستی ئیمانەکەیەتی. بۆ نموونە: هەندێك جار ناوی درەخت دەبەیت و (بە شێوەی چاوپۆشی) مەبەستیشت خۆی و بەرهەمە کەیشیەتی، کەواتە: بەم ئەندازە گشتگیرییە، ئیمان دەبێتە جێگرەوەی ناوی ئیسلام و پڕ بەپێستی یەکترین، نەزیاد و نەکەم. وە هەمان واتایش لەم ئایەتە دەرهێناوە: ﴿فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ ( وەك پێشتر باسکرا).

# باسی سێیەم:

# دەربارەی حوکمی شەرعی

بۆ ئیسلام و ئیمان دوو حوکمیان هەیە: دوارۆژی و دونیایی:

## حوکمی دوارۆژی:

واتە پەیوەندارە بە دوارۆژەوە، کە دەرباز بوونیانە لە ناو ئاگری دۆزەخ و، نەمانەوەیان بە هەتاهەتایی لە ئاگردا. وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((يَخرجُ مِنَ النارِ مَنْ كانَ في قَلبهِ مِثقالَ ذرَّةٍ مِنَ الإيمان))**[1]،

ئەوەی بە ئەندازەی گەردیلەیەك بڕوا لە دڵیدا هەبێت، لە ناو ئاگر دەردەهێنرێت، وە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە، کە ئەم حوکمە چ واتایەك دەگەیێنێت؟ وە بەوە لێکیان داوەتەوە کە ئیمان بۆخۆی چییە؟

هەندێك هەیە دەڵێت: ئیمان تەنها ئەو بڕیارو عەزمەیە کە دڵ داویەتی [1]، وە هەندێکیش دەڵێت: ئیمان بریتییە لە گرێبەستێکی ناودڵ و، شەهادەتێکی

---

(١) رواه البخاري (٢٢) ومسلم(١٨٣) والترمذي (٢٥٩٨)، وقال العراقي أخرجاه من حديث أبو ذر الخدري في الشفاعة وفيه: (**اذهبوا فمَن وجدُتم في قلبه مثقال ذرة أو خَردلةٍ من إيمان، لفظ البخاري فهما**)، وله تعليقا من حديث أنس: (**يخرجُ من النار من قال لا اله الا الله وفي قلبه وزن ذرَّة مِن إيمان**)، وهو عندهما متصل بلفظ خير مكان إيمان، قلت: أخرجه البخاري في كتاب الايمان من طريق هشام الدستوائي عن قتادة عن انس بلفظ: (**يخرُج من النار مَن قال لا اله الا الله، وفي قلبه وزن شعيرة من خير، ويخرجُ مِن النار مَن قال لا اله الا الله وفي قلبه وزن برة من خير، ويخرُج من النار من قال: لا اله الا الله وفي قلبه وزن ذرة من خير**)، ثم قال: قال أبان: حدثنا قتادة عن انس رفعَه: من إيمان مكان خير. وهذا التعليق قد وصله الحاكم في كتاب الأربعين له من طريق موسى ابن اسماعيل قال حدثنا إبان واخرجه البخاري أيضا في التوحيد ومسلم في الإيمان والترمذي في صفة جهنم و قال حسن صحيح. أنظر الإتحاف٢/٢٤١.

سەر زوبان[٢]، وەهەندێکی تریش ڕایەکی سێیەم زیاد دەکەن لە تەصدیق و دانپێدانانەکە و دەڵێت: ئیمان ئەوەیە کە کار بکرێت بە ئەندامەکانی لەش[٣]، ئێمەش پەردە لەسەر ئەم ڕایانە هەڵدەدەینەوە و دەڵێین:

## پلەی یەکەم:

هەرکەسێك ئەو سێ مەرجە لە خۆیدا کۆ بکاتەوە (تەصدیق و ئیقرارو شەهادەت)، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەچێتە بەهەشتەوە، وە ئەمەش پلەی یەکەمە لە شەش پلەکانی بەهەشت.

---

(١) ئەمە ڕای هەڵبژێرراوی ئەشعەرییەکانە، وە زانا (ماتوریدییە)کانیش هەروا دەڵێن، کە بڕوا بریتییە لەوەی کەبە دڵ و بەمتمانەوە باوەڕی هێناوە بە دینی حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەبێ ئەوەی کە پێویستی بە سەرنج و بەڵگەهێنانەوە هەبێت. إتحاف٢/٢٤١.

(٢) ئەمەش فەرموودەی ئیمام ئەبوحەنیفەو قسەی مەشهوری هاوڕێکانیەتی، لەگەڵ ڕای هەندێك لە لێکۆڵەرەوە ئەشعەرییەکان، مەبەستیش لە شەهادەتی زوبان ئیقرارو ددان پێدانانە، الإتحاف ٢/٢٤١.

(٣) ئەمەیش ڕای خەواریجەکانە، وای لێکردوون کە بە موطڵەق تەکفیری ئەوانە بکەن کە گوناهبارن، چونکە ئەوانە هۆکارو واسیطەو میانەبوونێك نابینن لە بەینی کوفرو ئیماندا.بە پێچەوانەی موعتەزیلەکانەوە کە ڕایان وایە واسیطە هەیە لە میانی ئیمان و کوفردا، ئەمانە ڕایان وایە گوناهی کەبیرەو صەغیرە هەیە، گوناهی گەورە مرۆڤی پێ فاسق دەبێت کە فیسق لای موعتەزیلەکان نە کوفرەو نە ئیمان، واتە بڕوایان وایە جێگەیەك هەیە لە میانی هەردوو حاڵەتەکەدایە(المنزلة بين المنزلتين)، وە بڕوایشیان وایە طاعەت مەرجە بۆ درووستی ئیمانەکە، بەڵام خەواریجەکان بە بەشێکیان داناوە لە ئیمان ئیتر فەرز بێت یان سوننەت. بنوارە هەمان سەر چاوە: ٢/٢٤٣.

## پلەی دووهەم:

ئەوەیە کە بڕوای هەبێت و بە زوبانیش ئیقرار بکات، وە هەندێك کرداریشی هەبێت، بەڵام گوناهێکی گەورە یان چەن گوناهێکی کەبیرەی کردبێت، ئا لێرەدا موعتەزیلەکان دەڵێن: بە هۆی ئەو گوناهە گەورەوە لە ئیمان دەرچووە، بەڵام نەچووەتە ناو ڕیزی کافرەکانەوە، بەڵکو ناوی دەبرێت بە (فاسق)، ئەوەیش لە پلەیەکدایە لەمیانی هەردوو پلەکەدا(واتە: لە میانی کوفر و ئیماندایە)، وە هەتاهەتایشە لە ناو ئاگردا دەمێنێتەوە، ئەمەش ڕایەکی پوچ و باطیلە، وەك لە پاشاندا ڕونی دەکەینەوە.

## پلەی سێیەم:

ئەوەیە کە بەدڵ باوەڕی هەبێت و، بە زوبانیش شایەتی بۆ بدات، بەڵام هیچ جۆرە کردەوەیەك بە ئەندامەکانی لەشی ئەنجام نەدات، زانایان جیاوازی بیروڕایان هەیە لە حوکمی ئەو کەسەیە:

ئەبوطالیبی مەککی فەرموویەتی: کارکردن بەئەندامەکانی لەش، بەشێکە لە ئیمان، وە ئیمان بەبێ کردەوە تەواو نابێت، وە دەڵێت: ئەم ڕایە کۆ دەنگی زانایانی لە سەرە، وە هەندێك فەرموودەی هێناوەتەوە بە بەڵگە: کە واهەست دەکەیت پێچەوانەی مەبەستەکەیەتی، وەك فەرموودەی خودا:

﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾،

کە ئەمە نیشانەیە کە کردار لە پشتەوەی ئیمانەوەیە، نەك بەشێك بێت لێی، یان ئەصڵ و حەقیقەتی ئیمانەکەبێت، ئەینا کردارەکان لە حوکمی ئەو بەشە دووپاتکراوانە دەبن، (مەبەستی ئەوەیە بیسەلمێنێت کە کردار بەشێکە لە ئیمان، کە چی بەڵگەکەی کە هێناویەتیەوە پێچەوانەی مەبەستەکەیەتی) ئەوەی مایەی سەرسوڕمانیشە دەڵێت: ئیجماعی لەسەرە، لەگەڵ ئەمەشدا فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەگوازێتەوە :

**(( لا يَكفُرُ أحدٌ إلا بجُحُودهِ لِما أقرَّ بهِ ))** [1]،

نابێت کەسێك کافر بکرێت، مەگەر نکوڵی بکات لەوەی کە ددانی پیاداناوە، وە ناڕازیشە بە قسەی موعتەزیلەکان کە دەڵێن: ئـەوەی بـە هۆی گوناهی کەبیرەوە بچێتە ئاگرەوە هەتاهەتایە تیایدا دەمێنێتەوە. [2]،

خاوەنی ئەم ڕایە هەمان ڕای موعتەزیلەکانی هەیە، کە بە کەسێکی وا دەوترێت:

باشە ئەگەر کەسێك بەدڵ بڕوای هەبوو، وە بەزوبانیش بڕواکەی دەربڕی، وە یەکسەر وەفاتی کرد، ئایا ئەو کەسە لە بەهەشتدایە یان نا؟

بەدڵنیاییەوە دەبێ بڵێت: بەڵێ، ئەمەش حوکم کردنە بە بەبوونی ئیمان بەبێ ئەوەی کردارێکیشی کردبێت، زیاتر لەگەڵی دەدوێین و دەڵێین:

باشە ئەگەر بەزیندوویی مایەوە تاوەختی نوێژێك هاتە پێشەوە، ئەویش ئەو نوێژەی نەکرد و مرد، یان زینایەکی کرد و مرد، ئایا هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە؟ ئەگەر وتی: بەڵێ، کەواتە ئەویش ڕای موعتەزیلەکانی گەیاندووە، وە ئەگەر وتی: نەخێر، کەواتە ئەوە بەڕاشکاوی ددانی ناوە بەوەدا کە عەمەل وکردار ڕوکنێکی سەرەکی نین لە ئەصڵی ئیمانەکەدا، وە مەرجیش نین؛ نە بۆ دامەزراندن و بوونی ئیمان و بڕوا، وە نەبۆ ئەوەی بەبێ ئەو کردارە نەچنە ناو بەهەشتەوە..

ئەگەر وتی: مەبەستم ئەوەیە کە ماوەیەکی زۆر بژی و نوێژ و کردەوەی چاکەو شەرعیش ئەنجام نەدات.. دەڵێین

---

(١)قال العراقي اخرجه الطبراني في الأوسط(٤٤٣٠) من حديث أبي سعيد بلفظ: **لن يَخرُج أحد من الإيمان إلا بجحوده مادخل فيه**، وإسناده ضعيف اهـ قلت: وهكذا هو في الجامع الكبير للسيوطي، والجَحد والجحوُد يقال فيما يُنكَر باللسانِ لا بِالقلب، واته: ئەوەی بەزوبان ئینکاری شتێك بکات و بەدڵ نەیکات ئەوە پێي دەوترێت (جحود). الإتحاف٢/٢٤٤.

(٢) بنوارە: قوت القلوب٢/١٣٠-١٣١.

ئەو ماوەیە دیاری بکە چەندێکە؟ وە پێمان بڵێ ژمارەی ئەو طاعەت و عیبادەتانە چەندێکە، کە ئەگەر نەیانکات بچێتە ناو ئاگرەوە، وە ژمارەی ئەو گوناهە گەورانە چەندن کە بیانکات ئیمانی پێ بەتاڵ دەبێتەوە؟ ئەمەش بابەتێکی وایە، کەس ناتوانێت حوکمی بەسەردا بدات و لە خۆیەوە بێخەملێنێت، وە هیچ کەسێك خۆی لەم ڕێگە دژوارە نەداوە.

## پلەی چوارەم:

ئەوەیە کە بڕواو تەصدیقەکە بەدڵ هەبێت، بەڵام پێش ئەوەی کە بە زوبان ڕایگەێنێت و دانی پیا بنێت مرد، ئایا دەبێ بڵێن: بەینی خۆی و خودا لەسەر ئیمان مردووە ؟[1]، ئەم پرسە ڕای جیاوازی لێ کەوتۆتەوە:

ئەوەی ئیقراری بەمەرج داناوە بۆ تەواو دامەزراندنی ئیمان و بڕوا، دەڵێت:

ئەو کەسە پێش تەواو بوونی ئیمانەکەی مردووە، ئەمەش ڕایەکی بێ بنەمایە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((يَخرُجُ مِنَ النَّارِ مَن كانَ في قَلبِهِ مِثقالُ ذرَّةٍ مِنَ الإيمان))** [2].

(ئەوەی بەئەندازەی پارچە گەردیلەیەك کەمتر بڕوا لە دڵیدا بێت، ئەوا لە ئاگر ڕزگاری دەبێت.) خۆ ئەم کەسە دڵی پڕیەتی لە بڕوا، ئیتر چۆن هەتاهەتایە لە ئاگردا دەمێنێتەوە، کە لە فەرموودەکەی (حەزرەتی) جوبرەئیل دا هیچ مەرجێکی بۆ ئیمان دانەنابوو، بێجگە لە تەصدیق و بڕواکردن نەبێت بەدڵ بە بوونی خودای گەورەو مەلائیکەتەکانی و کتێبەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی وەك پێشتر باسمان کرد.

---

(١) لەسەر ئەو بنەمایەی کەوتمان تەصدیقی قەلبی و بەدڵ بڕواکردن بەسە بۆ وەرگرتنی مەفهوم و بوونی ئیمان، الإتحاف٢/٢٤٥.

(٢) رواه البخاري (٢٢) ومسلم، (١٨٤)، والترمذي (٢٥٩٨) واللفظ له.

## پلەی پێنجەم:

ئەوەیە بەدڵ بڕواو تەصدیقی هەبێت و، تەمەنیش مۆڵەتی بدات کە دووکەلیمەی شەهادەت بڵێت، وە بشزانێت کە پێویستە لەسەری بیانڵێت، بەڵام بمرێت و بە زوبانیش شەهادەتی نەهێنابێت، نە بە نهێنی و نە بە ئاشکرا، لەوانەیە کە نەوتنەکەی هەمان حوکمی ئەوەی بۆ دابنێن؛ کە کاتی نوێژی بۆ هاتبووە پێشەوە و دەیتوانی بیکات و نەیکردووە، وەك ئەو حاڵەتە دەڵێین:

ئەمیش بڕواداره و تا هەتایە لە ئاگردا نامێنێتەوە، چەنکە ئیمان تەنها تەصدیق و بڕوا ڕوتەکەیە، زوبانیش تەنها تەرجومانی دڵەکەیەتی کە بڕوای هەبووە، کەواتە دەبێت ئیمانەکە بە تەواوی بوونی هەبێت، پێش ئەوەی نۆبەی زوبان بێت، کە دەری ببڕێت و بیدرکێنێت، ئەمەش زاهیرو دیاریترین ڕای زانایانە لەسەر ئەم بەشەی ئیمان، چونکە تەنها بەڵگەیەك بەدەستمانەوە بێت، واتای لەفزەکەیە کە چی دەگەێنێت، وە بە پێی (زمانی عەرەبیش) بڕوا بریتییە لە: تەصدیق و باوەڕکردن بە دڵ.

هەروەك پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

**((يَخرُجُ مِنَ النّارِ مَن كانَ في قَلبِهِ مِثقالُ ذرَّةٍ مِنَ الإيمان))**

(ئەوەی بەئەندازەی پارچە گەردیلەیەك کەمتر بڕوا لە دڵیدا بێت، ئەوا لە ئاگر ڕزگاری دەبێت)خۆ بەو بێدەنگ بوونە لە دەربڕینەکە. ئیمانەکە نافەوتێت، وەك چۆن ئەگەر بڕوای هەبێت و کارێکی واجب ئەنجام نەدات، ئیمانەکەی هەردەمێنێت و نافەوتێت.

هەندێکی تر دەڵێن:

وتن و دەربڕین بەسەربەخۆیی ڕوکنی ئیمانە، چونکە دوو کەلیمەی شەهادەت (بەپێی ئەم بۆچوونە) هەواڵدانێك نییە لەو بڕوایەی کە لە ناو دڵدایە، بەڵکو کەلامێکی (ئینشائی) سەربەخۆیە، عەزم و ئیرادەیەکی تازەیە، کە

به زوبان دەری دەبڕێت، وە سەرەتای شەهادەت و پابەندی بوونە بە ناوەرۆکی بڕواهێنانەکەی، بەڵام ئاشکرایە، ڕای یەکەم دیاری ترو بەهێزترە، کەدەڵێت: زوبان تەرجومانی دڵە.

تایفەی (مورجیئە)کان[1]، لەم بابەتەدا زۆر خراپ ڕۆچوون، دەڵێن: ئەو کەسە هەرگیز ناچێتە ناو دۆزەخەوە، وە دەڵێن: مرۆڤی بڕوادار با یاخیش بێت ناچێتە ناو ئاگرەوە[2]، کە (پشت بەخودا) قسەو بۆچوونە هەڵەکانیان ڕەد دەکەینەوەو بەم نزیکانە بەرپەرچیان دەدەینەوە.

## پلەی شەشەم لەپلەکانی بڕوا:

ئەوەیە کە بە زوبانی بڵێت: ( **لاإله إلا الله محمد رسول الله**)بەڵام بەدڵ بڕوای بەم وتنەی نەبێت و تەصدیقی نەکات، ئەوە گومانمان نییە، کە لە دوارۆژدا لەناو کافرەکان دەژمێررێت، وە لەئاگریشدا هەتا هەتایە دەمێنێتەوە، وە لەوەش گومانمان نییە کە لەناو دونیادا لەلای پێشەواو دەستەڵاتداران بە موسوڵمان دادەنرێت؛

چونکە ئێمە ناتوانین حوکم بەسەر دڵیدا بکەین کە ڕاست دەکات یان نە، ئەوەندەمان لەسەرە وای گومان پێ ببەین، کە مادەم بە زوبانی دوو کەلیمەی شەهادەتی وتووە، مانای وایە زوبان تەعبیرە لە دەربڕینی ئەوەی لە

---

(١)ئەهلی بیدعەن، ڕای زۆر نادرووستیان هەیە، کە بڕوایان وایە لەگەڵ بوونی ئیماندا هیچ گوناهێك زیانی نابێت، وەك چۆن لەگەڵ بوونی كوفردا هەموو طاعەتێك بێ سوودە .

(٢) وە ئەم قسەیان کە باوەڕیان وایە لەگەڵ ئیماندا گوناه زیانی نییەو، وەك چۆن لەگەڵ كوفردا تاعەت سوودی نییە، ئەم بۆچوونە هەڵەیان بڵاو بوویەوەو خەڵێك ی تووشی سەرگەردانی کرد.

دڵیایەتی، بەڵام تەنها لە فرمانێکی سێیەم گومانی لێ دەکەین، کە ئەویش لە دونیادا دەبێت چی بڵێین، کە لە بەینی خۆی و خودای خۆیدا چی بۆ بڕیار بدەین؟ بۆ نموونە ئەگەر لەم حاڵەتەیدا خزمێکی نزیکی بڕواداری مرد، لە پاشان ئەم کابرایەش جگە لە شایەتومانەکە کە بەزوبان هێناویەتی، بە دڵیش تەصدیقی کرد، لە پاشان داوای فەتوا لە زانایان بکات و بڵێت:

لە حاڵەتی مردنی ئەو خزمەماندا من بەڕاستی ئەهلی ئیمان نەبووم و، بەدڵ بڕوام نەهێنابوو، بەڵام دوای مردنەکەی من بڕوام دامەزراە، ئایا ئەو میراتەی کە بەشی خۆمم وەرگرتووە پێم حەڵاڵە یان نا؟

یان ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتی تەصدیق نەکردنە، نیکاحی ئافرەتێکی موسوڵمانی کردبوو، ئیمجا بڕواکەی بۆ پەیدابوو، ئایا پێویست دەکات کە دووبارە لێی مارە ببڕرێتەوە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە جێگای تێڕامانە: لەوانەیە کە بووترێت:

ئەحکامی دونیا بەستراوە بە زاهیری قسەکانەوە (کە وتنی دوو کەلیمەی شەهادەتە) لە زاهیرو لە باطیندا، وە ڕێیشی تێ دەچێت کە بووترێت:

ئەحکامە دونیاییەکان لە حەق غەیری خۆیدا پەیوستەو، دەبەسترێتەوە بە زاهیرەوە، چونکە باطین و حاڵەتە شاراوەکەی غەیری زاهیرەکەیەتی بۆ کەسانێکی غەیری خۆی، بەڵام حاڵەتە باطینەکەی خۆی لە میانی خۆی و خالیقەکەیدا ئاشکرایە، (واتە خۆی وەڵامی دڵی خۆی دەزانێت).

ئەوەی دیاری ترین وەڵام بێت بۆ ئەم بابەتە (عیلمیش لای خودایە):

بۆ خۆی حەڵاڵ نییە لەو میراتە وەربگرێت، (چونکە لەوکاتەدا بڕوای نەبووە) وە پێویستێشە لەسەری دووبارە ئافرەتەکە مارە ببڕێتەوە، (چونکە پێشتر بڕوای دانەمەزراوە)، هەر لەبەر ئەمەیش بوو کە (حەزرەتی) حوزەیفە (خودای لێ ڕازی بێت) ئامادەی نوێژ لەسەر کردنی مونافقەکان نەدەبوو کە

دەمردن، وە (حەزرەتی) عومەریش چاودێری ئەو حاڵەتەی دەکردو بە هەندی وەردەگرت، ئەگەر حوزەیفە ئامادەنەبوایە، ئەویش ئامادەی نوێژ لەسەر کردنی نەدەبوو،[1]

دەشزانین نوێژ لەسەر کردن کارێکی ئاشکراو زاهیرییە لە دونیادا، وە خۆ پاراستن لە حەرامیش لەو شتانەیە کە مافی خودایە بەسەر بەندەکانەوە، وەك حوکمی نوێژکردن وایە، دەبێت خۆیـی لێ بپارێزێـت، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((طلبُ الحَلالِ فَريضَةٌ بَعدَ الفَريضَة))[2]

(واتە: گەڕان بە دوای حەڵاڵیشدا، ئەویش فەرزێکە وەك هەموو فەرزەکانی تر) وە ئەم قسەو حوکمدانەیش پێچەوانەی ئەو بڕیارە نییە کە وتوومانە: میرات بردن حوکم و فرمانێکی ئیسلامییە، کە بە واتای: تەسلیم بوون و خۆ بەدەستەوەدانە، بەڵکە تەسلیم بوونی تەواو ئەوەیە کە:

هەموو کردەوە زاهیریەکانی بگرێتەوەو، باطین و شاراوەکانیشی لێ بەدەر نەبێت، ئەمانەیش کە باس کران کۆمەڵە باسێکی فیقهین، لە سەر بنەمای زەننی و گومان دامەزراوە، حوکمەکان بە پێی ڕواڵەتی لەفزو وتەکان و واتاگشتی و پێوەرە فیقهییەکان دەدرێت، نابێت ئەو کەسەی کە کورتبینەو ئەودیوی مەبەست و ماناکان نابینێت، یەکسەر واگومان ببات: کە مەبەستە سەرەکییەکە ئەوەیە، کە بەدڵنیاییەکەوە بڕیاری حەتمی لە بارەوە بدەیت، (چونکە بنەمای بڕیاردان لە عیلمی کەلامدا، لەسەر بەڵگە یەقینییەکانەو بنەمای ئەم بابەتەیش لەسەر بەڵگە زەنییەکانە) هەرگیز سەرفراز نابێت ئەوەی سەرنجی عادەت و مەراسیمە زاهیرو ئاشکراکان بدات و بەو پێوەرە حوکمەکانی

---

(١) رواه وكيع في (الزهد)( ٤٧٧)، وابن عساكر في (تأريخ دمشق، (٢٧٦/١٢)، بنحوه.

(٢) رواه الطبراني في المعجم الكبير.

لەسەر دابمەزرێنێت.[1]

## وەڵامدانەوەی شوبهەی مورجیئەکان

ئەگەر بڵێیت: کەواتە مورجیئەو موعتەزیلەکان شوبهەکانیان چییە؟ وە بەڵگەتان چییە لەسەر باتڵی و پوچەڵی قسەکانیان؟

دەڵێم: مورجیئەکان دەڵێن: بڕوادار ناچێتە ناو ئاگرەوە ئەگەر هەمو جۆری تاوانەکانیش بکات، چونکە خودا فەرموویەتی:

﴿فَمَنْ يُؤْمِنْ بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ (الجن/١٣) (واتە: ئەوەی ئیمان بە

---

(١) چەند پرسێکی گرنگ هەیە پێویستە بەکورتی ڕونیان بکەینەوە: یەکەم: ئەوانەی کەدەڵێن ئیقرار کردن پێویست نییە مادەم تەصدیقی دڵی هەیە، هەموو کۆدەنگییان هەیە کە دەبێت ئەو کەسەی بڕوای هەیە بڕوایشی بەوەهەبێت کە هەرکاتێك بانگیان کرد کە ئەو بڕوایەی ڕابگەێنێت دەبێت ڕای بگەێنێت، کەواتە ئەگەر داوایان لێکرد کە بەئاشکرا پابەندییە دینییەکانی ڕابگەێنێت و نەیکرد، ئەوە بەکافر ئەژمار دەکرێت، کەواتە دەبێت واز لە عینادی بهێنێت، ئەینا بە موسوڵمانی زاهیریش ناژمێررێت.

**دووهەم:** لەسەر ڕای ئەشعەرییەکان کە تەنها تەصدیقی دڵ بۆ بڕوابوون بەسەو لەسەر ڕای حەنەفییەکانیش کە پێویستە بەدڵ و زوبان بڕواکەی ئاشکرا بکات، لە سەر هەردوو مەزهەبەکە دەبێت ئەو کەسەی پابەندی هەیە دوور بێت لە هەندێك کوفر و کاری ناجۆر، وەك سوجدەبردن بۆ بت، یان سووکایەتی بە پێغەمبەران، یان ئینکاری کردنی فرمانێك کە کۆدەنگی لەسەر پەیدا بووبێت و هاوێنەکانی، هەرکەسێك یەکێ لەمانە بکات با بڕواداریش بێت و با ڕایشی گەیاندبێت ئەوە بە موسوڵمان ناژمێررێت. بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە لق وپۆکانی بنوارە: الإتحاف ٢/٢٤٧-٢٤٩.

خودای خۆی دەهێنێت، با ترسی ئەوەی نەبێت کە زیانی تووش دەبێت، یان زەلیلی و نارەحەتی دێتە رێی).

(هەروەها پشتیان بەزاهیری واتای ئەم ئایەتە بەستووە) کە خودا دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ أُولَئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ﴾.....(الحديد/١٩)واتە: ئەوانەی بڕوایان بەخوداو پێغەمبەرەکەی هێناوە، ئەوانە بەڕاستگۆیان دەژمێررێن، هەروەها ئایەتی: ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ، قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ﴾ (الملك/٩) (واتە: هەر تاقمێك کە هەوادەدرێنە ناو دۆزەخەوە، پرسیاریان لێ دەکرێت: ئەرێ کەسێك نەهات کە هەڕەشەتان لێ بکات و ئەم ڕۆژەتان بەبیر بهێنێتەوە، دەڵێن بەڵێ، هەڕەشەکەرو ترسێنەر هات بۆ لامان، بەڵام بەدرۆمانخستەوە) وشەی:

(كُلَّما أُلقِيَ) وا دەگەێنێت کە پێویستە هەرکەسێك هەوابدرێتە ناو ئاگرەوە، کەسێك بێت کە ئیسلام بە درۆ بخاتەوە، (کەواتە ئەوەی بەدرۆی نەخاتەوە، با گوناهباریش بێت(لەسەر ڕای ئەوان) ئەوە ناخرێتە ناو دۆزەخەوە).

وە لەبەر ئەوەی کە خودا فەرمویەتی:

﴿لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى، الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾ (الليل/١٦)

(واتە: بەدبەختەکان کە ئاین و پێغەمبەر ﷺ بەدرۆ دەخەنەوە ئەوانە دەخرێنە ناو ئاگرەوە،) ئایەتەکە بە حەصری باسی کردووە، تەنها ئەوانە ئەهلی ئاگرن، بە دوو ڕستەی موسبەت و مەنفی.

وە بەڵگەیەکی تریان فەرموودەی خودایە: ﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا وَهُمْ مِنْ فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ﴾ (النمل/٨٩) (ئەوەی بە چاکەیەکەوە بێت بۆ حزور خودا، ئەوا باشتر پاداشتی دەدرێتەوە، وە ئەمین دەکرێتەوە لە نارەحەتی مەترسییەکانی ئەو ڕۆژە سەختە) دەی ئیمان لەسەروو هەموو چاکەکانەوەیە. هەروەها فەرموودەی خودا: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (ال عمران/١٣٤)

خودا چاکەکارانی خۆش دەوێت، یان فەرموودەی:

﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا﴾ (الكهف/٣٠)

ئێمە چاکەی چاکەکاران زایە ناکەین.

هەرچەندە بە زاهیری پشتیان بەم بەڵگانە بەستووە، بەڵام لە ڕاستی دا هیچ بەڵگەیەکی ئەوانی تێدا نییە، چەنکە لە هەرجێگەیەکدا لەم ئایەتانە باسی ئیمانی تێدا بکرێت، مەبەست بوونی ئیمانە لەگەڵ کردەوەی چاکەدا، چونکە ڕونمان کردەوە، کە هەندێك جار بە ڕەهایی تەنها باسی ئیمان دەکرێت و مەبەستیش پێی ئیسلامە، کە بریتییە لەوەی بەدڵو بە زوبان و بە کرداریش هەمووی یەك بگرێتەوە، وە بەڵگەی ئەم دابڕینەی کە دەبێت بەو شێوە لێی حاڵی ببین، بوونی ئەو هەمو فەرموودانەیە، کەهەواڵدەدەن لە تۆڵەسەندنەوەی یاخییەکان و، ئەندازەی سزاکانیان و، فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ کە (باسمان کرد ) دەفەرموێت:

((يَخرُجُ مِنَ النَّارِ مَن كانَ فِي قَلبِهِ مِثقالُ ذرَّةٍ مِنَ الإيمان))[1]،

(ئەوەی بەئەندازەی پارچە گەردیلەیەك کەمتریش بڕوا لە دڵیدا بێت ئەوا لە ئاگر ڕزگاری دەبێت،) دەی ئەگەر نەچێتە ناو ئاگرەوە چۆن لێی دەردێتە دەرەوە؟ وە هەر لەقورئانیشدا هاتووە کە خودا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ (النساء/٤٨)

واتە: خودا لەوانە خۆش نابێت کە هاوبەشی بۆ بڕیاردەدەن، بەڵام بۆ ئەوانەی ئارەزوی لێبێت لێیان خۆش دەبێت)

کەواتە خودا ﷻ لێخۆش بوونەکەی بۆ ئەوانی تر بەستۆتەوە بە ئارەزوو مەشیئەتی خۆیەوە، کەواتە هەندێك لێخۆش بوون نایانگرێتەوەو هەر لە

---

(١) رواه البخاري(٢٢) ومسلم (١٨٤) والترمذي(٢٥٩٨) واللفظ له.

دۆزەخدا دەمێننەوە، [(١)].

هەروەها فەرمووده‌ی خودا: ﴿وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ (الجن/٢٣) ئەوانەی کە تاوان ئەنجام دەدەن، تاوانەکەیان تایبەت بدەیت بەکوفرکرنەوە، ئەمە بەزۆر سەپاندنە، ئەینا لە ڕاستیدا خودا درووستە تۆڵە لەوانەش بسەنێت کە گوناهی بچووکیان ئەنجامداوە.

وەفەرمووده‌ی خودا: ﴿أَلَا إِنَّ الظَّالِمِينَ فِي عَذَابٍ مُقِيمٍ ﴾ (٤٥/الشورى) یان فەرمووده‌ی : ﴿وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ﴾ (النمل/٩٠)

ئەوەی زوڵم بکات و ئەوەیش کە گوناهی خراپ ئەنجام بدات، لەوە گشتگیر ترە کە تەنها گەناهی بچوك یان گەورە بگرێتەوە. کەواتە هێنانەوەی ئەم ئایەتە گشتیانە لە بەرامبەری ئایەتەکانی کە ئەوان بەبەڵگە هێناویاننتەوە، کەواتە لەهەردوو لاوە پێویستە تایبەتمەندی حاڵ و مقام و تەئویلکردنی ئایەتەکان زاڵ ببێت بەسەر لێکدانەوەی واتاکاندا، چونکە فەرموودەکان بە ڕاشکاوانە باس لەوە دەکەن کە تاوانبارە یاخییەکان سزا دەدرێن، [(٢)].

بەڵکو فەرمووده‌ی خودا: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ (مریم/١٧) بەڵگەیەکی

---

(١) گوناهەکان دەبنە دووبەش: گوناهی گەورەو گوناهی بچوك،کەواتە دروستیشە کە تۆڵەیان لێ بسەنێت لەسەر گوناهی بچوك، ئیتر یەکسانە گوناهی گەورەی لەگەڵدا کردووە یان نا، وەك قورئان فەرمویەتی،﴿لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا﴾ (الکهف/٤٩)سەرژمێرکردنیشی بۆ لێپرسینەوەو تۆڵەسەندنەوەیە. الإتحاف٢/٢٥١.

(٢) وەك بوخاری ڕیوایەتی دەکات بە مەرفوعی: (( لیُصیبن أقواماً سفعاً من النار، بذنوبٍ أصابوها عقوبةً ، ثمَّ یُدخِلهمُ اللهُ الجنَّة، بفَضلِ رَحمَتهِ، یقالُ لهُمُ الجَهَنمیُّون))کەواتە دەیانخاتە ئاگرەوەو تۆڵەیان لێدەستێنێتەوە و، لە پاشان بە فەزڵی خۆی دەیانبەخشێت و دەیانخاتە ناو بەهەشتەوەو پێیشیان دەڵێن: جەهەنمییەکان.

ئاشکرایەو وەك ڕاستەوخۆوایە کەچوونە ناو ئاگر بۆ هەموانە،چونکە هیچ بڕوادارێکیش لە گوناه خاڵی نییە.[1]

وەخودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَايَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى﴾ (الليل/١٥)

ئەوانەی بەدبەختن دەخرێنە ناو ئاگرەوە،) مەبەستی پێی کۆمەڵێکی تایبەتیین، یان کەسێکی تایبەتی دیاریکراوی بەدبەخت . وە خودا فەرموویەتی: ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ ﴾ (الملك/٨)

(واتە: کۆمەڵێك لەکافران فڕێ دەدرێنە ناو ئاگرەوە) شتێکی نزیك و ئاساییە کە دەقە گشتگیرەکان تایبەت بکرێن، بۆ نموونە ئەم ئایەتەی کە باسکرا ئیمام ئەبولحەسەنی ئەشعەری و کۆمەڵێك لە زانایانی عیلمی کەلام ئینکاریان کردووە لە صیغەگشتییەکانی ئایەتەکان، وە دەڵێن:

ئەو ئایەتانەی بە شێوەی گشتی هاتوون،دەبێت لە لێکدانەوەی واتاکانیان ڕابووەستین، تا قەرینەیەك دەبینرێتەوە، ئیمجا دابڕدرێت بەسەر واتاکەیدا.

---

(١) هەموو ئیماندارێکیش کە دەبێت بەسەر پردی صیراطدا بپەڕێتەوە ئەوە چوونە بەسەر دۆزەخدا، وەك ئیبن ومەسعود و حەسەن و قەتادە تەفسیریان کردووە، کە لە پاشاندا قورئان دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾، تەقواکارەکان ڕزگار دەکەین و، زاڵمەکانیش لە دۆزەخدا دەهێڵینەوە، هەندێکیش بەوە لێکیانداوەتەوە، کەواتە: دەبێت هەموویان بچنە ناو ئاگرەوە، وەك لە حەدیسەکەی جابر دا بەمەرفوعی هاتووەو لێی زیاد کردووە: (لايَبقَى بَرٌّ ولا فاجر إلا أدَخلها، فتكون علَى المؤمنين بَردا وسَلاما، كمَا كانَت علَى إبراهيم، حتى إنَّ للنار لضَجيجاً من بَردِهِم، ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا)، رواه أحمد وابن أبي شيبة وعبدالرحمن بن حميد، وأبو يعلى، والنسائي في (الكنى) والبيهقي وغيرهم، وهو حسن.الإتحاف ٢/٢٥١.

# ڕەددانەوەی شوبهەی موعتەزیلەکان

وە موعتەزیلەکانیش کۆمەڵە گومانێکیان هەیە، کە خودا فەرموویەتی:

﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى﴾ (طه/٨٢)

وە فەرمودەی خودا: ﴿وَالْعَصْرِ ، إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ ، إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (العصر/٣) (واتە: قەسەم بە چەرخی زەمان، بەڕاستی هەموو ئادەمزاد ژین بە خەسار و زەرەرمەندن، تەنها ئەوانە نەبێت ئیمانیان هێناوەوکردەوەی چاکیان کردووە.)هەروەها خودای گەوەرە فەرموویەتی:

﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا﴾ (مریم/٧١) کە هەموان دەبێت بچنە ناو ئاگرەوە، لە پاشاندا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا﴾، واتە: تەقواکاران و ئیمانداران ڕزگاردەکەین. وە خودا دەفەرموێت:

﴿وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ﴾ (الجن/٢٣)

کەواتە: ئەوەی یاخی ببێت و تاوان بکات دژ بە خوداو پێغەمبەر ﷺ سزادەدرێت بە ئاگری دۆزەخ، وە هەموو ئایەتێك کە ناوی کردەوەی چاکەی تێدا برابێت، بەستراوەتەوە بە ئیمانەوە، وە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا﴾ (النساء/٩٣)

(ئەوەی بڕوادارێك بە عەمدی بکوژێت، تۆڵەی بەوە لێدەسەنرێتەوە، کە دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە هەتاهەتایی) .

ئەم هەموو ئایەت و حوکمە گشتییانە، لە ئایەت و فەرموودەی تردا تایبەت کراون، بەبەڵگەی فەرموودەی خودا:

﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ﴾ (النساء/٤٨).

کەواتە پێویستە ئارەزوو ئیختیار لەدەست وفرمانی خودادا بمێنێت بۆ لێخۆش بوونی گوناهەکانی تر،جگە لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خودا. هەروەها فەرموودەی

پێغەمبەرﷺ : ((يَخرُجُ مِنَ النّارِ مَن كانَ في قَلبِهِ مِثقالُ ذرَّةٍ مِنَ الإيمان))[1] ،

وە فەرموودەی خودا: ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴾ (الكهف/٣٠) ئێمە چاكەی چاكەكاران زايە ناكەين.هەروەها دەفەرموێت:

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (التوبة/١٢٠)

ئەگەر پاداشتی چاكەكارێك نەفەوتێت، ئيتر چۆن پاداشتی ئەصڵی ئيمانەكەو هەمووطاعەتەكان بەتەنها يەك تاوان زايە دەكات؟!

وە فەرموودەی خودا: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا﴾ (النساء/٩٣)

ئەوەی بڕوادارێك بكوژێت لەبەر ئيمان و بڕواكەی، بەڕاستی هاتنە خوارەوەی ئەم حوكمە لەسەر هاوشێوەی ئەم هۆكارە هاتووە،[2] ،

ئەگەر بڵێيت: كەواتە ئەو ڕايە پەسەندكرا كە ئيمان بە بێ كردار پەيداوجێگير دەبێت ، وە ئەم وتەيە لای زانايانی سەلەف زۆر بڵاوە كە دەڵێن: ئيمان عەزم و گرێ بەستەو، قسەو شەهادەتەو، كردارەو عەمەل، واتای ئەم سێ مەرجەچييە؟ وتمان: دوور نييە كە كردار بە ئيمان دابنرێت، چونكە كامڵ و تەواوكاريەتی، وەك دەوترێت: سەری مرۆڤ و هەردوو دەست بەشێكن لە مرۆڤەكە، ئاشكرايشە كە لە مرۆڤ دەكەوێت ئەگەر سەری پێوە نەمێنێت، بەڵام ئەگەر هەردوو دەستيشی نەمێنێت صيفەتی ئادەمی لەدەست نادات، هەروەهايش دەوترێت: تەسبيحات و تەكبيرو (الله أكبر) كردن بەشێكن لە

---

(١) واتاو تەخريجەكەی پێش چەندلاپەڕەيەك كراوە، لەباسی شوبهەی مورجيئەكان.

(٢) ئەو ئايەتە هاتە خوارەوە لە پياوێكدا كە هەڵگەڕابوويەوەو لەدين مورتەد بوبوويەوە، دوای ئەوەی خوێنی براكەی وەرگرت، لە پاشان قاتڵەكەی دەكوژێت و ڕادەكات بۆ مەككە، ئەو مورتەد بوونەوەی بووبەهۆكاری كافر بوونی و مانەوەی هەتاهەتايی لە دۆزەخدا، بنوارە(الدر المنثور) (٢/٦٢٢).

نوێژ، هەرچەندە بەبێ کردنی ئەو دوانەیش نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە.

کەواتە بڕواو تەصدیق کردن بەدڵ بەرامبەر بە ئیمان، وەك و سەروایە بە نیسبەت گیان و بوونی مرۆڤەوە، وە پاشماوەی طاعەتەکان وەك دەست و پێ وان، هەندێکیان بەرزو گرنگترن لە هەندێکیان، وە لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((لایزني الزاني حين يزني وهو مؤمن))**[1].

(واتە: زیناکەر لە کاتی زینا کردنەکەیدا بڕوای نییە، بۆیە کاری وادەکات) (واتە: ئیمانی تەواوی نییە، نەك تەواوی ئیمانی نامێنێت) ڕای موعتەزیلەکان جێگەی بڕوای صەحابەکان نەبووە (خودایان لێ ڕازی بێت) کە دەیڵێن:

ئەوەی زینا دەکات لە ئیمان دەشۆرێتەوە، بەڵکو واتاکەی ئەوەیە:

زیناکەر بڕوای ڕاستەقینەی نییە، ئیمانی تەواوی نییە، وەك چۆن دەوترێت: بەکەسێك کە هەموو لاق و دەستی بڕابێتەوە:ئەوە ئینسان نییە، مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤێکی کامڵ و تەواو نییە، واتە: ئەو مرۆڤە نییە کە

---

(١)قال العراقي: متفق عليه من حديث ابي هريرة،رواه البخاي(٣٤٧٥) ومسلم(٥٧)، قلت: وفيه زيادة عندهما: وهكذا رواه أحمد والترمذي و ابن ماجه وزاد عبد الرزاق وأحمد ومسلم في:

**(وهي لايشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن ولا ينتهب نهبة ذات شرف يرفع الناس اليه فيها ابصارهم حين ينتهبها وهو مؤمن**،روايتهم **ولا يغل أحدكم حين يغل، وهو مؤمن فايا كم واياكم)**، وأخرجه عبد الرازق وعبد بن حميد والطبراني في الكبير والحكيم الترمذي والبيهقي عن عبدالله بن أبي داود والطبراني أيضا في الكبير عن عبدالله بن مغفل واخرجه أبو نعيم في الحلية عن ابي هريرة و زاد بعد قوله **وهو مؤمن: ينزع منه الايمان ولا يعود اليه حتى يتوب فاذا تاب عاد اليه**، الإتحاف ٢/٢٥٤-٢٥٥.

حەقیقەتی مرۆڤ دەیگرێتەوە.[1] .

## ڕونکردنەوەیەك لە بارەی زیاد و کەمی ئیمانەوە

**ئەگەر بڵێیت:**

زانایانی سەلەف هەموو هاوڕان کە ئیمان زیاد دەکات و کەمیش دەکات، بە گوێڕایەڵی و بەندایەتی زیاد دەکات، وە بە گوناهیش کەم دەکات، دەی ئەگەر بڕوا بوون بریتی بێت لە تەصدیق کردن و، تەصدیقیش بریتیبێت لە بڕوا هێنان، چۆن بۆچونی وا ڕاست دەبێت کە ئیمانەکە کەم و زیاد بکات؟

لەوەڵامدا دەڵێم:

زانایانی سەلەف هەموویان شایەتە عادل و دادپەروەرەکانن، وەکەسیش لە وتەو فەتوای ئەوان لانادات، ئەوەی فەرموویانە ڕاستەو دورووستە، بەڵام کێشەکە لە جۆری تێگەیشتنە لە فەرموودەکانیان، فەرموودەی ئەمان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کردار بەشێك نییە لە پارچەکانی ئیمان، وە یەکێك نییە لە ڕوکنەکانی بوونی ئیمان، بەڵکو بە شتێك کە پێی زیاد دەبێت لێی زیاد کراوە ، زیادەکەش بوونی هەیە، وە کەمکردنەکەیش بوونی هەیە، وە شتێك کە زیاد دەکات بە خۆی زیاد ناکات، کەواتە دورووست نییە بڵێیت: مرۆڤ بە

---

(١) ئەبو طالیبی مەککی لە (قوت القلوب)دا ١٣٢/٢، دەفـەرموێت: ئەو فەرمـوودە واتـایەکی ناسکی تێدایە، وەك ئەوەی کە ئیمانی شـەرم و حەیای لێ هەڵدەگیرێت، چـونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(الحیاء من الإیمان)**، کەسێکیش خاوەنی حەیا بێت دوخێنی لە حەرامدا ناکاتەوە، ئەینا ئیمان و تەوحید و مانەوەی ئەحکامەکانی تری لادەمێنێت. وە شێخی زوبەیدیش دەفەرموێت: کەماڵی بڕوای نامێنێت، واتە: تەواوی ترس و خۆفی لە خودا، بەلای ئیمامی شافیعیشەوە (رحمه الله) مرۆڤی فاسق لەئیمان دەرناچێت، الإتحاف ٢٥٥/٢.

هۆی سەریەوە زیاد دەکات، چونکە سەری مرۆڤ ڕوکنی سەرەکی جەستەی مرۆڤە، بەڵکو دەوترێت: مرۆڤ بە ڕیش و قەڵەوی زیادی کردووە، هەروەها درووست نییە بوترێت:

نوێژ کردن بە هۆی ڕکوع و سەجدە بردنەوە زیاد دەبێت، (چونکە چەمینەوەو سەجدە هەردوکیان ڕوکنی سەرەکی نوێژەکەن، ئیتر چۆن خۆ بە خۆ زیاد دەبێت؟) بەڵکو دەوترێت: نوێژ بە ئاداب و سوننەتەکان زیاد دەبێت.

ئەمەش بەڕاشکاوی ئەوە ڕادەگەیێنێت کە:

ئیمان و بڕوا بۆ خۆی بوونێکی هەیە، لە دوای چەسپاندن و سەلماندنی بوونەکەی ئیتر جیاوازی دەکەوێتە حاڵەتەکەیەوە بە زیاد بوون یان کەم بوون.

ئەگەر بڵێیت:

تا ئێستەش ئاڵۆزییەکە هەرماوە، باشە بڕواو تەصدیقەکە چۆن زیاد و کەم دەکات، مەفهومی ئیمان یەك خەصڵەتەو پێك نەهاتوو لە دووشت ئیتر چۆن زیادو کەم دەکات و پارچەپارچەدەبێت؟

لەوەڵامدا دەڵێم:

ئەگەر وازمان لە خاترانەو نەرمی نواندن هێناو گوێمان نەدا بە ئاژاوەو هەرای ئاژاوەچییان و پەردەی ڕاستەقینەمان لە سەر بابەتەکە هەڵدایەوە، ئەو کاتە ئەو ئیشکالەش بەتەواوی نامێنێت و دەڵێم:

## ئیمان ناوێکی هاوبەشەو لەسێ ڕووەوە پێناسەی دەکرێت:

## ڕووی یەکەم:

مەبەست لە ئیمان ئەو تەصدیقەیە کە بەدڵ بڕوادەکەیت و بەدڵنیاییەوە ئەو بڕوایە لەدڵتا دەچەسپێت یان شوێن بڕوای زانایەکی پێگەیشتوو دەکەویت، بەڵام حەقیقەتی ئیمانەکە بۆ خۆت دەرناکەوێت و سینەت گوشاد نابێت، واتە: شەرحی صەدرت بۆ پەیدا نابێت،ئەمە پێی دەڵێن ئیمانی عەوام و تێکڕای خەڵکەکە، مەگەر ئەهلی خەواص و تایبەتمەندەکان[1]،

ئەم بڕوایە وەك گرێیەك وایە لەسەر دڵدا، هەندێ جار توونددەبێت و بەهێز دەبێت، وە هەندێك جاریش بێ هێز دەبێت وخاو دەبێتەوە، بۆ نموونە وەك پەتێك کە گرێ درابێت چۆن توند دەبێت و شل دەبێتەوە.

وە ئەمەش بەدوور مەزانە، بەراوردی بکە لەگەڵ جوولەکەیەکدا، کە چەندێك سوورە لەسەر بیروباوەڕەکەی و، توندەو بەهێچ ترس و بیم و هەڕەشەو گوڕەشەو بێدارکرنەوەو بەڵگەو لێکۆڵینەوەیەکیش، لەرزە ناکەوێتە بڕواو عەقیدەکەیەوە، هەروەها گاورو ئەهلی بیدعە و گومڕاکان، بەڵام هەیشیانە بە تەنها گومانێك کە بۆیان درووست بکەیت، یان خونکییەکیان بۆ بکەیت، یان ترسانێك بخەیتە بەرچاویانەوە، یەکسەر دڵیان ڕابکێشیت و، وایان لێ بکەیت کە گوێت بۆ بگرن، خۆ ئەمانەیش وەك پێڕی یەکەم، گومان لە دڵیاندا نەبووە، بەڵام بەو پلەی تاقمی یەکەم سوور نەبوون و بە توندی نەیانگرتووە، لەم ڕووەوە جیاوازی لە میانیاندا هەیە، بەهەمان شێوە ئەم جۆرە بڕوایەش لە هەڵگرانی باوەڕی حەق و ڕاستی دا هەیە.

---

(١) زۆر بەی خەڵکەکە ئەمە سەرچاوەی باوەڕەکەیانە تەنانەت زاناکانی عیلمی زاهیریش لەم بوارەدا هەر بە عەوام ناو دەبرێن، جگە لە ئەهلوڵلا نەبێت کە فەیزو نووری خۆی دەڕژێنێتە سەر دڵیان و بە (معرفة الله) ئاشنایان دەکات.

کارکردنیش کاریگەری دەبێت لەسەر ئەم گەشەو نماکردن و زیادکردنی ئەو نەخشەیە لە دڵدا، وەك چۆن ئاودێری هۆکاری بوژانەوەو بەزبوونەوەی زیاترە، هەر لەبەر ئەمەیشە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَانًا﴾،

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ (التوبة/١٢٤)

وە فەرموودەی خودای گەورە: ﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ﴾ (الفتح/٤)، کەواتە زانستەکەیان بۆ زیاد دەبێت بەهۆی زیادە بیرکرنەوەو تێڕامان و بەهێزکردنی ئیمانەوە، کە بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی ئیمان .

وە پێغەمبەری خودا ﷺ وەك لە هەندێك هەواڵەوە گەیشتووە فەرموویەتی: ((**الإيمان يَزيدُ ويَنقُصُ**))،[1]

واتە: ئیمان زیاد و کەم دەکات، ئەمەش بە کاریگەری طاعەت و بەندایەتییە لە دڵدا، کەسانێکیش بەمە دەزانن، کە چاودێری ئەحواڵی

---

(١)قال العراقي أخرجه ابن عدي في الكامل وأبو الشيخ في كتاب الثواب من حديث أبي هريرة وقال ابن عدي باطل فيه محمد بن أحمد بن حرب الملحمي يتعمد الكذب. وهو عند ابن ماجه موقوف علي أبي هريرة وابن عباس وأبي الدرداء اهـ قلت: ونص القوت: وروينا في حديث واثلة بن الاسقع: **الإيمان يزيد وينقص** وروي ذلك عن جماعة من الصحابة لا تحصي كثرتهم اهـ وأخرجه ابن عدي في الكامل في ترجمة معروف بن عبد الله الخياط الدمشقي قال حدثنا واثلة بلفظ: **الإيمانُ قولٌ وعمل يزيدُ وينقصُ ولا يكون قولاً بلا عَملٍ** ثم قال هو منكر والحمل فيه على معروف اهـ وأخرجه أبو نعيم في ترجمة الشافعي في الحلية وهو عند الحاكم بلفظ ابن عدي الذي سقناه، فالذي تحصل لنا من هذا، أنه رواه أربعة من الصحابة، وظاهر سياق القوت يقتضي أنه موقوف علي واثلة رضي الله عنهم، وروي أبو اسحق الثعلبي في تفسيره من رواية علي بن عبد العزيز عن حبيب بن عيسي ابن فروج عن اسمعيل بن عبد الرحمن عن مالك عن نافع عن ابن عمر قلنا: **يا رسول الله إن الإيمان يزيد وينقص، قال نعم يزيد حتى يدخل صاحبه الجنة، وينقص حتى يدخل صاحبه النار. الإتحاف ٢/٢٥٨.**

نەفسیان کردبێت و، بە تایبەتی لە کاتی بەردەوام بوون لە سەر بەندایەتی و خۆ یەکلایی کردنەوە بۆی، بە ئامادەبوونی دڵەوە، لەگەڵ تەرخانکردنی کاتەکانی تەمبەڵی و بێتاقەتی بۆ تەقواو خوداناسی، تا هەست بە پلەکانی ئیمان بکات و، دڵی زیاتر لەسەری دابمەزرێت و، وای لێ بێت گرێبەستی بڕواکەی ئەوەندە بەهێزو بتەو ببێت، کە هیچ گومان و دوودڵییەك نەتوانێت خاوی بکاتەوە، بەڵکو ئەوەی بە پێی عەقیدەکەی واتای ڕەحمەتی هەست پێ کردووە و، دەستی هێنا بەسەری منداڵێکی بێ باوکدا و، سۆزو میهرەبانی لە گەڵدا نواندووە، لە ناخی دڵیەوە هەست بە سۆزو ڕەحمەتێکی زیاتر دەکات و، بەهۆی ئەو کردارەیەوە چەند بەرابەری دەکاتەوە، هەروەها کەسێك کە بڕوای بە خێرو بێری تەواضوع و گەردن کەچی هەبێت و، بەپێی ئەو تەوازوعەوە لە گەڵ یەکێکدا بجوڵێتەوەو، ڕووبەڕوی بڕوات و، ملکەچی لە حەنادا بنوێنێت، ئەوە هەر لە خۆیدا هەست بە بوونی زیادە تەوازوعێك دەکات، بە تایبەتی کاتێك کە هەڵدەستێت و کارو خزمەتێك ئەنجام بدات.

هەروەها هەموو صیفەتەکانی دڵ، کە کردارەکانی ئەندامەکانی جەستەی لێ پەیدا دەبێت، لە پاشان ئاسەواری ئەو کردارانە لەسەریان دەبینێت ، وە دوپاتیان دەکاتەوەو زیادیان دەکات، لە پاشاندا لە باسی (چوار یەکی کردارە ڕزگار کەرەکان و کردارە فەوتێننەرەکاندا) لەو جێگەدا کە باسی چۆنیەتی پەیوەندی باطین بە کرداری زاهیرییەوە و، پەیوەندی کردارەکان بە عەقیدەو دڵەکانەوە بەدرێژی باسیان دێت، چونکە ئەو باسانە لە ڕەگەزی پەیوەنداری موڵك و دەستەڵاتەوەیە، بە مەلەکووتی خودایی.

**مەبەستم لە موڵك**: جیهان و عالەمی شەهادە و بینراوە، واتە ئەوەی کە مومکینە بە یەکێك لە ئامێرە هەستیارەکان ببینرێت.

**وە مەبەستیشم لە مەلەکووت**: جیهانی بەربڵاوی غەیب و نادیارەکانە، کە

تەنها بە نووری بەصیرەت و بەرچاو ڕونی دەزانرێت، دڵیش بۆخۆی لە جیهانی مەلەکووتە، ئەندامەکانی جەستەو کردارەکانیش لە جیهانی موڵك و موشاهەدەیە، وردی و ناسکی پەیوەندی نێوان ئەو دوو جیهانە وای کردووە، کە هەندێك کەس وا گومان ببات، کە هەردووکیان ئەوندە تێکەڵن، وەك یەك جیهانیان لێ هاتووە، وە هەندێك وایان گوومان بردووە، کە تەنها یەك جیهان هەیە، کە جیهانی بینراوو موشاهەدەیە، کە ئەم جەستە هەست پێکراوانەیە. بەڵام ئەوەی کە هەست بەهەردوو جیهانەکە بکات و، بشزانێت کە دوو جیهانی لەیەك جیاوازن و سەربەخۆن و، پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، ئەوا ئەو هەست و زانینەی خۆی بەو شێوەی کە دەیزانێت دەری دەبڕێت[1]،

---

(١) ئیمامی غەزالی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) چونکە خۆی شارەزای هەموو پلەو مەقامەکانە، وە بۆ ئەوەی کەسانێك تووشی هەڵدێرەی فیکری و زانستی و تەصەووف نەبن، لە ئاخری بەرگی چوارەمی کتێبەکەی (المقصد الأسنی)دا، باسی هەندێك کەلیماتی صۆفیەکان دەکات، کە خەڵکێك لێیان حاڵی نین، یان ئەوان لە حاڵی سەکر و بێ هۆشیدان، واتە لە حاڵی (فەناو فەنای ئەتەم) دان، ئەوا هەندێك قسە دەکەن، یان شت دەبینن وادەزانن حەقیقەتەکەیان بینیوە، یەکێ لەو پرسە گرنگانە مەسەلەی (ئیتتیحادە)، لەدوای ئەوەی بە درێژی باسی دەکات دەفەرموێت: ئەم پرسەیە جێگەی پێ هەڵخلیسکانی زۆر لەو کەسانەیە، کە بە نەشارەزایی تێی کەوتوون، هەرکەسێك قەدەمی ڕاسیخ و شارەزایی لە زانستی مەعقولاتدانەبێت، لەوانەیە یەکێکیانی لەویان بۆ جودا ببێتەوە، کە قوربی مەعنەوی خۆی دەبینێت لە خوداوە، سەیر دەکات وەك گەوهەری درەوشاوە بە خشڵی جوانکاری حەقیقەت ڕازاوەتەوە، خۆی نابینێت و تەنها خودا دەبینێت، خۆی لەبیر دەکات و، تەنها خودا دەبینێت، بۆیە وشەی: **(أنا الحق)** دێت بە زاریدا، ئەوەش وەك بینینی نەصاراکان بۆ حەزرەتی عیسا، کە

تەجەللیاتی خودایان تێدا دەبینی، وایان دەزانی خودایە، ئەمیش هەروا لە هەڵەدایەو، وەك ئەو کەسەی بەسەر هاتووە، کە وێنەی خۆی لە ئاوێنەدا دەبینێتەوە، کە ئەو وێنە ڕەنگینەی تێدا بەرجەستەیە، وادێتە خەیاڵیەوە کە ئەوە ئەصڵی ئاوێنەکەیە، وە ئەو ڕەنگانەش ڕەنگی ئاوێنەکەن، ئەمەش زۆر دوورە لە ڕاستیەوە، چونکە ئاوێنەکە لە زاتی خۆیدا هیچ ڕەنگێکی نییە، وە حاڵی وایە کە قەبوڵی ڕەنگی هەموو خاوەن ڕەنگەکان دەکات، بە شێوەیەك کە مرۆڤ وا خەیاڵ دەکات، کە ئەوە وێنەی و ڕەنگی نینۆك و ئاوێنەکە خۆیەتی، بۆ نموونە منداڵێکی نەشارەزا، یەکەمجار کە ئاوێنەیەك دەبێنێت یەکسەر وا گومان دەبات کە مرۆڤەکە لە ناو ئاوێنەکەدایە، (زۆریش هەبوون کە خۆیانیان لە ئاوێنەدا دەدی، دەیانووت ئەوکابرا کێیە؟ قسەیشم لە گەڵدا دەکات)، زۆر گیان لەبەریش هەیە، لە ناو ئاوێنەدا شەڕ لەگەڵ وێنەکەی خۆیدا دەکات، ئەمە هەموی تەعبیرە لە نەزانین و، کەم ئاستیی بیرو زانست تیایاندا) هەروەها دڵیش لە زاتی خۆیدا هیچ وێنەیەکی تێدا نییە، وە هەیئەت و شکڵ و شێوەی تێدا نییە، بەڵکو حاڵەتی وایە، قەبوڵی مەعناو واتای هەیئەت و شێوە و وێنەو حەقیقەتەکان دەکات، ئەوەی کە دەچێتە ناویەوە، وەك ئەوە وایە کە لە گەڵیدا تێکەڵ بووبێت، نەك بەحەقیقەت تێکەڵیەتی، بۆ ئەم بابەتە نموونەیەکیان هێناوەتەوە : ئەوکەسەی شیشەی شەراب و شەرابی نەدیبێت و نەیناسێت، ئەگەر شیشەیەك ببینێت ئارەقی تێدایە، نازانێت کە جیاوازن لەیەك، هەندێك جار وای دەبینێت، کە ئەوە تەنها شیشەیەو شەراب نییە، وە هەندێك جاریش وای دەبینێت کە ئەوە تەنها شەرابەو شیشە هەر دیار نییە، وەك شاعیرەکە لەسەرەوە تەعبیری لێ داوەتەوە، هەروەها لە (مشكاة الأنوار) دا دەفەرموێت: دوور نییە کەسێك بۆ یەکەمجار لە ناکاودا ئاوێنەیەك ببینێت، وا گومان ببات ئەو وێنەیەی لە ئاوێنەکەدایە، وێنەی خۆیەتی و لە گەڵی تێکەڵ بووە، وە ئەو

لەم بارەوە شاعیر دەڵێت:[(١)]،

رَقَّ الزُّجاجُ ورَقَّتِ الخَمرُ     فَتَشابَها وتَشاكَلَ الأَمرُ
فَكــأَنَّما خَمــرٌ ولاَ قَـدَحٌ     وكأَنَّـما قَدَحٌ ولاَ خَمرٌ

واتە: **شیشە ناسك تر دەبینی، وەك شەرابی تامدار**
**چون یەکی هەردوو بەجاری، تێکەڵی کردن بە زار**
**هەر وەك و تەنها شەرابەو، جامی خەمری نادیار**
**جام دیاربوو، لەم دیاری عەشقە خەمرە نادیار[(٢)]،**

**بابگەڕێینەوە بۆ ئەصڵی مەبەست:**

ئەمەی باسمانکرد لادانێکی کەم بوو، کەپەیوەنداری عیلمی موکاشەفەبوو، دەرچوونێك بوو لە زانستی موعامەلە، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانین: کە لە میانی عیلمی موعامەلەو موکاشەفەیشدا، پەیوەندیان هەیەو پێکەوە بەسراونەتەوە، بۆیە دەبینیت زانستی موکاشەفە، لەبەر ڕۆشنایی و دیاربوونی، هەموو ساتێك خۆی دەنوێنێت بەسەر زانستی موعامەلەدا، مەگەر بە زۆر لەخۆ کردن ڕزگارت ببێت لێی، ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ئیمان بەهۆی

---

شــەرابە لە نــاو شیشــەکەدا ببینێــت، وا گومـان ببـات، کە شــەرابەکە ڕەنگـی شووشــەکەیە، بەڵام ئەگەر چەنـدین جـار ئەم دیـمەنەی بینـی و لای ئاســایی بـوویەوە، وە زانسـتی و شـارەزایی تیایـدا تەواو کـرد، ئەوکاتە حـاڵەتەکە بەتەواوی دایـدەگرێت و، هەمووگیـان و ڕۆحـی پێـوە سـەرقاڵ دەبێـت و (شـیعرەکەی سەرەوە) دەڵێت: الإتحاف٢/٢٥٩.

(١) شیعری صاحب، لە (دیوان صاحب بن عواد) ١٧٦.

(٢) وەر گێڕاوی بەندە(ئەحسەن) بۆ واتای هەردوو هۆنراوەکە، بنوارە پەراوێزی ژمارە یەکی پێشوو، چونکە ئەم باس و تێکەڵ بوونە، پێویستی بەو ڕونکردنەوەهە یە.

عیبادەتەوە زیاد دەبێت، بە پێی ئەم دەربڕینی یەکەمەی کە بەیانمان کرد، بۆیە (حەزرەتی) عەلی (کرم الله وجهه) فەرموویەتی:

(( **إن الإيمانَ ليَبدُو لمعةً بيضاءَ، فإذا عَملَ العبدُ الصالحاتِ نمَت فَزادتْ حتَّى يَبيضَّ القلبُ كلُّهُ، وإنَّ النِّفاقَ ليَبدو نُكتةً سَوداءَ، فإذا انتَهكَ الحُرماتَ نمَتْ وزادَتْ حتَّى يسوَدَّ القلبُ كلُّهُ، فيُطبَعُ على قَلبهِ فذلِكَ الخَتم، ثُمَّ قَرأَ: كلاَّ بَلْ رانَ عَلى قُلوبِهِمْ ماكانُوا يَكسِبُون** )) [١]

واتە ئیمان وەك تیشکێکی سپی پرشنگدار دەردەکەوێت، ئەگەر بەندەی خودا کردەوە چاکەکانی ئەنجامدا، ئەو تیشکە زیاتر دەدرەوشێتەوە تا هەموو دڵ سپی دەکاتەوە، وە نیفاق و دووڕوویی وەك نوکتەیەکی ڕەش دەردەکەوێت هەتا زیاتر سنووربەزێنێت و کاری حەرام ئەنجام بدات، نوکتەکە زیاتر ڕەشدەبێتەوەو گەورەتر دەبێت تا هەموو دڵی داگیر دەکات، ئەو کاتە مۆری نیفاق دەنرێت بەسەر دڵیەوە، ئەمەیە خەتمی دڵ و ئەو ئایەتەیشی خوێندەوە:

---

(١)ويروى بوجه أخر قال: (**إنّ الإيمان يبدو لمظة بيضاء في القلب، فكلما ازداد الأيمان عظما ازداد ذلك البياض فإذا استكمل الإيمان ابيض القلب كله، وإن النفاق يبدو لمظة سوداء فكلما ازداد النفاق عظماً، أزداد ذلك السواد، فإذا استكمل النفاق، اسود القلبُ كلُه، وأيم الله لو شققتم عن قلب مؤمن لوجدتُموه أبيض، ولو شققتُم عن قلب مُنافق لوجدتُموهُ أسود** )قال السيوطي في الجامع الكبير: هكذا أخرجه ابن المبارك في الزهد وابن أبي شبية في المصنف، وأبو عبيد في الغريب ورسته في الإيمان، والبهقي واللالكائي في السنة، والأصبهاني في الحجة، وقال الزبيدي: قلتُ: ومن طريق أبي عبيد أخرجه اللالكائي في كتاب السنة مختصراً و ساق سندَه من طريق دعلج بن أحمد حدثنا علي بن عبد العزيز قال قال أبو عبيد فذكره، وقال الأصمعي مثل النكتة أو نحوها. وفي كتاب الحلية في ترجمة حذيفة بمعنى ما ورد عن علي رضي الله عنهما. أنظر :الإتحاف٢/٢٥٩.

﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين/١٤)

تاوانەکانیان وەك خاڵێکی ڕەشی لێ هاتووەو، بووە بە ژەنگ بەسەر دڵیانەوە و دڵی داگرتوون، بۆیە ناتوانن ڕاست و چەوت لێك جودا بکەنەوەو ئەم قسانە دەکەن[1].

## ڕووی دوهەم:

ئەوەیە باسی ئیمان بکەیت و مەبەستت پێی تەصدیق و بڕواکردن بێت و کرداریشی لە پاڵدا بێت، وەك چۆن پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((الإيمانُ بِضعٌ وسَبعونَ باباً))**[2]

واتە: ئیمان حەفتاو ئەوەندە دەرگای هەیە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((لا يَزني الزَّاني حينَ يزني وهُو مُؤمن))**[3]،

وە هەرکاتێك عەمەل و کردار چووە ناو خواست و داخوازی ئیمانەوە زیادو کەمییەکەی ناشارڕێتەوە، وە ئایا کاریگەری هەیە لەسەر زیاد بوونی ئیمان کە خۆی بریتییە لە تەنها تەصدیق و بڕوابوونی تەواو ؟ ئەم بابەتە ڕای جیاوازی لەسەرە، ئێمەش هێمامان کرد بۆ ئەوەی کە کاریگەری لەسەری دەبێت.

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی:/٥٨٨.

(٢)قال العراقي وذكره بعد هذا فزاد فيه: **أدناها إماطة الأذي عن الطريق، البخاري ومسلم من حديث أبي هريرة الإيمان بضعٌ وسبعون شعبة**.برقم (٩) زاد مسلم في روايته **فأفضلها قول لا اله إلا الله وادناها** فذكره ورواه بلفظ المصنف الترمذي وصححه(٢٦١٤) اه قلت أخرجه البخاري في أول صحيحه عن المسندي عن ابي عامر العقدي عن سليمان ابن بلال عن عبد الله بن دينار عن ابي صالح عن ابي هريرة رفعه: **الإيمان بضع وستون شعبة والحياء شعبة من الإيمان .الإتحاف ٢/ ٢٦٠.**

(٣) رواه البخاري، (٢٤٧٥) ومسلم (٥٧).

## ڕوی سێیەم:

ئەوەیە کە مەبەست لە بڕواو ئیمان، تەصدیقی پڕ لە متمانەیە، لە ڕێگەی کەشفی مەعنەوی و، گوشادی و فراوانبوونی سینەو بینینی نهێنییەکان بە نووری بەصیرەتو بەرچاو ڕوونی،ئەم بەشە دوورترین بەشە لەوەی کە زیادبوونی بڕوای پێوەبێت،(وەك حەزرەتی عەلی فەرموویەتی:ئەگەر پەردەی حیجابیشم لەسەر هەڵبگیررێت، لەوەی ئێستا هەمە متمانەو یەقین زیاتر ناکەم)

بەڵام من دەڵێم: ئەو فەرمانە پڕ لە متمانەییەی کە هیچ گومانێکیشی تێدا نییە، هێشتا خەڵکەکان جیاوازی ڕو لە نەفسیان دەکات، لەڕوی کەمی و زۆری ئارامی و دڵنیاییەوە، بۆ نموونە:

دڵنیایی و ئارامی دڵت لە ڕاستی ئەوەی کە ژمارە دوو زیاترە لە یەك، زۆر لەوە زیاترە کە بەبەڵگەیشەوە بۆت دەرکەوتووە کە جیهان دروستکراوو پەیدابووە، هەرچەندە لە هیچ یەکێك لەم دوو بابەتە گومانێکت نییە، بەڵام بابەتە یەقینییەکانیش بۆ خۆیان لەڕوی ڕونی و ئاشکراییەوەو، لەو ڕووەیشەوە کە ئارامی و دڵنیایی تەواو بە نەفسی مرۆڤ بدەن پلەی جیاوازیان هەیە.

ئەم بابەتەمان لە (باسی یەقین) لە پەڕاوی زانست لە باسی نیشانەکانی زانایانی ئاخیرەت ڕونمانکردەوەو پێویست بەدووبارە ناکات.

کەواتە دەرکەوت کە لە بارەی ئیمانەوە بە هەموو پێناسەو ڕووەکانیەوە ئەوە ڕاستە کە زیادو کەم دەکات.چۆن وانییە؟ خۆ لە فەرموودەی پێغەمبەر یشدا ﷺ هاتووەکە: (( **يَخرُجُ مِنَ النّارِ مَن كانَ في قَلبهِ مِثقالُ ذرَّةٍ مِنَ الإيمان**)) (ئەوەی بەئەندازەی پارچە گەردیلەیەك کەمتر بڕوا لە دڵیدا هەبێت، ئەوا لە ئاگر ڕزگاری دەبێت،) وە لە هەندێك بابەت و لە ڕیوایەتێکی تردا ئەم وشەیە هاتووە (**مِثقالُ دينارٍ**) جا ئەگەر مسقاڵە زەڕەیەك بێت، یان مسقاڵی دینارێك جیاوازی ئەندازەکەی هیچ بایەخێکی نییە، ئەگەر ئەوەی لە ناو دڵدا بێت

جیاوازی نەبێت.[1]

## ڕونکردنەوەیەك
## لەسەر وتەی کەسێك کە بڵێت:
## (من باوەڕدارم ئەگەر خودا ئارەزووی لێبێت)

ئەگەر پرسیت: چۆن ئەم وتنەی زانایانی سەلەف لێك دەدەیتەوە کە دەیانووت: من باوەڕدارم ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت، خۆ ئیستیسناکردن، واتە گومانێکت هەیە، (کە ئەو ئەگەرە بەکار دەهێنیت، واتە: بڕواکەت پەیوەست کردووە بە ئارەزوی خوداوە)، وە گومانیش لە بڕوابووندا بە کوفر دادەنرێت، بەڵام ئەوانەی سەلەف، هەموویان خۆیان دەپاراست لە بەکارهێنانی وتەیەك کە لە بارەی ئیمانەوە جەزم و دانپێدانانی تێدا بێت، بەڕاستی سوفیانی سەوری(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: هەرکەسێك بڵێت: من لە لای خودا باوەڕدارم، ئەوە لە هەرە درۆزنەکان دادەنرێت، وە هەرکەسێك بڵێت: من باوەڕدارێکی ڕاستەقینەم، ئەوە قسەیەکی بیدعەو داهێنراوی وتووە[2]،

دەی چۆن دەکرێت بەدرۆزن بزانرێت، کە خۆی لەدڵی خۆیدا دڵنیایە کە بڕوادارە، خۆ هەرکەسێك باوەڕداربێت، لای خودایش هەر بەباوەڕدار دادەنرێت، هەروەك چۆن ئەگەر کەسێك باڵای بەرز بێت، یان سەخی طەبع بێت و خۆیشی بەو شێوە بناسێت، هەر بەم شێوەیش دەبێت لای خودا، هەروەها هەرکەسێك دڵخۆش بێت، یان خەفەتباربێت، یان ببیستێت و ببینێت، ئەوە لای خودایش هەر بەو شێوەیە.

(١) رواه البخاري (٧٤٤٠) ومسلم (١٨٣).

(٢) قوت القلوب/٢/١٣٧.

ئەگەر بە مرۆڤێك وترا: ئایا تۆ گیانداری.. خۆ جوان نییە بڵێت: ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت من گیاندارم، کاتێك سوفیان ئەوەی فەرموو: عەرزیان کرد: کەواتە چی بڵێین: فەرمووی: بڵێن:

بڕوامان بە خودایەو ئەوەی ناردوویەتیەخوارەوە بۆ لامان، کەواتە چ جیاوازییەك هەیە لە میانی ئەوەدا کە بڵێت: ﴿آمَنّابالله وَما أُنزِلَ إِلَينا﴾ لەگەڵ ئەوەدا کە بڵێت: من باوەڕدارم؟ (بە ڕواڵەت هیچ جیاوازییەکیان نییە).

وتیان بە حەسەنی بەصری(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) ئایا تۆ بڕواداریت: فەرمووی: ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت، وتیان:

ئەی ئەبو سەعید، کەواتە چۆن دەبێت ئەگەر بەکار بهێنیت لە بابەتێکی عەقیدەییدا، کە گومان درووست دەکات؟!

فەرمووی: دەترسم بڵێم : بەڵێ، خودا بفەرموێت: درۆ ئەکەیت ئەی حەسەن، ئیتر کەلیمەی عەزاب لەسەرم واجب ببێت. بۆیە دەیفەرموو:

چی من دڵنیادەکاتەوەو ئەمینم دەکاتەوە لە سزا، ئەگەر خودا سەیری هەندێ کردەوەی کردبم، کە پێی ڕازی نەبووبێت و لێم تورەبێت و بفەرموێت:

بڕۆ هیچ کارێکی تۆ وەرناگرم، کەواتە: من لە غەیری شوێنی پێویستی خۆمدا کارم کردووە![1]،

هەروەها ئیبراهیمی(نەخەعی) دەفەرموێت: ئەگەر لێیان پرسیت ئایا تۆ باوەڕداریت؟ تۆیش بڵێ: **لاإله إلا الله**![2]

وە جارێکی تر فەرمووی: بڵێ: من هیچ گومانێکم نییە لەوەی ئیمان و بڕوام هەبێت، پرسیارەکەی تۆیش بۆمن بیدعەو داهێنراوە.[1]،

---

(١) قوت القلوب(١٣٧/٢).

(٢) هەمان سەرچاوە١٣٧/٢.

وتیان بە عەلقەمە: ئایا تۆ ئیمانداریت؟

فەرمووی: ڕجام وایە ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت.[٢]،

سوفیانی سەوریش فەرمویەتی: ئێمە بڕوامان هەیە بە خوداو مەلائیکەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی ، وەناشزانین ئێمە لە حزوری خودادا چۆنین و حاڵمان چییە[٣]،

کەواتە بابزانین واتای ئەو هەموو ئەگەرو ئیستیسناکردنانە چییە؟

**وەڵامەکەی:** ئەم جۆرە ئەگەر و ئیستیسنایە درووستە، وە چوار ڕوی تایبەتی هەیە: دوو ڕوویان دەدرێنە پاڵ گومانێکەوە، نەك لە بارەی ئەصڵی ئیمانەکەیەوە، بەڵکو لە بارەی خاتیمەو کۆتاییەکەی و، پلەی کەماڵی ئەو بڕوابوونەیە، (ئایا هەتا سەر بەو شێوە بڕوایە دەمێنێتەوە، وە ئایا دەتوانێت بگاتە ئیمانی کامڵ و خواناسەکان).

**وە دوو ڕووەکەی تریش ناخرێنە پاڵ هیچ شك و گومانێکەوە:**

## ڕوی یەکەم:

ئەوەیە کە ناخریتە پاڵ هیچ بەرامبەرییەك لەگەڵ گوماندا: ئەمەش جۆرێکە لە خۆپارێزی لە جەزم و دڵنیایی، نەوەك گومانی لە بڕواکەی خۆی هەبێت، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی کە تووشی خۆ پەسەندی و تەزکییەی نەفسی نەبێت، کە خودای گەورەش فەرموویەتی: ﴿**فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى**﴾ (النجم/٣٢) واتە خۆتان بەباشی مەپاڵێون و تەزکییەی خۆتان مەکەن، هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿**أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنْفُسَهُمْ**﴾ (النساء/٤٩) لە

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) هەمان سەرچاوە٢/١٣٧.

(٣) قوت القلوب٢/١٣٧.

پاشان دەفەرموێت: ﴿انْظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ (النساء/٥٠) (کەواتە ئەوانەی کە تەزکییەی خۆیان دەکەن دەبێت چاوەنواڕی ئامانجەکەیشی بکەن، کە بە درۆزن و بوختانچی لای خودا دەژمێرڕێن.)

وتیان بە حەکیمێك: کام ڕاستیەیە کە وتنەکەی دێزو ناشیرینە ؟

وتی ئەوەیە پیاوێك تاریفی خۆی بکات.

ئیمانیش لەهەموو صیفەتە بەرزەکانی مرۆڤ گەورەترو باڵاترە، بەدڵنیاییەوە باسکردنی ئیمان کە جەزمی پیا بنێیت، ئەوە خۆپەسەنییەکی ڕەهایە، بەکارهێنانی ئەو صیغەی ئەگەر درووست کردنە، واتە: (ئیستیسناء)بکرێت، وەك ئەوە وایە کە لە عورفی تەزکییەو خۆپەسەندییەوە خۆت لادەدەیت و دەگوازیتەوە بۆ دەروازەیەکی تر، وەك ئەوەی بە مرۆڤێك بووترێت: تۆ پیاوێکی باش و پاکیت؟ تۆ فەقیهیت، یان موفەسسیریت؟ لەوەڵامدا دەڵێت: بەڵێ ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت، نەك لەوەدا کە تۆ گومانت هەیە، بەڵکو لەوەدا کە خۆت لە تەزکییەو خۆپەسەندی دەربازبکەیت.

کەواتە صیغەکە بۆ دوودڵی و گومان درووست کردن و لاوازی هەواڵەکەیە، (چونکە وشەی: ئەگەر کە دەخرێتە پێش وەڵام و قسەیەکەوە بەواتای ئیحتیمال دێت، کەئەمەش بە واتای گومان دێت، گومانیش لاوازی قسەو هەواڵەکەیە) واتاکەی لاوازکردنی هەواڵەکە بۆ یەکێك لە لازمی هەواڵ و خەبەرەکە، واتە لاوازییەکە ڕوناکاتە هەواڵەکە، بەڵکو ڕودەکاتە لازمی خەبەرەکە کە (خۆ تەزکییەکردنەکەیە)، کەواتە بە هەمان تەئویل ئەگەر پرسیار بکرێت لە بارەی وەصفی شتێکی زەمکراوەوە، ئەوکاتە جوان نییە ئەگەر و وشەی ئیستیسنای بۆ بەکار بهێنێت.

## ڕووی دووهەم:

ئەدەب وەرگرتن بە کردنی زیکری خودای میهرەبان لە هەموو حاڵەتێکدا، وە گێڕانەوەو ڕووبەڕووکردنەوەی هەموو **فرمانەکان** بۆ لای ئیرادەو ئارەزوی خودای گەورە، بەڕاستی خودای بەدەستەڵات پێغەمبەرەکەی ﷺ فێری ئەوە کرد چۆن بە ئەدەبەوە قسەو گوفتار بکات و فەرمووی: ﴿**وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا، إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ**﴾ ( الكهف/٢٣) واتە هەمیشە بڵێ:

ئەگەر خودا ویستی لەسەر بێت، فڵان کار دەکەم، هیچ بڕیارێك مەدە بەبێ وتنی (**إن شاءالله**)، بەمەیشەوە نەوەستاوە، بەڵکو خودا خۆیشی بەندەکانی تێدەگەیێنێت، کە لە قسەیەکیشدا هیچ گومانیان نەبێت، دەبێت هەربەو شێوە بڵێن: ﴿**لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ، مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ**﴾ (الفتح/٢٧)

( بە دڵنیاییەوە دەچنە ناو مزگەوتی حەرامەوە، ئەگەر خودا ئیرادەی لەسەر بێت و، سەرتان دەتاشن و کورتی دەکەنەوە)، خودا زانا بوو کە بەدڵنیاییەوە دەچنە ناو مەککەوە، خۆیشی ئیرادەی ئەم چوونەی ئەوانی بووە، بەڵام مەبەستی ئەوەیە کە فێری ئەدەبی قسەکردنی بکات، پێغەمبەریش ﷺ بە ئەوپەڕی ئەدەبەوە چاودێری قسەکانی دەکرد، لە هەموو هەواڵێکدا کە بیدایە، لێی دڵنیابوایە، یان گومانی لەسەری ببوایە، گەیشتە ئەوەی کاتێك کە چووە سەر قەبرانی مەدینەوە فەرمووی: ((**السلامُ عَليكُم أهلَ دارِ قَومٍ مُؤمنينَ، وإنَّا إنْ شاءَ اللهُ بكُم لاحِقُون**))[1]، خۆگەیشتنەوە بە مردووەکان، هیچ گومانێکی

---

(١)دەق (قوت القلوب) ئەوەیە کە سەلامەکەی بە نەکیرە کردووە کە فەرموویەتی:: سلامٌ، وقال العراقي أخرجه مسلم (٢٤٩) عن أبي هريرة اهـ . قلت روى لك من حديث أبي هريرة وعائشة وانس وبريدة بن الحصيب رضي الله عنه: اما حديث أبي هريرة فاخرجه

لەدڵدا نەبووە، بەڵام ئەدەبی حزوری خودا، داخوازی ئەوەی لێ دەكات كە بەو شێوە ناوی خودای(عَزَّوَجَلَّ) ببات، وە هەموو فەرمانەكان بەوەوە ببەستێتەوە، ئەم صێغەیە كە بەكاری هێناوە، نیشانەیە لەسەری [١]، تاوای لێ هاتوو بە پێی عورف و نەریتی بەكارهێنانی (إن شاء الله) وەك دەرخستنی حەزو ئاواتێكی لێ هاتووە، كە دەوترێت فلانكەس خەریكە بە خێرایی دەمرێت: دەڵێیت: ئینشائەڵلا ، وات لێ حاڵی دەبێت كە حەزت لێیە زوو بمرێت، نەك گومانت هەبێت لە مردنەكەی.

وە ئەگەر وتیان پێت: فڵان كەس نەخۆشیەكەی لادەچێت و چاك دەبێتەوە، تۆیش دەڵێیت: ئینشائەڵلا! واتە حەزت لێیە چاك بێتەوە، واتە: ئێستا ئەو كەلیمەیە لە واتای گومان لێكردنەوە گواستوویانەتەوە بۆ واتای ڕەغبەت و حەزلێبوون، هەر بەم شێوەیەش واتای وشەی ئینشائەڵلا لە گەیاندنی

---

مسلم واللالكائي من طريق مالك واللالكائي وحده من طريق اسماعيل بن علية كلاهما عن روح بن القاسم عن العلاء عن ابيه عنه بلفظ: خرج رسول الله ﷺ الى المقبرة فسلم على اهلها فقال: (**سلامٌ عليكم دارَ قوم مؤمنين، وإِناً إن شاء الله بكم لاحقون)**، ولفظ الحديث لابن علية، واما حديث عائشة فاخرجه مسلم واللالكائى من طريق شريك بن عبد الله بن ابى نمر عن عطاء بن يسار عنها بلفظ: إنَّ النبيَّ ﷺ كان يخرج الى البقيع فيقول: (**السلام عليكم دار قوم مؤمنين، وإنا وإياكم غدا موجلون وإنا ان شاء الله بكم لاحقون، اللهم اغفر لاهل بقيع الغرقد)**، واما حديث انس فاخرجه اللالكائى من طريق ابن احمد الزبيدى عن كثير بن يزيد عنه بلفظ:( **أن النبي ﷺ أتى البقيع فقال السلام عليكم وانا بكم لاحقون ان شاء الله اسأل الله ربى ان لا يحرمنا اجركم ولا يفتِنَّا بعدَكُم)**. الإتحاف/٢/٢٦٦.

(١) واتە نیشانەیە لە سەر ئەوەی كە ئەدەب و تەبەڕوكی بەكار هێناوە، هەموو كارەكانیشی بۆ داهاتووە ، وە بەستنەوەی داهاتوو بە شەرتەوە شتێكی ناڕەوا نیيە، الإتحاف/٢٢٦٦.

گومانەوە لادراوە بۆ گەیاندنی واتای تەبەرِوك و ئەدەب وەرگرتن، فەرمانەکە هەرچۆنێك بێت[1]،

## ڕوی سێیەم:

ئەوەیە کە واتای گومانی لێ بکەوێتەوەو پشتبەستنەکەی بە گومانەوە بێت، واتاکەی : من باوەڕدارم ئەگەر خودا ئیرادەی هەبێت، چونکە خودای گەورە دەربارەی کۆمەڵێکی تایبەت بەخۆیان فەرموویەتی:

﴿أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا﴾ (الأنفال/٤) کە خودا وەصفی کردوون بە کەماڵی ئیمان و بڕوا، ئەوانەش بوون بە دوو تاقمەوە: بەشێکیان بە باوەڕدانی ڕاستەقینە دەژمێررێن، وە بەشەکەی تریان وانین، ئەم دابەشکردنە

---

(١)باشترین بەڵگە ئەوەیە کە بوخاری تەخریجی کردووە: عن ابی هريرة رضي الله عنه أنه سمع النبي ﷺ قال: قال سليمان عليه السلام: (**لأطوفن الليلة على تسعين إمرأة كلهن تأتي بفارس يُجاهِد في سبيل الله، فقال له صاحبه: قُل إن شاء الله، فلم يَقُل إن شاء الله، فطاف عليهن جميعاً فلم تَحمِل منهنَّ إلاَّ امرأة واحدة، جاءت بشقِّ رجُل والذى نفس محمد بيده لو قال إن شاء الله لجاهدوا في سبيل الله فرساناً أجمعون**). واخرجه مسلم كذلك من طريق اخرى نحوه ومنها ما اخرجه مسلم أنَّ ابا هريرة يحدث ان النبي صلى الله عليه وسلم قال: (**إن لكلِّ نبي دعوة دعا بها في أمته فاستجيبت له وإني أريد إن شاء الله أن أُدَّخر دعوتي شفاعة لامتي يوم القيامة**)، ومنها ما أخرجه اللالكائي من طريق سعد بن اسحق بن كعب بن عجرة عن ابيه عن جده أن النبى صلى الله عليه وسلم قال لاصحابه: (**ما تقولون في رجل قُتل في سبيل الله؟ قالوا الجنة، قال الجنة إن شاء الله، قال فما تقولون في رجل مات؟ فقام رجلان ذوا عدل فقالا: لا نعلم إلاَّ خيرا، قالوا الله ورسولُه أعلم فقال الجنة إن شاء الله، قال: فما تقولون في رجل مات؟ فقام رجلان فقالا: لا نعلم إلاَّ شراً، فقالوا النار، فقال رسول الله ﷺ عبدٌ مذنبٌ وربٌّ غَفور**) الإتحاف ٢/٢٦٦-٢٦٧.

دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گومانیان بۆ پەیدابووە لە تەواوی و کەماڵی ئیمانەکەیان، نەك لە بوونی ئەصڵی ئیمانەکەیان، ئەمەش بە کوفر دانانرێت، بەڵکو گومان لە بوونی کەماڵی ئیمان شتێکی ڕاستە لە دوو ڕووەوە:

**یەکەمیان:** لەو ڕووەوە کە دوڕوویی کەماڵ و تەواوی ئیمان لادەبات، ئەمەش کارێکی شاراوەیەو ناتوانرێت خۆیی لێ بەری بکات،

**دووهەمیان:** ئەوەیە کە بە هۆی کردەوەی چاکەو طاعەتەوە ئیمانەکەی کامڵ دەبێت، بەڵام باوەڕدارەکە دڵنیا نییە لە کەماڵ و تەواوی بڕوای خۆی.

بەڵگەی گرنگی کارو عەمەل بۆ بەهێزبوونی ئیمان:

ئەوەیە کە بە ڕاستی خودا فەرموویەتی:

﴿**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ**﴾ (الحجرات/١٥)

( ئیمانداری ڕاستەقینە ئەوەیە کە بڕوایان بە خوداوپێغەمبەری خودا هەبێت و، هیچ گومان و دوودڵییەکیش نەکەوێتە دڵیانەوەو، بە ماڵ و دارایی و بەگیانی خۆیان تێکۆشاون لەڕێگەی خودادا، ئەمانە مرۆی ڕاسگۆن،) کەواتە ئەو گومانە پەیدادەبێت لەبوونی ئەو صیفەتانەیە کە دراوەتە پاڵیان، ئایا تیایاندا هەیە یان نە، نەك لە ئەصڵی ئیمانەکەیان.

هەروەها فەرموودەی خودا ﷻ: ﴿**وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ**﴾(البقرة/١٧٧)باسی چاکە دەکات و مەرجی هاتنەجێی بیست صیفەتی بەیانکردووە، وەك وەفا بە عەهدو بەڵێن و، خۆڕاگری کاتە سەختەکان کە فەرموویەتی: ﴿**أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ**﴾،

واتە: ئەوانە ڕاستگۆو تەقواکارانن.

هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ (المجادلة/١١) ئەوانەی خاوەن بڕواو خاوەن زانستن خودا چەندین پلە بەرزیان دەکاتەوە، هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُمْ مَنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ (الحديد/١٠)( کە باس لە جیاوازی پلەو پایەی ئەوانە دەکات، کە پێشتر کۆچیان کردووەو جیهادیشیان کردووە، بەبەراورد لە گەڵ ئەوانەدا کە لە دوای فەتحی مەککە کۆچیان کردووە، یان خودا فەرموویەتی:

﴿هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللَّهِ﴾ (ال عمران/٦٣)

هەریەکەو تاقمێکیان لای خودا لە پلەیەکی تایبەتیدا .

وە پێغەمبەری خودایش فەرموویەتی: ((الإيمانُ عُريانٌ، و لباسُه التَّقوى، و زينتهُ الحَياء، و ثَمرتُه العِلمُ))[1] واتە:( ئیمان و بڕوا بە تەنها ڕوتەڵەیە، تەقوا

---

(١) رواه ابن أبي شيبه في(مصنفه) (٣٦٣٨٣) من كلام وهب بن منبه، و كذا ابن عساكر في(تأريخ دمشق)(٣٨٩/٦٣) و قال أبوطالب في( القوت) (١٣٨/١): وقد أسنده حمزة الخراسانی عن الثوري فرفعه إلى عبدالله، عن النبي (ﷺ) و كذا هو عند الخطيب في ( الفقه و المتفقه)(١٢٩، ١٣٠ ) مرفوعا موقوفا. ئەبو طالیبی مەککی دەفەرموێت:

ئەوەی تەقوای نەبێت ئیمانەکەی بەرگی نییە، ئەوەی خۆپارێزی نەبێت، ئیمانەکەی جوانی نییە، ئەوەی زانستی نەبێت، ئەوا بڕواکەی بەرهەمی نییە، ئەگەر یەکێ واڕێکەوت فاسق و زاڵم و نەزان بوو، ئەوە لە مونافقەکان نزیکترە لەوەی لە باوەڕدارەکان نزیك بێت، ئیمانەکەی لە نیفاقەوە نزیکترەوە متمانەکەیشی لە گومانەوە نزیکترە، بە ئیماندارێکی ڕووت و ڕەجاڵ ناودەبرێت، نیفاق حەفتا جۆرو دەرگای هەیەو شیرکیش بەو شێوەیە پەنا بە خودا.

پۆشتەکەرەوەیەو، دەبێتە پۆشاک بۆی، شەرم وحەیا جوانی دەکات و، وەك خشڵ دەیرازێنێتەوەو ، بەرهەمەکەیشی زانستە).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**الإيمانُ بِضعٌ وسَبعونَ باباً أدناها إماطة الأَذى عَنِ الطريق...**))[1] (واتە: ئیمان حەفتاو ئەوەندە دەرگای هەیە، پلە نزمەکەیان ئەوەیە: کۆسپ و نارەحەتی و هەموو ئەوەی ئازاربەخشە لە رێگەی خەڵکدا لایبەریت.)ئەم بەڵگانە هەمووی بەو واتایەن کە پەیوەندی تەواو هەیە لە میانی کەماڵی ئیمان و ئەعمال و کردارەوە.

وە لەبارەی پەیوەندی ئیمانەوە بە بەرائەتی باوەڕدارەوە لە نیفاق و بڕیاردانی هاوبەشی شاراوە بۆ خودا، ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ :

((**أربعٌ مَن كُنَّ فيهِ فهُو مُنافقٌ خالِص، وإنْ صامَ وصَلَّى وزَعَمَ أَنَّهُ مُؤمنٌ: مَن إذا حَدَّثَ كذَبَ، وإذا وَعَد أَخلفَ، وإذا ائتُمِنَ خانَ، وإذا خاصَمَ فَجَر**) [2]،

(وە لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە : **وإذا عاهَدَ غَدَرَ.**

( واتە: چوار صیفەت هەیە لە هەرکەسێکدا بن، ئەوە دەبێتە مونافقێکی پوخت و تۆخ، با نوێژو ڕۆژویش بکات و واگومان ببات کە باوەڕدارە : کەسێك کە قسە دەکات درۆدەکات، وە بەڵێن دەدات نایباتەسەر، وە هەر ئەمانەتێکی

---

(١ تەخریجی ئەم فەرموودە کرا لە باسی (زیاد و کەمی ) ئیماندا ل/٢٤٣. رواه الترمذی( ٢٦١٤)

(٢)هكذا أورده صاحب القوت وقال العراقي متفق عليه من حديث عبد الله بن عمرو اهـ رواه البخاري (٣٤) ومسلم (٥٨). **فان كانت فيه واحدة منهن ففيه شعبة من النفاق حتى يدعها قال الزبيدي)**: أخرجه البخاري ومسلم في الايمان وأعاده البخاري في الجزية، وأخرجه أصحاب السنن كلهم من طريق الأعمش عن عبد الله بن مرة عن عبد الله بن عمرو رفعه **أربعٌ من كُنَّ فيه كان مُنافقا خالصاً، ومَن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدَعَها، إذا ائتمن خان، وإذا حدَّث كذب وإذا عاهد غدر، وإذا خاصم فجر بنواره: الإتحاف ٢/٢٦٩.**

پێ سپێررا خیانەتی لێ بکات، وە ئەگەر ڕوبەڕوی کەسێك بوویەوە لەحەق لابات و، جنێو و قسەی ناشیرنیش بەکار بهێنێت، وە هەر بەڵێن و عەهدێکی دا غەدری لێ بکات و خیانەتی لێ بکات یان بیدات بە دەستەوە .....)

وە لە فەرموودەکەی ئەبی سەعیدی خودریدا هاتوو:

**((القُلوبُ أربعةٌ: قلبٌ أجرد، وفيه سِراجٌ يزهَر، فَذلِكَ قَلبُ المُؤمِنِ، وقَلبُ مُصَفَّحٌ فيهِ إيمانٌ ونفاقٌ، فمَثلُ الإيمانِ، فيهِ كَمَثلِ البقلَة يَمدُّها الماء العذبُ الغَزيرُ، ومَثلُ النِفاقِ فيهِ كَمَثلِ القُرحَةِ يمدُّها القَيحُ والصَّديدُ، فأيُّ المادَّتَينِ غَلَبَ عَليهِ حُكِمَ لهُ بها، وفي لفظ اخرَ: ذهَبَتْ بهِ))** [1]،

واتە دڵەکان دەبن بە چوار بەشەوە: دڵێك ڕوتە لە هەموو تاریکییەك، وە چرایەکی تێدایە دەدرەوشێتەوە، ئەوە دڵی باوەڕدارە، وە دڵێکیش کە دەگۆڕێت و تێکەڵە لە ئیمان و نیفاق، وە نموونەی بڕوا لەو دڵەدا وەك ئەو دەنکە پاقلە وایە کە ڕێژەنە ئاوێکی زۆری شیرین ئاودێری بکات، وە نموونەی دوڕوویی لە نێو دڵدا، وەك ئەو نەخۆشی قورحەی هەناوە وایە، کە بە کێم و جەراعەت پێی بگەیێنێت، هەر یەکێك لەم دوو ماددەیە زاڵ ببێت بەسەر دڵێدا ئەوە دەیبات بەلای خۆیداو بەو لایەوە حوکمی بەسەردا دەدرێت (لایەنی ئیمانی زیاتر بێت یان لایەنەکەی تر)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: دەیبات بۆلای خۆی.

وە پێغەمبەر خودا ﷺ فەرموویەتی: **((أَكْثرُ مُنافِقِي هذهِ الأمَّة قُرَّاؤُهَا))** [2]، واتە: زۆربەی دوڕووەکانی ئەم ئوممەتە یان ئوممەتی من قورئان خوێنەکانە.

---

(١) رواه أحمد في مسنده/١٧/٣. (١٠٧٤٥) من حديث أبي سعيد، وفيه ليث بن أبي سليم مختلف فيه، (قال الزبيدي: ٢٦٩/٢، أخرجه أبو نعيم في الحلية، ٢٧٦/١، عن حذيفة (رضي الله عنه) من قوله)

(٢)قال العراقي أخرجه أحمد والطبراني من حديث عقبة بن عامر وفيه ابن لهيعة وسيأتي في آداب تلاوة القرآن اهـ ووجدت بخط الشيخ شمس الدين الداودي له طريق من غير رواية ابن

وه له فەرمووده یەکی تردا هاتووه: ((**الشرك أخفَى في أُمَّتي مِن دَبيبِ النَّملِ عَلَى الصَّفا**)) [1] (واته: شەریك بۆ خودا بڕیاردان، لەناو ئوممەتەکەما له دەنگی ڕۆشتنی پێی مێرو شاراوەتره که لەسەر صەفاوه دەڕوات،)

وه حەزرەتی حوزەیفه (رضي الله عنه) دەیفەرموو: له چەرخی پێغەمبەردا ﷺ پیاو هەبوو قسەیەکی دەکردپێی دەبوو به موونافق، تا مردن لێی نەدەبوویەوه، بەڕاستی ئەمڕۆ هاووێنەی ئەو قسانه له هەندێکتانەوه ڕۆژی واهەیه ده جار دەیبیستم! [2].

---

لهيعة ورويناه في صفة المنافقين للغرباني اهـ وقال السيوطي في الجامع الصغير أخرجه أحمد والطبراني والبيهقي عن ابن عمرو واحمد والطبراني عن عقبة بن عامر عن عصمة بن مالك اهـ ، **والمراد بالقراء: الفقهاء أى يضعون العلم في غير مواضعه، يتعلمون العلم نَفيَةً للتُّهَمَة وهُم معتقدون خلافَه، وكان المنافقون في عصر النبي ﷺ بهذه الصفة ينظر للمزيد: الإتحاف ٢/ ٢٧٠.**

(١)هكذا أورده صاحب القوت، وقال العراقي أخرجه أبو يعلي وابن عدي وابن حبان في الضعفاء من حديث أبي بكر ولاحمد والطبراني نحوه من حديث ابي موسى وسيأتي في ذم الجاه والرياء اهـ قلت: وله في الجامع الصغير بقية (**وسأدلك على شئ إذا فعلته اذهب عنك صغار الشرك وكباره**)، الحديث... وسيأتي ذكره قريباً أخرجه الحكيم الترمذي عن أبي بكر وفي الجامع الصغير ايضا: (**الشركُ أخفَى في أمَّتي مِن دَبيبِ النَّمل علَى الصَّفا، في اللَّيلةِ الظَّلماء، وأَدناهُ أن تُحِبَّ علَى شئ مِنَ الجُور، أو تُبغِضَ عَلى شئ من العَدل، وهَل الدِّينُ إلاَّ الحُبُّ في اللهِ والبُغضُ في اللهِ**)، الحديث قال اخرجه الحكيم الترمذي في النوادر والحاكم في التفسير، وابو نعيم في الحلية كلهم عن عائشة قال المناوي قال الحاكم صحيح ، الإتحاف ٢/ ٢٧٠.

(٢)وقال حذيفة رضي الله عنه (**كان الرجل يتكلم بالكلمة على عهد رسول الله ﷺ يصير بها منافقا إلى أن يموت وإني لاسمعها من أحدكم في اليوم عشر مرات**) هكذا أورده صاحب القوت قال العراقي وأخرجه، وقال الزبيدي أخرج أبو نعيم في الحلية بسنده عن أبو الرقاد وقال خرجت مع مولاى وأنا غلام فدفعت إلى حذيفة وهو يقول: (**إن كان الرجل ليتكلم بالكلمة على عهد رسول الله ﷺ فيصير بها منافقا، وإنى لأسمعها من أحدكم في المقعد الواحد أربع**

هەندێك لە زانایان فەرموویانە: نزیك ترین کەس لە دوڕویی، ئەو کەسەیە کەوادەزانێت خۆی دوورو بەرییە لە نیفاق[1]،

هەروەها حوزەیفە دەیفەرموو: مونافقەکانی ئەمڕۆ زۆرترن لەوانەی لە چەرخی پێغەمبەردا بوونﷺ، ئەوان ئەو کاتە دەیانشاردەوە بەڵام ئێستا ئاشکرای دەکەن[2]،وە ئەم نیفاقە دژایەتی هەیە لەگەڵ ڕاستی و کەماڵی ئیماندا، وە صیفەتی وایە شاراوەیە، ئەوەی زۆر لێی دوورە ئەو کەسەیە کە لێی دەترسێت، وە ئەوەی لە هەموان لێی نزیك ترە ئەو کەسەیە کە وادەزانێت کە لێی دوورە.

بە(حەزرەتی) حەسەنی بەصری یان وت: دەڵێن: ئەمڕۆ نیفاق و دوڕویی نەماوە، فەرموی: ئەی برام: ئەگەر مونافقەکان بفەوتێن، خۆتان بە نامۆو بێ ڕەفیق دەزانن لە ڕێگەکاندا[3].

هەروەها ئەو زاتە یان غەیری ئەو فەرموویەتی: ئەگەر مونافقەکان کلکیان لێ بڕوایە، نەماندەتوانی پێ بخەینە سەر زەوی[4].

(حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عومەر بیستی، کە پیاوێك قسەی بە حەججاج دەوت و بە ناشیرینی باسی دەکرد: فەرمووی: باشە ئەگەر ئێستا زیندوو بوایەو گوێی لێت بوایە ئەو قسانەت پێ دەوت؟ وتی: نەخێر،

فەرمووی: ئێمە ئەم جۆرە حاڵەتەمان لە چەرخی پێغەمبەردا ﷺ بە نیفاق و دوڕیی دادەنا[1].

---

مرات: لتأمرون بالمعروف ولتنهون عن المنكر، ولتحضَنَّ على الخير. أو ليَسحِتَنَّكُم الله بعذابٍ، أو ليُؤَمَّرنَّ عَليكُم شِرارُكم، ثمَّ يَدعُو خِيارُكم فلا يُستجابُ لَكم). الإتحاف٢/٢٧١.

(١) قوت القلوب/٢/١٣٦.

(٢) رواه النسائي في السنن الكبرى (١١٥٣١) وبنحوه عند البخاري (٧١١٣)،

(٣) قوت القلوب(١٣٧/٢)، وبنحوه رواه الخرائطي في (مساوىء الأخلاق) (٣١٧).

(٤) قوت القلوب ١٣٧/٢.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( **من كان ذا لِسانَينِ في الدُّنيا جَعَلَهُ اللهُ ذا لِسانَين في الآخِرَة**))[2]، وە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: ((**شَرُّ النَّاسِ ذُو الوَجهَينِ الَّذى يأتي هؤلاءِ بِوَجهِ وهؤلاء بِوَجه** )) [3].

خراپترینی خەڵك ئەوانەیە كە دووڕوییان هەیە، دێن بۆ لای ئەوتاقمە بە ڕویەكەوە، وە بۆلای ئەوانی تر بەڕویەكی ترەوە .

وتیان بە (حەزرەتی)حەسەن: كۆمەڵێك هەن دەڵێن: ئێمە لە دوڕویی ناترسین، فەرموی: وەڵلاهی ئەگەر بزانم من بەریم لە نیفاق، پێم خۆشترە لە پڕی ئەم زەوییە(یان بەرزایی وەك گردێك) لە زێڕو ئاڵتون كە خاوەنی بم.[4]،

پیاوێك بە (حەزرەتی)حوزەیفەی وت (خوای لێ ڕازی بێت):

من دەترسم كە مونافق بم، فەرمووی:

ئەگەر مونافق بویتایە نەدەترسایت. چونكە كەسی دوڕوو ناترسێت و ئەمینە لەوەی مونافق بێت[5]،

ئیبن و ئەبی مەلیكە دەڵێت: بە خزمەت صەدو سی (لە ڕیوایەتێكی تردا) پێنج

---

(١) رواه ابن عبدالبر في التمهيد (٢٤/٢٣) وأصله في البخاري(٧١٧٨).

(٢)وهو من تتمة كلام ابن عمرو وليس حديثا مستقلا كما هو ظاهر من سياق القوت، حيث قال بعد قوله: (**كنا نعدُّ هذا نفاقا في عَهد رسول الله ﷺ مَن كان ذا لِسانَين في الدُّنيا كانَ له في الآخرة لِسانٌ مِن نار**)، ثم قال بعد ذلك وفي الخبر: **شر الناس ذو الوجهين** الحديث فدل ذلك ان الذى قبله من كلام ابن عمر لا من كلام رسول الله ﷺ فتأمل. الإتحاف ٢٧١/٢.وروى أبو نعيم في الحلية ١٦٠/٢ مرفوعاً: (**مَن كان ذا لِسانَين في الدُّنيا جعل الله له يوم القيامة لسانين من نار**)،

(٣) رواه البخاري (٧١٧٩) ومسلم (٤٧١٥).

(٤) قوت القلوب ١٣٧/٢،

(٥) قوت القلوب ١٣٧/٢.

صەد ئەصحابی پێغەمبەر ﷺ گەیشتووم، هەموویان دەترسان لە دوڕوبی[١].

((وروى أنَّ رسولَ الله ﷺ كانَ جالساً في جماعةٍ مِن أصحابه فَذَكَروا رَجلاً وأكثروا الثَّناءَ عَليه. فبَينما هُم كَذلك إذْ طَلَعَ الرَّجلُ عَلَيهم وَوجهُه يَقطُر ماءً مِن أثر الوُضوء قَدْ عَلَّق نَعلَه بيَدِه وبينَ عَينيْهِ أَثر السُّجود فقالوا يا رسول الله هذا الرَّجل الذي وصفناهُ. فقالَ رسوُل الله أرَى في وَجهِهِ سَفعَةَ مِن الشَّيطان. فجاءَ الرَّجُل حَتَّى سلَّم وَجَلَس مَع القَوم. فقال ﷺ نشدتك بالله حين اشرفت على القوم، هل حدَّثَتكَ نَفسَكَ أَنَّه ليسَ فيهم خَيرٌ مِنكَ قالَ: اللَّهُمَ نَعَم))[٢].

واتە: دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ناو کۆمەڵێك لە صەحابەکانیدا دانیشتبوو، ناوی پیاوێکیان بردو زۆر ستایشیان کرد، لەو کاتی باسکردنەدابوو کە کابرا هاتە ناویانەوە و ڕوخساری ئاوی دەستنوێژی لێ دەتکا، سەرپاکانیشی گرتبوو بە دەستیەوە، وە ئاسەواری سەجدە بردن بە ناوچەوانیەوە دیاربوو، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە ئەوپیاوەیە کە ستایشمان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕوخساری دەبینم شەیتان دەستی لێ وەشاندووە، ڕەشاییەك بەڕوخساریەوەیە، کابرا هات و لەگەڵ خەڵکەکەدا دانیشت، لە پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێنت دەدەم بە خودا! کاتێك هاتیت بۆ ناو ئەم کۆمەڵە لە نەفسی خۆتدا ئەوەت نەدەوت کە لەم کۆمەڵەدا کەسێکی تیا نییە

---

(١) هەمان سەرچاوە ١٣٧/٢، وفي البخاري ( أدركتُ ثلاثينَ من أصحابِ النبي ﷺ كلُّهم يَخافُ النِّفاق على نفسه، ما منهم أحد يقول: إنَّه على إيمان جبريل وميكائيل).

(٢)قال العراقي أخرجه أحمد والبزار والدارقطني من حديث انس، ئەمەش نیشانەی درووستی فەراسەت و بەرچاوڕونی حەزرەتە ﷺ وەك موعجیزەیەك کە دەری بڕیوە، کە باطین و شاراوەی ئەو کەسەی دەبینی و دەیزانی کە دەروونی جیاوازە لە ڕواڵەتەکەی، کە ئەمەش مەترسی ترین جۆری نیفاقە پەنا بە خودا، ورواه أبو يعلي في مسنده، (٩٠)، وأبو نعيم في الحلية (٥٢/٣، والدارقطني في (سننه) ٥٤/٠٢)

له تۆ باشتر بێت، وتی: بەرێ وەڵلا وتم!.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((اللَّهُمَّ إنِّي أستَغفِرُكَ لِما عَلِمتُ ولِما لم أعلَم، فقيلَ يارسولَ اللهِ؟ وما يُؤمِنُني والقَلبُ بينَ إصبعَينِ مِن أَصابعِ الرَّحمن، يُقَلِّبُها كَيفَ يَشاء))**[1]، واتە:

خودایە من داوای لێخۆش بوونت لێ دەکەم لەوەی کە زانیومەو کردوومەو لەوەیش کە نەمزانیوە، وتیان پێی: ئایا دەترسیت ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ئەی چی لە سزای خودا ئەمین و دڵنیام بکاتەوە کە دڵەکان ئەوەتان لە میانی دوو پەنجەی(قودرەتی) لە پەنجەکانی خودای میهرەباندا، کە چۆنی بوێت ئاوا هەڵیدەسوڕێنێت.

هەروەك چۆن خودا ﷻ فەرموویەتی: **﴿وَبَدَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ ﴾** ( الزمر/٤٧) هەندێك لە زانایان لە تەفسیرەکەیدا دەڵێن: کردەوەیەکی زۆریان کردووە، وایان زانیوە هەموو چاکەیان کردووە، کەچی

---

(١)هكذا اورده صاحب القوت إلاَّ أنَّه قال:( **كان مِن دُعاء رسُول الله ﷺ فذَكره**)، وقال العراقي أخرجه مُسلم من حديث عائشة: (**اللَّهم إني أعُوذ بكَ مِن شرِّ ما عَمِلتُ وشرِّ ما لَم أعمَل**) ولابى بكر بن الضحاك في الشمائل من حديث مرسل **وشر ما لم أعلم** واخر الحديث عند مسلم من حديث عبدالله بن عمر اه قلت: وأخرجه أبو داود والنسائي وابن ماجه عن عائشة كسياق مسلم. (**اللَّهم إنِّي أعوذُ بكَ مِن شرِّ ما علمتُ وشرِّ ما لَم أعلَم**، وفي القوت: **وعلم رسول الله ﷺ أبا بكر رضي الله عنه دعاءً قال: قُل فيه: اللهم إني أعوذ بكَ أن أُشرِكَ بكَ وأنا أعلم، وأستغفرك لما لا أعلم**). قلت: وأخرج أحمد وأبو يعلي والحكيم والترمذي وأبو نعيم في الحلية عن أبي بكر: (**الشِّركُ فيكم أخفَى مِن دَبيبِ النَّملِ وسأدلُّكَ عَلى شَئ إذا فَعلتَه أذهَب عنكَ صَغارَ الشِّرك وكِبارَه، تقول: اللَّهم إنِّي أعوذ بكَ أن أشرك بكَ وأنا أعلم، وأستغفرك لما لا أعلَم، تقولُها ثلاثَ مرات**)، **ينظر الإتحاف ٢٧٣/٢**.

کاتێك بۆ یان دەردەکەوێت وان لە تای ترازووی خراپەکانیدا[1].

سەرپی سەقەطی دەفەرموێت:

ئەگەر مرۆڤێك بچێتە ناو باخێکەوە، لەهەمووجۆرەکانی درەختی لێ بێت، هەموو جۆرێك پەلەوریان لەسەر بێت، هەر یەکێك لەو باڵندانە بە زوبانێك قسەی لە گەڵدا بکەن، بڵێن: سەلامی خودات لە سەر ئەی دۆستی خودا، ئەگەر دڵی دابێت و ئارام بێتەوە بەم حاڵەت و بینینە، کەواتە دەبێتە دیل و کۆتکراوی دەستی خۆی.[2]

ئەم فەرموودە و هەواڵانە ئەوەت پێ دەناسێنێت کە چ مەترسیەك هەیە لە وردەکاریەکانی دوڕویی و شەڕیك دانانی شاراوە، کە ناتوانێت لێی ئەمین بێت، تەنانەت زاتێکی وەك (حەزرەتی) عومەری کوڕی خەطابیش (رضي الله عنه) پرسیاری لە (حەزرەتی) حوزەیفە دەکرد دەربارەی خۆی ئایا لە ناو مونافقەکاندا ناوی نەبراوە؟[3]،

ئەبو سولەیمانی دارانی فەرموویەتی:

لە هەندێك لە ئەمیرو فەرماندەکانم شتێك بیستووە، ویستم نکوڵی لێ بکەم،

---

(١) بەم شێوەیە لە تەفسیری ئیمامی موجاهیددا هاتووە، لە (أحكام القرآن)دا ١٥/ ٢٦٥ ، تەنانەت ئیمامی قوشەیری دەفەرموێت: لە بیستنی ئەم ئایەتەدا ئاخ و پەژارەیەکی زۆری تێدایە بۆ ئەوانەی خاوەنی فام و بێدارین،بنوارە: لطائف الإشارات ٣/٢٨٥.

(٢) حلية الأولياء ١١٨/١٠. سەهلی توستوری دەفەرموێت: غەفڵەتی زانا ئەوەیە دڵی دابێت و ئارام بێتەوە لەو کاتەدا کە تاریفی دەکەن، غەفڵەتی نەزانیش ئەوەیە کە شانازی پێ بکات، دڵداهاتن بە تاریف و ستایش لە وەیە کە داوای ئەو شتە دەکات و ئەوەش بە گوناە بۆی دەژمێررێت. الإتحاف/٢/٢٧٣.

(٣) رواه وكيع في الزهد، (٤٤٧) و ابن عساكر في (تأريخ دمشق) ٢٧٦/١٢ ،بنحوه.

ترسام فرمان بە کوشتنم بدرێت ، لەمردن نەدەترسام، بەڵام لەوە دەترسام دڵم ئەوحاڵەتەی لاخۆش بێت و جوانکارییەك ڕوی تێ بکات کە گیانم دەکێشرێت، شانازی بە خۆیەوە بکات بۆیە وازم هێنا.[1].

ئەمەیە ئەو نیفاقەی کە دژایەتی تەواوی ئیمان و بڕواو ڕاستگۆیی و کەماڵ و صەفا و بێگەردی ئیمان دەکات، نەك دژایەتی ئەصلی بڕواکە[2]،

**کەواتە دووجۆر نیفاقمان هەیە:**

**یەکێکیان:** خاوەنەکەی لە دین دەردەکات، وە دەیگەیێنێت بە کافرەکان، وە دەیخاتە ڕیزبەندی ئەوانەی کە هەتاهەتاییە لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە.

**دوهەمیان:** ماوەیەك خاوەنەکەی ڕوبەڕوی ئاگر دەکاتەوە، یان لە پلە باڵاکانی بەهەشت دەیهێنێتە خوارەوە، یان لە ڕوتبەو پلەی صددیق و ڕاستگۆیان دایدەبەزێنێت، ئەوە ئەو حاڵەتەیە کە گومانی تێدا پەیدا دەبێت بە زۆری و کەمی، وە خاوەنەکەی جوانتر وایە وشەی (ئیستیسنا)و ئەگەری بۆ بەکار بهێنێت[3].

---

(١) قوت القلوب٢/١٣٧.

(٢) وەك لە پێشەوە ڕونمان کردەوە ئەم نیفاقەی لێرەدا باسی کراوە، نیفاقی عەمەلییە، کە نووری ئیمان و کەماڵی بڕوا دەکوژێننەوە، ئەمە هەرچەندە جیاوازە لە نیفاقی باوەڕو عەقیدە، بەڵام ئەوەش نەبێت مەترسییەکی زۆر گەورەی هەیە، چونکە ڕێگەی بۆ خۆش دەکات، وەك بیشری حافی فەرموویەتی:
پێ خۆش بوون و بێدەنگی ئەو کەسەی کە مەدح و سەنای دەکرێت، زیانی زیاترە لە گوناهکردن، الإتحاف٢/٢٧٣

(٣) وتیان بە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رضي الله عنه) واتای ئیستیسنا چییە لە ئیماندا؟ فەرمووی: ئایا ئیمان گوفتارو کردار نییە، وتیان: بەڵێ، فەرمووی:

وەئەصڵ و بنەمای ئەم دوڕویە لە وەوە هاتووە، کە دەرەوەو ناوەوەی نەوکەسەیە یەك نەبێت، وە ئەمینیش بێت لە مەکری خوداو، ترسی گۆڕانی تەقدیری خودای نەبێت و، خۆپەسەندیش بێت و، حەزی بە پیاهەڵدان بێت و، هەندێك فرمانی تر کە جگە لە صددیقەکان کەسیان لێ خاڵی نیيە. (واتە بەندەکانی خودا نابێت ئەمین بن لەوەی کەبەزاهیری بۆیان دەرکەوتووە، کۆ دەڵێت: ئەوەی خودا لێی شاردونەوەتەوە جیاواز نییە، ئایا دەزانن مەشیئەت و ئیرادەی خودا لەسەر چی دەوەستێتەوە،بۆیە ناتوانن لەمەکری خودا ئەمین بن.

## ڕوی چوارەم:

ئەمەیشیان بەگومانەوە دەبەسترێتەوە، گومانەکەش ڕو لەحەقیقەتی ئیمانەکە ناکات، بەڵکو ڕو لە داهاتوی خاوەنەکەی دەکات، کە ترسی سەلبی سەرەمەرگ و، سووئی خاتیمەی هەبێت، کە نازانێت ئایا بە سەلامەتی ئیمانەکەی دەردەکات لە کاتی مردنیدا یان نا؟ خۆ ئەگەر کۆتایی ژیانی بەکوفر بۆی مۆر کرابێت، ئەوە هەموو ئیمانەپێشووەکەی بەتاڵ و پوچەڵ دەبێتەوە، چونکە بڕوای تەواو بەسراوە بە کۆتایی ژیانەوە، ئەگەر لە ناوەڕاستی ڕۆژدا پرسیت لە کەسێکی ڕۆژوەوان دەربارەی ڕۆژووەکەی ، ئەویش بڵێت:

من بە دڵنیایی بەڕۆژوم ، خۆ ئەگەر لە ماوەی ڕۆژەکەدا شکاندی، ئەوا درۆکەی دەردەکەوێت، چونکە درووستی ڕۆژوەکەی بەستراوە بەوەی بیباتە

---

بڕوا پێکرنەکە، بە قسەو ددان پێدا نان جێگیر دەبێت، وە ئەگەرو ئیستیسناکردنەکەیش بە کردار دەبێت، هەندێك لە ئەولادی تابیعین لە سەر ئوموستیلەکەی نەقشی کردبوو (فلان شەریك بۆ خودا بە هێچ شێوەیەك بڕیار نادات)، باوکی فەرمووی: ئەمە خراپترە لە شیرکەکە،چونکە ئەمەیان تەزکییەی نەفس و عوجبی تێدایە،

سەر تاكۆتایی ڕۆژەكە، وەك چۆن ئێوارە و ڕۆژ ئاوابوون كاتی دیاری كراوە بۆ دروستی ڕۆژووەكە، هەروەها كۆتایی تەمەنیش كاتی بەڕێخستن و دروستی و سەلامەتی ئیمانەكەیەتی، بۆیە ئیمان بە تەندرووست وەصفكراوە، لەسەر ئەو بنەمایە كە هاوڕێی دەبێت، تا دەچێتە ناو گۆڕەوە لە گەڵیدا، ئەمەش جێگەی گومانە، داهاتویش ترسناكە، هەر لەبەر ئەمەیش بووە كە زۆربەی ئەوانەی لە ترسی سەلبی سەرەمەرگ و نادیاری چارەنووسیان گریاون و شینیان كردووە، چونكە ئەو ساتە وەختە بەرهەمی هەموو كۆششەكانی پێشووە، وە مەشیئەت و ئیرادەی ئەزەلی خودایش شاراوەیە و دەرناكەوێت، تا ئەم كۆتا بە ژیانی نەیەت، كەسیش ناتوانێت لێی ئاگاداربێت.

كەواتە خۆف و ترسی خاتیمەو كۆتایی ژیان كە چی بەسەر دێت، وەك ترس و خۆفی حاڵەتی پێشوی وایە، لەوانەیە لە كاتی سەرەمەرگدا حاڵی خۆیی لێ ئاشكرا ببێت، كە ئەوەی پیایدا دەنازی و خۆی بە بڕوادارێكی حەتمی لە قەڵەمدەدا، پێچەوانەكەی ئاشكرا ببێت، كێ دەزانێت ئەو كەسە ئایا لەو كۆمەڵ و تاقمانەیە كە وشەی عاقیبەت خێری و بڕیاری جوانی و خۆشی ژیانی پاشەڕۆژیان بە گفت و بەڵێنی خودا بۆ درابێت؟!

لە واتای ئەم فەرموودەی خودایەدا:

﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ﴾ (ق/١٩)

وتویانە: (لە نارەتی سەكەراتی مردن، ئەقڵ و هۆش لەسەردا نامێنێت، ئالەوكاتەدا ئەوەی پێشتر بڕیاری بۆ دراوە دەخرێتە بەرچاوی) واتە: حاڵەتی داهاتووی لێ ئاشكرا دەبێت، بۆیە هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە: ئەو كردارانە دەخرێنە ناو میزان و كێشانی دواڕۆژەوە، كە لە كۆتایی تەمەندا

لەگەڵیدا بوون.[1]،

بۆیە(حەزرەتی) ئەبو دەرداء(خودای لێڕازی بێت) سوێندی دەخوارد بە خودا: هەرکەسێك ئەمین بوبێت لە سوئی خاتیمە، ئەوە بە بێ ئیمانی ڕۆشتووە![2].

**وە دەوترێت:**

هەندێك گوناه هەیە تۆڵەکەی تەنها ئەوەیە کە خاوەنەکەی دوچاری سووئی خاتیمە دەکات، پەنا دەگرین بەخودا لەو حاڵەتە، هەندێکیش دەفەرموون: سەلبی ئیمان وعاقیبەت شەڕی، بۆ ئەوکەسانەیە کە ئیددیعای پلەی ویلاییت و کەرامات دەکەن و، بە درۆ خەڵکی پێ فریو دەدەن.

**هەندێك لە عاریف و خوداناسان فەرموویانە:**

ئەگەر پلەی شەهادەتم بخەنە ئیختیارەوە لە بەردەم دەرگای ماڵەوەماندا، وە لەبەرامبەریشدا مردن لە سەر تەوحیدو یەکتاپەرستی لە بەردەم دەرگای ژورەکەمدا، بە دڵنیاییەوە مردن هەڵدەبژێرم لەبەردەرگای ژوورەکەمدا، کە بە زوبانی پاراوی یەکتاپەرستیوە بگەم بە حزوری خودا، چونکە من نازانم لەبەردەمی دەرگای ماڵەوە تادەرگای حوجرەکەم دڵم دامەزراو دەبێت لەسەر بڕوا، یان گۆڕانی بەسەردا دێت[3]،

وە هەندێکی تریان فەرموویانە:

ئەگەر یەکێك بە ئیمان و یەکتاپەرستی پەنجا ساڵ بیناسم، لە پاشان پایەیەك کەوتە بەینمانەوەو، ماوەیەك لێم ون بوو، لە پاشاندا مرد، ئەوا ناتوانم حوکم

---

(١) واتاکی بەم شێوە دەگێڕنەوە لە (وەهبی کوڕی مونەببەهەوە) بنوارە: (الدر المنثور)٣/٤١٨.

(٢) قوت القلوب ٢/١٣٦.

(٣) هەمان سەرچاوە.

بدەم بەسەریدا(بەمتمانەو دڵنیاییەوە) کە لەسەر تەوحید مردووە[1]

وە لە حەدیسیشدا هاتووە:((**مَن قالَ أنا مُؤمنٌ فهُو كافِر،ومَن قالَ أنا عالمٌ فهُوَ جاهِل**))[2]، هەرکەسێك وتی: من باوەڕدارم، ئەوە کافرە، وە ئەوەش بڵێت: من زانام ئەوە نەزانە وتراوە لە بارەی فەرموودەی خوداوە:

﴿**وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا**﴾ (الأنعام/١١٥)

وتەی پیرۆزی خودا تەواو بوو (صدقا)بە مانەوە لە سەر ڕاستی، کە بە ئیمانەوە بمرێت، (وعدلا) ئەوەی بە پێی عەدالەتی خودا لەگەڵیدا بجوڵێتەوە کە مردبێت لەسەر شیرك و بێ باوەڕی، وە بەڕاستیش لەم بارەوە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ**﴾[3]، (الحج /٤١)

پاشماوەی هەمووکارەکان بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە.

کەواتە لەهەر کاتێکدا گومان کەڕو لە ئیماندەکات بەم شێوەیە بوو، ئەوکات پێویستە ئەگەرو ئیستیسنای بۆ دابنێیت و دڵنیایی پێ نەدات، چونکە ئیمان بریتییە لە شتێك کە بەهەشتی پێ مسەوگەر بکات، وەك چون ڕۆژو بریتییە

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢)هكذا هو في القوت(٢/١٣٧) وقال العراقي أخرجه الطبراني في الاوسط. الشطر الأخير منه من حديث ابن عمر وفيه ليث والشطر الاول روى من قول يحيى بن أبي كثير، رواه الطبراني في الصغير بلفظ: **من قال: أنا في الجنة فهو في النار** وعنده ضعيف، ورواه ابو منصور الديلمي في مسند الفردوس من حديث البراء باسناد ضعيف جدا، ورويناه في مسند الحرث ابن أبي اسامة من رواية قتادة عن عمر بن الخطاب مرفوعا وهو منقطع اهـ . قلت: هكذا نقله الحافظ السخلوي بتمامه في المقاصد، إلاَّ أنَّه قال في رواية الديلمي عن جابر، بدل البراء، فلا أدرى هو تصحيف في نسخة المقاصد، أو تغيير منه قصدا. ينظر الإتحاف ٢/٢٧٦.

(٣) قوت القلوب ٢/١٣٨.

لەوەی کە زیممەو گەردنی ئەو کەسەیە لەفەرمانبەرداری پاك دەکاتەوە،

کەواتە ئەو ڕۆژووەی پێش خۆرئاوابوون بەتاڵ بوویەوە، ئەوا خاوەنەکەی تەبرییە نابێت، لەوە دەردەچێت کە ڕۆژوی گرتبێت (با تا پێش خورئاوایش هەر بەڕۆژوبووبێت).

هەروەها ئیمانیش تا کاتی غەرغەرە تێکی نەدا بۆی حیسابە، ئەگەر پێشتریش نەیما، ئەوە بەبێ بڕوایی سەردەنێتەوە، بەڵکو دوور نییە لە بارەی ڕۆژوی پێشترەوە ئەگەر پرسیاری لێ بکرێت کە لێ بوبێتەوە، دەتوانێت بڵێت: بەڵێ دوێنێ (ئینشائەڵلا)بە ڕۆژوو بووم، چونکە ڕۆژوی ڕاستەقینە وەردەگیرێت، ئەویش دەزانێت کە بەڕۆژوو بووە، بەڵام نازانێت کە وەرگیراوە یان نە!

لەمەوە دەرکەوت بۆ هەموو کردارێکی باش (ئەگەری قەبووڵ کردنی بدەیتە پاڵ خودا)و ئینشائەڵلای بۆ بکەیت، ئەو گومانە ڕو لە ئەگەری وەرگرتنەکەی دەکات، چونکە هەندێك هۆکاری شاراوە هەیە، ڕێگەی وەرگرتنی کردەوەکەی لێ دەگرن بابە پێی زاهیری مەرجەکانی شەرعیش ئەنجامی دابن، ئەو هۆکارانە کەس لێیان بە ئاگا نییە، جگە لە پەروەردگاری باڵادەست نەبێت، بۆیە وا باشە گومانیان بۆ بەکار بهێنرێت، ئەمە ئەو چوار وەجهو ڕوەیە کەواجوانە ئیستیسنا و ئەگەری تیا باس بکرێت، لە وەڵامدانەوەی پرسیار لە بارەی ئیماندا، ئەمەش کۆتا باسی ئەم پەڕاوەیە کە کتێبەکەی پێ بە کۆتا دەگەێنین، (بنەماکانی باوەڕ) خودایش زاناو ئاگادارترە

**پەڕاوی(قواعد العقائد)(بنەماکانی باوەڕ)**

**تەواو بوو، کە پەڕاوی دووهەمە لە چواریەکی کتێبی ژیانەوەی زانستەکانی ئاین،**

**والحمد لله رب العالمين وصلواته على سيدنا محمد وعلى اله الطاهرين وصحبه أجمعين ئەوەی دێت بە دوایدا پشت بەخودا:پەڕاوی:**

**(نهێنییەکانی ڕاگرتنی پاکی و ئەرك و مەهامەکانی)**

كِتاب

أَسْرارُ الطَّهارَةِ وَمُهِمَّاتِها

پەڕاوی

# نهێنییەکانی ڕاگرتنی پاکوخاوێنی و

## ئەرك و بایەخەکانی

پەڕاوی (تەهارەت)و پاکوخاوێنی

پەڕاوی سێیەمە

**لە چواریەکی بەندایەتی**

**لە پەڕاوەکانی**

**ژیانەوەی**

**زانستەکانی ئاین**

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

# پەڕاوی نهێنییەکانی ڕاگرتنی پاك وخاوێنی و ئەرك و بایەخەکانی

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

حەمدو سەنا بۆ خودای میهرەبان، کە لوتف و نەرمی و محەببەتی لەگەڵ بەندەکانی نواندووەو، وای لێکردوون کە بەپاکی وپوختی بەندایەتی و گەردن کەچی بۆ بنوێنن، وە بۆ پاڵفتەو پاککردنەوەی نهێنییەکانیان، نوورو ئەلطافی خۆیی ڕژاندووە بەسەر دڵیاندا، وە ئاوی پوخت و نەرم نیانیشی بۆ ئامادەکردوون، بۆ پاککردنەوە ڕواڵەتی جەستەو لاشەیان.

وە درووود و سەلامی خودا، لەسەر حەزرەتی موحەممەد ﷺ، کە بەنووری هیدایەت و ڕێنمایی، هەموو کەنارو لایەنەکانی دونیای لێوان کردووە لە نووردا.

وە لەسەر ئال وبەیتی پاك و پیرۆزو هەڵبژاردەو(ئەصحابی کیرام و گوزین)، درووودێك فەرو بەرەکەتەکەی لەڕۆژی سەخت و ترسناکدا پارێزەری ژیانمان بێت و، قەڵغانی گێڕانەوە بێت لە میانی ئێمەو هەموو دەردەکوشندەکاندا.

پاش حەمدوسەنا:

بەڕاستی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی:

((بُنِيَ الدِّينُ علَى النَّظافَة))[1]

واتە: بنەمای ئیسلام لە سەر پاك و خاوێنی دامەزراوە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

(١) رواه الرافعي في (التدوين في أخبار قزوين) ١٧٦/١، بلفظ: **فإن الله بنى الإسلامَ على النظافة**، وعند الترمذي (٢٧٩٩) (**إنَّ اللهَ طيبٌ يحبُّ الطيب، نظيفٌ يحب النظافة...**)

((مِفتاحُ الصَّلاةِ الطُّهورُ))[1]،

واتە: کلیلی نوێژ دابەستن خۆپاککردنەوەیە،

وەخودای گەورەدەفەرموێت:

﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾(التوبة/ ١٠٨)

واتە: کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە کە حەز بەوەدەکەن خۆیان پاك بکەنەوە، لەخووڕەوشتی خراپیش خۆیان دوور بخەنەوە، بێگومان خودایش ئەوانەی خۆش دەوێت کە بایەخی تەواو بە پاك و خاوێنی و خۆپاککردنەوە دەدەن.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الطُّهورُ نِصفُ الإيمانِ))[2]،

خۆپاککردنەوە بە نیوەی دین دەژمێررێت،[3]،

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ ﴾ (المائدة/٦)

---

(١)وتحريمها التكبير، وتحليلها السلام، وقال العراقي أخرجه أبو داود(٦١) والترمذي (٣) وابن ماجه(٢٧٥) من حديث علي قال الترمذي التكبير تحليلها التسليم قال العراقي أخرجه أبو داود رواه أحمد في مسنده ،أخرج أحمد أيضا والبهيقي من حديث جابر بلفظ مفتاح الجنة الصلاة ومفتاح الصلاة الطهور ينظر الإتحاف ٣٠٣/٢.

(٢)قال العراقي أخرجه الترمذي(٣٥١٩) من حَديث رجلٍ من بني سليم وقال حسَنٌ، ورواه من حديث أبى مالك الاشعري بلفظ: شطراها، قلت: وحديث أبي مالك الأشعري رواه أيضا أحمد والترمذي ولفظهم: **(الطهور شَطرُ الايمان، والحمد لله تَملأ الميزان، وسبحانَ الله والحمدُ لله يَملَآنِ أوتَملأ ما بينَ السماءِ والأرض، والصلاة نورٌ، والصَّدقة برهانٌ والصبرُ ضياءٌ والقرأنُ حجَّةٌ لكَ أو عليكَ، كلُ النَّاسِ يَغدُو فبائِعٌ نفسَه فعتَقَها أو مُو بِقُها)**، الإتحاف /٣٠٣/٢-٣٠٤.

(٣) وەك چۆن دەست نوێژ نیوەی نوێژەکەیە، وە تێگەیشتنی پرسیار نیوەی وەڵامە، خۆپاکردنەوەیش نیوەی ئیمان وبڕوایە.

واتە: خودای میهرەبان نایەوێت کە باری گیان وجەستەتان گران بکات و ناڕەحەتتان بکات، بەڵام دەیەوێت کە پاکتان بکاتەوە، ئەوانەی کە بەرچاویان ڕون بوو، لە سەرنجدانی ئەم بەڵگە زاهیریانە تێگەیشتن، کە گرنگترین فرمان و ئەرکی سەرشانیان، پاککردنەوەی نهێنییە شاراوەکانی دەروونیانە، چونکە ئەوە زۆر دوورە، کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودەوەیە:

کە پاك وخاوێنی نیوەی ئیمانە، مەبەستی تەنها خۆشۆردن و پوخت و خاوێن ڕاگرتنی بەرگ و جەستەی خۆی بێت، بەڵام ماڵی دڵی بە وێرانەیی بهێڵێتەوەو ئاوەدانی نەکاتەوە، کە دەروونی پڕی بێت لە چڵك و چەپەڵی و پیسی ، ئەمە زۆر دوورەو هەرگیز شتی وا ناگونجێت.

## کەواتە طەهارەت و ڕاگرتنی خاوێنی چوار پلەی هەیە:

**یەکەم:** پاککردنەوەی دەرەوەی جەستەیە، لە هەموو بێدەستنوێژی و پیسی و پارچەزیادەکان،(وەك نینۆککردن و لابردنی مووی زیادەو ...تاد).

**دووهەم:** پاراستن و پاککرنەوەی ئەندامەکانی جەستەیە لە گوناهو تاوان.

**سێیەم:** پاککردنەوەی دڵە لە ڕەوشت و ئاکارە ناپەسەندو قیزەون و بێزراوەکان.

**چوارەم:** پاك و پوخت ڕاگرتنی نهێنی و ناخی دڵ و دەروونە، لە هەر شتێك کە غەیری خودا بێت، واتە: لە(ماسوی الله)، ئەم پاکەوەکردنەیش بە طەهارەتی پێغەمبەران و صدديق و ڕاستگۆیانی دەرگای خوداناسی دەناسرێت.

لەهەموو پلەیەك لەم چوار پلەیەدا، پاککرنەوەو تەهارەت بە نیوەی ئەو کارەیە دادەنرێت کە تێیدایە، چونکە ئەو پەڕی ئامانج و ئاواتی لەوەی سیڕی دڵی کارا بکات ئەوەیە کە: جەلال و عەزەمەت و کیبریای خودای لێ ئاشکرا ببێت، وە هەرگیز ناتوانێت ناسینی خودا و (معرفة الله) لە دڵیدا جێگیربکات، ئەگەر پێشتر دڵی لەهەموو شتێك و لە غەیری خودا خاڵی نەکردبێتەوە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:﴿قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ﴾ (الأنعام/٩١) واتە: تۆ بڵێ:

یا ئەڵلاهـ ! ئیتر واز لەوان بهێنە، چونکە نابێت لە دڵێکدا خودای تێدابێت، لەگەڵ شتی تردا پێکەوە کۆیان بکەیتەوە.(سیری خوداناسی و خۆشەویستی دونیا ویستی پێکەوە نایانکرێت).

هەرگیز خودا ﷻ رێگـەی نەداوە یەکێـك دوو دڵی هـەبێـت، یەکێکیـان پەیوەندی بە خوداوە هەبێت و ئەویشیان بە دونیاوە.

**کاری دڵ: ئەنجامی سەرەکی ئەوەیە؛**

کە دڵت ئاوەدانبکەیتەوە، بەرەوشتی پەسەندو ئاکاری بەرزو باوەڕی درووست، وە هەرگیز ناتوانێت دڵ ئەم صیفەتە چاکانەی هەبێت، ئەگەر پاك نەبێتەوە لە دژەکانیان، دەبێ دڵی پاك بکرێتەوە لە عەقیدەی پڕوپوچ و، کردەوەی نەشیاوو قیزەون و، ڕەزیلە ناهەموارەکانی نەفس، پاککردنەوەی دڵ لە یەکێ لەم دوانە مەرجی سەرەکییە بۆ پاکبوونەوەی نیوەی دووهەم، بۆیە دەفەرموێت: خۆپاککردنەوە نیوەی ئیمانە، [(١)]

هەروەها پاککرنەوەی ئەندامەکانی جەستە و، دوور خستنەوەیان لە قەدەغەکراوو کارە نەشیاەکان، یەکێکە لەو دوو بەشەی ئیمان، وە ئاوەدانکردنەوەیان بە بەندایەتی و کاراکردنیان بۆ کاری خێر و چاکە، نیوەی دووهەمیەتی. (واتە خاڵی بوون لە ڕەزیلەو خراپەکردن، نیوەی بڕوایەو، ڕازاندنەوەیشی بە چاکەو فەزیلەتە پیرۆزەکان، نیوەکەی تریەتی و، بە هەردووکیشیانەوە کەماڵی پلەی عیرفان وەردەگرێت) .

---

(١) پاکی باطین و سیری دڵ پێویستی بە مەرجەکانی طەهارەتی ئەندامەکانی لەشەو، پاك بوونەوەیە لە بێ دەزنوێژی و پیسی جەستەی مرۆڤ، هەروەها پاکی تەن و جەستەیش بەرهەمی نابێـت، ئەگەر دڵی پـاك نەبێـتەوە، لەدوای ئەم دوو پـاك بـوونەوە زاهیـری و باطینییە، ئینجا سیری ئیمان لە دڵدا دەدرەوشێتەوە و دەبێتە خاوەنی ئیمانی شهوودی.

ئەمەی باس کرا مەقامەکانی ئیمانە، وە هەموو پلەو مەقامێك چینێکی تایبەتی هەیە، وە هێچ بەندەیەك ناگات بە چینە بەرزەکان، تا بەرێگەی پلەکاری پلە نزمەکان نەبرێت، کەواتە؛ ناگاتە پلەی پاکبوونەوەی سیری دڵ لە صیفەتە نەشیاوەکان و، گۆڕینیان بە صیفەتە باش و پەسەندەکان، ئەگەر دڵی بەتەواوی خاڵی نەکاتەوە لە هەموو خووڕەوشتێکی ناپەسەند و، ئاوەدانی نەکاتەوە بە خووە پەسەندو چاکەکان، وە نایشگاتە ئەم پلەیە، تا لێ نەبێتەوە لە پاککردنەوەی هەموو ئەندامەکانی جەستەی، کە دووریان بخاتەوە لە هەموو قەدەغەکراوەکان و، ئاوەدانیشیان بکاتەوە بە هەموو جۆرە تاعەت و گوێڕایەڵیەکان، وە دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین:

کە هەر ئامانجێك چەندێك بەنرخ و پڕبەهاو نایابتر بێت، ئەوەندەش ڕێگاکەی سەخت و تووش و دوورو درێژ دەبێت و، کۆسپ و تەگەرەیشی زیاتر دەبێت، ئیتر هەرگیز وا بیرمەکەرەوە (ئەی سالیکی ڕێبازی حەقیقەت) کە ئەم فرمانە نایابە هەروا بەئاسانی و ئاواتخوازی وەدەست دێت، بەڵکو کارو شەونخونی و لێبڕانی تەواوی دەوێت.

بەڵێ: ئەوەی چاوی دڵی کوێر بێت، وە دەرکی ئەم چینە تایبەتیانە نەکات، ئەو کاتە لە پلەکانی طەهارەت و پاککردنەوە تێ ناگات، جگە لە دوا پلە نەبێت کە وەك توێکڵی ئەخیری (گوێز وایە بەنموونە) بەبەراورد لەگەڵ ناوك و ناوکرۆکەکەی، ئیتر کابرای بەرچاو تاریك، تەنها دیوی دەرەوەی بابەتەکە دەبینێت و، لەدوای تێڕامانی زۆر و گەڕان بە دوای کون و کەلەبەرەکانیدا، سەیر دەکات هەموو کاتەکانی لێ دەڕوات بە خۆپاککرنەوە لە پاشەڕۆك و شۆردنی بەرگ و پۆشاکەکەی و، بایەخدان بە پاك و خاوێنی ڕواڵەتیی گیانی خۆی و، داواکردنی ئاوی لەبەر ڕۆشتووی زۆر، بۆ دووبارەو دەبارە شۆردنی ئەندامەکانی جەستەی، بەو گومانەی کە تووشی تێکچوون و کەم ئەقڵی و

وەسوەسەیشی کردووە، پاك و خاوێنی ڕاستەقینە، تەنها ئەو جۆرە کارانەیە کە ئەو ئەنجامی دەدات، لەگەڵ نەزانینی تەواو بە سیرەت و ڕەویەی سەلەف و پێشینە بەڕێزەکان، کە ئەوانە (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەوەی کە هەموخەمیان لێ هەڵگرتبوو، وە هەموو کاتەکانیان تەرخان کردبوو بۆی، تەنها گرنگی دان بوو بە پاککردنەوەی دڵ و، زۆر بە ئاسان و ئاساییەوە دەیانڕوانی بۆ پرسە لاوەکیەکان.

بۆ نموونە[1] زاتێکی وەك (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) لەگەڵ بەرزی پلەو قەدرگرانیدا دەستنوێژێکی گرت بە ئاوی(کوندە)ی ئافرەتێکی نەصرانی.

تەنانەت ژیانیان ئەوەندە ئاسایی بووە، دەستیان لە چەوری و خواردنەکان نەدەشۆرد، بەڵکو دەستیان بە ناولەپی پێیان دەسڕی و، ئەم گیاو صابوونەی دەستی پێ دەشۆررا بە بیدعەیەکی تازەیان دادەنا.

وە حاڵیان وابوو لەسەر زەوی لە مزگەوتدا نوێژیان دەکرد، بە پێی پەتی لە سەر ڕێگاکان دەڕۆشتن، گەورە پیاوەکانیشیان خۆیان واڕاهێنابوو، لەدانیشتندا هیچیان لەژێردانەبوو، لەسەر زەوی دادەنیشتن، وە تەنها بەبەردخۆیان پاکدەکردەوە[2].

---

(١)البیهقي (السنن)١/٣٣ وعلّق البخاري: وتوضأ عمر بالحمیم (الماء الساخن) من بیت نصراني.

(٢)وقدثبت الإقتصار على الحجارة من فعله ﷺ من ذ لك ما أخرجه البخاري من حدیث أبي هریرة (**فلما قضى ﷺ أتبعه بهنَّ، أی ألحق المحل بالأحجار، وکنی به عن الاستخباء**)، ئەوەی کە ئیمامی غەزالی باسی دەکات، واتە: بە سەهلی سەیری ئەم بابەتەیان کردووە، مانای ئەوە نییە کە هەموویان وا بوون، بەڵکو

ئەبو هورەیرە و کەسانێکی تر لە ئەهلی صوففە (خودایان لێ ڕازی بێت) دەفورموون: ((**كُنَّا نأكل الشَوَّاء فتُقامُ الصَّلاة فنَدخُل أصابِعَنا في الحَصباء، ثم نفركها بالتراب ونكبر**))[1] واتە: گۆشتی برژاومان دەخوارد و، قامەتی نوێژ دەکرا، پەنجەکانمان دەکرد بەوردەبەردەکانی ناو مزگەوتدا، لەپاشان بە گڵی ئەرزەکە دەمانپرواند و ئامادەی تەکبیرەی نوێژ دابەستن دەبووین.

(حەزرەتی) عومەر(خودای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی:

لە چەرخی پێغەمبەردا ﷺ ئەو گیای ئەشنانەمان نەدەزانی چییە (صابوون)، دەستەسڕەکانمان ناو لەپی پێ کانمان بوو، ئەگەر چەوریمان بخواردایە دەستمان بە بن قاچمان دەسڕی[2].

دەڵێن: یەکەم جار کە لەدوای پێغەمبەر ﷺ کارە بیدعەکان دەرکەوت چوار شت بوون: بێژنگ و صابون و سفرەو تێربوون[1]،

---

زیاتر بەو شێوە بوون، وەك دەزانین پێغەمبەر ﷺ بەئاویش تارەتی گرتووە، وەك چەندین فەرموودە لەم بارەوە هاتووە: كما رواه البخاري في صحيحه من حديث أنس: (**كان النبي ﷺ إذا خرج لحاجته أجيء أنا وغلامٌ معنا اداوة من ماء يعني ليستنجي به، وأخرج مسلم عن أنس: فخرج علينا وقد استنجى بالماء**) . وفي صحيح ابن حبان من حديث عائشة: (**مارأيت رسول الله ﷺ خرج من غائط قط إلاَّ من ماء**)، فما ذكره المنصف من أحوال السلف يحمل على أغلب أحوالهم. الإتحاف ٣٠٧/٢.

(١) رواه ابن ماجه (٣٣١١).

(٢) قوت القلوب.١٤٢/٢، کە دەچوون بەسەر زەویداگڵەکە پێی پاکدەکردنەوە، چونکە گڵ باشترین پاککەرەوەیە، واتە زیاتر بەو شێوە دەستمان دەسڕی، مانای ئەوەنییە کە نەیاندەشۆرد، بەڵکو خودا ﷻ تاریفی ئەهلە (قوبائی) کردووە کە جگە لە بەرد بەئاویش خۆیان پاك دەکردەوە، خودایان لێ ڕازی بێت.

هەمیشە گرنگی سەرەکییان بە پاکو پوختی دەروون و باطینیان دەدا، تا ئەوەی کە هەندێکیان دەیانووت: نوێژ کردن بە سەرپایی و نەعلەوە خێری زیاترە، [٢]»،

چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێك سەرپاکانی لە نوێژەکەیدا داکەند، لەبەر ئەوەبوو کە جوبرەئیل(علیه السلام) هەواڵی پێدا کە پیسییەکی پێوەیە، خەڵکەکەش نەعلەکانیان داکەند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

بۆچی نەعلەکانتان داکەند؟![٣]

تەنانەت ئیبراهیمی نەخەعی دەفەرموێت:

خۆزگە ئەوەی سەرپاییەکەی دادەکەند، داماوێك بهاتایەو لێی ببردایە، نیشانە لەسەر ئەوەی کە داکەندنی سەرپایی پێ ناخۆش بووە. [٤]»،

بەم شێوە لە فرمانە ئاساییە زاهیریەکاندا، زۆر ئاسانکاریان دەنواند، بەڵکو لە سەر گڵی جادەکان بە پێی پەتی دەڕۆشتن و، لەسەر زەویەکەیش دادەنیشتنو لە مزگەوتیشدا لەسەر تەختی زەویەکە نوێژیان دەکرد، وە لە ئاردی گەنم و جۆ نانیان دەخوارد، کە لە ژێر پێی وڵاخدا گێرەی دەکراو، میزیشی پیادەکراو، گەنم و جۆکەیشی لە گوڵەکانی جودادەکرایەوە، وە خۆیشیان لە ئارەقی وشتر و ئەسپ نەدەپاراست، کە ئەوانە زۆر خۆیشیان دەگەوزاند لە ناو گڵ و سەرسە نوێلگەدا، وە هەرگیزیش نەبیسراوە لەیەکێکیانەوە پرسیارێکی لەبارەی وردە کاری ئەو شتە پیسانەوە کردبێت، بەم شێوە ئاسانکاریان لەم بوارەدا هەبوو.

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) چونکە ئەم جۆرە نوێژو وەستانە تەوازوع و گەردنگەچی زیاتر تێدایە، الإتحاف/٢/٣٠٩.

(٣)رواه أبوداوود (٦٥٠) وبلفظه عند أحمد في المسند (٣/٢٠).

(٤) رواه ابن أبي شيبة في (المصنف) (٧٩٦٤)

بەڵام ئێستا نۆبەی کۆمەڵێك هاتۆتە پێشەوە[1]، نەزاندوویی و ئارەزوو ویستیان کردووە بە پاکوخاوێنی، (واتە زۆر ڕۆچوون لە هەموو شتێکدا لەگەڵ نەزانین وەسوەسەکاریدا، )وە ئەوانە دەڵێن:

ئەمەی ئێمە دەیکەین بنەمای ئاینە، زۆربەی کاتەکانیان لە جوانکرنی ڕەنگ و ڕوخساری زاهیرییاندا بەسەر دەبەن، وەك ئەوەی پرچ داهێنان و هۆنینەوەی، چۆن بوکەکەیان دەڕازێننەوە ، دەروونی شاراوەشیان وێرانەیەو، پڕیەتی لە پیسی کیبر و نەسەقزلی و کینەو عوجب و نەزانین و ڕیاکاری و دوڕویی، ئەم کارانەشیان پێ خراپ نییە و، دژیشی ناوەستن و، سەریشیان لێی سوڕنامێنێت، خۆ ئەگەر یەکێك لە جیاتی بە ئاووبەرد تەنها بەبەرد خۆی پاك کاتەوە، یان بەپێی پەتی بەسەر زەویدا بڕوات، یان لەسەر زەوی یان لەسەر حەسیرێك نوێژ بکات، بەبێ بەرمال و ڕاخەرێکی تایبەتی، یان بەسەر فەرش و ڕایەخدا بڕوات بە بێ ئەوەی پێستێکی خۆشەکراو یان خوففێك لە پێبکات، یان دەستنوێژ لە قاپ و حاجەتی پیرەژنێك بگرێت، یان هی پیاوێکی بێ دین، ئەوا قیامەتی لەسەر هەڵدەستێنن، وە زۆر ئینکاری لێ دەکەن و، بە پیس وپۆخڵ ناوی دەبەن و، لەناو کۆڕو کۆمەڵی خۆیان دەری دەکەن، وە بێزیان نایەت پێکەوە هاوبەشی سفرەو خوانی بکەن، یان تێکەڵیی بکەن، ئەو حاڵی شڕو وڕیەی کە نیشانەی ئیمانە، بە پیس و پۆخڵی حیسابی دەکەن [2]، وە نەزاندوویی و ئارەزو ویستیشیان کردووە بە پاك و خاوێنی .

---

(١) واتە ئەوکاتە لە دەورو بەری ٤٩٠ ی کۆچیدا، إتحاف/٢/٣١٠.

**(٢) ئەبو داوود ڕیوایەتی ئەم فەرموودەی کردووە(٤١٦١) ألا تسمعون، ألا تسمعون،؟ إن البذاذة من الإيمان، واتە بێداربن و ببیستن، ئەوەی ڕەش و ڕووت و بەرگی شڕووڕی لەبەردا بێت ئەوە نیشانەی بوونی ئیمانە تیایدا، ئەی نەتانبیستووە**

بنواڕە چۆن کاری ناپەسەند و ناڕەوا جێگەی چاکەو مەعرووفی گرتۆتەوە،وە کاری باشیش بووە بە ناپەسەند، وە چۆن لە دیندا شکڵ و ڕەسمەکەیشی پوکاوەتەوەو لەبیرچووەتەوە. وەك چۆن زانستی و لێکدانەوەیشی لەبیرکراوە !!

ئەگەر بڵێیت: کەواتە ئایا تۆیش وا دەڵێیت: کە ئەم نەریت و شێوازەی کە صۆفیەکان دایانهێناوە، لە شکڵ و بەرگ و پاکوخاوێنیان، ئایا لە قەدەغەکراوەکانە، یان لە کارە نەشیاوو ناپەسەندەکان؟

منیش دەڵێم: پەنادەگرم بە خودا کە وەڵامێکی ڕەهایی بدەمەوە، بە بێ ئەوەی ڕوونی بکەمەوە، بەڵام ئەوەی ڕاستییەدەیڵێم:

ئەم زۆر لەخۆکردنە لە هەوڵدان بە پوخت ڕاگرتنی خۆی، وە ئامادەکردنی دەفرو قاپ و ئامێری زۆر و گرانبەهاو، خوف و لە پێکردنی جیلد و خوری و چەفتەو سەپۆشی سەر، کە خۆپارێزی لە تەپوتۆزو گەرماو نەزەرکردن و هاووێنەکانی، لەم وەسائیل و هۆکارانە کە بەکاریان دەهێنن. ئەگەر بەتەنها سەیری خودی خۆیان بکەین، شتێکی موباحن و بەکارهێنانیان درووستە، بەڵام هەندێك جار بەهۆی نییەت و جۆری بەکارهێنانەوە بە چاکە بۆیان دەنوسرێت، یان بە خراپەو ناپەسەند.

ئەوەی کە خودی خۆی موباحە و درووستە بەکار بهێنرێن، ئەوە لای هەموان ئاشکرایەو شاراوە نییە، چونکە خاوەنەکەی بۆی هەیە ماڵ و جەستەو جل و بەرگی خۆی چـــۆن دەیـــەوێت بەکـاری بهێنێـت، مادەم زایەی نەکـات، یان

---

فەرمـوودەی پێغەمـبەر : عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ - ﷺ يَقُـولُ: «رُبَّ أَشْـعَثَ أَغْبَـرَ ذُو طِمْـرَيْنِ لَا يُؤْبَـهُ لَـهُ لَـوْ أَقْسَـمَ عَلَى اللَّـهِ لَأَبَـرَّهُ» التوحيـد لابـن منـده ٢/ ٩٢، (٢٣٢) صحيح.

زیادەڕەوی تێدانەکات بۆی هەیە ماڵی خۆی بەکار بهێنێت.

بەڵام ئەم بەکارهێنانە چۆن دەبێتە ناپەسەند، بەوەی کە بیکاتە ئەصڵ و بنەچەی دین، تەفسیری فەرموودەکەی پێغەمبەر دەکات:

(**بُنِيَ الدِّينُ علَى النَّظافَة**)[1]، واتە بنەمای ئیسلام لە سەر پاك و خاوێنی دامەزراوە، وای لێ بێت کە ئەو حاڵەتەی چینی یەکەمی ئەصحاب لەسەری بوون و ئاسانکاریان کردووە، ئەو ئینکاریان بکات و، مەبەستیشی ئەوە بێت زاهیری حاڵی خۆی لەبەرچاوی خەڵکی چاکبکات،سەرنج و هەڵوێستیان لەسەرخۆیان جوانبکەن، ئەمەیە کە جێگەی مەترسییەو، دەبێتە حاڵەتێکی ڕیاکاری، بۆیە ئەم جۆرە خۆپاککرنوەوەو خۆڕازاندنەوەیە، بەم دوو لێکدانەوەیە دەبێتە کارێکی مونکەرو ناپەسەند.

ئەوەش کە ببێتە حاڵەتێکی باش و، بە چاکەیش بۆی بنوسرێت، بەوەی کە مەبەستی تەنها خێر و چاکە بێت نەك خۆ ڕازاندنەوە، لەگەڵ ئەمەشدا نابێت ئینکاری لە حاڵی ئەوانە بکات کە پێشتر وازیان لەو کەمالیاتە هێناوە، وە نابێت وای لێ بکات بەهۆی ئەو بەرگ و ماڵ و ئامێرە نوێیانەوە لە نوێژ و سەرەتای دەستپێکی نوێژ دابەستن دوای بخات، بەڵکە نابێت سەرقاڵی بکات و کارێکی گرنگتری لە دەست بدات، یان لە فێربوون و پەروەرەدەیی و زانست و زانیاری و کارە بەکەڵکەکان بەدووری بخاتەوە، ئەگەر نەلکێت بە یەکێك لەم ئەگەرانەی باسمانکرد، ئەوە کارەکەی دورووستەو ،دەشگونجێت ببێت بەکارێکی خێردار و، نییەتی ڕەزامەندی خودای لێ بهێنرێت، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم مەرجانە تەنها بۆ ئەو بێکارانە دەگونجێت، کە ئەگەر بەم شتانەوە کاتەکانیان

---

(١) رواه الرافعي في (التدوين في أخبار قزوين) ١/١٧٦، بلفظ: **فإن الله بنى الإسلامَ على النظافة**، وعند الترمذي (٢٧٩٩) (**إنَّ اللهَ طيبٌ يحبُّ الطيب، نظيفٌ يحب النظافة...**)

بەسەر نەبەن، لەوانەیە خۆیان سەرقاڵی نوستن و قسەی بێهوودەو کات بەفیڕۆدان بکەن، کەواتە بەو کارانەی تر خۆیان خەریك بکەن باشترە بۆیان، چونکە مەشغوڵ بوون بە پاك و خاوێنییەوە، زیکری خودا لە دڵیاندا تازەدەکاتەوەو، یادی بەندایەتی باشتر دەکەن، ئەو کاتە ڕێگریان لێ ناکرێت مادەم لەسنووری شەرعی دەریان نەکات و، تووشی مونکەر و زیادەڕەوەیان بکات.

بەڵام ئەوانەی ئەهلی کارو زانستی و حەقیقەتن، ئەوە نابێت هەرگیز خۆیان بەو شتانەوە خەریك بکەن، مەگەر لە پێویستی وناچاریدا، ئیتر زیادەڕەوی بکەن دەشکێتەوە بەسەریاندا، چونکە بەنرخترین شت زایە دەکەن کە کاتی ژیانە، بەتایبەتی بۆ کەسێك کە بتوانێت سوودمەندبێت لێی، سەریشت سوڕنەمێنێت لەم قسەیە، چونکە **((حَسَناتُ الأَبرار سَيِّئاتُ المُقَرَّبِين))**[1]،

ئەوەی بۆ پیاوباشان بەچاکە بۆیان دەنوسرێت، هەمان شت بەنیسبەت نزیکان و موقەڕەبینی دەرگای خودایییەوە بە خراپە لەسەریان دەنوسرێت.

وە نابێت کەسێکی بێ کارو(بەتاڵ)، خۆیشی واز لە پاکوخاوێنی بهێنێت و حاڵەتی صوفیەکانیش ڕەدبکاتەوە و، وایش گومان ببات کە ئەو چاو لە صەحابەکان دەکات، چونکە کاتێك ڕاستدەکات کە لەوان دەچێت، کە کاتی خۆی تەرخان نەکات بۆ کاری زۆر گرنگ نەبێت، وەك ئەوەی وتیان بە داوودی طائی[2] بۆچی ڕیشت داناهێنیت؟ وتی: کەواتە من بێکارم.

بۆیە نابینم بۆ زانا و فێرخواز کە خەریکی زانستن، ئەوەش کە کار بەزانستەکەی دەکات، کاتەکانی هەروا بۆ بەرگ شۆردنێك بەفیڕۆ لەدەست بدات ، بۆئەوەی

---

(١)السخاوي: هو من كلام أبي سعيد الخراز، رواه ابن عساكر في ترجمته مرفوعا.إتحاف٢:٣١٢
(٢)أبو نعيم في الحلية(٣٣٩/٧).

کابرای بەرگشۆریش وا گومان نەبات کە کارەکەی ئەوی بەدڵ نەبووە و خۆیشی وەسوەسەی خراپی بۆ درووست نەبێت.

کاتی خۆی لە چەرخی یەکەمدا نوێژیان دەکرد لەسەر پێستی خۆشەکراو، بێ ئەوەی پرسیار بکەن کێ خۆشەی کردووە و کێ هێناویەتی، وە نەبیستراوە لە کەسێکیانەوە، کە جیاوازیان خستبێتە میانی پێستی خۆشەکراوو بەرگی شۆرراو لە پاکی و پیسیدا، بەڵکو ئەوانە بەچاو ئەگەر پیسیەکیان ببینیایە، خۆیانیان لێ دەپاراست، ئەوەندە بەوردی سەیری ئەو شتانەیان نەدەکرد کەئەگەر و خەتەرەو خەیاڵاتیان بۆ درووست بکات، بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەوەندە بەوردی سەیری وردەکاریەکانی ڕیا و حاڵەتەکانی ڕیاو زوڵمیان دەکرد، تا گەیشتە ئەوەی کە سوفیانی ثەوری (خوای لێ ڕازی بێت) هاوڕێکەی لەڕێگەدا سەیری دەرگای ماڵێکی بەرزی ئاوەدانی دەکرد:

فەرمووی: وامەکەو سەیر مەکە، ئەگەر ئەو خەڵکە ئەوندە سەیریان نەکردایەو بایەخیان پێ نەدایە، ئەویش ئەوەندەی تیاسەرف نەدەکرد و بەرزی نەدەکردەوە، کەواتە ئەوەش کەسەیری دەکات، دەبێتە یارمەتی دەر بۆی، کە ئەویش زیاتر بایەخ بە جوانکاری بدات[1].

ئەوانە حاڵیان وابوو، هەموو بیرو هۆشیان ئامادە دەکرد بۆ تێگەیشتن لە وردەکاری و دەرگاکانی ڕیاکاری، کەلە ڕیا خۆیان بپارێزن، نەك لەو ئەگەرەی کە تووشی پیسییەك ببن یان نا.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەر زانایەك کابرایەکی بازاڕی دەسکەوت و پاك و خاوێنیشی دەزانی، ئەوە باشترە کە بیدا پێی کارەکەی بۆ ئەنجام بدات و، ئەویش سوودێك وەربگرێت و ئەمیش سەرقاڵی کاری خۆی بێت، ئاسانکا

---

(١) قوت القلوب/ ١/١٧٠.

ریەکیشە بۆی، وە کابرای بازاڕیش نەفسی سەرکەشی ماوەیەك لە بیرو کاری خراپ و گوناە دوور دەخاتەوەو، کارێکی درووستیش ئەنجام دەدات، چونکە نەریتی نەفسی مرۆڤ وایە، ئەگەر بە شتێکەوە خەریکی نەکەیت، ئەوا خاوەنەکەی مەشغوڵ دەکات بە خراپترەوە، وە ئەگەر مەبەستیشی ئەوەبێت کە خۆی لە زانایەك نزیك بخاتەوە، ئەوە کارێکی زۆر باشی کردووە، کاتی زاناکەش وەك خۆی دەمێنێتەوەو بە فیڕۆ لەدەستی ناچێت، وە کاتی ئەو کەسەش بە باشی بەڕێوەدەچێت و لەهەموو لایەکەوە دووچاری خێر دەبن.

بەم نموونەیە با ئەویش زیرەکانە بیربکاتەوە، بۆ تەواوی کردەوەکانی تری، وە باشترەکانیان پێش بخات و، ئەوەش دیاری بکات کە هۆکاری بایەخدان بەهەندێك و، پێشخستنی بەسەر هەندێکی تردا، بەڕاستی وردبینی بۆ هەموو چرکە ساتەکانی تەمەنی، کە وەك کاتێکی زێڕین بە فیڕۆ لەدەستی نەچێت و، لە باشترین چاکەو خێردا بەسەری بەرێت، زۆر باشترە لەوەی کە وردبینییەکانی بۆ وەدەستهێنانی ماڵی دونیاو هەموو بەش و لق و پۆکانی بێت.

ئەگەر ئەم دەستپێکە و سەرەتایەت زانی، بۆت ڕوون بوویەوە کە پاك و خاوێنی چوار پلەی هەی..

ئەوەش بزانە ئێمە لەم پەڕاوەدا ئەوەی دەمانەوێت قسەی لەسەر بکەین، تەنها باسکردنی پلەی چوارەمە ، کە پاکوخاوێنی ڕواڵەت و زاهیرییە، چونکە لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا، تەنهاو بەمەبەست باسی کردارە زاهیرییەکان دەکەین و دەڵێین:

## پاکوخاوێنی ڕواڵەتی سێ بەشی هەیە:

پاك بوونەوەیەك لە پیسی، وە پاکبوونەوەیەك لە بێدەستنوێژی، وە پاکبوونەوەیەکیش لە لابردنی شتە زیادەکانی جەستە، وەك نینۆککردن و بەکار هێنانی مووس و نورەو تێکەڵەی لابەری موو و خەتەنەکردن و ئەوانی تر.

# بەشی یەکەم

## لەبارەی خۆپاککردنەوە لە پیسی

## وەسەرنجدان لەوەی کەلادەبرێت(لە پیسییەکان) وە ئەوەش کەلای دەبات (وەك ئاو)، وە چۆنیەتی لابردن و لادانەکانیان.

### لایەنی یەکەم: ئەوەی لادەدرێت:

ئەوش بریتییە لە پیسییەکان، ماددە عەینییەکان[1]، سێ بەشیان لێ دەکەوێتەوە: (جەماد)وبێگیانەکان، گیاندارەکان، ئەو پارچانەی کە لێیان دەبنەوە.

**ماددە بێ گیانەکان:**

هەموویان پاکن تەنها ئارەق نەبێت، وە هەموو ئەوانەی زۆر کوڵاون و خەستبوونەتەوە و سەرخۆش دەکەن.

**گیاندارە رۆح لەبەرەکانیش:**

هەموویان پاکن جگە لە سەگ و بەراز نەبێت، یان ئەوەی لەهەردوکیان بووبێت، یان لەیەکێکیان، وە ئەگەر ئەو گیاندارانە مردن، ئەوە هەموویان پیسن جگە پێنجیان نەبێت:

جەستەی مردووی ئادەمیزاد و، ماسی و، کوللەو، کرمی ناو سێو، وە هەموو ئەوانەش کە وەك کرمی سێو وان، کە خۆراك هەڵیاندەهێنێت و لەناویدا پێدەگەن، وە هەموو ئەوانەی کە خوێنیان لێ نارژێت، وەك مێش و

---

(١) ماددەی عەینی ئەوەیە کە بەخۆیەوە راوەستابێت، وە لە شوێنێکدا گیرسابێتەوەو پەیوەندی بە هیچ ماددەیەکی ترەوە نەبێت.

قالۆنچەو هاووێنەکانیان ( وەك: مێرو و قرژانگ و ..تاد)، ئەمانە ئەگەر بکەونە ناو هەر ئاوێکەوە، ئاوەکە پیس نابێت.

## پارچەو ئەندامی گیان لەبەرەکان:

**ئەمەیش دوو بەشە:**

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە پارچەیەکی لێ جودا دەبێتەوە، حوکمی ئەمەش وەك مردووەکەیەتی (١) مووی ئاژەڵیش بە لێکرنەوەو بڕین و مردنیش پیس نابێت، بەڵام ئێسکەکەی یەکسەر بە مردنی پیس دەبێت،

**دووهەم:** ئەو تەڕاییانەی کە لە ناوسکیەوە دەردەچێت، ئەوەی گۆڕانی بەسەردانایەت، شوێن و جێگایەکی نەبێت کە تێیدا کۆبووبێتەوە، ئەوەی وەك خۆی بێتە درەوە، وەك: فرمێسك و ئارەق جەستەو، لیکی دەم و ئاوی لووت ئەوە پاکە، مادام لە گیاندارێکی پاك بێت. بەڵام ئەوەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و شوێن و جێگایەکیشی هەیە لە ناوسکدا، ئەوە پیسە، وەك خوێن و میز و پیسی، مەگەر ئەوانە نەبێت کە بنەماو ماددەی درووست بوون ی گیاندارن، وەك مەنی (ئاوی پیاو) هێلکەی پەلەورە گۆشت خوراوەکان، بەڵام کێم و جەراعەت و خوێن و میز و شیاکەو تەرسی گیان لەبەران بە گشتی پیسن.

---

(١)لما روي عنه ﷺ ما أُبينَ مِن حَي فهُو ميّتٌ أخرجه الحاكم من حديث أبي سعيد بلفظ ما قطع وأخرجه الدرامي وأحمد وأبو داود والترمذي من حديث: أى واقد الليثى بلفظ: ما قطع من البهيمة وهي حيَّة فهو ميتة وأخرجَه ابن ماجه والطبراني وابن عدي من حديث تميم الداري بلفظ: ما أُخذ مِنَ الَبهيمَة وهي حَيَّة فهو مَيتةٌ وقد ظهر منه أن الأصل فيما يُبانُ من الحَيِّ النجاسَةُ، کەواتە ئەگەر ئەوەی کە پارچەکەی لێ بووەتەوە بۆخۆی پاك بوو، پارچەکەیشی پاکە، ئەگەر پیسیش بوو ئەوە پارچە جیابووەکەیشی پیسە، الإتحاف٢/٢١٦.

**وە چاوپۆشی نەکراوە لە کەم زۆری ئەم پیسیانە مەگەر لەم پێنجە:**

**یەکەم:** دوای خۆپاککرنەوە بەبەرد، ئاسەوارێکی کەمی ئەگەر پێیەوە مایەوە، مادەم لە سنوری ئەو جێگایە دەرنەچێت عەفوی لێ دراوەو ئەگەر بششۆرڕێت سوننەتە و واجب نییە.

**دووهەم:** چاوپۆشی کراوە لە گڵی سەرجادەکان و تەپۆتۆزی پیس و، ڕیخی سەرجادەو سەنوێلگەکان، کە نەتوانێت بەئاسانی خۆی لێیان بپارێزێت، با دڵنیاشبێت لە پیسییان، بەو ئەندازەی کە کەسێك ئەو پیسی و تۆزی ڕیخەی لێوەگلا بێت، کەمتەرخەمی خۆیی تێدا نەبێت و، زیان لە مرووئەت و پیاوەتیشی نەدات.

**سێیەم:** گوێرەوی و (خوف) کە لە پێ دەکرێت، ئەو پیسییەی کە پێیەوە دەلکێت چاوپۆشی لێ کراوە، کەڕێگەکان خاڵی نەبن لێیان، تەنها ئەوەندە هەیە بیهێنێت و بیپروێنێت بەو گڵەی کە بەسەریدا دەڕوات پاکی دەکاتەوە.

**چوارەم:** خوێنی کێچ و ئەسپێ، زۆر بێت یان کەم، ئەوەندەی لەسنوور دەرنەچوبێت، بەبەرگی خۆتەوە بێت یان بەرگی یەکێکی ترەوەبێت و، لەبەرت کردبێت.

**پێنجەم:** خوێنی زیپکەی دەم وچاوو جەستە، با کێم و جەراعەت و خێزاوەکەیشی تێ زابێت، یان بتەقێت و لێی جودا بووبێتەوە.

(حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عومەر زیپکەیەکی پرواند لە دەموچاویدا و تەقی، خوێنیشی پێداهاتە دەرەوەو نوێژیشی کرد و نەیشۆرد[1]، ئەوەش کە لەمانای زیپکەدایە وەك تەقینی دومبەڵ (ئەوەی کە زیاتر بەردەوامی هەیەو درێژە دەکێشێت) و ترازانی خوێنەکەی لە جێگەی خۆیداو، ئاسەواری خوێنی

---

(١) رواه البيهقي في السنن الكبرى. ١٤١/١.

(کەڵەشاخ) گرتنیش چاوپۆشییان لێ دەکرێت، ئەمانە حوکمەکەیان لکێنراون بە خوێنی (ئیستیحاضەوە)(خوێن چرکەی نەخۆشی)، [1] وە ئەوانەی تر کە هیچ کەس و حاڵێکی لێ بەدەر نابێت، ئەوە ناخرێنە مانای زیپکەکانەوە، چونکە ئەوەی بە کەمی ڕودەدات دەتوانێت خۆیان لێ بپارێزێت.

ئەم پێنج چاوپۆشیانەی کە شەریعەتی ئیسلام بڕیاری لەسەرداون، ئەو ڕاستییەت پێ نیشان دەدات، کە فرمانی تەھارەت و پاك و خاوێنی لەسەر بنەمای ئاسانکاری دامەزراوە، ھەرکەسێك بە گوێرەی وەسوەسەی خۆی داھێنانی تێدا بکات و، لەسەر خۆی گران بکات ئەوە باطل و بێ بنەمایە.

## لایەنی دووھەم :

**بەچی لادەبرێت و پاك دەکرێتەوە:**

یان بە شتێکی وشك و جامید ، یان بە شتی تەڕەوە:

وشکەکە: بەو بەردەی ئاسەواری پیسیەکەی پێ پاك دەکاتەوە، ئەمەش بە پاکەوەکەرێکی سووکتر دادەنرێت، بەمەرجێك کە بەردەکە ڕەق و زبر و ھەڵکەنەری پیسی و پاك و وشکیش بێت و، بەنرخ و بەھاداریش نەبێت.

**ھەموو شتە تەڕو شلەمەنیەکان:** ئەوە بزانە کە پیسی لاناچێت بەھیچ

---

(١) حوکمی خوێنی نەخۆشی ژنانەی بەردەوام (ئیستیحاضە) عەفوی لێدراوەو نوێژیشی لێ قەدەغە نەکراوە، بەڵام دەبێت بۆ ھەموو نوێژێك دەستنوێژێکی تازەی بۆ بگرێت، بنوارە: العزیز ١/٢٩٨، غەزالیش لە (الوسیط)دا فەرموویەتی:

ئەو ئاسەوارانەی لە دومەڵ و کێم و کەڵەشاخەو سەردەکات، خوێنەکانیان پاکە و حوکمەکەی ئەوەیە کە دەلکێنرێت بە خوێنی (ئیستیحاضەوە) مادەم زۆربەی کات تووشی ئەو حاڵەتانە ببێت، بەڵام ئەگەر بە دەگمەن بوو ئەوا دەلکێت بە خوێنی ئەجنەبییەوەو چاوچۆشی لێ ناکرێت.

شلەمەنییەك تەنها بە ئاو نەبێت، وە هەموو ئاوێكیش نا، بەڵكو ئەو ئاوە پاكەی كە گۆڕانێكی زۆری بەسەردا نەهاتبێت، بە تێكەڵبوونی لەگەڵ شتێكدا كە لێی نامۆ بێت و پێیەوە نەبەسترابێەوە، كەواتە ئاو لە پاكی لادەچێت ئەگەر بلكێت بە پیسییەكەوە و، تامی یان ڕەنگی یان بۆنی بگۆڕێت، بەڵام ئەگەر یەكێ لەم سیانەی صیفەتی ئاوەكەی نەگۆڕی و خۆیش نزیكەی دووصەد و پەنجا مەن ببێت، واتە پێنج صەد مشتی پێوانەی عێراقی، ئەوە پیس نابێت، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((إذا بَلَغَ الماءُ قُلَّتَين لَم يَحمِلْ خُبثاً))[١]

واتە: هەركاتێك ئاو گەیشتە (قوللەتێن) واتە پێنج صەد ڕیتل و مشتی بەغدادی، ئەوە پیسی هەڵناگرێت، بەڵام ئەگەر لەو ئەندازە كەمتربوو، بەلای ئیمامی شافیعییەوە (خودای لێ ڕازی بێت) ئەگەر لە ئاوێكی وەستاودا بێت ئەوە پیس دەبێت.

بەڵام ئاوێك كە لەبەری بڕوات و وەستاو نەبێت، ئەگەر بە پیسی گۆڕانی بەسەردا هات، ئەوە جێگەی گۆڕانەكە پیسەو، ئەوی تری كە لەژێریەوەیە یان لە سەریەوەیە ئەوە پیس نابێت، چونكە ڕەوتی ئاوەكە لەیەكیان جودا دەكاتەوە.

هەروەها ئەگەر پیسیەكە بڕوات، ئەگەر بەهۆی ڕەوتی ئاوەكەوە دەڕۆیشت، ئەوە ئەو شوێنە پیسە كە پیساییەكەی پیا دەڕوات، هەروەها ئەو ئاوەش كە لای ڕاست و چەپیەوە بێت و كەمتر بێت لە قوللەتێن، بەڵام ئەگەر ڕۆشتنی ئاوەكە لە ڕۆشتنی پیساییەكە بەهێزو خێرا تربوو، ئەو ئاوەی كە دەكەوێتە سەر پیسییەكەوە ئەوە پاكە. بەڵام ئەوەی دەكەوێتە ژێر پیسییەكەوە ئەوە پیسە، با زۆریش بێت و لێیشی دوور بێت، مەگەر هەمووی لەحەوزێكدا

---

(١)رواه أبو داوود (٦٣). والترمذي (٦٧) والنسائي (٤٦/١). وابن ماجه (٥١٧).

کۆببێتەوە و بەئەندازەی قوللەتێنێکی لێ بێت ئەوکاتە پیس نابێت.

وە ئەگەر لە ئاوێکی پیس ئەوەندەی قوللەتێنێکی لێ بێت، ئەوا پاك دەبێتەوە، کە پاکیش بوویەوە ئیتر بە لێکجیابوونەوەش پیس نابێتەوە.

ئەمە پەیڕەوی ئیمامی شافیعییە (خوای لێ ڕازی بێت).[1] بەڕاستی من حەزم دەکرد لەم بابەتەدا مەزهەبەکەی وەك مەزەبی ئیمامی مالیك بوایە (خودای لێ ڕازی بێت)، کە ڕای وایە:

ئاو با کەمیش بێت ئەگەر گۆڕانی بەسەردا نەیەت ئەوا پیس نابێت، چونکە خەڵکەکە هەمیشە پێویستیان بە ئاوەکە هەیە، وە مەرجی قووللەتێن هەندێك وەسوەسە ڕۆڵی تیایدا بووەو. بووەتە هۆکاری مشەقەت و ناڕەحەتی بۆ خەڵکەکە. وە بەڕاستیش هەروایە و ئەوەی بەتاقیکردنەوە وەك من بۆی دەرکەوتبێت و سەرنجی لێی دابێت، ئەم ڕاستییە دەزانێت.

وە من هیچ گومانم لەوەدا نییە، ئەگەر ئەم هەموو مەرجانە لەسەرەتاوە بە هەند وەربگیرانایە، ئەو کاتە مەککەو مەدینە لە هەموو جێگەیەك زیاتر دووچاری کێشەی ئاو دەبوونەوەو پاکوخاوێنی بەو مەرجانە بە ناڕەحەتی دەسدەکەوت، چونکە نە ئاوی ڕوبارو جۆگەو لەبەر ڕۆشتووی پیادا دەڕوات و، نە ئاوی وەستاوی زۆریشی هەیە،

## (بە پێی ئەم بەڵگەو خاڵانەی خوارەوە):

**(یەکەم)** لەسەرەتای چەرخی حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ تا کۆتایی چەرخی صەحابەکان، (تا صەدو دەی هیجری). باسی تاکە ڕوداوێك لە بارەی طەهارەت و پاکوخاوێنی ڕوی نەداوەو، پرسیارێکیش نەکراوە لە بارەی چۆنیەتی پاراستنی

---

(١) ئەمەیش ئەوە بە مەرج گیراوە کە دوای کۆبوونەوەی ئاوە پیسەکە گۆڕانی ڕەنگ و تام و بۆنی پێوە دیارنەبێت، بنواڕە: الخلاصة: ٦٠، وە (العزیز) ١/٤٩.

ئاو لە پیسی ، کە حاڵیشیان وابوو، گۆزەو کوندەی ئاویان، منداڵ و کەنیزەکەکانیان دەیانهێنا، کە خۆیان لە پیسی نەدەپاراست و، ئەوەندەش سەریان لێ نەدەکردەوە.

**دووهەم:** حەزرەتی عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) لە گۆزەی ئافرەتێکی نەصرانی دەستنوێژی گرت و[1]، لێیشی نەکۆڵییەوە کە ئەمە پیسە یان پاکە، ئەمەش وەك بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ وایە، کە جگە لە گۆڕانی (تام و ڕەنگ و بۆنی) ئاو، کەم و زۆری ئاویان بەمەرج نەگرتووە، ئەینا پیسی ئاوی دەستی ئافرەتێکی نەصرانی و گۆزەکەی، زیاتر دەچێتە زیهنی هەرکەسێکەوە کە سەرنجی بدات، کەواتە پەیڕەوی کردن لەم مەزهەبە (کە ئاو بگاتە قوڵلەتێنی تەواو) ناڕەحەتی لە جێبەجێکردنی داو، پرسیار نەکردنی هێچ کەسێك لە مبارەوە بە درێژایی ئەو ماوە زۆرە، نیشانەی ئەوەیە کە ڕاو مەزەبی (ئیمامی) مالیك پەسەندترە و، کردارەکەی حەزرەتی عومەریش بەڵگەی دووهەمە.

**بەڵگەی سێیەمیش:**

**((إصغاء رسول الله ﷺ الإناءَ للهِرَّة))**[2]،کەپێغەمبەر ﷺ خۆی دەفرەکەی بەردەستی ڕادەگرت، تا پشیلەکە ئاوی لێ دەخواردەوە، لە پاشان دەستنوێژی لێ

---

(١)رواه البیهقي في (السنن الكبرى) ١/٣٢، وەك پێشتر ڕونمان کردەوە.

(٢)أخرجه الدارقطني في سننه(٧٠/١) والطبراني في الأوسط من حديث عائشة بإسنادين ضعيفين بلفظ: **(كانَ يَصغى الاناء للهرة فتشرب منه ثم يتوضا)**. وأخرجَه الطحاوي مِن وَجه آخر وهو ضعيف أيضاً وأخرج الأربعة في حديث مالك مِن فِعل أبي قتادة وهو في الموطأ عن إسحق بن أبي طلحة عن حميدة بنت عبيد بن رفاعة عن خالتها كبشة بنت كعب وكانت تحت ابن أبي قتادة، **(أنَّ أبا قتادة دخلَ عَلَيها فسَكبت لَه وضُوءا فجاءَت هِرَّةٌ تَشرَب فأصفى لها الإناء حتى شَربت)**، وروى في آخرِ الحديث:**( إنَّها ليست بنَجَس، لإنَّها مِن الطوّافينَ عَلَيكمُ والطَّوافات)**. الإتحاف ٢/٣٣٠.

دەگرت. کە حاڵیشیان وابوو، سەری قاپ و دەفرەکانیان دانەدە پۆشی لێی، دەیشیانزانی کە پشیلە و مشك و حەشەراتی زیانبەخش دەخوات، وە لەوشارو وڵاتەکەی ئەواندا حەوزو کۆمای ئاوی قووڵی ئەوەندەی لێ نەبووە، کە پشیلە دەمی تێ بخات و ئاوی لێ بخواتەوە، ئەویش دانەدەبەزی بۆ ناو بیرەکان بۆ ئاو خواردنەوە، بۆیە بەناچاری لە قاپ و دەفرەکان ئاوی دەخواردەوە.

**چوارەم:** (حەزرەتی) شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) ئەوەی چەسپاندووە پیسی کەئاوی بەسەردا بکەیت پاك دەبێتەوە، ئەگەر ئاوە بەکار هاتووەکە نەگۆڕابێت،

وە ئەگەر گۆڕابێتیش ئەوە بەپیسی دەمێنێتەوە.

باشە چ جیاوازییەك هەیە لەمیانی ئەوەدا کە ئاو بگات بە پیسی و بەسەریدا بڕوات، یان پیسی بڕوات بەسەر ئاوەکەدا؟! وە قسەی ئەو کەسە چ واتایەك دەبەخشێت کە بڵێت: بەڕاستی هێزی تێپەڕبوونی ئاوەکە بەسەریدا پیسییەکە لادەدات و دووری دەخاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانین بەیەککگەیشتنیان ئەو ڕێگەی لێ ناگیرێت کە ئاوەکە تێکەڵی پیسییەکە نەبێت ؟!

وە ئەم پرسەیە ئەگەر ڕوبەڕوی پێویستی بکرێتەوە، بەڕاستی پێویستییەکی زۆرهەیە بەو ئاوە، ئیتر چ جیاوازییەك نییە لەوەدا کە ئاو بکرێت بەسەر دەبەو ئینجانەیەکدا کە ئاوی تێدا بێت، یان بەرگێکی پیس بخرێتە ناو ئینجانەکەوە کە ئاوی پاکی تێدا بێت، هەردوو حاڵەتەکە ئاساییە لە شۆردنی قاپ و بەرگ و پۆشاکدا.

**پێنجەم:** ئەوانە نەریتیان وابووە، کە لەپەراوێزی ئاوی کەمدا (وەك جۆگەلەیەکی بچوك بڕوات) خۆیانیان پاککردۆتەوە، وە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا (خودای لێ ڕازی بێت) هیچ ڕایەکی جیاواز نییە لەسەر ئەوەی ئەگەر میز کرایە ناو ئاوێکی لەبەر ڕۆشتوو، وە تام و ڕەنگ و بۆنیشی نەگۆڕی بێت،

ئەوا درووستە دەستنوێژی لێ بگیرێت، با ئاوەکە کەمیش بێت، کەواتە چ جیاوازییەك هەیە لە میانی ئاوێکی لەبەر ڕۆشتووی بەو شێوە و ئاوی وەستاودا؟!

خۆزگە دەمزانی: ئایا بەو شێوەبێت کە مەرجەکە تەنها بە نەگۆڕانی تام و ڕەنگ و بۆنی ئاوەکەبێت باشە، یان بە بەهێزی ئاوەکەبێت بەهۆی ڕەوتەکەیەوە؟ لەپاشان سنووری ئەو هێزە چییەو چەندێکە: ئایا ئەو دانەپاڵەیە دەکرێت بەسەر ئەو ئاوەدا کە جارییەو ناوەستێت لەناو بۆری ئاوی گەرماوەکاندا یان نا؟!

ئەی ئەگەر ئاوەکە نەدەڕۆیشت، جیاوازی چییە، بۆچی قیاسی نەکردۆتە سەر ئاوێکی لەبەر ڕۆشتوو؟ وە ئەگەر ئاوەکە دەڕۆشت و جاری بوو، جیاوازی چییە لەوەی کە دەکەوێتە ناو ئەو بۆری و لاسکانەوە، یان ئەوەی کەدەکەوێتە سەرچاوەی ئاوەکە، لەو دەفرو قاپانەی کە دەکرێن بەسەر جەستەداو ئاوەکەش جارییەو دەڕوات؟ کە دەشزانین میز زووترو زیاتر لەگەڵ ئاوە جارییە کەدا تێکەڵ دەبێت، لەو پیسییە وشکەی کە لە شوێنێکدا جێگیرە.

ئەگەر وا حوکمەکەدرا کە ئەو ئاوەی بەسەریدا دەڕوات با نەیشی گۆڕێت هەر پیسە تا ئەوکاتەی کە هەمووی لە چاڵێکدا کۆدەبێتەوەو قوللەتێنی لێ پێك دێت و ئیمجا پاك دەبێتەوە، چ جیاوازییەك هەیە لە میانی شتێکی پیسی وشکدا، یان تەڕ؟ کە ئاوەکە هەر یەك ئاوە و تێکەڵ بوونەکەش زۆر بەهێزترە لە وەی پیسییەکە بە پەراوێزو تەنیشتیدا بڕوات؟![1].

---

(١) ئەصفەهانی فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعی نەقڵ دەکات (قەولی قەدیمی) کە ئاوی جاری کەم بێت یان زۆر، خاو بێت یان تیژ، بە وەی بگات بە پیسییەك پیس نابێت مەگەر تام و بۆن و ڕەنگی بگۆڕێت، بنواڕە: الإتحاف ٣٣١/٢.

**شەشەم:** ئەگەر پاوەندێك لە میز بخرێتە ناو قوللەتێنێكی ئاوەوە، لە پاشان ئاوەكە خرایە ناو دوو حەوزەوە، هەر دوێڵچەیەك ئاو لە هەر كامیان دەربهێنرێت ئەوە پاكە، ئاشكرایشە كە ئەو میزەی تێكەڵی بووە كەمە، كەواتە خۆزگە دەمزانی؛ بۆ باسكردنی هۆكاری پاكیەكەی، ئایا بوترێت(عیللەتەكە) نەگۆڕانی وەصفی ئاوەكەیە، ئەوە باشترە؟

یان بوترێت بەهۆی بە هێزی و زۆربوونی ئاوەكەوەیە؟ كە لەدوای نەمانی زۆریەكەیشی و، دڵنیایی لە مانەوەی پارچەو بەشە پیسیەكانیش لەو ئەندازەدا كەتێكەڵی بووە و، لەپاشان ئاوەكە بووە بەدوو بەشەوەو، هەردووبەشەكەیش هەر پاك بن، ئەم دوو هۆكارە كامیان بەهێزترە؟!

**حەوتەم:**

گەرماوەكان هەر لە دێر زەمانەوە پیاوە خواناسە زاهیدە دونیانەویستەكان دەستنوێژیان لێ شۆردووەو، دەست و قاپ و دەفرەكانیشیان دەكرد بەناو ئەو ئاوە كەمەی كە لەناو حەوزەكاندا بووە، دەیشیان زانی كە بە دڵنیاییەوە دەستی پاك و پیس هەمیشە دەهاتە سەر ئەو ئاوە كەمانە.

بوونی ئەم هەموو فرمانانە، لەگەڵ زۆری پێویستی هەموان پێیان، ئەو ڕایە لە دڵدا بەهێزتر دەكات، كە ئەوانە سەیری نەگۆڕانی صیفەتی ئاوەكەیان دەكرد، پشتیشیان بەو فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ بەستووە:

**((خُلِقَ الماءُ طَهوراً لا يُنجِّسُه شئٌ، إلاَّ ما غَيَّرَ طَعمَهُ أَو رِيحَهُ أو لونه))**[1]،

---

(١)كذا في النسخ وفي بعضها: **(خلقَ اللهُ الماءَ طهورا لا يُنجسُه شئ إلا ما غيرَّ لونَه أو طعمَه أو ريحَه)**. قال العراقي أخرجه ابن ماجه (٥٢١) من حديث أبي إمامه باسناد ضعيف، وقد رواه بدون الاستثناء أبو داود والترمذي والنسائي من حديث أبى سعيد وصححه أحمد وغيره اهـ قلت: قال الحافظ وفي إسناد ابن ماجه أبو سفيان طَريف

واته: خودا ئاوی بە پاککەرەوە درووست کردووە، هیچ شتێك پیسی ناکات مەگەر تام و بۆنی بگۆڕێت.

**ئەمە جۆرێك لێکۆڵینەوەی لەسەرە:**

سرووستی هەموو شتێکی شل و تەڕ ئەوەیە: کە هەرچی دەکەوێتە ناویەوە وەك صیفەتەکەی خۆیی لێ دەکات، ئەوەی دەکەوێتە ناویەوە بێ دەستەڵاتەو شلەمەنییەکەش زاڵە بەسەریدا، هەر وەك چۆن دەبینیت صەگێك دەکەوێتە ناو کانگای وەبەرهەمهێنانی خوێ وە، هەموو ئەندامەکانی جەستەی دەبێت بە خوێ و حوکم دەکرێت بەپاك بوونەوەی، چونکە هەموو گیانی هەڵگۆڕاوە بۆ خوێ و، صیفەتی صەگیەتی تێدا نەماوە، هەروەها سرکە دەخرێتە ناو ئاوەوەو، شیر دەکرێتە ناو ئاوەوە، چونکە بۆخۆی کەمە، صیفەتەکەی خۆی لە دەست دەدات و، وێنەی ئاوی تێدا ڕەنگ دەداتەوە و هەموو سرووشتێکی ئەو وەردەگرێت. مەگەر بۆخۆی زۆر بێت و ڕواڵەتی ئاوەکە بگۆڕێت و کار لە بۆن و تام و ڕەنگی بکات .

---

بن شهاب وهو ضعيف متروك، وقد اختلف على شريك الراوي عنه، وقد روى هذا الحديث من رواية ابن عباس بلفظ: **(الماءُ لا يُنجسهُ شئ)**. رواه احمد وابن خزيمة وابن حبان ورواه اصحاب السنن بلفظ: **( الماء لا يجنب)**، ورواه الدارقطنى من طريق داود بن ابى هند عن سعيد بن المسيب قال: **أنزلَ اللهُ الماءَ طهوراً لا يُنجّسُه شئ، إلاّ ما غلَب علَى ريحهِ أو طعمِه** وقال صاحب الهداية من أصحابنا، وما رواه مالك ورد في بئر بضاعة وماؤها كان جاريا بينَ البساتين قال الحافظ في تخريجه على الهداية: كانَّه يشير الى حديث: **الماء لا ينجسه شئ**. واما وروده في بئر بضاعة فاخرجه أصحاب السنن الثلاث عن أبى سعيد قال: **(قيل يا رسول الله أنتوضأ من بئر بضاعة؟ وهُو يُلقى فيها الحَيض ولحُوم الكِلاب والنتن، فقال إن الماء طهور لا ينجسه شئ )** .....ينظر للمزيد الإتحاف ٢/٣٣٢-٣٣٣.

**ئەم پێوەرەی دیاریمانکرد، ئەوەیە کە:**

شەریعەتی ئیسلام هێمای کردووە بۆ ئاوی بەهێز، کە توانای هەیە بۆ لادانی پیسیەتی، وە شیاوی ئەوەیشە کە پشتی پێ ببەسترێت و هیوای لەسەردابنرێت، وە نارەحەتی و پێداویستییەکانی پێ لادەدرێت و، ئەوەیشی پێ دەردەکەوێت کە بۆچی پێی دەوترێت پاکەوەکەر، چونکە بەسەر پیسییەکەدا زاڵ دەبێت و پاکی دەکاتەوە، وەك چۆن ئاوێك کە بگاتە قەللەتێن، زاڵ دەبێت بەسەر پیسییەکەدا و لە خۆیدا دەیتوێنێتەوەو صیفەتەکەیشی دەگۆڕیت لە پیسییەوە بۆ پاکەوەکەر، وەك چۆن ئەو مادده پیسەی دەیشۆریت پاك دەبێتەوە، ئاوی جاری بدات بەلای پیسیدا و دەمی پشیلە بیخاتەناو لەگەنێك ئاوەوە هەمووی دەگۆڕێت بە پاك و، لەسەر صیفەتە کۆنەکەی لای دەدات.

وایش مەزانە ئەمە چاوپۆشییەکەو شەرع عەفوی لێدابێت، چونکە ئەگەر وابوایە، ئەوکاتە وەك ئاسەوار و پاشماوەی (جێگای خۆپاککردنەوە) دەبوو، یان جێگاخوێنی مێش و مەگەز، کە ئەگەر زۆر ببێت، ئەو ئاوەیش دەیدات بەلایاندا پیس دەبێت، نەك ئاوەکە ئەو پاك بکاتەوە، بەڵام دەبینین هەر ئەو ئاوەی کە دەکرێت بەشتێکی پیسدا پیسنابێت، بەڵکو ئەویش پاك دەکاتەوەو، جێ دەمی پشیلەکەیش پاك دەبێتەوە، با بە هۆی ئاوێکی کەمیشەوە بێت.

بەڵام مەبەستی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: ((**لايَحمِلُ خُبثاً**)) [1]، واتە: ئاو پیسی هەڵناگرێت، تێگەیشتنی واتای ئەم فەرموودەیە ئاسان نییە، چونکە ئاو کە گۆڕان بەسەر صیفەتەکانیدا هات، ئەو کاتە پیسیەکە هەڵدەگرێت.

**ئەگەر وتیان:** مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر نەگۆڕرێت، کەواتە دەگونجێت کە

---

(١) رواه أبو داوود (٦٣) والترمذي (٦٧) والنسائي(٤٦/١) وابن ماجه (٥١٧).

بڵێین: مەبەستی ئەوەیە زۆربەی کات ئاوێك پاك بێت پیسییە ئاسابیەکان ناگۆڕێت.

لەپاشان کار کردن بەو فەرموودەیە خۆبەستنەوەیە بە ناوەڕۆکی فەرموودە کەوە، لەکاتێکدا کە نەگەیشتبێتە قوللەتێن، (ئەوکاتە دەبێتە هەڵگری پیسییەکە، وەك ناوەڕۆکی فەرموودەکە ئەمە دەگەیێنێت)، وە وازهێنان بە کارکردن بە ناوەڕۆکی فەرموودەکە بەکەمتر لەو حەوت بەڵگەیەی کە بەیانمان کردن دەگونجێت و ڕێگای لێ ناکرێت.

کە دەشفەرموێت: ئاو پیسی هەڵناگرێت، ڕواڵەتەکەی ئەوەدەگەیێنێت کە ئەو پیسیە هەڵناگرێت، واتە:

صیفەتەکەی هەڵدەگێڕێتەوە بۆ صیفەتی خودی ئاوەکە، وەك چۆن دەوترێت: کـانگــای (خوێ) هەڵگری گڵاوی صەگ و غەیری ئەویش نییە، کەواتە:

تەنها صیفەتەکەی هەڵدەگێڕێتەوە ؛ ئەمەش بەو شێوەیە کە خەڵکەکە هەندێك جار خۆیان پاك دەکەنەوە بەو ئاوە کەمانەی کە لافاوو سێڵ لای دەدات و لەناو چاڵەکاندا کۆدەبنەوە، وە قاپ و دەفرەپیسەکانیشی تیادەشۆن، لە پاشان دەکەونە گومانەوە، ئایا ئەو ئاوە ڕوبەڕوی گۆڕانێکی کاریگەر دەبێتەوە یان نا، بۆیە ڕونی دەکاتەوە: کە ئەگەر ئاوەکە قوللەتێن بوو ئەوا بەهۆی ئەم پیسیە ئاساییەوە گۆڕانی بەسەردانایەت.

**ئەگەر بڵێیت:** خۆ پێغەمبەرﷺ بەدڵنیاییەوە فەرموویەتی:((**لاَ يَحمِلُ خَبَثاً**)) پیسی هەڵناگرێت، وە چەندێك پیسییەکە زیاتر بێت، ئەوا هەڵی دەگرێت، کەواتە ئەمەی کە وتووتە هەڵدەگەڕێتەوە بەسەرتدا؛

چونکە لەگەڵ زیاتر بوونی پیسییەکە، حوکمێکی تری جیاواز لەسەری جێگیر دەبێت، کە پیس بوونە، وەك چۆن بەبەرچاوتەوە ڕواڵەتەکەی

دەگۆڕێت، کەواتە لە هەردوو حاڵەتەکەدا و بە پێی هەردوو مەزهەبەکە(مالیکی و شافیعی) دەبێت تایبەت بکرێت بە پیسییە ئاساییەکانەوە.

## کەواتە پوختەی قسە ئەمەیە:

من لەم بابەتانەی کە پەیوەندی بە باسی پیسیەکانەوە هەیە، مەیلی دڵم بەلای ئاسانکارییە، وەك چۆن لە سیرەت و ڕێبازی سەلەفی صالحین و جیلی یەکەم حاڵی دەبین، بەمەش زیاتر دەتوانین ڕێگاکانی وەسوەسە بەرتەسك بکەینەوە، بۆیە فەتوام داوە بە طەهارەت و پاکی هەموو ئەو پرس و بابەتانەی لێرەدا ڕای جیاوازیان لەسەر بوو، لەهەموویاندا من وتوومە کە پاکن[1].

---

(١) لێرەدا خوێنەری بەڕێز بۆی دەردەکەێت کە ئیمامی غەزالی ڕەحمەتی خودای لێ بێت، لە زۆربەی ئەو بابەتانەی لە کتێبە فیقهییەکانی خۆیدا وەك سەرمەزهەبەکەی حەزرەتی شافیعی بڕیاری شەرعی چەسپاندووە، بەڵام لە ئیحیادا چونکە دوا کتێبەکانیەتی و، هیچ نوسراوێکیشی نییە کە ڕاجیاوازەکانی ئیحیای هەڵوەشاندبێتەوە، بۆیە ئەم فەتوایەشی لە دوا فەتواکانی ژیانیەتی، کە لەسەر ماوەتەوە تا وەفاتکردنی، کە ئاوی کەمیش با نەگەیشتبێتە قوللەتێن، ئەگەر پیسییەکی تێ کەوت و تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕێت، ئەوا ئاوە کەمەکە هەر بە پاکی دەمێنێتەوە.

ئەمەش مانای ئەوەنییە کە غەزالی وازی لە مەزهەبی شافیعی هێنا بێت، بەڵکو بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر توانای غەزالی لەسەر ئیجتهاد کردن لە ناو مەزهەبەکەیدا، تەنها بەرگری کاری فەتوای ئیمامەکەی نەبووە، بەڵکو وەك شێخی زوبەیدی باسی دەکات:

ئیمامی غەزالی لەوانە بووە کە هەموان تەسلیم بوون، کە توانای ئیجتهادی ناو مەزهەبی هەبووە و کردویشیەتی، لەوانەیە هەندێك وابزانێت لە دوارۆژەکانی ژیانیدا بووە بە مالیکی مەزهەب، نەخێر وانییە.

## لایەنی سێیەم: لەبارەی چۆنیەتی لابرنەکەیەتی:

ئەگەر پیسیەکە (حوکمیی) بێت واتە جورم و قەبارەیەکی هەست پێکراوی نەبێت، وەك پیسبوونێك بە میزکە وشك بووبێتەوە، تەنها ئەوەندە بەسە کە

---

شێخ زەروق لە شەرحی (قواعد العقائد)دا دەفەرموێت:

لە ئەبی عەبدوڵلای قوریم بیستووە کە ئیبن و عەرەبی لە کتێبی (الإقتراب شرح الجلاب) دا فەرموویەتی: کاتێك کە شێخی ئێمە (غەزالی) زۆر ڕۆچوو لەناو زانستەکاندا، وازی لە ئینکاری هێناو گەڕایەوە سەر مەزهەبی مالیکی، هەروەها گەورەم ئەحمەد زەرووقیش ئەم ڕایەی هەبووە، بەڵام شاراوە نییە، کە ڕایەکی تابڵێیت لاواز و بێ بنەمایە، والله أعلم.

منیش دەڵێم: ئیبن و عەرەبی یەکێکە لەو زاتانەی کە غەزالی بینیوەو زانستیشی لێ وەرگرتووە، لەوانەیە مەبەستی لە قسە پێشووەکەی تەنها ئەمە بێت کە غەزالی ئەو فتوای داوە، بۆیە دەڵێن گەڕاوەتەوە بۆ مەزهەبی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت)، بەڵام ئەگەر وابوایە غەزالی دەیفەرموو ئەوامن لەسەر فەتواکەی ئیمام مالیك دەڕۆم.

بەڵام ئەم وەك زانایەکی وردبین، دوای گەڕانێکی تەواو بە دوای هەموو بەڵگەکاندا، ئیمجا بڕیار دەدات ئەو فەتوایە بدات، نافەرموێت ئەوا بڕیارم دا تەقلیدی ئیمامی مالك بکەم، کەسێکیش لە یەکێك لە پرسەکاندا ئەگەر پێچەوانەی ڕای ئیمامەکەی ڕایەکی تری هەبێت و بڵێن ئەوە لەسەر مەزهەبەکەی نەماوە، کەواتە دەبێت چی بڵێین بە ئیمامە بەرزەکانی وەك: أبویوسف و محەممەد و زوفەر (خوایان لێ ڕازی بێت)کە زۆربەی زۆری فەتواکانیان پێچەوانەی یەکتریە و نایشگونجێت لەگەڵ ڕای پێشەواکەیان ئیمام ئەبو حەنیفە، وە زۆربەی ڕاکانیان لەگەڵ ئیمامی شافیعیدا یەك دەگرێتەوەو، تا وەفاتیشیان کرد هەر حەنەفی مەزهەب بوون. بنوارە بۆ زیاتر: الإتحاف ٢/ ٣٣٤.

ئاو بەسەریدا ڕێ بکات و هەموو لایەنەکانی ئەو جێگایە بگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر قەبارەیەکی بەرچاوی هەبوو:

دەبێت ئەصڵی پیسییەکە لاببرێت و، مانەوەی تامەکەیشی نیشانەیە لەسەر مانەوەی عەینی پیسییەکە، هەروەها مانەوەی ڕەنگی پیسیەکە هەمان نیشانەی هەیە، مەگەر لە شتێکدا کە بەتەواوی پێوەی بلکێت و لێی نەبێتەوە، ئەوە دوای هەوڵدانێکی زۆر پاش کڕاندن و پرواندنی تەواو، ئەگەر ئاسەواری مایەوە ئەوە عەفووی لێ دەدرێت.

## بەڵام دەربارەی لادانی بۆنەکەی:

ئەویش مانەوەی بۆنەکەی نیشانەکەی لەسەر مانەوەی ئەصڵی پیسییەکە، ئەمەیش چاوپۆشی لێ ناکرێت، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە بۆنێکی زۆر توندی هەبێت و، بە هەموو شێوەیەك هەوڵبدرێت و نەتوارێت بۆنەکەی بنەبڕ بکرێت.

ئەو کاتە بۆ لادانی بۆنەکەی، دەستپیاهێنان و گوشینی زۆر لەگەڵ ئەوەی کە ئاوی باشی بکرێت بەسەر دا، ئەوە لە جێگەی پرواندن و کڕاندنەکەیە کە باسمان کرد.ئەوەیش کە دەبێتە هۆی لابردنی وەسوەسەی خراپ لە مێشکیدا:

دەبێت بزانێت: کە هەموو شتەکان لە ئەصڵ و بنەچەدا بە دڵنیاییەوە بە پاکی خودا درووستی کردوون، ئەوەی پیسی پێوە دیار نییەو، بە یەقینیش دڵنیا نییە لەوەی کە پیس بووبێت و ،یەکێکی ڕاستگۆیش ئەو هەواڵەی پێ نەداوە، ئەوە با لێی دڵنیا بێت و نوێژی لەسەر بکات .

بۆ زانینی ڕاستی ئەم بابەتانە، هەرگیز پێویستی بەوە نییە کە بەپێی تێڕامان و گەڕان بەدوایدا ئیجتهادی بۆ بکات و، بەدوای حەقیقەتی پاکو خاوێنی ئەو شتەدا بگەڕێت، بەڵکو شەرع زاهیر بینەو، بەو بڕیارەی کە ئەصڵ لەشتدا پاکییە، فەرمانبەرداری ببێت و، نوێژیشی لەسەر بکات.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم

# بەشی دووهەم

## خۆپاككردنەوەكان

### باسی دەست نوێژ و خۆشۆردن و تەیەموم ، لە پێشـەنگی هەموویشیانەوە باسی تەهارەت و خۆپاككرنەوە

پشت بەخودای گەورە، باسی چۆنیەتی ئەنجامدانیان دەكەین، بەپێی ڕیزبەندییان، لەگەڵ ڕونكردنەوەی ئاداب و سوننەتەكانی، بەوەش دەست پێ دەكەین كە دەبێتە هۆكاری دەستنوێژ شتن، كە چوونە سەرئاوە .

### باسی ئادابی چوونە سەرئاو

پێویستە لە دەشتاییدا لەبەرچاوی خەڵكی خۆی دوور بخاتەوە، ئەگەر شتێكی دەست بكەوێت خۆیی لەپاڵدا كەنار بدات، وە نابێت پێش دانیشتن لەمیانی ناوك و ئەژنۆیەوە (عەورەتی) دەربخات، وە نابێت ڕوبكاتە خۆر و مانگەوە، وە نابێت ڕولە قیبلەبكات یان پشتی تێبكات، مەگەر لەناو خانوویەكدا بێت، وەباشتریش وایە لە خانویشدا ڕولە كەعبەنەكات و پشتیشی تێ نەكات، وە هەروەها درووستە ئەگەر لە دەشتێكدا خۆی بخاتە پاڵ وڵاخ و بارەكەیەوە، یان پارچەیەك لە بەرگەكەی خۆی بخاتە سەر زەوی و خۆی دابپۆشێت ، وە مەرجێكی تریش ئەوەیە، كە لە شوێن قسەكردنی خەڵكیدا دانەنیشێت، وە نابێت میز بكاتە ئاوێكی وەستاوەوە، یان ژێر درەختێكی بەرهەمدارەوەو، ناو كون و كەلەبەری زەمینەوە، وە خۆی بپارێزێت لە شوێنێكی ڕەق، تا پرژەكەی بۆی نەگەڕێتەوە، یان ڕوبەڕوی با، چونكە خۆیشی لە پاشمیز بۆ پاك نابێتەوە، وە دەبێت لە كاتی دانیشتنیدا قورسایی جەستەی بخاتە سەر پێی چەپی، وە ئەگەر لە بینایەكدا بوو، ئەوا دەبێت پێی چەپی بخاتە پێشەوە بۆ چوونە ژوورەوەو، پێی ڕاستیشی پێش بخات لە كاتی

هاتنه دەرەوەدا.

وەنابێت بە پێوە میز بکات، چونکە حەزرەتی عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: **((من حَدَّثكُم أنَّ رسولَ اللهِ صلَى اللهُ عليهِ وَسلَّم كانَ يبُول قائماً فلاَ تُصَدِّقُوه))**[1].

واتە: ئەوەی دەڵێت پێغەمبەر ﷺ بە پێوە میزی کردووە باوەڕی پێ مەکەن، حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

**((رآني النبيُّ ﷺ وأنا أبُول قائماً، فقالَ يا عُمَر لا تَبُل قائِماً))**[2]

کە پێغەمبەر ﷺ بینیمی بە پێوە بووم، فەرمووی : ئەی عومەر بە پێوە میز مەکە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئیتر هەرگیز بە پێوە میزم نەکردووە، ئەمەش ڕوخصەتی تێدا هەیە، چونکە حەزرەتی حوزەیفە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری دیوە ﷺ بە پێوە میزی کردووە، وەك دەفەرموێت: **((أنَّه ﷺ بالَ قائماً فأتيتُه بوُضوء فتَوضَّأ ومَسَح عَلَى خُفَّيهِ))**[3]، ئەڵێت: منیش ئاوم بۆبرد و دەستنوێژی پێ گرت و مەسحی خوففەکەی کرد .

وەنابێت لەو شوێنەدا خۆیی لێ دەشوات میز بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

(١)قال العراقي أخرجه الترمذي (١٢)والنسائي (٢٦/١) وابن ماجه ٣٠٧) قال الترمذي: هو أحسن شئ في هذا الباب وأصح اهـ

(٢)قال العراقي أخرجه ابن ماجه (٣٠٨) باسناد ضعيف، و رواه ابن حبان من حديث ابن عمر ليس فيه ذكر لعمر اهـ . ورواه الترمذي أيضاً(١٢) .

(٣)قال العراقي متفق عليه، البخاري(٢٢٤) ومسلم (٢٧٣) اهـ . قلت: أخرجه الستة بلفظ: **(أتى سباطة قوم فبالَ قائِما ثمَّ دَعا بماءٍ فمَسحَ على خُفيه)**، قال أبو داود قال مسدد قال: فذهبت أتباعد فدعاني حتى كنت عندَ عقِبة، ئەمەش بۆ ڕوخصەت و ڕێگە پێدانێکی تایبەتە، بۆ کاتێك کە نەتوانێت لەبەر هەرهۆیەك بێت کە دابنیشێت، ئەو ڕێگەوئاسانکارییەی بۆ کراوە.

**((عامَّـةُ الوَسـوسِ مِنهُ))**،

واتـــه: زۆربـــەی زۆری تـــووشبـــوونی وەسوەسە لەوەوەیە.[١]

عەبدوڵلای کوڕی موبارەکیش فەرموویەتی: ئەگەر ئاوەکە لەبەری بڕوات قەیناکە،[٢]، وە نابێت شتێك لەگەڵ خۆی بباتە ژوورەوە کە ناوی خودای لەسەر نووسرابێت، یان ناوی پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە نابێت بەسەری ڕوتەوە بچێتە ژورەوە، وە کاتێك دەچێتە ئاودەستەوە بڵێت: خودایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە هەموو پیسی و سەرچاوەیەکی پیسی، کە شەیتانی نەفرەت لێکراوو ڕەجم کراوە. **(اللَّهُمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ مِنَ الخُبثِ والخَبائِث، الشيطانِ الرَّجيم)**[٣]،

وەلەکاتی چوونە دەرەوەیشدا دەڵێت:

**((الحَمدُ للهِ الَّذي أذهبَ عَنّي ما يُؤذيني وأبقَى عَليَّ ما يَنفَعُني)) ويَكونُ ذلِكَ خارجاً عَن بَيتِ الماءِ في مَوضعِ الحاجَةِ**[٤]،

---

(١)قال العراقي اخرجه اصحاب السنن من حديث عبد الله بن مغفل قال الترمذي غريب قلت: واسناده صحيح اهـ قلت: ولفظهم: **(لا يبولن احدكم في مستحمة ثم يغتسل فيه، فان عامة الوسواس منه)** واخرجه احمد إلاَّ أنَّه قال: **ثم يتوضأ فيه** واخرج ابو داود والنسائي من حديث حميد بن عبد الرحمن الحميري قال: **(لقيت رجلاً صحِبَ النبى ﷺ قال نهى رسول الله ﷺ أن يتمشط أحدنا كل يومٍ أو يبولَ في مُغتَسله) الإتحاف: ٢/ ٣٣٨.**

(٢) رواه الترمذي (٢١).

(٣) أخرجه ابن ماجه، وابن أبي شيبة في (المصنف) (٤).

(٤) رواه ابن أبي شيبة في المصنف.(١٢). و الزيادة الأخيرة وجدت في بعض النسخ وسقطت من اكثرها، والدعاء المذكور اخرجه الطبراني في الدعاء من طريق سلمة بن دهرام عن طاوس رفعه: وأخرج الاربعة من حديث عائشة رفعه كان إذا خرج من الغائط قال: غفرانك. ينظر الإتحاف ٣٣٩/٢.

سوپاس بۆ ئەو خودایەی نارەحەتی و ئازاری لەسەر هەڵگرتم و ئاسودەی کردم، ئەوەش کە سوودم پێ دەگەێنێت بۆی هێلامەوە، لەکاتی چوونەدەرەوەدا ئەم دۆعایە دەخوێنێت.

وە دەبێت پێش دانیشتنەکە بەردی تایبەتی بۆ خۆپاککردنەوە هەڵبگرێت و ئامادەی بکات، وە ئاویش بۆ کەسێك کە هەردوکیان بەکاربهێنێت، وە دەبێت لە جێگەی سەرئاوەکە خۆی بە ئاو پاك نەکاتەوە تا پرژەکەی پیایدا بەرزنەبێتەوە، (مەبەست ئاودەستەکانی ئەمڕۆ نییە، ئەوە لە جێگەی خۆی دەتوانێت تەنها بەئاو خۆی پاك بکاتەوە).

وە دەبێت خۆی لە پاشمیز پاك بکاتەوە، پێش ئەوەی هەڵبستێت، بە قرخەو هێز دانە خۆو کۆکەکردن و ( هەڵسان و دانیشتن و هەرجۆرێك کە بۆی ئاسان دەبێت).

هەروەها بەنەرمی دەست بە و شوێنەدا بهێنێت تا پاشمیزی نەمێنێت، وە نابێت زۆر بیر لە وە بکاتەوە کە ئایا پاك بووەتەوە یان نا؟ چونکە ئەم بیرکردنەوەیە وەسوەسەی بۆ درووست دەکات و لە سەریشی گران دەبێت، ئەگەر هەستی بە تەڕییەك کرد لە جێگەیەکدا، با یەکسەر وای دابنێت کە ئەوە پاشماوەی ئاوەکەیە، ئەگەر بزانێت کە لەوانەیە ئازاری بدات، ئەوە با تۆزێك ئاوی بەسەردا بڕژێنێت، تا لە خودی خۆی دا ئەوە بەهێز ببێت کە پاکەو وەسوەسەی بۆ درووست نەبێت و، شەیتانیش زاڵ نەبێت بەسەریدا، وەك لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ وای کردووە

واتە: ئاوی پژاندووە بەسەر ئەو جێگەدا[1]، کاتی خۆی ئەوەی زۆر بە ئاسانی خۆی پاك بکردایەتەوەو خۆی زۆر نەهێڵایەتەوە، ئەوە لە هەموان شارەزاترو

---

(١) رواه أبو داوود (١٦٦) والنسائي ٨٦/١) وابن ماجه (٤٦١) .

تێگەیشتووتر بوو لە دین، ئەوەش کە وەسوەسەی ببوایە نیشانەی تێنەگەیشتنی بووە.

لە فەرموودەی (حەزرەتی) سەلمان (خودای لێ ڕازی بێت) هاتووە:

**((علَّمَنا رسُول الله ﷺ كلَّ شئ، حتَّى الخَراءةَ. فأمَرنا أن لا نستَنجي بعَظمٍ ولا رَوْثٍ، ونَهانا أَن نَستَقبِلَ القِبلَةَ ببَولٍ ولاَ غائِطٍ))**[1]،واتە پێغەمبەرﷺ هەموو شتێکي فێردەکردین، تەنانەت چۆنیەتی سەر ئاو کردنیش، وە فرمانیشی پێداین کە بە ئێسك و شتی پیس خۆمان پاك نەکەینەوە، وە ڕێگری لێ کردوین کە لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا ڕوبکەین لە قیبلە یان پشتی لێ بکەین.

پیاوێك بە هەندێك لە هاوڕێیانی وت، لە عەرەبە دەشتەکییەکان کە ڕوبەڕوی بوبویەوە وتی:

وائەزانم تۆ نازانیت تەنانەت سەر ئاویش بکەیت.

ئەویش وتی: بەڵێ بەگیانی باوکت! من زۆر جوان دەیزانم و زۆر لێی شارەزام، خۆم لە خەڵکی دوور دەخەمەوەو، بەردی چاك بۆ خۆ پاککردنەوە ئامادەدەکەم و، ڕو لەو ڕووەکە بۆنخۆشە دەکەم کە لە دەشتەکاندا پێدەگەن و ، پشتیش دەکەمە هەواوەو، وەکو ئاسك دادەنیشم، واتە: لەسەر پەنجەکانی پێم، دوای خۆیشم بەرزدەکەمەوە وەك دوای نەعامە.

هەروەها ڕێگەیش دراوە کە درووستە نزیك لە هاوڕێکەی میز بکات و، تەنها خۆی کەنار بدات، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەدا کە خاوەنی شەرم و حەیایەکی زۆرە، بەڵام ئەو ڕوخصەتەی بەکارهێناوە.

بۆ ئەوەی بۆ خەڵکەکەی ڕون بکاتەوە، کە لە کاتی پێویستدا درووستە لە نزیك هاوڕێکەیەوە دابنیشێت.

---

(١)قال العراق اخرجه مسلم(٢٦٢) قال الزبيدي اخرجه الاربعة في السنن . الإتحاف٢/٣٤٠.

# چۆنیەتی خۆپاککردنەوە

لەپاشان بۆ جێگەکەی بە سێ بەرد خۆی پاکدەکاتەوە، ئەگەر پوختەبوویەوە ئەوەباشە، ئەینا بەردی چوارەم بەکار دەهێنێت، ئەگەرنا ئەوا دەیکات بە پێنج،چونکە پوختەکردنەوەی دوای خۆی واجبەو، بە تاکیش بێت ئەوە سوننەتە،چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((مَنِ اسْتَجمَرَ..فَلْيُوتِرْ))[1]، واتە ئەوەی خۆی بەبەرد پاك دەکاتەوە، بابە تاك بێت، وە بەردەکە بە دەستی چەپی بگرێت و دەیهێنێت بە پێشەوەی دا ، لە پێش جێگەی پیسییەکەوە دەیهێنێت پیایدا، تا دەیگەێنێتە دوایەوە، بەردی دووهەمیش لە دواوە مەسحی دەکات تا دەیگەێنێت بە پێشەوەی، بەردی سێیەمیس دەیهێنێت بە چواردەوری شوێنی دەرچوونی پیسییەکەدا، تا هەمووی دەگرێتەوە.

وە ئەگەر ئەو جۆرە سوڕاندنەی بۆ ناڕەحەت بوو، وە لە پێش و دواوە مەسحی کردبوو ئەوە بەسیەتی، لە پاشان بە دەستی ڕاستی بەردێکی گەورە دەگرێت بە دەستیەوە، وە زەکەری دەگرێت بە دەستی چەپی، وە بەردەکە دەهێنێت بە زەکەری دا، وە دەیجوڵێنێت بۆلای چەپی، بە سێ جار لە سێ شوێنەوە مەسحی دەکات و پیایدا دەهێنێت، یان بەسێ بەرد ئەم کارە ئەنجام دەدات، یان لە سێ جێگەی دیوارێکەوە ، مەگەر تەڕایی ببێنێت لە جێگەی پێداهێنانەکەدا، ئەگەر بە دووجار تەڕایی هەبوو، پێویستە جارێکی تر پێیدا بهێنێت، وە ئەمەش پێویستە، ئەگەر مەبەستی بووتەنها بەبەرد خۆی پاك بکاتەوە، وە ئەگەر بۆ وشك بوونەوە پێویستی بە جاری چوارەم هەبوو، ئەوا سوننەتە لەبەر ئەوەی ویتر و تاك بێت، بیکات بە پێنج جار. لە پاشان با لەو جێگاوە بچێتە جێگایەکی تر، بۆ ئەوەی بە ئاویش خۆی پاك بکاتەوە، بەوەی کە

---

(١) رواه البخاري (١٦١) ومسلم (٢٣٧).

بەدەستی ڕاست ئاو بکات بە جێگەکەیدا، وە بەدەستی چەپیشی دەستی پێدا بهێنێت، تا ئاساری ئەو پیسییە نەمێنێت، کە بەهەستی پەنجەی دەستەکانی بەو پاك بوونەوە یە دەزانێت، ئیتر واز لەوە دەهێنێت کە بەڕاستی بگاتە دڵنیابی پاکبوونەوەی پیسابی ناوەوە، چونکە ئەمە دەبێتە سەرچاوەی وەسوەسەکانی.

ئەوەش بزانە هەرچی ئاوی پێ نەگات ئەوە باطینەو پێویست بە شۆردن ناکات، وە حوکمی پیسیەتی جێگیر نابێت بۆ ئەو زیادانەی لە ناوەوەیە تا نەیەنە دەرەوە، وە هەرچی بێتەدەرەوەو حوکی پیسیەتی وەرگرت و دەرکەوت، ئەوە پێویستە ئەوەی کە ئاوەکە پێی دەگات بیگەێنیت و بیشۆریت، ئیتر هیچ واتایەکیش بۆ وەسوەسە نامێنێت. وەکاتێك لە خۆ پاککردنەوە لێ دەبێتەوە دەڵێت:

((اللَّهُم طَهِّر قَلبِي مِنَ النِّفاقِ وحَصِّنْ فَرجِي مِنَ الفَواحِشْ))[١]،

واتە: خودایە دڵم پاکەوەکە لە نیفاق و دوڕویی، وەك چۆن عەورەتمت پاراستووە لە کاری خراپەو فاحیشە، وە دەستیشی باهێنێت بە دیوارێکدا، یان بەگڵی زەویدا ئەگەر بۆنەکەی مابێت، وە بەرد و ئاو کۆبکاتەوە بۆ خۆپاککردنەوە باشترەو سوننەتە، دەگێڕنەوە کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە :

﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾(التوبة/١٠٨)

واتە: لەناو ئەو مزگەوتەدا کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە حەز بە پاککردنەوەی تەواوی خۆیان دەکەن، خوایش ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاکدەکەنەوە، پێغەمبەر ﷺ بە ئەهلی قوبای فەرموو:

((ما هذهِ الطَّهارَة التي أَثنَى اللهُ بِها عَلَيكُم؟ قالوا: إنَّا نَجمَعُ بينَ الماءِ والحَجَر))[١]، ئەوە چییە ئەو پاکییەی کە خودا ستایشی ئێوەی لەسەر کردووە؟ وتیان : ئەوەیە کە بە ئاوو بە بەرد خۆمان پاك دەکەینەوە.

---

(١) قوت القلوب (٩٢/٢)، وكذا هو في (بداية الهداية) (٧٨).

# سەرەتای دەنوێژگرتن

کاتێك لە خۆپاککردنەوە لێبوویەوە، بە دەست نوێژ گرتنەوە خەریك دەبێت، چونکە هەرگیز پێغەمبەر ﷺ نەبینراوە لەسەر ئاو دەرچووبێت ئەگەر یەکسەر دەست نوێژی هەڵنەگرتبێت(٢)، وە بەسیواك کردن دەست پێ دەکات، بەڕاستی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((إِنَّ أَفواهَكُم طرُقُ القُرآنِ ، فَطَيِّبوها بالسِّواكِ))**[٣]،واتە دەمەکانتان ڕێگەیە بۆ خوێندنەوەی قورئان، کەواتە بە سیواك کردن بۆنخۆشی بکەن.

کەواتە: پێویستە لەکاتی سیواك کردندا نیيەتی پاککرنەوەی دەم بهێنێت، بۆ ئەوەی بە پاکی فاتیحەو زیکری خودای گەورەی پێ بکات.

وە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: **((صلاةٌ على أثر سواكٍ أفضلُ من خَمس وسَبعينَ صلاةً مِن غَير سِواك))** [٤]، نوێژێك بەدوای سیواك کردندا بێت، ئەوە خێری زیاترە لە (حەفتاە پێنج) نوێژ بە بێ سیواك.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((لولا أَنْ أَشُقَّ علَى أُمَّتي لأَمرتُهم بالسِّواكِ عِندَ كلِ صَلاةٍ))**[١]، واتە: ئەگەر نەبوایە بە زەحمەت و ماندونوونی ئوممەتەکەم، ئەوا فەرمانم پێدەدان بە سیواك کردن لە گەڵ هەموونوێژێکدا.

---

(١) رواه البزار، في مسنده. كما في مجمع الزائد(١/٢١٧).

(٢) رواه ابن ماجه (٣٥٤).

(٣) رواه ابن ماجه في سننه، (٢٩١) موقوفا على سيدنا علي ابن أبي طالب (رضي الله عنه) وهو عند البزار في مسنده (٦٠٣) مرفوعا بنحوه. وإسناده جيد.

(٤)قال العراقي أخرجه ابو نعيم في كتاب السواك من حديث ابن عمر باسناد ضعيف ورواه احمد في مسنده(٦/٢٧٢) بلفظ: **فضلُ الصلاة بالسواكِ على الصلاة بغير سواك سبعين ضِعفاً**) وانظر فيه: فيض القدير، ٤/٤٣١)، وهو بلفظ المصنف عند ابن عدي في( الكامل)، ٦/٣١٦. والحاكم وصححه والبيهقي وضعفه من حديث عائشة بلفظ: **مِن سَبعينَ صَلاةٍ** اهـ

وه پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((مالي أراكُم تَدخُلونَ عليَّ قُلْحاً؟ استاكُوا))[2]، بۆچی دەتانبینم کە دێن بۆ لام ددانتان زەرد هەڵگەڕاوە، سیواك بکەن با پاك و سپی ببنەوە، وە حاڵی پێغەمبەر ﷺ وابووە کە بەشەواندا چەندین جار سیواکی دەکرد[3].

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی (( لَم يَزَل رَسولُ الله ﷺيَأمُرُنا بالسِّواكِ حتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ يَنزِلُ فيهِ شيئٌ))[4]،واتە: بەردەوام پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدەداین کە سیواك بکەین، تاوامان گوماندەبرد کە ئایەتێکی لە سەر دێتە خوار. هەورەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((عليكُم بالسِّواكِ فإنَّه مُطهِّرةٌ للفَم ومُرضاةٌ للرَّب عَزَّ وَجَلّ))[5]،

واتە: لەسەرتانە کەسیواك بکەن، کە بەڕاستی دەمتان پاکوخاوێن

---

(١)قال العراقي متفق عليه من حديث أبي هريرة ، رواه البخاري (٨٨٧)، ومسلم (٢٥٢).قلت وأخرج أبو داود والنسائي بلفظ: **لأمرتهم بتأخير العشاءِ والسِّواك عِند كلّ صَلاةٍ**.

(٢)قال العراقي أخرجهُ البزار والبيهقي من حديث العباس بن عبد المطلب وأحمد في مسندهِ ٢١٤/١)، والبغوي من حديث تمام بن العباس والبيهقي من حديث تمام بن العباس والبيهقي من حديث عبد الله بن عباس وهو مضطرب اهـ قلت: والذي قال انه مضطرب هو أبو على بن السكن، فقد رواه أحمد والجماعة المذكورون وابن أبي خيثمة من حديث تمام .

(٣) رواه مسلم(٧٦٣).

(٤) رواه أحمد في مسنده(٣٣٩/١)،

(٥)أخرجه البخاري تعليقاً مَجزوما، أي في كتاب الصيام من حديث عائشة والنسائي وابن خزيمة موصولاً، قال العراقي وقد وصل المصنف هذا الحديث بحديث ابن عباس الذى قبله وقد رواه من حديث ابن عباس الطبراني في الاوسط والبيهقي في شعب الايمان اهـ ، قلت: وأخرجه ابن عدي من رواية الخليل بن مرة عن عطاء بن أبي رباح عن ابن عباس بلفظ: **مُطهِّرةٌ للفَم مُرضاةٌ للرَّبِ مُفرحَةٌ للمَلائكةِ**. قال والخليل عنده مناكير. قاله البخاري قلت: وأخرجه أحمد من حديث ابن عمر إلاَّ أنَّه قال: **مطيبةٌ بدل مُطهِّرة** والباقي كلفظ المصنف.

دەکاتەوەو، خودایشتان لێ ڕازی دەبێت. وە حەزرەتی عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ((**السِّواكُ يَزِيدُ فِي الحفظِ ويَذهَبُ البَلغَم**)) [1]

،واتە: سیواك كردن هێزی لەبەركردن زیاد دەكات و بەڵغەمیش لادەبات.

وە ئەصحابی پێغەمبەریش ﷺ دەهاتن بۆ مزگەوتەكەی پێغەمبەر ﷺ دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، وە سیواك لەسەر گوێكانیان بوو[2]

# چۆنیەتی سیواك كردن

دەبێت بە داری ئەراك بێت یان هەردارێكی زبر، كە بتوانێت زەردایی و سەوزی قەتماخ بەستووی سەر ددانەكان لاببات، وە بەلای پانایی و درێژیدا سیواكی پێ بكات، وە ئەگەر تەنها لایەكیانی كرد بابەلای پانیدا بێت.

وە سیواك كردن لە كاتی هەموو نوێژێكدا سوننەتە، وە لەكاتی هەموو دەست نوێژێكدا، با نوێژیش نەكات لەدوای دەستنوێژەكە، هەروەها سوننەتە دوای هەموو گۆڕینێكی بۆنی دەم بە هۆی نوستنەوە، وە دوای بێدەنگی و قسەنەكردنی زۆر و، خۆگرتنەوە لە خواردن، یان پاش خواردنی شتێك كە بۆنێكی ناخۆشی هەبێت.

---

(١)وفى كتاب النوادر للترمزي الحكيم: **السِّواكُ يزيد الحُفاظ حِفظاً** ، واته: زیرەكییەكەی زیاتر دەكات، وفي الكلام ابن عباس في السواك عشرُ خِصالٍ فذكر منها: **أنَّه يُنقِّي البلْغَم**. والبلغَم أحد الأخلاط الاربعة. بنوارە: الإتحاف ٣٤٩/٢.

(٢) رواه ابن أبي شيبة في المصنف، (١٨٠٥)، قال العراقي أخرجه الخطيب في كتاب اسماء من روَى عن مالك، وعن أبي داود والترمزي وصحَّحه **أنَّ زيد بن خالد كان يشهَدُ الصلوات وسِواكُه علَى أُذنهِ مَوضعَ القَلمِ مِن أُذُن الكاتِب**، اهـ . قلت: وهو الذى قدمناه آنفا وأولُه: لولا أن اشق. وفيه قال ابو سلمة: **فرأيتُ زَيدا يَجلِس في المَسجدِ وإنَّ السِّواكَ مِن أذنه موضعَ القلم من أُذن الكاتب، فكُلَّما قام إلى الصلاة استاك**. وقد اخرجه النسائى كذلك وحديث الترمزى مشتمل على الفعلين كما تقدم وقال حسن صحيح

# چۆنیەتی دەست نوێژ گرتن

لە دوای ئەوەی لە سیواککردن لێ دەبێتەوە، دادەنیشێت بۆ دەست نوێژ و ڕووەو قیبلە دادەنیشێت و دەڵێت: **بسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم**: چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**لاوضوءَ لِمَنْ لَم يُسَمِّ اللهَ عَليهِ**))[1].

خێری دەست نوێژی ناگات ئەگەر بەناوی خودای گەورەوە دەستی پێ نەکردبێت، مەبەستی ئەوەیە کە خێری تەواوی ناگات. وە لەدوای ئەمە بڵێت:

خودایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە خەتەرە و خەیاڵاتی شەیتانەکان و ئامادەبوونیان: ((**أعوذُ بِكَ مِن هَمَزاتِ الشَّياطِينِ وَأعوذُ بكَ رَبِّ أَنْ يَحضُرُون**)) وە داوای خێر و بەختیاری و بەرەکەتی خودا دەکات و پەنا دەگرێت لە شەڕ و شوم و بەهێلاکدا چوون، وەدەڵێت:

((**اللَّهُم انِّي أَسأَلُك اليُمنَ والبَرَكَة وأَعوذُ بكَ مِن الشُّؤمِ والهَلَكَة**))[2].

لە پاشان نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی بهێنێت، یان حەڵاڵ کردنی نوێژ، وە نییەتەکەی بەردەوام بێت تادەموچاوی دەشوات، ئەگەر نییەتی بیر چوو لەکاتی شۆردنی ڕوخساریدا ئەوە دانامەزرێت، پاشان مشتێك ئاو هەڵدەگرێت

---

(١)قال الرافعي كذلك روى في بعض الروايات ويدل عليه قوله ﷺ (**من توضأ وذكر اسم الله عليه كان طهورا لجميع بدنه، ومن توضأ ولم يذكر اسم الله كان طهورا لأعضاء وضوئه، ولو كانت التسمية واجبة لما طهَّر شئ**) اهـ والحديث الذى اورده المصنف قال العراقي أخرجه الترمزي وابن ماجه من حديث سعيد بن زيد احد العشرة ونقل الترمزي عن البخاري أنَّه أحسنُ شيئ في هذا الباب اهـ . الإتحاف ٢/٣٥٢.

(٢) لە قوت القلوب داوا هاتووە بەڵام ئیمامی نەوەوی (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ئەم دۆعاو ئەزکارانەی دەست نوێژ سەنەدی دووستیان نییە، وە عەللامەی موحەددیث ابن عەلانی مەکی لە(شرح الأذكار دا)بە باشی ئەم بابەتەی شیتەڵ کرۆتەوە،٢/٢٧-٣٠.

بۆ ناو دەمی، بۆ ئاو لە دەمڕادان و غەرغەرە پێکردنی، تا ئاوەکە دەگاتە نزیکی گەروی، مەگەر بەڕۆژو بێت ئەو کاتە خۆی بپارێزێت و ئەوەندە خەستی نەکاتەوە، وە بڵێت:

**(اللَّهُمَّ أَعِنِّي علَى تِلاوَةِ كِتابِكَ، وكَثْرَةِ الذِّكرِ لَك)**. خودایە یارمەتیم بدەیت لەسەر چاك خوێندنەوەی قورئانەکەت، وە بتوانم زیاتر زیکری تۆ بکەم.

لەپاشدا مشتێك ئاو هەڵگرێت بۆ لووتی و، سێ جار هەڵی بمژێت و، وە بەهۆی هەناسەیەوە ئاوەکە هەڵکێشێت و بیگەێنێت بە نەرمایی و سەری لووتی، وە لە ئاو لەدەم ڕادانەکەدا بڵێت: خودایە بۆن و بەرامی بەهەشتم دەست بخەیت و تۆیش لێم ڕازی بیت و بڵێت: **(اللَّهُم أَوجِدْ لِي رائِحَةَ الجَنَّة وأَنتَ عنِّي راضٍ)**، وە لە کاتی توڕدانی ئەوەی ناو لووتدا دەڵێت: خودایە من پەنات پێدەگرم لە بۆن و بەرامی ئاگر: **(اللُّهُمَ إنِّي أعوذُ بكَ مِن رَوائِحِ النار ومِن سُوءِ الدَّار)**، چونکە (ئیستینشاق) ئاو هەڵمژینەو (ئیستینثار) یش تۆڕدانی پیسی ناو لووتە.

لەپاشان مشتێك ئاو بەرزکاتەوە بۆ دەموچاوی، لە سەرەتای پانایی تەوێڵیەوە ئاوەکەی بکات بەسەردا، تا دەگاتە ئاستی چەناکەی لە خوارەوە، وە لە باری پانیشەوە بەینی هەردوو گوێیەتی، ئەو دوو سپیایی و قۆچەکانی سەری کە لەملاو لای تەوێڵیەوەیە، ناچێتە ناو دەم وچاوەوەو بەبسك ناو دەبرێت و بەشێکە لەسەر، وە دەبێت ئاو بگەێنێتە شوێنی جوان کردن، واتە ئەو دوو شوێنەی کە مووە وردیلانەکانی لێ دەڕوێت، لە نێوان زوڵف و قۆچەکانی سەریەوە، کە ژنان کردوویانە بەنەریت ئەو جێگە دەتاشن، ئەوەش ئەو ئەندازەیە کە دەکەوێتە تەنیشتی دەموچاوەوە، لەهەرشوێنێکدا بەشێکی پەتەکە دەیگرێتەوە لەسەر گوێ کانی.

لەهەر جێگەیەکدا ئەم پەڕی پەتەکە دەکەوێتە سەر گوێی، وە لایەنەکەی تریشی دەکەوێتە سەر سووچی تەوێلی، وە دەبێت ئاوەکە بگەێنێت بە هەموو

ئەو چوار شوێنەی کە مووی تێدا دەڕوێت، وەك هەردوو برۆو هەردوو سمێڵ و برژانگەکانی و هەردوو گوێسوی.[1] چونکە ئەو موانە زیاتر وایە کە پڕ نین و شاشن، گێسویش ئەو دوو بەستە مووەیە، کە لە بەرامبەر هەردوو گوێدان، لەو جێگەوە کە ڕیشی دەست پێدەکات.

هەروەها پێویستە ئاو بگاتە جێگا مووەکانی کەسێك کە ڕیشی تەنك بێت، واتە ئەوەی لە بەرامبەر ڕوخساریەتی، بەڵام ڕیشی پڕ، ئەوە پێویست ناکات، وە حوکمی (عونفوقە) واتە: ئەو موانەی کە لەژێر لێوی خوارەوە دەڕوێت، ئەوەش هەمان حوکمی ڕیشی هەیە، کە تەنك بێت یان پڕ، لە پاشان ئەو ئاو پێدا کردنە دەیکات بە سێجار، وە ئەو ڕیشەی کە بەری داوەتەوەو لە دەموچاوی دێتە خوارەوە، با ئاوی پێدا شۆڕبکاتەوە، بەڵام تەڕ بوونی ژێرەکەی پێویست نییە، وە دەبێت پەنجەی بکاتە هەردوو قونچکە چاوی و بیروێنێت و، ئەگەر ڕیپۆق(جیقنەی چاو) هەبوو، دە بێت هەڵکەنرێت و ئیمجا بشۆررێت، هەروەها ئەو جێگەی کلی تێدا کۆدەبێتەوە، هەر پیسییەك لەو شوێنانەدا هەبوو دەبێت لابدرێت و چاوەکانی بشۆررێن و پاك بکرێنەوە، وەك دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوە جوڵاوەتەوە[2]، بەو هیوایەش بێت کە هەڵەو گوناهەکانی لە چاوەکانیەوە دەچێتە دەرەوە، هەروەها لە کاتی شۆردنی هەر

(١) واتە : ئەو دوو بەستە مووەی لەبەرامبەر مێخی گوێیەکانیەوە بەرەو خوارەوەترن ،تا دەگاتە ڕوومەتەکان ، چونکە بەشێکن لە دەمو چاوی.

(٢)ال العراق روى أحمد في (مسنده) ٢٥٨/٥. من حديث أبي إمامة **كان يتعاهد الماقين** وروى الدار قطني من حديث أبي هريرة باسناد ضعيف: (**إشرَبوا الماءَ أعيُنكُم** ) اهـ . قلت : ورواه ابن عدي في الكامل والعقيلي في الضعفاء بلفظ: **إشربوا أعينكم من الماء عند الوضوء ولا تنفضوا أيديكم فإنها مراوح الشيطان**، الإتحاف ٣٥٩/٢.

ئەندامێکیدا بڵێت:((**اللهُمَّ بيِّض وَجهي بنُورِكَ يَومَ تبيَضُّ وجُوهَ أَوليائِكَ، ولا تسودَّ وَجهي بظُلُماتِكَ يَومَ تسوَدُّ وجُوهُ أعدائِكَ**))

واتە: خودایە بە نووری خۆت ئەو ڕۆژەی ڕوی دۆستەکانت سپی دەکەیت ڕووی منیش سپی بکە، وە ڕوم بە تاریکییەکانت ڕەش مەکە، ئەو ڕۆژەی ڕوی دوژمنەکانت ڕەش دەکەیت، وە سوننەتیشە ئەگەر ڕیشی پڕ بوو، ئەوا پەنجەکانی بخاتە ناو ڕیشیەوە، هەوڵی تەڕکردنی بدات.

لەپاشان هەردوو دەستی تا ئانیشکی دەشوات، وە ئوموستیلەکەی دەستی بجوڵێنێت، (ئەگەر ئاوی پێ نەدەگەیشت، ئەوە واجبە بشۆرڕێت) وە زیاتر ئاوی دەستنوێژ بگەێنێتە بەرزاییەکانەوە، لەگەڵ سەری ئانیشکەکانی، (واتە: چەندێك ئاوی دەستنوێژ زیاتر دەموچاوو قۆڵەکانی بگرێتەوە) ئەوە لە قیامەتدا زیندوودەکرێنەوەو ناوچاوو باڵەکانیان سپی دەبێت) فەرموودەیش بەم شێوە هاتووە: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**مَـــنِ استَطــاعَ أنْ يُطيــلَ غُـــرَّتَهُ فَليَفْعَلْ**)) [1]. ئەوەی دەیەوێت سپیایی ناوچەوانی و باڵەکانی زیاتر بێت با ئاوی دەستنوێژەکەی زیاتری بگرێتەوە، وە دەگێڕنەوە کە ئەو نوورەی خودا لە ناوچەوان و پێکانی بەندەکانیدا درووستی دەکات، دەگاتە ئەو جێگایانەی کە ئاوی دەست نوێژی پێ دەگات: ورويَ : ((**أنَّ الحليةَ تبلُغُ مَواضِعَ الوُضوءِ**))[2]،

(١)قال الزبيدي: هذا مع ما قبلهُ حَديث واحد عند البخارى (١٣٦) ومسلم (٢٤٦)، من حديث أبي هريرة: **إن أُمَّتي يُدعَونَ يَومَ القِيامَةِ غُـرّاًمُحَجَّلينَ مِنْ آثـارِ الوضُـوء، فمَنِ استَطاعَ مِنكُم أَن يُطيلَ غُرَّتَهُ فَليَفعَل!**

(٢)أخرجه البخارى ومسلم(٢٥٠)، من حديث أبى هريرة رضي الله عنه، قال العراقي: (**وتلك الحلية نورٌ يخلقهُ الله تعالى في جباهِ المؤمنين وأقدامهم، وهى الغرَّة والتحجيل**). قالهُ الشبرخيتى في شرح الاربعين ينظر: الإتحاف ٣٦١/٢.

وەبەلای ڕاستیەوە دەست پێ دەکات، وە دەڵێت:

(**اللَّهُم اعْطِني كتابي بيَميني وحاسِبني حساباً يَسيراً** )خودایە نامەی کردەوەکانم بدەیتە دەستی ڕاستمەوەو، لێپرسینەوەیەکی کەمم لە گەڵدا بکەیت، وە لە کاتی شۆردنی لای چەپیدا بڵێت:

(**اللُّهمَ أني أعُوذ بكَ أن تُعطِيَني كِتابي بشِمالي أوْ مِن وَراءِ ظَهري**) خودایە من پەنات پێ دەگرم ، کەنامەی کردەوەکانم بدەیتە دەستی چەپم، یان لە پشتەوە بیدەیتە دەستم. لە پاشان مەسحی هەموو سەری بکات، بە شێوەیەك کە دەستی تەڕ بکات و سەرە پەنجەڕاستەکانی بیانلکێنێت بە چەپەکانیەوە و، دایبنێت بەسەر پێشی سەریدا و، بیبات بەرەو دواوە و لە پاشاندا بهێنێتەوە بۆ پێشەوە، ئەمە مەسحێکی تەواو کرد، سێ جار ئەم سڕینەی سەرەی دووبارەی دەکاتەوە، وە دەڵێت:

(**اللَّهُم غشِني برَحمَتِكَ وأنزِل عَليَّ مِن بَركاتكَ، وأظِلَّني تَحتَ ظِلِّ عَرشِكَ، يومَ لا ظِلَّ إلاَّ ظِلُّكَ**) خودایە با ڕەحمەتی خۆت دامبگرێت و ، بەرەکەتی خۆت بڕژێنە بەسەرمدا و، لە ژێر سێبەری عەرشی خۆت جێگەم بکەرەوە، ڕۆژێك کە هیچ سێبەرێك نامێنێت جگە لە سێبەری تۆ نەبێت.

لە پاشان بە ئاوێکی نوێ با مەسحی دەرەوەو ناوەوەی گوێی بکات، بەوەی کە سەری پەنجەکانی ئیشارەتی بخاتە ناو کرکڕاگەی گوێیەوەو، تێیدا بیسوڕێنێت و، پەنجەی گەورەیشی بە چواردەوری گوێیدا بسوڕێنێت، وە ناولەپی تەڕی خۆیشی بە ئیحتیاط بهێنێت بەسەر گوێیدا، سێجاریش ئەم مەسحەی دووبارە بکاتەوە، وە بڵێت: (**اللَّهُم اجعَلني مِنَ الذينَ يَستمِعُونَ القَولَ فيتَّبعُونَ أحسنَهُ، اللَّهُم اسمَعني مُنادِيَ الجنَّةِ مَع الأبرار**) خودایە بمگێڕیت لەوانەی کە قسەکان دەبیستن و، شوێن باشەکەیاندەکەون، خودایە وام لێ بکەیت کە گوێم لە بانگکەری ئەهلی بەهەشت بێت لەگەڵ پیاوچاکاندا.

له پاشان به ئاوێکی تازه پشت ملی مه‌سح ده‌کات، چونکه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی:(**مسحُ الرَّقبَةِ أمانٌ مِنَ الغِلِّ يَومَ القِيامَةِ**)

واته: مه‌سحی پشته‌مل، مرۆڤ ئه‌مین ده‌کاته‌وه، له هه‌موو دوژمنایه‌تی و ناکۆکییه‌ك، له ڕۆژی قیامه‌تدا)، له پاشاندا بڵێت:

(**اللَّهُم فكَّ رقَبَتي مِنَ النَّار، وأَعوذُ بكَ مِنَ السَّلاسِلِ والأغلال**)

خودایه گه‌ردنی من له ئاگر ئازاد بکه‌ی، وه په‌نا ده‌گرم به تۆ له‌و کۆت و زنجیرانه‌ی له دوا ڕۆژدا دێنه ڕێگه‌ی موسوڵمانه‌کان.

له پاشان پێی ڕاستی سێ جار ده‌شۆرێت، وه له‌ژێر په‌نجه‌کانی پێی ڕاستیه‌وه به ده‌ستی چه‌پی ده‌ستی تێ ده‌خات و پیایدا بهێنێت، له په‌نجه‌ی بچوکی لای ڕاسته‌وه (خینصر) تا په‌نجه‌ی بچوکی پێی چه‌پی، وه بڵێت:

(**اللَّهُم ثَبِّت قَدَمي علَى الصِراط يَومَ تَزولُ الأَقدامُ.**)

وه له‌کاتی شۆردنی پێی چه‌پیدا بڵێت:

(**أعوذُ بكَ أَن تَزِلَّ قَدَمي علَى الصِّراطِ يومَ تَزِلُّ أَقدامُ المُنافِقين**)

وه ئاو بکات به پێکانیدا تا ﺑﻪشێکی لووله قاچی (سه‌روو قوله قاپه‌کانی)، وه کاتێك که لێ بویه‌وه سه‌ری بۆ ئاسمان به‌رز کاته‌وه‌و بڵێت:

**((أشهَدُ أن لاَإلهَ إلاَّ اللهُ وحدَهُ لاشريكَ لَه، وأشهَدُ أَنَّ مُحمَّداً عبدُهُ ورَسُولُه، سُبحانَك اللَّهم وبِحَمدِكَ، لا إلهَ إلاَّ أنتَ، عَمِلتُ سُوأً وظَلَمتُ نَفسي، أَستغفِرُكَ وأَتوبُ إلَيكَ، فاغْفِر لي وتُب عَليَّ، إنَّكَ أنتَ التَّوابُ الرَّحيم، اللَّهُم اجعَلني مِنَ التَّوابِينَ، واجْعَلني مِنَ المُتَطَهِّرِينَ، واجعلني مِن عِبادِكَ الصَّالِحِين، واجْعَلني عَبداً صَبوراً شَكوراً، واجْعَلني أَذكُرُكَ ذِكراً كثيراً، و أُسبِّحكَ بُكرَةً وأَصيلاً.))**

واته: شایه‌تی ده‌ده‌م که هیچ خودایه‌ك نییه جگه له خودای تاك و ته‌نهانه‌بێت، وه پێغه‌مبه‌ری خودایش به‌نده‌و نێرراوی ئه‌وه، پاکی و سه‌ناو

ستایش هەر شایانی تۆیە، تەنها تۆ خواوەندی ڕاستەقینەیت، کرداری خراپم کردووەو زوڵمیشم لە خۆم کردووە، تۆیش لە گوناهەکانم خۆش ببە، دەگەڕێمەوە بۆلات و داوای لێبوردنت لێ دەکەم، تۆیش لێم خۆش ببەو تەوبەکەم وەربگرە، چونکە بەڕاستی تەنها تۆ بەسۆز و میهرەبان و لێبوردەی، خودایە منیش بگێڕە لەوانەی کە زۆر بەگەرمی دەگەڕێنەوە بۆ لای خودای خۆیان و تەوبەدەکەن ، وە بمگێڕە لە وانەی خۆیان لە گوناە پاك دەکەنەوە، وە لەناو ڕیزی بەندە صاڵحەکانت جێگەم بکەرەوە، تا ببمە بەندەیەکی سوپاسگوزاری خاوەن ئارامی، تا بتوانم هەمیشە بەزوبانی پارانەوەوە زیکرت بکەم، وە بەیانیان و ئێواران هەمیشە پاکو مونەززەهی بۆ خودای خۆم بڕیاربدەم.

**دەڵێن:**

ئەوەی دوای دەست نوێژ ئەم نزایە بکات، مۆرێکی پەسەندکراوی دەدرێت بەسەر کرداری دەستنوێژەکەیدا، وە بۆی بەرز دەکرێتەوە بۆ ژێر عەرش، بەردەوام ئەو مۆر و خاتەم و ستایشە، نزاو تەسبیحات و تەقدیسی خودا دەکات، وە پاداشتی بەردەوامی بۆ دەنوسرێت، تا ڕۆژی قیامەت دێتە پێشەوە[١]

---

(١) قوت القلوب،٢/٩٣، وأصله حديث رواه عبدالرزاق في المصنف(٣/٣٧٨)، وابن السني في (عمل اليوم والليلة) (٣٠). وە بەدرێژی خاوەنی: إتحاف السادة المتقين هەموو ڕێوایەتەکانی ئەم کۆمەڵە فەرموودە کە ئەو نزاو دۆعایانەی لێ کۆکراوەتەوە بەیان کردووە، وە سەنەدی هەموو نزاکانی لە فەرموودە صەحیحەکانەوە هێناوەتەوە، وە سەر بەرز کردنەوەی بۆ ئاسمان بۆ بڕیاردانی گەورەییە بۆ خودا، نەك ئەوەی کە جیهەتی بۆ بڕیار بدرێت (پەنا بەخودا) وەك لەمەودوا لە فەرموودەکانی حەزرەتی عومەر و ئەوانی تردا باسیان دەکرێت. الإتحاف/٢/ ٣٦٧-٣٧٩.

## ئەوشتانەی کردنیان ناپەسەندە لە دەست نوێژدا

هەندێك شت هەن کە لە دەستنوێژ گرتندا کەراهەتیان هەیە، وەك ئەوەی کە زیاد لە سێ جار بیانشوات، ئەوەی زیادەڕەوی بکات لە بەکارهێنانی ئاودا ئەوە زوڵمی کردووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ سێجار سێجار دەست نوێژی گرت و فەرمووی: ((مَنْ زادَ.. فَقَد ظَلَمَ وأساءَ))[1]،ئەوەی لەو سیانە زیادی کات ئەوە زوڵمی کردووە و خراپ جوڵاوەتەوە. هەروەها فەرموویەتی:

((سَيكونُ قومٌ مِن هذهِ الأُمة يَعتدُونَ في الدُّعاءِ والطُّهُورِ))[2]،

واتە: لەم ئوممەتی منە قەومێك پەیدا دەبن سنوور دەبەزێنن لە نزاکردن و خۆپاککرنەوەکانیاندا.

وە وتراوە: لە نیشانەی کزی زانست و زانیاری ئەوکەسەیە کە هۆگری زۆر بەکار

---

(١)قال العراقي أخرجه أبوداود (١٣٥) والنسائي(٨٨/١) واللفظ له وابن ماجه من رواية عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده ا هـ. قلت لفظ أبى داود: ( **أنَّ رجلا أتَى النبيَّ ﷺ فقال يارسولَ الله كيفَ الطُّهور فدَعا بإناءٍ فيه ماء، فغسلَ كفَّيه ثلاثاً، ثُمَّ غسَل وجهَهُ ثلاثاً، ثمَّ غسلَ ذِراعَيه ثلاثاً، ثم مسحَ برأسه، أدخلَ أصبعَيهِ السَّبَّابتَينِ باطنَ أُذُنيهِ ثمَّ غَسلَ رِجلَيهِ ثلاثاً ثلاثاً، ثمَّ قال: هكذا الوُضوءُ فمَن زاد علَى هذا أو نقَصَ فقَد أساء وظلَمَ، أو ظلَمَ وأساء**). وأخرجه النسائي وابن ماجه وفي لفظ ابن ماجه **فقد تعَدَّى وظَلم**، وللنسائي **أساء وتعدى وظلم** والإحتجاج بهذا الاسناد صحيح . الإتحاف ٣٧٠/٢.

(٢)قال العراقي أخرجه أبو داود(٩٦)وابن ماجه(٣٨٦٤) وابن حبان والحاكم من حديث عبدالله بن مغفل ا هـ قلت: أخرجه أبو داود من طريق أبي نعامة واسمه قيس بن عبايه أنَّ عبدالله بن مغفل سَمع ابنه يقول: (**اللُّهم إني أسألُك القَصْرَ الأَبيض عَن يَمينِ الجَنَّة إذا دخَلتُها، فقال أي بُنَيَ سَلِ اللهَ الجنةَ، وتعَوَّذ به مِنَ النار، فإني سمعتُ رسول الله ﷺ يقول: إنَّه سَيكونُ في هذهِ الأُمَّة قومٌ يَعتدونَ في الطُّهورِ والدُّعاءِ، وأخرجه ابن ماجه مقتصرا منه على الدعاء**) .الإتحاف /٣٧٠

هێنانی ئاو دەبێت لە تەهارەتدا، دڵی ئاو ناخواتەوەو زیادەڕەوی دەکات[1].

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم فەرمووی: وتویانە:

یەکەمجار کە پیاو تووشی وەسوەسە دەبێت، بەهۆی خۆپاککردنەوەیە، لەو ڕێگەوە لێی دێتە پێشەوە،[2].

حەسەنی بەصری (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

بەڕاستی شەیتان بەو خەڵکە پێدەکەنێت، لەکاتی دەست نوێژگرتندا پێی دەڵێن: وەلهان،[3].

وە کەراهەتی هەیە دەستی ڕابووەشێنێت و ئاوەکە بپرژێنێت، یان لەسەر دەستنوێژ قسەبکات، یا ئاوەکە بەتوندی بدات بە دەموچاویدا، وەك ئەوەی زللەی لێ بدات.

وەهەندێك لەزانایان دەموچاوو دەست وشك کردنەوەیان بەلاوە ناپەسەندە،

---

(١) ئیمامی عیراقی وای گومان بردووە کە حەدیس بێت، بۆیە فەرموویەتی: ئەصڵی ئەم فەرموودەم نەدۆزیوەتەوە. بەڵام ئەمە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ نییە بەڵکو فەرموودەی (موحاربی کوڕی دثار)ە قاسمی کوڕی سەلام لێی دەگێڕێتەوە، لە کیتابی (الطهور)١٢٣

(٢) دەڵێت هێشتا پاك نەبووەتەوە، تا توشی وەسوەسەی دەکات. کتاب الطهور،/١٢٣.لە ئیبراهیمی تەمیمییەوە خوای لێ ڕازی بێت).

(٣) ئەوە فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ کە بەمەرفوعی باسی دەکات، أخرجه الترمذي في جامعه فقال اخبرنا محمد بن بشار اخبرنا ابو داود حدثنا خارجه بن مصعب عن يونس بن عبيد عن الحسن عن يحيى بن ضمره السعدي عن أبي بن كعب رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنَّه قال: (**للوُضوء شَيطان يُقال له الوَلهان، فاتقوا وساوس الماء.**) الإتحاف ٣٧٠/٢. ورواه البيهقي في السنن الكبرى، ١٩٧/١عنه، وأصله في المرفوع كما رواه الترمذي (٥٧) وابن ماجه(٤٢١).

چونکە دەڵێن: دەستنوێژ نوورێکە، لە ترازووی چاکەکاندا ئاوەکەی دەکێشرێت بۆ خاوەنەکەی، (حەیفە کەمی بکاتەوە)، وەك سەعیدی کوڕی موسەییەب و ئیمامی زوهەری فەرموویانە[1]

بەڵام حەزرەتی معاز (خودای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەموچاوی خۆیی بە چمکێ لە بەرگەکەی دەسڕییەوە[2].

هەروەها حەزرەتی عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەستەسڕی وشککرنەوەی هەبووە[3]، بەڵام ڕەخنەیەکیان ڕوبەڕوی ڕیوایەتەکەی حەزرەتی عائیشە کردۆتەوە[4].

وە کەراهەتی هەیە کە لە دەفرێکی لە مس دروستکراودا دەستنوێژ بگیرێت، یان بە ئاوێك لە بەرخۆر دانرابێت[1]، لەلایەن زانستی پزیشکییەوە

---

(١) وەك ئیمامی تورمذی لێیان دەگێڕێتەوە، (٥٤).

(٢) رواه الترمذي (٥٤) وعند أبو داوود. (٢٤٥) لە فەرمـوودەی ئیبـراهیمی کـوڕی خالیـد، : سـڕینەوەی دەموچـاو بە دەستەسـڕێك قەینـاکە، بەڵام نەیکـات بە نەریتێکی هەمیشەیی.

(٣) رواه الترمذي،(٥٣).

(٤) واتە تەنها لەم فەرموودەیدا، لاوازی ڕیـوایەتەکەیش لە لایەن ئەبـو مـوعەزەوە هـاتووە، کە تـورمزی نـاوی بـردووە بە سـەلمانی کـوڕی ئەرقەم، وە لەپـاش ڕیوایەتەکەی دەڵێت: حەدیسەکەی عائیشە ڕاوەستاو نییە، کە ئیمامی نەوەوی لە (شرح صحيح مسلم)(٣/٢٣٢)، ئەو ڕایەی هەڵبژاردووە، کە دەڵێت: سێیەم: ئەوەیە کە موبـاحە، واتە: ئەو دەستەسـڕ بەکارهێنـانە، بەکارهێنـان و بەکـار نەهێنـانی یەکسـانە، ئەمەش ڕای ئاشکرای هەڵبژێرراوە، چـونکە ئەو فەرمـوودە صەحیحە وا دەگەیێنێت کە موباحە، وە شـتێکی لەسـەر نەهـاتووە کە نەهی لێ کرابێت. بنوارە: إحياء علوم الدين چاپی دار المنهاج ٢٠١١، دەبەرگەکە، ب١/ل/٤٩٧.

قەدەغەکراوە.

وەك دەگێڕنەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر و ئەبی هورەیرەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) کە دەفر و قاپی مس کەراهەتیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن:

لەناو دەفرێکی مسدا ئاوێکم دەرهێنا بۆ (زانای گەورە) شەعبی، ڕازی نەبو کە دەستنوێژی لێ بگرێت، وە ئەم ڕای کەراهەتەی (حەزرەتی)عەبدوڵلای کوڕی عومەرەی گێڕایەوە، (خودایان لێ ڕازی بێت) .

وە هەرچۆنێك لە دەست نوێژەکەی لێ بویەوە و ڕوی کردە نوێژکردن، دەبێت ئەوە بهێنێت بە خەیاڵیدا کە ئەوا ڕواڵەتی خۆیی پاك کردۆتەوە، کە جێگەی سەرنجی خەڵکەکەیە، بۆیە پێویستە شەرم بکات کە لە حزوری خودادا موناجات و نزا بکات ئەگەر ناو دەروونی پاك نەکردبێتەوە، کە جێگەی نەزەرو سەیرکردنی پەروەردگاری باڵابێت.

وەدەبێت دڵنیا ببێت کە طەهارەت و خاوێنی دڵ تەنها بە تەوبەی ڕاستەقینەیە، وە دوور کەوتنەوەیەتی لە ڕەوشتە ناپەسەندەکان، وە هەڵگرتنی ڕەوشت و بەها شایستەکانە، ئەمە لە پلەی یەکەمی کارەکانیەتی.

وە ئەو کەسەی کە تەنها گرنگی و بایەخ بە پاکوخاوێنی زاهیری بدات، وەك ئەو کەسەیە کە پادشایەکی بانگ کردبێت بە میوانی بۆ ماڵەوەیان، ماڵەکەی پڕبێت لە شتی پیس و قیزەون و، تەنها بایەخی بە بەردەرگای ماڵەکەی دابێت و، ڕازاندبێتیەوە بەگەچ و زەخرەفە، دیارە ئەم جۆرە پیاوە زۆر شایان و شایستەیە بۆ توڕەبوون و غەزەب و بەهیلاکدا چوونی تەواو، دیارە کە خودا زانا و ئاگادارترە.

---

(١) بەتایبەتی لە وڵاتی حیجازدا، کە زۆرگەرمە چونکە ئاوێك کە خۆر کاری لێ کردبێت توشی بەڵەکی دەکات.. إتحاف٢/٣٧١.

## گەورەیی خێری دەستنوێژ

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((مَنْ تَوضَّأَ فأَسبَغَ الوُضوءَ وصَلَّى رَكعتَينِ، لَم يُحَدِّث فيهِما نَفسَهُ بِشَيْءٍ مِنَ الدُنيا، خَرَجَ مِن ذُنوبِهِ كَيَومِ وَلَدَتهُ أُمُّه))** وە لە ڕیوایەتێکی تردا : **(( وَلَمْ يَسْهُ فيهِما غُفِرَ لَهُ ماتقدَّمَ مِن ذَنبِهِ))**[1]،

واتە: ئەوەی دەستنوێژێکی چاك بگرێت (بەتایبەتی لەکاتی سەرماو سۆڵەدا) وە دووڕکات نوێژی پێ بکات و، هیچ خەتەرەو خەیاڵێکی دونیا نەهێنێت بە خەیاڵی دڵیدا، ئەوا لە هەموو گوناهەکانی دەردەچێت و ڕزگاری دەبێت، وەك ئەو ڕۆژەی کە تیایدا لە دایك بووە.

یان دەفەرموێت: ئەگەر لەو دووڕکاتە نوێژەدا هیچ سەهویەکی تێدا نەکات، ئەوا خودا لە گوناهە پێشووەکانی هەمووی خۆش دەبێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ دووبارە فەرموویەتی: **((ألا أُنَبِّئُكم بِما يُكَفِّرُ اللهُ بِهِ الخَطايا، ويرفَعُ بِهِ الدَّرَجات، إسباغُ الوُضُوءِ عَلَى المَكاره، ونَقلُ الأَقدامِ إلى المَساجِد، وانتظارُ الصَّلاةِ بعدَ الصَّلاة، فذلكُمُ الرِّباط، ثَلاثَ مَراتٍ.))**[2]،

---

(١) كذا في القوت ٩١/٢، وبنحوه عند البخاري )١٦٠)، ومسلم (٢٢٦)، وأبي داوود(٩٠٥). وقال الزبيدى قلت: والرواية المذكورة فى القوت: مَن تَوضَّأ كما أمَر، أخرجهُ الطبراني في الكبير من حديث عثمان رفعهُ: **من توضأ كما أُمِرخَرجَ مِن ذُنوبِهِ كيَوم ولدتهُ أُمُّه**، واخرجه أحمد والدرامي والنسائي وابن ماجه وابن حبان والطبراني في الكبير عن أبي أيوب وعقبه ابن عامر معا بلفظ: **من توضأ كما أُمر وصلى كما أُمر غُفِر لَه ماقدم من عَمل**، الإتحاف ٣٧٣/٢.

(٢)قال العراقي أخرجه مسلم(٢٥١) من حديث أبو هريرة اهـ قلت : ومالك وأحمد والترمذي والنسائي لفظهم: **ألا أدلُكم عَلى ما يَمحُو اللهُ بِهِ الخطايا**، والباقي مثل لفظ المصنف، وأخرج ابن خزيمة في صحيحهِ من طريق روح بن القاسم ومالك كلاهما عن العلاء بن عبد الرحمن عن أبية عن أبي هريرة رفعه بلفظ: **ألا أدلكم على ما يمحو الله به من الخطايا، ويرفع به الدرجات؟ قالوا بلى يارسو ل الله، قال:** والباق سواء..... وأخرجه البيهقي في شعب الإيمان (٢٤٨٣)... الإتحاف ٣٧٤/٢.

ئایا هەواڵتان پێ بدەم بەوەی کە گوناهەکانتان دەسڕێتەوە، وە پلەو پایەتان بەرز دەکاتەوە؟ ئەوە جوان شۆردنی دەست نوێژە لە کاتی سەختی و ناڕەحەتیدا، وە گواستنەوەی پێیەکانە بەرەو مزگەوتەکان، وە چاوەنوارکردن و مانەوەیە لە مزگەوتدا، لە دوای نوێژێکەوە بۆ نوێژێکی تر، ئەمە ڕیباطەو مانەوەیە لە ناو سەنگەری جیهاددا، سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەست نوێژی گرتووە، یەکجار یەکجار ئەندامەکانی دەستنوێژی شتووە، وە فەرموویەتی: ئەمە دەست نوێژێکە خودا نوێژ وەرناگرێت لە هێچ کەسێك بەم دەستنوێژە نەبێت، (واتە نابێت شۆردن لە یەك جار کەمتر بێت)، لە پاشان دەست نوێژی گرت، دووجار دووجار دەیشۆرد، وە فەرمووی: **((مَن تَوضَّأَ مرَّتَينِ مرَّتَينِ .. آتاهُ اللهُ أجرَهُ مرَّتَينِ))**، واتە : هەرکەسێك دووجار دووجار ئەندامەکانی دەستنوێژی بشۆرێت، ئەوە دوو پاداشتی دەدرێتەوە، وە خۆیشی دەستنوێژی گرت سێ جار سێ جار و فەرمووی: **((هذا وُضوئي ووُضوء الأَنبياء مِن قَبلي ووضُوءِ خَليلِ اللهِ إبراهيم عَلَيهِ السلام))**[1] ، ئەمە دەستنوێژی من و پێغەمبەرەکانی پێشووە، وەدەستنوێژی ئیبراهیمی خەلیلە (سەلامی خوای لەسەر بێت)

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((مَن ذَكَر اللهَ عَزَّ وَجَلَّ عِند وضوئِهِ طَهَّر اللهُ جسدهُ كلَّهُ، ومَن لَم يَذكُرِ اللهَ تعَالى لَم يُطهِّر مِنهُ إلاَّ مَا أَصابَ المَاءَ))** [2]،

---

(١) رواه ابن ماجه(٤٢٠)، والطبراني في الأوسط (٦٢٨٨).

(٢)قال العراقي رواه الدارقطني في سننهِ(٥١٢/١) من حديث أبي هريرة باسناد ضعيف أهـ قلت: ولكن لفظه عنده: **من تَوضَّأ وذكَر اسمَ اللهِ عَليهِ كانَ طهوراً لِجَميع بَدَنهِ، ومَن توضأ ولَم يذكر اسمَ اللهِ عليهِ كانَ طهوراً لأعضاء الوُضوءِ**، وهكذا ساقه الرافعي وفي رواية: **من توضأ وذكر اسمَ الله عليه. تطَهَّر جَسَده كله. ومن توضأ ولم يُذكر اسمُ اللهِ عَلى وُضوئهِ، لَم يتَطهَّر إلاَّ مَوضعَ الوُضوء .**

کەواتە ئەوەی زیکری خودا بکات ﷻ لەکاتی دەست نوێژەکەیدا، هەموو جەستەی پاك دەکاتەوە، وە ئەوەی هیچ زیکرێکی خودا نەکات، ئەوە تەنها ئەو شوێنەی پاك دەبێتەوە، کە ئاوی دەست نوێژەکەی بەردەکەوێت.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**مَن توضَّأ على طُهْرٍ كتَب اللهُ لَهُ عَشرُ حَسَنات**)) [١]، وە هەرکەسێك لەسەر پاکی دووبارە دەستنوێژی تازەکردەوە، خودای گەورە دە چاکەی بۆ دەنوسێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:((**الوُضُوءُ علَى الوُضوءِ نورٌ علَى نور**))[٢]

تازەکردنەوەی دەستنوێژ لەسەر دەست نوێژ، ڕۆشناوی و نوورە لەسەر نوور. ئەمەش هەمووی هاندانە بۆ تازەکردنەوەی دەست نوێژ.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:(( **إذا تَوَضَّأ العَبدُ المُسلمُ (أو المؤمن) فتَمضْمَضَ خَرجَت الخَطايا مِن فيهِ، فإذا استنثَر خَرجَت الخَطايا مِن أنفهِ، فإذا غَسَلَ وجْهَهُ، خَرجَت الخَطايا مِن وَجهِهِ، حتَّى تخرُجَ مِن تَحتِ أَشفار (مِن بينِ أَظفارِ) عينيهِ، فإذا غسَل يَديهِ خرجَت الخَطايا مِن (بَينِ) يَديهِ، حَتَّى تَخرُجُ مِن بَينِ (تَحتِ) أَظفارهِ (أظفارِ يَدَيهِ)، فإذا مَسَح برأسهِ.. خرجَت الخَطايا مِن رأسهِ، حتَّى تَخرُجَ مِن أذنيهِ، فإذا غَسَل رِجلَيهِ خَرجَت الخطايا مِنْ رجلَيه حتَّى تَخرُجَ مِن تَحتِ أظفارِ رِجلَيهِ، ثُمَّ كانَ مشيُهُ إلى**

---

(١)قال العراقي أخرجه أبو داود(٦٢) والترمذي (٥٩) وابن ماجه(٥١٢) من حديث ابن عمر باسناد ضعيف اهـ قلت: وابن ابى شيبه والطحاوي وابن جرير ولفظهم كتب له عشر حسنات .

(٢) قالَ الحافظ السخاوي: في المقاصد الحسنة، ١٢٦٤، ذكره الغزالي في الإحياء، فقال الحافظ العراقي: لم أقف عليه، وسبقهُ لذلكَ المنذري، وأمّا شيخُنا إبن حجر فقال: إنه حديث ضعيفٌ رواه (رزين) في مسنده، قلت: قد تقدَّم في معناه حديث (**مَن توضأ على طُهر**) المذكور.. الإتحاف ٣٧٥/٢.

**المَسجدِ وَصلاتُهُ نافلَةً لَهُ ))**[1].

واته ئەگەر بەندەیەکی موسوڵمان ئاوی لە دەمی ڕادا، گوناهەکانی لە دەمیەوە دێنەدەرەوە، ئەگەر ئاوی لە لووتی وەردا، گوناهەکانی لە لووتیەوە دێنە دەرەوە، وە ئەگەر دەموچاوی شت، گوناهەکانی لێوە دەردەدەچن، هەتا لە ژێر برژانگی چاوەکانیەوە دێنە دەرەوە، ئەگەر دەستەکانی شت، گوناهەکانی لە میانی دەستەکانیەوە دێنە دەرەوە، هەتا لە ژێر نینۆکەکانیەوە دەردەچن، ئەگەر مەسحی سەری کرد، هەڵەو تاوانەکانی لە سەریەوە دەردەچن، هەتا لە گوێ کانیەوە دێنە دەرەوە، کە هەردوو قاچەکانیشی شۆری، لە میانی پێکانیەوە گوناهەکانی دێنە دەرەوە، تا لە ژێر نینۆکی پێکانیەوە دەردەچن، لە پاشان کەدەڕوات بۆ مزگەوت، نوێژەکەیشی دەبێتە سوننەت بۆی. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: وەك ئەو ڕۆژەی لێ دێتەوە کە تیایدا لە دایك بووە.

---

(١)قال العراقي أخرجه النسائي وابن ماجه من حديث الصنابحي واسناده صحيح، ولكن اختلف في صحبته وعند مسلم من حديث أبي هريرة وعمرو بن عبسه ونحوه مختصرا اهـ قلت: أخرجه مالك في الموطأ من حديث عبدالله الصنابحي او هو ابو عبدالله الصنابحي واسمُه عبدُالرَّحمن وله صحبة وفيه: (**إذا توضأ العبدُ المُؤمِنُ مِن غير شك، وفيه من تحت أظفار يديه وأظفار رجليه)** والباقي سواء، وقال ابن خزيمه في صحيحه حدثنا يونس بن عبدالأعلى اخبرنا بن وهب أنَّ مالكا حدثه عن سهل بن أبي صالح عن أبيه عن أبي هريرة رفعهُ قال:( **إذا توضأ العبد المؤمن أو المسلم فغسل وجهَه خرجَت من وجهِه كلَّ خطيئةٍ نظر إليها بعينه مع الماء أو مع آخر قطرة الماء، فاذا غسل يديه خرج من يديه كل خطيئة كان بطشتها يداه مع الماء أو مع آخر قطر الماء، فاذا غسل رجليه خرجت كل خطيئة مسَّتها رِجلاه مع الماء أو مع آخر قطر الماء حتى يخرج نقيا من الذنوب)**، وعند الطبراني من حديث أبي إمامة وعمرو ابن عبسه: (**من توضأ فأحسن الوضوء ذهب الإثم من سمعه وبصره ويديه ورجليه**.) ينظر لتفصيل أكثر:الإتحاف ٢/٢٧٥. ورواه الإمام مالك في الموطأ ١/٣١، وهو كذلك عند النسائي ١/٧٤، وابن ماجه ٢٨٢.

وەدەگێڕنەوە: **((أَنَّ الطاهِرَ كالصَّائِمِ))**[1]،واتە ئەوەی بەپاكو پوختی دەمێنێتەوە، وەك ئەوە وایە كە هەمیشە بەڕۆژو بێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **(من تَوضَّأ فأَحسَنَ الوُضوءَ ثمُّ رَفَع طَرفَهُ إلى السَّماءفقالَ: أشهَدُ أن لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وحْدَه لاشَريكَ له، وأَشهَد أنَّ مُحمَّداً عبدُهُ ورَسُولُه، فُتِحَت لَه أبوابُ الجَنَّةِ الثَّمانية يَدخُل مِن أَيِّها شاءَ)**[2]، واتە: ئەوەی بە تەواوی ومەرج و سوننەتەكانەوە دەستنوێژێكی پوخت و خاوێن بگرێت، لەپاشان چاوی بەرزكاتەوە بۆ ئاسمان (كە قیبلەی نزاكارانە) وە ئەو شایەتومانە ڕاستییە بهێنێت و، ددان بە یەكتایی و بێ شەریكی خوداو، بەندەیی و ڕەوانەكراوی پێغەمبەری خودا بهێنێت، ئەوا هەموو هەشت دەرگاكەی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە، لە كامیان ئارەزوویەتی بچێتە ژوورەوە.

حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی**(( إنَّ الوُضُوء الصَّالِح يُطرِدُ عَنكَ الشَّيطان))**[3]، دەست نوێژی تەواوبگریت، شەیتانت لێ دوور دەخاتەوە.

وە موجاهیدفەرموویەتی: ئەوەی دەتوانێت كە شەو تا بەیانی دەستی بەدەست نوێژەوە و، دەم بەزیكر و داوای لێخۆشبوونەوە بێت بابیكات، چونكە ڕۆحەكان لەسەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەكرێنەوە كە لەسەری مردوون و گیانیان كێشاوە.

---

(١)قال العراقي رواه أبو منصور الديلمي في مسند الفردوس (٣٩٨١)من حديث عمرو بن حريث بلفظ: **الطاهرُ النائم كالصائمِ القائمِ** وسنده ضعيف اهـ الإتحاف٣٧٥/٢.

(٢)قال العراقي رواه أبو داود (١٦٩) من حديث عقبه بن عامر وهو عند مسلم(٣٩٨١) دون قوله ثم رفع اهـ قلت: لفظ أبي داوود: **(مامنكم من أحمد يتوضأ فيحسن الوضوء ثم يقول: حين يفرغ من وضوئه)**، كما عند المصنف وفيه: **ثم رفَع نظرَه إلى السَّماء، فقال** وفي إسناد هذا رجلٌ مجهول واخرجه مسلم والنسائي وابن ماجه كالسياق الأول وقد تقدَّم شئ من ذلكَ وحقَّقه الحافظ ابن حجر في تخرج أحاديث الاذكار.

(٣) رواه ابن أبي شيبه في مصنفه،١٢٧٢، وفي الحلية من قول سيدنا ابن عباس٢٩٥/٢.

# چۆنیەتی خۆشۆردن

دەبێت جام و دەفرەکە لە لای ڕاستیەوە بێت (واتە: هەرشتێك کە خۆیی پێ دەشوات، ئەگەر دووش بێت یان سۆندە یان جام) لە پاشان ناوی خودای لێ بهێنێت (بسمِ اللهِ الرَّحمَن الرَّحِيم ) بکات، وە سێ جار دەستەکانی بشوات، لە پاشان خۆی پاك کاتەوە، با دڵنیا بێت لە خاوێنی عەورەتی، وە دەست بخاتە گیانیەوە، هەر پیسیەکی ئەگەر پێوە بێت لای بدات، لە پاشان وەك لە پێشەوە وتمان: دەست نوێژێك بگرێت چۆن بۆ نوێژکردن دەیگرێت، تەنها پێکانی نەشوات، با دوایان بخات، چونکە ئەگەر بیانشوات و بیانخاتە سەر زەوی وەك ئەوە وایە کە ئاوەکەی زایە کردبێت و بە فیڕۆی دابێت، لە پاشان ئاو دەکات بەلای ڕاستی دا سێ جار، لە پاشان بەلای چەپیدا سێ جار، لە پاشان بەسەر سەریدا سێ جار، لەپاشان دەست بهێنێت بە هەموو جەستەی دا لە پشت و پێشەوە، وە دەست بخاتە بن مووەکانی سەر و ڕیشی، وە ئاو بگەێنێتە ژێر مووەکان ئەگەر پڕ بن یان شاش.

ئافرەتان لەسەریان نییە کە پرچەکانیان بکەنەوە، مەگەر ئاو نەگاتە بن مووی پرچەکانیان، وە دەبێت بگەڕێت بە شوێن لار و پێچ و خواری جەستەیدا، کە بەئاسانی ئاویان پێ ناگات ئاوی تایبەتییان پێدا بکات، تا هەموو چالاییەکانی گیانی تەڕبکات، وە خۆی بپارێزێت و دەستی لە زەکەری نەکەوێت، ئەگەر دەستی پێکەوت با دەستنوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، وە ئەگەر پێش خۆشۆردنەکەی دەستنوێژی گرتبوو، ئەوە دووبارە کردنەوەی پێویست نییە.

ئەمەی باسمان کرد سوننەتەکانی غوسڵ و دەستنوێژشتن بوو، ئەوەی زۆر پێویستە باسیان بکرێت، ئەوەمان خستە بەرچاوی سالیکانی طەریقی ئاخیرەت، بۆ زانست و زانیاری و کارپێکردنی، وە پرسە لابەلاکانی تر کە لە پێشهات و ڕوداوە تایبەتیەکاندا پەیدا دەبن، با بۆ زانینیان بگەڕێنەوە بۆ

پەرتووکە فیقهییەکان. وە لە کۆی ئەوانەی کە باسمان کردن لە خۆشۆردندا دوو شت پێویستن: نییەت و شۆردن و دابۆشینی هەموو جەستەی بە ئاو.

وە فەرزی دەستنوێژیش نییەت و شۆردنی دەموچاوو، شۆردنی دەستەکانی تا ئانیشکی و ، مەسح کردنی ئەوەی پێی دەوترێت سەر، وە شۆردنی پێکانی تا قولەقاپەکانی و، ئەمانەش یەك لەدوای ئەك ئەنجام بدات. بەڵام شۆردنەکان یەك لەدوای یەکیش نەبێت قەیناکە و واجب نییە.

وە ئەو شۆردنانەی کە واجب و پێویستن چوار غوسڵن: شۆردنی هەموو گیانی لەبەر دەرچوونی مەنی (تۆو)ی پیاوو ژن ، وە لەبەر بەیەك گەیشتنی هەردوو ئامێری زاو زێ[1]، خوێنی حەیز و عادەی ئافرەتان، خوێنی زەیستانی پاش منداڵ بوون.

جگە لە مانە هەموو غوسڵەکانی تر سوننەتن، وەك خۆشۆردنەکانی ڕۆژی هەینی و، جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان و ، غوسڵی بەستنی ئیحرام و، ڕاوەستانی عەرەفە و موزدەلیفە و چوونە ناو مەککە، وە سێ خۆشۆردنی ڕۆژەکانی تەشریق و ڕەمی جەمەرات، وە لەسەر فەرموودەی هەندێك لە زانایان غوسڵی تەواف خوداحافیزی لە کەعبەو ماڵی خودا، کافریش ئەگەر موسوڵمان بوبێت و پاکو خاوێنیش بێت، ئەوە سوننەتە وسڵی تۆبەو موسوڵمان بوون بکات[2]، هەروەها شێت ئەگەر بە ئاگا هاتەوە و کەسێکیش مردوویەکی شۆردبێت، هەموو ئەمانە سوننەتە خۆشۆردنی بۆ بکات.

---

(١) إلتقاء الختانين: واتە: ئەندامی میزکردنی نێرینە بگات و نەختێکی بچێتە ناو ئەندامێکی نادەمی و گیان لەبەرانی تر. ئاوی هاتبیتەوە یان نا.بنوارە: ڕۆژی پرشنگدار م/هەرتەلی ٢٣.

(٢)فانه يندب له الاغتسال لانه ﷺ أمر قيس بن عاصم و ثمامة بذلك حين اسلما و حمل ذلك على الندب و كذا اذا اسلمت طاهرة من حيض و نفاس هكذا ذكره شمس الائمة السرخسي في شرحه على المبسوط

# چۆنیەتی تەیەمموم کردن

کەسێك ئەگەر بەهانەیەکی شەرعی هەبوو کە بەدوای ئاودا گەڕابوو وەدەستی نەکەوتبوو. یان نەیدەتوانی ئاو بەکار بهێنێت، کە لە ڕێگەدا ڕێگرێکی وەك دڕندەیەك، یان دزو جەردەیەك ، یان ئەو ئاوەی کە هەبوو خۆی پێویستی پێی هەبوو بۆ خوارنەوە یان تینوێتی هاوڕێکانی، یان خاوەنەکەی کەسێکە تر بوو وە نەیدەفرۆشت بە نرخی خۆی، بەڵکو داوای نرخی زیادی لێ دەکرد، یان برینێك یان نەخۆشییەکی هەبوو، دەترسا لە بەکارهێنانی ئاو ئەو ئەندامەی تێك بدات ، یان تووشی زیانی زیاتری بکات و نەخۆشییەکەی لەسەری قورس و گران بکات، یان چاکبوونەوەکەی دوا بخات، ئەو کاتە دەبێت ئارام بگرێت تا کاتی نوێژی فەرز دێتە پێشەوە ، لەپاشان بگەڕێت بە دوای گڵێکی پاکدا، کە خاکێکی پوختی نەرمی لەسەر بێت کە تۆزی لێ هەڵبستێت، ئەمیش بە هەردوو ناو لەپ و پەنجەکانی بە پێچراوەیی بیدات بەسەر گڵەکەدا و یەکجار مەسحی هەموو دەمو چاوی خۆیی پێ بکات و نییەتی حەڵاڵکردنی نوێژی لێ بهێنێت.[1]

پێویست بەوە ناکات زۆر لە خۆی بکات و تۆزەکەی بگەێنێتە ناو مووەکانیەوە، تەنك بێت یان پڕ، ئەوەندە کۆشش بکات کە تۆزەکە بگاتە پێستی ڕوخساری، وە بەتەنها لێدانی یەکەم ئەوەی بۆ پەیدا ببێت، چونکە پانایی دەموچاو بە ئەندازەی پانایی ناو لەپەکانیەتی، ئەوەندەی گومان بۆ پەیدا بووبێت کە تۆزەکە دەمووچاوی گرتۆتەوە ئەوندە بەسە.

لە پاشان ئوموستیلەکەی دابکەنێت و، جارێکی تر دەستەکانی بداتەوە بە سەر گڵەکەدا و، ناو پەنجەکانی بکاتەوەو، لەپاشان پشتی پەنجەکانی دەستی ڕاستی

---

(١)وقال مالك وأحمد: يمسحُ يديه إلى كوعَيه لما ورد أنَّه ﷺ قال لعمار يكفيك ضربةٌ للوَجه وضربةٌ لليدينِ، ونقُل مِثل هذا للشافعي في القديم. الإتحاف ٢/

بیلکێنێت بە ناوەوەی پەنجەکانی دەستی چەپی، بە شێوەیەك لە هیچ لایەکەوە لە ئەملاو لای سەرەپەنجەکانی تێنەپەڕێت، بە پانایی پەنجەی ئیشارەت و موسەببیحەی لەگەڵ ئەوی تردا، لە پاشان دەستی چەپی دەهێنێت لەو جێگەوە کە دایناوە لەسەر باسکی لای ڕاستی تا دەگاتە ئانیشکی، لە پاشان ناو لەپی چەپی هەڵدەگێڕێتەوە بۆ سەر ناوەوەی باڵی لای ڕاستی، وە دەیهێنێت بە باڵیدا لەسەرەوە تا دەگاتەوە بە مەچەکیدا، وە ناو پەنجەی ئیبهامی چەپی دەهێنێت بەسەر ڕوی زاهیری پەنجەی ڕاستی، لە پاشان هەمان شت بەدەستی چەپیشی دەکات، لە پاشان مەسحی هەردوو ناو لەپی دەکات و، نێوانی پەنجەکانی پێ دە هەنوێت.

مەبەستیش لەم تەکلیف و فرمانەیە ئەوەیە: کە تۆزەکە بگاتە هەموو دەست و باڵەکانی تا ئانیشکی بە تەنها یەك لێدان، ئەگەر ئەمەی بۆ نەدەگونجا، ئەوە قەیناکە بە دووجار یان زیاتر ئەو کاری تەیەممومە ئەنجام بدات.[1]،

ئەگەر نوێژێکی فەرزی بەو تەیەممومە ئەنجامدا، ئەوە دەتوانێت هەرچەنێك سوونەتی دەوێت بەو تاقە تەیەممومە بیانکات، وە ئەگەر دوو فەرزی بەیەکەوە کۆکردبوویەوە، ئەوە پێویستە بۆ نوێژە فەرزەکەی تر تەیەمومەکەی بۆ تازە بکاتەوە، وە هەر بەم شێوە بۆ هەموو فەرزێك تەیەمومێك دەگرێت.

---

(١)ذكر المصنف في الوجيز للتيمم سبعة أركان ١- التراب٢- القصد إلى الصعيد ٣- نقل التراب المسموح به إلى العضو ٤- نية إستباحة الصلاة٥- إستيعاب الوجه بالمسح ٦- مسح اليدين إلى المرفقين٧- الترتيب، وشروط صحة التيمم ثمانية: الاول: النية، والثاني: العذر المبيح للتيمم، والثالث: أن يكون بطاهر من جنس الارض، والرابع: إستيعاب المحل الخامس: أن يمسح بجميع اليد أو باكثرها، والسادس: أن يكون بضربتين، والسابع والثامن: زوال ما يمنع المسح على البشرة كشمع وشحم والموالات الإتحاف٢/٣٩٤-٣٩٥.

# بەشی سێیەمی پاکوخاوێنی

## پاککردنەوە لە شتە زیادە ئاشکراکان

**ئەمەش دوو بەشە: پیس و پۆخڵییەکان کە لەدەرەوە دێن بۆی، وە پارچەکان: کە لەناو جەستەوە سەرچاوە دەگرن،**

**جۆری یەکەم: تەپوتۆزو پیس و پۆخڵیەکان و ئارەقی لاشەو بۆن و بەرامی جەستەکان. ئەمەش هەشت بەشە:**

**یەکەم:** ئەوەی لە ناو مووی سەردا کۆدەبێتەوە، لە پیس و پۆخڵی و کێچ و ئەسپێ. خۆپاککردنەوە لەو شتانە کارێکی باشە، بە شۆردن یان بە شانەو داهێنان، یان چەورکردن، تا ئاڵۆزی و گرژی مووەکانی سەری لابدات .

چونکە پێغەمبەر ﷺ حاڵی وابوو کە مووەکانی چەوردەکرد، وە ڕۆژە نارۆژێك یان ماوە لە دوای ماوە بە شانە دایدەهێنا،

بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێدەدات و فەرموویەتی: (( **ادَّهَنوا غِبًّا**))[1]. واتە: مووەکانتان ناوە ناوە چەور بکەن.

---

(١)وأخرج الترمذي في الشمائل باسناد ضعيف من حديث أنس: **كان يكثر دهن رأسه وتسريح لحيته** وفيه أيضا باسناد حسن من حديث صحابي لم يسمَّ رفعَهُ: **كان يترجل غبّاً**، وأما قوله **أدهنوا غبّاً** فقال الصلاح: لم أجد له اصلاً. وقال النووى غير معروف، وعند أبى داود الترمذي والنسائي من حديث عبد الله بن مغفل النهمي. عن الترجل إلا غِبّاً. باسناد صحيح قال العراقي قال ابن حجر في شرح الشمائل **وإنَّما نَهى عن الترجُل إلاَ غِبّاً لأن إدمانه يشعر بمَزيد الامعان في الزينة والترفه. وذلك يُنافي شهامة الرِجال** الإتحاف ٢/٣٩٥والحديث رواه العسكري في (تصحيفات المحدثين) ﷺ(٣٦٠) وروى الترمذي في الشمائل، (٣٣) عن أنس (رضي الله عنه) قال: **كان رسول الله ﷺ يكثر دهن رأسه، وتسريح لحيته. ويكثر القناع. حتَّى كأَنَّ ثوبه ثوب زيَّات).**

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((من كانت له شعرة فليكرمها))**[1]، واتە: ئەوەی پرچ و مووی هەبێت، با ڕێزی لێ بگرێت و لەپیس و پۆخڵی بیپارێزێت، پیاوێکی قژ و ڕیش ئاڵوزی شپرزە، چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە نەدەکرا ڕۆنتان لێ بدایە تۆزێك ئەو گرژی و ئاڵۆزییەی دابمرکایەتەوە، لەپاشان فەرمووی: هەندێك لە ئێوە دێنە ژورەوە بۆ لامان، وەك ئەوەی شەیتانێك بێتە ژورەوە (واتە شتێکی دێزی قیزەون)؟! **((أمَا كانَ لِهذا دهنٌ يَسكُن بهِ شَعرَهُ، ثمَّ قال ﷺ يَدخُلُ أحدُكُم كأنَّه شَيطانٌ))**[2].

**دووهەم:** ئەو چڵك و پیسییەی لە پەناکانی گوێیدا کۆدەبێتەوە، بە مەسحەکەی تەنها ڕوی دەرەوەی پاك دەکاتەوە، ئەوەی لەناو قولایی گوێکاندا دەمێنێتەوە، دەبێت بە نەرمی لەکاتی دەرچوون لە گەرماو پاك بکرێتەوە، زۆر بوونی ئەو چڵك وچەورایەتییە لەوانەیە زیان بەبیستن بگەیێنێت.

**سێیەم:** ئەوەی لەناو لووتدا کۆدەبێتەوە، لەو تەڕی چڵم و چەپەڵییەی کە لە دەماخیەوە دێتە خوارەوەو، هەندێکی پێیەوە ڕەقدەبێت، بەهۆی ئاو لەدەم ڕادان و هەڵمژینی پاك دەبێتەوە.

**چوارەم:** ئەو زەردایی و سەوزاییەی کە لەسەر ددانەکانی و ئەملاو لای زمانی قەتماخەی دەبەست و ڕەنگی دەگۆڕن، کە بە هۆی سیواك و ئاو لە دەم ڕادان و خاوێنکردنەوەیان پاك دەبنەوە، کە باسیانمان کرد.

**پێنجەم:** ئەو چڵك و کێچ و ئەسپێ و تەپوتۆزەی کە لە ناو ڕیشی دا کۆدەبنەوە، ئەگەر چەورو شانەکراو نەبێت، پێویستیان بە شۆردن هەیە، وە

---

(١) رواه أبوداوود (٤١٦٣) ، ولفظ المصنف في القوت (١٤٤/٢)، وأخرج أبو داود من حديث أبي هريرة بلفظ: (من كان له شَعر فليكرِمهُ) وليسَ إسناده بالقوي

(٢)قال العراقي أخرجه أبو داود(٤٠٦٢)، والنسائي وابن حبان من حديث جابر باسناد جيد اهـ .ورواه مالك في الموطأ ٩٤٩/٢،

سوننەتە بشۆررێت و بە شانە دابهێنرێت، لە فەرموودەیەکدا کە زۆر بڵاوە لە سەر زوبانی خەڵکی هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز شانەو شاخ و ئامێری خوراندن و ئاوێنەی لێ نەبڕاوە، نە لە گەشت و نە لەماڵەوەدا[1]. ئەمەش داب و نەریتی عەرەبەکانە.

وە لە هەواڵێکی نامۆدا هاتووە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕۆژێکدا دووجار ڕیشی دادەهێنا [2]، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕیشی پڕ بووە [3]،

هەروەها (حەزرەتی)ئەبوبەکریش هەروابووە، وە (حەزرەتی) عوسمان ڕیشی درێژ و تەنك بووە، وە ڕیشی (حەزرەتی) عەلی پان بووەو، نێوانی هەردووشانی پڕ کردووە.

وە لە فەرموودەیەکی نامۆتر لەوەی پێشوو هاتووە: کە حەزرەتی عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: **((إجتمَعَ قومٌ ببابِ الرَّسولِ ﷺ فَرأيتُه يَطلع في الحُبِّ يُسوي مِن رأسِهِ ولِحيَتِه. فقُلتُ: أَو تَفعَلُ ذلِكَ يا رَسُولَ الله، فقالَ نعَم إنَّ اللهَ يُحِبُّ مِن عَبدِهِ أَن يَتجَمَّلَ لإخوانهِ إذا خَرجَ إلَيهم))**[4].

واتە: هەندێك لە عەرەبەکان هاتنە بەردەرگای پێغەمبەر ﷺ چاوەنواڕی بوون، بینیم کە تەشریفی هاتە دەرەوە بۆ ناویان، لە ناو دەفرێکدا وەك گۆزە و مەرکانە وابوو کە ئاوی تێ دەکرێت، مووی سەرو ڕیشی تێدا یەکسان دەکرد،

---

(١) رواه الطبراني في (الأوسط) ٥٢٣٨. وابن طاهر في (صفوة التصوف) ص/٣٩٢.

(٢) تقدم عند الترمذي في (الشمائل) /٣٩، أنه كان يكثر تسريحه.

(٣) رواه النسائي (١٨٣/٨).

(٤)قال العراقي أخرجه إبن عدي في الكامل وقال حديث منكر اهـ **وكأنه ﷺ كان مُستَعجلا في الخروج إليهم ولذا لم يلتفت إلى المرآة ينظر فيها وجهه الشريف ونظر في الحُبِّ لصَفاء مائهِ بل هُو يُرى أحسنَ من المرآة ويَحكي الوَجه كما هُو بلونه. ولذا اتخذ الملوك ديدنهم في الرؤية فيه بلا عن المرآة**الإتحاف ٣٩٦/٢، وسياق المصنف عند صاحب قوت القلوب/١٤٤/٢.

وتم: تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا وا دەکەیت؟! فەرمووی: بەڵێ؛ خودا خۆشی لە عەبدەکانی دێت کە دەچنە دەرەوە بۆ لایان، خۆیان بۆ براکانیان جوان نیشان بدەن. واتە: دەیەوێت ئاسەواری جەماڵی پەروەردگاریان پێ نیشان بدات.

کەسێکی نەفام لە وانەیە واگومان ببات، کە ئەوە حەزکردنە لە خۆجوان کردن بۆ خەڵکی، وەك شیمەو ئاکاری خەڵکێکی تر لێکدانەوەی لەسەر ئەویش هەبێت. وە مەلائیکە بەرزەکانیش بشوبهێنێت بە ئاسنگەرەکان، بەڵام ئەم لێکچواندنەی زۆر دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێ درابوو، کە بانگەشەی خەڵکی بکات، دیارە یەکێ لە ئەرکەکانی سەرشانی ئەوەیە: کە خۆی بە گەورەو بەڕێز بخاتە ناو دڵیانەوە، بۆ ئەوەی بە کەم سەیری نەکەن، وە وێنەو دیمەنی هەمیشە جوان بێت لە بەرچاویاندا، بۆ ئەوەی بە کەم و بێ بایەخ نەکەوێتە بەرچاویانەوە و تەرێزی لێ بکەن ، ئەوانیش وەك دوڕووەکان تووشی ئەو تێنواڕینە نەبن، دیارە ئەم نییەتە پاکەیش پێویستە لەسەر هەموو زانایەك، کە هەڵگری فرمانی بانگەشەی خەڵکی بێت، بۆ حزووری خودا ﷺ ئەبێت بەو شێوە بایەخ بۆ خۆیان بدەن، کە ڕواڵەتی بە شێوەیەك نیشان بدات، کەس نەفرەتی لێ نەکات، لەم جۆرە کردارانەش تەنها پشت بە نییەتی ساغی ئەو کەسە دەبەسرێت، چونکە ئەم جۆرە کردارانە لە خودی خۆیاندا صیفەتێکی تایبەتی پێ دەبەخشن، خۆ جوان کردن بەم نییەتە خێرە کارێکی باش و پەسەندە، وە دوورکەوتنەوە لە ڕیش ئاڵۆزی و پرش و بڵاوی سەروڕیش، بەمەبەستی خۆدەرخستن بێت، یان بە ڕواڵەت حەزی لە دونیا نەویستی و گوێنەدان بێت بە مەزاهیرو کارە ڕواڵەتییەکان، ئەمە کارێکی قەدەغەکراوە، بەڵام ئەگەر کەسێك واز لەو جوانکاری و خۆ ڕازاندنەوانەی هێنا بێت کە سەرقاڵی کاری گرنگ تروو بایەخدارتر بێت، ئەوە باشەو پەسەندە.

ئەمەش چەندین حاڵەتی جیاوازە لە میانی بەندەو خالیقەکەیدا (عَزَّ وجَلْ).

کابرای ڕەخنەگری دانایش چاوی بینایەو دوڕوویی و لێ شێواندن سەری لێ تێك نادات و لای ئەو ڕەواجێکی نابێت.

زۆر نەفام هەیە ئەم کارانە وا جێ بەجێدەکات بە مەبەستی زیاتر لاکردنەوەی خەڵك بە لایدا، کەواتە ڕاستییەکە لە خۆی و خەڵکیش دەشێوێنێت و تێکی دەدات. وا گومان دەبات کە نییەتەکەی خێرە، دەبینیت هەندێك لە زاناکان پۆشاکی زۆر گرانبەها لە بەر دەکەن و، واگومان دەبەن کە مەبەستیان تەوساندنەوە و دەمکوتکردنی ئەهلی بیدعەو موخالیفەکانیانە. وە تەنهایش مەبەستیان ڕەزامەندی و نزیك بوونەوە یە لە خودا!

ئەمەش لەو ڕۆژەدا ڕاستییەکان دەردەکەون، کە هەموو نهێنییەکان هەڵدەماڵرێن و ئەهلی گۆڕستانەکان لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوەو زیندوو دەکرێنەوەو، لێپێچینەوەکان لەسەر بنەمای ئەو نییەتانە دەست پێدەکەن کە لە ناو سینەیاندا شاراوە بووە ، ئا لەو ڕۆژە سەختەدا زێڕی دوا عەیار جیا دەبێتەوە لە بەردی ساختەو مسی زڕکەفتکراوی ساختە، (خودا پەنامان بدات). لە ڕسوایی و تێشکانی ڕۆژی حەشری گەورە

**شەشەم:** چڵکو پیسی سەرە پەنجەکانە، کە پێستی داپۆشەری پشتی سەرەپەنجەکانە، کاتی خۆی عەرەبەکان بایەخیان بە شۆردنی نەدەدا، چونکە دەستەکانیشیان دوای نانخواردن نەدەشۆرد و، تەنها دەیانسڕییەوە و دەیانهێنا بە سەر گڵدا، لەو بنەپێست و درزانەدا پیسی تێدا کۆدەبوویەوە، پێغەمبەری خودا فەرمانی پێ دان کە ئەو بەینانە بشۆرن،[1].

**حەوتەم:** پاککردنەوەی سەرەپەنجەکان و بن نینۆکەکان .

کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بە عەرەبەکان دا کە پاکی بکەنەوە، سەری

---

(١) واتاکەی بە ڕونتر لە حەدیسەکەی جوبرەئیلدا دێت، رواه الحكيم الترمذي في (نوادر الأصول) /٤٥.

پەنجەو ژێرنینۆکەکان، چونکە ئەوکاتە ئەوەندە نینۆکگریان لانەبووە، کە نێنۆ کەکانیان بکەن وبە پوختی ڕاگیری بکەن، بۆیە چڵکی تێدا کۆدەبوویەو پێغەمبەری خودایش ﷺ کاتی بۆ دیاری دەکردن،کە نابێت لە چل ڕۆژ تێبپەڕێت دەبێت نینۆکیان بکەن و ، مووی بن باڵیان هەڵبکەنن و بەریان بتاشن [1]،

بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی دا بە پاککردنەوەی ژێر نینۆکەکان، [2].

وە لە ئەسەری پیرۆزدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ : ((**إستَبطأ الوَحيَ فلَمَّا هَبطَ عَليهِ جُبريل عليه السلام قالَ لَه: كَيفَ نَنزِلُ عَليكُم وأَنتُم لا تَغسِلُونَ بَراجِمَكُم ولا تُنظِّفونَ رَواجِبكُم وقُلحاً لا تَستاكُونَ. مُرْ أُمَّتَكَ بذلك**))[3]، ماوەیەك وەحی و نیگای دوادەکەوت، کاتێك کە (حەزرەتی) جوبرەئیل (عليه السلام) هاتە خوارەوە لێی پرسی: فەرموی: چۆن بێینە خوارەوە بۆ سەرتان، کە ئێوە درزی بەینی پەنجەکانتان ناشۆن و، ژێر نینۆکەکانیشتان پاك ناکەنەوەو، ددانەکانیشتان زەردبووە لەچڵکدا، پاکیان ناکەنەوە، فەرمان بدە بە

---

(١) رواه مسلم (٢٥٨)ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێت: مانای وانییە دوای چل شەو بیانتاشن، بەڵکو نابێ لەوە زیاتر دوا بکەوێت، ئەینا چەندێك زووتر بکرێن باشترە. صحيح مسلم للنووى/١٤٩/٣.

(٢) رواه الطبرانى فى (الكبير) ١٤٧/٢٢). هو عند مسلم من حديث انس **وقَّت لنا في قص الشارب وتقليم الاظفار ونتف الإبط وحلق العانة، أن لا يترك أكثر من أربعين ليلة وهكذا أخرجه ابن ماجة بلفظ وُقِّتَ على البناء للمفعول وحكمه الرَّفع على الصحيح عند اهل الحديث والاصول**. وقال ابو داود والنسائي والترمذي في هذا الحديث وقَّت لنا رسول الله صلى الله عليه وسلم فصرَّح بالفاعل. الإتحاف ٣٩٩/٢.

(٣)رواه احمد في مسنده من حديث ابن عباس وفيه اسمعيل بن عياش من روايته عن الشاميين وهي مقبولة، ولفظه أنَّه قيل له: **يا رسول الله: لقَد أبطأ عنك جُبريل! فقال: ولِمَ لا يُبطِئُ عَنيَ وأنتُم لا تَستَنّون. ولا تقلمون أظفاركم. ولا تَقصُّون شَواربكم. ولا تنقُّون رواجبكم**، الإتحاف ٣٩٩/٢.

ئوممەتەکەت کە ئەم کارانە بکەن.

وە بزانن کە: أُفّ، واتە پیسی ژێر نینۆکەکان، وە: التُّفُّ: واتە: پیسی و چڵکی گوێ، خودای گەورە کەدەفەرموێت: ﴿فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ﴾، (الإسراء/٢٣)

واتە: ماندوویان مەکەن بە پاککردنەوە چڵکی ژێر نینۆکەکانیان، (ئەفیان لەگەڵ مەڵێن) یان کارێ مەکەن کە ئازاریان پێ بخۆن وەك چۆن ئازار بە چڵك و پیسی ژێر نینۆکەکانتان دەخۆن، وەنابێت ئەوەندەش ئازاریان بدەن.

**هەشتەم:** ئەو چڵك و پیسییەی کە لەسەر هەموو جەستەی مرۆڤ کۆدەبێتەوە، بە هۆی ئارەق کردنەوەو تەپ و تۆزی ڕێگاوە، ئەوەش گەرماوەکان لای دەبات، بۆ ئەم حاڵەتانە قەیناکە بچێتە ناو گەرماوەوە، وەك چۆن صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ چوونەتە گەرماوەکانی شامەوە.

وە هەندێکیان وتوویانە: بەڕاستی حەمام(گەرماو) ماڵێکی چاکە، جەستەیش پاك دەکاتەوەو، ئاگری دۆزەخیشت وەبیر دەهێنێتەوە، ئەم فەرموودەیە لە (حەزرەتی) ئەبودەرداء و ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە گێڕاویانەتەوە[١].

وە هەندێکی تر لە زانایان (بە پێچەوانەوە) فەرموویانە: خراپترین ماڵ گەرماوەکانە، ئەوەی دەڕواتە ناوی عەورەتیشی تێدا دەردەکەوێت و، شەرمیشی لەسەر هەڵدەگرێت.[٢]، ئەمەیان باسی مەترسییەکانی دەکات و ئەویشیان باسی سوودەکەی دەکات، ئەگەر کەسێك بتوانێت (خۆی لە خراپەکانی

---

(١) رواه ابن أبي شيبة، في المصنف، (١١٧٣، ١١٧٦، ١١٧٩) عن أبي الدرداء وأبي هريرة وابن عمر (رضي الله عنهم) والبيهقي في السنن الكبرى، ٣٠٩/٧عن أبي الدرداء وابن عمر (رضي الله عنهم)

(٢) رواه ابن أبي شيبة في المصنف ١١٧٢،عن سيدنا علي مجتزأً،والبيهقي السنن الكبرى ٣٠٩/٧عن أبي درداء، وفي القوت :٢٦٠/٢:وقداختلف مواجيد الصحابة في دخوله ..).

بپارێزێت، قەیناکە بە دوای سوود و قازانجەکەیدا بگەڕێت.

بەڵام ئەوەی دەچێتەناو گەرماوەوە، چەند ئەرکێکی سوننەت و واجبی لەسەر شانە، دوو پێویستی کە ڕوی تێدەکات دەربارەی عەورەتی خۆی، وە دوانیش دەربارەی عەورەتی کەسانی تر:

دەربارەی عەورەتی خۆی پێویستە بیپارێزێت لەوەی کەسانێکی تر سەیری بکەن، وە بیشیپارێزێت کە دەستی هیچ کەسێکی تری بەر بکەوێت، نابێ کاری جەستەی خۆی بداتە دەست کەسی تر، تەنانەت لابردنی چڵك و پیسی لاشەیشی، وە دەبێت ڕێگە بگرێت لە ناتری حەمام کە دەست بهێنێت بە ڕانیدا، یان نێوانی ناوك و تووکی خوار سکیەوە.

وە لەبارەی درووستی دەستدان لە غەیری عەورەتیەوە، بۆ لابردنی چڵك و پیسی جەستەی ئەگەرێکی درووستبوون هەیە، بەڵام بە پێی پێوەرە زانستیەکان حەرامە، چونکە وەك چۆن حەرامە سەیری پاش و پێشی بکرێت، حەرامیشە کە دەستیان لێ بدرێت، هەرواش سەیرکردنی ڕانەکانی و ئەوەیش لە میانی ناوك و ئەژنۆیدایە حەرامە.

دەربارەی عەورەتی کەسانی تریش: پێویستە لەسەری کە چاوی خۆیشی داخات و سەیری عەورەتی کەس نەکات و، ڕێگەیشی پێ نەدات کە دەری بخات، چونکە بەرگری کردن لە شتی ناڕەوا ئەرکێکی پێویستە، دەبێت باسی بکات، وە نابێت قەبوڵی بکات، مەگەر ترسی لێدان و قسە و جنێوی هەبێت کە ڕوبەڕوی ببێتەوە، یان کارێکی وا ڕوبەڕی ببێتەوە کە لە خۆیدا حەرام بێت، کە ئیتر ناتوانێت لەبەر ڕێگریکردن لە حەرامێك کارێکی حەرامتری دووچاربێتەوە، ئەگەر بەم شێوە نەبێت ئەوا ئەو ئەرکەی لەسەر ناکەوێت، ئەوەش کە بڵێت: من دەزانم کە ئەم کارە سوودی نیەو نابێت پێی هەڵبستێت، ئەم وتنە نابێت بە بەهانەیەکی درووست بۆی، بەڵکو دەبێت ناوی خراپەکانیان ببات و بێدەنگ

نەبێت لێیان، ئینکاری کردن هۆکارێکی سەرەکییە، کە کاریگەری بخاتە سەر لایەنی بەرابەر و، وای لێ بکات کە ئەو کارەی ئەنجامی دەدا قیزەون ببێت لەبەرچاوی و، بۆ خۆیشی نەفرەتی لێ بکات، کەواتە فرمان بەچاکە کردن نابێت هەرگیز تەرك بکرێت و پشت گوێ بخرێت.

هەر لەبەر ئەمەیە کە ڕای درووست ئەوەیە، لەم کاتانەدا نەچێتە ناو گەرماوی دەرەوە، چونکە ئەم چوونە خاڵی نییە لەوەی کە تووشی دەرکەوتنی عەورەت دەبێت، بە تایبەتی بینینی نێوانی ناوك و سەرووی عەورەتەوە، چونکە خەڵکەکە ئەو جێگایە بە عەورەت نازانن و، تووشی گوناه دەبن، کە شەرعی پیرۆز ئەوێیشی لکاندووە بە عەورەتەوە و، وەك حەریمی ئەوێ وایە، بۆیە واباشە حەمام چۆڵ بێت یان چۆڵ بکرێت.

بیشری کوڕی حاریس دەفەرموێت: هەرگیز توڕەنابم لە پیاوێك کە تەنها دیرهەمێکی پێ بێت و بیدات بە حەمامچییەکە و پێی چۆڵ بکات، تا بەتەنها بچێتە ژورەوەو کەسی تری لەگەڵدانەبێت بۆ خۆشۆردن، [1]،

هەروەها عەبدوڵلای کوڕی عومەریان بینی (خوایان لێ ڕازی بێت) لە ناو گەرماودا، وە ڕوی کردبووە دیوارەکەوە، وە چاویشی بەپارچە قوماشێك بەستبوو ئیمجا خۆی دەشۆرد.

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: قەیناکات بچێتە ناو حەمامەوە، بەڵام دەبێت بە دوو کراسەوە بێت، کراسێك بۆ دابۆشینی عەورەتی، وە کراسێکیش بۆ داپۆشینی سەری خۆی و داپۆشینی چاوەکانی.[2].

---

(١) قوت القلوب/٢/٢٦٠).

(٢) قوت القلوب ٢/٢٦٠. قال العراقي يباح كشف العورة في الخلوة في حالة الاغتسال مع امكان التستر، وبه قال الائمة الاربعة وجمهور العلماء من السلف والخلف وروى برد

## سوننەتەکانی خۆشۆردن و چوونە ناو حەمام دە سوننەتن:

یەکەم: نییەت، دەبێ نەچێتە ناو گەرماوەوە لە بەر قازانجێکی بە پەلەی دونیایی، وە تەنها لەبەر گەمەو گاڵتەو هەوابازی نەبێت، بەڵکو مەبەستی پاکو خاوێنی بێت، خۆ ئامادەکردن بێت بۆ چوونە لای خۆشەویستەکەی کە نوێژە.

لەپاشان سوننەتە پێش ئەوەی بچێتە گەرماوەکەوە، پارەی حەمام چییەکە بدات، چونکە ئەو خزمەتانەی کە دەیکەن نەزانراوەو. ئەوەش کە خاوەن گەرماو چاوەنواڕی دەکات، کەواتە تەسلیم کردنی کرێی خۆ شۆردنەکە پێش چوونە ژورەوە، پێدان و لادانێکی ئەو نەزانینەیە لە یەکێ لەو دوو بریتییەی کە ڕوبەڕوی دەبێتەوەو دڵی کابرایشی پێ خۆش دەکات.

لە پاشان پێی ڕاستی پێش بخات و بڵێت

**(( بسمِ الله الرَّحمَنِ الرَّحيمِ، أعوذُ بالله مِنَ الرِّجسِ النَّجس، الخَبيثِ المُخبِثِ، الشَّيطانِ الرَّجيم))**

بەناوی خودای بەبەزەیی و دلۆڤانەوە، پەنا دەگرم بە خودا لە هەموو پیسی و نەجاسەتێکی پۆخڵواتی پیسکەر، کە شەیتانی نەفرەت لێکراوی ڕەجم کراوە.

لەپاشان کاتی ئەوە دێت لەبەرچاوی خەڵکی خۆی ون بکات، یان داوای ئەوە دەکات کە جێگەکەی بۆ چۆڵ بکەن، خۆ ئەگەر کەسێکی خراپیش لە ناو گەرماودا نەبێت و، هەمووی ئەهلی بڕواو خۆپارێزی بن ، ئەوا سەیرکردنی جەستەکان کە بەدەرەوەن بۆنی بێ شەرمی و ناجۆری لێ دێت، ئەوە وەبیردەهێننەوە کە بەهۆی سەرنجدانی زیاترەوە، بیری ناجۆری زیاتری بۆ دێت، وای لێ دێت بیەوێت یانا، چاو بەملاولادا دەگێڕێت و، ژێر کراس و بن کراس

---

عن مكحول عن عطية عن النبى ﷺ قال: **من اغتسل بليلٍ في فضاء فليتحاذر على عورته، ومن لم يفعل ذلك فاصابه لمم فلا يلومن إلا نفسه.** الإتحاف ٢/ ٤٠١.

چاوی هەڵدەتەقێت بە عەورەتی کەسی نامەحرمدا، هەر لەترسی ئەم ئەگەرەیە کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) چاوی خۆیی دەبەست.

لەپاشان هەردوو شانەکانی دەشوات. وە پەلەناکات لە چوونە ناو جێگا گەرمەکەوە، تا لە سەرەتاوە ئارەق دەکات.

وە نابێت زۆر ئاو برێژێت ، بەڵکو بەئەندازەی پێویست، چونکە ئەوەندەی ڕێگەی پێ دەدرێت بە ئەندازەی حاڵ و مقامە، خۆ ئەگەر حەمامچییەکە بەو زیادەڕەویانە بزانێت پێی نیگەران دەبێت، بەتایبەتی ئیسراف لە ڕشتنی ئاوی گەرمدا، چونکە نرخ و بەهای هەیە و ماندووبونیشی تێدایە.

وە دەبێت لە ناو گەرماوی حەمامدا بیر لە گەرمای دۆزەخ بکاتەوە، وە خۆی وا دابنێت کە ساتە وەختێك لە ماڵێکی گەرمدا زیندانی کراوە، وە ئەو حاڵەی بپێوێت بە مانەوەی ناو دۆزەخ، چونکە ئەو شوێنە گەرمە زیاتر دەشوبهێت بە جەهەنم، ئاگر لە ژێرەوەو تاریکی لە سەرەوە، پەنا بەخودا لەو مەترسیانە، بەڵکو کەسی داناو ژیر بۆ چرکەیەکیش خۆی بێ ئاگاناکات لە بیرکردنەوەی ئاخیرەت، چونکە داهاتوو چارەنووسی هەر بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوە.

کەواتە هەرچی دەیبینێت لە ئاوو ئاگر و شتەکانی تر، ئەوا پەندو ئامۆژگاری لێ دەبینێت، بەڕاستی پیاو بە پێی تواناو هیممەتی خۆی سەرنج دەدات و بیر دەکاتەوە.

ئەگەر قوماش فرۆشێك و دارتاشێك و وەستایەکی بیناساز و ڕستن و چنین پێکەوە بچنە ناو ماڵێکی ئاوەدانی ڕاخراوەوە، ئەگەر بگەڕێیت بە دوایاندا، دەبینێت کوتاڵ فرۆشەکە سەرنجی فەرش و ڕاخراوەکە دەدا، وە بیر لە نرخ و بەهاکەی دەکاتەوە، وەستای ڕستنەکەیش سەرنجی بەرگ و لیباسەکان دەدا بزانێت چۆن چنراون، دارتاشەکەیش سەیری سەقفی ماڵەکە دەکات و چۆنیەتی پێکهێنانەکەی، وە ستای بینایش سەرنجی دیوارەکان دەدات چەندێك

ڕێك و خۆڕاگر و محكەمە.

هەروەها سالیكی ڕێگای ئاخیرەتیش هەرچییەك دەبینێت لە درووستكراوەكانی خودا، پەند و ئامۆژگاری باشی تێدادەبینێت و بیر خەرەوەیەكی گرنگیش دەبێت بۆ ژیانی دوارۆژی، بەڵك و سەرنجی هەرچی بدات خوای گەورە دەروازەی پەندو ئامۆژگاری بۆ لەسەر دەكاتەوە، ئەگەر سەیری ڕەنگی ڕەش بكات یەكسەر بیر لە تاریكایی گۆڕ و ئەڵحەد دەكاتەوە، وە ئەگەر سەیری مارێك بكات یەكسەر مار و ئەژدەهای دۆزەخی بیر دەكەوێتەوە، وە ئەگەر سەرنجی وێنەیەكی دێزی ناشیرینی ترسناك بكات، ئەوا بیر لە نەكیر و مونكەری ناو گۆڕەكەی دەكاتەوە، وە ئەگەر دەنگێكی سەختی ترسناكی بیست، ئەوا یەكسەر ئەوكاتەی بیر دەكەوێتەوە كە فوو بەنەفخی صوور دا دەكرێت، وە ئەگەر شتێكی جوان ببینێت ئەوا نیعمەتەكانی بەهەشتی وەبیر دێتەوە،

وە ئەگەر وشەی بەرپەرچدانەوە یان قەبوڵكردنی لە ناو بازاڕدا یان لەناو ماڵێكدا بیست، ئەوەی بیر دێتەوە كە نهێنییەكانی لە داهاتووی ژیانیدا كە ئاشكرا دەبێت، لە دوای لێپرسینەوەی خودایی، كە ئایا وەرگیراو دەبێت یان ڕەد دەكرێتەوە.

زۆر حاڵەتێكی گونجاوو شیاوە كە زیاتر ئەم جۆرە بیركردنەوانە زاڵ ببێت بەسەر مێشكی كەسێكی ئاقڵدا، مەگەر كارە زۆر گرنگەكان بیری بترازێنێت، ئەینا هەمیشە یاد و بیری لەسەر ئەو ڕاستیانە ناگۆڕێت.

خۆ ئەگەر بەراوردی نیسبەتی مانەوەو مقامی ناو دونیاو مانەوەی هەتاهەتایی پاشەڕۆژی بكات، ئەوا مانەوەكەی دونیای زۆر لاقیزەون دەبێت و، سووك دەبێت لە بەرچاوی، مەگەر كەسێك دڵی مۆركرابێت وچاوی دڵی كوێربێت وخاوەنی دڵێكی كەڕی غافڵ بێت.

## هەروەها

## لە سوننەتەکانی چوونە ناو حەمامە:

کاتێك دەچێتە ناویانەوە سەلامیان لێ نەکات، وە ئەگەر سەلامیشی لێ کرا وەڵامی بە وشەی سەلام نەداتەوە، بەڵکو ئەگەر کەسێکی تر وەڵامی دایەوە ئەوا ئەم بێدەنگ بێت، وە ئەگەر پێی خۆش بوو وەڵامی بداتەوە ئەوا با بڵێت: خودا لێت خۆش بێت . وەرێگری لێ ناکرێت ئەگەر لەناویدا تەوقەیان لەگەڵدا بکات، وە لەسەرەتای قسە لەگەڵکردنیاندا بڵێت:

خودا بتپارێزێت و لێت خۆش ببێت، لەپاشان نابێت لە حەمامدا زۆر قسەبکات، وە نابێت قورئانیش بخوێنێت مەگەر بەدەنگی نزم، بەڵام قەیناکە ئەگەر پەنا بگرێت لەشەیتانی نەفرەت لێکراو.

وەکەراهەتی هەیە بچێتە ناوی حەمامەوە لە میانی نوێژی ئێوارەو خەوتناندا، یان نزیك لە کاتی خۆرنشین، چونکە ئەوکاتە کاتی بڵاوبوونەوەی سەربازەکانی شەیتانە، وە قەیناکە ئەگەر کەسێك دەست بەگیانیدا بهێنێت.

دەگێڕنەوە لە یوسفی کوڕی ئەسباطەوە کە وەسێتی کرد یەکێك بیشورێت کە لە هاوڕێکانی نەبوو وەخاوەنی فەزڵێکی تایبەتیش نەبوو، وتیان بۆچی وەسێت دەکەیت کە ئەو بتشۆرێت؟

فەرمووی:

ئەوکەسە جارێك لە گەرماودا منی شێلاوە، ویستم پاداشتێکی بدەمەوە، کە پێی دڵخۆش بێت، وە بەدڵنیاییشەوە بەوە شادومان دەبیت[1]،

وە بەڵگەیەکی تریش لەسەر درووستی تەدلیك و دەست پێداهێنان ئەوەیە:

---

(١) قوت القلوب ٢٦١/٢. ئەمەش بەڵگەیە لە سەر درووستی تەدلیك و شێلانی ناو گەرماو.

هەندێك صەحابە دەگێڕنەوە كە پێغەمبەری خودا ﷺ لە یەكێك لە گەشتەكانیدا دابەزییە جێگایەك بحەوێتەوە تیایدا، لەسەر سكی خۆی نوستبوو، یەكێك لە كۆیلە ڕەشەكان بەپەنجەكانی پشتی دەشێلا، وتم ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە چییە؟

فەرمووی: وشترەكە منی هەوادایە خوارەوە،

(( فقلت ما هــذا يا رســول الله؟ فقال: أمــا إنَّ النــاقةَ تَقحَّمت بي))[1]

لەپاشان هەركاتێك لەگەرماوەكە لێبوویەوە، با سوپاسگوزاری خودا بێت لەسەر ئەو نیعمەتی پاك بوونەوەیە،

وەك وتراوە: ئاوی گەرم لە زستاندا لەو نیعمەتانەیە كە لێپرسینەوەت لەسەر دەكرێت بەرامبەری[2]

وەعەبدوڵلای كوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

حەمام لەو نیعمەتە تازانەیە كە دایانهێناوە[3]،

**ئەمەی كەباسمان كرد لە ڕوی شەرعەوە بوو.**

---

(١)قال العراقى أخرجه الطبراني في الاوسط (الصغير) (٨٣/١).من حديث عمر بن الخطاب رضي الله عنه بسند ضعيف اهـ ووجه الاحتجاج به أنه إذا جاز الغمز في غير الحمام لحاجة داعية ففي الحمام أولى لقيام الداعي فيه. والصحابى هو سيدنا عمر ،الإتحاف: /٤٠٥/٢.

(٢) قوت القلوب ٢٦١/٢، ولطائف الإشارات.٧٦٣/٣.

(٣) هەمان سەرچاوە ٢٦١/٢.

## بەڵام لە ڕوی طیب و پزیشکییەوە:

بەڕاستی وتراوە:

حەمامکردن لە دوای(النُّورة) (واتە: بەکارهێنانی ئەو تێکەڵەیەی کە لە کلس و زرنیخ و هەندێك شتی تر کە مووی پێ لادەبرێت)

ئەوە دەبێتە ئەمان بۆی، لە تووش بوونی بەڵەکی.

وە وتراوە: بەکارهێنانی ئەو تێکەڵەیە کە موو لادەبات لە هەموو مانگێکدا یەك جار، گەرمایی جەستە ئەکوژێنێتەوەو، ڕەنگی مرۆڤ پاکو خاوێن دەکاتەوەو، توانای درووستبوونیشی زیاد دەکات.

دەڵێن:

بەپێوە میزکردن لە حەمامێکی گەرمدا باشترە لە خواردنەوەی دەرمان[1]

هەروەها دەڵێن:

نوستنێکی دوای حەمامکردن لە هاویندا باشترە لە خوارنەوەی دەرمانی پێویست، وە شۆردنی پێکانت لە دوای حەمام کردن بە ئاوی ساد، ڕزگارت دەکات لەوەی تووشی نوقرەس و (داء الملوك)ت بکات[2]،

وە کەراهەتی هەیە کە هاتە دەرەوە ئاوی ساد بکات بەسەری دا، چونکە تووشی نەخۆشی سەرئێشەو گرفتی تری دەکات، وە باش نییە بیشی خواتەوە، ئەمەی باسمان کرد بە نیسبەت پیاوانەوە.

---

(١) نابێت پرژ لە خۆی بدات، وە کەس ببینێت یان خۆی ئاشکرا بکات، وە دەبێت لە شوێنێکدا نەبێت کە ئاوی لەسەر نەڕوات.

(٢) پێشەوا ئیبوطالیبی مەککی لە (قوت القلوب)دا باسی هەموو ئەمانەی کردووە، ٢/٢٦١.

## حوكمی ژنان بۆ چوونه ناو گەرماو:

پێغەمبەری خودا ص فەرموویەتی: ((**لايَحِلُّ لِلرَّجُل أنْ يدخِلَ حَليلَتَه الحَمامَ وفي البيتِ مُستَحَمٌ**))[1]. واته بۆ پیاو حەلاڵ نییه كه خێزانەكی بنێرێت بۆ حەمامی دەرەوه مادەم له ماڵەوه شوێنی خۆشۆردنیان هەبێت.

ئەوەش كه مەشهووره لای زانایان: پیاویش نابێت بچێته ناو حەمامەوه ئەگەر سەری دانەپۆشیبێت به مێزەرێك، وه حەرامیشه ئافرەت بچێته ناو حەمامەوه مەگەر زەیستان و نەخۆش (سوری مانگانەی هەبێت)[2].

(حەزرەتی)عائیشه (خودای لێ ڕازی بێت) چووه ناو گەرماوێكەوه، بەهۆی نەخۆسییەكەوه كه هەیبوو.خۆ ئەگەر لەبەر پێویستی چوبێته حەمامەوه ئەوەنابێت بچێت مەگەر به كراسێكی دەرەدامانی درێژدوه لەسەری تا پێكانی داپۆشێت[1] وەكەراهەتی هەیه پیاو كرێی خۆشۆردنی حەمام بداته خێزانەكەی،كه یارمەتی دەری بێت كه كارێكی مەكروه ئەنجام بدات.

---

(١)أخرجه الترمذي(٢٨٠١) وحسنه، والنسائي والحاكم وصححه من حديث جابر بلفظ: (**من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلايدخل الحمام إلابمئزر، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلايدخل حليلته الحمام**). قاله العراقي. قلت: إسناد النسائي جيد وإسناد الترمذي ضعيف لضعف راويه ليث ورواه الحاكم على شرط مسلم وأقره الذهبي الإتحاف ٢/٤٠٦.

(٢)بەشی یەكەمی فەرموودەكه له وەی پێشەوەدا باسمان كرد، والجملة الثانية معناها عند الحاكم في الادب من حديث عائشة: ( **دخل عليها نسوة فقالت من أنتنَّ؟ قُلنَ مِن حِمصْ فقالت:صواحبُ الحَمّامات؟ قلنَ نعم، قالت: سمعت رسول الله ﷺ يقول: الحمامُ حرامٌ على نساءِ أمَّتي، وقال صحيح الاسناد وأقرَّه الذَّهبي، ولابي داود وابن ماجه من حديث عبد الله بن عمر: فلايدخلها الرِّجال إلاَّ بالأُزر وامنعوها النساء إلامريضةً أونَفساء**): الإتحاف٢/٤٠٧.

# جۆری دووهەم:

## ئەوەی کە لە جەستەی ئادەمی دەبڕڕێت کە هەشت شتە:

**یەکەم: مووی سەر:** ئاساییە کە بیتاشێت ئەگەر بیەوێت پاکو خاوێنی سەری ڕابگرێت، بۆ کەسێکیش بەرداتەوە و بیەوێت چەوری بکات و شانەو خزمەتی بکات قەیناکە، مەگەر بهێڵێتەوە بە پارچە پارچەیی و پچڕپچڕ[٢]، کە نەریتی خراپەکارەکانە، یان هەندێك لە مووەکانی بەلای ڕاست و چەپی سەرشانیدا بەرداتەوە، وەك شكڵی ئەشراف و پیاوەگەورەکان، کە بووە بە نیشانەی ئەوان، خۆ ئەگەر لەوان نەبێت و خۆی بەوان بچوێنێت ئەوە وەك لێ شێواندنێك بۆی دەژمێررێت.

**دووهەم: مووی سمێڵ:**

هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺفەرموویەتی: ((**قَصُّوا الشَّوارِبَ**)) واتە: سمێڵەکانتان کورتکەنەوە، وە لە ڕێوایەتێکە تردا هاتووە:

((**جُزُّوا الشوارب**)) سمێڵەکانتان ببڕن، وە لە لەفزێکی تردا هاتووە :

((**حُفُّوا الشَّوارِبَ واعفوا اللِّحى**)) سمێڵەکانتان بکەنە چواردەوری لێوتانەوە و، ڕیشیشتان بهێڵنەوە، واتە مووی چواردەوری لێوتان با دیار نەبێت و لێی پاك بکرێتەوە، وەك خودا دەفەرموێت:

﴿**وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ**﴾ (الزمر/٧٥) ،

واتە: دەبینیت فریشتەکان بە دەوری عەرشدا دەگەڕێن، وە لە لەفزێکی تردا

---

(١) قوت القلوب/٢/٢٦١، وللبيهقي في الشعب(٧٣٨٢) عن عائشة (رضي الله عنها) ما يسرُ عائشة أنَّ لَها مثل أحد ذَهباً وأنَّها دخلَت الحمام.

(٢)رواه البخاري (٥٨٩٢) ومسلم (٢٥٩ــــ ٢٦٠).

هاتووه ((احْفُوا) واته: وەك ئەوەی داوای هەڵکەندنی بکات، وە کە دەفەرموێت: (حُفُّوا) نیشانەیە لە سەر کەمتر لە هەڵکەندن.

وەك خودای (عَزَّ وجَلْ) فەرموویەتی:

﴿إِنْ يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا﴾ (محمد ٣٧) واته:

ئەگەر خودا داوای پارەو داراییتان لێ بکات، وە سور بێت لەسەر داواکەی و هەر دەسبەردار نەبێت، ئەوە ئێوە ڕژدی پیشان دەدەن.[١]

بەڵام تاشینی سمێڵ نەهاتووە[٢] . ئەوەش کە چواردەوری لێو ببڕێت، ئەوەیە کە لە صەحابەکانەوە هاتووە.

یەکێك لە تابیعی (خودای لێ ڕازی بێت)سەیری کابرایەکی کرد چواردەوری سمێڵی بڕی بوو، فەرمووی:

بەڕاستی صەحابەکانی پێغەمبەری خودات بیرهێنامەوە ﷺ .

هەروەها موغیرەی کوڕی شوعبە فەرموویەتی: پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری سمێڵەکانی کرد درێژ بووبون فەرمووی: وەرە ((تَعالَ: فقَصَّهُ لي على سواكِ)) واته: لەسەر ئەندازەی سیواکێك بۆی کورت کردمەوە[٣] ،

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی/٥١٠.

(٢) ڕەنگە ئەوەی لە السنن الكبرى دا هاتووە لە حەدیسی أبوهريرة وەك نەسائی ڕیوایەتی دەکات (٩) پێنج شت هەن لە فیطرەتی ئیمانن، یەکێکیان:حلق الشارب، واته: تاشینەکە بەواتای تاشینی چواردەوری لێوە، بۆ ئەوەی ڕیوایەتەکان دژایەتییەك نەبێت لە میانیاندا.

(٣) رواه أبو داوود (١٠٨). رواه أبو داود والنسائي والترمذي في الشمائل واسناده صحيح ووجه الاستدلال به أنه لو كان المراد استئصاله لما وضع السواك حتى يقطع مازاد عليه، وقال العراقي في شرح التقريب. وذهب بعض العلماء إلى أنَّه مُخيرٌ بَين الأمرين. حكاه القاضي عياض. الإتحاف ٤٠٩/٢.

وەهیچ ڕێگرییەکی لێ ناکرێت ئەملاولای سمێڵی بهێڵێتەوە، حەزرەتی عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) دەیکرد، چونکە نەدەمی دادەپۆشێت، وەنە زیادەی خۆراکیشی تێ دەچێت، چونکە پێی ناگات، وە فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ ((**أعفوا اللِّحى**)) ڕیشتان بهێڵنەوە و بەربدەنەوە واتە: زۆری بکەن.

وە لە هەواڵ و فەرموودەدا هــاتووە: [1]،((**إِنَّ اليَهودَ يَعفُونَ شَوارِبَهُم وَيَقُصُّونَ لِحاهُم فَخالِفُوهُم**)) واتە: جوولەکەکان سمێڵیان دەهێڵنەوەو ڕیشیشیان دەتاشن، فەرمووی: پێچەوانەی ئەوان بجوڵێنەوە.

وە هەندێك لە زانایان بەلایانەوە ناپەسەند بووە، کە تاشینی ئەملاولای سمێڵیان پێ پەسەند نەبووە[2]،

**سێیەم: مووی بن باڵ و هەنگڵ:** وە چاکەو پەسەندە لە هەموو چل شەو جارێکدا کەرەتێك مووەکانی بن هەنگڵی هەڵکەنێت، بۆ کەسێك کە لەسەرەتاوە خۆی بە هەڵکەندنی فێر کردبێت ئاسانە، بەڵام بۆ کەسێك کە هەمیشە تاشیبێتی، ئەوە با تەنها بیتاشێت ، چونکە لەو هەڵکەندنەدا ئێش و ئازارێکی زۆری دەدا، مەبەستیش تەنها پاکوخاوێنییە، وە پیسی لەبن باڵێدا کۆنەبێتەوە، ئەوە بە تاشینیش دێتە جێ.

---

(١)رواه أحمد في المسند(٥/٢٦٤، في أثناء حديث لأبي إمامة (رضي الله عنه) فقلنا يارسول الله ﷺ (**إنَّ أهلَ الكِتابِ يَقصُّونَ عَثانينَهم، ويوفرون سِبالَهُم، فقال النبي ﷺ قصوا سِبالَكم ووَفِروا عَثانينَكُم، وخالِفوا أهلَ الكِتاب.**) وتيان ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ جوولەکەکان ڕیشیان دەبرن و ئەملاو لای سمێڵیان دەهێڵنەوە، فەرمووی: ئێوە ئەملاو لای سمێڵتان ببڕن و ڕێشتان بهێڵنەوە، وە پێچەوانی جوولەکەکان بجوڵێنەوە.

(٢) ئەوە فەرموودەی ئیمامی مالیکە (خودای لێ ڕازی بێت) کە تاشینی بەلاوە بیدعەیەکی ناپەسەندە بنوارە: مواهب الجليل/١/٣١٣).

**چوارەم :** مووی بەر: کارێکی باش و پەسەندە کەلای ببات، بە تاشین بێت یان بە نوورە،(تێکەڵەی کلس و زرنیخ) وەنابێت لە چل ڕۆژ دوابکەوێت.

**پێنجەم:** نینۆکەکانی: نینۆك کردن خێرو چاکەیە، چونکە دیمەنێکی زۆر ناشیرینی هەیە کە درێژ دەبێت، وە چڵك و پیسی تێدا کۆدەبێتەوە، پێغەمبەری خودا ﷺفەرموویەتی:

**((قَلِّم أظفارَكَ فَإِنَّ الشَّيطانَ يَقعُدُ عَلَى مَاطالَ مِنها))**[1]

واتە: نینۆکەکانت بکە، چونکە بەڕاستی شەیتان لەسەر درێژی نینوك دادەنیشێت، وە ئەگەر لە ژێر نینۆکەکەدا پیسی تێدا بێت، ئەوە ڕێگری لە درووستی دەست نوێژەکە ناکات، چونکە نابێتە ڕێگر لە گەیشتنی ئاو بە ژێری نینۆکەکەی، وە ئەوەش پرسێکە تایبەتەو شەرع لەبەر زەرورەت ئاسانکاری تێدا کردووە، بەتایبەتی لە نینۆکەکانی پێ، وە لەو پیسی و چڵکەی کە لە لوێچەکانی پەنجەو پێستی دەستو پشتی پێ و، دەستی عەرەبە دەشتەکییەکانداو، ئەوانەی خەڵکی ئەهلی سەوادن کۆ دەبێتەوە، (واتە: خەڵکی گوندو لادێ دوورەکان).

بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێدەدان کە نینۆکیان بکەن، وە نارازی بوو لەو پیس و پۆخڵییەی ژێر نینۆکەکانیان، لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانی پێ نەداون کە نوێژەکانیان بگێڕنەوە، خۆ ئەگەر ئەمریشی بفەرموایە، ئەوە

---

(١) ئیبلیسی لەعین هەر جێگایەکی پیس ماڵ و شوێنی حەوانەوەیەتی، بۆیە لەو سەر نینۆکە درێژەیش دادەنیشێت، چونکە ژێرەکەی پیس دەبێت، یان ئافرەتی ئەم سەردەمە بۆیەی دەکەن و وسڵی دەرناچێت. رواه الديلمي هكذا في مسند الفردوس(٤٥٧٩) عن علي (رضي الله عنه) ، و قال العراقي وأخرج الخطيب في الجامع (٥٨٩/١) من حديث جابر باسناد ضعيف بلفظ: **(خَلِّلوا لِحاكُم وقصوا أظافيركم فانَّ الشيطان يجرى مابين اللحم والظفر)**، قلت: ورواه ابن عساكر يضا في تاريخه من حديث جابر الا أنَّ لفظهُ ولفظ الخطيب: **(خلِلُّوا لِحاكُم وقَصُّوا أظفاركم)**.الإتحاف٤١١/٢.

سوودێکی گەورەی تری تێدا دەبوو، کە زیاتر توندی بکات لەسەریان و سەرزەنشتیان بکات، کە نابێ بایەخ بە پاکوتەمیزی نەدەن، وە لەهیچ کتێبێکدا نەمدیوە هەواڵێکی درووست هاتبێت لەسەر جۆری نینۆك کردنەکە بەچ شێوەیەکی ڕیزبەندی بێت، بەڵام ئەوەندەم بیستووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ بە پەنجەی شایەتومانی دەستی پێکردووە، وە کۆتاییشی بە پەنجەی ئیبهامی لای ڕاستی هێناوە، کاتێك سەرنجم دایە حیکمەتی ئەم بابەتە، واکەوتە دڵمەوە لە عالەمی مەعنادا،کە ئەو ڕیوایەتەی وادەفەرموێت کە بە پەنجەی شەهادەتی دەستی پێکردووەو بە ئیبهامی کۆتایی پێ هێناوە ئەوە ڕاستە، چونکە نموونەی

ئەو واتا پیرۆزەیە بە غەیری نووری نبووەت هەروا بە ئاسانی دەرناکەوێت،

بەڵام زانای بەرچاو ڕوون ، ئامانجی ئەوەیە کە هەڵێنجانی ئەو واتایە لە ئەقڵەوە بێت و لەوەوە وەربگرێت، دوای ئەوەیە کارەکەی بۆ لا بگوێزرێتەوە.

ئەوەی خودا بۆمنی دەرخستووە لەحیکمەتی ئەوکارە:

(زانستی ڕاستە قینەش هەر لای خودایە)، ئەوەیە کە:

پێویستە نینۆکەکانی پەنجەی دەست و پێ بکرێت، وە دەستیش بەڕێزترە لە قاچ، کەواتە لە پێشەوە بەپەنجەی دەستەکانی دەست پێ دەکات، لەپاشان لای ڕاست بەنرخترە لە لای چەپ، بۆیە لەلای ڕاستەوە دەست پێ دەکات، لەلای ڕاستیشەوە پێنج پەنجەی پێوەیە، بە پەنجەی شەهادەت دەست پێ دەکات، کە لە هەموویان بە نرخترە، چونکە تەنها بەو پەنجە هێمای وشەی یەکتاپەرستی پێ دەکەیت، لە پاشان دەبێت لەلای ڕاستی پەنجەی شەهادەتەوە دەست پێ بکات، چونکە شەرع وای پێ باشە، کاری پاکوخاوێنی و هەموو کارێکی تریش لە لای ڕاستەوە دەست پێ بکات، وە ئەگەر پشتی ناولەپت خستە سەر زەوی، ئەوە پەنجەی گەورە (ئیبهام) لە لای ڕاستەوە دەبێت، وە ئەگەر

ناولەپت خستە سەر زەوی، ئەوا پەنجەی ناوەڕاست دەبێتە لای ڕاست[1]،خۆ ئەگەر واز لە دەست بهێنیت و بە شێوەیەکی ئاسایی دایبنێیت، ئەوا زیاتر بەلای زەویدا دەکەوێت، چونکە لایەنی جووڵەی لای ڕاست بۆ لای چەپ دەچێت، وە تەواوی جووڵەکە بۆلای چەپ بەوەیە کە پشتی ناولەپی خۆی بەرزکاتەوە، کەواتە ئەوحاڵەتەی سروشتی ئاسایی داوای دەکات ئەوە لە پێشترە.

لەپاشان ئەگەر ناولەپ بخەیتە سەر ناو لەپ، ئەوکاتە پەنجەکان لە حوکمی ئەڵقەیەکی بازنەییدا دەبن، کەواتە بۆ خۆی سوڕانەوەکە ئەوە دەخوازێت کە لە لای ڕاستی پەنجەی شایەتومانەوە بڕوات تا دەگەڕێتەوە هەمان پەنجەی شەهادەت، کەواتە سەرەتاکەی بە پەنجەی (خنصر)ی بچوکەوە دەست پێدەکات، وە کۆتاییەکەیشی بە پەنجەی ئیبهامی دەبێت، ئەوکاتە ئیبهامی لای ڕاست دەمێنێت کە کۆتایی نینۆك بڕینەکەی پێ دەکات.

بۆیە وام دانا کە ناولەپ دابنرێت لەسەر ناو لەپ، هەتا پەنجەکان وەك چەند کەسێکیان لێ بێت لە ئەڵقەیەکدا، تا تەرتیب و ڕیزبەندییەکەیان دەر بکەوێت، شێوەی ئەو دەرکەوتنەیش لەپێشترە لە دانانی ناو لەپەکەی لە سەر پشتی ناولەپەکەی تری، یان دانانی پشتی لەپی دەستی لەسەر پشتی ناو لەپی، چونکە ئەمە سروشتی مرۆڤ نایخوازێت و پێچەوانەیشێتی[2] ،

(١) بە ئیعتیباری پەنجە (موسەببیحەکە).

(٢) ئەوەی ئیمام دیاری کردووە لە سەرەتاوە بە پەنجەی شایەتومان دەست پێدەکات: شەهادەی لای ڕاست و ناوەڕاست و بونصور و خونصور و لەپاشان خونصوری لای چەپ و ئیمجا بونصور و ناوەڕاست و سەببابە و ئیبهامی لای چەپ و لە پاشان ئیبهامی لای ڕاست.لە کوردەواری خۆیشماندا بەو پێنج پەنجە دەڵێن: تووتە و برای تووتە و بەرزەلووتەو دۆشاو مژەو ئەسپێ کوژە.وە پەنجەی شەهادەیش بە سەببابە دەڵێن.

بەڵام پەنجەکانی پێ.. ، چونکە هیچ ڕیوایەت و نەقڵێکی لەسەر نەهاتووە، ئەوەی لە لای من لە پێشترە، دەبێت لە پەنجە تووتەی ڕاستەوە (خنصر)دەست پێ بکات، وە کۆتاییەکەیشی بە پەنجەتووتەی لای چەپی دێت، وەك چۆن لەپاك کردنەوەی پەنجەکانی دەسدا لە باسی دەستنوێژدا هاتووە. بەڕاستی ئەو واتایانەی لە باسی پەنجەکانی دەسدا باسمانکردن لێرەدا ناگونجێن، چونکە لە پێدا پەنجەی شەهادەتی تێدا نییە، وە پەنجەکانی پێ هەموویان لە حوکمی یەك ڕیزدان، کە لە سەر زەویدا جێگیرین، کەواتە لەلای ڕاستەوە دەست پێ بکەین، وە ئەگەر بەو شێوە بازنەییە دای بنێن و پاژنەی پێ لەسەر پاژنەکەی تر دابنێت، تەنانەت سرووشتی خۆیشی بێزی لێ دەکاتەوە، بەڵام زانیمان بۆ دەستەکان وا نەبوو، ئەم وردەکارییە لە تەرتیب و ڕێکخستنیان بە نووری پێغەمبەرایەتی ﷺ بەیەك چرکە دەزانرێت، بەڵام بۆ ئێمەمانان بە ماندووبوونێکی زۆر تەواو دەبێت، خۆ ئەگەر لە سەرەتاوە ئەو جۆری ڕیزبەندییەمان لێ بپرسن، لەوانەبوو هەر بە خەتەرەی دڵیشماندا نەهاتایە، بۆیە باسی چونیەتی ڕیزبەندی پێغەمبەرمان کرد ﷺ ، چونکە بەوەی ئەو زاتە بە شەهادەتی فرمانڕەوایی کە بەچاوی خۆی بینیویەتی، دەتوانین سەرنجی حیکمەتەکەی بدەین، وە واتای گرنگ لە کردارەکانی ئەو دەربهێنین.

تۆیش ئەی سالیکی طەریقی ئاخیرەت، هەرگیز ئەو گومانە نەبەیت ، کە کردارەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ دووربوو بێت لە بازنەی وەزن و کێشی مەعنەوی و، ڕەسم و یاسای ئیلاهی و، ڕیزبەندی و تەرتیبی ڕەببانی، بەڵکو هەموو فرمانە ئارەزوومەندییەکان کە بکەرەکانی دودڵییان هەبووە لە میانی دووبەش یان سێ بەشدا، پێغەمبەری خودا ﷺ تەنها کارێکی دیاری کراوی لەو کارانە هەروا بەڕێکەوت ئەنجام نەدەدا، بەڵکو بەو شێوەی هەڵدەبژارد کە لەپێشتر بێت و شیاوتر بێت، چونکە هەروا بە هەڕەمەکی و بەبێ هەڵبژاردن

هەرچۆنیك هاتە بەردەست کارەکە بکات، ئەوە لە شیمەی ئاژەڵەکانە، وە زاناو دۆستانی خودا هەموو کارێکیان بە میزان و، هەمووجوڵەیەکیان پڕ لە حیکمەت و واتای بەسوودە، هەرچەندێك کارو خەتەرەو خەیاڵاتی ئادەمی نزیکتربوو لە ڕێکی و بتەوەی و پڕحیکمەتییەوە، وە دوورتر بێت لە ئیهمال و گەمەو گاڵتەوە، ئەوە پلەو پایەی ئەو کەسە لە ئەولیاو دۆستانی خوداوە نزیکترە، وەنزیك بوونەوەیشی لە خودای گەورەوە ئاشکراترە، چونکە ئەوەی لە پێغەمبەری خودا ﷺ نزیك بێت، دیارە لە خوداوە نزیك دەبێت، وە بەدڵنیاییشەوە نزیك دەبێت، چونکە ئەوەی لە نزیکەوە نزیك بێت، نزیکترە لە هەموو کەسەکانی تر. کەواتە پەنادەگرین بەخودا کە جڵەوی کارو جووڵەو بێ دەنگیی و وەستان و ئارەزوکاریمان بەدەستی شەیتانەوە بێت، یان شوێن کەوتەی ئارەزواتمان بین .

وە لە ڕێکخستنی کارەکانماندا دەبێت چاو لە کردارەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەین، بۆ نموونە چاوڕشتنی ئەو زاتە بە سێ جار لەچاوی ڕاستەوە دەستی پێ دەکرد و، بەدووجاریش لە چاوی چەپەوە کۆتایی پێدەهێنا[(١)]

بۆیە بە چاوی ڕاستی دەستی پێ کردووە، چونکە لای ڕاست بەنرخ و پڕ بەهادار ترە، وە جیاوازی میانی ڕاست و چەپ لە بەش و ژمارەکانیان، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە کۆتایی ڕەشتنەکان بە تاك بێت، چونکە خودا ویترو تاکەو حەزیشی لە کارێکە بەتاك کۆتایی بێت[(٢)]،

---

(١) رواه ابن سعد في طبقاته.٤١٦/١. وابن أبي شيبة في المصنف.(٢٣٩٥٣)

(٢) رواه البخاري (٦٤١٠)ومسلم (٢٦٧٧). وقد أغفله العراقي، أخرجه أحمد والبزار عن ابن عمر وقال الهيثمي رجاله موثقون وأخرجه محمد بن نصر في كتاب الصلاة عن أبى هريرة وابن عمر.واتە خودا تاکو تەنهایە لە زاتی خۆیدا. وە قەبوڵی دابەش بوون و پارچەپارچەبوون ناکات، وە تەنهایە لە صیفەتەکانیدا. واتە : هیچ کەسێك هاوبەشی

کەواتە نابێت کاری بەندەکەی خاڵی بێت لە موناسەبەو لێکچواندنێك بە صیفەتێك لە صیفەتەکانی خالیقە کەیەوە، هەر لە بەر ئەمەیشە کە واباش دانراوە لە خۆپاك کردنەوەشدا بە سێ بەرد بێت، یان بەکارهێنانی بخوورد، (وەك ئیبن و عمەر و ئیمامی مالك کردویانە).

ئەی بۆچی لە چاو ڕەشتندا بەسێدانە تەواو نابێت؟ چونکە ئەوکاتە چاوی چەپ یەك دانەی بەردەکەوت، دوو بۆ ڕاست و یەکیش بۆ چەپ، وە یەکدانەیش بنەماو ڕەگەکانی پێڵوی چاو تێر ناکات، بۆیە دەستی ڕاستیش تایبەتمەند کراوە بە سێ جارەوە، بۆ ئەوەی کە دەبێت فەزڵی بەسەر لای چەپدا ئاشکراو دەرکەوتوو بێت، لای ڕاستیش گەورە ترە، کەواتە هەقی خۆیەتی کە بۆی زیاد بکرێت. ئەگەر بڵێیت: بۆچی بۆ چاوی چەپ تەنها دووجار دەیرێژێت کە ژمارە دوو جووتە؟ لەوەڵامدا دەڵێم:

ئەوە لەبەر زەرورەت و پێویستی بووە، خۆ ئەگەر بۆ هەریەکەیان بە ویتر و تاك بۆی دابنێین، ئەوا کۆی هەمووی دەبوو بە جووت، چونکە تاکێك بخەرە پاڵ تاکێکی ترەوە دەبێتە جووت، وە چاودێریکردنی ئەوەی لە تاك و ویتر دەرنەچێت، ئەوە بۆ کۆی هەموو بەشەکانە، چونکە هەمووی لە حوکمی یەك خەصڵەتدایە، کاتێك لە کۆی هەمویدا بە تاك دەربچێت، ئەمە باشترە کە بە تەنها تەنها حیسابی ویتریان بۆ کرابێت.[1]

---

صیفەتێکی خودا نیـیە، وە کەسیش ناشوبهێت پێی لە کردارەکانیدا، وەکەس لەوناچێت و بیسەر و بینایەو، کاری تاك و ویتری خۆش دەوێت چونکە خۆی تاك و تەنهایە.الإتحاف/٢٤١٥

(١) ئەمەش لەسەر ئەوەیە کە هەردوو چاوەکە لە حوکمی یەك چاودایە، بەهەردوکیانەوە سەیری شتەکانی پێ دەکرێت، الإتحاف ٢/٤١٦.

ئەگەر بەو شێوەیش بوایە هەر ڕێی تێدەچوو، کە لە هەریەکێك لە چاوەکانی سێجار کلی تێ بکات، بە قیاس لەسەر ئاوی دەست نوێژ، ئەمەش لە ڕای درووست و ڕاستەقینەدا باسی کراوە، کە پەسەند و شیاوترە(١)،

خۆ ئەگەر بە وردی بڕۆمە ناو بابەتەکانەوەو، هەموو ئەو وردەکاریانەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە جوڵەو وەستانەکانیدا چاودێری کردووە و سەرنجی داوە، باسی هەموویان بکەین، ئەوە بەڕاستی زۆر دەکێشێت و بە کۆتا ناگات، کەواتە ئەوەی بیستووتە قیاسی بکەو بیپێوە بەوەی کە نەتبیستووە.

**بزانە:** زانا نابێتە میراتگری پێغەمبەری خودا ﷺ، هەتا ئاگاداری هەموو واتاکانی شەریعەتی ئیسلام نەبێت، تاوای لێ دێت میانی ئەوو پێغەمبەری خودا ﷺ تەنها یەك پلەیان جیاواز دەبێت، ئەویش پلەی پێغەمبەرایەتییە، کە ئەو پلەیە میراتبەر و میراتلێگیراو لەیەك جودا دەکاتەوە، چونکە خاوەن میرات ئەوەیە کە میراتی لێدەبەن، واتە ماڵەکەی پەیدا کردووە، وە پێیەوە سەرقاڵ بووە، توانای بەسەریدا پەیدا کردووە، بەڵام میراتگر ئەوەیە نەبۆتە خاوەنی تەواوی و توانایشی بەسەردا پەیدانەکردووە، بەڵام تەنها ئەوەی کە ماڵەکە گوازراوەتەوە بۆ لای و لەوی ترەوە وەری گرتووە دوای ئەوەی بۆ ئەوپەیدابووە.

نموونەی ئەم واتایانە، لەگەڵ ئەوەدا کە فرمانێکی ئاسان و گرێ و گۆڵیان تێدا نییە، کەچی کەسێکی نامۆ زانینی نهێنییەکانی کەسێکی تر ناتوانێت لەسەرەتاوە بەسەر بەخۆیی بیانزانێت و دەرکیان پێ بکات، جگە لە پێغەمبەران نەبێت، وە دوای پێغەمبەرانیش کەسی تر ناتوانێت ئەو واتاو ناوەڕۆکەیان لێ

---

(١)قال العراق هو عند الترمذي(١٧٥٧) وابن ماجه (٣٤٩٩)من حديث ابن عباس قال الترمذي حديث حسن اهـ قلت ولفظه عندهما: **كان له مكحلة يكتحل بها كل ليلة ثلاثا في هذه، وثلاثا في هذه** هكذا هو في اللباس عند الترمذي: **الإكتحال ثلاثا في كل عين الإتحاف** ٢/٤١٦.

وەربگرێت، دوای بێدارکردنەوەی پێغەمبەران لەسەریان، جگە لە زاناکان نەبێت، کە بەڕاستی میراتگری پێغەمبەرانن (سەلامی خودایان لەسەر بێت).

**شەشەم و حەوتەم**: بڕینی ئەو زیادەی ناوك و پێستی زەکەر:

یەکەمیان ناوك بڕین: ئەوە لە سەرەتای منداڵبوونەوە دەبڕرێت، وە پاکبوونەوەش بە خەتەنەکردن دەبێت، کە بڕینی ئەو پێستەیە لەسەری زەکەری پیاوو، وەبڕینی هەندێکە لەو پێستەی بەسەر پێشی مێینەوەیە.

وە نەریتی جولەکەکان ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بوونە، وە پێچەوانەی ئەوان بکەیت بە دواخستنی، هەتا ئەو منداڵە ددانەکانی شیرەخۆری دەکەوێت، یان بۆخۆی بەهێز دەبێت، ئەو دواخستنە باشترە و لە مەترسیش دووری دەخاتەوە. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((الختانُ سُنَّةٌ للرِّجالِ ومَكرَمَةٌ للنِّساء))**[1]،واتە خەتەنەکردن بە نیسبەت پیاوەوە سوننەتەو، بەنیسبەت ئافرەتیشەوە ڕێز لێگیرانە بۆی.

وە پێویستە بۆ ئافرەت ئەو پێستە بەکەمی ببڕێت، پێغەمبەری خودا ﷺ بە دایکی عەتییەی فەرموو کە خەتەنەی ئافرەتی دەکرد: ئەی دایکی عەطییە :

**((ياأمَّ عَطيَّة أشِمِّي ولاتَنهَكي فإنَّهُ أسرى لِلوَجهِ وأحظَى عِندَ الزَّواج))**[2]، واتە: پێستی ئافرەتەکە کەمتر ببڕە، چونکە زیاتر بەهۆی بۆنەوە خوێن لە دەموچاوی دەزێت و، گەشتر و ڕۆشن تردەبێت، وەباشتریش دەتوانێت کارو چێژی درووست بوون هەست پێ بکات. بنوارە پێغەمبەری خودا ﷺ چەند بە

---

(١)رواه أحمد في المسند (٧٥/٥). والبيهقي في السنن الكبرى(٣٢٤/٨).من رواية أبي المليح بن أسامة عن أبيه باسناد ضعيف اهـ قلت رواه الطبراني والبيهقي أيضا من حديث شداد بن أوس وأبي أيوب وابن عباس قال العراقي وقد رواه الطبراني في مسند الشاميين من غير طريق الحجاج من رواية سعيدعن قتادة عن جابر بن زيد عن ابن عباس. الإتحاف ٤١٧/٢.

(٢)قال العراقي رواه الحاكم والبيهقي من حديث الضحاك ولابي داود نحوه برقم(٥٢٧١) من حديث أم عطية وكلاهما ضعيف . وبلفظه عند الطبراني في الأوسط (٢٢٧٤).

کەمی و کورتی و بە کینایە ئەوەی مەبەستیەتی گەیاندوویەتی، وە چۆن لە نووری پێغەمبەرێتی ئەوەی لێ ئاشکرا بووە، کە جگە لە بەرژەوندییەکانی ئاخیرەت، کە مەبەستی سەرەکییەتی لە گەیاندنی شەریعەت، دابەزیوە بۆ ڕونکردنەوەی بەرژەوەند ییەکانی دونیا، تا ئەوەی کە هەرچەندە نەخوێندەوارە، ئەو فرمانە گرنگەیشی بۆ ئاشکرابووە، کە ئەگەر لێی بێ ئاگابوایەو گرنگی پێ نەدایە، بە دڵنیاییەوە زیانێکی زۆری بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا. پاکو مونەززەهی بۆ ئەو خودایەی کە پێغەمبەرەکەی بە ڕەحمەتی هەموو جیهان ناردووە، تابتوانێت بە بەرەکەت ڕەوانەکراوی خۆی، بەرژەوەندییە دینی و دونیاییەکانیان بپارێزێت.

**هەشتەم:دەربارەی درێژی ڕیش:** بۆیە دوامان خست، بۆ ئەوەی باسی هەموو ئەو بابەتانەبکەین، کە پەیوەستن پێیەوە لە بارەی ڕیشی سوننەت و بیدعەتەوە چونکە ئەم جێگایە نزیکترین وێسگەیە کە ئەم باسانەی تێدا شیتەڵ بکرێتەوە.

بەڕاستی ڕای جیاوازیان لە ڕیشی درێژ هەیە، هەندێك دەڵێن:

ئەگەر کەسێك بە دەستی خۆی ڕدێنی بگرێت، ئەوەی لە خواری دەستیەوە یە بیبڕێت، ئەوە باشەو قەیناکە. دەزانین کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) وە کۆمەڵێك لە تابیعین کردوویانە، وە زانایان (شەعبی و ئیبن و سیرین) بەلایانەوە ڕایەکی جوان و پەسەندە.

بەڵام(حەزرەتی)حەسەنی بەصری و قەتادە بەلایانەوە ناپەسەندە بەو شێوە بێت، وە دەڵێن: وازی لێ بهێنێت و بەری داتەوە ئەوەمان پێ باشە: ڕیشتان بەردەنەوە.((**اعفُوا اللِّحى**))[1] ئەو فەرمانەی کە پەیوەندی بە ڕیش بەردانەوەوە هەیە، زۆر نزیکە لە تێگەیشتنەوە، نەئەوەیە کە بڕین و پچڕپچڕی تێ بکەوێت و، لە هەموو لایەکەوە بێت بەدەوری دەمووچاودا، وەك ئەهلی بازاڕی، چونکە

---

(١) رواه البخاري (٥٨٩٢) ومسلم ٢٥٩-٢٦٠.

درێژی زۆر شیمەو ڕوخسار تێك دەدات و، دەمی غەیبەتکەرانیشی لێ دەکاتەوە، ئەگەر لەسەر ئەم نییەتە خۆی لە بەردانەوەی ڕیشی درێژ بپارێزێت خراپ نییە. ئیمامی نەخەعی دەفەرموێت: سەرم لەو کەسە سوڕماوە کە ڕیشی زۆر درێژە، بۆچی لە درێژی ڕیشەکەی هەڵناگرێت بیخاتە میانی دووڕیشەوە، بە ڕاستی لە هەموو شتێکدا میانەڕەوی باشە.بۆیە وتراوە:(**كُلَّما طالَتِ اللِّحيَةَتَشمَّرَ العقلُ**)[1] چەندێك ڕیش درێژتر ببێت ئەقڵیش ئەوەندە پەڕەوازەو سووك دەبێت.

# ناوبڕێك (فصل)

## باسی ئەو خەصڵەتانەی بۆ ڕیش مەکروهن

بۆ ڕیش هێڵانەوە دە شێوەو خەصڵەت هەیە کە نەشیاوو ناپەسەندن، وەهەندێکیان کەراهەت و ناپەسەندییان زیاترە، کە ئەمانەن:

بیگرێتە خەنەی ڕەش، یان سپی بکاتەوە بە هۆی کبریتەوە، یان هەڵکەندنی، یا لابردنی مووە سپیەکانی، یان کەمی بکاتەوە یان زیادی بکات (وەك باسی دێت)، وە شانەکردنی بۆ ڕیابازی، یان دێزو ئاڵۆز بهێڵێتەوە، وەك زاهیدەکان خۆی نیشان بدات، یان سەیرکردنی ڕەشایی ڕیش کە موعجەب بێت بە گەنجێتی خۆی، یان شانازی و فەخر بکات بە سپێتی ڕیشیەوە، وەك فیزو خۆ بەگەورە زانین، وە ڕەنگکرنی بەخەنەی سور و زەرد، بە بێ نییەتێکی باش، وە بەمەبەستی خۆ شوبهاندن بە پیاوچاکانەوە.

**یەکەم: بەکارهێنانی خەنەی ڕەش:**

ئەوە نەهی لێکراوە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**خيرُ شبابكُم مَن تشبَّهَ بشيُوخِكُم وشَرُّ شيُوخِكُم مَنْ تشبَّهَ بشَبابِكُم**))[1]. مەبەست لەوەیە: کە

---

(١)وقيل(ماطالت اللحية من رجل إلا ونقص من عقله بمقدار ماطال من لحيته) القوت٢/١٤٥

باشترینی گەنجەکان ئەوانەن خۆیان وەك پیرەکان لێ دەکەن، واتە ویقار و ڕێزی خۆیان دەپارێزن، نەك لەوەدا کە ڕیشی خۆیان سپی بکەن، وە خراپترینی پیرەکانیشتان ئەوانەن کە خۆیان دەشوبهێنێن بە گەنجەکانەوە، وە نەهی کراوە لە بەکارهێنانی خەنەی ڕەش، **((ونَهى عَنِ الخِضابِ بالسَّوادِ))**[2]،

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((هُوَ خِضابُ أهلِ النَّار))**[3]، خەنەی ڕەش ڕەنگی ئەهلی ئاگرە، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:

**((الخِضابُ بالسَّواد خِضابُ الكُفَّار))**[4]،

خەنەکردن بە ڕەنگی ڕەش خەنەکردنی ئەهلی ئاگرە.

پیاوێك لە چەرخی خەلافەتی(حەزرەتی)عومەردا ژنێکی مارە بڕی، ڕیشی خۆی ڕەشکردبوویەوە بە هۆی خەنەوە، خەنەکەی کاڵ بووبویەوەو لاچوبوو، وە پیریەتییەکەی دەرکەوتبوو، کەسوکاری ئافرەتەکە بردیان بۆ خزمەتی (حەزرەتی)عومەر(خودای لێ ڕازی بێت)نیکاحەکەی هەڵوەشاندەوە و ئەوەندە

---

(١)كذا في القوت ولكن قال **بكهُولكم بدلَ بشُيوخكم** قال العراقي أخرجه الطبراني(٥٩٠٠) من حديث واثلة باسناد ضعيف.قلت: وكذا أبو يعلي قال الهيثمي وفيه من لم أعرفهم وأخرجه البيهقي عن ابن عباس وقال: تفرَّد به بحر بن كنيز السقا وبحر قال في الكاشف تركوه وفي الضعفاء اتفقوا على تركه، وفيه أيضا الحسن ابن أبي جعفر وهو ضعيف وأخرجه ابن عدي عن ابن مسعود وقال ابن الجوزى حديث لايصح، الإتحاف ٢/٤٢٠.

(٢) رواه مسلم (٢١٠٢) عن جابر (رضي الله عنه) قال: **(أُتِيَ بأبي قُحافة يوم فتح مكة، ورأسه ولحيته كالثغامة بياضاً، فقال ﷺ غيروا هذا بشيئ واجتنبوا السواد). قال العراقي أخرجه ابن سعد في الطبقات من حديث ابن العاص باسناد منقطع. الإتحاف ٢/٤٢٠.**

(٣)أى الخضاب بالسواد (وفي لفظ آخر) قال العراقي أخرجه الطبراني والحاكم من حديث ابن عمر بلفظ:الكافر ، قال ابن أبي حاتم منكر، نفس المصدر

(٤) رواه الحاكم في المستدرك(٥٢٦/٣) بلفظ: **(والسواد خضاب الكفار)**. والرواية والسياق عند صاحب القوت ٢/١٤٤).

یشی لێدا هەتا ئازاری پێگەیاند،وە فەرمووی: ئەو قەوم و خزمانەت بەگەنجێتی خۆت هەڵفریواند و، پیرێتی خۆتت لێ شاردنەوە.[1] وەك دەڵێن یەکەم کەسێك ڕوخساری خۆی بەخەنەی ڕەش گۆڕیوە فیرعەن بووە (لەعنەتی لێ بێت)[2]

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێت)دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((یَکونُ في آخِرِ الزَّمان قَومٌ یَخضِبُون بالسَّوادِ کحَواصِلِ الحَمامِ لا یَریحُون رائحةَ الجَنَّة))**[3].

واتە لە ئاخر زەماندا کۆمەڵێك پەیدا دەبن بە خەنەی ڕەش ڕیش و سەریان ڕەنگ دەکەن وەك گەدەو جیقڵدانی کۆتر، ئەوانە بۆنی بەهەشت ناکەن.

**دووهەم: ڕەنگکردن بە سوورو زەرد،**

بەکارهێنانی ئەو جۆرە خەنەیە درووستە(وسمە)بۆ ئەوەی بەرامبەر بە کافرەکان وەك گەنجێك بکەوێتە بەرچاویان، خۆ ئەگەر لە پێناوی ئەم نییەتەدا نەبێت، وە تەنها بیەوێت خۆی بە ئەهلی دین بشوبهێنێت و لەوانیش نەبێت، ئەوە کارێکی نەشیاوە و پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((الصُّفرة خِضابُ المُسلمین، والحُمرَةَ خِضاب المؤمنین٦))** .[4] ،

واتە: ڕەنگکردنی ڕیش بە خەنەی زەرد شیمەی موسوڵمانانە، وە بەڕەنگی

---

(١) قوت القلوب ٢/١٤٤.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣)أورده صاحب القوت وقال رواه سعيد بن جير عن ابن عباس وقال العراقي أخرجه أبو دواود(٤٢١٢)و النسائي (١٣٨/٨) من حديثه باسناد جيد اهـ

(٤)هكذا أورده صاحب القوت قال العراقي أخرجه الطبراني والحاكم من حديث ابن عمر بلفظ الافراد، قال ابن أبى حاتم منكر اهـ قلت: أورده الحاكم في المناقب ولكن لفظهم: **(الصُّفرة خضاب المُؤمن والحُمرة خِضابُ المُسلم والسَّوادُ خِضاب الكافِر)** ، الإتحاف ٢/٤٢١.

سووریش شیمەی بڕوادارانە.وە کاتی خۆی نەریتیان وابوو، بۆ ڕەنگی سوور خەنەیان بەکاردەهێنا، وە بە گیاو بۆنی (کەتەم) بۆ ڕەنگی زەرد (کە ڕووەکێکە لە چیاکان دەڕوێت، ڕەنگی ڕەش و (مرەکەب) وحیبریشي لێ درووست دەکرا).

وەهەندێك لە زانایان ڕیش و سەری خۆیانیان ڕەش دەکرد بە خەنە بۆ جیهاد کردن، ئەگەر نییەتەکەیان درووست بێت ئەوە ئاساییە، بەو مەرجەیش کە هەواو ئارەزواتی تێکەڵ نەبوبێت.

**سێیەم: سپی کردنەوەی مووی ڕیشە** بە کبریت[1]، بۆ ئەوەی پەلە بکات و خۆی بەتەمەن گەورە لە قەڵەم بدات، تا ڕێزی لێ بگیرێت، وە شەهادەتی وەربگیرێت، وە بڕوای پێ بکرێت کە ڕوداوێك لە یەکێك لە مەشایەخانەوە دەگێڕێتەوە، وە خۆیشی بەسەر گەنجەکاندا بەرز کاتەوە، وە بیشیگەێنێت کە زانستی زۆرە، واگومان ببات کە زۆربوونی تەمەنی زیادە فەزڵێکی پێ دەبەخشێت، بەڵام خەیاڵی خاوە! مرۆڤ نەزان تا گەورەتریش ببێت تەنها لەنەزانینی زیاتر بەهرەمەند دەبێت، چونکە زانست بەرهەمی ئەقڵە، ئەوەش غەریزەیەکە لە مێشکدا درووست دەبێت، پیریەتی کاریگەری لەسەری نابێت، وە کەسێکیش بەشە غەریزەکەی نەفامی و ئەحمەقی بێت، تا تەمەن درێژ تر بێتَ نەفامیەکەیشی زیاتر دەبێت.

وەك عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: خودای گەورە زانستی بەهەرکەسێك دابێت بە گەنجی پێی داوە، وە هەرچی خێر و چاکە هەیە لە گەنجێتیدایە، لە پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:

﴿قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ﴾ (الأنبياء/٦٤)

---

(١) کبیریت کانیەکە لە بەری دەڕوات، کە ئاوەکەی بیبەستێت دەبێ بە کبریتی زەردو سورو سپی، وە هەمو جۆرەکانی ڕەنگ. ڕیش سپی دەکەنەوە وەك بیەوێت گەنجێتی خۆی بگۆڕێت.

وتیان: بیستمان گەنجێك ناوی خوداكانتانی دەبرد ناوی ئیبراهیم بوو، هەروەها فەرموودەی خودا:

﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى﴾

(الكهف/١٣) ئەوانە كۆمەڵە گەنجێكن بڕوایان هێناوە بە پەروەردگاریان و ئێمەش زیادە ڕێنماییمان كردوون، وە فەرموودەی خودا:

﴿وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا﴾ (مريم/١٢)

واتە: هەر بە منداڵی ئەقڵی تەواو و تێگەیشتنمان پێداو، فێری حوكمەكانی تەوراتمان كرد.

(حەزرەتی) ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆحی سپارد تەنها بیست مووی سپی لە سەر و ڕیشیدا هەبوو، وتیان پێی: ئەی باوكی هەمزە: كەواتە پیر بووە؟

ئەنەس فەرمووی:

خودای گەورە پێغەمبەرەكەی بە پیریەتی عەیبدار نەكردووە، وتیان : بۆچی ئەوە نەنگی و عەیبە؟ فەرمووی: هەمووتان ڕقتان لێیەتی[1] ،

---

(١) وە فەرموودەی :(**الشيب وقارٌ و نُورٌ**) دەوترێت ڕاستە پیریەتی ویقار و زیادكردنی ئیمان و نووره، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ژنان پێی نارەحەتن، وە لەوانەیە حەرەمەكانی پێغەمبەری خودا ﷺ پێی نارەحەت بن و. ئەگەر بەم شێوەش بن ئەوا نارەزابوون لە صیفەتێكی پێغەمبەر بەكوفر دادەنرێت، بۆیە خودا ئەوانیشی لەو كێشە پاراستووە، قال العراقي متفق عليه من حديث أنس دون قوله فقيل إلى اخره،ورواية البخاري برقم(٣٥٤٧)، ولمسلم (٢٣٤٧) من حديثه وسئل عن شيب رسول الله ﷺ فقال: **ما شانه الله ببيضاء** اهـ قلت ولمسلم عن أنس روايات أخر: (**كان في لحيته شعرات بيض لم ير من الشيب إلا قليلا**) وأخرج مسلم والنسائي عن جابر بلفظ: (**كان قد شمط مقدم رأسهِ ولحيتِه وعند مُسلم كان إذا أدهَن لم يتبين**) أى الشيب، واذا

دەڵێن:

یەحیای کوڕی ئەکتەم کرا بە قازی، تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو، یەکێك لە مەجلیسەکەیدا ویستی تەریقی بکاتەوە پێی وت: تەمەنی قاضی چەندە، خودا یارمەتی بدات؟ ئەویش فەرمووی:

وەك تەمەنی عوتتابی کوڕی ئوسەید دەبێت، کە پێغەمبەری خودا ﷺ کردی بە فرماندار و قاضی مەککە، بەم شێوەیە بێدەنگی کرد.[1].

وە دەگێڕنەوە لە مالیکی کوڕی مەغولەوە کە فەرموویەتی:

هەندێك لە کتێبە ئاسمانییەکانم خوێندۆتەوە: با ڕیش فریوتان نەدات بزنیش ڕیشی هەیە![2].

وە ئەبو عەمری کوڕی عەلا دەفەرموێت:

ئەگەر کەسێکی بەژن و باڵا درێژ و سەر بچوك و ڕیش پانت بینی، ئەوا حوکمی نەفامی و ئەحمەقی بدە بە سەریدا، با ئەو کەسە ئومەییەی کوڕی عەبدی شەمسیش بێت.

ئەیوبی سەختیانی فەرموویەتی:

پیاوی هەشتا ساڵەم بینیوە شوێنی غوڵامێکی هەرزەکار کەوتووە لێ یەوە فێر ببێت.

هەروەها عەلی کوڕی (حەزرەتی) حوسەین فەرموویەتی:

---

اشعث تبيَّن، قال شارحه لانه عند الإدهان يجمع شَعره فيخفَى شيبه لقلته، وعند عدمهِ يتفرق شَعره فيَظهر شيبَه والله أعلم. الإتحاف ٤٢٣/٢.

(١) قوت القلوب/١٤٥/٢.

(٢) هەمان سەرچاوە.

ئەوەی پێش تۆ بەهرەی زانستی وەرگرت، ئەوە پێشەوای تۆیە لەو زانستەدا با لەتۆ تەمەنی کەمتریش بێت.[1]

وتیان بە عەمری کوڕی عەلاء: ئایا کارێکی باشە کە پیاوێکی پیر لە منداڵێکی بچوك شت فێر ببێت؟ فەرمووی:

ئەگەر ناشیرین بێت جەهل و نەزانینی لێوە فێرببێت پێی خراپ ببێت، دیارە چاکەیشی لێ فێر ببێت پێی جوان دەبێت.

هەروەها یەحیای کوڕی موعین فەرمووی بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل: کە بینی ئیمامی ئەحمەد لە پشتی هێسترەکەی ئیمامی شافیعی یەوە دەڕوات:

فەرمووی:

ئەی باوکی عەبدوڵلا؛ وازت لە مەجلیس و فەرموودەکانی سوفیانی کوڕی عویەینە هێناوەو شوێن هێستری ئەو گەنجە دەکەویت و گوێیشی لێ دەگریت؟ (ئیمام)ئەحمەد فەرمووی:

ئەگەر بتزانیایەو بتناسیایە، ئەوا تۆیش لەولایەوە دەڕۆشتیت؛

ئەگەر زانیاریەکانی سوفیانم لە بەرزی و ڕوبەڕوییەوە لێی مەحروم بووبم، ئەوا دەتوانم لە نزمی و هۆکارەکانی ترەوە دەستی خۆمی بخەم، بەڵام زانستی ئەم گەنجەم ئەگەر لە کیس بچێت، ئەوا نە لەبەرزی و نە لە نزمیدا ناتوانم وەدەستی بهێنمەوە![2].

## چوارەم:

هەڵکەندنی مووەسپیەکانیەتی، کە حەز بە پیریەتی نەکات، کە بەڕاستی

---

(١) ئەم سێ ڕێوایەتەو نەودوانەی تریش کە دێن هەموویان لە قوت القلوب ی ئەبو طالیبی مەککی وەر گیراوە ١٤٥/٢.

(٢) بنوارە قوت القلوب ١٤٥/٢، وە ئەصڵی ئەم ڕیوایەتەیش لە (تأريخ بغداد) وەرگیراوە ٦٤/٢.

پێغەمبەری خودا ﷺ نەهی کردووە لە هەڵکەندنی مووی سپی، وە فەرموویەتی: (هُو نُوُر المُؤمِن)ئەوە نووری ئیمانداره،[1].

ئەوەش وەك ئەوە وایە کە خەنەی ڕەشی بەکارهێناوە، وە هۆکاری ئەو جۆرە کەراهەت بوونە ئەوەیە کە باسمان کرد، چونکە پیریەتی نووری خودایە، هەرکەسێکیش حەزی لە پیریەتی نەبێت ئەوا حەزی لە نووری خودا نییە.

**پێنجەم:**

هەڵکەندنی هەموو یان هەندێکی ئەو موانە تەنها لەبەر گاڵتە کردن و ئارەزوکاری و ئەقڵسووکی بێت، ئەمەش ناپەسەندەو تێکدانی سرووشتی ڕاستەقینەی مرۆڤە، کەخودا دروستی کردووە، هەروەها هەڵکەندنی گەنەمووی ئەو دوولایەنەی بەملاولای (عونفوق)ە یە، لە ژێر لێویدا کارێکی داهێنراوەو، یەکێك لەوانەی مووی ئەو جێگای هەڵدەکەند شایەتییەکی لای(حەزرەتی)عومەری کوڕی عبدالعزیزدا ئەویش شایەتیدانەکەی ڕەدکردەوە،

---

(١)قال العراقي أخرجه أبو داود(٤٢٠٢) والترمذي(٢٨٢١) وحسنه والنسائي وابن ماجه(٣٧٢١) من رواية عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده اهـ قلت: وعند المنذري وقال: **إنَّه نُور المسلم**، وعند أبي داود من حديثه بلفظ: (**لا تنقوا الشيب فانه نور يوم القيامة.**) وفي رواية له: **فإنَّه نور المؤمن**، وأخرج البيهقي من هذه الرواية: (**الشيب نور المؤمن، لا يشيب رجل شيبة في الاسلام إلا كانت له بكل شيبة حسنة، ورفع بها درجة**). وفي اسناده الوليد بن كثير أورده الذهبي في الضعفاء، وروى ابن عساكر من حديث أنس:( **الشيب نور من خلع الشيب، فقد خلع نور الاسلام وإنما جعل الشيب نورالمؤمن لانَّه يمنَعُه عن الغرور والخِفة والطيش، وبميلُه إلى الطاعةِ ويحبسُ عن نفسهِ الشَّهوات وكل ذلك موجب للثواب يوم المآب**). هەڵکەندنی موویش مووی ڕیش و سەریش دەگرێتەوە. الإتحاف ٤٢٥/٢.

هەروەها(حەزرەتی) عومەری کوڕی خەطاب و ئیبن و ئەبی لەیلا کە قاضی مەدینە بوو شەهادەتیان لەوانە وەرنەدەگرت کە ڕیشیان هەڵدەکەند.[1]،

بەڵام ئەوانەی کە لەسەرەتای هەرزەکاریانەوە مووەکانیان لادەبەن کە وەك (ئەمرەد)ە بێ مووەکان دەربکەون، ئەوە زۆر ناپەسەند و ناجۆرە، چونکە ڕیش زینەت و جوانی پیاوانە، بەڕاستی خودای گەورە چەندین فریشتەی هەیە کە بەم شوێنە سوێند دەخۆن:

سوێند بەو خودایەی ئادەمیزادی بە بەردانەوەی ڕیش جوان کردووە[2]، ئەوەش لە تەواویی پیاوەتی و خیلقەتی مرۆڤە، کە پیاوی لە ژن پێ جودا دەکرێتەوە.

لە پەڕاوی (غریب التأویل) دا وتراوە: مەبەست لەم ئایەتە ڕدێنە کە دەفەرموێت: ﴿يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ﴾ (فاطر/١)

واتە: چەندی بوێت لە درووستکراوەکانی لێیان زیاد دەکات.

هاوڕێیانی ئەحنەفی کوڕی قەیس دەڵێن: خۆزگەمان دەخواست کە ڕیشێکمان بۆ ئەحنەف بکڕیایە، با بە بیست هەزار دیرهەمیش بوایە! [3]،

شورەیحی قاضی فەرموویەتی:

خۆزگەم دەخواست کە ڕیشم هەبوایە با بە دەهەزاریش بوایە.

---

(١) رواه أبوبكر الجصاص في أحكام القرآن٢/٢٣٦ بنحوه، وهو بهذا السياق في القوت ٢/١٤٤.

(٢) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق، ٣٦/٣٤٣، وروى السيدة عائشة (رضي الله عنها) أنها كانت تقوله، كما ذكر ذلك ابن قتيبه في عيون الأخبار ٤/ ٥٥ وتنزيه الشريعة١/٢٤٧.

(٣) ئەحنەف پیاوێکی دانای زانای حەلیمی بەڕێزبووە، لەگەڵئەوەشدا کە چاوێکی نەبووەو تۆزێکیش شەل بووە، بەڵام ئەوانەیان بە عەیب لەسەر نەژماردووە تەنها حەزیان کردووە کە ڕیشی هەبێت ، بنواڕە: قوت القلوب،٢/١٤٢.

چۆن دەبێت ڕێشت بەلاوە پەسەند نەبێت، کە گەورەیی پیاوی تێدا بەرجەستە دەبێت، کە بە چاوی زانست و ڕێز و سامەوە سەیری دەکرێت، وە لە سەروی مەجلیسەوە دادەنرێت، خەڵکی ڕوی لێ دەکەن، لە هەموان پێشی دەخەن، شەرەف و ناموسی خاوەنەکەیشی دەپارێزێت، تەنانەت ئەوەش کە قسەی ناشیرینی پێ دەوترێت ئەگەر ڕیشی هەبێت، قسە بە ڕیشی دەدەن و دەبێتە پارێزەری گیانی ؟!

وەك وتراویشە:

ئەهلی بەهەشت ڕیشیان نییە جگە لە (حەزرەتی) هاروون نەبێت، برای (حەزرەتی) موسا(سەلامی خودایان لەسەر)، ئەو ڕیشێکی دەبێت تا ئەژنۆی دێت، لەبەر ڕێز و بەگەورە زانینی[1].

**شەشەم**: بڕینی مووەکانیەتی، وەك ئەوەی بیبڕێت و چین لەسەر چینی بکات، لەملاو لای ملیەوە بهێنێتە خوارەوە، بۆ ئەوەی کە چاوی ئافرەتان ڕاکێشێت بەلای خۆیدا.

کەعبی ئەحبار فەرموویەتی:

لە کۆتایی زەماندا کۆمەڵێك پەیدا دەبن ڕیشەکانیان دەبڕن، وەك کلکی کۆتری لێ دەکەن، وە نەعل و سەرپاکانیان بەرزدەکەنەوەو وەك داسی لێدەکەن، کە لووتەکەی بەرزبووبێتەوە، ئەوانە بەشیان نامێنێت لە چاکە[2]،

**حەوتەم**: زیادکردنی ڕیشی، ئەوەیە کە لە مووەکانی ئەملاولای شانی زیاد بکات، تا تێیدەپەڕێنێت لە ئێسکی ڕیشی، یان دەیگەیێنێت بە نیوەی گۆنای، کە ناگونجێت لەگەڵ سیمای ئەهلی صەڵاح و تەقوادا.

---

(١) بۆ هەردوو ڕیوایەتەکە بنوارە:قوت القلوب ١٤٢/٢، هەروەها :المقاصد الحسنەص/١١٦.

(٢) قوت القلوب ١٤٣-١٤٤.

**هەشتەم:** لەبەر خاتری خەڵکی دایهێنێت، بیشری حافی دەفەرموێت:

لە ڕیش هێلانەوەدا دوو جۆر شیرکی تێدایە: شانەکردن و داهێنانیەتی لەبەر خەڵك، یان وازلێ هێنانی ڕیشە بە شپرزەیی و ئاڵۆزییەوە، وەك کەسێکی دونیانەویست خۆی پیشان بدات.

(کە ئەبوطالیبی مەککی لە (حەزرەتی) سەری سەقەطی دەیگێڕێتەوە.)

**نۆیەم و دەیەم:**

بەسەرسوڕمان و دڵخۆشبوونەوە سەرنجی ڕیش و سەری سپی یان ڕەشی خۆی بدات، ئەمەش نەهی لێ کراوەو کارێکی بێزراوە، نەك تەنها بۆ ڕیش بەڵکو بۆ هەموو ئەندامەکانی جەستە، بەڵکو لەوەش زیاتر بۆ هەموو ڕەوشت و کردار و ئاکارەکانی تر کە لەمەودا باسیان دەکەین.

ئەمە ئەو بابەتەبوو کە ویستمان باسی بکەین، لە جۆرەکانی خۆڕازاندنەوەو پاکوخاوێنی، وە لە پوختەی سێ فەرموودەدا لە باسی سوننەتەکانی جەستە، دوازدە خەصڵەت و چاکەمان تیا دییەوە:

**پێنجیان وان لە سەردا:**

داهێنانی قژی سەری بەسەر هەردوولای دا[1]، وە ئاو لەدەم ڕادان و ئاو لە لووت ڕادان و، کورتکرنەوەو بڕینی سمێڵ و، سیواك کردن.

---

(١)فقد أخرج البخاري من حديث ابن عباس أن **رسول الله ﷺ كان يسدل شعر رأسه إلي أن قال: ثم فرق رسول الله ﷺ الفرق** (هو جعل الشعر فرقتين كل فرقة ذوابة ضد السدل: وهو مطلق الإرسال. والمراد هنا إرساله على جبينه، وجعله كالقصة)، وقد سدله من ورائه من غير أن يجعل فرقتين، و الفرق أفضل لأنه الذي رجع إليه ﷺ الإتحاف٢/٤٢٧، وروى البخاري (٣٥٥٨) عن ابن عباس (رضي الله عنهما) قال: **كان ﷺ يسدل شعره ، وكان المشركون يفرقون رؤوسهم، فكان أهل الكتاب يسدلون رؤوسهم، وكان رسول الله ﷺ**

**وە سێ خەصڵەتیش لە دەست و پێ دایە، وەك:**

نینوکردن و شۆردنی چرچ و لۆچی دەست و پەنجەکانی و، پاککردنەوەی گرێی پەنجەکان.

**وە چواریشیان لە جەستەدایە:**

وەك هەڵکەندنی مووی بن هەنگڵ و، تاشینی جێگا پێویستەکان و، خەتەنەکردن و، خۆ پاککردنەوە بە ئاو.

هەموو ئەم خەصڵەتانە فەرموودەیان لەسەر هاتووە. مادام مەبەستیش لەم پەرتووکە تەنها باسکردنی پاکوخاوێنییە زاهیرییەکانە نەك باطینی و شاراوەکان، بۆیە بەو ئەندازە باسەکەمان بە کۆتا گەیاند.

وە بزانە کە شتە زیادەکان و پیسییەکانی پەیوەندار بە باطینەوە، کە زۆر پێویستە خۆیان لێ پاك بکاتەوە، لەوە زیاترن کە سەرژمێر بکرێن، وە پشت بەخودا لە چوار یەکی فەوتێنەر و موهلیکاتەکاندا باسیان دێت، لەگەڵ ڕونکردنەوەی ڕێگەچارەی خۆپاك کردنەوە لێیان، وە چۆنیەتی لادانیان و خاوێنکردنەوەی دڵ و دەروون ئەگەر خودا یارو هاوکار بێت.

**تەواو بوو پەڕاوینەسرار و نهێنییەکانی تەهارەت و پاکوخاوێنیکە کتێبی سێیەم لە چواریەکی بەشی عیبادات، لە کتێبەکانی إحیاء علوم الدین(ژیانەوەی زانستەکانی ئاین)بەحەمدی خوداو یارمەتی و هاوکاریکردنی،وصلی اللهُ علی سیدنا محمد نبیِّهِ وعلی آله وصحبه أجمعین.وە لەدوای ئەمەش پەڕاوی چوارەم دێت کە بەناوی کتاب أسرار الصلاة ومهماتها واتە:**

**پەڕاوی نهێنی و ئەسرارەکانی نوێژ و گرنگییەکانی**

---

**یحب موافقة أهل الکتاب فیما لم یؤمر فیه بشيء. ثم فرق رسول الله رأسه.** أنظر طبعة دار المنهاج للإحیاء الجزء الأول ٥٣٤.

# كتابُ
# الصَّلاة ومُهِمَّاتُها

پەرتووكی

# نهێنیی و ئەسرارەكانی نوێژ و گرنگییەكانی

كە پەڕاوی چوارەمە
لە چواریەكی بەندایەتی
لە كتێبەكانی

# إحياء علوم الدين
# ژیانەوەی زانستەكانی ئاین

# پەڕاوی نهێنییەكانی نوێژو ئەرك و گرنگییەكانی

## بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمدُ للهِ الذي غَمَرَ العِبادَ بِلَطائفهِ، وعَمَّرَ قلُوبَهُم بأنوارِ الدِّين، والصلاة والسَّلام على نبيِّهِ المُصطَفى ووليّهِ المُجتَبى، وعلَى آله وأصحابه مَفاتيحِ الهُدى، ومَصابيحِ الدُّجا، وسَلَّمَ تَسليماً.**

حەمدو سەناو سوپاسی بێ پایان، بۆ ئەو خودایەی كە دڵی بەندەكانی خۆیی داپۆشیوە بە لوطف و میهرەبانییەكانی، وە دڵەكانیانی ئاوەدان كردۆتەوە بە ڕۆشنایی و نووری ئاین و ئەركەكانی، كەسێكی وا پڕ قەدر و گران، كە دابەزین لە عەرشی باڵاو جەلالی خۆیەوە بۆ ئاسمانی دونیا، لە پلەكانی میهرەبانی خودا، یەكێكە لە سۆزەكانی، لەگەڵ ئەوەدا كە تەنها خۆیەتی خاوەنی كەماڵی پلەی جەلال و كیبریایە، كەچی جیاواز لە هەموو پادشاكان كە هانی خەڵكی داوە، كە داواو نزاو پاڕانەوەكانیان هەمیشە ڕو لە پەروەردگاریان بێت و، دەفەرموێت:

ئایا كەسێك هەیە داواو نزایەكی هەبێت كە بچم بەدەمیەوە؟ كەسێك هەیە داوای لێخۆشبونم لێ بكات، تا منیش لێی خۆش ببم؟[1]، وە جیاوازی هەیە لەگەڵ دەستەڵاتدارەكاندا، كە دەرگای ڕەحمەتی هەمیشە كراوەیەو

---

(١)روى الامام أحمد ومسلم(٧٥٨) من حديث أبي هريرة وأبي سعيد معا قالا: (قال رسول الله ﷺ **أن الله تعالى يمهل حتى اذا كان ثلث الليل الاخير نزل إلى السماء الدنيا فينادي هل من مستغفر هل من تائب هل من سائل هل من داع حتى ينفجر الفجر)** ورواه أيضا البخاري في مواضع من صحيحه بالفاظ متقاربة المعنى(١١٤٥) وفيها ينزل بدل نزل والمراد بنزوله رحمته وانتقاله من مقتضى صفة الجلال التي تقتضي الغضب والإنتقام إلى مقتضى صفة الإكرام المقتضية للرحمة والانعام . إتحاف الساده المتقين٣/٣.

پەردەی لاداوە لە میانی خۆی و بەندەکانیدا و، ڕێگەی پێداون کە موناجاتی حزوری خودا بکەن و، بە نوێژەکانیان نزاکانیان لەناو کۆڕ و خەڵوەتیاندا بگەێنن بە خوداوەندیان، بەتەنها ئەوەندەش نەوەستاوە کە ڕێگەی پێداون، بەڵکو هانیشیان دەدات و بانگیشیان دەکات، کەچی پادشابەهێزەکانی تر هەیە ڕێگەنادەن کەس بە خەڵوەتی لەگەڵێیان دا بنیشێت، مەگەر بەرتیل و دیاری بەنرخ و گران بەهایان پێ بێت، پاکو خاوێنی بۆ خوداوەندی خاوەن دەستەڵاتی گەورە، چەندێك بەهێزو بەسۆز و خاوەن چاکەیە.

وە صەڵات و سەلامی نەبڕاوە لەسەر پێغەمبەری مەزن (حەزرەتی) محمد المصطفی، دۆست وخۆشەویستی هەڵبژێرراوی خودا، وە لەسەر ئال و خانەوادە و صەحابە بەڕێزەکانی، کە کلیلی ڕێگای ڕێنومایی و سەرفرازین و چرای داگیرساوی شەوی تاریکین.

**لە پاش حەمدو سەناو صەڵات و سەلام:**

بەڕاستی نوێژکردن کۆڵەکەی ئاینی ئیسلامە، پشتوێنی پشت پێ بەسراوی متمانەو یەقینە، وە سەرەڕمی هەموو قورب و نزیك بوونەوەیەکە، سپیایی ناوچەوانی طاعەت و تەقوایە، هەروەك چۆن لە زانستی فیقهدا لە پەرتووکەکانی (بەسیط و وەسیط و وەجیز) دا هەموو بنج و بنەوانی پرس و مەسەلە فیقهییەکانمان باسکردووە و شیتەڵ کردۆتەوە، تەنانەت لق و پۆ و ڕوداوە شاز و ناوازەکانیشمان بەجێ نەهێڵاوە، بۆ ئەوەی کە غەزنەیە کە نەبڕاوە بێت لە بەردەم فەقیە و ئەهلی فەتوادا، کە بتوانێت بۆ پرسە فیقهییەکان پشتی پێ ببەستێت و بۆیان بگەڕێتەوە.

ئێمەش لەم پەڕاوەدا بەکورتی ئەوەندە باس دەکەین، کە پێویستە مورید لێی شارەزابێت، لە کردەوە زاهیری و شاراوەو نهێنییەکاندا، وە هەوڵدەدەین وردەکارییە گرنگ و ناوازەکان و، واتا شاراوەکانی زاراوەکانی گەردن کەچی و مل

کەچی و، ئیخلاص و دڵسۆزی و نییەت پاکی و بابەتە مەعنەویەکانی تر باس بکەیت ، کە بەپێی نەریتەکان ئەو جۆرە باس و خواسانە لە کتێبە فیقهییەکاندا باسیان لێ نەکراوە.

**ئێمەش ئەم کتێبە مان ڕیکخستووە لەسەر حەوت دەروازە:**

**دەروازەی یەکەم:**

لە بارەی فەزائیل و گەورەیی نوێژەکانەوە.

**دەروازەی دووهەم:**

لە بارەی درێژەدان بە باسکردنی کردەوە زاهیرییەکان کە لە نوێژداهەیە.

**دەروازەی سێیەم:**

لە بارەی بەدرێژی باسکردنی کردارە باطینی و شاراوەکان.

**دەروازەی چوارەم:**

باسی پێشەوایەتی کردنی نوێژ و ئیقتیداکردن بە ئیمام.

**دەروازەی پێنجەم:**

دەربارەی نوێژی جومعەو چۆنیەتی ئادابەکانی.

**دەروازەی شەشەم:**

لە بارەی چەندین پرسی جیاوازەوە، کە زیاتر بە شێوەیەکی گشتی هەموان دووچاری هاتوون و تووشیان دەبن، کە پێویستە موریدی ڕێگەی ئاخیرەت ئەمانە بزانێت.

**دەروازەی حەوتەم:**

لەبارەی خێرە خۆبەخشەکان و کردنی سوننەت و نەوافیلەکان و باسەکانی تر.

# دەروازەی یەکەم

## لەبارەی گەورەیی خێری نوێژەکان و سوجدەبردن و نوێژی جەماعەت و بانگدان و ئەوانی تر.

## گەورەیی خێری بانگدان

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((ثلاثةٌ یومَ القیامةِ علَی کثیبٍ مِن مسكٍ أَسوَدَ، لایَهمُّهم حِسابٌ ولایَنالُهم فَزَعٌ: رَجلٌ قَرأَ القُرآنَ ابتِغاءَ وَجهِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ، وأَمَّ بهِ قَوماً وهُمْ بهِ راضُون، ورَجلٌ أَذَّنَ في مَسجدٍ ودَعا إلی اللهِ عَزَّوَجَلَّ إبتِغاءَ وَجهِ اللهِ، ورَجُلٌ ابتَلَی بالرِّقِ في الدُّنیا، فَلَم یُشغِلهُ ذلِكَ عَن عَمَلِ الآخِرَة))**[1]، واتە: سێ کەس هەن لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر وردە بەردی درێژ و کۆماوی میسکی ڕەشدان، کە لێپرسینەوەی خودایی خەفەتیان پێ نادات و، ترس و بیم و تۆقانیش ڕویان تێ ناکات، کاتێك کە هەموو خەڵکەکە

---

(١)قال العراقي أخرجه الترمذي(١٩٨٦) بنحوه، وحسنه من حديث ابن عمر مختصرا وهو في الصغير للطبراني(٢/٢٥٢) (١١١٦) بنحوٍ ممّا ذكره المؤلف، قلت: أما ماأخره الطبراني فهو من طريق فيه بحر بن كثير السقاء وهو ضعيف بل متروك من حديث ابن عمر بلفظ: **(ثلاثةُ علَى كَثبانِ المسك يوم القيامة، لايُهَوِّلُهم الفزعُ ، ولايَفزَعُون حينَ يفزَعَ النَّاس: رجلٌ تعلَّم القُرآن فقامَ به يطلبُ وجهَ الله وماعنده، ورجلٌ نادَى في كلِّ يوم وليلة خمس صَلوات يطلبُ وجهَ الله وماعنده، ومملوكٌ لم يَمنعْهُ رِقُّ الدُّنيا مِن طاعةِ ربِّه.** وأما حديث الترمذي الذي أشار اليه فلفظه: **ثلاثةٌ على كثبان المسكِ يومَ القيامة يغبطهُم الأولُون والاخَرون، عبدٌ أدَّى حقَّ الله وحق مواليه، ورجلُ يؤُم قوماً وهم بهِ راضون، ورجل نادى بالصَّلوات الخَمس في كلِّ يومٍ وليلة)**، هكذا أخرجه في الادب من حديث ابن عمر وقال حسن غريب وهكذا أخرجه الحاكم أيضاً، وقال الصدر المناوي في اسناد الترمذي ابو اليقظان عثمان بن عمير قال الذهبي: كان شيعيا ضعَّفُوه، الإتحاف ٣/٥.

وهو بلفظه عند الخطيب في تأريخ بغداد،١٢٤/٤.

له مەترسیدان: **یەکەمیان:** پیاوێکە فێری قورئان بووبێت و، مەبەستیشی تەنها ڕەزامەندی خودا بێت لە فێربوونەکەی، وە بەو قورئانەش ئیمامەت بۆ تاقمێك بکات کە لێی ڕازی بن. **دووهەم:** پیاوێکە لە مزگەوتێدا بانگ بدات، وە خەڵکی بۆ نزاو عیبادەت بانگ بکات و مەبەستیشی ڕەزامەندی خودا بێت. **سێیەم:** پیاوێکیش کە بۆخۆی دوچاری کۆیلەیی بوبێت لە دونیادا، کەچی ئەم بارەگرانەیش کارو هەوڵدانی بۆ دوارۆژ لە بیر نەبردبێتەوە .

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((لایَسمَعُ نِداءُ المُؤمنِ(صَوْتَ المُؤَذِّنِ) جِنٌ ولا إنس ولاشيءٌ إلاَّ شَهِدَ لهُ يَوم القِيامَة))**[1]، ئەوەی گوێی لە بانگدانەوە بێت، لە جنۆکە و ئادەمیزاد و هەر شتێکی تریش، ئەوە لە دوارۆژدا شایەتی بۆ دەدەن.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((يدُ الرَّحمنِ علَى رأسِ المُؤذِّنِ حتَّى يَفرَغ مِن أَذانِه))**[2]، واتە: دەستی ڕەحمەتی خودای میهرەبان وا بەسەر بانگوێژەوە، تا لە بانگدانەکەی لێ دەبێتەوە.

وە زانایان لە سەر تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿**وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا**

---

(١)رواه ابو مصعب الزبيدي عن مالك عن عبد الرحمن بن عبد الله بن ابي صعصعة المازني عن أبيه ان اباسعيد الخدري رضي الله عنه قال: **(إنّي اراكَ تُحبُّ الغنَم والبادِيَة فاذا كُنت في غَنمِك او بادية فأذنتَ بالصلاة فارفع صوتَك فانَّه لايَسمع مَدى صَوتِ المُؤذّن جِنٌّ ولا إنس ولاشيء إلاّ شَهدَ له يومَ القيامة)**قال ابو سعيد سمعته من رسول الله ﷺ وهو حديث صحيح أخرجه البخاري(٦٠٩)عن عبد الله بن يوسف واسماعيل ابن ابي وايس وقتيبة بن سعيد فرقهم كلهم عن مالك واخرجه النسائي أيضاً ينظر :الإتحاف ٥/٣.

(٢) قال العراقي: رواه الطبراني في الاوسط (٢٠٠٨) والحسن بن سفيان في مسنده من حديث أنس باسناد ضعيف، وابن عدي في الكامل ١٢٤/٥. وانظر الإتحاف ٥/٣.ورواد ابن أبي شيبة في (المصنف) (٢٣٦١) من قول سيدتنا عائشة (رضي الله عنها) وانظر (الدر المنثور)٣٢٥/٧.

﴿إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً﴾(فصلت/٣٣)فەرموویانە: لەسەر بانگوێژان دابەزیوە. واتە: کێ گوفتاری لەو کەسە جوانترە، کە بانگی خەڵکی دەکات بۆ لای خوداپەرستی و هاتن بەدەم بانگەوازی خودابیەوەو کردەوەی چاکەیش دەکات.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**إذاسَمِعتُم النِّداءَ فقُولُوا مِثلَ مَايقُولُ المُؤَذِن**)) [1] واتە: ئەگەر بانگتان بیست، ئەوەی دەیڵێت وەڵامی بدەنەوە، واتە: هەرچی بڵێت، بەهەمان شێوە بیڵێتەوە خێری دەگات، جگە لە(**حَيَّ على الصَّلاة و حَيَّ على الفَلاح**)نەبێت، لەوەڵامی ئەواندا دەڵێت: (**لاحَوْلَ ولا قُوَّةَ إلاَّ بالله**)[2]، وە لەدوای وتنی: (**قَد قَامَتِ الصَّلاة**)؛ دەڵێت:

(**أَقامَها اللهُ وَأَدمَها مادامَتِ السَّماواتُ والأرض**)[3].

واتە لە وەڵامی قامەتدا سوننەتە بڵێت: خوا ئەم نوێژە بەردەوام وپایەداری کات، بەبەردەوامی ئاسمانەکان و زەمین، لە(تەثویب) یشدا واتە: دوای وتنی: الصلاةُ خيرٌ مِنَ النَّوم، بڵێت: (**صَدَقتَ وبرَرتَ ونَصَحتَ**) وە لەهەندێك ڕێوایەتدا وا هاتووە: (**وبالحَقِّ نَطَقتَ**) واتە: ڕاستت کرد و چاکت وت، وە ئامۆژگاری باشت کرد، وە گوتەیەکی حەق و ڕاستت بەدەمدا هات.

---

(١)رواه أبو مصعب الزبيدي عن مالك عن الزهري عن عطاء بن يزيد عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه، رواه البخاري (٦١١)، ومسلم(٣٨٣).

(٢)أخرجه مسلم (٣٨٥) بسنده عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه رفعَه: **إذا قال المُؤذن الله أكبر الله أكبر قال: أحدُكم الله أكبر الله أكبر، ثم قال: أشهد أن لا إله إلا الله، قال أشهد أن لا إله إلا الله، ثم قال: أشهد أن محمدا رسول الله، قال أشهد أن محمدا رسول الله، ثم قال : حي على الصلاة، قال: لاحول ولاقوة الا بالله، ثم قال: حي على الفلاح، قال لاحول ولاقوة الا بالله، ثم قال الله أكبر الله أكبر، قال الله أكبر الله أكبر، ثم قال: لا اله الا الله قال: لا اله الا الله دخل الجنَّةَ. الإتحاف ٣/٦.**

(٣) رواه أبو دوود (٥٢٨).

وەلەکاتی لێ بوونەوەی بانگوێژ با بڵێت: ((**اللهُمَّ ربَّ هذهِ الدَّعوَةِ التَّامَّة والصَّلاةِ القائمَة، آتِ مُحَمَّداً الوَسيلَة والفَضيلَة، وابعَثْه المقامَ المَحْمودَ الَّذي وعَدتَه، إنَّك لاتُخلِفُ الميعاد**))[1]، واتە: خوێندنی دۆعای وەسیلە: ئەی خودایە! ئەی خاوەنی ئەم بانگەشە جوان و تەواوەو، خاوەنی نوێژەی کە هاتۆتە پێشەوە، ببەخشە بە گەورەمان (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ وەسیلەو فەضیلە، کە دوو جێگای تایبەتین لەبەهەشتدا، وە لەسەر پێدانی مقامی مەحمود و پەسەندکراو، کە زیندوی بکەرەوە، تۆ هەرگیز پێچەوانەی بەڵێنەکانت نابیت. پێشەوا سەعیدی کوڕی موسەییب فەرموویەتی:

((**مَن صَلَّى بأرضٍ فَلاةٍ، صَلَّى عَن يَمينِهِ مَلَكٌ، وعَن شِمالِهِ مَلكٌ، فإنْ أَذَّن وأقامَ صلَّى وَراءَه أمثال الجِبالِ مِنَ الملائكَة**))[2].

واتە: هەرکەسێك لە زەویەکی چۆڵەوانی دا نوێژ بکات، لەلای ڕاستیەوە مەلائیکەیەك و، لە لای چەپیشیەوە مەلائیکەیەك صڵاوات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن و ڕێزی لێ دەگرن، ئەگەر بانگیش بدات و لە پاشان قامەتیش بکات، ئەوا مەلائیکەکان بە نموونەی کێوەکان نوێژی لەپشتەوە دەکەن.

---

(١)أخرج الطبراني في الدعاء فقال حدثنا أبو زرعة الدمشقي حدثنا على بن عياش حدثنا شعيب عن أبي حمزة عن محمد بن المنكدر عن جابر رضي الله عنه قال: **قال رسول الله ﷺ من قال حين يسمع النداء اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة والفضيلة وابعثه المقام المحمود الذي وعدته حلت عليه الشفاعة يوم القيامة** هكذا لفظ أبي زرعة المقام المحمود باللام فيهما كما عند المصنف قال الحافظ: ووهم في استدراكه فان البخاري اخرجه في موضعين من صحيحه في ابواب الاذان.(٦١٤)، والنسائي: ٢٧/٢. ينظر الإتحاف ٦/٣.

(٢). وقد روى بن الضريس من حديث جابر مرفوعا من صلى ركعتين في خلاء لايراه إلا الله والملائكة كتبت له براءة من النار، ورواه مالك في الموطأ، ٧٤/١.

# گەورەیی نوێژە فەرزەکان

خودا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ (النساء/١٠٣) واتە: بەڕاستی نوێژەکان فەرز و پێویستکراون لە سەر بڕواداران، وە بەستراونەتەوە بەکاتی دیاری کراوی خۆیانەوە، نابێت لەکاتی خۆیان لابدرێن.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( **خَمسُ صَلواتٍ كتَبَهُنَّ اللهُ علَى العِبادِ، فمَن جَاءَ بِهِنَّ ولَم يُضَيِّعْ مِنهُنَّ شيئاً استِخفَافاً بحَقِهِنَّ كانَ لهُ عِندَ اللهِ عَهدٌ أَنْ يُدخِلَهُ الجَنَّة، ومَنْ لَمْ يأتِ بِهِنَّ فلَيْسَ لهُ عِندَ اللهِ عَهدٌ،إنْ شاءَ عذَّبهُ وان شاءَ أدخَلَه الجَنَّة**))[1].

واتە:خودای گەورە پێنج نوێژی فەرز کردووە لە سەر بەندەکانی، هەر کەسێك بەچاکی بیانکات و لێیان زایە نەکات و سووکایەتییان پێ نەکات، ئەوە لە لای خودای خۆی بەڵێن و گفتێکی پێ دەدرێت، کە بیخاتە بەهەشتەوە، بەڵام ئەوەی وەك شەریعەت بۆی بڕیارداوە نەیکات، ئەوە هیچ پەیمانێکی خودایی نایگرێتەوە، ئەگەر خودا ویستی، بە پێی دادگەری خۆی سزای دەدات، وە ئەگەر مەیلیشی لێ بوو بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی دەیخاتە بەهەشتەوە.

---

(١)أخرجهُ مالك واحمد وأبو داود(١٤٢٠) والنسائي(١/٢٣٠) وابن ماجه(١٤٠١)، وابن حبان والحاكم عن عبادة بن الصامت قال الزين العراقي وصححه ابن عبد البر، ورواه أبوداود أيضا بلفظ آخر يقاربه: **خمسُ صَلواتٍ افترضهُنَّ اللهُ عزوجَل مَن أحسَن وضُوأهُن وصلاَّهُنَّ لوَقتِهِنَّ، وأتَمَّ ركُوعَهُنَّ وخشُوعهُن، كانَ له عَلى اللهِ أنْ يغفِرَ له، ومن لم يفعل فليس له علَى الله عهْدٌ إن شاء غفر له وان شاء عذبه**، وأخرجه البيهقي كذلك والجمعة الى الجمعة وزيادة ثلاثة ايام. وعند احمد ومسلم في الطهارة، والترمذي في الصلاة عن ابي هريرة بلفظ: **الصلوات الخمس والجمعة إلى الجمعة ورمضان إلى رمضان مُكَفِراتٌ لما بَينهُنَّ إذا اجتنبت الكبائر**. ولكن الترمذي لم يذكر رمضان. ينظر الإتحاف،٩/٣.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَثَلُ الصَلَواتِ الخَمسِ كَمثَلِ نَهرٍ عَذبٍ غَمرٍ بِبابِ أَحَدِكم، يَقتَحِمُ فيهِ كُلَّ يَومٍ خَمسَ مرَّات، فَما تَرَونَ ذلِكَ يُبقي مِن دَرَنِه،؟ قالوا: لا شَيئَ، قال ﷺ: فَإِنَّ الصَّلَواتِ الخَمسَ تُذهِبُ الذُّنوبَ كَما يَذهَبُ الماءُ الدَّرَنَ))**[1]، واته: نموونەی ئەو پێنج نوێژە کە دەکرێت، وەك ڕوبارێکی شیرینی خوڕ وایە، کە ئاوی زۆربێت و بەبەردەرگای ماڵی یەکێکتاندا هەموو ڕۆژێك پێنج جار بڕوات، ئایا هیچ پیسییەك لە بەردەرگاکەدا دەمێنێت، وتیان نەء: هیچ نامێنێت، فەرمووی: کەواتە پێنج فەرزەکەیش ئاوایە، هەموو گوناهەکان هەڵدەگرێت، وەك چۆن ئاوەکە هەموو پیسییەکان دەشۆرێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:**((إِنَّ الصلواتِ الخَمسِ كفارةٌ لما بينهنَّ مِن الصَّغائرِ وماجتَنبَتِ الكبائِرُ))**[2]، بەڕاستی پێنج نوێژە فەرزەکان

---

(١) رواه مسلم (٦٦٨)، أخرجَه الامام أحمد وعبد بن حميد والدارمي ومسلم وابن حبان والرامهرمزي من حديث جابر ولفظه: **مثلُ الصلوات الخمس المكتوبة كمثل نهر جار عذب على باب أحدكم يغتسل فيه كل يوم خمس مرات. فما يبقى ذلك من الدنس.** وعند البخاري ومسلم نحوه، واخرجه ابو يعلي عن انس والطبراني عن ابي امامة وعن الرمهرمزي من حديث ابي هريرة: **مثل الصلوات الخمس مثل رجل على بابه نهر جار غمر. يغتسل منه كل يوم خمس مرات. فماذا يبقى من درنه.** سوودی ئەم نموونەیە وەك مەناوی فەرموویەتی: دەیەوێت ئەوەی مەعقولە وەك هەست پێکراوی لێ هاتووە، بۆیە تەشبیهی گوناهبارێکی کرد کە پێنج فەرزە نوێژەکانی بکات، بە حاڵی کەسێك ڕۆژانە پێنج جار خۆی لە ئاوی ئەو ڕوبارە پاك بکاتەوە ، وەك چۆن ئەمان پاك دەبنەوە لە چڵك و پیسی، هەروایش نوێژخوێنەکانیش گوناهەکانیان بەهۆی نوێژەکەوە دەسڕێتەوە و نامێنێت. الإتحاف ٣/٩.

(٢)والَّذي أخرجَه أبو نعيم في الحلية من حديث أنس: **الصلوات الخمس كفارة لما بينهن ماجتنبت الكبائر. والجمعة إلى الجمعة وزيادة ثلاثة أيام** وعند أحمد ومسلم في الطهارة

دەبنە کەفارەت و سڕینەوەی گوناهە بچووکەکان کە لە میانیاندا دەکرێت ئەگەر گوناهی گەورەیان تێدا نەکرابێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((بَينَنا وبَينَ المُنافِقينَ شهُودُ العَتَمَةِ والصُبحِ لا يَستَطيعونَهُما ))**[1].

واتە: لە میانی ئێمەو دوڕووەکاندا ئامادەبوونی جەماعەت و کردنی نوێژەکانی خەوتنان و بەیانیانە، چونکە ئەوان ناتوانن.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(مَن لَقِيَ الله وهوَ مُضَيِّعٌ للصَلاة لم يَعْبَأِ اللهُ بِشَيءٍ مِنْ حَسَناتِهِ)**[2]،

ئەوەی بگات بە حزوری خوداو، نوێژەکانی زایە کردبێت و بیانفەوتێنێت، خودای گەورە هیچ بەهاو بایەخێك بە کردەوەچاکەکانی تری نادات.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((الصَّلاةُ عِمادُ الدِّين فمَن تَركها فقَد هَدمَ الدِّين))**[3]

---

والترمذي في الصلاة عن ابي هريرة بلفظ:**الصلوات الخمس والجمعة إلى الجمعة ورمضان إلى رمضان مكفرات لما بينهن إذا اجتنبت الكبائر** والترمذيُّ لم يذكر رمضان، و رواه مسلم (٢٣١).

(١) رواه مالك في الموطأ (١/١٣٠)، أخرجه مالك في الموطأ من رواية سعيد بن المسيب مرسلا قاله العراقي

(٢)قال العراقي لم أجده هكذا وفي معناه حديث: **أوَّل مايحاسَب بِهِ العبدُ الصلاة، وفيه فإن فسدَت فسَد سائرُ عمله**، رواه الطبراني في الأوسط(١٨٨٠)مرفوعاً من حديث أنس قلت: ورواه ايضا الضياء في المختارة عن انس بلفظ: **أول مايُحاسَبُ بِهِ العبدُ يومَ القيامةِ الصَّلاة، فإن صلحت صَلُح لهُ سائِرُ عَملهِ، وإن فسَدَت فَسَد سائِر عَمله**، وعند النسائي عن ابن مسعود **أول مايحاسَبُ بِهِ العبدُ الصلاة، وأوَّلُ مايُقْضي بينَ النَّاسِ في الدِّماءِ**،

(٣)قال العراقي أخرجه البيهقي في الشعب(٢٥٥٠) بسند ضعيف من حديث عمر قال الحاكم: عِكرمة لَم يسمع من عُمر، قال: وأراهُ ابنُ عُمر ولم يقِف عَليه ابن الصلاح، فقال في مشكل الوسيط: إنَّه غيرُ مَعروف، قلت: وقول النووي في التنقيح: حديث منكر باطل. رده الحافظ

واتە: نوێژ کۆڵەکەی دینە، ئەوەی نەیکات ئاینەکەی خۆیی ڕوخاندووە، وە پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ چ کردارێك لەهەمووی گەورەترە.فەرمووی:

((الصَّلاةُ لِمَواقيتِها))[1]، نوێژەکان لە کاتی دیاری کراوی خۆیاندا.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( مَن حافَظ عَلى الخَمسِ طُهُورِها و مَواقيتِها.. كانَت لَه نُوراً وبُرهاناً يَومَ القيامةِ ومَنْ ضيَّعَها حُشِرَ مَعَ فِرعَون وهامانَ))**[2]

ئەوەی پارێزگاری لە پێنج نوێژەکە بکات بە تەواوی تەهارەت و خاوێنی و پابەندی بە کاتەکانیەوە ، ئەوا بۆی دەبێت بە نوور و ڕۆشنایی ناو قەبر و بەڵگەو خۆپەڕاندنەوەی ڕۆژی لێپرسینەوە، وە ئەوەش کە زایەی بکات و مافی خۆیی پێنەدات، ئەوا لەگەڵ فیرعەون و هاماندا حەشر دەکرێت.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((مِفتاحُ الجَنَّةِ الصَّلاةُ))**[1] واتە: کلیلی چوونە ژورەوەی دەرگای بەهەشت نوێژکردنە. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **(مافْتَرضَ اللهُ علَى خَلقِهِ بعدَالتَّوحيدِ أحَبَّ إليهِ منَ الصَّلاة،**

---

ابن حجر وشنَّع عليه ثم ان الذي خرجه البيهقي في الشعب هي الجملة الاولى فقط، وأما قولُه فمن تركَها الخ فلَم أره، وعند الديلمي عَن علي: **الصلاةُ عمادُ الايمان، والجهادُ سنامُ العمَلِ والزكاةُ بينَ ذلكَ**، ورواه التيمي في الترغيب بلفظ**الصلاة عماد الاسلام** الإتحاف٣/٩.

(١) رواه البخاري (٥٢٧) ومسلم (٧٥).

(٢)قال العراقي أخرجه احمدفى المسند(١٦٩/٢) وابن حبان من حديث عبد الله بن عمرو قلت: وكذلك أخرجه الطبراني والبيهقي في السنن ولفظهم جميعا: **من حافظ على الصلاة كانت له نورا وبرهانا ونجاة يوم القيامة، ومن لم يحافظ عليها لم يكن له نورٌ ولابرهانٌ ولا نجاةٌ وكان يوم القيامة مع قارون وفرعون وابي بن خلف**، واخرجه ابن نصر في كتاب بلفظ: **خمسُ صلوات من حافظ عليهن كانت له نورا وبرهانا ونجاة يوم القيامة، ومن لم يحافظ عليهن لم يكن له نور يوم القيامة ولا برهان ولانجاة، وكان يوم القيامة مع فرعون وقارون وهامان وأبي بن خلف** الإتحاف ١٠/٣.وأصله عند أبي داوود (٤٣٠) وابن ماجه (١٤٠٣).

**لوْ كانَ شيءٌ أحبَّ اليهِ مِنْها لتَعبَّد بهِ مَلائكتَهُ، فَمِنهُم راكعٌ ومِنهُم ساجدٌ، ومنهُم قائِمٌ وقاعِد)**[٢].واته: خودای گەورە لەدوای تەوحید و یەکتاپەرستی، هیچ شتێکی تری بەئەندازەی نوێژکردن پێ خۆش نییە، کە فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی، ئەگەر شتێکی تر هەبوایە ئەوا بە فریشتەکانی ئەسپارد، کە بەندایەتی پێ بکەن، کە ئەوانە یان لە ڕکووع دان، یان لە سەجدە بردندا، یان دانیشتوون یان بە پێوەن.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **(مَن تَرك صلاةً مُتعَمِّداً فَقَد كَفَر)**[٣]،ئەوەی نوێژێك بە ئارەزوو نەیکات و گوێی پێ نەدات، ئەوا بە کوفر لەسەری دەژمێررێت، واتە: (شیاوی ئەوەیە تۆڵەی کافر وەربگرێت،) یان نزیکە

---

(١)وقال العراقي أخرجَه أبوداود والطيالسي من حديث جابر وهو عند الترمذي(٤) وليس داخلا في الرواية قلت: وهكذا أخرجه أحمد والبيهقي بزيادة: **ومفتاح الصَّلاةِ الطُهورُ**، واتای فەرموودەکە: ئەوەی دەبێتە هۆکاری چوونە ژوورەوەی موسوڵمان بۆ ناو بەهەشت نوێژ کردنە، چونکە دەرگاکانی بەهەشت داخراون، وە بە طاعەت دەکرێنەوەو گەورەترین بەندایەتیش نوێژکردنە.

(٢)قال الزبيدي: قال العراقي: لم أجد هكذا، وآخر الحديث عند الطبراني(١٧٥١/٢.١٨٤،٠) في الكبير من حديث جابر. وعند الحاكم من حديث ابن عمر. قلت: هو في القول بلفظ وروينا عن رسول الله ﷺ ثم سلفهِ قال: ويقال **(إنَّ المؤمن إذا صلَّى ركعتين عجب منه عشر صنوف من الملائكة، كل صنف منهم عشرة آلاف، ثم قال فالقانمونَ صنفٌ لايركعونَ إلى قيام الساعة، والساجدون لايرفعون إلى القيامة. وكذلك الراكعون والقاعدون)**. الإتحاف٣/١٠.

(٣) قال الزبيدى: قال العراقي: أخرجه البزار من حديث أبي الدرداء باسناد فيه مقال قلت: وعند الطبراني من حديث أنس **(من ترك الصلاة متعمدا فقد كفر جهارا)** قال الهيثمي رجاله موثقون إلا محمد بن أبي داود الأنباري فلم أجد ترجمته، وذكر ابن حبان محمد بن أبي داود البغدادي فما أدري هو أم لا. وقال الحافظ: الحديث سئل عنه الدارقطني فقال رواه أبو النضر عن أبي جعفر عن الربيع موصولا ووقفه أشبه بالصواب .الإتحاف٣/١٠.

ئیمانی لێ دابماڵن، چونکە ئەو خۆی لە بنەماو حەبلی مەتینی ئیمان وەدەرناوە، کۆڵەکەی بڕوای ڕوخاندووە، وەك چۆن ئەگەر کەسێك نزیك بوبێتەوە لە شارێکەوە دەڵێن: ئەوا گەیشتە بەرەوە یان چووە ناو شارەکەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن تَرَك صَلاةً مُتَعمِّداً فقَد بَرِئَ مِن ذِمَّةِ مُحمَّدٍ صَلَى الله عَليهِ وَسَلَّم))**[1]

ئەوەی نوێژێکی بە عەمدی و ئارەزووکاری نەکات، ئەوا لەژێر سایەی پێغەمبەردا نامێنێت و پەیوەندی بەزیممەی ئەو زاتەوە نامێنێت، صەڵات و سەلامی خودای لەسەر بێت.

ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

**((مَن تَوضَّأ فأحسَنَ وضُوءَه، ثُمَّ خَرجَ عامِداً إلَى الصَّلاةِ، فإنَّه في صلاةٍ ماكانَ يعمَدُ إلى الصَّلاة، وإنَّهُ يُكتَبُ لَه بإحدَى خُطوَتَيهِ حَسَنةً، وَتُمحَي عَنهُ بالأُخرى سَيِّئَة، فإذا سَمِعَ أحدكم الإقامَة فلاَيَسعَى، فَإنَّ أعظمَكُم أَجْراً أبعَدُكُم داراً. قالُوا لِمَ يا أَبا هُريرَة؟ قال: مِن أَجْل كَثْرةِ الخُطا))** [2].

---

(١)قال الزبيدي: قال العراقي أخرجه أحمد في المسند،٤٢١/٦) والبيهقي من حديث أم أيمن بنحوه ورجال إسناده ثقات،قلت: وعند أبي شيبة في المصنف عن أبي الدرداء وعن الحسن مُرسلاً: **من ترك الصلاة متعمدا كُتب إسمه علَى باب النار فيمن يدخلها** وعند البيهقي في المعرفة عن نوفل: **من ترك الصلاة فكأنما وتر أهله وماله**، الإتحاف ١٠/٣.

(٢)قال الزبيدي: وقد أخرج ابن جرير والبيهقي عن ابي هريرة رفعه من توضأ ثم خرج يريد الصلاة فهو في الصلاة حتى يرجع إلى بيته، وهذا أيضا قد روي مرفوعاً من حديثهِ بلفظ: **(إذا سمع أحدكم النداء والإناءُ على يَدهِ فلايَضَعُه حتى يقضي حاجته منه)**،أخرجه أحمد وأبوداود والحاكم وعندابن عساكر من حديث أنس: **(إذا سمعتَ النداء فأَجِبْ وعليكَ السكينة)**،واخرج ابن ماجه من حديثه ايضا: **(أعظم الناس أجراً في الصلاة أبعدُهم إليها مَمشى فابعدهُم)**، الإتحاف١١/٣

ئەوەی دەست نوێژێکی پوخت و تەواو بگرێت و لەپاشان بەمەبەستی نوێژ کردن بچێت بۆ مزگەوت، ئەوە بەڕاستی وەك لە نوێژدابێت ئاوا بۆی دەژمێررێت مادەم بۆ نوێژ دەچێت، بەیەکێ لە هەنگاوەکانی چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت و، بە هەنگاوەکەی تری خراپەیەکی لەسەر دەسڕێتەوە، ئەگەر هەریەکێك لە ئێوە گوێی بە قامەت کردنەوە بوو با لە ڕۆشتن پەلەنەکات، (بە ویقارەوە بڕوات) ئەوانەتان هەنگاوی زیاتر دەنێن، پاداشتی زیاتری پێ وەردەگرن. وە دەگێڕنەوە کە یەکەم شت لە ڕۆژی قیامەتدا سەیری بکرێت لە کرداری بەندەکان نوێژکردنە، ئەگەر دەرچوو کە کاری نوێژەکەی تەواو بێت، پاشماوەی کردەوەکانی تری لێ وەردەگیرێت، وە ئەگەر کەموکوڕی هەبوو، ئەوا نوێژەکەیش و کردەوەکانی تریشی دەدرێتەوە بەسەردا[(١)].

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**يا أبا هُرَيرة مُرْ أهْلَكَ بالصَّلاةِ، فإنَّ الله يأتيكَ بالرِّزقِ مِنْ حَيثُ لاتحتَسِبُ**))[(٢)]، واتە: ئەی ئەبو هورەیرە، فەرمان

(١) قال الزبيدي٣/١١: قال العراقي رويناه في الطوريات من حديث أبي سعيد باسناد ضعيف ولاصحاب السنن والحاكم، وصحح إسناده نحوَه من حديث أبي هريرة وسيأتي، قلت: تقدم قريباً حديث أنس عند الطبراني في الاوسط(٢/٢٤٠) (١٨٥٩) : (**أول مايحاسب عليه العبد يوم القيامة الصلاة فان صلحت صلح سائر عمله وان فسدَت فسد سائر عمله**)، واخرج الحاكم في الكني كما في الجامع ٣/٢٩٩.عن ابن عمر: (**أول ماافترض الله تعالى على أمتي الصلوات الخمس، وأول مايرفع من اعمالهم الصلوات الخمس، وأول مايسألون عن الصلوات الخمس**) الحديث. وأخرج احمد في مسنده (١٦٥٠٦) وابوداود ابن ماجه(١٤٢٦) والحاكم في المستدرك(١/٣٩٤).(٩٦٦)عن تميم الداري: (**أول مايحاسب به العبد يوم القيامة صلاته، فان كان أتمها كتبت له تامة**) الحديث.

(٢) قال تعالى: ﴿ **وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى**﴾(طه/١٣٢) قال العراقي لم أقف له على أصل قلت: وهو من نسخة جمع فيها أحاديث يقول في اول كل منها: يا أبا هريرة، وهذه النسخة موضوعة باتفاق المحدثين، إلا أنَّ

بده بە خانەوادەت کە نوێژ بکەن، ئەو کاتە خودای گەورە دەروازەی ڕزق و ڕۆزیت لەسەر دەکاتەوە، بەو شێوەیەی کە بیرت بۆی نەچوبێت.

هەندێك لە زانایان فەرمووبانە: نموونەی کەسێکی نوێژخوێن وەك بازرگانێك وایە، سوودی کەسابەتەکەی دەست ناکەوێت تا سەرمایەکەی دەست نەکەوتبێتەوە، هەروەها نوێژخوێنیش سوننەتەکانی لێ وەرناگیرێت، تا فەرزەکانی بە چاکی ئەنجام نەدابێت[1]،

(حەزرەتی) ئەبوبەکر(خوای لێ ڕازی بێت) **إذا حَضَرتِ الصَّلاة:**

لەکاتی قامەتکردنی نوێژدا دەیفەرموو:

**((قُومُوا إلى ناركُم التي أوقَدْتُمُوها فأطفِئُوها))** [2]

ئەی خەڵکینە ئەو ئاگرەی لەسەر خۆتانتان کردۆتەوە بە هۆی گوناهەکانتانەوە، هەڵسن و بە نوێژەکانتان ئاگرەکە بیکوژێننەوە لەسەرخۆتان.

---

بعضَ مافيها ماهُو صحيحٌ باللفظ أو بالمعنى، كالذي نحنُ فيه، فإنَّ معناهُ صحيح لما أخرجَ عبد الرزاق في المصنف وعبد بن حميد عن معمر عن رَجلٍ من قُريش قال: **كان النبي ﷺ إذا دخَلَ على أهله بعضَ الضيقِ في الرّزق أمرَ أهله بالصلاة، ثم قرأ هذه الآية: وأمر أهلَك بالصَّلاةِ** ونحوه ذكره الطبراني في الكبير وابو نَعيم في الحلية ماهو مذكور في الدر المنشور للسيوطي رحمهم الله. الإتحاف ٣/١١.

(١) رواه البيهقي في السنن الكبرى(٣٨٧/٢) مرفوعاً.

(٢)قال الزبيدي: وهذا قد روي مرفوعاً من حَديث أنس أخرجَ الطبراني في الكبير والضياء في المختارة بلفظ:**( أنَّ للهِ تَعالى مَلَكا يُنادي عند كل صلاة يا بني آدمَ قُوموا الى نيرانكم التي أوقَدتُموها على أنفسكم فأطفئوها بالصلاة، أي خطاياكُم التي ارتكَبتُمُوها وظَلَمْتُم فيها انفسكم حتى أُعدت لكم مقاعد في جهنم التي وقودها الناس والحجارة، فامحوا أثرها بفعل الصلاة، فانها مُكفِرة للذُنوبِ، وزاد في رواية وبالصدقة وفعل القربات تُمحي الخَطيئات).**

## گەورەیی تەواو کردنی ئەرکانەکانی نوێژ

پێغەمبەری خودا ﷺفەرموویەتی: **((مثلُ الصلاةِ المكتوبةِ كَمَثلِ الميزانِ مَنْ أوفَى إسْتَوفَى))** [1]نموونەی نوێژە فەرزەکان وەك نموونەی کێشانە وایە، ئەوەی پارێزگاری لە ئەرکان و سوننەتەکانی بکات، پاداشتێکی تەواوی دەدرێتەوە ،

یەزیدی ڕەقاشی دەفەرموێت: نوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕێك و یەکسان بوون، وەك ئەوەی لە کێشانە درابن[2]، وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((إنَّ الرَّجُلين مِنْ أُمَّتي ليَقُومانِ إلىَ الصَّلاةِ وَ رُكُوعُهما وسجُودُهُما واحِد، وإنَّ مابَيْنَ صَلاتِهما مابينَ السَّماواتِ والأَرض وأشارَ ﷺ إلىَ الخُشُوع))** دوو پیاو لەم ئوممەتی منە نوێژ دەکەن، ڕکوع و سەجدەکانیان وەك یەکە، بەڵام جیاوازی نوێژەکانیان وەك جیاوازی میانی ئاسمان و زەوی وایە،.[3]

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((لايَنظُرُ اللهُ (عَزَّ وجَلَّ) يومَ القِيامَةِ إلَى العَبدِ، لايُقيمُ صُلبَهُ بَين رُكُوعهِ وسُجُودِه))**[4]،

واتە: ئەوەی لەمیانی هەڵسانەوەی ڕکوع و سجووددا پشتی ڕاست نەکاتەوە،

---

(١)قال العراقي اخرجه ابن المبارك في الزهد (٤١٩)(١١٩٠).من حديث الحسن مرسلا وأسنده البيهقي في الشعب من حديث ابن عباس باسناد فيه جهالة. قلت: وكذا اخرجه الحاكم والديلمي ولكن لفظهم جميعا:**(الصلاةُ ميزانٌ فمَن وفَّى استوفى.** وفي القوت عن ابن مسعود وسلمان رضي الله عنهما: **الصلاة مكيالٌ فمَن أوفَى أوفي له، ومن طفَّف فقد علمتُم ماقال الله تعالى في المطففين)** قلت: وقول سلمان هذا أخرجه ابو بكر بن ابي شيبة في المصنف٢٥٩/١.(٢٩٧٩) عن ابن فضيل عن عبد الله بن عبد الرحمن عن سالم بن ابي الجعد عنه، الإتحاف ١٢/٣.

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد(١٠٣).

(٣) واتە: هێمای بۆ ئەوە کرد: یەکێکیان خشوع و گەردن کەچی هەیە و ئەویان نییەتی، رواه ابن مبارك في الزهد، (٩٧) من زيادات نعيم بن حماد في نسخته للزهد عن شُقَيّ.

(٤)قال العراقي اخرجه الامام احمد في المسند(٥٢٥/٢) من حديث ابي هريرة باسناد صحيح

خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بە چاوی میهرەبانییەوە سەیری ناکات.

**((أمايَخافُ الَّذي يُحَوِّل وَجهَهُ في الصَّلاة، أن يُحوِّلَ اللهُ وجْهَه وَجهَ حِمَار))**[1]، ئەوەی کە لە نوێژدا ڕوی خۆی وەردەگێڕێت ، ئایا ناترسێت لەوەی خودا هەر بە حەقیقەت ڕوخساری بگۆڕێت بە ڕوی گوێدرێژ، یان لە زاهیردا وەك خۆی بێت و لە ڕاستی مەعنادا ئەو گۆڕانەی بەسەردا بێت.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((مَنْ صَلَّى صَلاةً لوَقتِها وأسبغَ وضُوءَها وأتمَّ ركُوعَها وسجوُدَها وخُشوعَها عُرِجَت) وعند الطبراني: وأتمَّ لَها قيامَها وخشوعها وركوعها وسجودها خرجت (وهيَ بَيضاءَ مُسفرةٌ تَقولُ: حَفِظَك اللهُ كَما حفِظتَني، ومن صَلَّى الصَّلواتَ لغَير وَقتِها ولَم يَسبَغ وُضوءَها ولَم يَتِمَّ رُكُوعَها ولا سُجودَها ولا خُشوعَها عَرِجَت(وعند الطبراني خرجَت) وهي سَوداءُ مُظلمَةٌ تقولُ: ضيَّعَكَ اللهُ كَما ضَيَّعتَني، حَتَّى إذا كانَت حَيثُ شاءَ الله، لُفَّتْ كَما يُلَفُّ الثَّوبُ الخَلِقُ فيُضرَبُ بها وَجهُهُ))** [2]،

واتە: ئەوەی نوێژێك لە کاتی خۆیدا بکات و دەست نوێژی پاکوپوختی بۆ شۆردبێت و چەمینەوەو سەجدە و گەردن کەچی تەواو بێت، نوێژەکەی بە سپێتی و درەوشاوەیی بەرز دەبێتەوە و، زوبانحاڵی نوێژەکە دەڵێت: خوا بتپارێزێت وەك منت پاراست. بەڵام ئەوەی نوێژەکەی لەکاتێکدا بکات کە

---

(١)أخرجه البخاري(٦٩١) ومسلم (٤٢٧) من حديث أبي هريرة بلفظ: **(أما يخشى الذي يرفع رأسه قبل الامام أن يَجعل الله وجهَه وجهَ حِمار.** وعند ابن عدي في عوالم مشايخ مصر من حديث جابر: **مايؤمنه إذا التفتَ في صلاته أن يحول الله وجهَه وجهَ كلب أو وجهَ خنزير)** ،قال منكر بهذا الإسناد قاله العراقي. قلت: وهو في السنن الاربعة بلفظ البخاري: **(ألا إنهم قالوا: رأس بدل وجه، وبزيادة: أو يجعل الله صورته صورة حمار)**، الإتحاف١٢/٣.

(٢) قال العراقي اخرجه الطبراني في الاوسط (٣١١٩)من حديث انس بسند ضعيف وللطيالسي، والبيهقي في الشعب (٢٨٧١) من حديث عبادة بن الصامت بسند ضعيف نحوه

وەختی خۆی نەبێت، بەبێ گەردنکەچی و بەناتەواوی لە ڕکوع وسەجدە کانیشیدا، نوێژەکەی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان،بەڵام ڕەش و تاریك،وە دەڵێت:خوا بتفەوتێنێت وا منت فەوتاند، تا ئەو جێگەی کە خودا ئارەزووی لێیەتی، دەپێچرێتەوە وەك چۆن بەرگێکی شرِوِرزیوو پتورکاو دەپێچرێتەوە، وە تورِدەدرێتەوە بە ناوچەوانیدا

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((أسوأُ الناسِ سَرِقةً الذي يَسرِقُ مِن صَلاتهِ))** [(١)]،خرابترین کار کە بە دزیەکی ناشیرین دا بنرێت، ئەو کەسەیە کە لە نوێژەکەی دەدزێت، واتە پەلە دەکات و ئارام نییە لە نوێژەکەیدا. هەروەها عەبدوڵلای کوڕی مەسعود و سەلمانی فارسی فەرموویان (خودایان لێ ڕازی بێت): نوێژ کردن پێوانەیە، ئەوەی بە چاکی و پڕیی مافی نوێژەکەی بدات، بە لێوان لێوی تەواوەوە مافەکەی بۆ دەپێورێت و پێی دەدرێتەوە، بەڵام ئەو کەسەی گزی بکات و خیانەت لە پێوانەکەی بکات، ئەوە دەزانن کە خودا چ هەڕەشەیەکی لە وانە کردووە لە پێوانەدا کەم و زیادی دەکەن. بۆخۆیان زیادی دەپێون و بۆ کڕیار کەمی دەکەنەوە (پەنا بەخوا).

---

(١) قال الزبيدي. قال العراقي أخرجه أحمد في (المسند) ٥٦/٣والحاكم وصحح إسناده من حديث أبي قتادة الانصاري قلت: خرجه مالك في الموطأ عن يحيى بن سعيد عن النعمان بن مرة ( **أنَّ رسول الله ﷺ قال: ماترون الشارب والسارق والزاني؟ قال وذلكَ قبل أن يُنزل فيهم، قالوا الله ورسوله أعلم، قال هنَّ فَواحش. وفيهنَّ عُقوبة، وأسوأ السَّرِقة الذي يَسْرِق مِن صَلاته، قالوا كيف يَسرِقُ مِن صَلاته؟ قال لايتِمُّ ركوعها ولاسجودها ولاخشوعها)**، وأخرجه ابوداود والطيالسي واحمد ايضا وابو يعلى عن ابي سعيد الخدري قال الهيثمي فيه علي بن زيد مختلف في الاحتجاج به وبقية رجاله رجال الصحيح وقال الذهبي إسناده صالح وقال المنذري رواه الطبراني في الثلاثة عن عبد الله بن مغفل باسناد جيد لكنه قال في أوله: أسرقُ الناس، الإتحاف ١٣/٣. ڕیوایەتی ئەخیریش : قوت القلوب ١٠٢/٣، ورواه ابن مبارك في (الزهد) ١١٩٢) عن سلمان (رضي الله عنه)

# گەورەیی و خێری جەماعەت

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((صلاةُ الجَماعَةِ تَفْضُلُ صَلاةَ الفَذِّ بسَبعٍ وعِشرِينَ دَرَجَة))واتە: نوێژی بە کۆمەڵ خێر و فەزڵی بیست و حەوت پلەی بە سەر نوێژی تاکەکەسدا هەیە[(١)].

وە ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کە پێغەمبەری خودا ﷺ چەند کەسێکی ون کردبوو لە هەندێك نوێژدا نەیدەبینین، بۆیە فەرمووی:

**(لَقَد هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بالنَّاسِ، ثُمَّ أُخالِفَ إلى رِجالٍ فأُحَرِّقَ عَلَيهِمْ بُيوُتَهُم)**

واتە: بەڕاستی ویستم فەرمان بدەم بە پیاوێك کە نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، لە پاشان منیش لایەکی تر بگرمە بەرو، بچم بۆ سەر چەندین پیاو کە دوادەکەون بۆ نوێژی جەماعەت، خانوەکانیان بەسەردا بسوتێنم.

وە لەڕیوایەتی ئەحمەد و موسلیم لە فەرموودەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودا هاتووە: ((**ثُمَّ أُخالِفَ إلى رِجالٍ يَتخلَّفُونَ عَنها، فآمُرَ بِهِمْ فَتُحَرَّقَ عَلَيهِم بِحُزَمِ الحطبِ بُيوتَهُم، ولَو عَلِمَ أَحَدَهُم أَنَّه يَجِدُ عَظْماً سَميناً لشَهِدَها، يعني صلاة العشاء**))[(٢)].

واتە: بچوومایە بۆ لای چەند پیاوێك کە لە نوێژی جومعە دوا دەکەون، فرمان بدەم لە بارەیانەوە کە بە باوەشی چیلکەو چەوێڵ ماڵەکانیان بسوتێنم،

---

(١) رواه البخاري (٦٤٥) ومسلم (٦٥١).

(٢)(وعند البخارى مِن حَديثِ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ (وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ، وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقًا سَمِينًا أَوْ مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ الْعِشَاءَ) فيض الباري على شرح صحيح البخاري ٦٤٤.

وەئەگەر هەرکامێکیان بیانزانیایە ئێسکێکی بەگۆشت و هەندێ چڵێسی و دەسکەوتی دونیایی تێدا بێت، بۆی دەهاتن و ئامادەی نوێژی خەوتانان دەبوون.
(حەزرەتی) عوسمان (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:
**((من شَهِدَ العِشاءَ فكأنَّما قامَ نصفَ ليلةٍ، ومَن شهِدَ الصُّبحَ فكأنما قام ليلةً))**[1]، ئەوەی ئامادەی نوێژی خەوتنان بێت بە جەماعەت، وەك ئەوە وایە کەرتێکی شەو شەونوێژ و بەندایەتی کردبێت، وە ئەگەر ئامادەی نوێژی بەیانیان ببێت، وەك ئەوەیە کە هەموو شەوەکە بێدار بێت و شەو نوێژی کردبێت.
وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:
**((مَنْ صَلَّى صَلاةً في جَماعَةٍ، فقَدْ مَلأَ نَحرَهُ عِبادَةً))**[2]، ئەوەی نوێژێك بە جەماعەت بکات ئەوا سینەو گەروی خۆیی پڕکردووە لە بەندایەتی و گوێڕایەڵی.
سەعیدی کوڕی موسەییبیش دەفەرموێت: **(ماأذَّنَ مُؤذِّنٌ مُنذُ عِشرينَ سَنَة إلاَّ وأنا في المَسجدِ)**[3]، واتە ماوەی بیست ساڵە بانگدەر بانگی نەداوە کە من لە پێشترەوە لە مزگەوت نەبووبم، هەروەها محەممەدی کوڕی واسیع دەفەرموێت

(١)رواه مسلم (٦٥٦)قال العراقي قال الترمذي وروى عن عثمان موقوفا قلت أخرج البيهقي في السنن من حديثه مرفوعا **من شهد العشاء في جماعة كان له قيام ليلة**
(٢)قال العراقي لم أرَه مَرفوعا وإنَّما هُو مِن قولِ سَعيد بن المسيب رواه محمد بن نصر في كتاب الصلاة، قلت: ووَجدت في العَوارفِ مانصه: **(ومَن أقامَ الصَّلوات الخَمس في جَماعةٍ فقَد ملأَ البرَّ والبحرَ عِبادَة)** الإتحاف ١٥/٣.
(٣) لە قوت القلوب دا هاتووە کە (حەزرەتی) سەعید فەرموویەتی: ماوەی چل ساڵە لەگەڵ دابەستنی نوێژی جەماعەتدا لە هەموو نوێژەکاندا لە مزگەوتدا بووم، کە ناو دەبرا بە کۆتری مزگەوت، الإتحاف ١٥/٣.ورواه ابن أبي شيبة في المصنف، (٣٥٤٢)وأبو نعيم في الحلية(١٦٢/٢)وقالا: ثلاثين، بدل عشرين،وفي (الطيوريات)(٤٥٠) (أربعين).

((ماأشتَهي مِنَ الدُنيا إلاّ ثَلاثةً: أخاً إنْ تَعوَّجتُ قَوَّمَني، وقُوتاً مِنَ الرِّزقِ عَفواً بِغَيرِ تَبِعَةٍ، وصلاةً في جَماعةٍ يُرفَعُ عَنِّي سهوُها ويُكتَبُ لِي فَضلُها))[1]، ئەوەی لە دونیادا پێم خۆشە پێی بگەم سێ شتە: برایەکی دڵسۆزی ڕاستەقینە، ئەگەر خوار و خێچیم تێدا بوو ڕاستم بکاتەوە، نانێکی حەڵاڵیشم هەبێت بێ ئەوەی هیچ بەدواداچوون و ئەرکێکم ڕووبەڕووبکاتەوە، وە نوێژێکی جەماعەتیشم بە نسیب ببێت، کە ئەوندە دڵم ئامادەباش و حزوری قەلبیم بۆ ببێت، دووربم لە هەڵەو سەهووکردن، وە فەزڵ و خێرەکەیشیم بۆ بنوسرێت.

دەگێڕنەوە ئەبو عوبەیدەی جەڕاح (خودای لێ ڕازی بێت) ئیمامەتی بۆ کۆمەڵێك دەکرد، کاتێك لێبوویەوە لەڕۆشتندا فەرمووی: بەردەوام شەیتان لە گەڵمدا خەریك بوو کەوای لێکردم من خۆمم بەلاوە باشتر بێت لەوانی تر، بڕیاربێت ئیتر ئیمامەت بۆ کەس نەکەم، با جارێکی تر تووشی هەڵەی تری وانەبم[2]،

ئیبراهیمی نەخەعی فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی کە ئیمامەت دەکات بەبێ زانست و خوێندەواری، وەك ئەو کەسە وایە لەناو دەریادا ئاو بۆ خەڵکی دەپێوێت، کە نازانرێت زیادەکەی چەندێکە لە کەمی و نوقسانی.

حاتەمی ئەصەم دەفەرموێت: نوێژێکی جەماعەتم فەوتا و فریای نەکەوتم، تەنها ئەبو ئیسحاقی بوخاری سەرخۆشی لێ کردم و دڵی دامەوە، خۆ ئەگەر کوڕێکم بمردایە زیاتر لە دە هەزار کەس دەهاتن و پرسەخوانییان لێ دەکردم،

---

(١) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق، (١٦١/٥٦).قال الزبيدي: لم أجده في الحلية في ترجمته وقد جاء في المرفوع من حديث حذيفة بن اليمان ماهو قريب من ذلك قال: **سيأتي عليكم زمان لايكونُ فيه شيء أعز من ثلاثة: درهمٌ حلال، أو أخ يُستأنس بهِ، أو سنة يعمل بها** . وفي اول القوت وقال بعض السلف **أفضل الاشياء ثلاثة: عملٌ بسنةٍ، ودِرهمٌ من حَلال، وصَلاةٌ في جَماعة. الإتحاف ١٥/٣.**

(٢) رواه ابن المبارك في (الزهد)(٨٣٤)، وابن أبي شيبة في (المصنف) ٤١٤١)

چونکه موصیبەت و نارەحەتییەك ڕو لە دین بکات زۆر کەم بایەخترە لەوەی کە موصیبەتێکی دونیایی ڕوی لە خاوەنەکەی کردبێت.

(حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عەبباس(خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەوەی گوێی لە بانگدەری نوێژ بێت و وەڵامی نەداتەوەو نەچێت بە دەمیەوە، نەئەو خێری دەوێت و نەخێریش ئەوی ویستووە[1]،

ئەبوهورەیرە(خودای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی:ئەگەر گوێی ئادەمییەك پڕبکرێت لە ڕەصاصی تواوە باشترە لەوەی گوێی بە بانگەوە بێت و نەچێت بە دەمیەوە[2]

دەگێڕنەوە کە زانای گەورە مەیمونی کوڕی مەهران هاتە ناو مزگەوتەوە وتیان پێی: خەڵکەکە ڕۆشتنەوە! فەرمووی: **إنا لله وإنا إليه راجعون!** بە ڕاستی فەزیلەتی ئەم نوێژەم لا خۆشتر بوو لە وەی بمکەن بە والی هەموو عێراق.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن صلَّى أربعِينَ يوماً مِن الصَّلواتِ في جَماعَة لاتَفُوتُه فيها تَكبيرةُ الإحرام كَتبَ اللهُ لهُ بَرائَتينِ: بَراءةٌ مِن النِّفاقِ وبَراءةٌ مِنَ النَّار))**[3]،

واتە: ئەوەی چل ڕۆژ لەسەر یەك ئامادەی هەموو نوێژەکانی جەماعەتی مزگەتەکەیان بووبێت، (ئەڵلاهو ئەکبەری) نوێژ دابەستنی لەگەڵ ئیمامدا لە کیس نەدەچـــوو، ئـــەوا دوو بەرائەت نامەو گـــەردن ئـــازادی بۆ دەنەسرێت،

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في (المصنف) ٣٤٨٥)، عن عائشة (رضي الله عنها) بنحوه.

(٢)رواه ابن أبي شيبة في (المصنف)(٣٤٨٤).

(٣)قال العراقي اخرجه الترمذي من حديث انس باسناد رجاله ثقات قلت: وهكذا أورده صاحب القوت. وقال في حديث أبي كامل عن رسول الله ﷺ واخرجه البيهقي كذلك، ولفظه: **(من صلّى لله أربعين يوماً في جماعة يدرك التكبيرةَ الأولى)**، والباقي سواء، وصحَّح التُّرمذي وقفه على أنس، وأخرج الامام أحمد من حديثه وفيه زيادة ولفظه: **(من صلّى في مَسجدي أربعين صلاة لاتفوتُه صلاةٌ كُتبتْ لهُ بَراءةٌ منَ النارِوبَراءةٌ منَ العذاب، وبرئَ من النفاق)** الإتحاف١٧/٣.

بەرائیتێك لە دوڕوویی و مونافقی، وە بەرائەتێکیش لە چوونە ناو ئاگر[1].

وە دەڵێن: بەڕاستی کاتێك کە ڕۆژی قیامەت دێتە پێشەوە، کۆمەڵێك حەشر دەکرێن، ڕوخساریان وەك گەوهەری تیشکدار وایە، فریشتەکان پێیان دەڵێن: ئەوە کردەوەکانتان چی بووە وا ڕوخسارتان وەك گەوهەر وایە؟

دەڵێن: ئێمە ئەگەر گوێمان لە بانگەوە ببوایە، هەڵدەستاین بۆ تارەت و دەستنوێژ و هیچ کارێکی تر ڕێگری نوێژەکەی لێ نەدەکردین. لە پاشان کۆمەڵێکی تر حەشر دەکرێن و ڕوخساریان وەك مانگی درەوشاوە وایە، لەوەڵامی هەمان پرسیاری پێشوودا دەڵێن: نوێژ بهاتایەتە پێشەوە دەستنوێژمان دەگرت و خۆمانمان بۆ ئامادەدەکرد، لە پاشان کۆمەڵێکی تر حەشر دەکرێن ڕۆخساری ئەمان وەك ڕۆژ داگیرساوو درەوشاوەبوو، ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە گوێمان لە بانگەوە بوو لەناو مزگەوتدا بوین، واتە پێشتر ئامادە دەبوین[2].

دەگێڕنەوە پێشینەی باش و سەلەفی صالحین نەریتیان وابوو، کە ئەگەر تەکبیرەی ئیحرامیان بۆ یەکجار بفەوتایەو فریای سەرەتای دابەستنی نوێژ نەکەوتنایە، ئەوا بۆ سێ ڕۆژ سەرەخۆشییان لە یەکتری دەکرد، وە ئەگەر جەماعەتێکیان بفەوتایە ماوەی حەوت ڕۆژ پرسەیان لەیەك دەکرد!!

---

(١)رواه الترمذي (٢٤١).

(٢) أورد نحوه صاحب قوت القلوب،٢/١٠١.

# گەورەیی سوجدەبردن

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: [1] ((ما تَقرَّبَ العَبدُ إلى اللهِ (عَزَّ وجَلَّ) بِشَيْءٍ أفضلَ من سُجودٍ خَفِيٍّ ))، واتە: بەندە بەهیچ شتێك ناتوانێت نزیکتر ببێتەوە لە خوداوە، ئەوەندەی بە هۆی سەجدەیەکی شاراوەوە نزیك دەبێتەوە. واتە: بەهۆی نوێژێکی سوننەتەوە لە ماڵەوە کەس پێت نەزانێت و، لەبەر خودا ئەنجامی بدەیت و ئاشکرای نەکەیت، ئیمامی غەزالیش یەکێکە لە وانەی لە خزمەت ئەبوبەکری ڕوزباری بەهرەمەندبووە، کە لە ساداتی نەقشبەندییە، کە

---

(١) رواه ابن مبارك فی الزهد(١٥٤) عن ضمرة بن حبیب بن صهیب مرسلا. (ئەمەش نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە کردارێك بە نهێنی بکرێت خیری زیاترە لە کرداری ئاشکرا، وە هەندێکیش طەریقەتی (مەلامەتیە)یان لە هەموو طەریقەتەکانی تەصەووف بەلاوە گەورەترە، چونکە شاراوەی دەروون و باطینی پێ ئاوەداندەکرێتەوە، خاوەنی (عوارف المعارف) دەفەرموێت: ئەوانە قەومێکی صالح و بێ زبانن، دڵیان ئاوەدان دەکەنەوەو خراپ و چاك بۆ خەڵکی ئاشکرا ناکەن، ئەوەش کە نهێنییەکانی چاك بکات، خودایش صیفەتە ئاشکراکانی چاك دەکات، فاکیهی دەفەرموێت: ئەوەی سەرقاڵی زیکری نهێنی بێت، دڵی ئاوەدان دەکاتەوە بە تایبەتی لە ناو قەرەباڵخیدا، وەبەم زیکری قەلبی یە دەگاتە پلە بەرزەکان، تا دەگاتە مەقامی (جەمع) وە لە کەلیمەی تەوحید بە پێی بنەمای (نەفی و ئیپبات) کار لە هەمووگیانی دەکات، وە بە لەفزی جەلالە دەگاتە جیهانی باڵا، وای لێ دێت هەموو ئەندامی گیانی زیکری خودا دەکات، تا دەبێتە ئەهلی غەیب و شارەزا لە شتە نەزانراوەکان، وای لێ دێت بە ئاشکرا هەموو زەڕاتی گیانی لەگەڵ دڵی دابەحاڵی نوستن و ئاگادارییەوە (الله) دەکات، وەك عاریف و خواناس (أبوالعباس)ی مورسی دەفەرموێت: ئەوەی بیەوێت خۆی دەربخات، ئەوە بەندەی خۆدەرخستنە، وە ئەوەی بیەوێت خۆی بشارێتەوە ئەوە بەندەی شاراوەیە! ئیتر بەندایەتی بۆ خودا دەکات و بەم شێوە دەیشارێتەوە، الإتحاف ١٨/٣.

بنەمای زیکر و بەندایەتییان لەسەر زیکری قەلبی و کاری نهێنی دامەزراوە.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **ما مِن مُسلمٍ يَسجُدُ للهِ سَجدةً إلاّ رفعَهُ اللهُ بِها دَرجَةً وحَطَّ عنهُ بِها سَيئَةً)** ) [1]،هیچ موسوڵمانێك نییە كە بۆ ڕەزای خودا سوجدەیەكی بردبێت، كە پلەیەكی بەرز نەكردبێتەوەو خراپەیەكیشی لەسەر نەسڕیبێتەوە. وە دەگێڕنەوە پیاوێك وتی بە پێغەمبەری خودا ﷺ : داوابكە كە خودا بمخاتە ڕیزی ئەوانەی بەری شەفاعەتی تۆ دەكەون، وە ئەو بەهرەم پێ ببەخشێت كە هاوڕێی تۆ بم لە بەهەشتدا، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (**أَعِنِّي بِكَثْرَةِ السُّجودِ**)[2]، واتە: یارمەتیم بدە لەسەر نەفسی خۆت بە سوجدە بردنی زۆر. بۆیە وتراوە: ((**أَقربُ ما يكونُ العبدُ مِنَ اللهِ تعالَى أنْ يَكونَ ساجِدًا**)) [3]، نزیكترین حاڵەت كە بەندەی خودای تێدا

---

(١)قال العراقي أخرجه ابن ماجه من حديث عبادة بن الصامت ولمسلم نحوه من حديث ثوبان وأبي الدرداء اهـ وبخط تلميذه الحافظ ليس في مسلم ذكر السيئة. نعم عند أحمد في هذا الحديث، قلت: وأخرجه ابن أبى شيبة والعقيلى من حديث أبى ذر: **ما مِن عَبد يسجد لله سجدة أو يركع ركعة إلا حَط الله عنه بها خطيئة ورفع له بها درجة**، وعند الطبراني في الأوسط من حديثه: **ما من عَبد يَسجد لله سجدة إلا رفعه الله بها درجة وكتب له بها حسنة** وأخرج أحمد وأبو يعلي والطبراني في الكبير من حديث أبي امامة رفعه: **إعلم أنك لَن تسجد للهِ سجدةً إلا رفَع الله لكَ بها درجَة وحط عنك بها خطيئة**. الإتحاف ١٨/٣.

(٢)قال العراقي أخرجه مسلم (٤٨٩)من حديث ربيعة بن كعب الاسلمي نحوه وهو الذى سأله ذلك اهـ قلت: وروى الطبراني عن جابر هذه القصة فقال: (**كان شاب يخدم النبي ﷺ ويخف في حوائجه فقال سَلني حاجتك؟ فقال: ادع اللهَ لي بالجنة. فرفع رأسه فتنفَّسَ فقال: نعم ولكِن أعِنيَ بكثرة السُّجود**)، واخرج البيهقي عن ابى الدرداء قال:( **لولا ثلاثٌ لأحببت أن لا أبقَى فى الدنيا: وضعُ وَجْهي للسجود لخالقي من الليل والنهار. وظماءِ الهواجر، ومقاعد أقوامٍ ينتَقُونَ الكَلامَ كما تُنتَقَى الفاكِهَةُ**) .الإتحاف١٨/٣.

(٣) رواه مسلم، (٤٨٢).

نزيك بێت لە خوداوەندەوە، ئەو حاڵەتەیە کە لە سوجدەدابێت.

ئەمەش واتای فەرموودەی خودایە ﷻ ﴿وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ﴾ (علق/١٩) [1]

واتە: سوجدە ببەو لە خوداوە نزیك بەرەوە. هەروەها خودی گەورە فەرموویەتی: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾ (فتح/٢٩)، نیشانەکانیان بە ناوچەوانیانەوەیە لە ئاسەواری ئەو سوجدە بردنەی بۆ خودای دەبەن.

وتراوە: ئەوە ئەو جێگایەی دەکەوێتە سەر زەوی لە کاتی سەجدەبردندا، هەندێکی تر دەڵێن: ئەوە بریتییە لە نووری خشوع و گەردن کەچی، چونکە ئەو نوورە لە جیهانی باطین و شاراوەیەوە پرشنگ دەداتەوە بۆ جیهانی ئاشکراو زاهیر، ئەمەش ڕای درووستە.

وە هەندێکی تر دەڵێن: ئەو نوور و ڕۆشناییە یە، کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەکەوێتە ناوچاویانەوە، لە ئەسەر و پاشماوەی خێری ئەو دەست نوێژانەیە[2]،

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((إذا قَرأَ ابنُ آدَم السَّجْدَةَ فسجد** (سجود التلاوة) **إعتَزَلَ الشَّيطانُ يَبكي ويقولُ ياوَيلاهُ أُمِرَ هَذا بالسُّجُودِ فَسَجدَ فَلهُ الجَنَّة بطاعَتهِ، وأُمرتُ بالسُّجودِ فَعَصَيتُ فَلي النَّار))**[3].

واتە ئەگەر ئادەمییەك ئایەتی سەجدەی خوێند و سوجدەیشی برد، شەیتان لێی دەتەکێتەوەو لە دوورەوە دەست دەکات بەگریان و دەڵێت:

وەیل و خەسارەتمەندی بۆ من، ئەوە فەرمانی سوجدەبردنی پێ دراو کردی و بەهەشتی مسەوگەر کرد، منیش فەرمانم پێدراو نەمکرد و بەشی منیش ئاگرە.

---

(١)انظر: الدر المنثور)٥٦٦/٨..

(٢)انظر: الدر المنثور)٥٤١/٧)، وە بنوارە : الإتحاف ٣/ ١٨.

(٣)اخرجه احمد ومسلم (٨١) وابن ماجه عن ابى هريرة .

وە دەگێڕنەوە عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت)حاڵی وابوو کە هەموو ڕۆژێك هەزار سەجدەی بۆ خودا دەبرد، بۆ یە ناوبانگی بە (سەججاد) دەرکردبوو[1]،

وە دەگێڕنەوە کە (حەزرەتی) عومەری کوڕی عبدالعزیز (خوای لێ ڕازی بێت) سەجدەی نەدەبرد لە سەر گڵ نەبێت[2].

یوسفی ئەسباط فەرموویەتی:

ئەی کۆمەڵی گەنجان، کارێك بکەن با لەشساغی و تەندرووستیتان لە دەست دەرنەچێت، بکەونە خۆتان پێش ئەوەی نەخۆش بکەون، کەس نەماوە کە ئیرەیی و حەسادەتی پێ بەرم بێجگە لەو کەسەی ڕکوع و سجوودەکەی بە باشی دەکات و ، منیش ئێستا لەبەر نەخۆشی ئەوەم پێ ناکرێت[3].

سەعیدی کوڕی جوبەیر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: خەفەت ئەسەفێکم بۆ لە دەستدانی هیچ شتێك نییە لە دونیادا جگە لەسەجدە بردن نەبێت[4]،

عەقەبەی کوڕی موسلیم فەرموویەتی: هیچ خەصڵەت و چاکەیەك نییە لە بەندەدا هەبێت، کە خودا زیاتر لەوە پێی خۆشتر بێت کە بەندەکە حەز بە

---

(١) رواه الطبراني في الكبير. (٢٧٥/١٠). وأبو نعيم في الحلية. ٢٠٧/٣).(١) جوانترینی قورەیشیەکان بوو لەسەر ڕوی زەویدا، ئەو ڕۆژەی حەزرەتی عەلی شەهید کرا ئەویش لەدایك بوو، بۆیە ناوی نرا بە ناوی ئەوەوە، بنوارە: طبقات ابن سعد(٣٠٨/٧).

(٢) قوشەیری دەیگێڕێتەوە لە (الرسالة) کەیدا، ٢٦٦، حافزی عەسقەلانی فەرموویەتی: لە (فتح الباري)دا ٤٨٨/١)، لەوانەیە بۆ زیاتر بەندایەتی و گەردن کەچی وای کردبێت، ئەوە نابێتە موخالەفەی کۆمەڵی موسوڵمانان، گڵیان بۆ دەهێناو لە جێگەیەکیشدا گڵی تێدانەبوایە ئەو گڵەی خۆیی دادەناو سەجدەی لەسەر دەبرد.

(٣) المجالسة ومجالس العلم، ٣٣١.

(٤) رواه ابن مبارك في الزهد، (٩٧٤)، عن سعيدٍ يحكيه عن مسروق.

لیقای خودا بکات، وە هیچ سەعاتێکیش نییە بەندەی تێدا نزیکتربێت لە خودا لەو کاتەی کە شۆڕدەبێتەوەو سەردەخاتە سەر زەوی و سەجدە ی تیا دەبات[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: نزیك ترین حاڵەت کە بەندەی تێدا بێت و لە خوداوە نزیك بێت، ئەوکاتەیە کە لە سەجدە دابێت، بۆیە لەو کاتەدا لە حزوری خودادا دۆعاو نزای زۆر بکەن[2]،

## گەورەیی خشوع و گەردنکەچی

خودا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ (طه/١٤)دەبێ نوێژەکەی بە هۆشداری و بێدارییەوە بکات، کەواتە ئەگەر غافڵ بوو بە نوێژی ڕاستەقینە ناژمێررێت. وە خودا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾ (٢٠٥/الأعراف)

نابێت بەندەکانی خودا بێ ئاگابن لە یادی خودا، زاهیری فەرمانەکەش بۆ ئەوەیە کە حەرامە غافڵبن. یان خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ (النساء/٤٣)

واتە: نابێت بە سەرخۆشی و بێ ئاگایی و فەرامۆشی نزیکی نوێژەکانتان بکەونەوە، بۆ ئەوەی هۆشتان لەسەر خۆتان بێت و بزانن چی دەڵێن. وەك دەڵێن: ئاگایان لە خۆیان نییە و وەك سەرخۆش وان لە زۆری خەفەتباری و مەراقدا، یان لە زۆر خۆشویستنی دونیادا، وایان پێ دەڵێن.

وەهبی کوڕی (مونەببیە) فەرمویەتی:

مەبەست بەم ئایەتە زاهیری واتاکەیەتی، کە بێدارکردنەوەیە لە سەرخۆشی دونیا، کە عیللەت و هۆکارەکەی ڕونکردۆتەوە بەوەی تا بزانن لە حزوری خودادا چی دەڵێن. وەك دەشزانین زۆر نوێژخوێن هەیە کە ئارەقیشی

---

(١)رواه ابن مبارك في الزهد، (٢٧٩_.

(٢) رواه مسلم (٢٨٢)، عن أبي هريره.

نەخواردۆتەوەو ناشزانێت لە نوێژەکەیدا چی دەڵێت!!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((مَنْ صَلَّى رَكعتَينِ لَم يُحدِّثْ نَفْسَه فيهما بشَيْءٍ مِنَ الدُّنيا غُفِرَ لهُ ما تقدَّمَ مِن ذَنْبه))**[1]

ئەوەی دوورکات نوێژ بکات و هیچ خەتەرەو خەیاڵاتێکی دونیایی نەهێنێت بە مێشکیدا و، تەنها بیری لای نوێژەکەی بێت، ئەوە خودا لەگوناهەکانی پێشەوەی خۆش دەبێت. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( إنَّما الصَّلاةُ تَمسْكُنٌ وتَواضُعٌ وتَضرُّعٌ وتَأَوُّهٌ وتَنادُمٌ، وتَضَعُ يدَيكَ فتَقُول: اللَّهُمَ اللَّهُم، فمَن لَمْ يَفعَل فَهِيَ خِداجٌ))**[2].

بەڕاستی حەقیقەتی نوێژکردن بریتییە لە خشوع و گەردن کەچی و مل کەچی و، پاڕانەوەو، ئاهو ناڵەو، ئاخ و حەسرەت هەڵکێشان و، دەربڕینی پەشیمانی و، هەردوو دەستیشت بەرزکەیتەوەو داوا لە خودا بکەیت : ئەی خودایە ئەی خودایە، ئەگەر یەکێك بەم شێوە نوێژ نەکات، ئەوە کەم بایەخ و نوقسانە.

وە لە کتێبە پێشووەکانەوە دەگێڕنەوە: کە خودا ﷻ فەرموویەتی: **((لَيسَ كُلُّ مُصَلٍّ أَتقبَّلُ صلاتَهُ، إنَّما أتقبَّلُ صلاةَ مَن تواضَعَ لِعَظَمتي))** زاد صاحب القوت: **((وخَشَع قَلبَهُ لجَلالي، وكَفَّ شَهواتَهُ عن مَحارمي، وقَطَع ليلَهُ ونَهارَهُ**

---

(١)قال العراقي أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف(٧٧١٣) من حديث صلة بن أشيم مُرسلا، وهو في الصحيحين من حديث عثمان، بزيادة في أوله، دون قوله: **بشئ من الدنيا**(البخاري ١٦٤، ومسلم ٢٢٦)، وزاد الطبراني في الاوسط إلاَّ بخير اهـ قلت: قال تلميذه الحافظ: لفظ ابن أبي شيبة في المصنف: **(لم يسأل اللهَ شيئاً الا أعطاه) اهـ وأخرج الطبراني في الكبير عن ابى الدرداء: (من صلَّى ركعتين يتمُ ركوعَه وسجودَه لم يسألِ الله تعالى شيئاً إلا أعطاهُ إيَّاهُ عاجلاً أو آجلا)**. الإتحاف ٢١/٣.

(٢)وقال العراقي أخرجه الترمذي والنساني بنحوه من حديث الفضل بن عباس بإسناد مضطرب اهـ ورواه الطحاوي في (شرح مشكل الآثار) وبها رواه ابن أبي شيبة(٧٧١٣) مرسلا.

بِذكْري، ولَم يُصِرْ على مَعْصِيَّتي (ولَمْ يَتكَبَّر عَليَّ) ونصُّ القُوت: (علَى خَلقي) ((وأَطعَم الفَقيرَ الجائعَ لِوَجهي))[١]

هەموو نوێژخوێنێك نوێژەكەی لێ وەرناگرم، بەڵكو تەنها نوێژ لەوكەسە وەردەگرم كە تەوازوعو گەردن كەچی بنوێنێت بەرامبەر عەزەمەت و گەورەیی من، وە نابێت فیزو دەمارم بەسەردا بكات، وە صیفەتیشی وابێت كە لەبەر خاتری من برسیی و نەدار تێر بكات[٢].

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّما فُرضَت الصَّلاة وأُمِرَ بالحَجِّ والطَّوافِ وأشعَرتِ المَناسِك لأَقامَة ذِكراللهِ تَعَالى))[٣]، بۆیە نوێژ فەرزكراوە و فەرمان بە حەجكردن و طەوافی ماڵی خودا دراوە، مەناسیكەكانی حەج بوون بە درووشم و شەعائیری ئیسلام، بۆ ئەوەی زیكری خودا ئەنجام بدرێت، جا ئەگەر لە دڵتدا بۆ ئەو زاتەی كە زیكری دەكەیت، سام و هەیبەت و عەزەمەتی جێگیر نەكەیت، كەواتە نرخ و بەهای زیكرەكەت چییە؟!

بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ وەصیّتی بۆ یەكێك دەكرد و فەرمووی: ((إذا صَلَّيتَ فَصَلِّ صَلاةَ مُوَدِّعٍ))[٤]،واتە: كە نوێژت كرد، ئەوەندە بە بایەخەوە بیكە وەك ئەو كەسەی كە ماڵاوایی لە خۆی دەكات و دەیەوێت ئیتر ئەوە دوا نوێژی بێت، ماڵاوایی لە هەواو ئارەزووەكانی، لە تەمەنی بەسەرچوویی، كە كاروانی

---

(١) بنحوه زواه أبو نعيم في الحلية،١٨/٤، وهو في قوت القلوب٩٧/٢، كما ذكرنا أعلاه.

(٢) بنحوه رواه مرفوعا أبو نعيم، فى الحلية (١٨/٤، وهو فى القوت ٩٧/٢.

(٣)خاوەنی قوت القلوب لەواتای ئەو ئایەتەدا پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ : وقال العراقي أخرجه أبو داود(١٨٨٨) والترمذي(٩٠٢) من حديث عائشة بنحوه دون ذكر الصلاة، قال الترمذى حسن صحيح اهـ

(٤)قال العراقي اخرجه ابن ماجه (٤١٧١)من حديث ابن عمر ومن حديث انس بنحوه اهـ قال تلميذه الحافظ واخرجه ايضا ابن ابى حاتم من حديث انس،

بەرێ خستووەو بۆ حزوری مەولای خۆی هەنگاو دەنێت، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ﴾ (الإنشقاق/٦)

تۆ ئەی ئادەمیزاد؛

لەو ڕۆژەدا بە پەلە دەڕۆی بۆ حزوری خودای خۆت و پێیشی دەگەیت .

هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾ (البقرة/٢٨٢)، واتە: ئێوە تەقوای خودا بکەن و لە گوناه خۆتان بپارێزن، ئەوا خوداهەمووشتێکتان فێر دەکات،یان خودا دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ مُلَاقُوهُ﴾ (البقرة/٢٢٣)، دڵنیابن کە ئێوە دەگەنەوە بە حزوری خوداو دوچاری لێپێچینەوەی دەبنەوە

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((مَنْ لَم تَنهَهُ صَلاتُه عَنِ الفَحْشاءِ والمُنكَر، لَمْ يَزدَدْ مِنَ اللهِ إلاّ بُعداً))[(١)]،

واتە: ئەوەی نوێژکردنەکەی لە کاری بێ ئابڕوبی و ناپەسەندی نەیگێڕێتەوە ، واتە لە کاتی نوێژەکەیدا ئەوەندە فێر نەبووبێت کە لە خراپەو فەساد دووری بخاتەوە، ئەوا نوێژەکەی جگە لە دوور خستنەوەی زیاتر لە خالیقەکەی هیچ بەهرەیەکی تری لێ فێر نابێت.

بەکری کوڕی عەبدوڵلای موزەنی فەرموویەتی:

---

(١) کەواتە نوێژی کەسێکی غافڵ هەرگیز خشوعی تێدا نابێت، بۆیە لای ئیمامی غەزالی وەك مەناوی فەرموویەتی: نوێژی غافڵ ڕێگری لە خراپەکاری ناکات، وأما تخريج الحديث فقال العراقي رواه على بن معبد في كتاب الطاعة والمعصية من حديث الحسن مرسلا باسناد صحيح ووصله ابن مردويه في تفسيره بذكر عمران بن حصين رضي الله عنه والمرسل أصح، ورواه الطبراني في الكبير(٥٤/١١)، وابن مردويه في تفسيره من حديث ابن عباس باسناد لين، وللطبراني من قول ابن مسعود : **من لم تأمره صلاته بالمعروف وتنهاه عن المنكر**..... وإسناده صحيح اهـ قلت: وأخرجه أيضا ابن أبي حاتم وابن المنذر من حديث ابن عباس ولين إسناده لاجل ليث ابن أبي سليم لتدليسه إلا أنه ثقة . الإتحاف ٢٢/٣.

ئەی نەوەی ئادەم! ئەگەر دەتەوێت بە بێ ڕێگەپێدان بچیتە خزمەتی مەولا و گەورەکەت، ئەوە دتوانیت، وتیان: ئەمە چۆن دەبێت؟ فەرمووی: دەستنوێژێکی باش بشۆرە، وە بچۆرە ناو میحرابەکەوە، تۆ بەم شێوە کە بەڕاستی و بە بێ ئیزن دەچیتە خزمەتی گەورەکەتەوە، ئەوە بەبێ تەرجومان و وەرگێڕی زوبان تۆ قسەی لە خزمەتدا دەکەیت[1].

(حەزرەتی) عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

**((كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحَدِّثُنا ونُحَدِّثُهُ فَإذا حَضَرَتِ الصَّلاةُ فَكَأَنَّهُ لَمْ يَعْرِفْنا ولَمْ نَعْرِفْهُ اشتِغالاً بِعَظَمَةِ اللهِ عَزَّوَجَلْ))** [2]، پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ ئێمە دەدواو ئێمەش لە خزمەتیدا قسەمان دەکرد، ئەگەر نوێژ بهاتایەتە پێشەوە، وەك ئەوەی نە ئەو ئێمەی ناسیبێت و نە ئێمەش ئەومان ناسیبێت، ئەوەندە سەرقاڵی بیرکردنەوە بوو لە گەورەیی خودا(**سَبحانَهُ وتَعالَى**).

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((لا يَنظُرِ اللهُ إلى صَلاةٍ لا يَحضُرُ الرَّجلُ فيها قَلبَهُ معَ بدَنهِ))** [3]، خودا

---

(١) أبونعيم (حلية الأولياء) ٢/٢٢٩ بنحوه.

(٢)قال العراقي رواه الأزدي في الضعفاء من حديث سويد بن غفلة مرسلا **كان النبي ﷺ إذا سَمِعَ الأذان كأنَّه لا يَعرفُ أحداً مِنَ الناس**. قال الحافظ ابن رجب في (فتح الباري)١١٤/٤). (خرَّجه الحافظ أبو الحسين بن المظفر في (غرائب شعبة) -وساق سنده- **عن عائشة قالت: كان رسول الله ﷺ إذا كان عندي ..كان في مهنة أهله، فإذا نودي بالصلاة، كأنَّهُ لَم يَعرِفنا))** أنظر الإتحاف ٢٣/٣. وأيَّد هذه الزيادة برواية أخرى عن أبي زرعة في (تأريخه) وأصل الحديث عند البخاري (٦٧٦).

(٣)قال العراق لم اجده بهذا اللفظ وروى محمد بن نصر فى كتاب الصلاة من رواية عثمان بن ابى دهرس مرسلا: لا يقبل الله من عبده عملا حتى يشهد قلبه مع بدنه. ورواه ابو منصور الديلمي في مسند الفردوس ١١٤/٤(٦٣٥٣) من حديث أبي بن كعب واسناده ضعيف. وروى المروزى في(**تعظيم قدر الصلاة**) ص/٩٢. نحوه بلفظ: **مابال أقوام يتلى عليهم كتاب الله فلا**

(بەچاوی ڕەحمەتەوە) سەیری نوێژی پیاوێك ناكات كە دڵی ئامادە نەكات لە گەڵ جەستەیدا، كە دەبێت دڵ و زوبان و جووڵەكانی پێكەوە وریاو ئاگاداربن.

(حەزرەتی) ئیبراهیمی خەلیل ((عَلیه السلام) هەركاتێك هەڵبستایە بۆ نوێژكردن، لە دووری دوو میلەوە ترپەو ناڵەی دڵی دەبیسترا[1].

وە هەركاتێك سەعیدی تەنوخی نوێژی بكردایە، فرمێسك لە چاوانی نەدەبڕا و بەردەوام فرمێسكی دەڕشت، لە سەر گۆنایەوە بۆ سەر ڕیشی خۆی.

**((ورآى رَسولَ الله ﷺ رجُلاً يَعبَثُ بِلحيَتِهِ في الصَّلاة، فقال: لَو خشَعَ قَلْبُ هَذا لخَشَعَتْ جَوارِحهُ))**[2].

پێغەمبەری خودا ﷺ كابرایەكی بینی لە نوێژدا یاری بە ڕیشی خۆی دەكرد، بۆیە فەرمووی: ئەم كەسە ئەگەر دڵی خشوع و گەردن كەچی تێدابوایە ئەوا كاریگەری لەسەر ئەندامەكانیشی دەبوو، ئاوا نەدەجوڵانەوە.

وەدەگێڕنەوە كە(حەزرەتی)حەسەنی بەصری سەیری پیاوێكی كرد لە نوێژدا

---

**يدرون ما يتلى منه مما يترك؟! هكذا خرجت عظمة الله في قلوب بني إسرائيل، فشهدت أبدانهم وابت قلوبهم، ولا يقبل الله من عبد عملاً حتى يشهدَ بقَلبه مع بدَنهِ).**

(١)وهو في كتاب العوارف للسهروردي بلفظ: **(كان يَسمع خفقان قَلبه من ميل**، قال: وروت عائشة ان رسول الله ﷺ **كان يُسمعُ من صَدره أزيزاً كأزيز المِرجل، حتى كان يسمع في بعض سكك المدينة)**، وروى ابن عساكر في تأريخ دمشق(٢١٨/٦) عن وهب بن منبه قال: **(قرأت في بعض الكُتب الذي أُنزلت من السماء، أن اللهَ قال لإبراهيم عليه السلام، أتدري لِمَ اتَّخَذتكَ خَليلاً ؟ قال: لا يارِبّ، قال: لِذُلِّ مَقامِكَ بين يَديَّ في الصلاة، وعنه قال: لما اتخذ اللهَ تعالى إبراهيم خليلا، كان يسمَعُ خفقان قلبه مِن بُعدٍ خوفا من الله ) (عَزَّوجَلْ)**

(٢)قال العراق رواه الحكيم الترمذي في النوادر من حديث أبي هريرة بسند ضعيف، والمعروف إنَّه مِن قَول سعيد بن المسيب رواه ابن أبي شيبة في المصنف وفيه رجلٌ لم يُسَم اهـ

یاری به بەرد دەکرد، وە دەیشیووت: خودایە حۆریەکانی بەهەشتم پێ ببەخشەو لێم مارەبکە، ئەویش فەرمووی: تۆخرابترین خوازبێنی دەکەیت! لەولاوە یاری بە ڕیشت دەکەیتو لەملایشەوە خوازبێنی حۆریەکان دەکەیت؟![1]

وتیان بە خەڵەفی کوڕی ئەیوب: ئەرێ لە کاتی نوێژدا مێش ئازارت نادات و تۆیش دەری بکەیت؟ فەرمووی: نەفسی خۆم لەسەر شتێك ڕاناهێنم کە نوێژەکەم لێ تێك بدات. وتیان: دەی چۆن دەتوانیت خۆت ڕابگریت و ئارام بیت؟ فەرمووی: هەواڵێکم پێ گەیشتووە، کە فاسقەکان لەکاتێکدا ڕووبەڕوی لیست و داری سوڵتان دەبنەوە، دەوترێت:فلان کەس زۆر خۆ ڕاگرەو شانازیشی پێوە دەکەن، دەی من لە میانی دوو دەستەی قودرەتی خودای خۆمدام، ئایا دەبێت مێشێك بمهەژێنێت؟! وە دەگێڕنەوە لە موسلیمی کوڕی یەسارەوە کە بیویستایە بچوایە بەدەم نوێژەوە، بە خێزانەکەی خۆیی دەوت: دەی ئێوە قسە بکەن، من ئیتر گوێم لێتان نییە.[2]

دەگێڕنەوە کە ڕۆژێکیان لە مزگەوتەکەی بەصرە نوێژی دەکرد، سوچێکی مزگەوتەکە دارِماو کەوتە خوارەوە، خەڵکەکە کۆبوونەوە لەسەری، بەڵام ئەم زاتە هەستی پێ نەکرد تا لە نوێژەکەی لێ بوویەوەو سەلامی دایەوە[3].

(حەزرەتی)عەلی(خودای لێ ڕازی بێت)حاڵی وابوو،کە وەختی نوێژ دەهاتەپێشەوە گیانی دەلەرزی و ڕەنگی دەگۆڕا، پێیان دەوت: ئەوە چیت بەسەر هاتووە ئەی فەرماندەی موسوڵمانان؟دەیفەرموو: وەختی هەڵگرتن ودانەوەی ئەو ئەمانەتانە هاتووە کە خودا ﷻ ئەمانەتی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خۆی خستە

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية، ٢٨٧/٥، عن عمر بن عبدالعزيز رحمه الله بنحوه.

(٢) رواه أبو نعيم في الحلية( ٢/ ٢٩٠).

(٣)رواه أبو نعيم في الحلية( ٢/ ٢٩٠).

بەردەمی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان، تا بزانێت ئاخۆ ئامادەن لە ئەستۆی خۆیانی بگرن، نکوولیان لەو بەرپرسێتییە کرد و، هەڵیان نەگرت و، پاشان ئادەمیزاد هەڵی گرت، حەزرەتی عەلیش دەفەرموێت: منیش هەڵم گرت[1].

دەگێڕنەوە لە عەلی کوڕی (حەزرەتی) حوسەین (خوایان لێ ڕازی بێت) کە هەرکاتێك دەستنوێژی بگرتایە، ڕەنگی زەردهەڵدەگەڕا، ماڵەوەی پرسیاری لێ دەکرد: ئەوە چ حاڵەتێکە کە داتدەگرێت؟! دەیفەرموو:

ئایا نازانن ئێستا دەمەوێت لە بەینی دوودەستەی قودرەتی کێدا ڕابووەستم؟[2].

دەگێڕنەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) (لە وەهبی کوڕی مونەببیهەوە، کە لە زەبوری (حەزرەتی) داوودەوە دەیگێڕێتەوە) کە فەرموویەتی:

(حەزرەتی) داوود لە موناجاتی خۆی لە حزوری خودادا دەفەرموێت:

ئەی پەروەدگارم! کێ لە ماڵەکەی تۆدا نیشتەجێ دەبێت و نوێژی کێیش وەردەگریت، فەرمووی:

ئەی داوود: ئەوەی لە ماڵی مندا جێگەی دەبێتەوەو نوێژەکەیشی لێ وەردەگیرێت: تەنها کەسێکە تەوازوع و گەردن کەچی نیشان بدات بەرامبەر گەورەیی و عەزەمەتی من، وە شەوو ڕۆژ بە زیکری من بەسەر بەرێت و، واز لە ئارەزووەکانی لەبەر من بهێنێت و، برسییەکان تێر بکات و، کەسی نامۆ و بێ لانە جێبکاتەوەو، ئەوەش لێی قەومابێت میهرەبانی لەگەڵدا بکات، ئەوە ئەو کەسەیە کە وەکو خۆر نوورەکەی لە ئاسماندا دەدرەوشێتەوە، ئەگەر هەر

---

(١)ئایەتە پیرۆزەکە ئەمەیە کە بە شایەت حاڵی خۆی هێناویەتییەو بنوارە: خۆلاصەی تەفسیری نامی، ل/٤٢٧.﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ (الأحزاب /٧٢).

(٢) رواه أحمد في (الزهد) ٢١٣٨، وابن أبي الدنيا في (الرقة والبكاء)(١٤٨) .

نزایەکم ڕو تێبکات، بە خێرایی دەچم بە دەمیەوە، وە ئەگەر داوام لێ بکات پێی دەبەخشم، لە ناو نەزانین دا حیلم و خۆڕاگری پێ دەبەخشم، وە بێ ئاگایی و غەفڵەتی بۆ دەکەم بە زیکر و یادی خۆم، وە تاریکی بۆ دەکەم بە نوور، نموونەی ئەو کەسە بە بەراورد لەگەڵ خەڵکەکەدا وەك فیردەوس وایە لە ناو بەرزترین پلەی بەهەشتدا، کە ڕوبارەکـانی وشــك نابن و بـەروبــوومەکـــەیشی گۆڕانی بەسەردا نایەت.[1]

هەروەها دەگێڕنەوە لە حاتەمی ئەصەممەوە (خودای لێ ڕازی بێت)کە پرسیاری لێ کرا لە بارەی نوێژەکەیەوە، فەرمووی:

ئەگەر وەختی نوێژ هاتە پێشەوە، بە تەواوی و جوانی دەستنوێژی بۆ دەگرم و ، دەچمە ئەو شوێنەی دەمەوێت نوێژی تێدا بکەم و، دادەنیشم تا هەموو ئەندامەکانم کۆدەبنەوەو ئامادەباش دەبن، لە پاشان هەڵدەستم بۆ نوێژ کردن و، کەعبە دەخەمە میانی برۆکانمەوە و، پردی صیراط دەخەمە ژێر پێمەوەو، وادەزانم بەسەریەوە ڕاوەستاوم و، بەهەشت لای ڕاستمەوەو، ئاگری دۆزەخیش لای چەپمەوەو، مەلائیکەی گیانکێشیش لە پشتمەوە، وای دادەنێم ئەوە دوا نوێژمە کە دەیکەم، لە پاشان لە میانی خۆف و ڕجادا ڕادەوەستم و، بە سۆز و محەببەتێکی زۆرەوە بە (الله أكبر) نوێژدادەبەستم، وە بە تەرتیل و تەجویدەوە قورئان دەخوێنمەوە و، بە ملکەچییەوە ڕکوع دەبەم و، بە خشوع و گەردن گەچییەوە سوجدەدەبەم و، دادەنیشم لەسەر لای چەپم و، پشتی پێی چەپم ڕادەخەم و، پێی ڕاستیشم ڕاستدەکەمەوەو، لە سەر ئیبهام و پەنجەگەورەم دای دەنێم، لە پاشان هەموو ئەم کردارانە بە ئیخلاصەوە

---

(١) وبنحوه مرفوعا في (الحلية) ٤/١٨، وابن أبي الدنيا في (التواضع والخمول) (٨٦) والخطاب فيه لسيدنا موسى عليه السلام.

ئەنجامیان دەدەم و، نایشزانم ئایا لێم وەرگیراوە یان نا[1]،

(حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: دووڕکات نوێژی نەدرێژو نەکورت(مامناوەندی)بە بیرکردنەوەو ئامادەیی دڵەوە، باشترە لە شەوێك لە عیبادەتدا بیت و دڵت بێ ئاگاو غافڵ بێت.

# گەورەیی مزگەوت و شوێنی نوێژ کردن

خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ (التوبة/١٨).

واتە: ئەوانە مزگەوتەکانی خودا ئاوەدان دەکەنەوە، کە باوەڕیان بە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە، وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((مَن بَنَى للهِ مَسجِداً ولَو كَمَفحَصِ قَطاةٍ، بنَى اللهُ لهُ قصراً في الجَنَّة)) [2].

---

(١) رواه أبو نعيم في (الحلية)(٧٥/٨) بنحوه.بۆیە وتراوە: **تفكر ساعة خير من عبادة الثقلين.**

(٢) رواه ابن ماجه (٧٣٨) وأصله في (الصحيحين)، قال الزبيدي: أخرجه ابن ماجه من حديث جابر وعلى باسناد صحيح بدون قوله: **ولو كمفحص قطاة** بزيادة **من بنَى لله بيتاً** بدل **قصرا**، ومثله لابن حبان من حديث أبى ذر و ابن عساكر في تأريخ دمشق (٢٣٩/٣٧)عن علي، وايضا عن عثمان والطبراني في الكبير عن اسماء بنت يزيد، وفي الاوسط(٣٤٧/٦(٦٥٨٦) والبيهقي(في الشعب) ٨١/٢(٢٩٣٩) من السنن عن عائشة وفي الاوسط أيضاً(٤٩/٥(٤٦٤١) عن أبي بكر وعن أبى هريرة وعن اسماء بنت ابى بكر(٢٢١/٨(٨٤٥٩) وعن نبيط بن شريط(٣٥٥/٢(٢٢١٥) والدار قطني في العلل(٢٦٣/١(٥٥) عن ابى بكر وابن عساكر ايضا عن معاذ بن جبل وام حبيبة رضي الله عنهم واخرج الشيخان والترمذى من طريق عبيد الله بن الاسود الخولاني انه سمع عثمان بن عفان يقول سمعت النبى ﷺ يقول: **من بنى مسجدا يبتغي به وجه الله بنى الله له مثله فى الجنة** وأخرجه ايضا هكذا احمد والنسائي وابن ماجه وابو يعلي وابن حبان وروى الامام احمد من حديث ابن عباس من رواية جابر الجعفى وهو ضعيف عن عمار عن سعيد بن

ئەوەی بەخۆی یان بە فەرمانی ئەو مزگەوتێکی درووست کردبێت، جێگای نوێژ بێت، باوەك هێلانەی کۆتری (قەتێ) بێت کە ناتوانێت لە سەر درەخت و شوێنە بەرزەکان هێلانە بکات، جا ئەوەندەبێت کە دەتوانێت لە سەر هێلکەکانی بنیشێت ، ئەوا خودای گەورە کۆشکێکی لە بەهەشتدا بۆ درووست دەکات.

وەپێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:((مَن أَلِفَ المَسجِدَ أَلِفَهُ اللهُ تَعالى))[1]، ئەوەی دڵی بە مزگەوتێك بکرێتەوە، و تیایدا بمێنێتەوەو زیکری خودای تێدا بکات، ئەوە خودای گەورە دەیخاتە ژێر سایەی ڕەحمەتی خۆیەوە.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((إذا دَخَل أَحدُكُم المَسجِدَ فَليركَع ركعَتَينِ قَبلَ أَنْ يَجلِسَ)) [2].

واتە: ئەگەر بە دەستنوێژەوە چوونە ناو مزگەوتەوە ئەوا سوننەتی (دیاری مزگەوت) جێ بە جێ بکەن، پێش ئەوەی دابنیشن.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: لاصَلاةَ لِجارِ المَسجِدِ إلاَّ في المَسجِدِ[3].

---

جبير عنه رفعه: مَن بنى لله مسجدا ولو كمفحَصِ قطاة لبيضها بنَى الله له بيتا في الجنة وعند ابن خزيمة كمفحص قطاة أو أصغر . ينظر: الإتحاف ٢٧/٣.

(١) قال مالك بن دينار: المنافقون في المساجد كالعصافير في القفص وكان أبو مسلم الخولاني يكثر الجلوس في المساجد ويقول إنها مجالس الكرام أخرجه الطبراني في الاوسط(٦٣٧٩) من حديث ابى سعيد الخدري بسند ضعيف قاله العراقي وهكذا هو في الجامع الكبير للسيوطي وعزاه فى الجامع الصغير الى المعجم الاصغر للطبراني فان لم يكن سبقُ قَلم مِن الناسخ فيَحتمل أن يكونَ مذكورا فيهما، الإتحاف ٢٨/٣.

(٢)اخرجه احمد والشيخان(البخاري)٤٤٤، ومسلم(٧١٤، والترمذي وأبو داود والنسائي من حديث أبي قتادة الحرث بن ربعي السَّلَمي الأنصاري وله سبب خاص وذلك لان ابا قتادة دخل المسجد فوَجد رسول الله ﷺ جالساً بين صحبه فجلسَ معَهم فقال له: ما منعك ان تركع؟ قال: رأيتك جالسا والناس جلوس، فذكره . الإتحاف ٢٨/٣.

(٣) رواه الدرقطني في (سننه) ٤١٩/١، والكاكم في (المستدرك) ٢٤٦/١).

واتە: ئەوەی دراوسێی مزگەوت بێت و گوێی لە دەنگی بانگ بێت، نوێژەکەی بە تەواوی بۆ ناژمێررێت، ئەگەر لەمزگەوتدا بە جەماعەت نەیکات.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((الملائكةُ تُصلِّي علَى أَحَدِكُم مادامَ في مُصَلاَّهُ الَّذي يُصَلِّي فيهِ: اللَّهم صلِّ عَليهِ، اللَّهُمَ ارحَمهُ، اللَّهم اغفِر لَه. مَالَم يُحْدِثْ أَو يَخرُجْ مِنَ المَسجِدِ))** [1]

واتە: مەلائیکە داوای ڕەحمەت دەکەن بۆ یەکێك لە ئێوە، مادەم لەشوێن نوێژەکەیدا بمێنێتەوە و، بەپاکی دەست نوێژەوە مابێتەوە و، نەچێتە دەرەوەی مزگەوتەوە، ئەوان بەردەوام نزای بۆ دەکەن و دەڵێن: خودایە ڕەحمەتی برژێنەسەر، خودایە لێی خۆش ببە، خودایە ڕەحمی پێ بکە.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((يأتي في آخر الزَّمان ناسٌ مِن أمَّتي، يأتونَ المَساجدَ فيقعُدونَ فيها حَلقاً ذِكرهُمُ الدُّنيا، وحُبُّ الدُّنيا. لا تُجالِسُوهُم فلَيسَ للهِ بِهِمْ حاجَةٌ))** [2].

---

(١)أخرجه البخاري في الصلاة(٤٤٥) من طريق الاعمش عن ابى صالح عن ابى هريرة رفعه، فساق الحديث وفيه: **وإذا دخل المسجد كان في صلاة ما كانت تحبسه، وتصلي عليه الملائكة مادام في مجلسه الذي يصلي فيه: اللهم اغفر له اللهم ارحمه مالم يؤذ بحَدثٍ**، وفي رواية مالَم يحدِث فيه، وعند الكشميهنى **مالم يؤذ بحدث فيه**، اخرجه ايضا مسلم(٦٤٩) وأبو داود والترمذى وابن ماجه كلهم فى كتاب الصلاة واخرجه البخارى ايضا فى الجماعة والله أعلم .الإتحاف ٢٩/٣.

(٢)اخرجه ابن حبان في صحيحه (١٦٣/١٥)(٦٧٦١)من حديث ابن مسعود والحاكم في المستدرك(٣٥٩/٤)(٧٩١٦)، من حديث انس وقال صحيح الاسناد قاله العراقي.وقال الحافظ الزبيدي: لفظ الحاكم ياتي على الناس زمان يتحلقون في مساجدهم وليس همَمُهم إلا الدُنيا وليسَ لله فيهم حاجة، فلا تُجالسوهم. وأخرج البيهقي في الشعب و السنن(٨٧/٣)(٢٩٦٢) عن الحسن مرسلاً: **يأتي على الناس زمان يكون حديثهم في مساجدهم في أمر دُنياهم فلا تجالسُوهم فليس للهِ فيهم حاجة**، **ومِمَّا يقرُب منه** ،ما أخرجه الحاكم في تأريخه عن

واته: له كۆتایی زەماندا کەسانێك له ئوممەتم پەیدا دەبن، دەچنە ناو مزگەوتەوە، بەئەڵقە دادەنیشن بۆ (زیکری خودانا) بەڵکو بۆ باسی دونیاو خۆشەویستی و پیاهەڵدانی دونیا، ئەوە نابێت لەگەڵیاندا دابنیشن، خودا هیچ پێویستیەکی پێیان نییه.

وه پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

خودای گەورە له هەندێك له کتێبه ئاسمانیەکانیدا فەرموویەتی:

**((إِنَّ بيوتي في أَرضي المَساجدُ، وإِنَّ زُوَّاري فيها عُمَّارُها، فَطُوبَى لِعَبدٍ تَطهَّرَ في بيتهِ، ثُمَّ زارَني في بيتي، فحَقٌّ علَى المَزورِ أن يُكرِمَ زائِرَه))** [1]،

---

ابن عمر: **يأتي على الناس زمانٌ يجتمعُون في مَساجدهم ويصلون وليس فيهم مؤمن،** ئەوەی له دەقی فەرموودەکە دەردەکەوێت به ئەڵقەدانیشتن له مزگەتدا نەهی لێ کراوه مەگەر بۆ فێر بوونی زانست و قورئان خوێندن و دیراسەکردنی قورئان و فەرموودەو زیکری خوداو باس و خواسی ئیمانی بێت، که له کۆتایی بابی جومعەدا باسی دەکرێت، الإتحاف ۳۰/۳

(۱)أخرجه ابو نعيم في الحلية(۲۱۳/۱۰) من حديث ابى سعيد باسناد ضعيف، بلفظ: **(يقول الله عزوجل يوم القيامة أين جيراني فتقول الملائكة ومن ينبغي أن يكون جارك فيقول عمار مساجدي)**، هكذا هو نص الحلية ونص العراقى منها من هذا الذى ينبغى ان يجاورك فيقول اين قراء القران وعمار المساجد قال واخرجه البيهقي في الشعب(۸۲/۳)(۲۹٤۳) نحوه موقوفاً على اصحاب رسول الله ﷺ باسناد صحيح، قال الزبيدي : و للطبرانى من حديث سليمان مرفوعاً: **(من تَوضَّا في بيته فاحسنَ الوضوء، ثم أتى المسجد فهُو زائر الله تعالى وحق على المزور أن يُكرم زائره)**، واسناده ضعيف، قلت: هكذا هو في المعجم الكبير الا انه قال: أن يكرم الزائر وقد وجدت سياق المصنف فى المعجم الكبير للطبراني من حديث عبد الله بن مسعود مرفوعاً بلفظ: **(إنَّ بيوتَ الله تعالى في الارض هي المساجد، وإن حقاً علَى الله أن يُكرم مَن زاره فيها.) الإتحاف ۳۰/۳، وأيضاً التخريجات المظبوطة في المجلد الأول لإحياء علوم الدين تحقيق وتخريج علي محمد مصطفي، وسعيد المحاسبي، ص/٤٦٥-**

واتە: ئەو جێگایانەی کە پاڵفتەو هەڵمانبژاردوون بۆ ئەوەی شوێنی دابەزینی ڕەحمەت و فریشتەکانم بێت لە زەویدا مزگەوتەکانە، ئەوانەیش کە زیارەتی دەکەن، ئەو کەسانەن کە بە بەندایەتی و خێر و چاکە ئاوەدانی دەکەنەوە، خۆش بەختی بۆ ئەو بەندەیەی کە لەماڵەوە خۆی پاکوخاوێن دەکاتەوەو، لە پاشان دێت بۆ زیارەتی من لە ماڵەکەی خۆمدا، ئەو کاتە پێویست دەبێت لەسەر زیارەتکراو (کە خودایە) ڕێز لە میوانە زیارەتکارەکەی بگرێت.

هەروەهاپێغەمبەری خودا(صەلات و سەلامی خودای لەسەر)فەرموویەتی:

**((إذا رَأيتُمُ الرَّجُلَ يَعتادُ المَساجِدَ فاشْهدُوا لَهُ بالإيمان))**[1]،

واتە: ئەگەر بینیتان ئەو پیاوە خووی بە مزگەوتەوە گرتووە و دڵی پێی داهاتووە و، حەزی لە زیکرو بەندایەتییە تیایدا، کە لێشی دووردەکەوێتەوە دڵی هەر لە لایەتی، ئەوە شایەتی بڕواو ئیمانی بۆ بدەن.

سەعیدی کوڕی موسەییب فەرموویەتی:

**(مَن جَلَس في المَسْجِدِ فَإنَّما يُجالِسُ رَبَّهُ، فَما أَحقَّهُ أنْ لا يَقُولَ إلاَّ خَيراً)**[1]،

---

٤٦٦. بەتایبەتی بۆ ناوی سەرچاوەکان و ژمارەی بەرگ و لاپەڕەکانیان زیاتر سوودم لەو سەرچاوەی پێشەوەو لە چەندین نوسخەی تری چاپکراوی ئیحیای غەزالی، کە گرنگییان بە تەخریجی فەرموودەکان داوە.

(١)قال العراقي أخرجه الترمذي(كتاب تفسير القرآن، باب ومن سورة التوبة(٣٠٩٣) وحسَّنه وابن ماجه(٨٠٢) والحاكم في المستدرك(٣٣٢/١(٧٧٠) وصحَّحه من حديث أبي سعيد اهـ قال الزبيدي: ٣٠/٣وأخرجه أيضا أحمد في مسنده(٢٧٣٢٥) وابن خزيمة في صحيحه(٣٧٩/٢(١٥٠٢) وابن حبان في صحيحه(٦/٥(١٧٢١). والبيهقي في السنن(٦٦/٣(٤٧٦٨) كلهم من حديث ابى سعيد قال الترمذي حسن غريب وتصحيح الحاكم له تعقبه الذهبي بأن في سنده دَرَّاجا وهو كثير المناكير، وقال مغلطاى في شرح ابن ماجه حديث ضعيف وعند الترمذي والحاكم وغيرهما بعد الحديث زيادة فان الله يقول: **(إنما يَعمرُ مساجدَ الله من آمنَ بالله واليومِ الاخر)**(التوبة/١٨.

ئەوەی لە مزگەوتدا دابنیشێت، ئەوە لە حزوری خودای خۆیدایەتی، و موناجاتی لە خزمەتدا دەکات، کەواتە دەبێت مافی ئەو جێگە بپارێزێت کە تەنها خێرو چاکەیە، وەك زیکر و تەسبیحات و داوای لێخۆش بوون.

هەروەها لە ئاساری پیاوچاکانەوە هاتووە، کە هەندێکیش بە فەرموودەی دەناسێنن :

**((الحَديثُ في المَسجدِ يأكُل الحَسناتُ كَما تَأكُل البَهائِمُ الحَشيشَ))**[٢]،

واتە: قسەکردنی بێ هوودە لە مزگەوتدا، چاکەکانی لێدەخوات و لایان دەبات، وەك چۆن ئاژەڵێك پوش دەخوات و نایهێڵێت.

ئیبراهیمی نەخەعی فەرموویەتی: کاتی خۆی ڕایان وابوو: ڕۆشتن بۆ مزگەوت لە شەوی تاریکدا بەهەشت مسەوگەر دەکات[٣]،

ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی:

ئەوەی چرایەك لە مزگەوتێکدا هەڵبکات، بەردەوام مەلائیکە و هەڵگرانی عەرش داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکەن، تا ئەو کاتەی ڕوناکی ئەو چرایە لە مزگەوتەکەدا دەمێنێت.[٤]،

(حەزرەتی) عەلی (کرم الله وجهه)فەرموویەتی:

**(إذا ماتَ العَبدُ...بَكى علَيهِ مُصَلاَّهُ مِنَ الأرضِ ومَصعَدُ عَمَلِهِ مِنَ السَّماء.)**

---

(١) رواه ابن مبارك في الزهد(٤١٦).

(٢)ئیمامی غەزالی بەدڵنیاییەوە بە فەرموودەی دانەناوە، بنوارە: كشف الخفا، ٤٢٣/١، واتاکەی ئەوەیە کە ئەو فەرموودە دەیگەێنێت: کە پێشتر باسمان کرد: **(فيقعدون حلقا، ذكرهم الدنيا وحب الدنيا فلا تجالسوهم)**،

(٣) رواه ابن مبارك في الزهد(٤٢٢) وابن أبي شيبة في (المصنف) (٦٥٠٠) وأبو نعيم في حلية الأولياء (٢٢٥/٤).

(٤) رواه الحارث بن المثنى عن أنى بن مالك مرفوعا(في مسنده) ١٢٧.

ئەگەر بەندەی خودا بمرێت، جێگا نوێژەکەی لە زەوی و شوێنی بەرز بوونەوەی کردارەکانی لە ئاسمان بۆی دەگرین و خەمی بۆ دەخۆن.
لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:
﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ﴾ (الدخان/٢٩).
واتە: ئەوانەی بڕوادار نین؛ نە ئاسمان و نەزەوی، فرمێسکی پەشیمانییان بۆ نارێژن و نەدوایش دەخرێن بۆ ماوەیەکی تر[١]،
(حەزرەتی) عەبـــدوڵلای کـــوڕی عەبباس فەرموویەتی:
زەوی بۆ بڕوادار چل بەیانی تەواو بۆی دەگری[٢]،
عەطای خۆراسانی فەرموویەتی: لەهەر پارچەیەك لە پارچەكانی سەر زەویدا هەر بەندەیەك سەجدەیەك بۆ خودا ببات، ئەوە ئەو جێگایە دەبێتە شایەت لەسەری بۆ ڕۆژی ئاخیرەت و لە ڕۆژی مردنیشی بۆی دەگری.[٣]،
(حەزرەتی) ئەنەسی کوڕی مالیكیش فەرموویەتی:
هیچ پارچە زەوییەك نییە کە زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ) ی تێدا بکرێت، بە نوێژکردن یان بە زیکر و یادی خودا، کە ئەو جێگایە شانازی نەکات بەسەر جێگاکانی تردا، وە ئەو شوێنە مژدە بە زیکری خودا دەدات (عَزَّ وجَلْ) تا کۆتایی قووڵایی زەوی، هەتاحەوت تەبەقەی ئەرز[٤]،
وە وتراوە: هەر مەنزڵ و جێگایەك کە تاقم و هۆزێکی تێدا نیشتەجێ بن، ئەوە ئەو جێگایەی یان ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت، یان نەفرەت و لەعنەتی بۆ دەنێرێت[٥]،

---

(١) خۆلاصە،٤٩٧.
(٢) رواه ابن مبارك في الزهد(٣٣٦).
(٣)رواه ابن مبارك في الزهد(٣٣٨).
(٤) هەمان سەرچاوە ٣٣٩.
(٥)هەمان سەرچاوە ٣٣٤.

# دەروازەی دووهەم

## لە بارەی چۆنیەتی کردەوە ئاشکراکان
## کە لە نوێژداهەیە
## سەرەتاکەیشی بە
## دەستپێکی نوێژ و (الله أکبر)
## وە باسی
## کارە پێشووەکانیش

پێویستە نوێژخوێن خۆی لە هەموو پیس و پۆخڵییەك پاکبکاتەوە و بەرگ و شوێنەکەیشی خاوێن کاتەوە، وە لە میانی ناوکیەوە تا ئەژنۆیشی داپۆشیبێت، لەپاشان دەست نوێژێکی پوختیشی بۆ گرتبێت، ئیمجا دەبێت:

هەڵسێتە سەر پێ و، ڕو لە قیبلە بکات. میانی هەردوو قاچەکانی بکاتەوەو نەیانلکێنێت بە یەکەوە[1]، کە پابەندی بەم ڕێنماییانەوە نیشانەیە لەسەر تێگەیشتن و شەرع زانینی ئەو کەسە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە: ((وقد نَهى ﷺعَنِ الصفْنِ والصِفْدِ في الصَّلاة))[2]صیفد: ئەوەیە کە هەردوو

(١) واتە: میانی هەردوو قولەقاپەکانی بە ئەندازەی چوارپەنجە لەیەك دووربخاتەوە وەك زانای گەورە (ئەردەبیلی) لە (الأنوار)دا ٨٨/١باسی فەرمووە.

(٢) ذكره ابن الأثير في النهاية،٣٥/٣-٣٩.وروى النسائي (١٢٨/٢) عن عبدالله بن مسعود، (أنَّ رجلا يصلي قد صَفَّ بينَ قَدَميهِ، فقال: أخطأالسنة، ولو راوَح بينهما كانَ أعجب إِلَيَّ).

پێی پێکەوە بلکێنێت، وەك لە قورئاندا هاتووە کە دەفەرموێت:

﴿مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ (ابراهیم/٤٩)لەو ڕۆژەدا تاوانباران دەبینیت لە کۆت و زنجیردا ڕیزکراون. وشەی صیفن: واتە یەکێك لە پێکانی بەرزکاتەوە، وەك ئەوەی لە قورئاندا هاتووە: ﴿الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ﴾ (ص/٣١)واتە:

ئەسپە چاکە پەلبڵاوەکانی پیشاندرا، (کە لەکاتی وەستاندا پێیەکی بەرزدەکاتەوەو لەسەر ئەوانی تر ڕادەوەستێت)

ئەبێت بەم شێوە ئەو نوێژخوێنەش چاودێری هەستانەوەکان بکات لەسەر پێیەکانی، وە ڕێکی دانەواندن و پێکەوەبوونی ئەژنۆکانی، وە بەرزبوونەوەی بەبێ لاری و چەمینەوە، کە ڕێك ڕابووەستێت. سەریشی ئەگەر مەیلی لێ بێت ڕێکی ڕابگرێت، وە ئەگەر بیشیەوێت دەتوانێت بیچەمێنێتەوە بەلای سینەیدا، وە ئەم سەر داخستنەی نزیکترە لە خشوع و گەردن کەچی، وە داخستنی چاوەکانی کە بەملاولادا نەڕوانێت و سەیری بەر پێی خۆی بکات.

با چاوەکانی تەنها سەیری بەرنوێژەکەی خۆی بکات، کە نوێژی لەسەر دەکات، ئەگەر نوێژگایەکی نەبوو لەسەری بووەستێت، با نزیك بکەوێتەوە لە دیوارێکەوە، یان هەر نەبێت خەتێك بکێشێت لەبەردەم سەجدەکەیدا، ئەگەر لە دەشتێکدا بوو، یان لە مزگەوتێکی فراواندا بوو. ئەو هێڵەیە مەودای بینین و سەیرکردنی چاوی کەم و بەرتەسك دەکاتەوە، وە بیر و فیکریشی پەرەوازە نابێت، با ڕێگری لە چاویشی بکات بەملاولادا نەیانسوڕێنێت و، تەنها لە سنووری بەرماڵەکەو جێ نوێژ و خەتەکەی کێشاویەتی سەیر بکات، ئیتر لەوە زیاتر چاو نەگێڕێت.

---

قال الحافظ الزبيدي: في الإتحاف ٨٩/٣، وأصل هذا في كتاب القوت، ٩٦/٣، وهو الذي فسر معنى الألفاظ وتبعه من جاء بعده.

ئەو بەپێوە وەستانەی بەم شێوە بەردەوام بێت، تا ئەو کاتەی رکوع دەبات، بێ ئەوەی لا بەملاو لادا بکاتەوە، ئەمە ئەدەبی چۆنیەتی وەستانی نوێژخوێنەکەیە.

ئەگەر وەستا و ڕوی کردە قیبلە و، سەردانەواندنی بەم شێوە بوو، سوننەتە ئەم سوورەتە بخوێنێت: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ (الناس/١)

واتە: پێیان بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری هەموو ئادەمیان و پەریان.

تاخۆی لە داوی شەیتان بپارێزێت، لە پاشاندا بێ بانگدان قامەت بخوێنێت، بەڵام ئەگەر بە هیوا بوو کەسێك بێت و نوێژی لە گەڵدا دابیەستێت، ئەوا با بانگیش بدات و خۆی دوا بخات، لە پاشان نیيەتی خۆی کۆبکاتەوە، بۆ نموونە نیيەتی نوێژی نیوەڕۆ بهێنێت، ئەوا دەبێت بە دڵ بڵێت:

نیيەتمە نوێژی نیوەڕۆ بە فەرز دەیکەم بۆ خودا، بۆ ئەوەی کە باسی ئەدا دەکات، واتە: نوێژەکەی حازرە و قەرزنییە، وە بە وشەی (فەرز) واتە نوێژی سوننەت نییە، وە بە وشەی (نیوەڕۆ) واتە نوێژی عەسر و ئەوانی تر نییە، دەبێت واتای ئەم وشانە لە دڵیدا ئامادەکات، ئەمە پێی دەڵێن: نیيەت! بەکارهێنانی وشەکان تەنها وەبیرخستنەوەیە، هۆکاری پەیدابوونی واتاو مەعناکانیەتی، وە دەتوانێت هەوڵی ئەوە بدات، کە ئەم نیيەتە لەسەرەتای دابەستنی نوێژەوە (ئەلفی ئەڵلاوە تا ڕێی ئەکبەر ) بەردەوام بێت، بۆ ئەوەی نیيەت و نوێژەکەی لێ شاراوە نەبێت. ئەگەر لە دڵیدا ئەم نیيەتەی ئامادەکرد، با دەستەکانی تا ئاستی سەرشانەکانی بەرز کاتەوە، دوای ئەوەی دەستەکانی کردبنەوە، کە ناولەپەکانی بگاتە ئاستی شانەکانی[١]، وە هەردوو پەنجە

---

(١) متفق عليه (البخاري)كتاب الأذان باب رفع اليدين في التكبيرة الأولى مع الإفتتاح، (٧٣٥)ومسلم، كتاب الصلاة، باب إستحباب رفع اليدين حذو المنكبين مع تكبيرة الإحرام.

گەورەکانیشی لە بەرامبەر نەرمەی گوێ کانیدابێت، بۆ ئەوەی تەواوی ئەو هەواڵانەی لەسەری هاتووە کۆیان بکاتەوەو جێ بەجێیان بکات، وە دەبێت ڕوی ناولەپ و پەنجە گەورەکانی لە ڕوگەبێت، وە پەنجەکانیشی بکاتەوەو نەیان نووقێنێت، وە لەو کاتەدا زۆر لە خۆی نەکات لە توند نووقاندن یان زۆر کردنەوەیان، بەڵکو سرووشتی خۆی چۆنە ئاوا بەرزیان بکاتەوە، چونکە لە هەواڵ و ئەثەر دا هاتووە: جارێك بینوقێنێت و جارێکیش بکرێتەوە[1]، کەواتە لە میانی هەردوو حاڵەتەکەدا بێت باشترە.

ئەگەر هەردوو دەستەکانی کە بەرزکردۆتەوە لەجێگەی خۆیانداجێگیر بوو، دەستدەکات بە دابەستنی نوێژەکەی، لەگەڵ بەردانەوەی دەستی و ئامادەکردنی نییەتەکەی، لەپاشان دەستی دادەنێت لەسەرناوکی و ژێر سنگی[2]،

---

(٣٩٠)من حديث ابن عمر باللفظ الأول، وأبو داود٧٣٧) من حديث وائل بن حجر، بإسناد ضعيف : إلى شحمة أذنيهِ، ولمسلم (٣٩١) من حديث مالك بن الحويرث، فروع أذنيه..

(١)قال العراقي ونَقل ضَمها الترمذي وقال: خطأ . وابن خزيمة في صحيحه(٢٣٣/١(٤٥٩) من حديث أبي هريرة. وللبيهقي في السنن الكبرى(٢٧/٢(٢١٥٠): **لم يفرج بين أصابعه ولم يضُمَّها ولم أجد التصريح بضَمِّ الأصابع اهـ وفي القوت: وقد رأيت بعض العلماء يفرقُ بين أصابعه في التكبير وينادى: أن ذلك معنى الخبر: أنه ﷺ كان إذا كبَّر ينشُر أصابعه نشراً.(٢٣٩) يُريدُ بهِ التَّفرق، وقد يُسمى التفرقة بثّاً ونشراً، لأن حقيقة النشر البسط، وقد قال الله تعالى: ﴿وزَرابيُّ مَبثُوثة﴾، فهذا هو التفرقة، وقال في معنى البثِّ كالفراش المبثُوث، ثُمَّ قال: في مثلهِ كأنهم جَراد مُنتَشِر. فإذا كان النشرُ مثلُ البَثِّ، وكان البثُّ هُو التَّفرقة كان قوله نشَر بمعنى فرَّق. وفي العوارف: ويضم الأصابع وإن نشرَها جاز. والضَّم أولى فإنَّه قيل النشر نشر الكف لا نشر الأصابع**. ينظر الإتحاف ٣.٣٧.

(٢)**ثم يضعُ اليَدين على ما فَوقَ السرَّة وتحت الصدر** . وبه قال أحمد في إحدى الروايتين، وقال أبو حنيفة: يجعلهما تحتَ السُّرَّة. وهو رواية أيضا عن أحمد، ويحكى

وه دەستی ڕاستی دەخاتە سەر دەستی چەپی، لەبەر ڕێزی دەستی ڕاست، بەوشێوەی کە هەڵگیراو بێت و، پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستی بەرداتەوەو بەسەر باسکیدا، وە بە هەردوو پەنجەی خونصور و بونصور(پەنجەتوتەو برای تووتە)با مەچەکی لای چەپی بگرێت، [١].

وایش ڕیوایەتکراوە لەگەڵ دەستبەرزکردنەوەکەدا (ئەڵلاهوئەکبەر)دەکات،

---

عن أبي إسحق المروزى قال الرافعى: لنا ما روى عن علي رضى الله عنه إنَّه فسَّر قوله تعالى: **﴿فصلِّ لِربِّك وانحَرْ﴾ بوضع اليُمنى على الشمال تحت النحر** .قال ابن الملقن رواه الدار قطني والبيهقي والحاكم وقال إنه أحسن ما يروى في تأويل الآية: قال ابن الملقن قلت: على عُلاته، ثم قال الرافعي ويروى: **أنَّ جبريل كذلك فسَّره للنبيِّ ﷺ** . قال ابن الملقن رواه البيهقي والحاكم باسناده اهـ . وقال صاحب القوت: بعد أن أورد حديث علي: وهذا موضع علم علي رضي الله عنه ولطيف معرفتِه لان تحتَ الصدر عِرقاً يُقال له الناحر، لا يعلمُهُ إلاَّ العُلماء فاشتقَّ قوله تعالى ﴿وانحَرْ﴾ من لفظ الناحر وهو هذا العرق كما يقال دمغ أي أصاب الدماغ، ولم يحمله نحر البدن، لانه ذكر في الصلاة، ومن الناس من يظن أن اشتقاقَه مِن النَّحر والنَّحرُ تحتَ الحُلقوم عندَ مُلتقَى التراقي، واليد لا توضع هُناك، ولكنَّ من فسَّره على مَعنى وانحَر القبلةَ بِنَحْرِكَ، اى إستقبلها بنَحرِكَ فاشتِقاقُه حينئذ من النَّحرِ اهـ

(١)قال الرافعى لنا ما روى أنَّه ﷺ قال: **ثلاثٌ من سُنَن الرسلين: تعجيل الفطر وتأخير السحور ووضع اليمنى على اليسرى في الصلاة**. قال ابن الملقن رواه ابن حبان في صحيحه من حديث ابن عباس. قال تلميذهُ الحافظ وكذا الطبراني في الاوسط كلاهما من رواية ابن وهب عن عمرو بن الحرث انه سمع عطاء يحدث عن ابن عباس سمعت رسول الله ﷺ يقول: **(إنا معشر الانبياء أمرنا أن نؤخر سحورنا ونعَجِّل فطُورنا وان نَمسَك بأيمانِنا على شمائِلنا في صلاتنا)**، وله شاهد من حديث ابن عمر رواه العقيلي وضعَّفه ومن حديث حذيفة أخرجه الدار قطني في الافراد، وفي مصنف إبن أبي شيبة من حديث أبي الدرداء موقوفاً: **من أخلاق النبيِّين وضعُ اليمين على الشمال في الصلاة** اهـ

هەروەها لەگەڵ ڕاوەستانی دەستەکانی لە حەنای گوێی داوە لەکاتی بەردانەوەی دەستی دا، هەرکامێکیان بکەیت ئاساییەو دابەستنی نوێژەکەت پەسەندە. وەمن وای دەبێنم وتنی تەکبیرەی نوێژدابەستن شیاوترە لەکاتی بەردانەوەی دەستەکانی بۆ خوارەوە، چونکە ئەمە گرێبەستێکی حەقیقییە واتای چەسپاندن و جێگیرکردنی عەزەمەت و کیبریایە بۆ پەروەردگار. [1].

وە شێوازی گرێبەستیش هەروایە، دەستێك دەخرێتە ناو دەستەکەی ترەوە وەك دامەزراندنی عەقدەکە، بنەمای دامەزراندنەکەیشی کردنەوەی دەستەکانیەتی، وە کۆتاییەکەیشی دەست خستنەناو دەستە، (لە دوای دەست بەردانی هەردوکیانیش گرێبەست و عەقدەکە کۆتایی دێت و دادەمەزرێت)، سەرەتای دەست پێکردنی نیەتەکەش لە ئەلفی ئەڵلاهەوە یە، کۆتاکەیشی ڕێ کەیە، کەواتە بەم شێوەیە کرداری دەست دانانەکە و گرێ بەست و عەقدی (الله أكبر)ە کە بەرامبەرو هاوتەریبی یەك دەبن، وە دەست بەرزکردنەوەکەش

---

(١)ومراده أن يبتدئ الرفع مع إبتداء التكبير رواه البخاري(٧٣٨) من حديث ابن عمر:**كان إذا قام الى الصلاة يرفع يَديه حين يكبر**، وقد تقدم ذكره قربيا ولابى داود(٧٢٣) من حديث وائل بن حجر يرفع يديه مع التكبير(و) روى ايضا (**مع استقرارها**) قال العراقي أي مرفوعتين رواه مسلم (٣٩٠)من حديث ابن عمر: **(كان إذا قام الى الصلاة رفع يديه حتى يكونا حذو منكبيه ثم كبرٍّ)** زاد أبو داود(٧٢٢) وهما كذلك، وقال الرافعي في تقرير هذا القول أن يرفع غير مكبر ويداه قارتان ثم يرسلهما فيكون التكبير بين الرفع والارسال، ويروى ذلك عن ابن عمر مرفوعا (و) روى ايضا ابتداؤه (مع) ابتداء (الارسال) وانتهاؤه مع انتهائه رواه ابو داود(٧٣٠) من حديث أبي حميد الساعدي: **(كان إذا قام إلى الصلاة يرفع يديه حتى يحاذي بهما منكبيه، ثم كبرٍ حتى يقر كل عظم في موضعه معتدلا)**، قال ابن الصلاح فى مشكل الوسيط فكلمة حتى التي هي للغاية تدل بالمعنى على ماذكره، أي من ابتداء التكبيأر مع الإرسال، فهذه ثلاثة أَقوال ذكرها المصنف، ونقل الرافعي عن التهذيب **(أنَّ الاصحَّ هوَ الرَّفع مَع الإستقرارِ)** ،الإتحاف ٣٩/٣.

وەك دەستپێكێكی تایبەتییە بۆ ئەم سەرەتایە.

لەپاشان دەبێت بزانێت؛

كە نابێت لە كاتی نوێژدابەستندا دەستی بەرەو پێشەوە هەڵبدات، وە نابێت بەرەو پشتەوەو لای شانەكانی بباتەوە، وە كاتێكیش لە نییەتەكەی تەواو دەبێت، نابێت دەستەكانی هەڵوەرێنێت بەلای ڕاست و چەپی دا، بەڵكو دەبێت بە نەرمی و هێمنی دایانبەزێنێت بەلای خۆیدا و، لای ڕاستی پێشتر بخات و، بیخاتەوە سەر دەستی چەپی، وە لە هەندێك ڕیوایەتی تردا هاتووە كە پێغەمبەری خودا ﷺ هەركاتێك ئەڵلاهوئەكبەری بكردایە دەستەكانی بەردەدایەوە، كە دەستیشی دەكرد بە خوێندنی فاتیحە، دەستی ڕاستی دەخستە ناو چەپی، ئەگەر ئەم فەرموودە درووست بێت، ئەوە ئەم ڕایە بەهێز و لە پێشترە كە جێ بەجێبكرێت،[(١)]،

بەڵام شێوەی تەكبیر و نوێژدابەستنەكەی:

دەبێت هێی ئەڵلاهەكە بۆری پێ بدات،(اللهُ) بۆرێكی سووك، بێ ئەوەی زیادەڕەوی تێدا بكات، نابێت لە میانی پیتی هائو ئەلفەكەدا واوێك درووست بكات، ئەوە زیادەڕەوی و موبالەغەی پێدەڵێن، وە نابێت لە میانی بێی ئەكبەر، لەگەڵ پیتی ڕێ كەیدا درێژ بكرێتەوە، وەك ئەوەی ئەلفێكی زیاد كردبێت، نابێت بڵێت: ئەكبار، وە پیتی ڕێ بە زەننە و مەجزوومی دەیخوێنێتەوە، نەك بۆری پێ بدەیت، ئەمەی كە باسمان كرد شێوەی دابەستنی نوێژ و ئەو باسانەبوو كە لەگەڵیدابوون.

---

(١)اخرجه الطبراني في المعجم الكبير (٧٤/٢٠)(١٣٩)من حديث معاذ بن جبل أن رسول الله ﷺ **إذا كان في صلاة رفع يديه حيال أُذنيه فاذا كبر أرسلهما ثم سَكت وربما رأيته يضع يمينه على يساره**، الحديث الإتحاف /٣٩/٣.

# خوێندنی فاتیحه

دوای نیيەتەکەی، یەکسەر سوننەتە دۆعای کردنەوەی نوێژ بخوێنێت، وە جوانتر وایە دوای : (ئەڵلاهوئەکبەر) بڵێت: **اللهُ أَكبَرُ كبيراً، والحمدُ للهِ كثيراً وسُبحانَ اللهِ بُكرةً وأَصيلا**،[1] لە پاشاندا دەڵێت:

**(( وَجَّهتُ وَجهيَ للذي فَطرَ السَّماوات والأرض حَنيفاً مسلِماً وما أنا من المُشرِكين، إنَّ صَلاتى وَنُسُكي ومَحيايَ ومَماتِيَ للهِ ربِّ العالَمين، لاشرِكَ لَهُ وبذلِكَ أُمِرتُ وأَنا منَ المُسلِمين))**[2].

واتە: ئەوامن ڕوی خۆمم کردە ئەو زاتەی کە ئەرز و ئاسمانەکانی درووست

---

(١) رواه مسلم/٦٠١. و النووي في الأذكار، إعلم إنه جاءت أحاديث كثيرة يقتضي مجموعها أن يقول الله اكبر كبيرا الخ قال الحافظ جميع ما ذكر من ثلاثة أحاديث أخرجها مسلم وأخرج البخاري الثالث منها فقط الأول حديث ابن عمر قال: بينما نحن نُصلِّي مع النبي ﷺ إذ قال رجل من القوم: **الله اكبر كبيرا والحمد لله كثيرا وسبحان الله بكرة وأصيلا فلما سلَّم النبي ﷺ من صلاتهِ قال من القائل كذا وكذا؟ فقال رجلٌ من القوم أنا يا رسول الله فقال لقد رأيت أبواب السماء قد فُتحت لَها. قال ابن عمر: فما تركت منذ سمعت من رسول الله ﷺ** الإتحاف ٤٢/٣.

(٢)الثاني حديث على بن أبي طالب وهو الذي أورده الرافعي قال (كان رسول الله ﷺ **إذا استفتح الصلاة قال: وجهت وجهي للذي فطر السموات والأرض حنيفا وما أنا من المشركين. إن صلاتي ونسكي ومحياي ومَماتي لله ربِّ العالمين لا شريك له وبذلك أُمِرتُ وأنا أوَّل المسلمين. اللهُم أنت الله لا اله إلا أنت، أنت ربي وأنا عبدك ظلمت نفسي واعترفت بذنبي، فاغفر لي ذنوبي جميعا، لا يغفر الذنوب إلا أنت، وأهدني لأحسن الأخلاق لا يهدي لأحسنها إلا أنت، واصرف عنِّي سيئها، لا يصرف عني سيِّئها إلا أنت، لبيك وسعديك والخير كله في يديك، والشرُّ ليس إليك، تباركت وتعاليت، أستغفرك وأتوب إليك)، أخرجه مسلم**.الإتحاف ٤٣/٣.

کردووە، موسوڵمانێتیم هەڵبژاردووەو لەڕێی باطیل و نارەوا لامداوەو، هەرگیز من لە وکەسانە نیم کە شەریك بۆ خودا بڕیاردەدەن، نوێژو بەندایەتی و ژیان و مردنم هەمووی بۆ خودایەو، بۆلای خودا دەگەڕێتەوە، خودا بێ شەریکە و بەم شێوەیە فەرمانم پێکراوە، وە من یەکەم کەسێکم کە بڕوام هێناوە و لەگرۆی موسوڵمانانم. لە پاشدا دەڵێت:

**((سَبحانَكَ اللَّهُم وبِحَمدِكَ، وتَبارَكَ اسمُكَ وتَعالَى جَدُّكَ، وَجَلَّ ثَناءُكَ، ولاَ إلهَ غَيرُك))**[1]،

پاکوخاوێنی و مونەززەهی بۆ خودایە و، سەناو ستایش و بەرزی و بڵندی شایستەی ناوی پیرۆزی تۆیە، حەمد و سەنای تۆ لە هەمووشتێك دیارترەو، هیچ پەرستراوێك بوونی هەبێت نییە جگە لە زاتی تۆ.

(بەم شێوەیە بیانڵێت) بۆ ئەوەی نزاو دۆعاکەی کۆکەرەوەی هەموو ڕیوایەت و فەرموودەکان بێت[2]، وەئەگەر لە پشتی ئیمامێکەوە نوێژبکات، ئەوا با کورتی بکاتەوە، ئەگەر ئیمام بێدەنگییەکی زۆری نەبێت کە فاتیحەی تێدا بخوێنێت.

لە پاشان بڵێت:

**أعوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم**، پەنا دەگرم بە خودا لە شەیتانی ڕەجم

---

(١)روي ذلك من حديث أبي الجوزاء عن عائشة رضي الله عنها قالت كان رسول الله ﷺ إذا استفتح الصلاة قال: (**سبحانكَ اللهم وبحمدِك وتَبارك اسمُك وتعالى جدُّك ولا إله غيرك**) أخرجه الحاكم عن الأصم عن العباس الدوري وأبو داود عن حسين بن عيسى كلاهما عن طلق بن غانم عن عبد السلام بن حرب عن بديل بن ميسرة عن أبي الجوزاء قال الحاكم وهو صحيح على شرط الشيخين.الإتحاف/٣/٤٣ورواه أبوداوود(٧٧٥) والترمذي(٢٤٢)، والنسائي(١٣٢/٢)وهو عند مسلم موقوفا على عمر (رضي الله عنه) .

(٢) بنوارە قوت القلوب/٢/٩٤، والأذكار للنووى/٩٩.

كراوو نەفرەت لێ كراو. لە پاشان سوورەی فاتیحە بخوێنێت، بە تەواوی پیت و شەددەو گرتن و بزوێننەرەكانیەوە، وە دەبێت كۆشش بكات تا لە میانی پیتی **(ضادو ظاد)** دا جیاوازیان بخات، وەك خۆیان بیانخوێنێتەوە، لە دواییدا كە فاتیحەی تەواو كرد بڵێت: آمیـن، وە دەبێت درێژی بكاتەوە، وە نابێت وشەی (ئامین) بلكێنێت بە وشەی**(ولاَ الضَّالِينَ)**ەوە.[1] ،

وە لە نوێژەكانی بەیانیان و خۆرئاواو خەوتنانەوە، بە دەنگی بەرز بیانخوێنێت[2]، مەگەر بۆ خۆی لە دوای ئیمامەوە بێت، وە دەبێت بە دەنگی بەرز ئامین بكات.

لە پاشان با سوورەتێك بخوێنێت، یان بە ئەندازەی سێ ئایەت یان زیاتر لە قورئانی پیرۆز، با لە كۆتایی سوورەتەكە لێ بێتەوە، ئیمجا (اللّهُ أَكبر)ی بەرەو ركوع بكات، واتە:

با سوورەت و ركووعەكە تێكەڵ بەیەك نەبن، بە ئەندازەی وتنی سوبحانەڵلایەك بەینیان هەبێت.

وە لە بەیانیاندا لە سوورەتە درێژەكان بخوێنێت،( وەك حەوت سوورەتە درێژەكەو، هەندێكیش دەڵێن لە (حجرات) ەوە.[3] ، وە لە نوێژی خۆرئاوادا

---

(١) واتە دوای وەستانێكی كەم ئیمجا (ئامین) بكات بۆ ئەوەی بزانرێت كە ئامین بەشێك نییە لە (ولا الضالين). بنوارە: الأذكار/١٠٨.

(٢) واتە: لە دووركاتی مەغریب و عیشادا و لە هەردوو ركاتی بەیانیاندا، ئیتر یەكسانە ئیمام بێت یان لەدوای ئیمامەوە بێت. بنوارە: الخلاصة/١٠٠.

(٣)واختلف في طوال المفصل: فقيل: **هو السبع السابع**، وقيل هو عند الأكثر من الحجرات وقيل من سورة محمد ﷺ، أو من الفتح، أو من ق، إلى البروج، وأوساطه منها إلى: لم يكن، وقصاره منها إلى أخره، وقيل طِوالُه من الحجرات إلى عَبسَ، وأوساطه من كُوِّرت إلى الضُّحى والباقي، فصار هكذا في كتب أصحابنا، والأصل فيه ما

کورتەکانی بخوێنێت، وە لە نیوەڕۆو عەسر و عیشادا ئەو سورەتانە بخوێنێت وەك (**وَالسَّاءِ ذاتِ البُروج**) و نزیکەکانی[1].

بەیانیانیش لە سەفەردا (**قُل ياأَيُّها الكافِرونَ**)ە و (**قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد**) هەروەها لە نوێژی (ئیستیخارە و دووڕکاتی پێش مەغریب)، سوننەتی بەرەبەیان و طەواف و دیاری و ڕێزی مزگەوت (تحية المسجد)و ،لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا بە پێوەدەبێت و، دەستی لەسەردەستی دەبێت، وەك چۆن لە سەرەتای باسی نوێژدا ڕونمانکردەوە.

---

روى عبد الرازق في مصنفه إن عمر بن الخطاب كتب إلى أبي موسى الأشعري أن اقرا في المغرب بقصار المفصل وفي العشاء بوسط المفصل وفي الصبح بطوال المفصل

(١) وأمثالها من السور مثل: **والليل إذا يغشى، وسبح اسم ربك الأعلى، والضحى، وإذا السماء انفطرت، ونحو ذلك، فان النبي ﷺ سماها معها في قصة تطويل معاذ الصلاة** فأما: والليل وسبح فهي متفق عليها وإما والضحى فهي عند مسلم وكذا عنده ذكر أقرا باسم ربك، وإما إذا السماء انفطرت فعند النسائي، ولأحمد من حديث أبي هريرة رفعه: **أنَّه كان يقرأ في العشاء الأخيرة : والسماء ذات البروج والسماء والطارق**، وفي الصحيحين من حديث البراء أنه قرأ في العشاء بالتين والزيتون، وفي كون هذه مع سورة إقرأ من أوساط المفصل إختلاف، ولذا قيده بعضهم بالسفر، ونص الرافعي: **ويستحب أن يقرا في الصبح بطوال المفصل ويقرا في الظهر بما يقرب من القراءة في الصبح وفي العصر والعشاء بأوساط المفصل وفي المغرب بقصاره** ، وعبارة المنهاج للنووي: ، قال الخطيب في شرحه:

ظاهر كلام المصنف التسوية بين الصبح والظهر، لكن المستحبَّ أن يقرأَ في الظهر ما يقرب من الطوال كما في الروضة كأصلها، قلت: وفي كتُب أصحابنا ما يُوافق ما في المنهاج وهو التسوية بين الصُّبح والظُّهر

# (ڕکوع )کڕنووش و پەیوەستەکانی

لە پاشان کڕنووش دەبات ، لەگەڵ چاودێری ئەم خاڵانەدا:

دەبێت بۆ ڕکوع (الله أکبر) بکات، وە دەبێت لەگەڵ تەکبیر کردندا دەستەکانی بەرزکاتەوە،[1] وە دەبێت درێژی بکاتەوە تا دەگاتە کۆتایی ڕکوعەکەی، وە ناولەپەکانی بخاتە سەر ئەژنۆکانی و، پەنجەکانی بکاتەوە بەسەر لاقیدا و، ڕویان لە قیبلە بکات، وە ئەژنۆکانی ڕاست بکاتەوە و نەیانچەمێنێتەوە، وە دەبێت پشتی ڕیك و ڕاست بێت، هەروەها مل و سەریشی لەگەڵ پشتیدا بەڕاستی و پان و بەرین دەربکەوێت، نابێت سەر و ملی نزمتر یان بەرزتر بێت لە پشتی[2]،

وە ئەبێت هەردوو ئانیشکی دووربخاتەوە لە تەنیشتی،[3]، بەڵام ئافرەت ئانیشکەکانی دەلکێنێت بە تەنیشتی خۆیەوە[1]

---

(١) کما ورد عن ابن عمر رضي الله عنهما أن النبي ﷺ كان يرفَع يدَيه حَذوَ مِنكَبيه إذا كبَّر وإذا ركع، وإذا رفع رأسه من الركوع. قلت: أخرجَه الشَّيخان. قال العراقي في شرح التقريب ورفع اليدين في المواطن الثلاثة قال به أكثر العُلماء من السَّلف والخلَف، قال ابن المُنذر روينا ذلك عن ابن عمر وابن عباس وأبي سعيد الخدري وابن الزبير و أنس بن مالك وقال الحسن البصري **(كان أصحاب رسول الله ﷺ يرفعون أيديَهم إذا كبروا وإذا ركَعُوا وإذا رفعوا رؤسَهم من الرُّكوع كانها المراويح)**، وروى لكَ عن جَماعة من التابعين ومَن بعدَهم ومن قول الليث ابن سعد والشافعي واحمد واسحق وأبي نور وحكاه ابن وهب عن مالك اهـ الإتحاف٣/٥٨.

(٢)قال الرافعي ويروى عن رسول الله ﷺ **أنه نهى أن يدبج الرجل في الركوع كما يدبج الحمار** واتە پشتی پان کاتەوە و سەری دانەوێنێت و نزمتریش بێت، قلت رواه الدارقطني من حديث على وابي موسى وابي سعيد باسناد ضعيف الإتحاف٣/٥٩.

(٣)رواه أبو داود في حديث أبي حميد ولفظه: **(ووتر يديه يتجافى عن جنبيه)** وللبخاري عن عبد الله بن بحينه كان إذا ركع فرج بيد يديه حتى يبدو إبطاه ،الإتحاف٣/٥٩.

وه دەبێ بڵێت: (**سُبحانَ رَبِّيَ العَظيم**) سێ جار، وه ئەگەر پێشنوێژ نەبوو تا حەوتجار و دەجاریش بیخوێنێت هەر باشی کردووه.

لەپاشان لە رکووعەوه هەڵدەستێتەوه و ڕادەوەستێت، وه دەستەکانی بەرز دەکاتەوەو دەڵێت: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ**) ئەوەی ستایشی خودا دەکات بیبیستێت و وەربیگرێت ، کاتێك بە تەواوی ڕاست بوویەوه بڵێت:

**(رَبَّنا لكَ الحَمدُ[2]، مِلْءُ السَّماواتِ وَمِلْءُ الأرضِ ومِلْءُ ما شِئتَ مِن شيْءٍ بَعدُ)** خودایە سەناو ستایش تەنها بۆ تۆیە، پڕی ئاسمانەکان و زەمین و شتەکانی تریش، وەك عەرش و کورسی و ئەوانی تر، وەستانەکەی ئەوەند درێژ نەکاتەوه، مەگەر نوێژی (صلاة التسبیح) بێت، یان خۆرگیران و مانگ گیران و نوێژی بەیانیان، وه لە نوێژی بەیانیاندا لە ڕاوەستانی دوای ڕکوعی ڕکاتی دووهەم، بەوکەلیمە پڕبەرەکەتانەی کە لە ئەسەرەوه وەرگیراون با دۆعای قنووت بخوێنێت[3].

---

(١)وروى أبو داود في المراسيل عن يزيد بن أبي حبيب إنه ﷺ مر على امراتين تصليان فقال إذا سجدتما فضما بعض اللحم إلى الأرض. نفس المصدر.

(٢)أخرجه مسلم من حديث عبد الله ابن أبي أَوْفَىَ قال: كان رسول الله ﷺ إذا رفع رأسه من الركوع قال سمع الله لمن حمده اللهم ربنا لك الحمد (ملء السموات ..الخ) الإتحاف ٦١/٣.

(٣)روى الحاكم في المستدرك من طريق عبد الله بن سعيد المقبري عن ابيه عن أبي هريرة قال: ( **كان رسول الله ﷺ إذا رفع رأسه من الركوع في صلاة الصبح في الركعة الثانية رفع يديه فيدعو بهذا الدعاء: اللهم اهدني فيمن هديت وعافني فيمن عافيت وتولني فيمن توليت وبارك لي فيما أعطيت وقني شر ما قضيت إنك تقضي ولا يقضى عليك وإنه لا يذل من واليت، تباركت ربنا وتعاليت**). قال الحاكم صحيح ، الإتحاف٦٣/٣. ورواه البيهقي في السنن الكبرى،٢٠٩/٢، وهو عند أصحاب السنن

# سەجدە بردن

لەپاشان بەرەو خواردەبێتەوەو بە (الله أكبر)ەوە سەجدە دەبات، هەردوو ئەژنۆی دەخاتە سەر زەوی، هەروەها تەختی تەوێڵی و سەری لووتی و هەردوو ناولەپی بەئاشكرا دەیانخاتە سەر زەوی، وە لەكاتی بەرەو خواربوونیدا (الله أكبر)بكات، وە جگە لە ڕكووع لە سەجدەو شوێنەكانی تردا دەستی بەرز ناكاتەوە، وە دەبێت یەكەم جێگا بكەوێتە سەر زەوی ئەژنۆكانی بێت،[1]، لەپاشان دەستەكانی دابنێت. لە دواییشدا ڕوخساری، لەپاشان تەوێڵی و لووتی دەخاتە سەر زەوی، وە دەبێت ئانیشكەكانی لە تەنیشتەكانی دووربخاتەوە، بەڵام ئافرەت واناكات، بەڵكو دەبێت خۆی كۆكاتەوە، وە دەبێت پێكانی لەیەك جودابكاتەوەو نێوانیان هەبێت، بەڵام ئافرەت دەیانلكێنێت بەیەكەوە، وە دەبێت لەسوجدەكەیدا سكی لە ڕانی بەرزكاتەوەو هەردووڕانیشی لەیەك دووربخاتەوە، بەڵام نابێت ئافرەت بەم شێوەبێت، دەبێت خۆی كۆبكاتەوەو ئاسایی بێت تا هیچ كوێیەكی بەدیار نەبێت[2]،

دەبێت دەستەكانی بەرامبەر شانەكانی لەسەر زەوی دابنێت، وە پەنجەكانی دەستی نەكاتەوە، بەڵكو بیان لكێنێت بەیەكەوەو، پەنجەگەورەكەیشی لە پاڵ

---

مخصوصة بالوتر_اللهم اهدني فيمن هديتوفي آخره (وصلى الله على النبي محمد وآله.) أنظر: العزيز شرح الوجيز ٥١٦/١.

(١)عن وائل بن حجر قال كان رسول الله ﷺ (**إذا سجد وضع ركبتيه قبل يديه فإذا نهض رفع يديه قبل ركبتيه**) قلت: أخرجه أصحاب السنن الاربعه وابن خزيمه وابن السكن في صحاحهم، الإتحاف ٦٧/٣-٦٨.

(٢)روى (أن رسول الله ﷺ **كان إذا سجد هوى في سجوده** )قلت: رواه أحمد من حديث البراء بلفظ: (**كان إذا سجد بسط كفيه ورفع عجيزته وهوى**)،الإتحاف٦٨/٣،

ئەواندا بێت، وە ئەگەر پەنجەگەورەکەی دووریش بێت لە وانەوە قەیناکە.

وە پێویستە باسکەکانی ڕانەخات لەسەر زەویو وەك چۆن(صەگ) ڕایان دەخات و خۆی لەسەریان ڕادەگرێت، ئەوە نەهی لێکراوە، بەڵکو دەبێت باسکەکانی بەرزکاتەوە[1]،وە دەبێت بڵێت:(**سُبحانَ رَبِّيَ الأَعلَى**) سێ جار، ئەگەر زیادی بکات ئەوە چاکی کردووە، مەگەر ئیمام بێت. (چونکە ئیمام پێویستە ئاگای لە تێکرای خەڵکەکە بێت، کە پیاوی پیر و نەخۆشیشیان تێدایە).

لە پاشان لە سەجدە سەر بەرز دەکاتەوە، ماوەیەك لە میانی هەردوو سەجدەکەدا بە ئارامی دادەنیشێت، بە دانیشتن خۆی ڕێك دەخاتەوەو، لەگەڵ سەربەرزکردنەوەکەیدا (**الله أكبر**)یش دەکات، وە لەسەر پێی چەپی دادەنیشێت، پێی ڕاستی بەرزکاتەوە، دەستەکانیشی دەخاتە سەر ڕانی، پەنجەکانیشی هەموو بە بڵاوی دایاندەنێت، ئەوەی پێ نەسپێرراوە کە پەنجەکانی بلکێنێت بەیەکەوە، یان لەیەکیان جودا بکاتەوە، وە دەڵێت: ((**رَبِّ اغفِر لي، وارحَمني، وارزُقني، واهدني، واجبُرني، وعافني، واعفُ عنِّي**))[2]، خوایە لێم خۆشببەو بەزەییت بێتەوە پیامدا و، ڕینومایم بکە، کەموکەسرییەکانم بۆ بپژێرەو، لەش ساغم بکەو، لێیشم خۆشببە، نابێت ئەم دانیشتنی میانی دووسەجدەکە زۆر درێژبێت، مەگەر لە (صلاة التسبیح)، لەپاشان بە هەمان شێوە سەجدەی دووهەم ببات، لەپاشان لێی هەڵسێتەوەو

---

(١)**رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي والنسائي من حديث شعبه عن قتاده عن أنس رفعه: اعتدلوا في السجود ولا يبسط أحدكم ذراعيه انبساط الكلب، أى فان المنبسط يشبه الكسالى ويشعر حالَه بالتهاون، لكن لو تركه صحت صلاته مع ارتكابه النهي وفي حديث أبي حميد عند البخاري فاذا سجد وضع يديه غير مفترش ولا قابضهما الإتحاف** ٦٨/٣.

(٢) رواه أبوداوود(٨٥٠)، والترمذى، (٢٨٢)، وابن ماجه، (٨٩٨)،

سووکە دانیشتنێك بکات، لەو دانیشتنانەی تەحییاتی لەدواوە نییە، لە پاشان هەڵسێتەوەو، دەستەکانی بخاتە سەر زەوی و، لەکاتی هەڵسانەوەیشیدا نابێت یەکێ لە پێکانی پێشتر بەرزکاتەوە، وە (أَللهُ أَكبَرُ)ەکەی درێژ دەکاتەوە، لەنیوەی یەکەمی هەڵسانەوەی ناو سەجدەوە، تا نیوەی دووهەمی، کە لە وەستانی تەواو نزیك دەبێتەوە(١)، بەو شێوەی لە سەجدەوە کە دەگاتە حاڵەتی دانیشتن ،گەیشتبێتە پیتی(هاء)ی الله ، وە کە دەستەکانی دەخاتە سەر زەوی بۆ هەڵستانەوە، گەیشتبێتە پیتی (کاف) أكبر، وە کە دەگاتە نیوەی دووهەمی دوای ڕکووع، تا هەستانەوەی تەواو، بگاتە پیتی(ڕی)ی ئەکبەرەکەوە، واتە وتنی وشەی (أکبر) بکەوێتە نیوەی میانی (ڕکووع و قیام)، بۆ ئەوەی تا هەڵسانەوەی تەواو، جێگەیەك چۆڵ نەبێت لە زیکر و تەعزیمی خوداوە ﷻ . ئەمەش مانەی بەگەورەزانینی خودای زیاتر تێدا بەرجەستە دەبێت، وە دەبێت ڕکاتی دووهەمیش بە هەمان شێوەبێت، بەئاداب و سوننەت و شێوەکانیەوە، وە دیسان دەستپێکی بە (**أعوذبالله من الشيطان الرجيم**) بکاتەوە.

---

(١) واتە: لەمیانی سەجدەو ڕکووعدا (أَللهُ أَكبَرُ) درێژدەکاتەوە تا دەگاتە میانی ڕکووع و هەڵسانەوەی تەواو، واتە: لە سەرەتای هەستانەوە تەکبیرەکەی درێژدەکاتەوە و تا دەگاتە دانیشتنی تەواو دەبێت گەیشتبێتە پیتی هێی الله، وە کە دەگاتە ئەوەی دەستەکانی دابنێت لەسەر زەوی و بەرزبێتەوە ئەوە کافی (أکبر)دەڵێت و لەبەرزبوونەوەیدا درێژی دەکاتەوە، تا نزیکی وەستانی تەواو، ئەویش بە پیتی ڕێی تەکبیرەکەی دەگات. وە باشترین ڕای درووست ئەوەیە هەر لە بەرزبوونەوەی سەجدەوە دەست بە (أَللهُ أَكبَرُ) دەکات تاکۆتاییەکی بەردەوام دەبێت. وأصحهما انه يرفع رأسه مكبرا لما روى: **أنه ﷺ كان يكبر في كل خفض ورفع قلت: قال الحافظ هذا لادليل فيه على أنه يمد التكبير في جلوسه إلى أن يقوم ويحتاج دعوى إستحباب مده إلى دليل والأصل خلافه** اهـ الإتحاف ٧٤/٣.

# خوێندنی تەحییات

لەپاشان لەدوای تەواو کردنی سەجدەکانی ڕکاتی دووهەم، دادەنیشێت بۆ خوێندنی (تەحییات)ی یەکەم، لە پاش ئەوە صلاوات لە سەر پێغەمبەر ﷺ و ئال وبەیتی لێدەدات، وە دەستی ڕاستی دەخاتە سەر ڕانی ڕاستی و، هەموو پەنجەکانی دەستی ڕاستی دەنووقێنێت، تەنها پەنجەی شایەتومانی نەبێت، وە تەنها بەو پەنجەی دەستی ڕاستی هێمای پێ دەکات، کە داگاتە (إِلاَّ اللهُ)پەنجەی شەهادەتی بەرزدەکاتەوە، نەك لەکاتی وتنی: (لا إِلهَ)دا.[1]،

---

(١) واتە: پەنجەی شەهادەتیشی درێژدەکاتەوە تا دەگاتە نزیك ئەژنۆی، وە لەکاتی شەهادەتهێنانەکەدا بەرزی دەکاتەوە، وە ڕووەو قیبلە دایدەنێت و تۆزێك شۆڕێشی دەکاتەوە. وە سوننەتە تەنها بنوارێتە پەنجەکەی. وەك باسی دێت، وە تا هەڵدەستێتەوە یان سەلامدەداتەوە بەبەرزکراوەیی ڕایدەگرێت و مەبەستیشی بڕیادان و شایەتی دانە بۆ تاکو تەنهایی خودا، تا لەو یەکتاپەرستییەدا لە زات و صیفات و کرداردا باوەڕی دڵی خۆیشی کۆبکاتەوەو وەك سەرچاوەکان ڕوونیان کردۆتەوە، عَنِ ابنِ عُمر (رضي الله عنهما) ((**كانَ النبيُّ إذا قَعَدَ للتَّشَهُّدِ وَضَعَ يَدَهُ اليُسرى على رُكبَتِهِ اليُسرى، واليُمنى على اليُمنى، وعَقَدَ ثَلاثاً وخَمسينَ، وأشارَ بإصبُعِهِ السَّبَّابَةَ**)) رواه مسلم، وأصحاب السنن، واتە پێغەمبەری خودا ﷺ کە بۆ تەحیات دادەنیشت دەستی چەپی لەسەر ئەژنۆی چەپی دادەناو، ڕاستیشی لە سەر ئەژنۆی ڕاستی، پەنجەکانیشی وەك ژمێریاری پەنجاو سێ دەنوقاندو، بەپەنجە شەهادەتیشی ئاماژەی بۆ یەکناسینی خودا دەکرد، وە لەو ماوەدا کە پەنجەکەی بەرزدەکاتەوە ئیتر نایجوڵێنێت، وە جوڵاندنی مەکروهو ناپەسەندە، بەڵکو لە فەرموودەیەکی مەزهەبدا هاتووە کە جوڵاندنی پەنجەی شەهادەتی دوای بەرزکردنەوەی حەرامە و نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، هەروەك لە (مەجموع ی نەوەوی و توحفەی ئیبن و حەجەر)دا هاتووە، عَنِ ابن الزبير (رضي الله عنهما) **أَنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يُشيرُ بالسَّبَّابَةِ ولاَ يُحَرِّكُها**، رواه أبوداود بإسناد

صحيح، ورواه أحمدوانسائي وابن حبّان في صحيه، وصَحَّحهُ البيهقيُّ ) كه پێغەمبەری خودا ﷺ ئاماژەی به پەنجەی شەهادەتی كردووه و ئیتر نەیدەجولاند، ئەوەش بزانه كه له فەرموودەیەكی درووستدا هاتووه: (عَن وائلِ ابن جحر (رضي الله عنه) **أنَّ النبيَّ ﷺ رَفعَ أصبعهُ فَرَأيتهُ يُحَرِّكُها يَدعو بِها**) رواه ابن خزيمة والبيهقي وغيره بإسناد صحيح، واته: پێغەمبەری خودا ﷺ پەنجەی شەهادەتی بەرزدەكردەوه و دەمبینی دەیجولاندو دۆعای پێدەكرد، ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێت: دەگونجێت مەبەستی بەم جولاندنەی تەنها ئیشارەت و ئاماژەپێكردنەكەبێت، نەك جولاندنی بەردەوام، بۆ ئەوەی (تەناقوض) و دژایەتی نەبێت لەگەڵ فەرموودە درووستەكەی تر ئەوەی (ئیبن و زوبەیر) ڕیوایەتی كردووه، وه دەبێت هەردوو فەرموودەكه پێك بگەنەوه و تەوافوق بخرێته میانیانەوه، هەروەها حەدیسەكەی عەبدوڵلای كوڕی عومەر (رضي الله عنهما) (**تَحريكُ الأُصبُعِ مَذعَرةٌ للشَّيطان**) جولاندنی پەنجه ترساندنه بۆ شەیتان، ئیمامی نەوەوی (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەم حەدیسه بێهێزەو صەحیح نییه، وەك له (المجموع)دا به درێژی ڕونی كردۆتەوه، هەروەها ئەو حەدیسەش كه دەفەرموێت: **لَهيَ أشَدُّ على الشَّيطانِ مِن الحَديد، يَعني السَّبَّابة**) پەنجەی شەهادەت له ئاسن بەهێزتره له دژی شەیتان، مەبەست به وشەی: (لَهِيَ) خودی پەنجەكەیه، هەروەك له كۆتایی فەرموودەكەدا به: (السَبَّابة) ڕاڤه كراوه، كەوابوو: لێرەشدا مەبەست جولاندن نییه؟ چونكه وشەی: (هِيَ) بۆ (مؤنَّثُ)ێ یینه بەكاردێت و (تحريك)یش وشەیەكی(موزەككەر)ەو نێرینەیه. بنواره : ڕوناكی رب العلمین، ڕونكردنەوەی منهاج الطالبین،بەرگی یەكەم ل/٢٣٢-٢٣٣.شرح و تحقيق عبالله هرتلی چاپی دەیەم ناشر مؤسسه انتشارات حسينى أصيل. هەروەها پێویسته ئەوەش بڵێین: كه ئیمامی نەوەوی بۆ تەوفیق و یەكخستنی ئەو دوو حەدیسه كه تەناقوض ڕونەدات له میانیانداو هەردوكیشیان صەحیحن، فەرموویەتی: لەبەر ئەوەی كه ڕیوایەتی حەدیسەكەی ئیبن و خوزیمه و بەیهقی صەحیحه، پێویسته پەنجه بجولێنرێت، وه حەدیسەكەی ئیبن و زوبەیریش صەحیحه و بەهێزتریشه پێویسته پەنجه نەجولێنرێت، كەواته له كاتی شایەتوماندا كه دەگاته سەر (إلاَّ الله) پەنجەكەی بەرز دەكاتەوه، ئیتر دوای ئەوەنابێت

وه لەم دانیشتنی یەکەمەدا، لەسەر پێی چەپی دادەنیشێت، وەك چۆن لە میانی هەردوو سەجدەکەدا دادەنیشێت، وە لە تەحییاتی کۆتاییدا ئەو دۆعاو نزا(مەئثور)ە بکات لە دوای صلاواتدان لە سەر پێغەمبەر ﷺ، وە بەجێهێنانی سوننەتەکانی وەك تەحیاتی یەکەم، بەڵام ئەوەندە هەیە، لە تەحیاتی ئەخیردا لەسەر لای سمتی چەپی دادەنیشێت، واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ پێی چەپی دەبردە پێش پێی ڕاستیەوەو، پێی ڕاستیشی دادەچەقاند، واتە: بەڕاستی ڕایدەگرت و لەسەر نەرمەی ڕانی دادەنیشت.(١) ،چونکە لەسەر هەڵسانەوەنییە،

---

پەنــجەی بجوڵێنێــت تــا کۆتــابی نــوێژەکەی یــان هەســـتانەوەی. کەواتە هەردوو فەرمـوودەکە جێ بەجێـدەکات و (تعـارض)یش ڕونـادات و لەگەڵ شـەهادەتدا بەرزی دەکاتەوەو لەدوای ئەوەیش ئیتر نایجوڵێنێت.

(١)وعند مسلم ثم يتخير من المسألة ماشاء وفي رواية النسائي عن أبي هريرة ثم يدعو لنفسه بما بدا له وسنده صحيح، والمراد بالمأثور المروي عن النبي ﷺ وقد ذكر الرافعي من ذلك: **(اللهم اغفر لي ماقدمت وماأخرت وماأعلنت وماأسرَرت وماأسرَفت وماأنت أعلم به مني أنت المقدم وأنت المؤخر لا اله الا أنت)**، قلت: رواه مسلم(٧٧١) من حديث علي قال الحافظ لكن عنده من طرق أخرى وعند أبي داود كان يقول ذلك بعد التسليم، ومن ذلك:( **اللَّهم إني أعوذ بك من عذاب النار وعذاب القبر وفتنة المحيا والممات، وفتنة المسيح الدجال)**، قلت: رواه مسلم (٥٨٨) من حديث أبي هريرة بلفظ: **(إذا فرغ أحدكم من التشهد فليتعوذ بالله من أربع من عذاب جهنم وعذاب القبر)** والباقي سواء، وهو في البخاري من غير تقييد بالتشهد، زاد النسائي: **ثم يدعو لنفسهِ بما بداله**، وأخرج البخاري ومسلم من حديث عائشه: **(أنه ﷺ كان يدعو في آخر الصلاة: اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر وأعوذ بك من فتنة المسيح الدجال وأعوذ بك من فتنة المحيا والممات إني أعوذ بك من المأثم والمغرم ومن ذلك أيضا: اللهم إني ظلمت نفسي ظلما كثيرا ولا يغفر الذنوب إلا أنت فاغفر لي مغفرة مِن عندِك وارحمني إنَّك أنتَ الغفُور الرَّحيم )**، قلت: متفق عليه من روايه عبد الله بن عمر(٨٨٣)،الإتحاف ٨١/٣. الإتحاف ٣:٨١

که به ئامادەباشی دابنیشێت، بەڵکو لە سەر حاڵەتێکی دامەزراوەو، تا سەلامدانەوە پێویستی بە هەڵستانەوە نییە، وە پێی چەپی دەخاتە پێش پێی ڕاستییەوە، وە پێی ڕاستیشی بەبەرزی دەهێڵایەوە، وە ئەگەر لەسەری گران نەکەوێت با پەنجەگەورەکەی ڕو لە قیبلە بکات، لە پاشان بڵێت:

(السَلامُ عَليكم ورَحمةُ الله) وە بەلای ڕاستدا لادەکاتەوە، بە شێوەیەك کە ڕوخی لای ڕاستی، ئەوەی لە دواوەوە لەلای ڕاستەوە سەیری دەکات ببینێت، وە بەلای چەپیشدا لادەکاتەوەو، سەلامی دووهەمیش دەداتەوە، بەو سەلامدانەوە نییەتی ئەوەی هەبێت کە لە نوێژەکەی دەربچێت، هەروەها لەسەلامەکەی نییەتی ئەوانەی هەبێت کە لە لای ڕاستیەوەن، لە مەلائیکەو موسوڵمانەکان لەسەلامی یەکەمدا، وە هەمان نییەتیش بهێنێت لە سەلامی دووهەمدا، وە دەبێت سەلامەکەی بە جەزم و بڕانەوە بێت و، نابێت درێژی بکاتەوە، کە ئەمە سوننەتی ئەم ڕوکنەی نوێژە، وە چۆنیەتی نوێژکردنی تاکێکی موسوڵمانە.

وە لە (الله أكبر)ەکاندا دەبێت دەنگ بەرزکاتەوە، ئەوەندەی کە خۆی گوێی لە دەنگی خۆی بێت، ئیمامیش بۆ ئەوەی خێری زیاتری دەست بکەوێت، با نییەتی ئیمامەت بهێنێت، خۆ ئەگەر ئەو نییەتە نەهێنێت، ئەوا نوێژی ئەوان (نوێژخوێنەکان) درووستە، ئەگەر نییەتی شوێنکەوتنی ئیمامیان هێنابێت، ئەوکاتە فەضیلەت و گەورەیی ئیمامەتیشیان دەست دەکەوێت.

وە ئیمام دەبێت بە بێدەنگی دوعای (کردنەوەی نوێژ) ئیستیفتاح و پەناگرتنی بەخودا (**أعوذ بالله من الشيطان الرجيم**)بکات، وە سوورەی فاتیحە و سوورەتەکەی دوای ئەو بە دەنگی بەرز بیانخوێنێت، لە نوێژەکانی بەیانی و ڕکاتی یەکەم و دووهەمی نوێژی خۆرنشین و خەوتناندا، هەروەها نوێژی کەسێکیش کە بە تەنها بیکات هەر بەو شێوەیە.

وە با وشەی(ئامین)یش لە نوێژە (جەهری و ئاشکراکاندا) ، بە دەنگی بەرز

بکات،[1] هەروەها(مەئموم)یش(واتە: ئەوەیلە پشتی ئیمامەوە نوێژ دادەبەستێت) وە دەبێت (مەئمووم) ئامینەکەی بەرابەر بێت لەگەڵ ئامینی ئیمامدا، بەیەکەوە بیکەن، نەك یەك لەدواوی یەك بێت، وە ئیمام وەستانێکی کورتی بێدەنگی لە دوای فاتیحە دەکات، بۆ ئەوەی هەناسەیەکی نوێی بۆ هەڵکێشێت، وە نوێژخوێنە (مەئموومەکانیش) لەو کاتی بێدەنگی ئیمامەدا، سوورەی فاتیحە دەخوێنن لە نوێژە جەهریەکاندا، بۆ ئەوەی زوو لێ بێتەوەو، لە کاتی خوێندنی قورئاندا گوێی بەدەنگی ئیمامەوە بێت ، وە نابێت (مەئمووم) لە نوێژە جەهریە کاندا دەنگ بەرزکاتەوە، مەگەر دەنگی ئیمامەکە نەبیستێت.

لە پاشان ئیمام دەڵێت: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَن حَمِدَهُ) لەکاتی بەرزکردنەوەی سەری لە ڕکوعدا، وە نابێت ئیمام لە ڕکوع و سەجدەکاندا لە سێ جار زیاتر تەسبیحات بکات، وە لە تەحیاتی یەکەمدا دوای ئەوەی گەیشتە:

((اللهم صَلِّ علَى(سيِّدِنا) مُحَمَّد وعَلى آلِ (سيِّدِنا) مُحَمَّدٍ))[2].

---

(١) نوێژی (جەهری) ئەو نوێژەیە کە فاتیحەو سوورەتێکی کەم، یان چەند ئایەتێکی تێدا دەخوێنرێت بە دەنگی بەرز. لە پاشان مەئمووم (واتە: ئەوەی ئیقتیدای بە ئیمامەوە کردووە) فاتیحەکە دەخوێنێت و ئیتر گوێ دەگرێت.

(٢) هەرچەندە پێغەمبەری خودا ﷺ نەیفەرمووە بڵێن: (سیدنا) بەڵام جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە مادام لە چەندین فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە بە (حەزرەتی) فاطیمەو (حەزرەتی) حەسەن و حسەینی فەرمووە (سەیید) هەروەها طەبەرانی لە الکبیر دا (٢٥٩٦) و(رجاله ثقات) وەك چۆن لە (مجمع الزوائد (١٥٠٤٩) هاتووە کە (المقبری) دەڵێت: ئێمە لەگەڵ ئەبی هورەیرە بوین (خوای لێ ڕازی بێت) (حەزرەتی) حەسەنی کوڕی (حەزرەتی) عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت) سەلامی کرد و ڕۆشت، ئەبوهورەیرە نەیزانی پێی، وتیان ئەوە ئەو بوو سەلامی کرد! بە پەلە ڕۆشت بۆ لای و سەلامەکی لێ کردەوە و فەرمووی: وعليكَ السلام ياسيِّدي! وتيان: پێی دەڵێیت: یا

سيّدي؟ فەرمووی:أَشهَدُ أنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ قال: (إنَّهُ سيِّد)! (حەزرەتی) عومەر ڕوی کردە (حەزرەتی) ئەبوبەکرەوەو فەرمووی: أبوبكر سيِّدنا وأعتق سيدنا(يعني بلالاً) رواه البخاري (٣٢/٣). وە لە ڕۆژی بەیعەتدا بە (حەزرەتی) ئەبوبەکر فەرمووی:بلْ نبايعكَ أنتَ فأنتَ سيِّدنا وخيرنا وأحبُّنا إلى رسول الله ﷺ فأخذَ بيَدهِ وبايَعَهُ النَّاس، رواه البخاري(١١/٣). وەفەرموودەی (قوموا إلى سَيّدكم فأنزلوهُ،) رواه الإمام أحمد بسند صحيح، ٢٢/٣، والبخاري(٣٠٤٣)، وفي الأدب المفرد(٩٤٥)، ومسلم ٤٥٧١)، وأبوداود(٥٢١٥). وفي رواية عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) (قوموا لِسَيِّدِكم)رواه الإمام البخاري(٣٠٤٣)، وأبو داود(٥٢١٥) وأحمد(٢٢/٣)، وە فەرموودی: ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه) کە دەفەرموێت: أنا سيِّدُ ولدِ آدمَ يوم القيامة، وفي رواية بزيادة :ولا فخر، وفي رواية البيهقي: أنا سيِّدُ العالَمين، وفي رواية أبي هريرة (رضي الله عنه) : قال ﷺ ( أنا سيِّدُ النَّاسِ يومَ القِيامة) رواه الإمام مسلم(٥٨٩٩(، وأبوداود(٤٦٧٣)، وأحمد(٥٤٠/٢)، و ٢/٣ مطولاً، والترمذي(٣١٤٨)،وابن ماجة(٤٣٠٨)، والبخاري(٣٣٤٠)، ومسلم( ٤٧٩)، والترمذي (٢٤٣٤)، .....الخ دەیان فەرموودە لەم بارەوە ڕیوایەتکراوە، کە بەدڵنیاییەوە بۆ صەحابەکان درووست بێت (سەیید)یان بۆ بەکاربهێنیت چۆن بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست نییە؟! وە وشەی (سیدنا) بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ناو نوێژدا درووستە لە هەمووکاتێکدا بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ بەکاربهێنرێت، بە پێی ڕای زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن: سوننەتیشە، وە فرمانەکان لەسەر گشتگیری خۆیان دەمێننەوە، کە کاتی نوێژ و غەیری نوێژیش دەگرێتەوە، وهذا هو الإمام الفقيه إبن عابدين (رضي الله عنه) يقول في حاشيته موافقة لصاحب الدر، وابن ظهيرة، والرملي الشافعي في شرحه على منهاج النووي وغيرهم من العلماء قال: (والأفضل الإتيان بلفظ السيادة). وورد في كتاب الأذكار للإمام النووي (رضي الله عنه) في ص/٤: وروينا عن السيد الجليل أبي علي الفضيل بن عياض رحمه الله قال: (ترك العمل لأجل الناس رياءٌ)....واتە: نەکردنی کارێك لە پێناوی دڵی خەڵکیدا بە ڕیا بۆت دەنوسرێت، وە کەسێکیش لەبەر خەڵکی کارێك بکات بە شیرك بۆی دەنوسرێت، ئیخلاصیش ئەوەیە خودا لە ڕیاو شیرك بتپارێزێت، الشاهد:

حقق هذا الكتاب وخرج أحاديثه عبدالقادر أرنائوط: في أسفل ص/٤ رقم (٢) حيث يقول: (٢) فيه إطلاق السيد على غير الله تعالى وهو جائزٌ. وفصل في الموضوع أكثر. **ويستحب أن يقول المصلي في التشهد وفي الصلاة الإبراهيمية (سيدنا) قبل ذكر إسمه سيدنا محمد، لأن السنة لا تؤخذ من فعله ﷺ فقط، بل تؤخذ من قوله**، وقد ثبت السيادة بأحاديث كثيرة من سنة سيدنا محمد ﷺ وقد ناداه الصحابي الجليل ابن مسعود في صيغة الصلاة حيث قال: **إذا صلَّيتُم على رَسولِ اللهِ ﷺ فأحسِنوا الصَّلاةَ عليهِ، فإنَّكم لاتَدرونَ، لعلَّ ذلكَ يُعرَضُ عَلَيهِ قال: فقالواله: فَعَلِّمَنا قال: قولوا: اللَّهُمَ اجعَل صَلاتَك ورَحمتكَ وبركاتكَ على سيِّدِ المُرسَلين، وإمامِ المُتَّقين، وخاتَم النبيين، محمدٍ عَبدِكَ ورَسولِكَ**....الحديث.أخرجه ابن ماجه في سننه(٢٩٣/١)، واستدل به على جواز إحداثِ ذكرٍ في الصلاة غيرِ مأثورٍ، إذا كانَ غير مُخالفٍ للمأثور، وزيادة لفظ (سيدنا) فيه تأدبٌ معه ﷺ والله تعالى يقول: ﴿**فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**﴾ (الأعراف/١٥٧)والتعزير هو: التوقير والتعظيم.فإثباتها مع ورودها في السنة موافق للقرآن الكريم، والتأدب خيرٌ مِنَ الإمتثال، ودلائله من السنة ثابتةٌ في البخاري ومسلم، من ذلك قوله ﷺ لسيدنا علي (رضي الله عنه) (**أُمحُ رَسولَ الله) فقال: لاوالله لا أمحوكَ أبداً**، ولا يعتمر هُنا عدَم الإمتثال إنكاراً عليه، بل يُعتبر زيادة التأدبِ مع رسول الله ﷺ . كما أخرجه البخاري ٤٩٩/٧)، ومسلم ٣١٦/٣). ومنها قوله ﷺ لسيدنا أبي بكر: **ما منعكَ أن تثبُتَ إذ أمرتُك؟ قال: ما كان لإبن أبي قُحافة أن يُصليَ بينَ يَدَي رسول الله ﷺ** كما أخرجه البخاري ١٦٧/٢فتح)، ومسلم:٣١٦/١).وما يتناقله الناس من قولهم: **(لاتُسيِّدوني في الصَّلاة)** فهو موضوعٌ مكذوبٌ مفترى وليس بحديث، وقال الحافظ السخاوي في المقاصد الحسنة: لا أصلَ لهُ. وهو لحنٌ أيضاً لأنَّهُ واوِيُّ العَينِ مِن سادَ يسودُ فالأصح أن تقولَ: **لاتَسُودُوني** والله أعلم. ينظر عدا المراجع المذكورة / الأذكار للإمام النووي والموسوعة اليوسفيَّة تأليف الأستاذ الدكتور يوسف خطار/دار التقوى للطباعة والنشر سنة ٢٠١٥ص/١٩٩-٢٠٣.

وه له دوو ڕکاتی دواییدا، ته‌نها سووره‌ی فاتیحه ده‌خوێنێت، له‌وه زیاتر له‌سه‌ریان درێژ ناکاته‌وه، وه نابێت له دۆعا کردنی ته‌حیاتی ئه‌خیر له صه‌ڵاوات و ته‌حییاته‌که زیاتر بێت، ته‌نها به ئه‌ندازه‌ی شایه‌تومانێك و صه‌ڵاواتدانێك له‌سه‌ر (حه‌زره‌تی) ڕه‌سولوڵلا ﷺ، وه له‌کاتی سه‌لامدانه‌وه‌ی، با نیه‌تی ئه‌وه بهێنێت که‌سه‌لام له هۆزه‌که‌ی ده‌كات و له فریشته‌کان. وه ئه‌و کۆمه‌ڵه‌یش که سه‌لامده‌ده‌نه‌وه نیه‌تیان وه‌ڵامدانه‌وه‌بێت.

وه ماوه‌یه‌ك ئیمام خۆی ڕاده‌گرێت، تا خه‌ڵکه‌که له سه‌لامدانه‌وه لێ ده‌بنه‌وه، ئیمجا به ڕوخساری خۆی ڕو له خه‌ڵکه‌که‌ده‌کات، به‌ڵام ئه‌گه‌ر له پشتی پیاوه‌کانه‌وه ژنانی لێ بوو، با له پێشه‌وه بچنه ده‌ره‌وه، وه نابێت که‌س له پیاوه‌کان هه‌ڵبستن تا ئیمامه‌که هه‌ڵده‌ستێت، ئه‌وکاته‌یش هه‌ڵده‌ستێ ده‌توانێت لای ڕاسته‌وه یان لای چه‌په‌وه هه‌ڵبستێت، به‌ڵام لای ڕاستی له‌لام باشتره.

وه نابێت ئیمام خۆی تایبه‌ت بکات به دۆعای قنووتی به‌یانیانه‌وه، به‌ڵکو بڵێت: **((اللهُمَّ اهدِنا فيمَن هَدَيتْ، وَعافِنا فيمَن عافَيتْ، وتوَلَّنا فيمَن تَولَّيت وبارِك لا فيما أَعْطَيتْ، وقِنا شرَّ ما قَضَيتْ، فإنَّكَ تَقضي ولاَ يُقضى عَلَيك، وإنَّهُ لايَذِلُ مَن والَيتَ ولاَ يَعِزُّ مَن عادَيتْ، تَبارَكتَ رَبَّنا وتَعالَيت، فَلَكَ الحَمدُ على ما قَضَيتَ، أستَغْفِرُكَ وأتوبُ إلَيك))**. وه به‌ده‌نگی به‌رز بیخوێنێته‌وه و خه‌ڵکه‌که‌ش ئامینی بۆ ده‌که‌ن، وه ده‌ستیان تا حه‌نای سینه‌یان به‌رز ده‌که‌نه‌وه، وه ده‌ستیان بهێنن به ده‌موچاویاندا، له‌به‌ر ئه‌و فه‌رمووده‌ی که پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ مه‌سحی ده‌م وچاوی کردووه)[1]، ئه‌گه‌رنا به پێی پێوه‌ری شه‌رعی، ده‌بێت وه‌ك نزای دوای (ته‌حیات) ده‌ست به‌رز نه‌کاته‌وه.

---

(١) وهو ما رواه الترمذي (٣٣٨٦): **كان رسول الله ﷺ إذا رفعَ يَديهِ في الدُعاءِ لَم يَحُطَّهُما حتى يَمسَح بِهِما وَجهَهُ** ) وانظر المجموع: ٤٦٢/٣—٤٦٣.

# ڕێگە پێ نەدراوەکان

پێغەمبەری خودا ﷺ نەهی کردووە لە (صیفن و صیفد)

((وقد نهی ﷺ **عن الصفنِ والصِفْدِ في الصَّلاة**)) صیفد: واتە: ئەوەیە کە هەردوو پێی پێکەوە بلکێنێت، وشەی صیفن: واتە: یەکێك لە پێکانی بەرزکاتەوە،وەك باسمانکردن، وە نەهی کردووە لە(الإقعاء)[1]وە(السَّدل)[2]، وە (الكَفّ)[3]،وە (الإختصار)[4]،وە (الصَّلْبِ)[5]،وە (المواصلَة)[6]،وە هەروەها نەهی

---

(١)رواه الحاكم في المستدرك(٤٠٥/١)(١٠٠٥) من حديث سمرة وصححه(نهى عن الإقعاء، وروي الترمذي وابن ماجه الحرث الأعور عن علي: **لاتقع بين السجدتين** وروى ابن السكن في صحيحه عن أبي هريرة رفعه: **نهى عن التورك والإقعاء في الصلاة**. وقال النووي في الخلاصة قال بعض الحفاظ ليس في الاقعاء حديث صحيح إلاً حديث عائشة (٤٩٨) (رضي الله عنها) **كان ينهى عن عقبة الشيطان**.

(٢)أخرجه أبو داود(٦٤٣) الترمذي (٣٧٨)والحاكم في المستدرك(٣٨٤,٩٣١/١)، وصححه من حديث أبي هريرة بلفظ: **نهى عن السدل في الصلاة** قاله العراقي، قال الزبيدي٨٩/٣: إلا أن الترمذي قال: لايعرف من حديث عطاء عن أبي هريرة إلا من حديث عسل بن سفيان اه

(٣)اخرجه الشيخان البخاري(٨١٥)من طريق عمرو بن دينار عن طاوس عن ابن عباس(٤٩٠) بلفظ: **(أمر النبي ﷺ أن يسجد على سبعه اعضاء ولايكف شعرا ولا ثوبا** وفي روايه لهما **أمرنا أن نسجد علي سبعه أعظم ولانكف ثوبا ولا شعرا)**، الإتحاف٨٩/٣.

(٤)اخرجه ابو داود(٩٤٧) والحاكم (٣٩٦/١)(٩٧٤)وصححه من حديث أبي هريرة وهو متفق عليه ولفظ البخاري نهي رسول الله ﷺ عن الخصر في الصلاة (١٢٢٠) ومسلم (٥٤٥)بلفظ: **(نهي أن يصلي الرجل مختصرا)** قاله العراقي قلت ورواه ايضا الترمذي باللفظ الاول وقال الصدر المناوي رواه الشيخان في الصلاة عن أبي هريرة، الإتحاف،٨٩/٣.

(٥)قال العراقي أخرجه أبو داود(٩٠٣) والنسائي (٨٩١) من حديث ابن عمر باسناد صحيح

(٦)قال العراقي عزاه رزين الي الترمذي ولم أجده عنده ووجد بخط الحافظ ابن حجر مانصه أنه عزاه بعضهم إلى الإمام أحمد والترمذي(٢٥١) وحسنه، وابن ماجه(٨٤٥)والبخاري(٧٤٤).

کردووه له نوێژی کەسێك کە (حاقین ،و حاقیب[١]، و حازبق) بێت[٢]،هەروەها پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەداوە بە نوێژی (جائیع) و [٣]،(تورە) و (المتلثم)واتە: ئەو کەسەی دەموچاوی خۆیی داپۆشیبێت، (کە پێناسەکانیان بەم شێوەیە:

الإقعاء: لە لای ئەهلی زوبان: لەسەر هەردوونەرمایی بن ڕانی دابنیشێت و ئەژنۆکانیشی بەرزبکاتەوە، وە دەستەکانیشی بخاتە سەر زەوی وەك دانیشتنی صەگ. وە بەلای ئەهلی حەدیسەوە :

ئەوەیە کە لەسەرلاقەکانی بێت و، تەنها ئەژنۆکانی و سەرە پەنجەکانی خستبێتە سەر زەوی.

**سەدل**: بە پێی زاراوەی ئەهلی حەدیس ئەوەیە کە: خۆی پێچابێتەوە بە بەرگەکەیەوە (وە ئەملاو لای بەرگەکەی بخشێت بەسەر زەویدا، چونکە واتای فیز و دەماری تێدایە) وە دەستی خستبێتە ناو بەرگەکەیەوە، بەم شێوەیە ڕکوع و سەجدەکانی ببات، جوولەکەکان بەم شێوە نوێژیان دەکرد، بۆیە ڕێگری کراوە لە باوەڕداران کە خۆیان بەوان بشوبهێنن. کراسیش هەر بەو واتایە، کە نابێت ڕکوع ببات و سەجدە ببات، بەو شێوە کە دەستی لە ناو قۆڵی کراسەکەیدا بێت، (مەگەر فراوان بێت)، وە هەندێك لە زانایان دەفەرموون: **سەدل**: بە واتای ئەوەیە کە: ناوەڕاستی کراسە شۆڕەکەی بخاتە سەر سەری

---

(١)رواه ابن ماجه (٦١٧)من حديث أبي إمامه بلفظ: **أن رسول الله ﷺ نهى أن يصلي الرجل وهو حاقن.** وله وللترمذي (٣٥٧) وحسنه نحوه من حديث ثوبان، ومسلم (٥٦٠)، من حديث عائشة: **لاصلاة بحضرة طعام، ولا هو يدافعه الأخبثان.** الإتحاف٣/٨٩.

(٢)قال العراقي عزاه رزين الى الترمذي ولم أجده عنده وإنما ذكره أصحاب الغريب قالوا: **ولا رأي لحازق** بالمعني الذي ذكره المصنف.نفس المصدر.

(٣)ومعناه في حديث ابن عمر وعائشة عند البخاري(٦٧٤) ومسلم(٥٥٩) **إذا حضر العشاء واقيمت الصلاة فابدؤا بالعشاء.**

خۆی و ئەملاو لاکەی بە لای چەپ و ڕاستدا شۆڕکاتەوە بۆ ئەوەی بیدا بەسەر شانیدا، کە ئەمەش ڕایەکی پەسەند نییە، ڕای یەکەم نزیکترە لێیەوە.

واتای **کەف** ئەوەیە: لیباس و جلەکانی لە میانی دەستەکانیدا، یان لە دوایەوە لەکاتی سەجدەدا بیپێچێتەوەو کۆی کاتەوە، یان بەوەش دەوترێت کە مووەکانی سەری بپێچێتەوە، نابێت نوێژ بکات بەو شێوەی قژی لول بکات و بیخاتە پشتی سەریەوە، بەڵکو وا باشە پیاو پرچی بەرداتەوە (کە سەجدەی برد قژەکەیشی لە گەڵیدا بکەوێتە سەر زەوی و سەجدە ببات) لە فەرموودەدا هاتووە: ((**أُمِرتُ أَن أَسجُدَ علَى سَبعةِ أَعضاءٍ ولاأَكُفَ شَعراً ولا ثَوباً**)) [1].

واتە فرمانم پێ دراوە کە لەسەر حەوت ئێسقان و ئەندامی لەشم سوجدە ببەم، بەرگ و مووەکانیشم نەپێچمەوە.

وە (ئیمام) ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (خودای لێ ڕازی بێت) بەلایەوە ناپەسەندو مەکروهە کە لە نوێژدا لە سەروو کراسەکەیەوە خۆی توندبکاتەوە، وەك ئەوەوایە کە جلەکەی پێچابێتەوە، [2].

---

(١)الحديث متفق عليه قال البخاري(٨١٦) باب السجود علي سبعة أعظم حدثنا قبيصة حدثنا سفيان عن عمرو بن دينار عن طاوس عن ابن عباس ( أمر النبي ﷺ **أن يسجد على سبعة أعضاء ولا يكفَّ شَعرا ولاثوبا، الجبهة، واليدين، والركبتين،والرجلين،أُمرتُ أن أسْجُدَ على سبعة أعظم على الجَبهة وأشار بيدِه إلى أنفه واليدين والرُّكبَتين وأطراف القَدمين ولانكفت الثياب والشع)**، وهذا أخرجه أيضا أحمد وأبو داود والنسائي وابن ماجه من طرق عن ابن عباس ومسلم (من حديث ابن عباس٤٩٠). الإتحاف ٩١/٣.

(٢) ئیبن و قودامە لە (المغني)دا (٣٠٠/٢) فەرموویەتی: ئەگەر لە نوێژدا پشتت ببەستیتەوە ئەگەر بە پارچەیەك بێت یان بە مێزەرێك یان بەرگێك، یان لەسەر ئەو بەرگەوە کە بەسەر کراسەکەیدا لەبەری کردووە، ئەوە پشتوێن لەو حاڵەتانەدا کەراهەتی نییە وە ئەگەر بە شێوەیەکیش بوو کە بشوبهێت بە ئەهلی کیتاب ئەوە پەسەند نییە.

وە **ئیختیصاریش** نەهی لێکراوە، واتە: لەکاتی نوێژ کردندا دەستی لەسەر کەلەکەی بێت. وە نەهیش کراوە لە **صەلب**؛ واتە: هەردوو دەستی لە سەر کەلەکەی بێت و، هەردوو باڵی لە کاتی هەستانەوەی لێکیان دوور بخاتەوە.

**مواصەلە**ش کە نەهی لێ کراوە، واتە: لکاندنی دووشت بە یەکەوە: لە پێنج حاڵەتدا درووست دەبێت:

دوانیان لەسەر ئیمامە، کە نابێت خوێندنی فاتیحە بلکێنێت بە تەکبیرەی ئیحرامەوە، وە نابێت ڕکوعیش بلکێنێت بە خوێندنی قورئانەوە. دوانیشیان لەسەر (مەئمورمە) (ئەوەی لە پشتی ئیمامەوە نوێژ دادەبەستێت)کە نابێت (الله أكبر)ی نوێژ دابەستن بلکێنێت بە تەکبیرەی ئیمامەوە، وە سەلامدانەوەش بلکێنێت بەسەلامی ئیمامەوە. (دەبێت ئیمام لێ بێتەوە، ئیمجا مەئمووم دەست پێ بکات)، یەکێکیش لە میانی هەردوکیاندایە: کە پێشنوێژ و مەئمووم نابێت سەلامدانەوەی نوێژی فەرز بلکێنن بە سەلامدانەوەی نوێژی سوننەتەوە، بەڵکو دەبێت بەینیان بخات.

هەروەها نەهی کراوە کەسێك میز زۆری بۆ هێنابێت، یان سەرئاوو پیسی زۆری بۆ هێنابێت نوێژ بکات، یان ترسی بای سکی هەبێت، هەروەها کەسێك خوففێکی تەسکی لە پێدابێت، هەموو ئەمانە بیری پەرەوازەدەکەن و خشوع و گەردن کەچی بۆ ناهێڵن، هەر لەو واتایەشدایە کەسێك برسی بێت، (بۆ خۆراکێك کە زۆر حەزی لێ بکات) یان کارێکی گرنگی هەبێت و، دڵی هەر لای ئەو بێت، ئەوەی برسیش هەر لەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوە:

((**إذا حضر العَشاءُ وأُقيمَت الصَّلاة فابدَؤا بالعَشاء**)) [1]، واتە: ئەگەر شیو و خواردن ئامادەبوو لە کاتی قامەتی نوێژدا، ئەواجارێکا خواردنەکە پێش بخەن و

---

(١)قال العراقي متفق عليه من حديث ابن عمر و عائشة اهـ قال الزبيدي٣/ ٩٣: وفي صحيح

له پاشان نوێژ بکەن، مەگەر کاتەکە زۆر بەرتەنگ بێت و ترسی فەوتانی نوێژەکەی هەبێت، یان دڵی بۆ خواردنەکە لێ نەدات، ئەوکاتە نوێژەکە پێش بخات قەیناکە.

له فەرموودەدا هاتووە:

**((لا يَدخُل أحدُكم الصَّلاةَ وهُو مُقَطِّبٌ، ولايُصَلِينَ أحدُكم وهُوَ غَضْبان))**[1].

واتە: هیچ یەکێك له ئێوە نابێت بە حاڵەتی ڕوگرژییەوە کە دەموچاوی دابێت بەیەکدا بچێتە ناو نوێژکردنەوە، وە نابێت بە توڕەییەوە نوێژبکات.

(حەزرەتی) حەسەنی بەصری دەفەرموێت:

هەموو نوێژێك کە بە حزور و ئامادەباشی دڵ نەبێت، ئەوە بۆ ئەوەی ڕوبەڕوی تۆڵە ببێتەوە خێراترە لەوەی کە پاداشت وەربگرێت.

وە لە فەرموودەدا هاتووە: ((**سبعةُ أشياءَ في الصَّلاة مِنَ الشَّيطان: الرُّعافُ والنُّعاس والوَسوسَة والتَثاؤُب والحُكَاكُ والإلتفاتُ والعَبَثُ بالشَّئِ**)) ثم قال: وزاد بعضهم: **(السَّهْوُ والشَّكُّ)**[2]

---

البخاري(٦٧٤)(٥٤٦٥) باب اذا حضر الطعام واقيمت الصلاة وكان ابن عمر يبدأبالعشاء وقال أبو الدرداء **من فقه المرء إقباله علي حاجته حتي يقبل علي صلاته وهو فارغ**،وأخرجه مسلم (٥٥٨)

(١)هكذا اورده صاحب القوت(٩٧/٢) وقال العراقي لم اجده،الإتحاف ٩٤/٣.

(٢)وقال العراقي أخرجه الترمذي(٢٧٤٨) من رواية عدي ابن ثابت عن ابيه عن جده فذكر منها **العطاس والنعاس والتثاؤب في الصلاة، والحيض والقيئ والرعاف من الشيطان**، وقال حديث غريب، ولمسلم من حديث عثمان بن أبي العاصي يارسول الله إن الشيطان قد حالَ بيني وبين صلاتي الحديث. وللبخاري(٧٥١) من حديث عائشة في الالتفات في الصلاة: هو إختلاس يختلسُه الشيطان من صلاة العبد. وعند مسلم(٢٢٠٣) شكاية عثمان بن أبي العاص الوسوسة في الصلاة. **فقال رسول الله ﷺ ذاك شيطانٌ يقال له (خَنزَبٌ) فإذا أحسَسْتَهُ فتَعَوذ باللهِ مِنهُ**. وما ذكره المصنف في القوت:٩٧/٢.

# حەوت شت هەن لە نوێژدا سەرچاوەکەیان لە شەیتانەوەیە:

خوێن پژانی لووت و، خەوەنوچکەو، وەسوەسەو، باوێشکدان و، خۆخوراندن و، لاکردنەوەو، یاری و گەمەکردن بەشت، وە هەندێك لە زانایان لێتێکچوون وسەهو کردنی ناو نوێژو گومانیشیان بۆ زیاد کردووە.

هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە:

چوار خەصڵەت هەن بەوشکی و جەفا بۆی دەژمێررێن:

لاکردنەوە بەملاو لادا، وە مەسح و سڕینی دەموچاو لە خۆڵی پاشماوەی تەیەمموم یان سەجدە، وە ڕێکخستنی ئەو بەردانەی کە سەجدەیان لەسەر دەبات، وە نوێژ کردن لە جێگە ڕەوتی خەڵکی، کە بەبەرنوێژەکەتدا بڕۆن.[1]

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ نەهی کردووە لەوەی کە پەنجەکانی بکات بە یەکدا،[2]، یان پەنجەکانی بتەقێنێت و دەنگیان لێ بێت،[3]، یان دەموچاوی لەکاتی نوێژدا داپۆشێت،[1]، یان ناو لەپێکی بخاتە سەر ئەوی تریان، وە لە

---

(١) قوت القلوب ٩٧/٢.

(٢)أخرجه أحمد في مسنده(١٧٦٣٧) وابن حبان في صحيحه(٥٢٣/٥)(٢١٤٩) والحاكم في المستدرك(٣٢٤/١)(٧٤٤)وصحَّحه من حديث أبي هريرة، ولأبي داوود(٥٦٢) والترمذي(٣٨٦) وابن جامه(٩٦٧) وابن حيان(في صحيحه٣٨٢/٥(٢٠٣٦) نحوَه من حديث كعب بن عجرة، قال الزبيدي٩٤/٣: أراد بذلك قوله ﷺ **(إذا توضأ أحدُكم فأحسن وضُوأهُ ثمَّ خَرَج عَمداً إلى المسجِد فَلا يُشَبِّكَنَّ بينَ أصابعهِ فإنَّه في الصَّلاة.)**

(٣)رواه ابن ماجه من حديث علي باسناد ضعيف: **لا تفقع أصابعك في الصلاة** قلت: كذا هو في الجامع الكبير للسيوطي إلا أنه قال وأنت في الصلاة الإتحاف ٩٥/٣

کاتی ڕکوعدا بیانخاتە ناو ڕانیەوە، هەندێ لە ئەصحاب فەرموویانە: ئێمە وامان دەکرد و ڕێگریمان لێکراو ئیتر وازمان لێهێنا.[٢]،

هەروەها کەراهەتی هەیە لە کاتی سەجدەدا فوو بکاتە سەر زەوی و پاکی بکاتەوە[٣]، یان بە دەستەکانی لە کاتی نوێژەکەیدا بەردەکان ڕێك بخات و سەریان بخاتە سەر[٤]،

ئەمانە هەمویان کۆمەڵە کردارێکن هیچ پێویستییەك نییە بە کردنیان، وە نابێت یەکێك لە پێکانی خۆی بەرزکاتەوە و لەسەر ڕانی دایبنێت، وە نابێت پاڵ بداتەوە بە دیوارێکەوەو خۆی پێ ڕابگرێت، ئەگەر بە شێوەیەك پاڵی پێوەداو گەر دیوارەکە یان تەختەکە لابرا ئەو بکەوێت، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

---

(١) عند أبي داود (٦٤٣) وابن ماجه(٩٦٦)( نهى رسول الله ﷺ أن **يُغَطِيَ الرَّجلُ فاهُ، وهُوَ في الصلاة.)**

(٢) رواه البخاري(٧٩٠)ومسلم(٥٣٥) مەبەست لەو صەحابە (حەزرەتی)سەعدی ئەبی وەقاصە. أخرجه الشيخان والأربعه قال البخاري حدثنا ابو الوليد حدثنا شعبة عن أبي يعقوب سمعت مصعب بن سعد يقول:

**صليت إلى جنب أبي فطبقت بين كفي ثم وضعتهما بين فخديَّ فنهاني أبي وقال: كنَّا نفعله فنُهينا عنه، وأُمرنا أن نضع أيدينا على الركب اهـ**

(٣) رواه أبوداود(١٣٧/٥) وقال العراقي **قد ورد النهي عن النفخ في ثلاثة مواضع:**

**في الطعامِ والشرابِ والسُّجودِ، والعلة فيها مختلفة بمعان مختلفة**، ثم ساقها وقال: **وأما النفخ في السجود فالظاهر أنَّ النبيَّ نهَى عنه خشية أن يخرُج مع النفخ حرفان، نحو (أف) فتبطل الصلاة، أو خوف أن يكون فمُه مُتغيرا فيتأذي به الملك** ، الإتحاف ٩٥/٣.

(٤) رواه أبو داود (٩٤٥)، والترمذي (٣٧٩) والنسائي(٦/٣.قال الزبيدي: ٩٦/٣، : كما في سنن أبي داود ، كتاب الصلاة ، باب في مسح الحصى في الصلاة(٩٤٦) عن معيقب رفعه: **(لاتمسح الحصى وأنتَ تُصلي، فإن كُنتَ لابُدَّ فاعِلاً فَواحِدة).**

# جیاکردنەوەی فەرزەکان و سوننەتەکان

پوختەی ئەوەی باسمان کرد. کۆمەڵێك کاری پێویست و فەرزەکان و سوننەتەکان و ئادابەکان و هەیئەت و شێوەکانەوە، کە دەبێت موریدی ڕێگای ئاخیرەت دەبێت چاودێریان بکات.

## پوختەو کۆی فەرزەکان(ئەرکان ومەرجەکانی نوێژکردن)

## دوانزە خەصڵەتە:

## نییەت و، تەکبیرەی ئیحرام،

(**واتە: الله أكبر**)ی دابەستنی نوێژو، هەڵستانەوەو ، خوێندنی فاتیحەو ، چەمینەوە بۆ ڕکوع، تا ناولەپەکانی دەگاتە سەر ئەژنۆکان، لەگەڵ ئەوەندە مانەوە کە ئارامی بە گیانی بگات، وە هەستانەوەی دوای ڕکوع و مانەوە بە پێوەو، خۆڕاگربێت تا جەستەی لە جوڵە دەکەوێت، لە پاشان سەجدە بردن و ئارامی جەستەی لە جوڵە، وە پێویست نییە دەستەکانی دابنێت لەسەر زەوی،[1]، لە دوای ئەو لەسەجدە هەڵسێتەوەو دابنیشێت و ئارام بێتەوە، وە دانیشتن بۆ تەحیاتی کۆتایی، وە خوێندنی تەحیاتی ئەخیر. وە صەڵەواتدان لە دیاری پێغەمبەری خودا ﷺ، وە سەلامدانەوەی یەکەم. بەڵام پێویست ناکات نییەتی چوونەدەرەوە لە نوێژ بهێنێت.

ئەوانی تر هیچی واجب نییە، بەڵکو ئەوانە سوننەت و هەیئاتی نوێژن، پەیوەنداری سوننەتەکان و فەرزەکانن.

---

(١) فەرموودەی دووهەم ئەوەیە کە پێویستە دەستەکانیشی لەگەڵ هەردوو ئەژنۆو سنگی پێکانی و تەوێڵ و لووتی بخاتە سەر زەوی، وەك ئیمامی نەوەوی لە ڕەوضەدا ئەو ڕایەی بە درووست زانیوە، واجبە بیانخاتە سەر زەوی.

## باسی سوننەتەکانی نوێژ: کردارەکان

**چوار سوننەتی کرداریمان هەیە:** بەرزکردنەوەی دەستەکان لە دابەستنی نوێژدا، وە دەست بەرزکردنەوە لەکاتی بەرەو خوار بونەوە بەرەو سەجدەبردن، وە لەکاتی بەرزبوونەوە بەرەو هەستانەوە و قیام، وە دانیشتنی تەحیاتی یەکەم.

وە ئەو شتانەیکە باسمانکردن لە چۆنیەتی ڕاخستنی پەنجەکانی دەست و ئەندازەی بەرزکردنەوەیان ، ئەوانە جۆرو شێوەکارێکن، کە پەیوەنداری ئەو سوننەتانەن، وە جۆری دانیشتنەکانیش؛ وەك چۆنیەتی دانیشتنی تەحیاتی بچوك و، (ئیفتیراش)کردن و، دانیشتنی تەحیاتی ئەخیریش کە پێی دەوترێت (تەوەرروك)، ئەمانەش جۆرە شکڵ و هەیئەتێکن، پەیوەندییان بە جۆری دانیشتنەوە هەیە، وە سەر دانەواندن و لانەکردنەوە بەملاو لادا، پەیوەندییان بە هەیئەت و شێوەی وەستان و جوانکردنی کێشانی وێنەکەیەتی، وە دانیشتنی حەوانەوەی میانی سەجدەکانمان دانەناوە بە بنەماکرداریەکانی سوننەت، چونکە تەنها وەك شێوەیەکی جوانکردنی هەیئەت و شێوازی هەڵسانەوەکانە، لە سەجدەبردنەوە بەرەو قیام و هەستانەوە، بۆیە بە شێوەیەکی تاك و سەربەخۆیی باسی لێوە نەکراوە.

### باسی سوننەتەکان لە زیکرەکاندا:

وەك سوننەتی خوێندنی دۆعا و نزای کردنەوەی نوێژە، کە بە (ئیفتیتاحی) نوێژ ناسراوە، لە پاشان پەناگرتن بە خوا، وتنی:

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) وە لە دوای فاتیحە وتنی: ئامین، کە سوننەتێکی (موئەککەدەیە) و دوپاتکراوەی پێغەمبەرە ﷺ. لە پاشان خوێندنی سوورەتێکی قورئانە، لەگەڵ وتنی ئەڵلاهو ئەکبەری گواستنەوەی ڕوکنەکانی ناو نوێژەکانەوە، وە وتنی زیکرو نزای تایبەت لە ڕکوع و سەجدەکاندا، وە

هەستانەوەو ڕاوەستان تیایاندا، وە ڕاستبوونەوەو هەستان و قیامی تەواو ، لە پاشان تەحیاتی یەکەم و صڵاواتدان

لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ ، وە لە پاشان نزاکردن لە کۆتایی تەحیاتدا و، لە دوای ئەویش دووهەم سەلامدانەوە لای چەپ.

کۆی ئەمانەش ئەگەرچی لە ژێر ناوی سوننەتدا کۆمانکردوونەتەوە، چەندین پلەی جیاوازیان هەیە، کە ئەگەر هەریەکێك لەوانە نەکرێت، بۆ پڕکرندنەوە و بژاردنی نوقسانییەکەی ئەوا سەجدەی سەهووی بۆ دەبرێت،

بەڵام لە (فیعل)و کردارەکاندا، تەنها یەك شت هەیە:

کە پێی دەوترێت دانیشتنی یەکەم، کە بۆ تەحیات ی یەکەم دەخوێنرێت، بەڕاستی ئەوە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر جوانی و ڕێکو پێکی و ڕێکخستنی نوێژەکان، لە بەرچاوی ئەوانەی سەیر دەکەن و سەرنجی دەدەن، تاوای لێ دێت بە هۆی ئەوەوە دەناسرێتەوە کە ئایا چوار ڕکاتییە یان کەمتر؟!

بە پێچەوانەی دەست بەرزکردنەوە لە نوێژدا، چونکە هیچ گۆڕانێك ئەنجام نادات لە شێوازی ڕێکخستنی کارەکاندا ، بۆیە بەوە ناوی دەبرێت: کە پارچە و هەندێکە لەنوێژ، وە لەمبارەوە هەندێك لە زانایان دەفەرموون: نەکردنی ئەو ئەبعازو پارچانە، بەسەجدەی سەهو بۆی دەبژێررێتەوە.

واتە: کەموکوڕییەکەی بۆ تەواو دەکات.

## بێینە سەر ئەزکارەکان:

جگە لە سێ زیکر نەبێت کە سەجدەی سەهویان دەوێت، هیچ زیکرێکی تر ئەگەر نەشکرێت پێویستیی بە سەجدە نییە، ئەوانەش: قنووت و، تەحیاتی یەکەم و صڵاواتدانە لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ لە نوێژدا، بە پێچەوانەی تەکبیری میانی ڕکوع و سەجدەکان و ئەزکار و تەسبیحاتەکانیان و، هەڵسانەوە لە میانیاندا، چونکە ڕکوع و سەجدە بردن با زیکریشی تێدا نەبێت، بۆ خۆیان

پێچەوانەی نەریتی گشتییە، وە بە بێدەنگ بوونیش و، زیکری (اللّٰه أكبر) نەکردنیش واتای عیبادەتیان تێدایە، نەبوونی ئەو زیکرانە وێنەی بەندایەتییەکە ناگۆڕێت. بەڵام بۆ نەکردنی دانیشتنی تەحیاتی یەکەم سەجدەی سەهوی دەوێت؛ ئەوە کردارێکی ئاساییە. وە لە پێناوی شایەتـوماندا زیادکراوە، نەکـــردنی کاریگەری دەبێت لە سەر گۆڕینی دیمەن و وێنەی عیبادەتەکە، بەڵام دۆعای (کرنەوەی نوێژ) و ،خوێندنی سوورەتی دوای فاتیحە، نەکردنیشیان کاریگەری نابێت، لە سەر وێنە و ناوەڕۆکی عیبادەتەکە، چونکە ئەصڵی قیام و هەستانەوە، بەهۆی خوێندنی سوورەتی فاتیحەوە ئاوەدان بووەتەوە، لە حاڵەتی نەریت و عادەتی وەستان جودای کردۆتەوە، (ئیتر پێویستی بە سوورەتی تر نەماوە، تا نەکردنی سەجدەی سەهوی بوێت) وەك چۆن دۆعاکردنی دوای تەحیاتی کۆتایی، صورەت و شێوەی بەندایەتیەکە ناگۆڕێت و، ئەگەر نەشکرێت سەجدەی ناوێت.

وە خوێندنی قنوتیش دوورترین شتە کە بۆ نەکردنی بە سەجدەی سەهو پڕکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا درێژکردنەوەی ماوەی ڕاوەستان و قیام بۆ نوێژی بەیانیانی بۆ دانراوە، لە پێناوی خوێندنی قنووتەکە، ئەمەش وەك درێژکردنەوەی ماوەی دانیشتنی پشوودانی دوای سەجدەی دووهەمی ڕکاتی دووهەمە، کە بە هۆی درێژکرنەوەکەوە، لەگەڵ وتنی شایەتوماندا، بووەتە شوێنی خوێندنەوەی تەحیاتی یەکەم، کەواتە دوای ڕکوعی ڕکاتی دووهەمی نوێژی بەیانیش، ئەو وەستانەیە بۆ خۆی بووەتە هەڵسانەوەیەکی درێژی ئاسایی، کە زیکرێکی واجبی تێدا نییە، بۆیە قنووتی بۆ دیاری کراوەو، نەکردنەکەیشی سەجدەی سەهۆی بۆ دانراوە، کە دەڵێین:

وەستانێکی درێژی بێ زیکر ، بۆ ئەوەی ئەو وەستانە درێژەی کە زیکری تێدایە نەیگرێتەوە، (وەك وەستانی ڕکاتەکان کە فاتیحەیان تێدایە)، وە

مەبەستی لەوەی کە خاڵی بێت لە زیکرێکی واجب، ئەوەیە کە ئەصڵی ڕاوەستانەکە نەگرێتەوە، کە وەستانی بۆ خوێندنی فاتیحە بێت.

ئەگەر بڵێیت: جیاکردنەوەی سوننەتەکان لە فەرزەکان کارێکی پەسەندەو ڕێی تێدەچێت، چونکە ئەگەر فەرزێك نەکەیت، نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر سوننەتێك نەکەیت نوێژەکەت بە درووستی دەمێنێتەوە، وە ڕووبەڕوی تۆڵە نابیتەوە، بەڵام بۆ نەکردنی فەرزێك ڕوبەڕوی تۆڵە دبیتەوە. بەڵام ئەمەی کە سوننەتێك لەگەڵ سوننەتێکی تردا جودا بکەیتەوە، ئەوە جێگەی پرسیارە، چونکە هەموو سوننەتەکان فەرمانیان پێکراوە کە کردنیان کارێکی باشە، وە نەکردنیان تۆڵەی لەسەر نییە، وە بەرامبەر هەموویشیان تەماداری پاداشتیان لێ دەکرێت، کەواتە واتای جیاکردنەوەی سوننەت لە سوننەت چییە؟!

**بۆ وەڵامەکەی بزانە:**

ئەوەی کە هەموو سوننەتەکان هاوبەشن لە پرسی پاداشت و تۆڵەو بەپەسەندلەقەڵەمداندا، ئەوە ڕێگر نابێت لە بوونی جیاوازی لە میانیاندا، ئەمەیش لە ڕوانگەی ئەم نموونەوە بۆت ئاشکرا دەبێت:

کاتێك بە ئادەمییەك دەوترێت: کە مرۆڤێکی تەواوەو بوونی خۆیی هەیە، کە دارای واتاو ناوەڕۆکی باطینی بێت، لەگەڵ بوونی ئەندامە زاهیرییەکاندا، کەواتە واتا باطینیەکەی بوونی ڕۆح و ژیانە تێیدا، وە زاهیرەکەیش جەستەی ئەندامەکانیەتی، کە دەزانین هەندێك لەو ئەندامانە بە نەمانی خاوەنەکەیان نامێنن، وەك دڵ و جگەر و دەماخی سەرو، هەموو ئەندامێك کە نەمانی مایەی فەوتان و نەمانی خاوەنەکەی بێت، وە هەندێکیان بە نەمانیشی ئەوان هەردەمێنن ، بەڵام مەقاصیدو گرنگییەکانی بوونی ژیانی تێدا نامێنێت، وەك چاوو دەست و پێ و زوبان!

وه هەندێکیشیان بە نەمانیان نە ژیان دەبەن و نە مەبەستەکانی ژیان لە گەڵ خۆیاندا دەبەن، بەڵام جوانی ڕوخسار و دیمەنی تێك دەدەن، وەك برۆکان و ڕیش و برژانگەکان و جوانی ڕوخسار، وه هەندێك کاریش هەیە بە کردنیان جوانی ئەصڵی دیمەن و ڕوخساریان لانابات، بەڵکو کەماڵ و پلەی تایبەتییــان لادەدات، وەك (کــەوانە کردنی برۆکــان). واتە برۆی پەیوەست و کەوانەیی بێت و، ڕیــش و برژانگەکانی ڕەش و قەترانی بێت، وە هەروا درووستکرابێت ، بوونی جوانی و تەناسوب لە میانی ئەندامەکانی لەشدا[1] ، وە ڕەنگو ڕوخساری سوورو سپی بێت ، کە ئەمانە کۆمەڵە پلەیەکی جیاوازن و، هەریەکەیان جۆرە تایبەتمەندییەکی پێ دەدات.

هەر بەم شێوەیەش بەندایەتی وێنەیەکی تایبەتییە، شەریعەتی ئیسلام کێشاویەتی، فەرمانمان پێدراوە کە ئەنجامیان بدەین و، وەك عیبادەت جێ بەجێ یان بکەین، ڕۆح و ژیانە شاروەکانی ئەو عیبادەتە بریتییە لە خشوع و نییەت و، ئامادەیی و، حزوری دڵ و، بوونی ئیخلاص تیایاندا، وەك باسیان دێت.

وە ئێمە ئێستا لە باسی بەش و بابەتە ئاشکراکاندایین، بۆ نموونە ڕکوع و سەجدەبردن و هەستان و وەستان و پاشماوەی ئەرکانەکانی تر وەك نموونەی دڵ و جگەر و سەر و دەماخ وایە بە نیسبەت جەستەی مرۆڤەوە، بە نەمانی ئەمانە، هەموویان یان یەکێکیان نوێژەکە بوونی خۆی لە دەست دەدات و

---

(١) وەك ئەوەی کە باڵای ئاسایی بێت و پێڵوی چاوی گەورەبێت و لووتی بارێك و بەرزبێت و ناوچەوانی پان بێت و دەموچاوی خڕ بێت گەردنی بەرز بێت و سنگی فراوان بێت و قۆڵەکانی بەرز بێت و کەمەری بارێك بێت و ڕانەکانی پڕ بێت و هەندێك صیفاتی جوانی تر کە خودا نەخشاندبێتی، الإتحاف ٣/١٠٩.

باتڵ دەبێتەوە، وە ئەو سوننەتانەی کە باسمان کردن، لە دەست بەرزکردنەوەو دۆعای دەستپێکردنی نوێژ و تەحیاتی یەکەم وەك دەستەکان و چاوەکان و پێکانی مرۆڤە، وەك چۆن کەسێك ئەو ئەندامانەشی نەبێت هەر دەژی، ئاوا ئەگەر ئەو سوننەتانەش بەجێنەهێنێت نوێژەکەی هەر درووستەو بەتاڵ نابێتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە نەمانی چاوو دەست و پێ، دەیکاتە ئادەمییەکی ناجۆر و نەشیاوو بێزراو. هەروەك چۆن نوێژ بە بێ ئەو سوننەتانە وەك ئەوە وایە کە یەکێك بەندەیەکی جوانی (زیندووی) بە دیاری ناردبێت بۆ پادشایەك، بەڵام هەردوو دەست و لاقی بڕابێت،[1] ،

ئاداب و هەیئاتی نوێژیش ئەوەیە کە لە پشتی سوننەتەکانەوەیە، لە بەرامبەر جەستەی مرۆڤدا لە جێگەی ئەو ئەندامانە دادەنیشن کە هۆکاری جوانبوونی جەستەن، وەك برۆکان و ڕیش و برژانگ و ڕەنگ و ڕوخساری جوان.

وە ئەو شتە وردە ناسکانەی کە لە ناو سوننەتەکاندا بە ئادابە تایبەتەکان ئەژمار دەکرێن، ئەوە تەواوکاری صیفەتە جوانەکانن، وەك پەیوەستی و کەوانەیی برۆکانی و خڕی و پڕی ڕیشی و ئەوانی تر، کەواتە نوێژ لای تۆ هۆکاری نزیك بوونەوەی بەندەیە لە خوداوە و، دیارییەکی بە نرخە کە دەبێت لە ڕێگەیەوە خۆت لە خودا نزیك بکەیتەوە، تا جێگای ڕەزامەندی پادشای پادشایان بێت ، وەك چۆن کەسێك بیەوێت خۆی لە پادشایەکی دونیایی نزیك بخاتەوە کەنیزەکێکی نایابی بۆ دەنێرێت، دە بێت نوێژەکەی تۆیش هەوڵبدەیت ئاوا بێ عەیب بێت، چونکە دیارییەکەی تۆ دەخرێتە حزوری پەروەردگارەوەو، لە پاشان لە ڕۆژی حەشری گەورەدا کە هەموو کردەوەکان دەخرێنە

---

(١) رواه المروزي في (تعظيم قدر الصلاة) ص/٨٣، عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: **الصلاةُ قُربانٌ. إنَّما مَثَلُ الصَّلاةِ كَمَثَلِ رَجلٍ أرادَ مِن إمامٍ حاجةً فأهدى لَهُ هَدِيَّةً ....)**

بەرچاووە، ئەو نوێژەی تۆیش دەهێنرێتە حزوری خوداوە، کەواتە ئارەزو لە دەستخۆتدایە، یان وێنەو دیمەنی نوێژەکەت جوان و ڕازاوە دەکەیت، یان دێز و ناشیرین! ئەگەر جوانت پێشکەش کرد ئەوا کارێکی چاکت بۆ خۆت کردووە،خۆ ئەگەر خراپیشت کرد، ئەوا بارگرانیت لەسەر خۆت زیاد کردووە.

وە نابێت بەشی تۆ لە شارەزابوون و هەوڵدانت بۆ کتێبە فیقهییەکان، تەنها ئەوەندەبێت کە کارە سوننەت و فەرزەکانت لەیەکتری بۆ جودا بکاتەوە، ئیتر وات لێ بێت کە هەر وەصفێکی سوننەتت کەوتە بەر دڵت و، گەیشتە فەهم و تێگەیشتنت کە مادەم درووستە نەیکەیت، ئیتر وازی لێ بهێنێت و نەیکەیت، ئەگەروا بکەیت و بیربکەیتەوە، ئەوە وەك قسەی ئەو دکتۆرە وایە کە بڵێت:

هەڵکۆڵینی چاو ژیان تێك نادات و، بوونی خاوەنەکەی باتڵ ناکاتەوەو هەر دەژی، بەڵام لەوە دەری دەکات کە شیاوی ئەوە بێت خۆیی پێ نزیکخاتەوە لە سوڵتانەوە، ئەگەر وەك دیارییەك بیەوێت پێشکەشی بکات.

(واتە: یا ژیانیشی مسەوگەر بێت، بەلام شایستەیی حزوری پادشای دونیای نامێنێت) هەربەم شێوەیەش دەبێت تێبگەیت لە پلەو پایەکانی سوننەتەکان ئەو هەیئاتانەی کە پەیوەنداری سوننەتەکانن و ئادابە باسکراوەکانیش.

هەر نوێژێك کە بیکات و بە شێوەیەکی تەواو ڕکوع و سەجدەکانی تیا نەبات، ئەوە هەر بۆخۆیان دەبنە ڕکەبەر و خەصمی خاوەنەکانیان و لێیان دێنە زوبان و دەڵێن: خودا زایەت کات و بتفەوتێنێت وەك چۆن منت فەوتان.

بۆیە زۆر پێویستە سەرنج بدەیتە ئەو باس و بابەتانەی لە بارەی تەواوکاری نوێژ و ئەرکانەکانی و، ئەنجامدانی هاتووە لە ئەخبار و فەرموودەکان، تا بزانێت چ وەقع و کاریگەرییەکی هەیەو، چۆن دەبێت پابەندی لێ بکەیت.

وە پشت و پەنایشمان هەر بەخودای بە دەستەلاتە.

# دەروازەی سێیەم

## باسی مەرجە شاراوەکان

## لەو کردارانەی کە پەیوەنداری دڵەکانن

با لەم دەروازەدا باسی ئەو پەیوەندییەی میانی نوێژکردن و، خشوع و گەردن کەچی و، حزور و ئامادەباشی دڵ، وە باسی هۆکار و چارەسەریەکانی بکەین، لە پاشان بەدرێژی باسی ئەوە بکەین: کە چی پێویستە ئامادە بکرێت بۆ هەموو ڕوکنێك لە ئەرکانەکانی نوێژ، بۆ ئەوەی شیاو بێت کە ببێە توێشووی ئاخیرەت.

### ڕونکرنەوە لە بارەی مەرجی خشوع و ئامادەیی دڵ لە نوێژدا

بزانە: بەڵگەی بە مەرجگرتنی بوونی خشووع لە نوێژدا زۆرن، لەوانەیە کە خودا فەرموویەتی: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ (طه/١٤)

(نوێژەکەت بە چاکی بخوێنە بۆ ئەوەی یادی من بکەیت) (وە دەبێت مەرج و فرمانە شاراوەکانیش جێ بەجێ بکات و یادی خودا لە بیر نەکات)

ڕواڵەتی ئەم فەرمانەیش بۆ وجوب و پێویستییە، کەسێکیش غافڵبێت پێچەوانەی بێداری و زیکرکردنە، ئیتر کەسێك کە لە تەواوی نوێژەکەیدا غافڵ و بێ ئاگابێت، چۆن پێی دەوترێت کە نوێژی کردووە؟!

وە خودا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾ (الأعراف/٢٠٥)

واتە نەهی دەکات، کە لەو کەسە غافڵانەبێت، کە ئاگایان لە یاد و زیکری خودا نییە، ڕواڵەتی ئەم نەهیەش بۆ بەیانی حەرام بوونیەتی.

وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ (النساء/٤٣) هۆکاری چییە کە ڕێگەنەدراوە خەڵکی خۆیان سەرخۆش بکەن و نوێژ بکەن، بۆ ئەوەی بزانن چی دەڵێن و ئاگاتان لە خۆتان بێت، ئەمەش بە زۆری بۆ ئەو

کەسە بەکار دەهێنرێت کە سەرقاڵی کاری دونیا بێت و، کاتەکانی بە وەسوەسەو بیری پوچ و نەشیاو بباتە سەر.[1] وەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ((الصلاة تَمَسكُنٌ وتَواضُع))[2].بە هۆی ئەلفلامەوە حەصری کردووە، کەواتە تەنها ئەوە نوێژەو، هەرچی وانەبێت بە نوێژ ناژمێررێت، وە وشەی (إنَّما) کە بۆ دوپاتکردنەوەو لێکدانەوەو تەحقیقی تەواوەتییە، هەروەك چۆن فوقەهاکان واله واتای ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتوون کە دەفەرموێت: ((إنَّما الشُّفعَةُ فيما لَم يُقسَم[3] ،فإذا وقعَت الحُدود وصُرفَت الطُّرُق فلاَ شُفعَة)) واتە کاتێك بە شوفعە دەتوانێت ماڵێك هەڵبگرێتەوە، کە دابەخش نەکرابێت، بەڵام ئەگەر سنووری بۆ دیاری کراو ،ڕێگەی پێدا تێپەڕی،ئیتر شوفعە نامێنێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((من لَم تنهَه صَلاتُه عَنِ الفَحشاءِ والمُنكرِ لَمْ يَزدَدْ مِنَ اللهِ إلاَّ بُعْداً))[1]

---

(١)خودای گەورە باسی صیفەتی ئەولیا کان دەکات﴿قد أفلَح المُؤمنون الَّذينَ هُم في صَلاتِهم خاشِعُون﴾، دەبینیت ستایشی کردن بە نوێژکردن و، لە پاشان ستایشیان دەکات کە لە ناو نوێژەکانیاندا خشوع و گەردن کەچی باڵ دەکێشێت بەسەریادا،

(٢) رواه الطحاوي في (شرح مشكل الآثار)١٢٤/٣، وهو عند الترمذي (٣٨٥) بنحوه. واتای ئەصڵی فەرموودەکەش ئەوەیە کە بەم شێوەیە لێکدراوەتەوە: (إنَّما الصَّلاةُ تَمسكُنٌ وتَواضُعٌ وتَضرُّعٌ وتَأَوُّهٌ وتَنادُمٌ، وتَضَعُ يدَيكَ فتَقُول: اللَّهُمَ اللَّهُم، فمَن لَمْ يَفعَل فَهيَ خِداجٌ) بەڕاستی حەقیقەتی نوێژکردن بریتییە لە خشوع و گەردن کەچی و مل کەچی و، پاڕانەوە و ئاهو ناڵە و، ئاخ و حەسرەت و، دەربڕینی پەشیمانی و، هەردوو دەستیشت بەرزکەیتەوەو دوا لە خودا بکەیت : ئەی خودایە ئەی خودایە بکەیت، ئەگەر یەکێك بەم شێوە نوێژ نەکات ئەوە کەم بایەخ و نوقسانە.

(٣) رواه البخاري، (٢٢١٣)عن جابر (رضي الله عنه) قال: (جعل رسول الله ﷺ الشفعة في كر مالَم يُقسَمْ) فەرموودەکە ئەوە دەگەێنێت شوفعە تەنها بۆ ئەو کەس و ماڵەیە کە بەشنەکرابێت، وە ڕێگەی نەداوە کە ماڵی بەشکراو شوفعەی تێ بکەوێت.

واتە: ئەوەی نوێژەکەی لە کاری فاحیشەو خراپەکاری دووری نەخاتەوە، ئەوە تا بێت زیاتر لە خوداوە دوور دەکەوێتەوە، وە نوێژی ئادەمییەکی بێ ئاگاو غافڵ، هەرگیز لە کاری فاحیشەو نارەوا بە دوری ناخاتەوە. **((کَمْ مِنْ قائِمٍ حَظُّه مِنْ (قِيامِهِ)التَّعَب والنَّصَب))**[٢]،

زۆر کەس هەن کە بەشیان لە بەرامبەری کردنی نوێژەکانیان تەنها ماندووبون و نارەحەتییان بۆ دەمێنێتەوە، دیارە مەبەستی هیچ کەس و شتێك نەبووە جگە لەو کەسە نەبێت کە غافڵە لە نوێژەکەیدا.

هەروەها پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: ((**لیسَ لِلعَبدِ مِنْ صَلاتهِ إلاَّ مَاعَقَلَ مِنْها**))[٣]، واتە: نوێژ خوێن تەنها ئەوەندەی بۆ دەنوسرێت لە نوێژەکەی کە بەئاگاداری و تێگەیشتن و ئەقڵەوە ئەنجامی داوە، لەوە زیاتری بۆ نانوسرێت.

ڕاستی ئەمەش بەو شێوەیە: کە ئەوەی نوێژ دەکات لە حزوری خودای خۆیدا نزاو موناجات دەکات، وەك لە فەرموودەدا هاتووە[١]، دەی قسەیەکیش لەگەڵ بێ ئاگاییدا بێت، هەرگیز بە نزاو داواو موناجات ناژمێررێت.

---

(١) رواه الطبراني في الكبير ٥٤/١١، مرفوعاً.

(٢)قال العراقي أخرج النسائي وابن ماجه(١٩٦٠) من حديث أبي هريرة: **رُبَّ قائم ليس له من قيامه إلاالسَّهر**، ولاحمد(٣٧٣/٢)**(رُبَّ قائِم حظهُ مِن صَلاته السهر، وإسناده حسن)اهـ قلت:** لفظ ابن ماجه: **ربَّ صائم ليس له من صيامه الا الجوع، ورب قائم ليس له من قيامه الا السَّهر**، والرواية الثانية التى عزاها لأحمد هكذا رواه الحاكم والبيهقي. ينظر: الإتحاف ١١٢/٣.

(٣)أورده صاحب القوت في الحلية(٦١/٧: عن سفيان الثوري قال: **(يُكتب للرجل من صَلاته ما عَقل مِنها)**هكذا وقال العراقي لم أجده مرفوعا. وروى محمد بن نصر المروزى في كتاب الصلاة له من رواية عثمان بن أبي دهرش مرسلاً: **لايقبل الله من عبد عملا حتى يحضر قلبه مع بدنه**، قال الزبيدي١١٢/٣: ومن أدلة اشتراط الخشوع فى الصلاة ماروواه الديلمي عن أبي سعيد رفعهُ: **لاصلاة لمن لايخشع في صلاته**. وأخرج أيضا عن ابن مسعود رفعه **لاصلاة لمن لايطع الصلاة وطاعة الله أن تنهى عن الفحشاء والمنكر**.

ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە: ئەوەی زەکات دەدات با ئەو کەسە بێ ئاگاو غافڵیش بێت، ئەصڵی کارەکە پێچەوانەی ویستی نەفس و ئارەزواتی مرۆڤە و، قورس و گرانیش دەکەوێت لەسەری، هەروەها ڕۆژوگرتن بۆ خۆی زۆرانبازییە لەگەڵ نەفس داو، شکاندنی هەواو ئارەزواتی نەفەسە، کە ئامێرێکەو شەیتانی دوژمنی خودا بەکاری دەهێنێت، دوور نییە زەکات و ڕۆژو کە ئەگەر بە غافڵیش بیانکات مەرامەکەی خۆی بپێکێت، هەروەها حەج کردن؛

لەبەر ئەوەی چەندین کرداری قوس و گرانی تێدایە، وە هەوڵ و موجاهەدەی نەفسی تێدایە، کە ئازار بە خاوەنەکەی دەگەێنێت، حزوری دڵی هەبێت یان نەیبێت کاریگەری خۆی دەکات.

بەڵام نوێژکردن : ئەوەی لە ناو نوێژدایە، تەنها زیکر و فیکر و خوێندنی قورئان و ڕکوع و سەجدەبردن و، هەستانەوەو دانیشتنە کە بەیانیان دەکەین:

زیکری نوێژ: ئەو گفتوگۆو موناجاتەیە کە لە حزوری خودا دا دەیانکات، ئیتر یان مەبەست لەو قسانە ئەوەیە کە ڕوی گوتار و حیواری تێدەکات و دەیدوێنێت، یان مەبەست پێی، دەربڕینی پیت و دەنگەکانە، کە زوبانی پێ وەگەڕخات و پێی تاقی بکرێتەوە؛ وەك چۆن بە هۆی بەڕۆژو بوونەوە، خۆگرتنەوە لە خۆراك و لە درووست بوونی جینسی پێ تاقیدەکرێتەوە، هەروەك جەستەی مرۆڤ بە ناڕەحەتی کارە قورسەکانی حەجکردن تاقیدەکرێتەوە، وەك دڵێش بەوە تاقی دەکرێتەوە کە زەکاتی ماڵەکەی دەدات و ئەو ماڵە خۆشەویستەی لێ وەردەگیرێت.

بێگومان ئەم دابەشکردنە نەگونجاوو باتیڵە، چونکە زۆر ئاسان دەکەوێت لە سەر کەسێکی بێ ئاگا، کە زوبانی بەو وشەو ڕستانە بجوڵێنێت وەك وڕێنە

---

(١) البخاری(٤٠٥) قال ﷺ إن أحدکم إذا صلَّی(قام في صلاته) يناجی ربه ، ومسلم(٥٥١)

بکات، چونکە لەو ڕووەوە کە ئەمە کارێك بێت هیچ تاقیکردنەوەیەکی تێدا نییە، بەڵکو مەبەست لە پیتەکان و دەربڕینیان، واتاو قسەکردنەکانە، وە ناشبێت بە قسەکردن، ئەگەر دەربڕینێك نەبێت ڕەنگدانەوە لە ناخ و ناوەڕۆکی دەرون بکاتەوە، وە هەرگیز تەعبیر لە دەروونیش ناکاتەوە، ئەگەر بە ئامادەباشی دڵ نەبێت، کەواتە ئەوە چ جۆرە پرسیارێکە، کە لە حزوری خودا ﷻ دەڵێت: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ (٦/الفاتحة) خودایە ڕێنومایی ڕێگای ڕاستمان بکە و، دڵیش غافڵ و بێ ئاگابێت لەم داواکارییەی؟

وە ئەگەر مەبەستی لەم داواکارییە پاڕانەوەو نزاو لاڵاناوە نەبێت، چ ناڕەحەتییەکی تێدایە، لە جوڵاندنی زوبانی بەو ڕستەو پیتانە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە بوو بەمەلەکە بۆی و خوی پێوە گرتبێت؟!

ئەمەی باسمان کرد حوکمی زیکرەکانە.

بەڵکو دەڵێم: ئەگەر کەسێك وتی: بڕیاربێت سوپاسی فلان کەس بکەم و ستایشی چاکەکانی بکەم و، داوایەکیشی لێ بکەم، لە پاشان ئەم قسانە وەك (وڕێنە) لە کاتی نوستنیدا بە سەر زوبانیدا هات، دیارە کە وەفای بە سوێنەکەی نەکردووە، تەنانەت ئەگەر لە تاریکاییەکدا ئەم قسانەی بەسەر زاردا هات و، نەیدەزانی ئەو کەسە ئامادەیەو گوێی لێیەتی و نەیدەبینی، بەم حاڵەش هەر وەفای بە سوێنەکەی نەکردووە، چونکە کاتێك قسەکانی دەبێتە گوتارو قسەلەگەڵکردنی ئەو، کە ئەو کەسە لە ناودڵێدا ئامادەبێت و، ڕوی گفتوگۆکانی لەو کردبێت، بۆیە ئەگەر لە ڕۆشنایی ڕۆژیشدا بە ئامادەبوونی ئەو کەسەیە ئەم قسانەش بێت بە دەمیدا، بەڵام بێ ئاگا بێت و، نەشزانێت لەگەڵ کێ قسە دەکات و، بەبیرو ئەندێشەیەکەوە سەرقاڵ بێت، وە مەبەستیشی لە قسەکانی ئەوە نەبێت، کە ڕوی گوتاری لەو کردبێت، ئەوە وادانانرێت کە وەفای بە سوێندەکەی کردبێت.

(کەواتە لە هەر حاڵەتێکدا کە غافڵ و بێ ئاگابێت، ئەوە لە گەڵ کەسێکی ئاسایشدا بە ئامادەباش ناژمێررێت، ئیتر چۆن لە حزوری خودادا کە سێکی غافڵ ورێنە بکات بە بەندایەتی و ئامادەباشی بۆی دەژمێررێت؟!)

وە گومان لەوەدا نییە، کە مەبەست لە خوێندنەوەی قورئان و زیکرەکان، حەمد و سەناو ستایشی خودایەو، نزا و لاڵەو پاڕانەوەیە لە حزوری خودادا، ئەوەش کە ڕوی گوتارو قسەی تێ دەکات هەر خودایە، وە دڵیشی پەردەی غەفڵەتی دراوە بەسەردا، بەو بێ ئاگاییەی کە نازانێت لە حزوری کێدا قسە دەکات، نە دەیبینێت و نە دەیشی ناسێت[1]،

بەڵکو بێ ئاگایە لە حزوری ئەو کەسەی قسەی لە خزمەتدا دەکات و، زوبانیشی بە حوکمی فێربوون کە خوی پێوە گرتووە دەجوڵێت و لێی بێ بەهرەیە، کەواتە ئەمە زۆر دوورە لەوەی کە دامەزراندن و واجب بوونی نوێژی بۆ دیاری کراوە، کە ئەوەیە دڵەکان پاڵفتە بکات و، هێلەساوەیان بدات و، بە زیکری خودا بڕواکەی تازە بکاتەوەو، لە دڵیدا بە چاکی جێگیر ببێت.

ئەمەش کە ڕونمانکردەوە، حوکمی خوێندنەوەی زیکرەکانە لە نوێژدا، کەواتە پوختەی قسە ئەمەیە: کە هیچ ڕێگەیەك نییە نکولی لە بوونی ئەم تایبەتمەندییە بکات لە قسەکردندا، کە لە کرداری نوێژەکە جودای دەکاتەوە.

---

(١) مەبەست لە ناسینی خودا و بینینی ئەوەیە: کە بە هۆی ناوەکانی و صیفەتەکانیەوە بیناسێت، ئەمەش بە پێی جیاوازی پلەو مقامی کەسەکان، ئەوەی تەنها زانایی و بەتوانایی خودا دەزانێت جیاوازە لەوەی کە ئاگادارەو سەرسامە بە بینینی دروستکراوە پڕ لە نهێنییەکانی پەروەردگار، وە شارەزای تەگبیر و جوانکاری و حیکمەتی کارەکانی خودایە، ئەینا ناسینی خودا لە سەر پێوەری حەقیقەت و ڕاستی ئەوە هیچ کەسێك نەبووە ئەم تەماداریەی بوبێت و تووشی سەرسامی چاو داخستن نەبووبێت. الإتحاف٣/١١٣.

مەبەستیش لە ڕکوع و سەجدەکان، بە گەورە زانین و بڕیاری بەهاو قەدرگرانی پەروەردگارە، ئەگەر درووست بێت بوترێت ، کە ئەو کەسە گەورەیی بۆ خودا بڕیارداوەو، بێ ئاگاو غافڵیشە لە قسەکانیدا، ئەوا درووستیش دەبێت کە بووترێت:

ئەو بتەی بە گەورە ناساندووە کە لە بەردەستیدا دانراوە، کە غافڵو بێ ئاگایشە لێی، یان ئەو دیوارەی لە بەردەمیدایە بە گەورەی زانیوە، کە لێیشی بێ ئاگایە.

خۆ ئەگەر لەوە دەربچێت کە بەگەورەوە سەیرکرابێت و بەهاداری بکات، ئیتر جگە لە جوڵاندنەوەی سەر و زوبانی، چی تری بۆ دەمێنێتەوە، ئەوندەیش نارەحەتی تێدا نییە، تا بووترێت : ئەوە تاقیکراوەتەوە بە وتنی ئەو قسانە، لە پاشان نوێژیش بکرێت بە کۆڵەکەی دین، وە دابنرێت بە سنووری جیاکەرەوەی میانی کوفر و ئیمان، وە لە حەج و هەموو بەندایەتیەکانی تریش پێشبخرێت، تا وای لێ بێت، ئەگەر کەسێك بەتایبەتی نوێژ نەکات بە تۆڵە بکوژرێتەوە!

ئەوەی دەیبینم، ئەوەنییە کە ئەم هەموو گەورەیی نوێژە تەنها بە هۆی کرداره ڕواڵەتیەکانی ناو نوێژەوە بێت، مەگەر مەبەستی سەرەکی موناجات و پاڕانەوەی بخرێتە پاڵ، ئەو کاتە نرخی زیاد دەبێت و، لە ڕۆژو و زەکات وحەجکردن بەهادارتر دەبێت، بەڵکو لە قوربانیی خێر و چاکەکانیش گەورەتردەبێت ،کە جیهادی نەفسیان تێدایەو، ماڵ و موڵکیان پێ کەمدەبنەوە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**لَنْ يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُمْ**﴾ (الحج/٣٧) (گۆشت و خوێنڕژانەکەی بە خودا ناگات، بەڵکو ئەوەی بە خودا دەگات ئەوە تەقواو خۆپارێزی یەکەیەتی،) واتە:

ئەو صیفەتەی کە زاڵ دەبێت بەسەر دڵدا، کە وای لێ کردووە فرمانبەرداریی خودا بکات. هەروەها حاڵی نوێژیش وەهایە، خودا چ کارێکی بە

کردار و قسەکان هەیە، ئەگەر تەقواو ئامادەباشی دڵی تیا نەبێت؟ ئەمەیە لە ڕوی واتاوە کە بە مەرجگیراوە دڵ ئامادەباش بێت، ئیمجا نوێژی کردووە.

**ئەگەر بڵێیت:** ئەگەر بەم شێوە حوکم بدەیت بە بەتاڵبوونەوەی نوێژەکەی، وە حزوری دڵت کردە مەرجی درووستی نوێژەکەی، ئەوە پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانی فیقهی ئیسلامی بوویت، خۆ ئەوان تەنها لە کاتی دابەستنی نوێژیان بە مەرج داناوە کە دڵ بە ئاگا بێت، نەك لە تەواوی نوێژەکەدا؛

**ئەوە بزانە:** لە پەڕاوی زانستدا باسمانکرد، کە فوقەهاکان، دەستەڵاتیان بەسەر باطیندا ناشکێت تا حوکمی بەسەردا بدەن، وە دڵەکانیشیان لەت نەکردووەو ئاگاداری ڕێگای ئاخیرەتیش نین، بەڵکو بنەمای حوکمە شەرعییەکانیان لەسەر زاهیری ئەو کردارانە دادەنێن، کە بە ئەندامەکانی جەستە دەکرێن، دەشزانین کە بە زاهیری هەر کردارێك ڕێکدەکەوێت، کە حوکمی کوشتن و تۆڵە سەندنەوەو تەمبێکرنی سوڵتانی لە سەر بکەوێت و لابدرێت، بەڵام ئەو بابەتەی کە ئایا سوود بە ئاخیرەتی دەگەیێنێت؟

ئەوە کاری فوقەهاکان نییە. وە لە سنووری کاری (فیقە)دا نییە، وە ناشکرێت کە بڵێیت:

ئیجماعی لەسەرە، کە تەنها لە کاتی نوێژدابەستن دا حزوری دڵ پێویستە، چونکە دەگێڕنەوە لە بیشری کوڕی حاریثەوە، وەك ئەبوطالیبی مەککی لە سوفیانی سەوری گێڕاوەتەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) کە فەرموویەتی:

ئەوەی لە نوێژدا خشوع و حزوری دڵی نەبێت، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە[1].

وە(حەزرەتی) حەسەنی بەصری فەرموویەتی:

هەر نوێژێك دڵی تیا ئامادەنەبێت، ئەوە زیاتر و خێراتر بەرەو ڕوی لێپێچینەوەو

---

(١) قوت القلوب٢/٩٧.

تۆڵەی خودایی دەبات[1].

هەروەها (حەزرەتی) معازی کوڕی جەبەل فەرموویەتی:

هەرکەسێك بە قەصدی لەنوێژدا بزانێت کێ لەلای ڕاست و چەپیەوەیە ، ئەوا خێری نوێژەکەی بۆ نانوسرێت و بە نوێژدانانرێت[2] ،

وە پێغەمبەری خودا ص فەرموویەتی:

**((إِنَّ العَبَد لَيُصلِّي الصَّلاة لايُكتَب لَه سُدسُها ولا عُشرُها، وإِنَّما يُكتَب لِلعَبْدِ مِن صَلاتِه ما عَقَل مِنها))**[3]

واتە: بەندەی وا هەیە کە نوێژ دەکات، شەش یەك، یان دە یەکی خێری نوێژەکەی بۆ نانوسرێت، ئەوەندەی خێر بۆ دەنوسرێت کە لێی حاڵی بووە و زانیویەتی لە حزوری خودادا چی دەڵێت.

ئەم فەرموودە ئەگەر لە کەسێکی تر وەربگیرایە جگە لە پێغەمبەر ﷺ دەیانکرد بە پەیڕەوو مەزهەبی خۆیان، ئیتر نازانم (کەفەرموودەی پێغەمبەریشە ﷺ)چۆن پابەندی لێ ناکرێت؟!

عەبدولواحیدی کوڕی زەید فەرمووی:

کۆدەنگی زانایان لە سەر ئەوەن؛ لەو نوێژەدا کە بەندەیەك دەیکات، هیچی بۆ ئەو نانوسرێت و خێری ناگات، مەگەر ئەوەندەی کە بە ئەقڵ و ئاگاداریی و

---

(١) رواه الطوسی في (أربعينه)(١١) والخبر في القوت: ٢/٩٧.

(٢) قوت القلوب٢/٩٧، وقال: وقد أسنده إسماعيل بن أبي زياد عن بشر بن الحارث وغيره.

(٣)) قال العراقي أخرجه أبو داود والنسائي وابن حبان من حديث عمار بن ياسر بنحوه اهـ. قال الزبيدي الإتحاف٣/١١٦: وأحمد: **إنَّ الرجل لينصرف وما كُتب له إلا عُشر صلاته، تسعها ثمنها، سبعها،سدسها،خمسها، ربعها، ثلثها، نصفها.** وفي رواية للنسائي: **إن الرجل ليصلى ولعلَّه أن لا يكون له من صلاته إلا عشرها** الخ وفي رواية له أيضا: **منكم مَن يصلى الصلاة كاملةً، ومنكُم من يصلى النصف والثلث والربع.** الخ ورجاله رجال الصحيح.

داناییەوە کردبێتی.[1] کەواتە خشوع و حزوری دڵی کردووە بە ئیجماع.

ئەوەش کە لەم بارەوە لە زانا خۆپارێز و، زانایانی ئاخیرەتەوە وەرگیراوە، زۆر لەوە زیاترە کە سەرژمێر بکرێت، [2].

ئەوەی ڕای درووست بێت ئەوەیە کە هەموو ئەو بابەتانە ڕو بەڕوی بەڵگەکانی شەرع بکرێنەوە، [3].

وە هەموو ئەو هەواڵ و فەرموودە و ئەسەرانەی بەئاشکرا حزوری دڵیان بە مەرج داناوە، بەڵام ئەوەندە هەیە بۆ تەکلیفە زاهیریەکان، بە پێی نەتوانین و کەموکوڕی هیممەتی خەڵکەکە فەتوایان بۆ دەدرێت، ناکرێت ئەوە بە مەرج بگیرێت بۆ هەموو کەسێك، کە دەبێت لە هەموو نوێژەکەدا دڵی ئامادە بێت و غافڵ نەبێت، ئەوە مەگەر کەمینەیەك، ئەینا هەموو ئادەمییەکان ناتوانن ئەو مەرجە جێ بەجێ بکەن.

---

(١) قوت القلوب٢/١٠٢.

(٢)ثم ساق صاحب القوت فقال وقال رسول الله ﷺ (**من تشعَّبت بهِ الهُموم لَم يُبالِ الله في أى أوديتها هلك**، وقد كان ابن مسعود يقول: **ركعتان من زاهد أفضل من ألف ركعة من راغب في الدنيا** ومما نقله النووى عن القاضي الحسين(٤٠٦/١)في التهذيب انه قال: **اذا انتهى بالمُصلى مدافعة الأخبثين أي أن ذهب خشوعه لَم تصحَّ صلاته)**، الإتحاف ١١٦/٣.

(٣)ئەبو زەیدی مروزی دەفەرموێت: فەرموودەی صەحیحی مەشهور ئەوەیە: کە نوێژکردن بەو شێوەیە کە دڵ ئاگادار نەبێت کەراهەتی هەیە و بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام وەك شێخی زوبەیدی دەفەرموێت: تەنانەت ئەگەر بەلای فوقەهاکانیشەوە حزوری دڵ مەرج نەبێت، ئایا وا باشتر نییە کە بە پێی ئیحتیاط بجوڵێتەوەو ،تام و چێژی موناجاتی حزوری خودای دەست بکەوێت و، تەقوای لا گرنگ تر بێت لە فەتوا. الإتحاف٣/١١٥

ئەگەر نەتوانین مەرجی بوونی ئەو خشوع و ئامادەیی دڵە، تەواوی هەموو نوێژەکــە بگرێتـــەوە، دەبێت هـــەرنەبێت ئەوەنــدە بگرێتەوە کە ناوەکەی بیگرێتەوە، با چرکەیەکی تایبەتیش بێت، باشترین کاتیش کە دەبێت خشوعی هەبێت و حزوری دڵی هەبێت، کاتی دابەستنی نوێژەکەیە.

کەواتە ئەوەندەمان لەسەر واجب کردوون، کە دەبێت لە کاتی نییەتهێناندا دڵی ورياو بێدار بێت، تا نوێژەکەی دروست بێت و دابمەزرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هیوامان وایە، کە هەموو نوێژەکەی بە غەفڵەت و بێ ئاگایی نەباتە سەر، وەك کەسێك کە هیچ حزورێکی نەبێت، هەرچەندە بە گشتی بە حزوری دڵەوە نوێژەکەی دابەستووە و، با چرکەیەکیش بێت ئامادەیی و خشوعی بۆ پەیدا بووە.

ئەمەش وەك ئەو کەسەوایە، کە نوێژی کردبێت و نەیزانیبێت کە بە بێ دەستنوێژی کردوویەتی ، هەرچەندە لای خودا نوێژەکەی بەتاڵە، بەڵام پاداشتێکی خۆیی هەیە، لەبەر ئەوەی کە نەیزانیوەو نوێژیشی کردووە، بەم پێیە بەهانەکەی وەردەگیرێت و، واجبەکەی لەسەر نامێنێت؟!

لە گەڵ بوونی ئەم هیوایەش، ترسی ئەوەش هەیە، کە حاڵی ئەو کابرا لە حاڵی ئەو کەسە خراپتر بێت، کە هەر لە سەرەتاوە نوێژی نەکردووە، ئەمەش زۆر ڕێی تێدەچێت وابێت، چونکە کەسێك ڕێگەی حزوری پێ بدرێت و ، بە کەمتەرخەمی و بە بێ نرخی و بەهاوە سەیری ئەو شوێن و مقامە بکات و، وەك کەسێکی غافڵ و بێ ئاگا قسە لە حزوریدا بکات، حاڵی ئەو کەسە خرابترە لەوەی کە هەر لە سەرەتاوە نەهاتبێتە پێشەوە بۆ خزمەتکردن؟!

لە کاتێکدا هۆکارەکانی خۆف و ڕجا بەرامبەر یەکتر وەستان و، فەرمانەکە هەر لە سەرەتاوە مەترسی تێدابوو، تۆیش دەتوانی ڕای باشتر بۆ خۆت هەڵبژێریت، یان ئیحتیاط بکەیت و، مەرجی ئامادەباشی و حزوری دڵ بە

پێویست بزانێت، یان بە پێی بڕیار و فەتوای فوقەهاکان بجوڵێتەوەو، ئاسانکاری بۆ خۆت بکەیت، لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانیت ئەو فەتوای زاناو فەقیهەکان داویانە لەبارەی درووستی نوێژی غافڵەوە ڕەد بکەیتەوە[1].

چونکە فەتوا لە سەر بنەمای زەروورەت و پێویستی دراوە، وەك ڕونمانکردەوە.

ئەوەی سیڕو نهێنیەکانی نوێژ بزانێت، دەزانێت کە غەفڵەت و بێ ئاگایی دژایەتی نوێژی تەواوە، بەڵام لە دەروازەی باسکردنی جیاوازیەکانی میانی زانستی زاهیر و باطیندا، لە پەڕاوی (بنەماکانی باوەڕ)دا باسمانکرد، کە ئەو ئاسانکاریەی لە فەتوادا کراوە، لەسەر بنەمای بێ هیممەتی و نەتوانینی خەڵکەکەیە، کە ناتوانین هەموو ئەوباس و نهێنیانەی کە بوونیان هەیە بۆیان باس بکرێت.

کەواتە با ئەوەندە بەس بێت لە ڕونکرنەوەی ئەم باسە، ئەوەی موریدی ڕێگەی ئاخیرەت بێت، ئەوەندەی باسکرا دەبێتە جێگەی متمانە بۆی، ئەوەش کە ئەهلی جەدەل و ئاژاوەو قسە بەزۆراندانە، ئێمە لێرەدا نامەنەوێت ڕوی گوتارمان لەو کەسە بکەین.

---

(١) بەلای ئیمامی غەزالیەوە خشوع ی ناو نوێژ مەرجی درووستی نوێژە، بەلای مەزهەبەکانی ترەوە ، واتە زۆربەی زاناکان بە سوننەت دانراوە، وەك ئیمامی ڕافیعی و نەووی و زۆربەی هاوڕێبازەکانی شافیعی لە سەری بوون، بەڵام ئەبوطالیبی مەکیی و عارفەکانی تر خشوعیان بە مەرج داناوە بۆ دروستی نوێژەکە، غەزالیش لە سەر ڕای عاریفەکانە، وە ئەو بەڵگانەی کە غەزالی هێناونێتیەوە نیشانەیە لە سەر ئەوەی کە کەماڵی نوێژ دەبێت بە حزوری دڵەوە بێت، دیارە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە میانی نوێژێکی پڕ لە غەفڵەت و نوێژێکی پڕ لە حزوری دڵ و ئامادەباشی.

## پوختەی قسە ئەمەیە:

### ئامادەبوونی دڵ:

ئامادەبوونی دڵ، بریتییە لە ڕۆحی زیندوی نوێژەکە، وە کەمترین هۆکار کە ئەندازەیەکی کەمیش هەناسەیەکی ژیانی ئەو نوێژەی پێوە بمێنێت، ئەوەیە هەر هیچ نەبێت لە کاتی سەرەتای دابەستنی نوێژدا، حزوری دڵی هەبێت، لەوە کەمتریش بێت، ئەوە بەرەو هیلاك و فەوتاندنی تەواوی دەبات، وە چەندێکیش ئامادەبوونی زیاتریشی هەبێت لە نوێژدا، ئەوە ڕۆحی نوێژەکەی بەهێزتر دەکات، وە ڕۆحەکە بە پارچەکانی ناو نوێژەکەدا بڵاو دەبێتەوە.

زۆر کەسی زیندوو هەیە و، کە سەیری دەکەیت هیچ جوڵەیەکی نییە، وەك کەسێکی نزیك لە مردوو دەژمێررێت، بەڕاستی نوێژی کەسێك کە تەنها لە نییەتەکەدا ئاگای لە خۆی بێت، وە لە هەموو نوێژەکەدا غافڵ و بێ ئاگا بێت، ئەوە وەك ئەو زیندووە وایە کە جوڵەی نییەو، وەك مردوو دەژمێررێت.

داوامان لە خودایە کە یارمەتی دەری چاکمان بێت.... ئامین.

# ڕونكرنەوەی ئەو واتا شاراوانەی کەژیانی نوێژی پێ تەواو دەبێت

بزانە:

ئەم واتایانە دەستەواژەی تەعبیری زۆر هەن لە بارەیانەوە، بەڵام لە شەش ڕستەدا کۆ دەبنەوە: حزورو ئامادەیی دڵ، وە تێگەیشتن، وە بەگەورەزانین، وە بوونی سام و هەیبەتی نوێژ، وە هیواو ڕجا، وە شەرم و حەیا.

با لە پێشەوە بەدرێژی باسیان بکەین، لە پاشان باسی هۆکارەکانیان، لە کۆتاییشدا چۆنیەتی وەدەستهێنانیان و چارەسەر پێکردنیان.

## سەرەتا ڕونکرنەوەیان بە درێژی:

**یەکەم: حزوری دڵ:** مەبەستمان پێی ئەوەیە:

دەبێت دڵی خاڵی بکات لە هەرشتێك کە پەیوەنداری نیەو، پێیەوە نەلکاوە و، لێی جودا نابێتەوە و بە هۆیەوە قسەی پێ دەکات.

کەواتە زانایی بەو کردار و گوفتارەی کە ئەنجامی دەداتە دەبێت لێیان جودا نەبێتەوەو، پەیوەست بێت بێت پێیانەوە، نابێت بیر و فکری بەملاولادا بڕوات و، لە کارو قسەکانی دوور بکەوێتەوە، چونکە هەرچەندێك بیری نوێژخوێن لای نەدا لەو فرمانەی کە دەستی پێ کردووە، وەك ئەوەی لە ناو دڵیدا یادو بیری ئەو فرمانەی تێدا بوو کە لەناویدا دەژی، وە غەفڵەت و بێ ئاگاییەکی وەها ڕوی تێ نەکردبوو کە پێچەوانەی ئەو یادو زیکرە بێت، ئەوا بەم شێوەیە ئامادەیی و حزوری دڵی بۆ پەیدا دەبێت.

**(دووهەم): تێگەیشتن:**

بەڵام ئەگەر بتوانێت لە واتای قسەکانی حاڵی ببێت کە دەیکات، ئەمەش لە دوای حزوری دڵەوە پەیدا دەبێت، لەوانەیە دڵ لەگەڵ وشەکاندا ئامادەبێت،

بەڵام لەگەڵ واتای وشەکاندا ئامادەنەبێت، بۆیە مەبەستمان لە تێگەیشتنی قسەکان ئەوەیە کە: لەگەڵ حزوری دڵدا لە واتای قسەکانیش تێ بگات.

ئەمەش مقامێکی تایبەتییە، خەڵکەکە هەر یەکە بە شێوەیەك لێی حاڵی دەبێت، چونکە ئەوە بەمەرج نەگیراوە لە نوێژدا کە دەبێت لە واتای قورئان و تەسبیحاتەکان حاڵی ببێت، دەبینین زۆر واتای ناسك و جوان هەیە لە ناو نوێژەکەدا لێی تێ دەگات و بیری بۆی دەچێت، کە پێشتر بە خەیاڵی دڵیشیدا نەهاتووە، هەر لەم ڕووەوەیە کە نوێژ دەبێتە ڕێگر و نەهی دەکات لە کاری خراپەو ناپەسەند، ئەوکاتە لە هەندێك فرمانی تایبەتی حاڵی دەبێت، کە ئەو فرمانانە بە دڵنیاییەوە لە خراپەو فەسادو کاری نابەجێی دوور دەخەنەوە.

**(سێیەم)بەگەورە زانین:**

ئەمەش کارێکی ترە لەدوای حزوری دڵ و، تێگەیشتنی واتاکانەوە پەیدا دەبێت، چونکە ڕێکدەکەوێت پیاوێك قسە لەگەڵ بەندەکەیدا بکات و، دڵیشی لای قسەکانی بێت و لێیشی حاڵی ببێت، بەڵام هیچ گەورەییەکی بۆ بڕیار نەدات، کەواتە لەکاتی قسەکردن لە حزوری خودادا، دەبێت بە تەعزیم و گەورەیی موناجاتی لە خزمەتدا بکات، کە زیادەیەکی پێویستە لە مەرجەکانی تر کە باسکران، (ئەگەر سەرنج لە گەورەیی و جەلالی پەروەردگار نەدەیت، حزوری دڵ هیچ بەرهەمێکی بە پێزی نابێت).

**(چوارەم)سام و هەیبەت:**

ئەمەش مەرجێکی زیادەیە لە بەگەورەزانین، بەڵکو بریتییە لە ترسێك کە لەسەر بنەمای بەگەورە زانینی خودا دروست دەبێت، چونکە ئەوەی نەترسێت، ناوترێت کە سامی لەو شتە کردووە، وە هندێك ترسان هەیە بە سام و هەیبەت ناو نابرێن، وەك ئەوەی کە لە دوپشکێك، یان بەدڕەوشتی کەسێك دەترسێت و هاووێنەکانی ئەمانە، لە هۆکارە نزم و بێ بەهاکان، ئەوە بە

مەهابەت و سام لێکردن ناناسرێت، بەڵکو ترسان لە سوڵتانێکی شکۆدار ئیمجا بەسامدار دەناسرێت، کەواتە سامکردن لەیەکێك، ترسێکە دەچێتە دڵیەوە ، سەرچاوە کەی شکۆمەندی و دەستەڵات و گەورەیی ئەو زاتەیە کە لێی دەترسێت.

**(پێنجەم)بەهیوابوون:**

بێگومان ئەمەش زیادەیەکی ترە، زۆر کەس هەیە لە پادشایەکی گەورە دەترسێت و سامیشی لێ دەکات و، خۆی لە تۆڵەو سزایشی دەپارێزێت و، هیچ هیوایەکیشی پێی نییە کە پاداشتی بداتەوە، بە تەمای چاکەیشی نییە، بەڵام بەندە لە حزوری خودادا، دەبێت بە نوێژەکەی بە هیوای پاداشت و ئەجری پەروەردگاری بێت، وەك چۆن لە بەرامبەری کەموکوڕییەکانیدا دەترسێت لە تۆڵەو سزاکانی خوداوەندی ﷻ .

**(شەشەم) شەرمکردن:**

ئەمەش صیفەتێکی ترە لە دوای هەموویانەوەیە دێت، لەسەر ئەو بنەما پەیدا دەبێت، کە هەست بە کەموکوڕی و کەمتەرخەمی خۆی دەکات لە نوێژ و گوێڕایەڵیدا ، وە گومانی تاوانباری و گوناهباری بە خۆی دەبات، بۆ یە شەرم و حەیا لە حزوریدا دەکات، وە ڕێدەکەوێت کە یەکێك بەگەورە دەزانیت و دەشترسیت لێی و، هیوای پاداشتیشت پێی هەیە، بەڵام لە دڵدا شەرمی لێ ناکەیت، بۆیە لەحزوری خودادا حەیاکردنیش مەرجێکی درووستی بەندایەتییە، ئەمەش بەو هەست کردن بە گوناهباری خۆی درووست دەبێت کە باسکرا[1] ،

---

(١) شەرم و حەیا دووجۆری هەیە: یەکەمیان نەفسانییە و هەموان تێیدا بەشدارن، وەك ئەوەی کە شەرمەکات گیانی دەربکەوێت، وە ئیمانیش هەیە کە ڕێگری کردەوەی حەرامی لێ دەکات لە ترسی خودا، هەیە شەرم تەنها لە خەڵکیدەکات، یان لەخۆیشی

## هۆکارکانی ئەم شەش واتایە

بزانە: هۆکاری ئامادەبوونی دڵ، بوونی هیممەتە لەو کەسەدا، دڵی تۆ شوێنکەوتووی ئەو شتەیە کە گرنگی پێ دەدەیت، بۆ شتێك ئامادە دەبێت، کە بە بایەخەوە بۆی بنوارێت، وە هەرچەندێك زیاتر گرنگی بە فرمانێك بدەیت ئەوەندە باشتر دڵت لای ئامادە دەبێت، پێی خۆش بێت یان نا! چونکە دڵ بەم شێوە داهاتووە و لەسەری ڕاهاتووەو وە بۆی دروستکراوە.

خۆ ئەگەر دڵ لە ناو نوێژیشدا ئامادە نەبێت، مانای ئەوەنییە ئیتر لەکار کەوتووە، بەڵکو بەدوای ئەو خەتەرەو خەیاڵاتەدا دەسوڕێتەوە لە کاروباری دونیایی، کە هیممەتەکەی بەدوای دا دەگەڕێت، کەواتە هیچ پلان و چارەسەرییەکت دەست ناکەوێت، کە دڵەکەت ڕابکێشیت بۆناو نوێژەکەت ، جگە لەوە نەبێت کە ڕوی هیممەتی خۆت لە نوێژەکەت بکەیت، وە ناشتوانیت ئەو هیممەتە بەرەو نوێژەکە یەکلایی بکەیتەوە، ئەگەر بۆت ڕون نەبێتەوە، کە مەبەستی سەرەکیت بەسراوە بەو کارەوە کە ئەنجامی دەدەیت، ئەمەش بڕواو متمانەکردن و دڵنیابوونە لەوەی، کە ژیانی دوارۆژ باشترو بەردەوامترە، وە نوێژکردنیش وەسیلەو هۆکارێکە، بۆ وەدەستهێنانی ئەو ژیانە. ئەگەر ئەم زانست و هیممەتەی پشتڕاستکرایەوە، بەو ڕاستییەی کە حەقیقەتی دونیا و بایەخدان بە کارەکانی زۆر سوك و بێ بایەخ و بێ بەهایە لەلای، ئەو کاتە زیاترو چاکتر لە نوێژدا حزوری دڵی بۆ ئامادەدەبێت.

وە بە نموونەی ئەم هۆکار و عیللەتەی باسمانکرد، ئەگەر لەبەردەم گەورە پیاوانێکدا ئامادە بوویت، لەوانەی کە ناشتوانن سوود و زیانت پێ بگەیەن، ئەوادڵت لە گەڵیاندا ئامادەدەبێت، دەی ئەگەر لە حزوری پادشای پادشاکاندا

---

دەکات، هەیشە شەرم لە خودا وای لێ دەکات شەرم لە هەموو شتێکی تریش بکات .

حزوری دڵت بۆ پەیدانەبێت، کە هەموو زیان و قازانجێکیشی بەدەستە، ئیتر جگە لە لاوازی ئیمانەکەت، بە دوای هۆکاری تردامەگەڕێ، کەواتە هەوڵبدەو ئێستا تێبکۆشە، بۆ زیاتر بەهێزکردنی بڕواکەت، وە ڕێگاکەیشی دەتوانیت بگرێتە بەر، وەك لە شوێنی تردا باسی دێت.

**وە هۆکاری تێگەیشتن ئەوەیە:** دوای ئامادەبوونی دڵ، بیرو هۆش و زیرەکی و مێشکی بخاتە کار، کە لە واتای ئەو قسانە حاڵی ببێت کە دەیانکات.

چارەسەرکرنەکەیشی بەوە دەبێت:

کە چۆن دەتوانێت دڵی ئامادە بکات و ڕو لە بیر و فیکری واتاو مەبەستەکان بکات و، خۆی کۆکاتەوە دژ بەو خەتەرەو خەیاڵاتەی کە بە لاڕێدا دەیبات.

وە چارەسەریش بۆ ئەوەی لەو خەتەرانە دووری بخاتەوە بەوە دەبێت: کە بنەبڕی هۆکار و بنەماکانی بکات، واتە: خۆی لەو هۆکارانە لابدات، کە نەفسی ڕادەکێشێت بۆ خەتەرەو خەیاڵاتی لابەلا، خۆ ئەگەر لەو ماددەو بنەماو هۆکارانە خۆی نەپچڕێنێت و، وازیان لێ نەهێنێت، ئەوا ناتوانێت خەتەرەکانی دڵی لێیان دوورخاتەوە، چونکە هەرکەسێك شتێکی خۆش بوێت، زۆرتر و زیاتر ناوی دەبات، ناوی خۆشەویستیش هەرچی دووبارە ببێتەوە، زیاتر زاڵ دەبێت بەسەر دڵدا و، دڵی لێ پڕ دەبێت، بۆیە دەبینین ئەوانەی غەیری خودایان خۆشدەوێت، ناتوانن نوێژەکەیان لە خەتەرەو خەیاڵاتی لابەلا بپارێزن.

## چۆنیەتی بە گەورەزانینی خودا:

ئەوەش حاڵەتێکە بۆ دڵ پەیدا دەبێت و، لە ئەسەری دوو زانین و شارەزاییەوە پەیدا دەبێت:

**یەکەمیان:** ناسینی جەلال و عەزەمەت و گەورەیی خودایە، کە ئەمەش لە بنەماکانی بڕوا دەژمێررێت، چونکە هەرکەسێك بڕوای خۆی لەسەر گەورەیی ئەو دانەمەزرابێت، نەفسیشی ملکەچی فرمان و عەزەمەتی ئەو زاتەیە نابێت.

**دووهەم:** ناسینی نەفسی خۆیەتی: کە چەندێك سوك و بێ بەهایە، کە بەندەیەکی ژێردەستەی لاوازە، لە بەردەستی تەوانایی پەروەردگاریەتی. بەم دوو ناسین و زانیارییە، دامەزراوی دڵ و گەردن کەچی و خۆ شکاندنەوەو خشوع و ملکەچی زیاتری بۆ خودای گەورە پەیدا دەبێت، کە بەواتای تەعزیم و بەگەورە زانین لێکدەدرێتەوە.

وە هەرکەسێك لەپاڵ دەرکەوتنی گەوریی پەروەردگاردا، بێ نرخی و بێ بایەخی نەفسی خۆیشی بۆ یەکلایی نەبوبێتەوەو ، پێکەوە تێکەڵیان نەکات، ناتوانێت حاڵەتی خشوع و ملکەچی و تەعزیمی خودا لە دڵیدا ڕێك بخات. چونکە ئەوەی کاری بە کەسێکی تر نەبێت، ئەمینیش بێت لە نەفسی خۆی، دروستە کە جگە لە صیفەتەکانی گەورەیی لە کەسێکی تر شارەزا ببێت، بێ ئەوەی صیفەتی خشوع و بەگەورە زانینیشی ببێت، چونکە ئەوحاڵەتەی نییە، کە نزمی و بێ بایەخی خۆیی بۆ دەرکەوتبێت، وەك وتمان هەرکەسێکیش ئەم حاڵەتە و گەورەیی خودا لە دڵیدا پێکەوە نەبەسرێنەوە، ئەوا لە واتای عەزەمەت و خشوعی ڕاستەقینەش حاڵی نابێت.

## باسی سام و هەیبەت و ترسان لە خودا

ئەمەش حاڵەتێکی نەفسییە، لەوەوە بۆت پەیدا دەبێت، کە زاناو شارەزابیت بە توانا و دەستەڵات و قودرەتی پەروەردگار، کە بۆ هەرچی مەیلی هەبێت توانای ئەو پێی دەگات و، زۆر کەمیش لای بەلادا دەکاتەوە، چونکە ئەوەندە ئەرزش و بەهای نییە، تا بایەخی پێ بدات، خۆ ئەگەر هەرچی درووستکراوە سەرەتایی و دواییەکان هەیە، هەموویان بفەوتێن و نەمێنن، یەك گەردیلە لە موڵکی خودا کەم ناکەنەوە، لە لایەکی تریشەوە دەبینین:

ئەو هەمو بەڵاو ناڕەحەتیانەی هاتوون بەسەر پێغەمبەران و ئەولیاو دۆستانی خودادا لەگەڵ ئەوەشـــدا دەتوانێت لایانـــدات و دووریان بخـــاتەوە، بە

پێچەوانەی پاشاکانی سەرزەوی[1]،
واتە تا زاناتر بێت بەخودا، (ترس و سام و(خشیةالله) لەدڵیدا زیاتر دەبێت، وەك لە پەڕاوی خەوف دا، لە چواریەکی ڕزگارکەرەکاندا پشت بەخودا باسی دەکەین.

**باسی ڕجاو بەهیوابوون:**

هۆکارەکەی ئەوەیە، کە تۆ دەزانیت خودای گەورە چەندێك بە لوتف و میهرەبان و بەخشندەو دەست کراوەیە، نیعمەتەکای گشتگیرە و، دەستی قودرەتی ناسکە و، جوانکاری لە هەموو شتێکدا دیارو ئاشکرایەو، بەڵێنەکانی وەك خۆیان دێنە دی ، کە گفتی بەهەشتی بەوانەداوە کە نوێژدەکەن، کاتێك متمانەی تەواوی هەبوو، وەدڵنیا بوو لە بەڵێنەکانی، وە ئاگاداربوو کە چەندێك بەلوتفو میهرەبانە، هیوایەکی زۆر بەهێز دەچێتە ناو دڵیەوە و، چاوەنواڕی لوتف و پاداشتی لێ دەکات.

**باسی شەرم وحەیا:**

کاتێك هەست دەکات کە کەم و کوڕی زۆری هەیە لە بەندایەتیدا و، دەشزانێت کە ماف و حەقێکی زۆری خودای گەورەی بەسەرەوەیە و، ناشتوانێت لەو بارگرانییە دەربچێت، ئەو شەرم و حەیایە دای دەگرێت و، ئەمەش چەندێك زیاتر زانابێت بە عەیبەکانی خۆی و، ئافات و دەردەکانی نەفسی نالەبار و، خراپی نەبوونی ئیخلاص و دڵسۆزی لە کارەکاندا و، نابوتی و ڕەشی و پیسی ناودەروون و، حەزکردن و هەڵپەی هەمیشەیی بۆ بەش و دەسکەوتی خێرایی دونیا، ڕوی کردارەکانی تەنها لەبەر مەرامی تایبەتی بێت، کە دەشزانێت گەورەیی و عەزەمەتی خودا چی لێ داوا دەکات، وە دڵنیاش بێت

---

(١)کەناتوانن بەڵاکان لابدەن و دەستەڵاتیشیان بەردەوامی نییەو کەم دەبێتەوە الإتحاف١٢٣/٣

لەوەی کە خودا ئاگادارە بەسەر هەموو نهێنی و قسەو خەتەرە شاراوەکانیدا و، چەندێك بیانشارێتەوەو وردتر بێت، ئەوەندە ئاشکراو و دیارتر دەبێت، کاتێك ئەم هەموو زانیاریانەی بە دڵنیاییەوە زانی و، ڕاستیەکانی بەم شێوە بۆ دەرکەوت، حاڵەتێکی لێ پەیدا و ئاشکرا دەبێت، کە پێی دەڵێن شەرم و حەیا.

ئەمەی کە باسمانکردن هۆکارەکانی وەدەست هێنانی ئەم صیفەتانەیە، کەواتە هەر چییەك بەدوایدا گەڕایت و، مەبەستت بوو کە بە دەستی بهێنیت، ئەوا دەبێت لە پێشەوە بە دوای هۆکارەکانیدا بگەڕێیت، کە هۆکارت زانی چارەسەرەکەیشی دەدۆزیتەوە، ئەوەی کە هەموو جەمسەرەکانیش بەیەك دەگەێنێت و، هەموو هۆکارەکان دەبەستێتەوە بە یەکەوە، بوونی ئیمان و یەقینە، مەبەستم پێی: ئەو هەموو مەعریفەت و زانیاریانەی کە باسمان کردن، واتای ئەوەش کە متمانەی هەبێت، ئەوەیە کە هیچ گومانێکی نەمێنێت، وە ئەو حزورو ئامادەباشییە هەموو دڵ بگرێتەوە، وەك چۆن لە باسی یەقیندا لە (پەڕاوی زانست)دا باسمانکرد، وە بە ئەندازەی بوونی یەقین، دڵیش پڕی دەبێت لە خشوع، بۆیە (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی:

**((كان النبيُّ ﷺ يُحدِّثُنا ونُحَدِّثُهُ. فإذا حَضَرتِ الصَّلاة كأَنَّهُ لَم يَعْرِفْنا ولَم نعرفْهُ))**[1].

واتە پێغەمبەر ﷺ حاڵی وابو کە لەماڵەوە لەناوماندابوو، فەرمایشت و قسەی لەگەڵ دەکردین و قسەشمان لە گەڵ دەکرد، کاتێك نوێژ بهاتایەتە

---

(١) قال الحافظ ابن رجب في (فتح الباري) ١١٤/٤.: خرجه الحافظ أبو الحسين بن المظفر في (غرائب شعبة) وساق سنده عن عائشة قالت: **(كان رسول الله ﷺ إذا كان عندي ...كانَ في مِهنَةِ أهلهِ. ، فإذا نودِيَ بِالصَّلاةِ ..كأن لَم يَعرِفْنا.)** وأيَّد هذه الزيادة برواية أخرى عند أبي زرعة في تأريخه. وأصل الحديث عند البخاري (٦٧٦).

پێشەوە وای لێ دەهات، وەك ئەوەی نە ئەو ئێمەی ناسیبێت و، نە ئێمەش ئەومان ناسیبێت .

وە دەگێڕنەوە کە خودای (عَزَّ وجَلْ) وەحی و نیگای کرد بۆ (حەزرەتی) موسا (سەلامی خودای لەسەر) و فەرمووی:

**((يامُوسَى إذا ذَكَرتَني فاذْكُرني وأَنتَ تَنتَفِضُ أعضاؤُك، وكُن عِندَ ذِكري خاشِعاً مُطمَئِنّاً، وإذا ذَكَرتَني فاجعَل لِسانَك مِن وَراءِ قَلبِكَ، وإذا قُمتَ بينَ يَديَّ فقُم قيامَ العَبدِ الذَّليلِ، وناجِني بقَلب وَجِلٍ، ولِسانٍ صادِقٍ))** [١].

واتە: ئەی موسا؛ ئەگەر زیکرو یادی منت کرد، بەو شێوە یادم بکە کە هەموو ئەندامەکانی لەشت بلەرزێت و بهەژێت، وە لەکاتی زیکری مندا بە دڵت گەردن کەچ و خاشع بە، ئەندامەکانی جەستەت با ئارام بن، وە کە ناوی منت برد، با زوبانت بە دوای دڵتدا بێت، واتە:

بزانێت چی دەڵێت و لێی حاڵی بوبێت، وە ئەگەر لە کاتی موناجاتدا هەڵسایت و داوات لێکردم، وەك بەندەیەکی زەلیل و بێ دەستەڵات خۆت ڕابگرەو، بە کزی و زەلیلی بپاڕێرەوە، بە زوبانێکی لەرزۆك و دڵێکی پڕ لە ترس و خۆفی خوداوە، وە بە زوبانێکی پاراوی پڕ لە ڕاستگۆیی ، کە لەگەڵ ئاهی دڵتدا یەکبگرنەوە...

وە دەگێڕنەوە کە خودا وەحی کرد بۆ (حەزرەتی) موسا (سەلامی خودای لەسەر) و فەرمووی:

**((قُل لِعُصاة أمَّتكَ لا يَذكُروني، فإنِّي آلَيتُ علَى نَفسي أَنَّ مَن ذَكَرني ذَكرتُه، فإذا ذَكَروني ذَكَرتُهم باللَّعنَةِ))** [٢].

---

(١) رواه الدينوري في (المجالسة وجواهر العلم ص/٣٧٩)، وأبونعيم في الحلية ٥٥/٦.

(٢) قوت القلوب ٥٧/١. بلفظ: وروينا في الإسرائيليات :

(واتە: بڵێ بە یاخی و تاوانبارانی ئوممەتەکەت، با بە تاوانەوەو بە تەنها زوبان یادی من نەکەن، من لەسەر خۆمم پێویست کردووە، ئەوەی بەدڵ و بە پوختەیی یادی من بکات، منیش بە سۆز و ڕەحمەتەوە ناوی ئەو دەبەم، بەڵام ئەگەر بە زوبان و حاڵەتی یاخی بوونەوە ناوی من ببات، ئەوە منیش بە دورخستنەوەو دەرکردنی ئەو لە ڕەحمەتی خۆم یادی دەکەم! )ئەمە کەسێکی یاخی یەو، غافڵیش نییە! ئاوا بە توندی خودا لە گەڵیدا دەجوڵێتەوە، ئەی ئەگەر هەردوو صیفەتی غەفڵەت و تاوانکاریشی تێدا کۆبێتەوە، دەبێ چ هەڕەشەیەکی خودا چاوەنواڕی بکات؟!.

وە بە پێی ئەو جیاکارییەی کەباسمان کرد، خەڵکەکە دەبن بە دووبەشەوە: **یەکێکیان** تەواوی نوێژەکەی بە غەفڵەت و بێ ئاگایی دەباتە سەر و، بۆ چرکەیەکیش دڵی بێدار نییە.

وە **بەشێکی تریش** ئەوەیە کە بۆ چرکەیەکیش دڵی غافڵ نابێت و، بە وریایی و بێدارییەوە نوێژەکەی دەکات، بەڵکو ئەوندە فیکر و بیری کۆیەو بێدارە لە نوێژەکەیدا، هەرگیز هەست ناکات بەوەی لە بەردەم و چواردەوریدا ڕودەدات، بۆیە موسلیمی کوڕی یەسار (خودای لێ ڕازی بێت) هەستی نەکرد بەوەی کە لە مزگەوتەکەی بەصرەدا کۆڵەکەکەی کەوتە خوارەوە و، هەموو کەس لێی کۆ بووبونەوە و، ئەو هەستی پێ نەکرد و نوێژەکەیشی نەبڕی[١].

---

أوحَى اللهُ (عَزَّ وجَلْ) لِنَبيِّهِ موسَى وداوود (عليهما السلام)... بنحوه. چونکە کەسێکی یاخی و تاوانبار خۆی چاك نەکات و بەو جورئەتەیشەوە لە حزوری خودادا قسەبکات و، بە حیساب یادیشی بکات، ئەوە هەرگیز لێی قەبوڵ ناکرێت و، تووشی ئەو لەعنەت و غەزەبە گەورەیە دەبێت پەنا بەخودا...

(١) رواه ابن عساكر في (تأريخ دمشق) ٥٨(١٣٥/)، وهو في قوت القلوب(١٠٢/٢).

وە هەندێکی تریان ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبوون و، هەرگیز نەیاندەزانی کێ لای ڕاستیان یان چەپیان نوێژ دەکات.[1] .

وە دەنگی لێدانی دڵی (حەزرەتی) ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر) لە دوری دوو میلەوە دەبیسترا[2] .

وە کۆمەڵێکی تریش لە کاتێکدا دەچوونە نوێژەوە، ڕەنگیان زەرد هەڵدەگەڕاو، گیانیان دەکەوتە لەرزینەوە.

ئەمانەش کە باسی دەکەین، هیچیان بە دوور مەزانە، زۆر لەوە زیاتر دەبینرێت لە ئەهلی دونیا و خۆف و ترسیان لە پادشاکانی دونیا، کە چەندێکیش لاوازن و بێ هێزن، ئەوانیش لە بەرامبەریاندا دەترسن و، ڕەنگیان زەرد دەبێت و، ئەوەش کە بەتەماینی، بەشێکی بێ نرخی بێ مایەی دونیایە، کە لەوانەوە دەستی بکەوێت، تەنانەت هەندێکیشیان دەچێتە ژورەوە بۆ لای وەزیرێك، یان پادشایەك کارێکی لە گەڵ باس دەکرد و دەڕۆشتە دەرەوە، ئەگەر لێیان پرسیایە کێ لەو ناوە بوو، یان جل و بەرگی پادشا چۆن بوو؟

نەیدەتوانی وەڵامیان بداتەوە، چونکە ئەوەندە سەرقاڵی سام و هەیبەتی پادشابوو، کە تووشی هەڵەیەك نەبێت لە بەردەمی دا، نەیدەپەرژایە سەر سەیرکردنی پۆشاك و بەرگ و دانیشتوانی مەجلیسەکەی.

وە هەریەکەیان پلەیەکی تایبەتیان هەیە، لە پاداشتی ئەو کردەوانەی کردوویانە، بەشی هەریەکەیان لە خێری نوێژەکەیان بە ئەندازەی ئەو ترس و بیم و خشوع و بەگەورە زانینی پەروەردگارەیە لە دڵیاندا، چونکە خودای گەورە

---

(١) ئەو زاتە (حەزرەتی) سەعیدی کوڕی جوبەیر بووە کە چل ساڵ بەم شێوە نوێژی کردووە، بنواڕە: قوت القلوب : ٩٧/٢.

(٢) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق (٢٠٨/٦) بنحوه.

سەیری ناو دڵیان دەكات، نەك ڕواڵەتی جوڵەو هەڵس و كەوتیان،[1] هەر لەبەر ئەمەیشە كە هەندێك لە ئەصحاب (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویانە:

**((يُحشَر الناسُ يَومَ القيامةِ عَلى مِثالِ هَيأتِهِم في الصَّلاة، مِن الطُّمأنينةِ والهُدوءِ، ومِن وُجودِ النَّعيم بِها واللَذَّةِ))**[2].

واتە: ئەو خەڵكە لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر شێوەی حاڵەت و چۆنیەتی نوێژەكەیان زیندوودەكرێنەوە، لە بارەی ئارامی و هێمنی و بێدەنگی یەوە، وە لە بوونی نیعمەتەكان و تام و چێژی تایبەتی.

بەڕاستی (ئەبوهورەیرە) (خودای لێ ڕازی بێت) ڕاستی فەرمووە:

هەموو كەسێك لەسەر ئەو حاڵەتەی كە مردووە زیندودەكرێتەوە،[3] وە دەشمرێت لەسەر ئەو حاڵەتەی لەسەری ژیاوە، وە چاودێری ئەو حاڵەتەی دەكرێت كە دڵی لەسەری بووە، نەك حاڵی شەخصی خۆی، چونكە لە صیفەتەكانی ناو دڵ، وێنەكان دەكێشرێن لە شوێن و ئاوەدانی ئاخیرەتدا، (بە پێی دڵی لێپیچینەوەی لەگەڵدا دەكرێت)، كەسیش ڕزگاری نابێت مەگەر بە دڵێكی ئارامی پوختەی بێگەردەوە چووبێتەوە حزوری خودا، داوامان لە خودایە كە ڕێنومایی ڕێگەی سەركەوتن و سەرفرازیمان پێ ببەخشێت، وە بە لوتف و كەرەمی خۆی، یارمەتی و تەوفیقمان بدات ئامین.

---

(١) كما رواه مسلم (٢٥٦٤) مرفوعا: **(إنَّ الله لاينظُر إلى أجسادِكُم ولا إلى صُوَركم، ولكن يَنظرُ إلى قُلوبِكُم، وأشارَ بأصابِعهِ إلى صَدرِهِ)**.

(٢) قوت القلوب ٩٨/٢، وعنده ٤٦/١، قال: ويقال: **( إن العبدَ يُحشَرُ عندَ المَوتِ مِن قبرِهِ على هَيئَتهِ في صَلاتهِ، مِنَ السكونِ والطمأنينَةِ، وتكونُ راحته في الموقف على قَدر راحته وتنعمهِ بالصلاة)**، وروينا معنى هذا عن أبي هريرة.

(٣) كما في مسلم (٢٨٧٨) مرفوعا **(يبعث كل عبد على ما مات عليه)**.

# دیاریکردنی چارەسەری بە سوود بۆ ئامادەبوونی دڵ

بزانە: بەڕاستی ئیماندار دەبێت گەورەیی خودا لە دڵیدا جێگیر ببێت، وە لێی بترسێت، وە بەهیوای پاداشت بێت، وە شەرمی هەبێت بەرامبەر بەو کەموکورییەی کە هەیەتی، وە دوای بڕواهێنانیشی لەم حاڵەتانەی جودا نابێتەوە، با هێزی ئیمانەکەیشی بە قەدەر هێزی یەقین و متمانەکەی بێت.

وە هێچ هۆکارێکیش نییە لەم حاڵەتانەی جودا بکاتەوە، جگە لە پەرتەوازەیی فیکر و بەشبەش بوونی خەتەرەکانی نەبێت، کە دڵیشی دوور کەوتبێتەوە لە موناجاتی خوداوەندی، وە لە نوێژەکەیدا لە حاڵەتێکی پڕ لە بێ ئاگاییدا بژی، بەڕاستی تەنها ئەو خەتەرەو خەیالاتە بەربڵاوانەیە، کە نوێژەکەی لە حزوری دڵدادەبڕێت و دوری دەخاتەوە، کەواتە تاقە دەرمانی بەسوود و کاریگەر،بۆ ئەوەی لە نوێژدا حزوری دڵی بۆ پەیدا ببێت ئەوەیە کە ئەو خەتەرەو خەیالانە لابدات، وەهەتا ڕێگایشی بۆ تەخت نەکات و هۆکارەکەی لانەبات ئەوەیشی بۆ لانادرێت، کەواتە لە سەرەتاوە پێویستە هۆکارەکەی بزانێت.

## هۆکاری ئەو خەتەرانەی کە دێنە ناو دڵی:

هۆکارەکەی یان فرمانێکی دەرەکییە، کە بە یەکێك لە هەستەکان دەزانرێت، یان فرمانێکی شاراوەی دەروونییە:

**فرمانە دەرەکییەکە:** ئەو شتانەی کە دەدرێن بە گوێیدا و ئاشکرادەبن بۆ چاو، ئەوە بە ڕاستی خەفەتەکان دەپێچێتەوە، وە تا چەندێك شوێنیان دەکەوێت، ئەوە کاریگەری لەسەری دەبێت، (واتە: بە هۆی بیستن و بینینەوە خەتەرەی خراپی بۆ پەیدا دەبێت، ئەگەر بیشیان پارێزێت، ئەوا بیرو فیکری لە پەرتەوازەیی دەپارێزێت، ئەگەر گوێیشیان بۆ شل بکات، ئەوە) بیرو فیکری ڕایدەکێشێت بۆ خەتەرەو خەیالاتی تر، وە بەم شێوە تا بێت لە ئاڵۆزیدا دەبێت

و کۆتایی نایەت، تا شت ببینێت زیاتر بیری پێ دەکاتەوە، وەهەندێك لەو بیرکردنەوانەیش دەبنە هۆکاری هەندێکی تر[1]، وە هەرکەسێك کە خاوەنی نیەتێکی بەهێز و هیممەتێکە باڵا بێت، ئەو خەتەرەو بیرو ئەندێشانەی دێن بە مێشکیدا بە هۆی حاسسە هەستیاریەکانیەوە، لە ڕاستە ڕێی حەقیقەت لای نادات و سەرقاڵی ناکات، بەڵام مرۆڤی لاواز هەروا دەبێت، کە بیر و فیکری ئاڵۆزو پەرتەوازە دەبێت و، بۆی کۆنابێتەوە.

## چارەسەریەکەی:

دەبێت ڕێگای ئەو هۆکارانە لەسەر دڵی ببڕێت، بەوەی کە چاوی خۆی دابخات[2]، یان نوێژ لە شوێنێکی تاریکدا بکات، یان شتێك لەبەردەمیدا نەبێت کە فیکر و هۆشی سەرقاڵ بکات، وە چاك وایە لە دیوارێکەوە نزیك بێتەوە، تا لە نوێژەکەیدا بەراییەکی زۆر لەبەردەمیدا نەبێت کە بیبینێت، وە خۆی بپارێزێت لە نوێژکردنی سەر شەقامەکان، یان لەسەر ئەو جێگایانەی کە نەخش ونیگاریان تێدا کراوە، یان لەسەر ڕایەخی

(١) وەك شێخی زوبەیدی دەفەرموێت: پێویستە پەلە بکات ئەو خەتەرەو خەیاڵانە لە خۆی دوور بخاتەوە، بەهۆی مورشیدێکی ڕاستەقینەوە، ئەینا خاوەنەکەی دەبێتە کەسێکە نەگبەت و بێزراوو، هیچ دەرمان و چارەسەریەکیش ناتوانێت تیماری دەردەکانی بکات، وە سەری بەرزناکاتەوەو، ڕێگەی هیدایەتی لێ دەگیرێت و، شوێن حەق و ڕاستی ناکەوێت، وەك سەرەتای ژیانی ئاوا دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕێی بەدبەختی و گومڕایی. بنوارە: الإتحاف١٢٦/٣. کەواتە دەبێت گوێ و چاوی ببەستێت و، دڵی بپارێزێت لە خراپی ئەم دوو هۆکارە نالەبارە، نەك هەر لە نوێژەکەیدا، بەڵکو پێش نوێژەکەیشی دەبێت هەوڵی خۆپارێزی بدات.

(٢) نابێت چاوی بەملاولادا بگێڕێت، خۆی بە پابەندی بوون بە ڕێنماییە سوننەتەکانەوە ببەستێتەوە، با سەیری بەرسەجدەی خۆی بکات، نەك چاوی دابخات.

چنراوی ڕەنگاو ڕەنگ[1]،
هەر لەبەر ئەمەیە کە خواناسەکان لە خانوویەکی بچوکی تاریکدا نوێژیان دەخوێند، کە فراوانیەکەی بە ئەندازەی جێگە سەجدەکەیان دەبوو، بۆ ئەوەی زیاتر بیرو فیکریان کۆکاتەوەو بەملاولادا نەڕوات[2].

بەڵام بەهێزەکان دەهاتنە ناو مزگەوتەکان و، چاویان دادەخست و، جگە لە جێگەی سەجدەکانیان سەیری شوێنی تریان نەدەکرد، وایان دەبینی کە کەماڵی نوێژ ئەوەیە کە لای چەپ و ڕاستی خۆیان نەبینن.

(حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) لە جێگەی سەجدەکەیدا، هەر قورئانێکی بدیایە دابنرایە یان هەڵبواسرایە لای دەدا، وە هەر شمشێرێکی بدیایە ئەوا لای دەداو هەڵی دەگرت، وە هەر نوسراوو پەڕاوێکیشی بدیایە کە لەسەر دیوارێك نوسرابێتەوە ئەوا دەیسڕییەوە.

## بێینە سەرباسی هۆکارە باطینی و شاراوەکان:

بەڕاستی ئەو هۆکارانە بەهێزترن، چونکە هەرکەسێك خەفەت و سەرقاڵی دونیا بیخاتە ناو شیوو دۆڵەکانی پڕ لە بیرو خەیاڵاتی دونیا ویستییەوە، ئەوە بیری لەیەك فەنن و هونەردا نابەسرێتەوە، بەڵکو بەردەوام لەم لاوە دەفڕێت بۆ ئەولا، تەنانەت ئەگەر چاوەکانیشی دابخات، ئەم بیربڵاوی و پەرتەوازییەی کۆناکاتەوە، کەواتە ئەوەی لە پێشترەوە کەوتۆتە ناو دڵیەوە، بەسە بۆ ئەوەی

(١) وەك ئێستا ئەو خەڵکە دوچاری ڕازانەوەو نەخش و نیگارنی مزگەوتەکان بوون و، وادەزانن ڕێزگرتنە لە مزگەوت. نازانن کە ئەوە نوێژخوێنەکان سەرقاڵ و غافڵیان دەکات، کە بەکێکە لە داهێنراوە هەرە خراپەکان، الإتحاف١٢٧/٣.

(٢) ففی البخاري (٣٨٢) ومسلم(٥١٢): عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: كنت أنام بين يدي الرسول ﷺ ورجلايَ في قِبلَتهِ، فإذا سَجَدَ غَمَزَني. فَقبضتُ رِجلي، فإذا قامَ بَسَطتُهما. قالت: والبيوتُ يَومئذٍ ليس فيها مَصابيح)

کاری تێ بکات و، هیچ دەرمان و چارسەریەکیش سوودی پێنەگەیێنێت.

**ڕێگەچارە:** کەواتە دەبێت بە هەموو توانایەوە هەوڵبدات، خۆی بگێڕێتەوەو، لە واتای خوێندنەوەی قورئانەکە حاڵی ببێت، وای لێ بکات بەهۆی تێگەیشتنی لە قورئان و تەسبیحاتەکان، خۆی پێیانەوە خەریك دەکات ، وە بۆ گەیشتن بەم مەرامە، دەبێت پێش دابەستنی نوێژەکە خۆیی بۆ ئامادە بکات، بیر لە دوارۆژ بکاتەوە و، بزانێت لە بەردەم چ مەترسیەکدایە، کە ئێستا ڕادەوەستێت لە حزوری خودادا و، موناجاتی لە خزمەتدا دەکات و،بیریش لە ترسناکی ڕۆژی دوایی دەکاتەوەو، دڵیشی لە هەموو پەیوەندیەکی دونیایی خاڵی دەکات، بەم شێوەیە خۆی بۆ دابەستنی نوێژەکەی ئامادە دەکات، وای لێ دێت مەرامێکی تایبەتی نامێنێت کە بیری پەرتەوازەبکات و، تەنها بیر لە نوێژەکەی دەکاتەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ بە عوسمانی کوڕی شەیبەی فەرموو:

**((إِنِّي نَسيتُ أَنْ أقوُلَ لَكَ أَنْ تُخَمِّرَ القِدرَ الذي في البَيت، فإنَّه لا يَنبغي أنْ يَكونَ في البَيتِ شَيءٌ يَشغُل النَّاسَ عَن صَلاتِهِم))**[1]،

(واتە: من لە بیرم چوو کە پێت بڵێم: سەری مەنجەڵەکە داپۆشە و ئاگرەکەی خەفە بکە، کە لەناو حەرەمی پیرۆزی کەعبەدایە، نابێ لە ماڵەکاندا شتێك هەبێت، کە ئەوەی نوێژ دەکات بیری بەملاولادا بڕوات و مەشغوڵی بکات.)

---

(١)قال العراق رواه أبو داود(٢٠٣٠) بلفظ: (**إني نسيتُ أن آمُرَكَ أَن تُخَمِّرَ القَرنَينِ. فإِنَّه ليسَ ينبغي أن يكونَ في البيتِ شيءٌ يشغِلُ المُصلي**) مەبەست لە وشەی: القرنين: ئەو دوو شاخە بەرانەیە کە کرا بە قوربانی بۆ (حەزرەتی) ئیسماعیل. من حديث عثمان الحجي وهو عثمان بن طلحة، كما في مسند الامام أحمد(٦٨/٤) ووقع للمصنف أنه قاله لعثمان بن شبية وهو وهم اهـ قلت: لم أجد هذا الحديث في ترجمة عثمان ابن طلحة في المسند، فلعله ذكره في موضع آخر ، ورأيت بخط الحافظ ابن حجر قال: صوابه عثمان بن شيبه اهـ ، وإن كان عثمان يكنى أبا شيبة فهو كما ذكر الغزالي وارتفع الخلاف، الإتحاف١٢٨/٣.

ئەمەیە ڕێگەی دامرکاندنەوە و هێورکردنەوەی بیرو فیکرە ئاڵۆزەکانە، ئەگەر شەپۆلی بیرو خەتەرە نامۆکان بەم هەموو دەرمان و چارەسەریانە هێور نەبوویەوە، ئەوا پێویستی بە دەرمانی ڕەوانی هەیە، واتە چارەسەرییەك كە بە ڕەگ و ڕیشاڵیدا بچێتە خوارەوە، وە ماددە کوشندەکانی ناو دەروونی هەڵبکەنێت، بەوەی کە سەرنج بدات لەو کار و فرمانانەی بووەتە هۆکاری ئامادە نەبوونی دڵ لە نوێژەکەدا، دیارە ئەوەی ناهێڵێت حزوری دڵی هەبێت، ئەو هەموو کار و سەرقاڵیانەیە کە بایەخی پێداوە، ئەمەش بە هۆی شوێن کەوتنی ئارەزووەکانیەتی، کە دەبێت بەوە تۆڵەی لێ بسەنێتەوە لە ئارەزوات خۆی دووربخاتەوە، وە ئەو پەیوەندییە دونیاییانە بپچڕێنیت، چونکە هەر شتێك ببێتە هۆی ئامادەنەبوونی دڵ لە نوێژدا، ئەوە دوژمنی ئاینەکەیەتی، وە بە سەربازی شەیتان دەناسرێت، وە مانەوەو هێڵانەوەی ئەو ئارەزواتە لە دەرونیدا زیانی زیاتر لێ دەدات، لە دەرپەڕاندن و دەرکرنی، کەواتە بە دەرکردنی ئەو ئارەزواتە بۆ یەکجاری ڕزگاری دەبێت لێی، وەك دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك ئەو کراسە(ڕەشە چوارگۆشەیەی) لەبەر کرد، کە ئەبو جەهمی عەدەوی بۆی هێنابوو، وە نیشانەیەکی پێوە بوو، ئەویش نوێژی پێوەکرد، دوای نوێژەکەی کراسەکەی داکەند و فەرمووی صەڵات و سەلامی خودای لەسەر: **((إذهَبُوا بِها إلى أبي جَهم فإنَّها ألهَتني آنِفاً عَن صَلاتي، وأتوني بأَنْبَجَانِيَّةِ أبي جَهم))**[1]، (واتە: بیبەنەوەو بیدەنەوە بە ئەبو جەهم، تۆزی لەمەوپێش لە

---

(١)قال العراقي متفق عليه، البخاري(٣٧٣)، ومسلم(٦٢/٥٥٦)، من حديث عائشة وقد تقدم في العلم ا هـ وقال هشام عن أبيه عن عائشة قال النبي ﷺ **كنتُ أنظر إلى عملها وأنا في الصلاة فأخاف أن تفتني** قال الزبيدي ١٢٩/٣: وهذا التعليق رواه مسلم وغيره بالمعنى الثاني في باب الالتفات في الصلاة: حدثنا قتيبة بن سعيد حدثنا سفيان عن الزهري عن

نوێژەکەمی لادام و ئەنجابیەکەی ئەبی جەهمم بۆ بهێننەوە، کە کراسێکی قایمی بێ نیشانەبوو. )

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی دا، کە سەری نەعلەکەی کە پێی دەبەسترێتەوە، کۆن بووەو بۆی تازەبکەنەوە، لە پاشان لە نوێژەکەیدا سەیرێکی کرد، کە تازەیەو لەوانەیە دڵی ببات بەلای خۆیدا، فرمانی دا کە تازەکە لادەن و کۆنەکەی بۆ دابنێنەوە.

**((ثُمَّ نظَرَ إليه في صَلاتهِ فَأمَرَ أَن ينزعَ منها وَيردَّ الشِراكُ الخَلَقْ))** [1].

وە جارێکی تر پێغەمبەری خودا ﷺ: **((كان ﷺ قد اتَّخذ(احتَذى) نعلين، فأعجبَه حُسنُهما فسَجَد وقال: تواضَعتُ لِرَبِّي عزَّوجَل كَي لا يَمقتني، ثُمَّ خَرج بهما فدَفعَهُما إلى أوَّلِ سائلٍ لَقِيَه، ثمَّ أمرَ عَليا كرَّم الله وجهَه أنْ يَشتَري لهُ سَبْتِيَّتَينِ))** [2]، واتە: سەرپاییەکی لەپێکرد و جوانیەکەی سەرنجی ڕاکێشاو یەکسەر سەجدەیەکی برد، وە فەرمووی: ملکەچی و تەوازوعم بۆ خودا کرد، بۆ ئەوەی لێم تووڕەنەبێت، لە پاشان ڕۆشتە دەرەوەو سەرپاییەکەی بەخشی بەیەکەم سواڵکەر کە پێی گەیشت، وە فەرمانی دا بە (حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) کە دووسەرپایی بۆ بکڕێت (کە لە پێستی مانگا درووست کراو بوون و دەباغ کرابوون)، بۆی هێناو لە پێی کرد.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ ئەموستیلەیەکی ئاڵتونی لە دەستدابوو پێش

---

عروة وعن عائشة أن النبي ﷺ صلى في خميصةٍ لها أعلام، فقال شغلتني أعلام هذه، اذهبوا بها إلى أبي جهم واتوني بأنبجانيتهِ اه

(١)قال العراقي راوه ابن المبارك في الزهد(٤٠٢) من حديث أبي النضر مرسلا باسناد صحيح اهـ

(٢)قال العراقي رواه أبو عبد الله ابن خفيف في شرف الفقهاء من حديث عائشة باسناد ضعيف اهـ قال الزبيدي ١٣١/٣.: وأبو عبد الله بن خفيف هذا شيرازى من كبار الأئمة ويعرف بالشيخ الكبير وله ذكر وصيت، وكذا ورد في القوت : /١٠٥،

ئەوەی حەرام بکرێت، وە لەسەر میمبەرەکەی بوو، فڕێی داو فەرمووی:
((شَغلَني هذا نَظرةً إليهِ ونَظرةً إلَيكُم))[1]، واتە: ئەوەندەی مەشغوڵکردم جارێك سەیری ئەوو جارێکیش سەیری ئێوەم دەکرد.

وە دەگێڕنەوە کە ئەبوطەلحە (خوای لێ ڕازی بێت) لە ناو باخێکدا نوێژی کرد کە درەختێکی تێدا بوو، بینیم کۆترێکی (دوبسی) هەڵفڕی و دەیویست بچێتە دەرەوە، ماوەیکی کەم چاوی بە دوایدا گێڕا و ئیتر نەیزانی چەندڕکات نوێژی کردووە، ئەم ڕوداوو تاقیکرنەوەی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ گێڕایەوەو فەرمووی: ((یارَسولَ اللهِ هوَ صَدَقَةٌ فَضَعهُ حَیثُ شِئتَ))[2]، ئەی پێغەمبەری خودا ؛ ئەو باخەم کرد بە صەدەقەو بەخشیم و چۆنت ئارەزولێیەتی ئاوای لێ بکە.

هەروەها لە پیاوێکی تر دەگێڕنەوە کە لە ناو باخێکدا بوو، بەری خورما داباری بوو بەهەرچوادەوری درەختەکەدا، سەرنجی ڕاکێشاو پێی سەرسام بوو، ئیتر نەیزانی چەند ڕکاتی نوێژ کردووە، ئەم باسەی بۆ (حەزرەتی) عوسمان گێڕایەوە و فەرمووی: ئەوا کردم بە خێر و صەدەقەو لە ڕێی خوادا چۆنت دەوێ سەرفی کە، ئەویش فرۆشتی بە پەنجا هەزار.

ئابەم شێوە دەجوڵانەوە، بۆ ئەوەی ماددەی بیرکردنەوە لە دونیا ببڕن و، ئەوەی دڵیان ڕادەکێشێت لەبەرچاوی خۆیان نەیهێڵن، وە ئەو بەخشینەشیان بکەنە کەفارەتی ئەو کەموکوڕییەی ڕوی لە نوێژەکانیان کردووە، ئەمەیە ئەو دەرمانەی کە دەردەکە هەڵدەکەنێت و هۆکارەکە ناهێڵێت و هیچ بەدیلێکیش ئەو جێگە ناگرێت. بەڵام ئەوەی باسمانکرد کە بە هێمنی خۆی بگەڕێنێتەوە بۆ

---

(١)قال العراقي أخرجه النسائي (١٩٤/٨) من حديث ابن عباس باسناد صحيح وليس فيه بيان أنَّ الخاتم كان ذهبا أو فضة إنما هو مطلق ا هـ

(٢) رواه مالك في الموطأ، ٩٨/١.

ئارامی هێورکردنەوەی دڵ و گەڕانەوە بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی واتای زیکرەکان، ئەوە بۆ کەسێکە کە ئارەزویەکی لاوازی هەبێت و، ئەو خەم و مەراقەی لە دونیای دەخوات، تەنها کاری لە ئەملاولای دڵی کردبێت نەك لە قوڵاییەکەی، چونکە کەسێك خاوەنی ئارەزواتێکی بەهێز بێت، کە ماندوی کردبێت و کاری لە ناخی دڵی کردبێت، ئەوە هەرگیز هێورکردنەوە سوودی پێناگەێنێت، بەڵکو بەردەوام یەکتری ڕادەکێشن تا ئەو هەواو ئارەزواتە زاڵ دەبێت بە سەرتدا، ئەوکاتە هەموو نوێژەکەت بە ڕاکێش ڕاکێش دەبەیتە سەر.

**نموونەی ئەمە:** پیاوێك لە ژێر درەختێکدا بیەوێت فکری خۆی صاف بکات و، دەنگ و جریوەی ئەو چۆلەکانە نەهێڵێت کە مێشکیان پڕ کردووە، بەردەوام بە دارێکی دەستی هەڵیاندەفڕێنێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای بیرکردنەوەکەی خۆی و، لە پاشان چۆلەکەکان دگەڕێنەوە بۆ سەردارەکە، ئەمیش دیسان هەوڵی فڕاندنیان دەدات، کەسێکیش پێی دەڵێت: ئەمە وەك دولاب وایە، واتە ئەوەی دێت و دەڕوات و بەردەوام وەك خۆی دێت و دەڕوات، بێ ئەوەی گۆڕانێکی بە سەردا بێت، جا ئەگەر دەتەوێت بە تەواوی ڕزگارت ببێت لێی، ئەوا درەختەکە بۆ یەکجاری هەڵکێشە و خۆت ڕزگار کە.

هەر بەم شێوەیەش درەختی ئارەزوات کە لە دەروونی مرۆڤدا درووست دەبێت ئەگەر بڵند بوو، وە لق و پۆی دەرکرد و بڵاوبوویەوە، ئەوا بیرو ئەندێشەو فیکرەکان ڕادەکێشێت بۆ لای خۆی و فکری ئاڵۆز دەکات و بیری لەلای خۆی ناهێڵێت، وەك چۆن درەخت چۆلەکەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و، چۆن پیس و پۆخڵی مێش و مەگەز بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن، بۆ لادان و دوورخستنەوەیشیان درێژە دەکێشێت، هەرچەندێك مێش دوربخەیتەوە خێرا دێتەوە، بۆ یە ناو دەبرێت بە (ذباب) واتە توڕدراو، هەروەها خەتەرەکانی دڵیش تا دووریان بخەیتەوە هەروا زوو دێنەوە،(مەگەر بە یەکجاری ڕیشەکێش بکرێن)

ئەم ئارەزواتانەش زۆرن، کەم وارێ دەکەوێت بەندەیەك هەبێت و ئەم ئارەزواتانەی نەبێت، تەنها ئەصڵ و بنەمایەکیش هەموویان کۆ دەکاتەوە کە خۆشویستنی دونیایە،[1] ئەمەش سەر و چڵەپۆپەی هەموو هەڵە و تاوانێکە[2]، وە هۆکاری هەموو نوقسانییەك و سەرچاوەی هەموو تێکچوون و فەسادێکە، هەرکەسێکیش ناخ و دەروونی پڕی بێت لە خۆشەویستی دونیاو، تاوای لێدێت کە لای بەلادا بکاتەوەو مەیلی دڵی بەولایەدابێت، نەك لەبەر ئەوەی بەشێکی ئەو دونیایە بۆ خۆی بەکار بهێنێت تا بەهۆیەوە دوا ڕۆژی مسەوگەر بکات، (بەڵکو تەنها لەبەر ڕابواردن و تێر بوون لە ئارەزوات) ئەوە هەرگیز بە هیوا نەبێت کە دڵی صەفادراو بێت و پاڵفتەو پوختەو ئامادە باش بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت چێژی موناجاتی خودای پێ وەربگرێت، چونکە بە ڕاستی ئەوەی بە دونیا دڵشاد و فەرەحناك ببێت، ئەوە ناتوانێت بەخودا خۆی فەرەحناك ببێت و، پڕ بە دڵی خۆی لە حزوری دا موناجات بکات.

هیممەت و هەوڵدانی پیاویش لە گەڵ نوری چاویەتی، ئەگەر قیبلەو نوری چاوی ئەو کەسە دونیا بوو، بێ گومان هەموو خەم و مەراقێکی ڕو لە دونیا

---

(١) مەبەست ئەو خۆشەویستییە ئارەزومەندانەیە، کە خۆی شتێك هەڵدەبژێرێت و خۆشی دەوێت، نەك بەزۆر وای لێ بکەن کە خۆشی بوێت، وەك ئەوەی سرووشتی مرۆڤ لەسەر ئەوە پەروەردەبووە کە منداڵەکەی خۆش دەوێت، یان خێزانی، یان ماڵ و ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتی، لە پاشان هەموو شتێك کە ببێتە یارمەتیدەر بۆ کارێکی دینی، بۆ هۆکارێکی دونیایی، ئەمانە نابنە خۆشویستنی دونیا، بەڵکو وەسیلەی گەیشتنی بەندەیە بە حزوری خودا و پەڕینەوە بۆ ژیانی هەمیشەیی، الإتحاف٣ /١٣١.

(٢) كما في الحلية ٣٨٨/٦، عن سفيان الثوري (رضي الله عنه) قال: **(قال عيسى ابن مريم (عَليه السلام) الدنيا رأسُ كُلِّ خَطيئة)** وعند البيهقي في شعب الإيمان(١٠٠١٩)مرسلا عن الحسن البصري، وسيأتي عند المصنف مصرحا به.

دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا نابێت واز لە تێکۆشان و جیهادی نەفس بهێنێت، بۆ ئەوەی دڵی بگێڕێتەوە بۆ لای نوێژەکەی و، هەوڵی کەمکردنەوەی هۆکارەکان بدات کە سەرقاڵی کاروباری دونیای دەکەن.

ئەمەی باسمانکرد دەرمانێکی تاڵە و لەبەر تاڵییەکەیشی سروشت و مەیلی خەڵکی لێی دووردەکەوێتەوە و حەزی لێ ناکات، وای لێ هاتووە کە بۆتە دەرد و عیللەتێکی درێژ خایەن و دەمێنێتەوە لە ناو جەستەی مرۆڤدا، وە دەردەکە زۆر کوشندەیە، تا وای لێ هاتووە کە گەورە پیاوانی ئەهلی عیرفان هەوڵیان دەدا کە دوورکات نوێژ بکەن و خەتەرەی دڵیان بەلای هیچ کار و فرمانێکی دونیایی نەڕوات، بەڵام نەیانتوانی و سەرکەوتوو نەبوون، کەواتە ئەمە نابێتە جێگەی ئێمەمانان، کە بۆ ئەم مەبەستە کۆ برکێ بکەین و خۆمانی لێ بدەین.

خۆزگە نیوەی نوێژەکەمان بە بێ خەتەر و خەیاڵات بۆ بچوایەتە سەریان سێ یەکی ئەو نوێژە، وە دوور بوایە لە وەسوەسەو خورپەی هەواو ئارەزوات، بۆ ئەوەی بکەوتینایەتە ناو ڕیزی ئەو کە سانەی کە ناوەرۆکی ئەم فەرموودەیە دەیانگرێتەوە، کە کرداری چاکەیان تێکەڵ بە کردارە خراپەکان کردووە، ( ئومێد هەیە کە خودا لێیان خۆش ببێت).

**پوختەی ئەم باسە ئەوەیە:**

هیممەت و هەوڵێك لە ناو دڵدا کە بۆ دونیا بەکاردێت و، هیممەتێکیش کە بۆ دوارۆژ لە کایەدایە، وەك ئەو ئاوە وایە کە دەڕژێتە ناو جامێکەوە کە پڕی بێت لە سرکە، دیارە بە ئەندازەی ئەوەی کە چەندێك ئاوی دەچێتە ناو، ئەوەندە سرکەی ناو جامەکە کەم دەکات ، چونکە ئەو دوانە(ئاوو سرکە) دوو شتی لێك جیاوازن و پێکەوە هەرگیز کۆنابنەوە. (کەواتە خۆشەویستی دونیاو دوا ڕۆژیش دوو شتی لێك جیاوازن و، پێکەوە نایانکرێت و هەرکامیان هەڵببژێریت جێ بەوی تریان لێژ دەکات ) خودا یارو پشتگیرمان بێت.

# بەدرێژی باسکردنی هەموو ئەو شتانەی کە حزوری دڵ مسەوگەر دەکەن
# لە پاڵ هەموو ڕوکن و مەرجەکانی نوێژدا

دەڵێین: ئەگەر تۆ خۆت لەوانە ئەژمار کردووە کە موریدی ڕێگای ئاخیرەتیت، دەبێت خۆت لەو هەموو بێدارکردنەوانە غافڵ نەکەیت کە بە مەرج گیراون لە باسی نوێژ و ئەرکانەکانی دا.

باسی مەرجەپێشینەکان بریتییە لە: بانگدان[1]، تەهارەت، داپۆشینی عەورەت، ڕوکردنە قیبلە، ڕاوەستان بە پێوە، نییەت هێنان.

**باسی بانگدان:**

ئەگەر گوێت بە بانگی بانگدەرەوە بوو، لە دڵتا ئەهوال و نارەحەتیەکانی بانگکردنی خەڵکی ئامادە بکە بۆ لێپرسینەوەی حەشر و دوارۆژ، خێرا خۆت بە دڵ و بە جەستە بۆ ئەو ساتە پڕ مەترسییە ئامادە بکە[2]، چونکە ئەوانەی لە دونیادا بە خێرایی ئامادە باشی خۆیان ڕادەگەیێن و دەچن بەدەم بانگەوە، ئەوە لە دوارۆژدا زۆر بە هێمنی و نەرمی بانگ دەکرێن بۆ ڕۆژی حەشری گەورە.

کەواتە تۆیش دڵی خۆت بخەرە بەردەمی ئەو بانگەیە، ئەگەر دڵەکەت شادمان و فەرەحناك بوو پێی، حەزی بەوە دەکرد کە بە شادییەوە بچێت بە دەمیەوە، ئەوە بزانە کە لە دوا ڕۆژیشدا بە مژدەو خۆشییەوە بانگ دەکرێیت بۆ ڕۆژی دادوەری و لێپرسینەوەی گشتی.

---

(١) واتە: هاتنە پێشەوەی وەختی نوێژ، ئیتر بانگ درابێت یان نا.

(٢) مەبەست ئەوەیە وەڵامی بانگەکە بدەیتەوەو، خۆیشت بۆ نوێژ و جەماعەت بخەیتە ڕێ و بە هێمنی ڕێگای مزگەوت بگریتە بەر.

بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((أَرِحْنا بِها يا بِلالْ)) [1]

ئادەی بانگ بدەو دڵمان ئاسوودە بکە ئەی بیلال! چونکە نوری چاوی پێغەمبەری خودا ﷺ لە نوێژەکانیدا بووە[2].

**باسی تەهارەت:**

ئەگەر جێگاکەی خۆتت پاك کردەوە کە شوێنی هەڵگرتنی نوێژەکەتە، لە پاشان بەرگ و پۆشاکێکی خاوێنت لەبەر کرد، کە بەرگی نزیکی نوێژەکەتە، لە پاشان پێستی جەستەی خۆتت خاوێن کردەوە، کە نزیکترین توێکڵە بە گیانت، لە دوای ئەمانە خۆت لە گرنگی دان بە ناخ و دڵت بێ ئاگا مەکە، کە خودی خۆتەو، دەبێت تێ بکوشیت بۆ گەیشتن بە مەرامی سەرەکی، کە پاککردنەوەی گیانتە بە تەوبەو پەشیمان بوونەوە لەسەر هەمو هەڵەو خراپەیەك پێشتر کردووتن، وە بڕیاردانی تەواو کە ئیتر لە داهاتوودا نەگەڕێیتەوە سەریان ، ئەوا باطین و دەروونی خۆتی پێ پاك بکەرەوە، چونکە تەنها ئەو جێگایە کە جێ نەزەری پەروەردگارتە[3].

---

(١) رواه أبو داوود(٤٩٨٥).وأخرجه الدارقطني من حديث بلالفي (العلل)٤/١٢٠(٤٦١).

(٢)الحديث المشهور: **(حُبِّب إليَّ مِن دُنياكم الطيب والنساء وجُعلت قرة عيني في الصلاة)** كما رواه احمد في كتاب الزهد(١١٨٨٤) والنسائي(٦١/٧)(٣٩٣٩-٣٩٤٠) والحاكم في المستدرك(١٧٤/٢)(٢٦٧٦) والبيهقي في السنن الكبرى(٧٨/٧)(١٣٢٣٢) عن أنس رضى الله عنه.

(٣)ئەگەر دڵت صەفاراو بێت ئەوا نەزەری خودایشی بەردەکەوێت. پاکی دڵیش پێویستی بە مورشیدێکی ڕاستگۆی شارەزای ڕێگەپێدراوی ڕەببانی هەیە، کە شارەزای چارەسەریەکان بێت و طەبیبی دڵ بێت. ڕێگەکانی پێ نیشان بدات و چۆنیەتی پاککردنەوەی دڵی بۆ بەیان بکات، ئەگەر ئەو پوختەکردنەوەی دڵی بۆ تەواو بوو ئەوا قۆناغی ڕوناککردنەوەی دڵیشی دەست پێ دەکات، تا دەگاتە قوناغە کۆتاکان لە ناسینی خوداو (معرفة الله). بنوارە الإتحاف ١٣٨/٣.

**باسی داپۆشینی عەورەت:**

واتە: داپۆشینی شوێنە ناشیرینەکانی جەستەت، کە نەکەوێتە بەرچاوی خەڵکی نامەحرەمەوە، چونکە ڕواڵەتی جەستەو لاشەی تۆ شوێنی ئەوەیە کە بکەوێتە بەرچاوی خەڵکییەوە، دەبێ بیانشاریتەوە. ئەی دەبێ ڕات چی بێت لە عەیبە شاراوەکانت، وە خراپەو نهێنییە نالەبارەکانت، کە کەس لێیان بە ئاگا نییە جگە لە پەروەردگارت ﷻ ؟! کەواتە ئەو نەنگی و حەیاچوون و خراپانەت بخەرەوە بەرچاوی خۆت، وە داوا بکە لە نەفسی خۆت با بیانشارێتەوە.

وە دڵنیاشبە کە کەس ناتوانێت لە بەرچاوو نەزەری خودا بیانشارێتەوە، کەواتە بەچی دەتوانیت بیانسڕیتەوە، تەنها بە پەشیمان بوونەوەو شەرم لە خۆکردن و، خۆفی خودا کە بچێتە ناو دڵتەوە، ئەگەر ئەم حاڵەتانە لە دڵتدا جێگیر بکەیت، ئەوا سەربازەکانی خۆف و ترس و بیم لە ناو دڵدا چرۆ دەکات و، نەفسی خۆیی پێ زەلیل و چاوشۆڕدەکات، وە لە ژێر ئەم باری خەجاڵەتی و ڕسواییەدا کە خۆی لە حزوری خودادا دەبینێتەوە، ئەوا دڵی هێور دەبێتەوەو، دەتوانێت لە حزوری خودادا بە پێوە ڕابووەستێت وەك بەندەیەکی تاوانباری خراپەکارو ڕاکردوو، کە پەشیمان بووبێتەوە و گەڕابێتەوە بۆ حزوری مەولاو گەورەکەی، بەسەری شۆڕ و حاڵەتی پڕ لە شەرم و ترسەوە.

**باسی ڕوکردنە قیبلە:**

ئەوەیە کە ڕوی خۆت لە هەموو لایەك وەربگێڕیت و، تەنها ڕو لە ماڵی خودای پێ بکەیت، ئایا تەنها ئەوەندە بەسە؟ یان دەبێت بزانیت کە پێویستە دڵیشت لە هەموو شت و فرمانە دونیاییەکان لابدەیت و، تەنها ڕوی پێ بکەیتە بە جێگەیاندنی فەرمانەکانی خودا؟

هەرگیز ئەمە نابێت! هیچ مەبەستێك لەوە گرنگتر نییە کە بۆلای خودات ببات، ئەم دیاردانە تەنها جوڵاندنێکی دەروونییە، وە ڕێکخستنێکی ئەندامەکانی

جەستەیە، وە هێورکردنەوەو ئارامی بەخشێکی کاتییە، تا بە هەموویان ڕو لە یەك لا دەکات، تاسنووری خۆی نەبەزێنێت و، دڵیش ببێتە شوێنکەوتەیەکی ئەندامەکانی لەش، چونکە ئەگەر ئەندامەکانی جەستە لە سنور لابدەن و، بە شێوەیەکی ستەمکاری بەملاولادا لابکەنەوە، یان ڕولەملاولا بکەن، ئەوا دڵیش ناچار دەبێت شوێن ئەندامەکان بکەوێت، ئیتر ڕوی لە قیبلەو لە ڕوکرندە خودا وەردەگێڕێت.

کەواتە با ڕوی دڵت لە گەڵ ڕوی ڕوخسار و جەستەت بێت، وە ئەوەش بزانە: وەك چۆن ناتوانیت ڕو بکەیتە قیبلە، تا لە هەمولاکانی تر ڕو وەرنەگێڕیت، هەروەها ناشتوانیت ڕو لە خودا بکەیت، تا ڕوی دڵت خاڵی نەکەیت لە هەموو شتێك کە غەیری خودا بێت، هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((إذا قامَ العَبدُ إلَى صَلاتهِ فَكانَ هَواهُ ووَجهُه وقَلبه إلى اللهِ عزَّوجَل، انصَرَفَ مِن ذنوبهِ كيَوم ولدَتْهُ أُمُّه))**[1]،(واتە: ئەگەر بەندەیەك هەستێت بۆ نوێژەکەی، بەو شێوەی کە هەواو مەیلی دڵ و ڕوخساری و دڵ وگیانیشی، واتە زاهیر و باطینی ڕوی لە خودا بێت، ئەوا لە گوناهەکانی دووردەکەوێتەوەو لێیان جودا دەبێتەوە، وەك ئەو ڕۆژەی لێ دێت کە تێیدا بە بێ گوناهی لەدایك بووە.)

## باسی ڕاوەستانی بە پێوە:

ئەوش پێویستە وەك ئامادەباشـییەك بێت بە جەستەو بە دڵ، لە میانی

---

(١)قال العراقي لم أجده بهذا اللفظ ولمسلم(٢٣٢) (٨٣٢) نحو معناه من حديث عمرو بن عنبسة في فضل الوضوء وفيه: **(من كبَّر وقامَ وصلَّى فحَمِد اللهَ وأثنى عليه ومجَّده بالذى هوَ لَه أهْلٌ، وفرغ قلبه للهِ إلاَّ انصرَف مِن خَطيئَته كهَيئته يَومِ ولدتهُ أمُّه)** ا هـ قلت ووجدت لماذكره المصنف شاهدٌ آخر من حديث عقبة بن عامر بلفظ: **(مَن توضأ فأحسَن الوُضوءَ ثمَّ صلَّى ركعتين يَقبل عليهما بقلبهِ ووَجههِ وجَبت له الجنة)**. أخرجه أبو بكر بن أبي شبيه في المصنف والنسائي والطبراني في الكبير.

دووده‌سته‌ی قودره‌تی خودای (عَزَّ وجَلَّ)دا، با سه‌رت که له هه‌موو ئه‌ندامه‌کانی له‌شت به‌رزتره دابنه‌وێنیت و، سه‌ر داخه‌یت و مل که‌چی ڕاسته‌قینه‌ی خۆت بخه‌یته حزوره‌وه، وه دانه‌واندنی سه‌ر له‌و به‌رزی خۆیه‌وه به‌و واتایه دێت که دڵت ڕابێنیت که به ناچاری ده‌بێت گه‌ردن که‌چ بێت و به زه‌لیلی خۆی ببینێته‌وه‌و، خۆی به‌ری بکات له خۆ به‌گه‌وره دانان و، فیز و ده‌مار کردن به‌سه‌ر هیچ که‌سێکدا، با له بیریشت بێت که تۆ هه‌ر به‌و شێوه مه‌ترسی وه‌ستانی ڕۆژی ترسناکی حه‌شریشت له پێشه، که له حزوری خودادا بۆ لێپێچینه‌وه ڕات ده‌وه‌ستێنن و پرسیارت لێ ده‌که‌ن[1].

وه ئێسته‌ش بزانه: تۆ ڕاوه‌ستاویت له میانی دووده‌سته‌ی قودره‌تی خودادا، ئه‌و ئاگای ته‌واوی لێته، ده‌ی ڕاوه‌سته له حزوریدا، وه‌ك چۆن له به‌رده‌می هه‌ندێك مه‌لیك و پاشادا ڕاده‌وه‌ستیت، ئه‌گه‌ر ناتوانیت شاره‌زای هه‌ندێك له گه‌وره‌یی و جه‌لال و عه‌زه‌مه‌تی خودا ببیت، ئه‌وا سه‌یری وه‌ستانی هه‌ندێك بکه له خزمه‌ت پادشا دونیاییه‌کاندا و، فێری وه‌ستانی حزوری خودایان لێ ببه، یان وای دابنێ، که تۆ له ژێر چاودێری سه‌رنج و تێڕامانی چاوێکی هه‌ستیارو به توانادایت، له پیاوێکی صاڵح و خواناسه‌وه له که‌س و کاری خۆت، یان له یه‌کێکه‌وه که حه‌ز ده‌که‌یت وه‌ك پیاوچاکێك بتناسێت، چۆن ده‌بینیت خشوعێکت بۆ په‌یدا ده‌بێت و، ئه‌ندامه‌کانی جه‌سته‌ت ئارام و هێور ده‌بنه‌وه، له ترسی ئه‌وه‌ی نه‌وه‌ك ئه‌و که‌سه داماوه به که‌م سه‌لیقه‌و لووت به‌رز له قه‌ڵه‌مت بدات، [2].

---

(١) یه‌که‌م پرسیاریش له باره‌ی نوێژه‌وه لێت ده‌که‌ن ...

(٢) مرۆڤی دانا کاتێك که تاوانێك ده‌کات یان ده‌یه‌وێت بیکات وه‌ك (راغیبی ئه‌صفه‌هانی) له (الذریعة)ل/٤٠ دا ده‌ڵێت: ده‌بێت یه‌کێك بهێنێت به زیهنیدا که له هه‌مووکه‌سێك

وە ئەگەر لە نەفسی خۆتدا وات هەست کرد، کاتێك کە سەرنجی بەندەیەکی هەژار دەدەیت، زیاتر خۆت کۆ دەکەیتەوەو، دەتەوێت بە بایەخەوە بۆت بنوارێت، کە ئەویش وەك تۆ بەندەیەکە، دەبێ سەرزەنشتی خۆت بکەیت و بڵێیت: تۆ وات ڕاگەیاندووە کە خودا دەناسیت و خۆشت دەوێت، ئایا شەرم ناکەیت کە ئەوەندە سنوور دەبەزێنیت و، لە پاڵ ئەو زاتەدا ڕێزێکی زۆر لە یەکێك لە بەندەکانی ئەو دەگریت ؟! ئایا دەبێت لە بەندەیەکی خودا بترسیت و لە خودا نەترسیت، کە هەر خودایە شایستەی ئەوە بێت لێی بترسیت.

هەر بۆ یە کاتێك(حەزرەتی) ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمویی: شەرم و حەیا لە خودا کردن چۆنە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی:

**((تَستَحي مِنهُ كَما تَستَحي مِنَ الرَّجلِ الصَّالح مِن أهْلكَ))**،[١]، شەرم لە خودا بکە، هەروەك چۆن شەرم لە پیاوێکی صاڵحی ئەهلەکەت دەکەیت، وە لە ڕیوایەتێکی تردا وەك چۆن شەرم لە (قەومەکەت)دەکەیت!

---

بەلایەوە بەنرخ تر بێت، وەك ئەوەی کە ئەو کەسە هەر بەڕاستی بیبینێت، چونکە سروشتی مرۆڤ وایە، شەرم لەو کەسە دەکات کە لە لای ئەو لە خۆی گەورەترە، بۆیە شەرم لە ئاژەڵ و منداڵ و ئەوانە ناکات، بەڵام شەرم لە زانایەك زیاتر دەکات لەوەی کە شەرم لە نەزانێك بکات، وە شەرم لەکۆمەڵێك زیاتر دەکات لەوەی لە تاکە کەسێکی بکات.

(١)أخرجه الخرائطي في مكارم الاخلاق(٦٧/(٢٨٥) والبيهقي في الشعب١٤٥/٤(٧٣٤٣) من حديث سعيد بن يزيد مرسلا بنحوه وأسنده البيهقى بزيادة ابن عمر فى السند وفي العلل للدار قطني(٤٢١/٤(٦٦٩) عن ابن عم له، وقال: أنَّه أشبَه شىء بالصَّواب أوردَه في حديث سعيد ابن زيد أحد العشرة، قاله العراقي قلت: وسعيد بن يزيد بن مسلمة الازدى تابعي روى عن أنس، ومطرف ابن الشخير وعنه يزيد بن زريع وابن علية روى له الجماعة، وأخرج ابن عدي في الكامل بسند ضعيف من حديث ابي الباهلي بلفظ: **إستَحي من الله استحياءَك من رجلين مِن صالحي عشيرتك**. الإتحاف ١٤٠/٣. ورواه الطبراني في الكبير(٦٩/٦).

## چۆنیەتی نیەت هێنان:

بە عەزم و ئیرادەیەکی بە هێزەوە بڕیار بدە، کە بەدەم فرمانی پەروەردگارەوە ﷻ بڕۆیت، کە فرمانی نوێژ بۆکردنی جێ بەجێ بکەیت و تەواویشی بکەیت، واز لەو شتانە بهێنیت کە دەست نوێژ دەشکێنن. یان بەتاڵی دەکەنەوە، وە هەموو ئەم کردارانەت تەنها لەبەر ڕەزای خودا بێت، بە تەمای پاداشتی بیت، وە ترست لە تۆڵەو سزای ئەو هەبێت، وە تەماداری ئەوەت لێی هەبێت کە لێی نزیك ببیتەوە، بشچیتە ژێر منەتی خوداوە، کە ڕێگەی موناجاتی حزوری خۆیی داویت، لەگەڵ ئەو هەموو بێ ئەدەبی و گوناهە زۆرەی کە لە ژێریدا دەناڵێنیت.

وە لە دڵی خۆتدا پێزانینی تەواو نیشان بدە، کە ڕێگەی موناجاتت هەیە، وە بنوارە لە خزمەت کێدا دەدوێیت، وە چۆن موناجات و هاواری تێ دەکەیت، وە بەچی پارەو لاڵەت دەکەیتە حزوری خودا؟

ئیتر دوای ئەم لێکدانەوانە دەبێت ناوچەوانت عەرەقی خەجاڵەتی دایبگرێت، وە لەرزین بکەوێتە هەمو لاشەو هەناوتەوە، وە سام داتبگرێت و ڕەنگت زەردببێت لە ترس و خۆفی پەروەردگارت.

## چۆنیەتی نوێژ دابەستن:

ئەگەر زوبانت تەکبیرەی ئیحرام بکات، نابێت دڵت زوبانت بە درۆ بخاتەوە، ئەگەر لە دڵدا کەسێکی تر هەیە کە لە خودا گەورە تر بێت، ئەوە خودا شایەتە کە تۆ درۆ دەکەیت، با قسەکەیشت ڕاست بێت؛ وەك چۆن شایەتی دەدات لە سەر دوڕووەکان لەوەی کە دەڵێن:

کە پێغەمبەر ﷺ ڕەسولی خودایە. جا ئەگەر هەواو ئارەزواتی خۆتت لا گرنگتر بێت و بارسەنگی بەهێزتر بێت لە فەرمانی خودای گەورە، کەواتە تۆ زیاتر فەرمانبەرداری ئەویت لە خودای گەورە، ئەوت کردووە بە خودای خۆت و

گەورەت کردووە و، زۆر نزیکە کە دەڵێت: (اللہ أکبر) قسەیەکی ڕوتی سەرزارەکی بێت و، دڵیش دوا کەوتووە لە یارمەتی دانی و تەصدیق کردنی.

ئای کە مەترسییەکی گەورەی تێدایە، ئەگەر تەوبەو داوای لێخۆشبوون و باشیی ظەنی خۆیان بە کەرەم و لێبوردن و سۆزی پەروەردگاری نەبوایە [1]،

## باسی دۆعای کردنەوەی نوێژ:

سەرەتای نزاکە بەوە دەست پێدەکات کە دەڵێت:

**(وَجَّهتُ وَجهِيَ للَّذي فَطَرَ السَّماوات والأَرض)،**

(واتە: ڕوی خۆمم کردە ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە)، دیارە مەبەست لەو ڕووە، ڕوی زاهیری ڕوخساری نوێژخوێن نییە، چونکە ڕوی خۆیی کردۆتە قیبلەوە نەك خوداوە ﷻ ، خودای گەورە لەوە پاك و مونەززەهترە کە جیهەت و لایەك بیگرێتەخۆی، هەتا ڕوی خۆتت بکەیتە خوداوە، کەواتە ئەوەی مەبەستە لەم ڕوتێکردنە، تەنها ئەوەیە کە ڕوی دڵی بکاتە خوداوە، کە خالیقی زەوی و ئاسمانەکانە، کەواتە سەیری دڵی خۆت بکە و بزانە: ئایا ڕوی کردۆتە هیواو ئاوات و مەرامەکانی لە ماڵ و بازاڕ و شوێن کەوتنی ئارەزوەکانی، یان ڕوی کردووەتە درووستکەری زەوی و ئاسمانەکان؟!

نەخڵەتابیت کە یەکەم دەستپێکی قسەکانت لە حزوری خودادا، موناجاتەکەت بە درۆ و قسەهەڵبەستن و قسە درووست کردن بێت!

---

(١) بۆ ئەم مەبەستە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ (١٨/المؤمنون)ئەوانەی چاودێری و وەفا بە پەیمان و ئەمانەتەکانیان دەکەن، عەهد و پەیمانەکە ئەوەیە کە بە زوبان داویەتی، وە چاودێری و ڕیعایەت کردنەکەش ئەوە وەفایە بەدڵ، جا هەرکەسێك دڵ و زوبانی یەکیانگرت، ئەوا دەچێتە ناو ئەو کۆمەڵەوە کە شایستەی سەناو ستایش دەبن. الإتحاف ١٤٢/٣.

خۆ دەزانیت کە ڕوخساری کەسێك ناتوانێت ڕو لە خودا بکات، ئەگەر بە تەواوی ڕوی لە غەیری خودا وەرنەگێڕابێت، کەواتە هەوڵ و کۆششی خۆت هەر ئێستا بخەرەکار کە ڕوی دڵت بایەکسەر لە خودا بێت، خۆ ئەگەر نەتوانیت بەردەوام بەم شێوە بیت، با هیچ نەبێت ئێستە و لەم کاتەدا ڕاست بکەیت.

ئەگەر بڵێیت: ﴿حَنيفاً مُسْلِماً﴾ پێویستە بێت بە خەیاڵی دڵتدا، **((أَنَّ المُسلمَ هُو الَّذي سَلِم المُسلم مِن لسانه ويَدِه))**[1]،کە موسوڵمان ئەوەیە کە موسوڵمانان لە دەم و زوبانی پارێزراو بن، خۆ ئەگەر بەم شێوە نەبیت، ئەوە درۆزن دەردەچیت، کەواتە هەوڵبدە با لەمەودوا ڕاست بکەیت، وە پەشیمان بەرەوە لە حاڵەتە ڕابوردووەکانت.

وە ئەگەر بڵێیت: ﴿وَما أَنا مِنَ المُشرِكِين﴾ با بێت بە خەیاڵی دڵدا کە شیرکی خەفی و شاراوە کامەیە ،﴿ **فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا**﴾ (١١٠/الكهف)

کەواتە ئەوەی بە تەمابێت بە لیقای خودای خۆی بگات، با کردەوەی چاکە بکات و، نابێت هیچ جۆرە هاوبەشێك بۆ خودا بڕیاربدات، ئەوە لەسەر کەسانێك هاتۆتە خوارەوە کە مەبەستی لە عیبادەتکردنی ئەوەیە کە لە ڕێی خودادایەو لەبەر ستایشکردنی خەڵکیشە[2]، خۆت بپارێزەو بترسە و وریابە لەو شەریك بۆ خودا بڕیاردانە، هەست بەخەجاڵەتی بکە لە دڵتدا،

---

(١)كما أخرجه البلخي (١٠) ومسلم(٤٠) و أحمدفي مسنده(٨٧١٢) والترمذي(٢٦٢٧) والنسائي (٤٩٩٥)والحاكم (في المستدرك٥٤/١(٢٢)من حديث أبى هريرة. (**وأَنَّ المُسلِمَ أَخُو المُسلِم لا يَظلمُه ولا يسلمه**) رواه أوداود،حەنیف: واتە لە دینێکی باطیلەوە لابدات بۆ لای دینێکی ڕاست ورواه أبو داود في (كتاب الأدب - باب المؤاخات)(٤٨٩٣).

(٢) ئیبن و جریری طەبەری لە تەفسیرەکەیدا دەیگێڕێتەوە ٥٧/٩) لە ئیبن و عەباسەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) وە بەلای طەبەرانیش لە تەفسیری (الكبير)دا فەرموویەتی: بە

که بەم شێوە وەصف و تاریفی خۆت دەکەیت کە لەموشریکەکان نیت، کە هیچ هەوڵێکیشت نەداوە لەو شیرکە ڕاستەقینە خۆت تەبرییە بکەیت، چونکە ناوی شیرك دەکەوێتە سەر شیرکی کەم و زۆر.

وە ئەگەر بڵێیت: ﴿مَحيايَ وَمَماتِي﴾

واتە: نوێژ و ڕۆژو و عیبادەتم و ژیان و مردنم بۆ خودایە، کەواتە بزانە: ئەمە حاڵی بەندەیەکە خۆیی لە بیر کردووەو بوونی ئەو تەنها لە پێناوی سەیید و گەورەکەیەتی، کەواتە قسەی وا ئەگەر لە یەکێکەوە دەربکەوێت کە ڕەزامەندی و توڕەبوونی و، هەستان و دانیشتن و، حەزلێبوونی لە ژیان و ترسان و خۆفی لە مردن و، هەمووی لە پێناوی دونیادا بێت، کەواتە ئەو کەسە شایستەی ئەوە نییە ئەو دەعوایە بکات کە ژیان و مردنی تەنها بۆ خودایە.[1]،

وە کاتێك بڵێیت: (أَعوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم)ئەوە بزانە:

شەتان دوژمنتە و هەمیشە لە کەمیندایە کە دڵت وەرگێڕێت لەخودای (عَزَّ وجَلْ)، کە حەسادەتت پێ دەبات، تۆ موناجاتی خۆت دەکەیت لە حزوری

---

مەرفوعی: إذا جمع الله الأولين والآخرين، ببقيع واحد ينفذهم البصر ويسمعهم الداعي قال: أنا خير شريك، كل عمل كان عُمل في الدنيا كان لي فيه شريك فأنا أدعه اليوم، ولا أقبل اليوم إلا خالصاً، ثم قرء: ﴿إِلاَّ عِبادَ اللهِ الْمُخلِصين﴾ ﴿ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾.

(١) هەروەها کە دەڵێیت: ﴿لاشريك له﴾ وە تۆ لە عیبادەتەکەتدا هاوبەشی بۆ بڕیار دیدەیت، ئەمەش هەواڵێکی درۆیەو لە سەرت دەنوسرێت، وە کە دەڵێیت: ﴿وأنا من المسلمين﴾ من لە موسوڵمانەکانم، موسوڵمان دەبێت لە سەر مەرجی خۆی بمێنێتەوە، ئایا وەفا بەو شەرتانە دەکەیت، ئەمەش درێژەی هەیەو درۆیەکی ترت لەسەر دەنوسرێت، کەواتە ئەگەر دۆعای (إستفتاح) ت کۆمەڵە درۆیەکی تێدا بێت، دەبێ حاڵت لە باقی نوێژەکەدا چۆن بێت؟! بۆ درێژی ئەم بابەتە بنواڕە: الإتحاف ١٤٥/٣.

خودادا و، سەجدەی بۆ دەبەیت، ئەویش داوای سەجدەیەکی لێ کرا و نەیتوانی بیکات، وە دەبێت بزانیت کە پەنا گرتنی تۆ بە خودا ئەوەیە کە واز لەوکارانە بهێنیت کە شەیتان پێی خۆشەو، بیگۆڕیتەوە بە کارێك کە جێگەی ڕەزامەندی خودا بێت، نەك تەنها بە قسە کردن، چونکە دەزانیت ئەگەر درندەیەك پەلامارت بدات و بڵێیت : پەنا دەگرم بە تۆ بەو قەڵا مەتین و بەهێزە، خۆیشی لە جێگەی خۆیدا ڕاوەستاوە، دیارە ئەو پەنا گرتنە هیچ سوودێکی پێ ناگەێنێت، بەڵکو تەنها ئەوە پەنای دەدات کە جێگاکەی بگۆڕێت، هەروەها کەسێکیش شوێن هەواو ئارەزوات کەوتبێت، کە جێی ڕەزامەندی شەیتانەو مایەی نارازی بوونی خودایە، بە تەنها قسە کردن دادی ناداتو دەبێت بە کردار ڕاستی قسەکانی بسەلمێنێت.

کەواتە با قسەکانی ببەستێتەوە بە کردار و ئیرادەی پەناگرتنی ڕاستەقینە بە قەڵاو پەناگای خودای (**عَزَّ وجَلْ**)ەوە لە شەڕی شەیتان . قەڵاکەیش پەناگای (**لاإله إلاالله**)یە، وەك خودای (**عَزَّ وجَلْ**) فەرمویەتی کە پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی پێداوین:

**((لاإلهَ إلاَّ اللهُ حِصني ومَنْ دَخَل حِصْني أمِنَ مِنْ عَذابي))**[1].

واتە: (**لاإله إلا الله**) پەناگای من، ئەوەی بە دڵنیاییەوە بچێتە ناو پەناگا و قەڵای (لائیلاهە ئیللە للا)وە ئەمین و پارێزراو دەبێت لە سزاکانی من.

ئەوکەسەش ڕاست دەکات کە پەنای بە قەڵای ئێمە گرتووە، کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نەبێت جگە لە خودای (**عَزَّ وجَلْ**) نەبێت، بەڵام ئەوەی

---

(١) أخرجه الحاكم في التأريخ،و رواه أبو نعيم في الحلية ١٩٢/٣، وأخرجه أحمد والبخاري ومسلم والترمذي وابن ماجه كلهم من غير تسلسل عن أنس رفعه: (**إني أنا الله لا اله الا أنا**) فساقوه بمثل رواية ابن الجزري، الإتحاف١٤٧/٣.

ئارەزواتی کردووەتە پەرستراوی خۆی، ئەوە لە مەیدانی شەیتاندا دەسوڕێتەوە، نەك لە ناو قەڵای خوداوەنددا.

وە بزانە: کە یەکێکی تر لە فرت و فێڵەکانی شەیتان ئەوەیە:

کە دەیەوێت لە نوێژەکەدا سەرقاڵی بیرکردنەوەی قیامەتت بکات و، چۆن کارە خێرەکان ئەنجام بدەیت، مەبەستیشی ئەوەیە کە لە خودی نوێژ و تێگەیشتن لە واتای ئەو وشە پیرۆزانەی دەیخوێنیتەوە بێ بەشت بکات، کە واتاکان فەرامۆش بکەیت، کەواتە بزانە: هەرچییەك لەوڕێگە لات بدات کە فەرامۆشی واتاکان بکەیت، ئەوە لە وەسوەسەی شەیتانی بزانە، چونکە بەڕاستی تەنها جوڵاندنەوەی زوبان بەس نییەو، پێویستی بە تێگەیشتنی واتاکان هەیە.

# باسی خوێندنەوەی قورئان:

**خەڵکەکە لەم بارەوە سێ جۆرن:** پیاوێك زوبانی دەجوڵێنێت و دڵی بێ ئاگایە، وە کەسێکی تر زوبانی دەجوڵێت و دڵیشی دێت بە شوێن زوبانیدا و قسەکان دەبێستێت و لێیشی حاڵی دەبێت، وەك لە کەسێکی تری بیستێت، ئەمانە پلەکانی ئەوانەن کەنامەی کردەوەکان دەدرێت بە دەستی ڕاستیانەوە، وە پیاوێکی تریش هەیە، دڵی خێراتر بۆ واتاکان دەڕوات و پێش زوبانی دەکەوێت، لە پاشان زوبانی بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی تەعبیر لە دڵی بداتەوەو ببێتە تەرجومانی دڵی، جیاوازیش زۆرە لە میانی ئەوەدا کە زوبان تەرجومانی دڵ بێت، یان ببێتە مامۆستاو فێرکەری دڵ، ئەوانە موقەڕەبی دەرگای خودان، هەمیشە زوبانیان بەشوێن دڵیاندا دێت و، دەبێتە تەرجومانی دڵیان، نەك دڵیان شوێن زوبانیان بکەوێت.

# درێژەی ڕاڤەکردنی واتاکان:

کاتێك کە دەڵێیت: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحيمْ﴾ ، با نیيەتت ئەوە بێت کە سەرەتای دەست پێ کردنت بە خوێندنەوەی کەلامی خوداو بە ناوی خوداوەیە، وە بشزانە کە واتاکەی: هەموو فرمانەکان بە گشتی بە خودایە، وە مەبەستیش لە ناوی خودا ناوبراوەکەیە کە زاتی ئەڵلایە.[1]

کەواتە بە دڵنیابییەوە کە زانیت و دانت نا بەوەی هەموو کردارەکان تەنها بە خودا دەکرێت، کەواتەهەمو سوپاسێکیش هەر بۆ خودایە، واتاکەی : بەڕاستی شوکر و ستایش تەنها بۆ خودایە، چونکە نیعمەتەکان لە خوداوەیە، وە هەرکەسێك لە غەیری خوداوە نیعمەتێك ببینێت، یان ڕوی شوکرانەبژێری بکاتە یەکێکی ترەوە، نەك لەو ڕووەوە کە ئەو کەسەش هەر لە لایەن خودای بەرز و باڵاوە دەستەمۆبووە و، بە فرمانی ئەو کارەکەی بۆ ئەنجامی داوە، بەڵکو وابزانێت کە بۆ خۆی ڕاستەوخۆ شیاوی ئەو سوپاس گوزارییەیە، ئەوە لە بیسمیللاو حەمدو سەناکەیدا بە قەدەر ئەو سوپاسگوزارییە نوقسانی تێ کەوتووە و، لای بەلای غەیری خودادا کردۆتەوە.

کەوتت: (الرَّحْمَنِ الرَّحيمْ) هەموو جۆرە لوتف و میهرەبانیەکانی خودا لە دڵتدا ئامادە بکە، با ڕەحمەتی خودات بۆ ڕون و ئاشکرا ببێت، وە بتوانیت بەهیوای ئەو ڕەحمەتە بیت، لە پاشان ترس و بیمێکی زۆر بخەرە ناو دڵتەوە، بەوەی کە دەڵێیت: ﴿مالِكِ يَومِ الدِّينِ﴾ گەورەیی بۆ بڕیار دەدەیت، چونکە هیچ موڵکێك بوونی نییە لە خوداوە نەبێت و هی ئەو نەبێت، وە خۆفەکەیشت لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە ترسی ڕۆژی جەزاو تۆڵەسەندنەوەیە، کە خودا

(١) بۆ تەبەڕوك ناوی خودا دەبات، وەك لە قورئانیشدا ناوەکەی کردووە بە پەردەیەکی تایبەتی لە میانی بەندەو خالیقدا (سبِّحِ اسمَ رَبِّكَ الأعلَى) الإتحاف٣/١٤٧.

مالیك و خاوەنی ئەو ڕۆژەیە، لە پاشان ئیخلاصی خۆت تازە بکەرەوە بە وتنی: ﴿إِيَّاكَ نَعبُدُ﴾ تەنها بۆ تۆ بەندایەتی دەکەم، وە زیللەت و نەتوانینی خۆیشت دوبارە ڕابگەیەنەرەوە، بەوەی کە تەنها خودایە پشت و پەنات بێت و پشتی پێ ببەستیت بە وتنی: ﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينْ﴾، وە دڵنیاش بە ئەو کار ئاسانییەی کە دەتوانیت بەندایەتی خودا بکەیت، بە هۆی یارمەتی دانی ئەوەوەیە، منەتی زۆرە بەسەرتەوە، کە ڕێنومایی کردویت و بەکاری هێناویت لە بەندایەتی کردنی دا، وە گێڕاویتی لەوانەی کە ئەهل بیت بۆ موناجاتی پەروەردگار، خۆ ئەگەر تەوفیق و یارمەتی نەدایتایە، ئەوا لەگەڵ شەیتاندا لە دەرکراوەکان دەبویت.

لە پاشان ئەگەر لە پەناگرتن بەخودا لە شەڕی شەیتان لێ بویتەوەو بیسمیللایشت خوێند و، سەناو ستایشی خوایشت کرد، وە ڕات گەیاند کە هەمیشە پێویستت بە کۆمەکی خودایە، کەواتە داواکانت دیاری بکە: کارو پێداویستییە گرنگەکانت بخەرەڕو، وە بڵێ: ﴿إهدِنا الصِراطَ المُستَقيمْ﴾ ڕێنومایی ڕێگای ڕاستم بکە، کە ڕاماندەکێشێت و دەمانخاتە ڕێ، بۆ نزیکی و جیواری جەنابتان، وە دەمانخاتە ژێر سایەی ڕەزامەندیتان، وە زیاتر ئەم دەستەواژەیە ڕونبکەرەوە و دوپاتی بکەرەوەو، بەڵگەی بۆ بهێنەرەوە، کە ئەو ڕێگایەت مەبەستە، کە نیعمەتی ڕێنومایت ڕژاندووە بە سەریاندا، لە پێغەمبەران و صددیق و ڕاستگۆیانی دەرگای خودا و، شەهید و پیاو صاڵحەکان، نەك ئەوانەی کە غەزەب و ناڕەزایی خۆتت داوە بەسەریاندا، لە کافر و لادەرەکان، لە جولەکەو گاور و صائیبەکان، لە پاشان چاوەنواڕی وەڵام و بەدەنگەوەهاتنت بە و بڵێ: ئامین. واتە: داواکانم وەر بگرە ئەی خودای میهرەبان.

ئەگەر بەم شێوەیە سوورەی فاتیحەت خوێندەوە، وەك ئەوانە وایت کە خودای گەورە دەربارەیان ڕایگەیاندووە و پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی پێداوین و دەفەرموێت(( قَسَمْتُ الصَّلاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْن، فَنِصْفُهَا لِي،

**وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ العَبْدُ: الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ؛ قَالَ الله: حَمِدَنِي عَبْدِي؛ وإِذَا قَالَ: الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ؛ قَالَ الله: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي؛ وإذَا قَالَ: مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ قَالَ الله: مَجَّدَنِي عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نسْتَعِينُ؛ قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلعَبْدِي مَا سَأَلَ، وَإِذَا قَالَ: إهْدِنَا الصِّرَاطَ المُسْتَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ، غَيْرِ المَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ، وَلا الضَّالِّينَ، قَالَ: هَذَا لِعَبْدي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ)).**[1]

واته: نوێژەم دابەش کردووە لە میانی خۆم و بەندەکەمدا، بە دووبەشەوە، بەشێکی بۆ من و بەشەکەی تریشی بۆ بەندەکەم، وە بۆی هەیە چ داوایەکم لێ بکات، ئەگەر عەبدەکەم وتی: حەمدو سەنا بۆ خودایە کە پەروەردگاری هەمووعالەمە، خودای گەورە دەفەرموێت: عەبدەکەم سوپاسی کردم و ستایشی منی کردووە، ئەمەش واتای ئەوەیە کە دەڵێت (خودا گوێی لەوانەیە کە سوپاس و سەنای دەکەن(سمع الله لمن حمده) ......تادوایی.

ئەگەر هیچ بەشێکت لە نوێژەکەتدا نەبێت جگە لەو زیکر و یادی گەورەیی و عەزەمەتی پەروەردگارە، ئەوە بۆ خۆی بەسە کە بەگەورەترین سەر مایەی

---

(١)وعن أبي هريرة - رضي الله عنه - قال: قَالَ رَسُولُ الله – ﷺ -: "مَنْ صَلَّى صَلاةً لم يَقْرَأْ فِيهَا بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ فَهِيَ خِدَاجٌ ثَلاثاً غَيْرُ تَمَامٍ. فَقِيلَ لأَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه -. إنَّا نَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ؟ فَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله ﷺ يَقُولُ: "قَالَ الله تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاةَ ...إلخ أخرجه الستة (١). إلاّ البخاري. [صحيح] أخرجه مسلم رقم (٣٩٥)، والنسائي في "المجتبى" (٢/ ٣٥)، وفي "الكبرى" رقم (٩٨٣، ٧٩٥٨، ٧٩٥٩، ١٠٩١٥). والترمذي رقم (٢٩٥٣) ، وأبو داود رقم (٨٢١)، وابن ماجه رقم (٣٧٨٤). وأخرجه أحمد (٢/ ٢٤١)، والحميدي رقم (٩٧٣، ٩٧٤) والبخاري في "القراءة خلف الإمام" رقم (٧١، ٧٩) ، وأبوعوانة (٢/ ١٢٨)، البيهقي في "السنن الكبرى" (٢/ ٣٨، ١٦٧) وفي "القراءة خلف الإمام" رقم (٦٣، ٦٤، ٦٥) وابن حبان رقم (٧٧٦، ١٧٨٨، ١٧٩٥) من طرق. وهو حديث صحيح، والله أعلم.

بزانیت، ئەی دەبێ حاڵت چۆن بێت کە بە هیوای فەزڵ و پاداشتیشی بیت؟!

هەروەها پێویستە ئەوەی دەیخوێنێتەوە لە سوورەتەکان لێی تێ بگەیت، وەك چۆن لە پەڕاوی تیلاوەی قورئاندا باسمان کردووە، خۆت لە فرمان و نەهیەکانی قورئان و، گفت و هەڕەشەکانی و، ئامۆژگاری و هەواڵی پێغەمبەرره پێشووەکانی تێدایە لێیان غافڵ نەبیت، هەروەها باسی منەتەکانی خوداو چاکەکانی بەرامبەر بە بەندەکانی، هەریەکێك لەم نیعمەتانە مافێکی خۆیان هەیە و بەرامبەری یەك دەبنەوە، بە هیوا بوون مافی گفت و بەڵێنەکانیەتی، ترس و خۆف لە بەرامبەر هەڕەشەکانیەتی، عەزم و ئیرادەی بەهێز مافی ئەمر و نەهیەکانیەتی، پەندوەرگرتنیش مافی ئامۆژگاریەکانیەتی، شوکرانەکردنیشی مافی باسکردنی ئەو منەتانەیە کە دەیخاتە سەریان، وە پەندوەرگرتیش لە بەرامبەری باسی پێغەمبەرەکانە، کە دەبێت پەند لە ژیان و هەواڵیان وەربگیرێت.

دەگێڕنەوە کە زەرارەی کوڕی ئەوفا کاتێك گەیشتە فەرموودەی خودا: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ﴾ (٨/المدثر) [1]،(ئەوکاتەی کە فوودەکرێت بە نەفخی صووردا) یەکسەر کەوت بەڕودا و وەفاتی کرد.

هەروەها ئیبراهیمی نەخەعی (خودای لێ ڕازی بێت) کە ئەم فەرموودەی خودای دەبیست: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ﴾ (الإنشقاق/١)

---

(١)أخرجه أبو نعيم في الحلية . ورواه الترمذي في (سننه) في ذيل حديث (٤٤٥) لە بەهزی کوڕی حەکیم فەرمووی: (زەرارەی کوڕی ئەوفا قازی بەصرە بوو ئیمامەتی بەنی قەشیر ی دەکرد، ڕۆژێك لە نوێژی بەیانیاندا ئایەتی: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ﴾ ی خوێندەوە، واتە: کە فوو کرا بە نەفخی صووردا، بەڕاستی ئەوە ڕۆژێکی زۆر سەخت و ناڕەحەت دە بێت، ئیتر کەوت بەڕودا و وەفاتی کرد، من یەکێك بووم لەوانەی کە هەڵمانگرتوو بردمانەوە بۆ ماڵەوەیان.

(کاتێك ئاسمان لەت بوو) ئیتر حاڵی دەشێواو گیانی دەستی دەکرد بە لەرزین.

عەبدوڵلای کوڕی واقید فەرمووی: بینیم عەبدوڵلای کوڕی عومەر وەك بەشیشەوەکرابێت و لەبەر ئاگرابێت ئاوا گیانی دەبرژا، حەقی خۆیشیەتی کە بەم شێوە ببینم کە دڵی بسوتێت بە وەعد و وەعیدو هەڕەشەکانی گەورەکەی، چونکە خۆی بە بەندەیەکی ژێردەستەی گوناهباری داماو دەزانێت، لە ژێر زەبر و دەستەڵاتی دوودەستەی قودرەتی خودادا.

جێگیربوونی ئەم واتایانەش بە پێی ئاستی تێگەیشتنیانە لە فەرموودەکان، تێگەیشتنیشیان بە پێی زۆری زانست و صەفای دڵ و پلە و ڕیزبەندییەکانی مقامەکانیانە کە سەرژمێرناکرێن، نوێژیش کلیلی کردنەوەی دەروازەی دڵەکانە، لە نوێژدا نهێنیەکانی وشەو ڕستەکان دەردەکەون.

ئەمەی باسمان کرد، مافی خوێندنەوەی قورئانە، کە لەسەریەتی بەو شێوە بیخوێنێتەوەو، زیکر و تەسبیحاتەکانیش هەربەو شێوە ئەنجام بدات.

لە پاشان دەبێت چاودێری هەیئەت و ئادابەکانی خوێندن بکات، بە تەرتیل و جوانی بیخوێنێتەوە و، هەروا بە سایەو ئاسایی نەبێت، ئەو جۆرە خوێندنەوە ئاسانترە بۆی لە تێگەیشتنی واتاو حاڵی بوون لە ناوەڕۆکەکانی، وە جیاوازی دەخاتە جۆرو صەدای پیت و، ئایەتەکانی ڕەحمەت و عەزاب و بەڵێن و هەڕەشەو، ئەوانەی کە بۆ ستایش و بە گەورە زانین و تەمجید و تەقدیسی خودا هاتوون.

بۆ نموونە ئیمامی نەخەعی (خودای لێ ڕازی بێت) هەرکاتێك بیدایە بەلای ئایەتێکی ئاوادا: ﴿**مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ**﴾ (المؤمنون/٩١) کە باسی ئەوەدەکات خودا پێویستی بە منداڵ و ڕاگرتنی منداڵ نییە، زۆر بە شەرمەوە دەنگی نزم دەکردەوە،وەك ئەوەی کە نەیەوێت بەم شێوە ناوی ببات.

هەروەها دەگێڕنەوە: کە دەڵێن بە وانەی لە دونیادا قورئانیان دەخوێند:

بخوێنه بەناسکی و نەرمی، وە بە تەرتیل و باشی بیخوێنه، وەك چۆن لە دونیادا بەو شێوە دەتخوێند[1].

## مانەوەی بە پێوە:

ئەوە بێدارکردنەوەیەکە لە سەر مانەوەی دڵ لە حزوری خودادا، لە سەرشێوەیەکی تایبەتی ئامادەباشی، وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**إنَّ اللهَ يُقبلُ علَى المُصَلي ما لَم يلتَفِتْ**))[2]، واتە: خوای گەورە ڕوی ڕەحمەتی دەکاتە ئەو کەسەی کە نوێژ دەکات، مادەم دڵی لانەکاتەوە بەملاولادا.

وە هەروەك چۆن پێویستە پارێزگاری لە سەر و چاو بکەیت، کە لا بەملاولادا نەکەنەوە، هەروایش پێویستە حیراسەتی سیڕ و نهێنییەکانی بکات، کە لا بەلای غەیری نوێژەکەیدا نەکاتەوە، خۆ ئەگەر لا بەلایەکی تردا بکاتەوە بیری بخەرەوە کە خودا چاوی لێتەو چاودێریت دەکات، وە ئەمە کارێکی خراپ و نەگونجاوی ئەو کەسەیە کە موناجات دەکات، بەرامبەر ئەوەی موناجاتی لە حزوردا دەکەیت ، بەڵکو هۆشی وەبەر بێت و بێدار بێتەوە.

وە دڵت پابەندبکە بە حاڵەتی خشوعەوە، چونکە ڕزگار بوونت لەوەی بەملاولادا لانەکەیتەوە، لە حاڵەتی زاهیری و شاراوەدا، بەرهەمی بوونی خشوع

---

(١)يقال لقاريءالقران إقرأ.. الحديث) قال العراقي أخراجه أبو داود (١٤٦٤)والترمذي (٢٩١٤) والنسائي في الكبرى (٨٠٠٢) من حديث عبد الله بن عمر وقال حسن صحيح اهـ.قال الزبيدي١٥٣/٣:أخرجوه من طريق سفيان عن عاصم بن أبي النجود عن ذرعن ابن عمرو اهو كذلك أخرجه أحمد والحاكم وابن حبان والبيهقي من حديث ابن عمر. ورواه ابن أبي شيبة مرفوعا عنه موقوفا: ولفظهم جميعا: (**يقال لصاحب القرآن يوم القيامة اقرأ وأرقهِ وَرتِّل،كَم كُنت تُرتِّلُ في دار الدُّنيا فإنَّ مَنزلتَك عِندَ آخرِ آيةٍ كُنت تقرؤها**).

(٢)قال العراقي رواه أبو داود(٩٠٩)والترمذي(٢٨٦٣) والنسائي(٨/٣) والحاكم وصحح اسناده من حديث أبي ذر اهـ الإتحاف ١٥٣/٣.

و گەردنکەچییە لە دڵتدا، وە هەرچەندێك باطین و دەروون خشوعی تێدا هەبێت، ئەوەندەش زاهیرو ئەندامەکانی جەستەی هێورو ئارام دەبن.

پێغەمبەری خودا ﷺ کابرایەکی بینی یاری بە ڕدێنی دەکرد فەرمووی:

((أمَّا هَذا لَوْ خَشَعَ قَلبُهُ لَخشَعَت جَوارِحُه))[1]،ئەگەر دڵی خشوعی تێدا بوایە ئەوا ئەندامەکانی لەشیشی ئارامدەبون و نەیدەجوڵاندن.

چونکە ڕەعیەت و ژێردەستە بە پێی چاودێر و شوانەکەیان دەجوڵێنەوە، بۆیە لە دۆعاو نزادا هاتووە: خودایە ئیصڵاحی ڕاعی و ڕەعییەتمان بۆ بکەیت، واتە شوان و چاودێر و ئەوانەش کە لەژێر دەستی دان، کە بریتین لە دڵ و ئەندامەکان.[2].

(حەزرەتی) صددیق (خودای لێ ڕازی بێت) لە نوێژەکەیدا وەك مێخێك وابوو بەزەویدا داکوترابێت، (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی زوبەیریش (خودای لێ ڕازی بێت) وەك (عود)ێك ڕادەوەستا،[3].

وە هەندێکیش لە ڕکوعدا ئەوەندە ئارام بوو، چۆلەکە بەسەر پشتیوە

---

(١) هو عند الحكيم الترمذي في (نوادر الأصول)٣/٢١٠،ص/٣١٧، مرفوعاً: ورواه المروزي في (تعظيم قدر الصلاة)(٨٩) وفي المصنف لان أبي شيبة ٨٦/٢(٦٧٨٧)موقوفا على حذيفة ومن قول سعيد ابن مسيب.

(٢)دۆعاکەبەم شێوەیە: (**اللهم أصلح الراعي والرعية**) وهو من قطعة دعاء كان الجنيد (رضي الله عنه) يدعوا بها كما في الحلية١٠/٢٨٢،قال العراقي لم أقف له علي أصل اهـ، ثم ان المعروف أن المراد بالراعي والرعية الحاكم والمحكوم عليه، بەڵام ئەم فەرمووده مەرفوعە پشتی دەگرێت: **ألاإن في الجسد مضغةٌ إذا صلحت صلُح الجسدُ كلُّه وإن فسدت فسد الجسد كله الا وهي القلب.**

(٣) وەك داری عوود بەڕێکی ڕادەوەستا، حەزرەتی ئەبوبەکریش وەك مێخ چۆن دابوکوترێت و سەری دانەواندبێت و گەردن کەچ بێت ئاوا لەحزوردا ڕادەوەستا. أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف (٧٣٢٢) والمروزى في (**تعظيم قدر الصلاة**)ص/٨٧.

دەنیشتنەوە، وەك لەسەر شتێکی بێ گیان بێت.[1]

ئەم حاڵەتانە سروشتی ئاسایی مرۆڤ داخوازی دەکات، بۆ کەسانێکی گەورەکراو لە ئەهلی دونیا، ئیتر چۆن بە پێویستی نازانێت ، بۆ کەسێك کە لە بەینی دوو دەستەی پادشای هەموو پادشاکاندا ڕاوەستابێت، بۆ کەسێك کە بزانێت مەلیکی هەموومەلیکەکان کێیە؟!

وە هەرکەسێك بە خاشیعی و گەردن کەچی لە بەردەمی غەیری خودادا خۆی ببینێتەوە، بەڵام ئەندامەکانی لەشی لە جوڵەدابێت و ئارامی پەیدا نەکاتەوە لە کاتێکدا لە حزوری خودادا ڕادەوەستێت، ئەوە نیشانەیە لە سەر کەم فامی و تێنەگەیشتنی، لە وەی کە نەیتوانیوە خودا بناسێت و ناشزانێت کە خودا ئاگادارو چاودێرە بەسەر زەمیر و نهێنییەکانیدا.

(حەزرەتی) عیکریمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿**الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ، وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ**﴾ (الشعراء/٢١٨)،

واتە: ئەو خودایەی کە تۆ شەوان هەڵئەستی بۆ شەو نوێژکردن، ئەو چاوی لێتە و ئەتبینێت، ئەم دیوو ئەو دیو کردن و جموجوڵێشت لە سوجدەبردنا بۆ خودا، لە ڕیزی سوجدەبەرادا ئەبینێت[2]،

لە بارەی ئەم ئایەتەوە فەرمووی: واتە هەستان و ڕکوع و سەجدەبەرەکان و دانیشتنەکانیان دەبینێت.

---

(١) ئەو کەسە (عنبس بن عقبة) بوو، وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە (الزهد)دا ٢٠٨٦) وە نمونەی ئەمەش هاتووە لە (الحلية)دا ٢/ ١١٤.

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی،٢٧٦، وە بنوارە: تەفسیری ابن أبي حاتم (١٦٠٣٢).

# باسی ڕکوع و سەجدەبردن:

لە کاتی کڕنوش وسەجدەبردن بۆ خودا، پێویستە باسی کیبریاو عەزەمەتی پەروەدگار زیاتر بکرێتەوەو، گەورەیی خودا نوێ بێتەوە لە دەرونیدا، وە دەستەکانت بەرزکەیتەوە بەوەی کە پەنات بردووە بە لێبوردەیی خودا لە تۆڵەو سزاکانی، وە شوێنکەوتەی سوننەتی (حەزرەتی) پێغەمبەر بێت ﷺ ، لە پاشان دەست پێ دەکەیت لە حزوری خودادا، لە ڕوانگەی ئەو ڕکوعەوە کە دەیبەیت، بە ئەوپەڕی گەردنکەچی و زەلیلی و خۆ بەکەمزانینەوە، خۆت بخەیتە بەرچاوی پەروەردگارەوە، وە کۆشش بکەیت کە زیاتر دڵت نەرم و، خشوعت تازەتر و زیاتر بێت، هەست بەبێدەستەڵاتی خۆت وعیزەت و جەبەروتی مەولاکەت بکەیت، وە گەردنکەچی خۆت و بەرزی و باڵایی پەروەردگار، وە بەهۆی زوبانتەوە دەتوانیت ئەوەی لە ناخی دڵتدایە دەری ببڕیت لەم بارەوە، تەسبیحاتی پەروەردگارت بکەیت و، شایەتی عەزەمەت و گەورەیی بۆ بدەیت، کە ئەو زاتە لە هەموو گەورەکان گەورەترە، وە ئەم ناوەرۆك و بڕیاری دەروونەت دووپاتی بکەیتەوە بەسەر دڵتدا و، بۆ ئەوەی هەمیشە بیلێیتەوەو دوپاتی بکەیتەوە، لە پاشان لە ڕکوعەوە سەرت بەرزکەیتەوە، هیوایشت وابێت کە خودا ڕەحمی بە زەلیلی و کزی و لاوازی تۆ کردووە[1]،وە بۆ دوپاتکردنەوەی ئەو هیوایەی کە هەتە بە ڕەحمی خودا، دەڵێیت:

---

(١) ئەم دەستەواژەیە هێمایە بەوەی کە کڕنوش بردن، حاڵەتی زیللەت و گەردن کەچییە، سەربەرزکردنەوەش حاڵەتی سەربەزی یە، لە کاتی ئەوەدا لەلایەن خوداوە فرمان دراوە کە لەسەر زوبانی پێغەمبەرﷺ سەرت بەرز کەرەوە، (**ثُمَّ ارفَعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ قائِماً**)تا بە ڕێکی ڕادەوەستێت، کەواتە خودا دەیەوێت ڕەحم بە زیلەت و خشوعەکەی بکات. بنوارە: الإتحاف٣/١٥٥.

(سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) واتە: خودا دێت بە هاوار و بەدەم داوای ئەو کەسەی کە سوپاس و شوکرانەبژێریەتی.

بە دوای ئەم سوپاس گوزاری یەیدا، شوکرێکی تری دەکات، کە تەماداری نیعمەتی زیاتری لێ دەکرێت و دەڵێت:

(ربَّنا لَكَ الحَمْد)خودایە تەنها تۆ شایستەی سوپاسی، وە سوپاسەکەیشت زیاتر دەوڵەمەند دەکەیت و دەڵێیت: (مِلءَ السَّماواتِ ومِلءَ الأَرضِ) سوپاس و ستایش بۆ خودا، پڕی هەموو ئاسمانەکان و زەوی، لە پاشان بەرەو خواردەبیتەوە بۆ سەجدەبردن، کە بەرزترین پلەی گەڕانەوەو خۆ بەکەمزانینە، بەڕێزترین ئەندامی جەستەت کە ڕوخساتە، دەیخەیتە سەر نزمترین شت کە خاك و زەمینە، ئەگەر بتوانیت هیچ شتێك نەکەیتە میانی تەختی تەوێڵ و خاکەکەوە باشترە، زیاتر واتای ملکەچی و خۆبەکەم زانین دەگەیێنێت، وە ئەگەر بەوشێوە نەفسی خۆتت لە جێگەیەکی پڕ لە زبللەتدا دانا، ئەوە بزانە: لە جێگەی خۆیدا دات ناوە، بەش و لقەکانت گەیاندۆتەوە بە ئەصڵەکەی، چونکە تۆ خۆت لە گڵ دروست بویت، وە بۆ ناو گڵیش دەگەڕێیتەوە، کەواتە لەم کاتی سەردانەواندن و گەردنکەچییەتدا، گەورەیی و عەزەمەتی خودا لەسەر دڵت تازە بکەرەوە، وە بەمتمانەی تەواوەوە بڵێ:

(سُبحَانَ رَبِيَ الأَعلَى)، پاك و مونەززەهی بۆ خودای بەرز و باڵا، وە چەندین جار دوبارەی بکەرەوە، چونکە وتنی ئەو تەسبیحاتە، بۆ یەکجار ئاسەوارێکی لاوازی دەبێت، بەڵام ئەگەر زۆرت وت و دڵت نەرمی و ناسکی ڕوی تێکرد و، گریان سەری هەڵدا، ئەو کاتە زیاتر ڕجاو هیوات قایم بکە بە ڕەحم و سۆزی پەروەردگارت، چونکە ڕەحمەتی خودا زیاتر و خێراتر بۆ لای کەسە لاواز و خۆبەکەمزانەکان دەچێت، نەك بۆلای کەسانی بەفیز و خاوەن دەمار.

لەپاشان سەرت بەرزکەرەوەو(الله أكبر) بکەو، داوای پێداویستییەکانیشت

له خودا بکه و بڵێ: (رَبِّ اغفِرْ وارحَمْ، وتَجاوَزْ عَمَّا تَعلم)[1]،خودایە لێم خۆش ببە و بەزەییت پیامدا بێتەوەو، لەوەیش کە دەیزانیت لە بارەی منەوە لێم ببورە و لەسەرم حیساب مەکە، یان هەردۆعایەکی تر[2]

لە پاشان دوپاتی گەردن کەچی خۆت بکەرەوەو، بگەڕێرەوە بۆ سەجدە و ، هەمان تەسبیحاتی تیا بکە.

## باسی تەحیات:

ئەگەر بۆ تەحیات دانیشتی، هەوڵبدە بە ئەدەبەوە دابنیشە، وە ڕایبگەیەنە کە هەموو ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت، لە صەڵەواتدان و عیبادەتە کرداریەکان و مالییەکان، وە هەموو ئەو شەهادەتەی کە دەیدیت و، ڕەوشتە پاك و پوختەکان هەمووی بۆ خودایە، وەك چۆن هەموو موڵکێك هەر بۆ خودایە، ئەمەیە واتای (تەحییات)[3].

وە پێویستە لە دڵتدا ڕۆحی پیرۆزی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ و کەسایەتی پیرۆز و بەڕێزی، بە ئەو پەڕی دانانی ڕێزەوە بۆی ئامادەی بکەیت و، لە پاشان بڵێیت:

(السَّلامُ عَليكَ أَيُّها النبِيُّ ورَحمَةُ اللهِ وبَرَكاتُهُ)[4]

---

(١) قوت القلوب ٢/٩٥.

(٢) وەك بڵێت: ربِّ اغفر لي وارحَمني واهدِني، واجبُرني، وعافِني، واعف عني.

(٣) وشەی (تەحییات) بە واتای سەلام و مانەوەو موڵك و گەورەیی و هەموو صیفەتێکی کەماڵ کە بۆ خودایە و ئیمامی غەزالی تەنها یەك واتای باس کردووە. إتحاف٣/١٥٨.

(٤) واتە: ئەو سەلامەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ فێری صەحابەکانی کرد، بەهەمان شێوە ئێمەش سەلامی لێ دەکەین، وەك شێخی قەسطەلانی لە شەرحی بوخاریدا فەرموویەتی، وە بە واتای ئەوەش دێت کە سەلامەتی لە هەموو ناسۆر و

سەلام و ڕەحمەت و بەرەکاتی خودا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خودا، وە دەبێت هیوات بەهێز بێت و دڵنیا بیت کەئەو سەلامەی تۆی پێ دەگات و وەڵامیشت دەداتەوە بە چاتر لە سەلامەکەی تۆ.

لەپاشان سەلام لەسەر خۆت بکەو لەسەر هەموو بەندە صاڵحەکانی خودا، وە سەرنج بدەو بە هیوابە کە خودا ﷻ بە ژمارەی بەندە صاڵحەکانی وەڵامی سەلامەکەت بە باشتر دەداتەوە، لە پاشان شایەتی بە یەکتابوونی خودا بدە، وە شایەتی بدە بە پەیامەکەی (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ ، ئەو پەیمانەی بە خودات داوە(واتە: دووکەلیمەی شەهادەت) دووپاتی بکەرەوەو نوێی بکەرەوە، بۆ ئەوەی خۆت لە ناو ئەو قەڵا بەرزەدا بپارێزیت.

لە کۆتایی نوێژەکەدا دۆعا (مەئسوورەکان)[1]،

---

نارەحەتیەکت لەسەر بێت، شێخی زوبەیدی دەفەرموێت: مەشایخەکانی ئێمە ئەو رایەیان هەڵبژاردووە کە ئەلفلامەکەی بۆ جینسە، واتە سەلامکردنی لە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ وەك تەحیاتەکە وایە، بۆ ئەوەیە واتای گشتگیری هەبێت، کەواتە لە حزوری خوداوە زیهنی دەگوێزێتەوە بۆ حزوری پێغەمبەر ﷺ و، سەلام لە خودی خۆی دەکات، کە بە ئامادەی دەزانێت و، ڕوی خیطابی تێ دەکات، وەك ئەو سەلامەی کە خودا لە شەوی میعراجدا لە خۆشەویستەکەی کرد و فەرموی: **السلام عليك**، بەو شێوە دەبێ سەلامی ڕوبەڕوی لە خزمەتدا بکرێت، الإتحاف ١٥٩/٣. دیارە ئەگەر حزوری ڕۆحیانەتی پێغەمبەری خودا ﷺ نەبوایە، بە کافی خیطاب ڕوی لە پێغەمبەر نەدەکرد. بۆیە دەبێت بە ئامادەی بزانیت، وە گەورەیشی بۆ بڕیار بدەیت، وە چاوەنواڕی ئەوەی لێ بکەیت کە دێت بە دەمتەوەو شەهادەتت بۆ دەدات و خودا ئاگاداری کردووەو دەیکات بەسەر کرداری ئوممەتەکەیدا.

(١)أي المنقول عنه ﷺ أو عن أصحابه وأحسنه ما رواه البخاري(كتاب الأذان-باب الدعاء قبل السلام)(٨٣٣) من حديث عائشة رفعته: كان يدعو في الصلاة: **اللهم إني أعوذ بك من**

(وەرگیراوەکان لە پێغەمبەر و صەحابەکانەوە) بخوێنە، کە پڕی بێت لە تەوازوع و گەردن کەچی، لەگەڵ پاڕانەوەو دواکردن و کڕوزانەوەدا، وە بوونی بڕوایەکی بەهێز و بەهیوابوونێکی تەواو کە وەڵامت دەداتەوە، وە باوك و دایکت و بڕوادارانیش بەشداری نزاو دۆعاکانت بکە.

وە لەکاتی سەلامدانەوەدا با مەبەستت سەلامکردن بێت لە مەلائیکەکان و ئامادەبوان و، نیەتی کۆتایی نوێژەکەیشی پێ بهێنە، وە هەست بە شوکرانە بژێری خودا بکە، کە ڕێنومایی و هیدایەتی داویت، کە ئەو تاعەت و گوێڕایەڵیەت تەواو کردوو ئەنجامت داوە، وا بخەرە خەیاڵتەوە کە تۆ بەم نوێژە ماڵئاوایی لە نوێژەکەت دەکەیت و، لەوانەیە کە نەگەیتە نوێژێکی تر ، وەك پێغەمبەری خودا ﷺ بەو کەسەی کە وەصێتی بۆ دەکرد فەرمووی:

((صَلِّ صَلاةَ مُوَدِّعٍ))[1].

وەك ئەو کەسە نوێژ بکە کە خواحافیزی لە ژیان و نوێژەکەی دەکات.

---

عذاب القبر، وأعوذ بكَ مِن فتنةِ المسيح الدجال وأعوذ بك من فتنة المحيا والممات، اللهم إني أعوذ بك من المأثم والمغرب. وأخرجه مسلم(٥٨٩) وأبو داود(٨٨٠) والنسائي(١٣٠٩).

(١)ونص القوت وقد قال رسول الله ﷺ وقد رأي أنس بن مالك رجلاً يتوضأ فقال: **إذا صليت فصل صلاة مُوَدع وتقدم الكلام عليه** . ويقول الزبيدي:١٦١/٣ ولقد رأيت في الحلية لابي نعيم، قال في ترجمة معاذ بن جبل، حدَّثنا أبو بكر بن مالك حدثنا عبد الله بن أحمد حدثني أبي حدثنا سليمان بن حبان حدثنا زياد مولي لقريش عن معاوية بن قرة قال قال معاذ بن جبل لابنهِ: **إذا صلَّيت فصَلِّ صلاةَ مُودِّع لا تظن أنَّك تعُود إليها أبداً، واعلم يابني أنَّ المؤمنَ يموتُ بين حَسَنتَين حَسَنة قدَّمَها وحسَنة أخَّرها. ورواه ابن ماجه(٤١٧١)**

لە پاشان هەست بە ترس و بیم و شەرم و حەیایەکی زۆر بکە لە هەموو کەموکوڕی نوێژەکەت و، ترست هەبێت بدرێتەوە بەسەرتدا و لێت وەرنەگیرێت، یان بەهۆی گوناهێکی ئاشکرا یان پەنهانی، کە پێت نەزانیبێت خودا لێت تۆڕە بووبێت و، لە ڕەحمەتی خۆی دووری خستبیتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا پشت بە فەزڵ و کەرەمی خودا تۆ هەر بە هیوای وەرگرتنی بە.

یەحیای کوڕی وەثثابی ئەسەدی ئەگەر نوێژی بکردایە..ئەوەندەی خودا ئیرادەی هەبێت دەوەستاو، وەك ئەوەی تووشی کەئابەو حوزنێکی گەورە بووبێت، بێتاقەتیەکی زۆری پێوە دیار بوو .[1].

هەروەها (حەزرەتی) ئیبراهیمی نەخەعی (خودای لێ ڕازی بێت) لە داوای تەواکردنی نوێژەکـانی، کاژێرێك دەمـــایەوە، وەك کەسێکی نەخـــۆش، ئیمجا بەڕێدەکەوت.[2].

ئەمەی باسمان کرد بە درێژەی باسی نوێژی خاشیع و ملکەچەکان بوو، ئەوانەی کە پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن، وە بەردەوامن لەسەر نوێژ و هەرگیز خەمساردی بەرابەر ناکەن، ئەوانەن کە موناجاتیان لە حزوری خودادا بەو ئەندازەیە، کە دەتوانن و بەڕاستی بەندایەتی دەکەن.

کەواتە با ئادەمیزاد نوێژەکەی خۆی بەراورد بکات لەگەڵ ئەم جۆرە نوێژەی کە بەیانمان کرد، چەندێك دەزانێت بۆی دەلوێت ئاوابیکات پێی دڵشاد بێت و، خەفەتیش لەوە بخوات کە ناتوانێت بەو شێوە پاك و پوختەیە

---

(١)امام أهل القراءة بالكوفة قال النسائي ثقة، وذكره ابن حبان في الثقات وقال غيره عن الأعمش: كان من أحسن الناس قراءة وربما اشتهيت أن أقبل رأسه من حسن قراءته وكان اذا قرأ لا تسمع في المسجد حركة،الإتحاف ١٦٢/٣ رواه ابن أبي شيبة في (المصنف) (٣٦٥١٩).

(٢) رواه أبو سعد في طبقاته (٣٩٦/٨).

ئەنجامی بدات، وە پێویستی بە هەوڵ و کۆششی زیاترە، تا لەسەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بێت و، کارەکانی بەرەو باشتر ببات.

بەڵام نوێژی غافڵ و بێ ئاگاکان، بەڕاستی زۆر جێگای مەترسییە، مەگەر خودا بە فەزڵی خۆی بیانخاتە ژێر سایەی ڕەحمەتی خۆیەوەو، ڕەحمەتی خودایش فراوانەو، کەرەمی خودایش ئەوەندە زۆرە لەسەری دەڕژێت و، هەموو شتێك دەگرێتەوە.

داوا دەکەین لە خودای گەورە، کە بمانخاتە ژێر لێشاوی کەرەم و ڕەحمەتی خۆیەوە، وە دامانپۆشێت بە سۆزی لێبوردنی خۆی، چونکە هیچ وەسیلەو هۆکارێکمان لە بەردەستدا نییە، پێیدا بنازین، جگە لەوە نەبێت کە دان دەنێین بە ناتەوانایی و بێ دەستەڵاتی ئێمە، لە کردنی نوێژ و تاعەتێك شایستەی گەورەیی خودای (عَزَّ وجَلْ) بێت .

وە بزانە: پوختەکردن و ڕزگار کردنی نوێژ لە هەموو ئافاتەزاهیری و شارەوەکان، کە وای لێ بکەیت تەنها لەبەر خاتری خودا ئەنجامی بدەیت، وە بەو مەرجە باطینیانە ئەنجامی بدەیت کە باسمان کردن، لە بوونی خشوع و بە گەورەزانینی خوداو، شەرمکردن لە حزوریدا ، هەموو ئەوانە هۆکارن بۆ پەیدابوونی ئەنواری خودایی لە دڵی دا، کە ئەو نوور و بەرەکەتانە دەبنە کلیلی دەروازەی ڕژانی زانستی موکاشەفەو عیلمی لەدونی، چونکە ئەولیا و دۆستانی خودا، کاتێك ئەسرار و نهێنییەکانی مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەویان بۆ دەردەخرێت و، ئەسراری پەروەردگاریان بۆ کەشف دەکرێت ، هەمووی لە کاتی نوێژدا ئەو دەروازەی بینین و زانستەیان لێ دەکرێتەوە، بە تایبەتی لە کاتی سەجدەبردندا، چونکە لە کاتی سەجدەدا زیاتر بەندەکان لە خوداوەندەوە نزیك دەبنەوە، بۆ یە قورئانی پیرۆزیش دەفەرموێت:

﴿وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ﴾ (العلق/١٩).
واته: سوجده بۆ خودا ببەو لێی نزیك ببەرەوە.

وە چەندێك بەندەكان صەفای دڵ و دەروونیان زیاتر بێت و، پارێزراو بێت لە پۆخڵەواتی دونیا، ئەوەندە زیاتر لە كاتی نوێژەكاندا بەرچاویان دەكرێتەوەو، نهێنییەكانیان دەخرێتە بەرچاو، ئەمەش بە پێی بەهێزی و لاوازی و، كەمی و زۆری و، ڕونی و شاراوەیی ئەو حاڵەتانە دەبێت، هەریەكە بە گوێرەی توانا و ئامادەباشی خۆی شتی بۆ دەردەكەوێت، هەیە عەینی ڕوداوەكەی بۆ ئاشكرا دەبێت و، هەیشە بە نموونەیەك پیشانی دەدەن، وەك چۆن هەندێكیان حەقیقەتی دونیایان خستۆتە بەرچاویان، بە وێنەی پارچە گۆشتێكی مردارەوەبوی بۆگەن كردوو، یان شەیتانیان لە وێنەی صەگێك كە كەوتبێت بەسەر ئەو جیفەو پارچەگۆشتە بۆگەنكردووەدا، كە خەڵكی بۆ لای بانگ بكات.

وە هەروەها جیاوازیەكی تریش هەیە لە ئەصڵی موكاشەفەكەدا، هەندێك لە دۆستانی خودا، لە صیفات و جەلالی خودای (عَزَّ وجَلْ) شتێكیان لێ حاڵی دەبێت، وە هەندێكیان لە كردار و ئەفعالەكانی، وە هەندێكی تریشیان لە وردەكاریەكانی زانستەكانی (علومی موعامەلە)، وە بۆ دیاری كردنی ئەو واتاو مانایانە، لە هەموو كاتێدا چەند هۆكارێكی شاراوە دەبن، كە لەبەر زۆری و شاراوەییان ناژمێررێن، وە لە هەموویان بەهێز و دیار تر، بوونی هیممەتی پێ بكرێتە شتێكی دیاریكراو، ئەوا لەپێشتر دەبێت بۆ دەرخستن و ئاشكرابونی.

وە لە دوای ئەوەی كە زانیمان، ئەو فرمانە تایبەتیانە نابینرێن، مەگەر لە ئاوێنەی صاف و بێگەردوو جەلایی كراودا، وە ئاوێنەكانی دڵی ئێستا هەمووی ژەنگاوی بووە، بە پەردەیەك ڕوپۆشی كراوە و، ڕێگای هیدایەتی لێ گیراوە، نەك لەبەر ئەوەی كە خاوەنی هیدایەت بەخشندەیی كەمە بۆ ڕێنومایی كردنیان،

بەڵکو لەبەر کەڵەکە بوونی توێژی ژەنگ و پۆخڵەواتی زۆر، بەسەر دەمی دەروازەی هیدایەتەوە، کە بەرچاوی کوێر کردوون و، زوبانەکانی خێرا کردووە لە نکووڵی کردنی ئەو کار و فرمانە نادیارانە، چونکە سرووشتی ئادەمیزاد وا داهاتووە، کە ئینکاری شتێك بکات کە لەبەرچاویدا نەبێت، خۆ ئەگەر کۆرپەی ناوسکی دایك بیئاوزایەو فامی ببوایە، ئەوا نکوڵی لە بوونی مرۆڤێك دەکرد کە لەو هەوا و ئاسۆ بەرفراوانەدا ژیان بەسەربەرێت.

وە ئەگەرمنداڵ جۆرە تەمیزێك پەیدا بکات و ئەقڵی بە هەندێك شت بشکێت، لەوانەیە ئینکاری ئەوە بکات کە ئاقڵەکان وا گومان دەبەن هەست بە بوونی جیهان و مەلەکووتی ئاسمانەکان و زەوی دەکەن.

هەر بەم شێوەیە ئادەمیزادیش لە هەموو چەرخ و قۆناغێکی ژیانی دا، زۆر نزیکە لەوەی ئینکاری ژیان و بیرکردنەوەی ئەوانە بکات کە لە دوای ئەوەوەن، وە هەرکەسێك بتوانێت ئینکاری قۆناغەکانی ویلایەت بکات، (کە بەندە دەکەوێتە حاڵەتی فەناوە لە نەفسی خۆی، وە پەروەردگاری یارمەتی دەدات تا دەگاتە ئەوپەڕی مقامی نزیکی و تەمکین، کە دەبێتە وەلی ودۆستی خودا)

ئەوەی نکوڵی لە حاڵ و قۆناغەکانی پێگەیشتنی وەلی بکات، لەسەری پێویستەبێت کە باوەڕ بە حاڵ و قۆناغەکانی بوونی پێغەمبەرایەتیش نەکات، کە بەڕاستی ئەو خەڵکە بە چەندین قۆناغی جیاوازدا هاتوون و درووستکراون، نابێت هەرکەسێك ئینکاری ئەودیوی پلە و حاڵەتەکەی خۆی بکات کە پێی نەگەیشتووە یان تێینەگەیشتووە.

بەڵێ، لە کاتێکدا بۆ تێگەیشتن لەم حاڵ ومقامانە ویستیان لە ڕێگەی موجادەلەو دەمەدەمێ و، باس و لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی پڕ لە تێکدان و هانی هانییەوە بۆی بچن و پێی بگەن، نەك لە ڕێگەی تەصفیەو پاڵفتەیی دەرون و

پاككردنەوەی دڵ لە (ماسوی الله) و، لەهەموو شتێك كە بۆنی غەیری خودا بدات،كە ئەم ڕێگەیان نەگرتە بەر، تووشی سەرگەردانی و ئینكاری كردن هاتن.

وە هەركەسێك بۆ خۆی لە ئەهلی موكاشەفە نەبێت، با كەمترین ئەركی ئەوەبێت كە بڕوای بە غەیب و شتە نادیارییەكان هەبێت، وە بڕوایان پێ بكات، تا بە تاقیكرنەوەش ڕاستییەكانی بۆ دەسەلمێت، لە فەرموودەدا هاتووە:

**((إنَّ العبدَ إذا قامَ إلى الصَّلاة رفَع اللهُ سُبحانَه الحِجابَ فيما بَينهُ و بَين عَبدهِ، ووَاجههُ بوَجهِهِ، وَقامَت الملائكةُ مِنْ لَدُن مَنكَبيْهِ إلى الهَواء، يُصلُّونَ بصَلاتِه، وَ يُؤَمِّنُون عَلى دُعائهِ، وَإنَّ المُصليَ لينثَّر علَيهِ البِرُّ مِنْ عَنانِ السَّماءِ إلى مَفرِقِ رأسهِ، و يُناديهِ مُناد: لَوْ عَلمَ المُناجي مَنْ يُناجي ما التَفَتَ، و إنَّ أبوابَ السَّماءِ تُفتَحُ لِلمُصلينَ، وإنَّ اللهَ عزَّوجَل يُباهي ملائكتَه بصِدقِ المصلي))**[1]

بەندەی خودا ئەگەر هەڵسا بۆ نوێژەكەی، پەردە لە میانی بەندەو خالیقەكەیدا نامێنێت، ڕوی ڕاستەوخۆی خۆیی تێدەكات، وە فریشتەكان لای شانەكانیەوە سەردەكەون، بەرەو هەواو بەرزی، بە نوێژەكەی ئەو نوێژ دەكەن، ئامین بۆ دۆعاكانی دەكەن، وە ئەو نوێژخوێنە لە بەرزایی ئاسمانەوەو، لای هەورەوە چاكەی بەسەردا دادەبارێت، تا دەگاتە ئاستی سەری، وە بانگكەرێك بانگی دەكات: ئەگەر ئەو كەسە وا موناجات دەكات، بزانێت لە حزوری كێدا موناجات و پاڕانەوەدەكات، ئەوا لای بەملاو لادا نەكردەوە، نەلای ڕوخسارو نەلای دڵی بە هیچ لایەكدا نەدەكردەوە، وە بزانە كە دەرگاكانی ئاسمانەكان

---

(١)و في بعض النسخ **ليباهي ملائكته بعبيده المصلين**، و نص القوت(٢/١٠٠) بصفوف المصلين قال الزبيدي١٦٤/٣، أورد صاحب القوت هكذا: باختلاف يسير نبهنا عليه و كذا السهروردي في العوارف و نص كل منهما.

دەكرێنەوە بۆ نوێژخوێنەكان، وە خودا شانازی بە سەر فریشتەكانیدا دەكات، بە ڕاستگۆیی نوێژخوێنەكان و ڕێكی ڕیزەكانیان.

ئەوەی كە دەرگاكانی ئاسمانیان بۆ دەكرێتەوەو، خودای گەورە بە خۆی ڕویان تێ دەكات، ئەوە كینایەیە لەو حاڵەتی موكاشەفەو زانیاریانەی بۆیان پەیدا دەبێت.

وە لە تەوراتدا هاتووە:

**((يا ابنَ آدَم! لا تَعجَز أَن تَقومَ بينَ يَديَّ مُصلياً باكياً، فأَنا اللهُ الَّذي اقتربتُ مِن قَلبكَ، وبالغَيبِ رأَيتَ نُوري))**[1]،

(ئەی ئادەمیزاد! وا مەكە كە نەتوانیت لە بەینی دوودەستەی قودرەتی مندا ڕابووەستیت و، بە گریانەوە نوێژ بكەیت، من ئەو خودایەم كە لە دڵتەوە نزیك بوومەتەوە، وە بەغەیب و شاراوەیی نووری منت دیوە)،

وە دەفەرموێت: ئێمە وامان دەزانی ئەو حاڵەتی ناسك بوونەوەی دڵ و گریان و فتوحاتی غەیبییەی كە بۆ نوێژخوێن دەهات و لە دڵیدا سەرڕێژی دەكرد، بە هۆی ئەو نزیكبوونەوەی پەروەردگارەوە بووە لە دڵی، خۆ ئەگەر ئەم نزیك بوونەوەیە نزیكی شوێن و مەكانی نەبێت، (چونكە ئەم نزیكییە محاڵە بۆ خوداو بەندە)

كەواتە هیچ واتایەكی تر نابەخشێت جگە لە نزیكبوونەوەی نەبێت بە هیدایەت و سۆز و ڕەحمەت و لادانی پەردەو حیجاب لە میانی بەندەو خالیقەكەیدا.

وە دەڵێـن: ئەگەر بەندەیەكی خودا دووڕكات نوێژی خوێند ئەوا دە ڕیزی مەلائیكە پێی سەسام دەبن و هەموو ڕیزێك دە هەزار كەسی لەگەڵدایە، وە خودا شانازی بەسەر صەد هەزار مەلائیكەدا دەكات، ئەمەش بەو شێوەیە كە

---

(١) قوت القلوب/٢/١٠٠.

ئەو بەندەیە لە ناو نوێژەکەدا هەستان و دانیشتن و، و ڕکوع و سوجدەی کۆکردۆتەوە، ئەمەیش دابەش دەکرد بەسەر چل هەزار مەلائیکەدا، ئەوانەی بەپێوە ڕاوەستاون، ئیتر تا ڕۆژی قیامەت هەر بە پێوە دەبن و ڕکوع نابەن، وە سەجدەبەرەکانیش سەر بەرز ناکەنەوە تا ڕۆژی قیامەت، هەر بەم شێوەیە ڕکوع بەر و دانیشتووەکانیش لەو حاڵەتی خۆیانەدا دەمێننەوە، چونکە بەڕاستی ئەوەی خودای گەورە بەخشیویەتی بە مەلائیکەکان،لە نزیکی و پلەو پایەی تایبەتی، بەردەوامەو لێیان نابێتەوە و، لەسەر یەك حاڵ دەمێننەوە نەزیاد دەکەن ونەکەم، لەبەر ئەمەیە کە خودای(عَزَّ وجَلَّ) هەواڵی لێ داون و دەفەرموێت:

﴿وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَعْلُومٌ﴾ (الصافات/١٦٤)

(هەریەکەمان تەنها پلەو مقامێکی بۆ دانراوو دیاری کراومان هەیە)،

بەڵام مرۆڤ جیاوازە لە مەلائیکەکان، کە پلە پلە زیاد دەکات، چونکە بەردەوام لە خودای گەورەوە نزیك دەبێتەوە، وە سوود لەو نزیکییە دەبینێت، بەڵام دەرگای نزیکی و پلە بەرزبوونەوە لە مەلائیکەکان داخراوە، (سەلامی خودایان لەسەر).

هەریەکەیان تەنها ئەو پلەیان هەیە کە وەقف کراوە لە سەریان، وە ئەو جۆرە بەندایەتییەی کە پێیان سپێرراوە، نابێت بیگوازێتەوە بۆ عیبادەتێکی تر یان بیانگۆڕێت، یان وازیان لێ بهێنێت:

﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ، يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ﴾ (الأنبياء/٢٠)

(فریشتەکانی لای خودا هەرگیز خۆیان بە زل نازانن لە بەندایەتیدا، وە لە

گوێڕایەڵیدا کە ماندووبن، بەشەوو بەڕۆژ سوبحانەڵلا دەکەن و هیچ درێغییەکیش ناکەن)[١]،

وە کلیلی زیادبوونی پلەکان بەهۆی نوێژەکانەوەیە، وەك خودا فەرموویەتی:

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾

(بەڕاستی ئەوانە سەرفرازن کە نوێژەکانیان بە خشوع و گەردنکەچی دەکەن) کەواتە لە دوای ئیمان و بڕوا بە نوێژێکی تایبەت ستایشی کردوون، کە پەیوەست بێت بە خشوعەوە، لە پاشان کۆتایی بە وەصف و پێناسەی خاشیعەکان بەوە دەهێنێت کە دەفەرموێت:

﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾

، (ئەوانەی بە تەواوی پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن، ماف و مەرجەکانی جێبەجێ دەکەن)،

لەپاشان باسی بەرهەمی ئەو صیفەتانە دەکات کە تیایاندا بێت و دەفەرموێت:

﴿أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (المؤمنون/١١)

(بەڕاستی هەر ئەوانەن کە میراتگرن ، کە میراتی نیعمەتی بەهەشت و فیردەوسی باڵای تیا وەردەگرن، وە هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە)، کەواتە بە ڕزگاربوو سەرفراز وەصفی کردن و، بەوەش کە دەبنە میراتگری فیردەوسی ئەعلا.

ئەوەی دێتە زیهنمەوە، تێکەڵکردنی زوبان و، پەلەکردنی لە نوێژەکاندا و، بوونی غەفڵەتی دڵیش، کە ئاگای لەخۆی و قسەکانی نەبێت، ئەیگەیێنێتە ئەو پلە نزمەی کە قورئانی پیرۆز باسی صیفەتی دزەکان دەکات و فەرموویەتی:

---

(١) خولاصە: ٣٢٣.

﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ . قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ﴾ (المدثر/٤٣)

(ئەوە چییە ئێوەی هێناوەتە ناو دۆزەخەوە، دەڵێن: لە پێڕی ئەوانە نەبوین کە نوێژیان دەکرد).

چونکە نوێژخوێنەکان میراتگری ناو فیردەوسن، ئەوانەن کە نوری خودا دەبینن، لە ناز و نیعمەتی نزیکیدان لە قوربی مەعنەوی پەروەردگارەوە، کە دڵیانی بەتەواوی داگرتووە و لێی نزیك بووەتەوە.

داوا دەکەین لە خودای (عَزَّ وجَلَّ) کە لەوانەمان بگێڕێت، وە بمانپارێزێت لە سزای ئەوانەی کە قسەی جوان و ڕازاوەیان هەیە و، کرداری دێز و ناشیرینیان هەیە، هەر خۆیەتی سەخی و خاوەن مننەت و، قەدیم و خاوەن چاکەو ئیحسان، ڕەحمەتی خودا لەسەر هەموو بەندە صەفادراوە پاڵفتەکراوەکان.

# چەندین چیرۆك و فەرموودە
# لەبارەی نوێژی گەردن کەچ و خاشیعەکانەوە

بزانە: خشوع و ئارامی لە نوێژدا، بەرهەمی بڕوابوونی ڕاستەقینەیە، وە ئەنجامی بوونی متمانەیەکی پەیدابووە، بە بەرزی و جەلالی خودا (سُبْحانَهُ وَتَعالَى)، وە هەرکەسێك خودا ئەو لوتفەی لەگەڵدا بکات، ئەوە نوێژەکانی زۆر بەهێمنی و ئارامی دەکات و، دوای نوێژیش هەر بەم شێوە ئارام دەبێت، بەڵکو لە خەڵوەیشدا خشوعی خۆی لەدەست نادات، تەنانەت لە سەرئاوو جێگای تارەت و دەستنوێژگرتنیش. ئەوەی خشوعی هەبێت، دەبێ بشزانێت و دڵنیابێت کە خودا ئاگادار و چاودێرە بەسەر بەندەکانیەوە، وە بزانێت کە خودا خاوەنی جەلال و گەورەییە، وە دانیش بنێت بە کەموکوڕییەکانی خۆیشیدا، وە لەم زانین و ناسینەیەتی کە خشوعی لێ پەیدادەبێت، ئەمەش تایبەت نابێت بە نوێژەوە، بۆیە دەگێڕنەوە لە هەندێکیان، کە ماوەی چل ساڵ سەری بۆ ئاسمان بەرز نەکردۆتەوە، لە شەرم وحەیادا لەحزوری خودای (عَزَّ وجَلَّ) دا[1]

ڕەبیعی کوڕی خوثەیم (خوای لێ ڕازی بێت)، لە زۆری و بەردەوامی چاوداخستن و سەردانەواندنی، هەندێك وایان دەزانی کە کوێرەو چاوی نابینێت، ماوەی بیست ساڵ بۆ خوێندن دەچو بۆ ماڵی (حەزرەتی) عەبدوڵلای

---

(١) ئەم بابەتە لە چەندین کەسی دەگێڕنەوە، وەك (حەزرەتی) سولەیمان (علیه السلام)وەك لە کیتابی (الزهد)ی عەبدوڵلای کوڕی موبارەکدا هاتووە، (١٧٦)، لە زیادکراوەکانی نەعیم ی کوڕی حەمماد، وە هەندێکی تریان حەفتا ساڵ بەمشێوە سەری دادەخست و کەس چاوی نەدەبینی، وەك ئەبوعوبەیدەی خەواص (خودای لێ ڕازی بێت) بنوارە (صفة الصفوة)١٩٥/٤.

کوڕی مەسعود، هەر جارێك کەنیزەکی ماڵەکە بیبینیایە دەیووت: هاوەڵە کوێرەکەت هاتووە، ئەویش پێدەکەنی، چونکە هەرکاتێك لە دەرگای ماڵی (حەزرەتی) عەبدوڵلای دەدا، کەنیزەکەکە دەرگای بۆ دەکردەوە، سەر و چاوی داخستبوو، وە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ﴾ مژدە بەوانە بدە کە خشوعیان هەیەو دڵیان ئارامە بە خودا، لەسەر خۆیشیان نایەنە جواب، هەمیشە بیریان بەلای خودایانەوەیە، وە دەیفەرموو: وەڵلاهی ئەگەر (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ تۆی ببینیایە دڵشاد و فەرەحناك دەبوو پێت، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:
(تۆی خۆش دەویست) یان بە شێوەیەکی تر (پێدەکەنی و دڵخۆشدەبوو[(١)]).

وە ڕۆژێکیان لەگەڵ ئیبن و مەسعود لە بازاڕی ئاسنگەرەکاندا دەگەڕان، کاتێك سەیری کوورەکانی دەکرد، بینی کە وەستاکە فووی دەکردو ئاگرەکەیش بڵێسەی سەندبوو، هاوارێکی کرد و کەوت و بێ هۆشبوو، وە ئاگای لە خۆی نەما، (حەزرەتی) عەبدوڵلا تا کاتی نوێژ بەسەریەوە ڕاوەستا، بەڵام ڕەبیع بە خۆی نەهاتەوە، ئەویش خستیە سەر پشتی و بردیەوە بۆ ماڵەوە، بەردەوام لەهۆش خۆی چووبو، تا گەیشتەوە ئەو سەعاتەی کە دوێنێ تیایدا بێ هۆش کەوتبوو، پێنج نوێژی فەوتا، عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش بەسەر سەریەوە ڕاوەستابوو هەموو کاتێك دەیفەرموو: وەڵلاهی ئەمەیە ترسان لە خودا![(٢)].

---

(١) روى الخبر أحمد في (الزهد) (١٩٨٩) والطبراني في الكبير(١٠/١٥١) وأبو نعيم في الحلية ١٠٦/٢، وهو في قوت القلوب١٠٢/٢) .

(٢) پێشتر لە (حەزرەتی) عەبدوڵلا ئەم ئایەتەی دەبیست: إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا (الفرقان/١٢)رواه أحمد في (الزهد)(١٩٤٥) وأبو نعيم في الحلية ١١٠/٢، يقول الأعمش كما في (الزهد) ١٩٨٢) فمررت بالحدادين لأتشبه به فلم يمن عندی خير) والخبر في القوت (١٦٧/٢).

هەروەها (حەزرەتی) ڕەبیع دەیفەرموو:

هەرگیز نەچوومەتە ناو نوێژێکەوە کە شتێکم بەلاوە گرنگبووبێت، جگە لەوەی کە دەیڵێم لە تیلاوەتی قورئان و تەسبیحات کردن، وە ئەوەش کە پێم دەوترێت، لە قسەلەگەڵ کردن و موناجات و وەڵامدانەوە [1].

هەروەها عامیری کوڕی عەبدوڵلا لە ناو نوێژخوێناندا بەناوبانگ بوو بە بەندەیەکی خاشیع و گەردن کەچ، هەرکاتێك نوێژی بکردایە، وارێدەکەوت هەندێك جار بە دەف لە کچەکەیان دەدا، وە ئافرەتەکانی دەوروبەر ئەمەیان دەزانی و دەیانکرد بە قاڵ، کەچی عامیر لە ژوورەوە لە نوێژدابوو، وە نەگوێی بەو قسانەوە بوو، نەئاگایشی لەم کەین و بەینەوە بوو.

ڕۆژێکیان پێیان وت:

ئایا تووشی هیچ خەتەرەو خەیاڵێك دەبیت لە خۆتەوە بۆت بێت، فەرمووی بەڵێ: ئەوەی کە نەفسی خۆم لەگەڵمدا دەدوێت تەنها باسی وەستانمە لە حزوری خودادا، وە پاشەڕۆژی چارەنووسی خۆم بۆ یەکێك لە جێگاکان، بەهەشت یان دۆزەخ، وتیان :

ئایا ڕوبەڕوی خەتەرەیەکی دونیایی نەبویتەتەوە، کە ڕۆژانە پێیانەوە دەتلێینەوە؟

فەرمووی: ئەگەر ڕمە کوشندەکان بچن بەگیاندا، زۆرم پێخۆشترە لەوەی دوچاری ئەو حاڵەتانەببم کە لە نوێژەکانتاندا ڕوتان تێدەکات [2].

بۆیە حاڵی وابوو کە دەیفەرموو:

---

(١) قوت القلوب:٢/١٠٢،

(٢) هەمان سەرچاوە.

ئەگەر پەردەی هەموو نهێنییەکان لابدرێت و، هەموو شتێکم بخرێتە بەرچاو، یەقین و متمانەم لەمەی کە هەمە زیاتر ناکات.

موسلیمی کوڕی یەساریش (خوای لێ ڕازی بێت) یەکێك بوو لەو زاتانە،[1] وەك باسمانکرد پایەی مزگەوتەکە ڕوخاو، هەموو کۆبوونەوەو ئەو لە نوێژدابوو و هەستیشی پێ نەکرد.

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە:

نوێژ بەشێکە لە ئاخیرەت، ئەگەر چوونە ناو نوێژەوە ئەوا لە دونیا دەردەچن[2]،

وتیان بە یەکێکی تر لە خوداناسان:

ئایا لە خۆتەوە هیچ خەتەرەیەکت بۆ دێت لە نوێژدا؟ فەرمووی:

نەخێر نە لە نوێژدا و نە لە غەیری نوێژدا هیچم پێ ناڵێت[3]،

وە پرسیاریان لە هەندێکی تر کرد:

ئایا لە نوێژدا هیچ شتێکت بیر دەکەوێتەوە؟ فەرمووی:

ئایا شتێکی وا هەیە لە نوێژ کردنم لا خۆشەویست تربێت تا ئەو شتە بە بیری خۆم بهێنمەوە[4]

(حەزرەتی) ئەبودەرداء (خوای لێ ڕازی بێت) دەیفەرموو:

نیشانە لەسەر تێگەیشتنی پیاو ئەوەیە کە پێش ئەوەی بچێتە ناو نوێژەوە کار و ئیشەکانی تەواو بکات، با دڵی لە هەموو شت خاڵی بێت و تەرخانی بکات بۆ

---

(١) رواه ابن عساكر في (تأريخ دمشق) ١٣٥/٥٨، وهو في القوت: ١٠٢/٢

(٢) واته(حەزرەتی)عورووەی کوڕی زوبەیرە، مامی حەزرەتی عامر، بنوارە: المرض والكفارات /١٤١، وابن عساكر في (تأريخ دمشق) (٢٦١/٤٠)دون تصريح أن القطع كان في الصلاة.

(٣) عوارف المعارف ٥٤٧/٢، وقد نسبه الزبيدي إلى (القوت).

(٤) قوت القلوب١٠٢/٢.

نوێژەکە[1]،

وە هەندێکی تریان لە ترسی وەسوەسە خێرایی دەکرد و نوێژەکەی زوو تەواو دەکرد، دەگێڕنەوە (حەزرەتی) عەماری کوڕی یاسر نوێژێکی کرد و سوکی کردەوەو پەلەی تێدا کرد، وتیان پێی: ئەی باوکی (یەقضان)! پەلەت لە نوێژەکەتدا کرد، فەرمووی:

ئایا منتان بینی یەکێك لە سنوورەکانی کەم بکەمەوە؟ وتیان نەخێر، فەرمووی: لەبەر سەهو پێکردنی شەیتان وا خێراییم لێ کرد.

بەڕاستی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((إنَّ العَبَد ليُصلِّي الصَّلاة لايُكتَب لَه مِنها نِصفُها ولا ثُلُثُها ولا رُبُعها، ولا خُمسها، ولا سُدسُها ولا عُشرُها، وكان يقول:**

**وإنَّما يُكتَب لِلعَبْدِ مِن صَلاتِه ما عَقَل مِنها))**[2]

واتە: بەندەی وا هەیە کە نوێژدەکات تەنها نیوەی، یان سێ یەکی یان چوار یەکی یان پێنج یەکی یان شەش یەکی، یان دە یەکی خێری نوێژەکەی بۆ نانوسرێت. ئەوەندەی خێر بۆ دەنوسرێت کە لێی حاڵی بووە و، زانیویەتی لە حزوری خودادا چی دەڵێت.

دەڵێن:

---

(١) رواه ابن مبارك في (الزهد) (١١٤٢) وهو من معلقات البخاري .

(٢)) قال العراقي أخرجه أبو داود(٧٩٦) والنسائي وابن حبان من حديث عمار بن ياسر بنحوه اهـ. قال الزبيدي الإتحاف١١٦/٣: وأحمد: **انَّ الرجل لينصرف وما كُتب له إلا عُشر صلاته تسعها ثمنها سبعها سدسها خمسها ربعها ثلثها نصفها.** وفي رواية للنسائي **ان الرجل ليصلي ولعلَّه أن لا يكون له من صلاته إلا عشرها** الخ وفي رواية له أيضا: **منكم مَن يصلي الصلاة كاملةً، ومنكُم من يصلي النصف والثلث والربع.** الخ ورجاله رجال الصحيح. وكذا في (تعظيم قدر الصلاة) ص/٩٠، والخبر في القوت ١٠٢/٢.

(حەزرەتی) طەڵحەو (حەزرەتی) زوبەیر و کۆمەڵێ لە صەحابە (خودایان لێ ڕازی بێت) لەهەموان زیاتر بەسووکی نوێژیان دەکردو ئەوەندە نەدەمانەوە لە نوێژدا، وە دەیانفەرموو: لەبەر ئەوەی تووشی وەسوەسەی شەیتان نەبین، بۆیە خێرای لێ دەکەین و بە سووکی نوێژ دەکەین[1]،

وە دەگێڕنەوە کە (حەزرەتی) عومەری کوڕی خەطاب (خودای لێ ڕازی بێت) لەسەر میمبەردا فەرمووی:

بەڕاستی پیاوی وا هەیە ئەملاولای ڕوخساری سپی دەبێت و لە ئیسلامدا پیر دەبێت، هێشتا نەیتوانیوە نوێژێك بە تەواوی بۆ خودا بکات، وتیان ئەمە چۆن دەبێت؟ فەرمووی:

ئەوەیە کە خشوع و طەردنکەچی و مەرجەکانی تەواو ناکات و، ڕویشی لە خودای (عَزَّ وجَلْ) کردووە.[2]

وە پرسیاریان لە (أبوالعالیة) کرد دەربارەی واتای فەرموودەی خودا: ﴿الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ (الماعون/٥)

(ئەوانەی کە لە نوێژەکانیان غافڵ و بێ ئاگان)،

واتە: ئەوکەسەی سەهو زۆردەکات لە نوێژەکەیدا، نازانێت لەسەر چەند ڕکات حیسابی بکات، ئایا تاکە یان جووت؟

(حەزرەتی) حەسەنی بەصری فەرموویەتی: (ساهون)

واتە: ئەو کەسەی لە وەختی نوێژەکەوە کە هاتۆتە پێشەوە سەهوو دەکات تا کاتی نوێژەکەی دەڕوات.

---

(١) وروى عبد الرزاق في المصنف، ٣٦٧/٢، عن أبي رجاء، قال: صلى بنا الزبير صلاة فخفف، فقيل له، فقال: إنّي أبادر الوسواس.

(٢) رواه ابن أبى الدنيا، فى (التهجد وقيام الليل)(٤٨٣) والخبر فى القوت(١٠٣/٢).

وه هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەو کەسەیە کە ئەگەر لە سەرەتای کاتی نوێژەکەوە بیکات دڵخۆش و فەرەحناك نابێت، وە ئەگەر دوای بخات تا کاتەکەی بەسەر دەچێت، ئەوا خەفەتی لێ ناخوات، نەپێشخستنەکەی بە چاکە دەزانێت، وە نە دواخستنەکەی بە گوناه دەزانێت[1]، ئەوە ئەو کەسەیە کە لە نوێژدا سەهودەکات.

وه بزانە: نوێژ جاری واهەیە هەندێکی بۆی دەژمێررێت و بۆی دەنوسرێت و ،هەندێکیشی بۆی نانوسرێت، وەك بەڵگەکان نیشانەن لەسەری، هەرچەندە زانای (فەقیە) دەڵێت:

نوێژکردن لە حاڵەتی درووستی دا پارچەپارچە نابێت، بەڵام ئەوە واتایەکی تری هەیە کە باسمان کرد، وە ئەم واتایەش کە ڕونمانکردەوە فەرموودەکان دەبنە بەڵگە لەسەری، کە دەبینین ئەگەر نوێژێکی فەرز کەمو کوڕی تێدا هەبێت، بە سوننەتەکان فەرزەکەی بۆ پڕ دەکرێتەوە[2]،

(حەزرەتی) عیسا (سەلامی خودای لەسەر) فەرموویەتی:

خودا ﷻ دەفەرموێت:

---

(١) قوت القلوب ٢:١٠٣.

(٢) كما روى أبوداود (٨٦٤) والترمذي(٤١٣)مرفوعا: (إن أول ما يحاسب الناس به يوم القيامةمن أعمالهم الصلاة، قال: يقول ربُنا جلَّ وعزَّ لِملائكتِهِ: أنظروا في صَلاةِ عبدي: أتمَّها أم نقصَها؟ فإن كانت تامَّةً..كتبت له تامَّة، وإن كان إنتقص منها شيئا..قال انظروا هل لعبدي من تطوع؟ فإن كان له تطوع، قال: أتموا لِعبدي فريضته من تطوعه، ثم تؤخذ الأعمال على ذاكم). ورواه ابن ماجه (١٤٢٥)، والحاكم في الستدرك(٣٩٤/١)(٩٦٥) وصححه من حديث أبي هريرة (إن أول مايحاسب به العبد يوم القيامة من عمله صلاته، وفيه: فأن انتقص من فرضه شيئاً قال الرب (عَزَّ وجَلّ) : أنظروا هل لعبدي من تطوع ؟ فيكمل بها ما نقص من الفريضة).

((بالفرائضِ نَجا مِني عَبدي، وبالنَّوافل تقَرَّب إليَّ عَبدي))[1]،

عەبدەکەی من بەهۆی فەرزەکانەوە ڕزگاری بوو، وە بە هۆی سوننەتەکانەوە لە من نزیك بوویەوە

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((قال الله عزَّ وَجَل: خودای (عَزَّ وجَلْ) فەرموویەتی:

**لا يَنجوُ مِنِّي عَبدي إلاَّ بأداءِ ما افتَرضْتُ عَليْهِ**))[2]، (بەندەی من ڕزگاری نابێت مەگەر بە بەجێگەیاندنی ئەو فرمانانەی لەسەرم فەرز کردووە).

وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژێکی خوێند، لە خوێندنەوەکەی ئایەتێکی نەخوێند، کاتێك لێ بوویەوە فەرمووی:

((ماذا قرأتُ؟)) چیم خوێند؟ خەڵکەکە بێدەنگ بوون، پرسیاری لە ئوبەیی کوڕی کەعب کرد (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

ئەو سوورەتەت خوێندەوەو ئەو ئایەتەت تەرككردووە، ئیتر نازانم ئەوە نەسخ بووەتەوە یان هەر بە تەواوی هەڵگیراوە لەسەرمان؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی:

((أَنتَ لَهاَ ياَ أُبَيُّ))

---

(١) كذا أورده صاحب القوت١٠٣/٢. وله شاهد في حديث أبي هريرة في الصحيح: **وما تقرَّب إليَّ عبدي بشَئ أفضلَ من أداءِ ما افترضتُه عليه. ومايَزالُ عَبدي يتقرَّبُ إليَّ بالنَّوافِل حتَّى أحِبَّهُ**. الحديث

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد(١٠٣٢) عن حسان بن عطية قال: قال الله :لاينجو مني....) وهو كذلك في الزهد لأبي داوود(٥) عن طاووس اليماني. وفي البخاري(٦٥٠٢) **(وما تقربَ إليَّ عبدي بشيئ أحبَّ إلَيَّ ممّا افترضته عليه، وما يزال عبدي يتقرب إليَّ بالنوافل حتى أحبَّهُ. فإذا أحببتهُ كنتُ سَمعَهُ الذي يَسمَعُ بهِ، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها**، ......الحديث)

تۆ بۆ ئەوە ئەی ئوبەی، لە پاشان ڕوی لە وانی تر کردوو فەرمووی:

**((ما بالُ أقوامٍ يَحضُرونَ صَلاتَهُم، وَيُتِمُّونَ صُفُوفَهُم، وَنَبِيُّهُم بَينَ أيديهِم، لايَدرونَ ما يَتلو عَلَيهِم، مِن كِتابِ رَبِّهِم! ألاَ إنَّ بني إسرائيلَ كَذا فَعَلوا . فأوحى اللهُ إلى نَبيِّهِمْ أنْ قُلْ لِقَومِكَ : تَحضُروني أبدانَكُم وتُعطوني ألسِنَتَكُم، وتَغيبونَ عنِّي بِقُلوبِكُم؟! باطِلٌ ما تَذهَبون)).** [1]،

(بۆدەبێ کۆمەڵێك لەو خەڵکە کە ئامادەی نوێژەکانیان دەبن، وە صەففەکانیان تەواو دەکەن و پێغەمبەرەکەیشیان لە بەردەستیاندایە، بەڵام نازانن چ ئایەتێکیان بەسەردا دەخوێنێت لە کیتابی پەروەردگاریان. بێداربن کە بەنی ئیسرائیلییەکان هەمان کاریان کرد، خودای گەورە وەحی کرد بۆ پێغەمبەرەکەیان کە بە قەومەکەت بڵێ:

جەستەو لاشەکانتان لە لەلای من ئامادەدەکەن و، تەنها زوبانی خۆتانم پێ دەبەخشن، واتە: تەنها بە زوبان لەگەڵم دەدوێن و، دڵتان دەشارنەوەو بەدڵ بێ ئاگان؟!

---

(١) رواه المزوري في تعظيم قدر الصلاة(ص/١٩)، عن عثمان بن أبي دهرش بلاغا بنحوه، وهكذا أورده صاحب القوات بطوله (١٠٤/٢) وقال العراقي أخرجه محمد بن نصرفي كتاب الصلاة مرسلاً، وأبومنصور الدَّيلمي من حديث أبى بن كعب، والنسائي في البرى (٦٧/٥، ٨٢٤٠) مختصراً من حديث عبد الرحمن بن ابزى، باسناد صحيح اهـ . **وفي العوارف: قال رسول الله ﷺ إنكاراً على أهل الوسوسة: (هكذا خرجَت عظمة الله تعالى مِن قلوب بنى إسرائيل، حتى شهدت أبدانهم وغابت قلوبهم، لا يقبل الله صلاة امرى لايشهد فيها قلبُه كما يشهَد بدَنُه، فإنَّ الرَّجل على صلاتهِ دائمٌ ولا يكتب لهُ عُشر ها إذا كانَ قلبُه ساهياً لاهياً)** اهـ الإتحاف ١٧٠/٣. ورواه محمد بن نصر في متاب الصلاة، ١٩٨/١(١٥٧) مرسلا، وأبو منصور الديلمي في الفردوس١١٤/٤(٦٣٥٣) من حديث أبي بن كعب.

ئەوەی بۆی دەچن ڕێگەیەکی پوچ و بێ بەرهەمە.

ئەمەش نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە گوێ گرتنی مەئمووم لە خوێندنەوەی ئیمامەکە لە جێگەی ئەوەیە کە خۆی سوورەتێك بخوێنێت.

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە:

بەندەی واهەیە کە سەجدەیەك دەبات لە نوێژەکەیدا، وادەزانێت بە هۆیەوە زۆر لە خودا نزیك بووەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر گوناهی ئەو سەجدەی دابەش بکرێت، بەسەر ئەهلی شارەکەیدا هەموویان بە هیلاکدا دەبات. وتیان دەی ئەمە چۆن دەبێت؟

فەرمووی:

بە خەیاڵی خۆی لەحزوری خودادایە و سەجدەی بۆ دەبات، بەڵام دڵی گوێی لە هەواو ئارەزواتی گرتووەو بە تەواوی زاڵ بووە بەسەریدا.

ئەمەی کەباسمانکرد صیفەتی ئەوانەیە کە لە نوێژدا خشوعیان هەیە، وە ئەم هەواڵ و فەرموودەو بەسەرهاتانەی کە باسمانکرد، لەگەڵ ئەوەی لە پێشەوە ڕونمانکردەوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەصڵ لە نوێژدا ئامادەبوونی دڵ و خشوع و گەردن کەچییە، وە تەنها جوڵانەوەی جەستەو ئەندامەکانی لەش بێ بایەخ دەبێت لە ئاخیرەتدا، ئەگەر بە بێ ئاگایی و غەفڵەتی دڵ نوێژەکەی بکات. خوای گەورەش زانایە بەسەر هەموو فرمانێکدا.

داوامان لە خودایە کە بە باشی ڕێنومایيمان بکات و، لە سەر ڕێگەی تەوفیق و سەرفرازی بین.

ئامین.

# دەروازەی چوارەم

# لە بارەی ئیمامەت و پێشەوایەتییەوە

ئیمام چەندین وەزیفەو ئەرکی لە سەرە، پێش دەستپێکی نوێژ و لە کاتی خوێندنەوەی قورئان و، لە بەجێگەیاندنی ئەرکانەکانی نوێژدا و، دوای سەلامدانەوەیش.

**ئەو ئەرك و پێداویستیانەی پێش نوێژ دەبێت بیانکات شەش وەزیفەیە:**

**یەکەمیان:** نابێت ببێتە پێشەواو ئیمامی کۆمەڵێك کە پێی ڕازی نەبن، ئەگەر هەندێك پێی ڕازیبوون و هەندێکیش بەدڵیان نەبوو، ئەوا سەیری زۆربەیان دەکرێت، ئەگەر کەمەکان ئەهلی خێر و دین بوون، ئەوە چاکتر وایە گوێ لە ڕای ئەوان بگیرێت.

هەروەك چۆن لە فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتووە:

((**ثلاثةٌ لا تُجاوزُ صَلاتهُم رؤُوسَهُم: العبْدُ الآبقُ، وامْرأةٌ زوجُها ساخِطٌ عَليها، وإمامُ قَومٍ هُم لهُ كارهِوُن**))[1]،

---

(١)قال العراقي أخرجَه الترمذى من حديث أبى امامة وقال حسن غريب وضعفه البيهَقي اهـ ، قال الزبيدي في الإتحاف ١٧١/٣: أخرجه في كتاب الصلاة بزيادة حتى يرجع الآبق والباقي سواء، وقال الذهبي ليس بالقوي، وروى باسناده حسن ووجد بخط الحافظ ابن حجر وصححه ابن حبان اهـ. وأخرجه إبن ماجه (٩٧١)من حديث ابن عباس رفعه: **ثلاثةٌ لا تُرفَع صلاتهم فوقَ رؤسهم شِبراً، رجل أمَّ قوماً وهُم لهُ كارهُون وامْرأةٌ باتَت وزوجُها عَليها ساخِط، وأَخوان مُتصارمان،** قال الحافظ مغلطاي في شرح السنن: إسنادهُ لا بأسَ به، وقال العراقي في شرح الترمذي اسناده حسنٌ . وأخرج أبو داوود في كتاب الصلاة(٥٩٣)، وابن ماجه كتاب الصلاة باب من أمَّ قوما وهم له كارهون. (٩٧٠) **ثلاثةٌ لايقبل الله منهم**

(واته: سێ کەس هەن نوێژەکانیان تۆزێك لە سەر سەریان بەرزنابێتەوە، بەندەیەك کە گوێڕایەڵی گەوەکەی نەکات و زاڵمیش نەبوبێت لە گەڵیدا، وە ئافرەتێك مێردەکەی لەسەر هەق لێی توڕە بێت، وە پێشەوای کۆمەڵێك کە نوێژیان بۆ بکات و ئەوانیش ڕقیان لێی بێت، چونکە ئیمامەت تکاو شەفاعەت کردنە، ئەگەر یەکێکی خۆش نەوێت، چۆن دەیکاتە تکاکاری خۆی؟)

هەروەك چۆن نەهی کراوە کە پێش کەسانێك بکەوێت کە ڕقیان لێی بێت، هەوایش نەهی کراوە کە بۆخۆی پێش بکەوێت ئەگەر کەسانێك هەبن لە خۆی شارەزاتر بن لە شەرعدا و لە خوێندنەوەی قورئاندا، مەگەر ئەوانەی لە پێشترن خۆیان پێش نەکەون، ئەو کاتە بۆی هەیە پێش بکەوێت، ئەگەر یەکێك لەم حاڵەتانە نەبو، ئەوا هەرکاتێك پێشخرا بۆ ئیمامەت، با پێش بکەوێت ئەگەر بزانێت کە دەتوانێت مەرجەکانی ئیمامەت ڕەچاو بخات.

وە لەم کاتەیشدا کەراهەتی هەیە یەکێك پێشبخرێت و ئەویش یەکێکی تر پێشبخات بۆ ئیمامەت، وەك دەگێڕنەوە کە کۆمەڵێك دوای قامەتی نوێژ هەریەکە خۆی لادەدا بچێتە میحرابەوەو ئیمامەتیان بۆ بکات، تا هەمویان چوون بەناخی زەویدا![1].

ئەوەش کە دەیگێڕنەوە لە میانی صەحابەکاندا (خودایان لێ ڕازی بێت) کە یەکتریان پێش خستووە و، کەسیان پێش نەکەوتوون و، بە هەمووویانەوە یەکێکی تریان پێشخسووە، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئیثاریان

---

صلاة: الرجل يؤم قوما وهم له كارهون، والرجل لايأتي الصلاة إلا دِباراً، ورجل إعتبد محرراً. قال الصدر المناوى في فيض القدير: ٣٢٨/٣: ضعفه الشافعي وغيره ، وفي شرح المهذب للنووى: ٢٤٠/٤: وهو ضعيفٌ، وأخرج الطبراني في الكبير ٢٨٢/٢(٢١٧٧) من حديث جنادة (من أمَّ قوما وهم له كارهون، فإن صلاته لاتجاوز تَرقُوَتُهُ).

(١) رواه ابن أبي الدنيا في العقوبات، (٩٠) ومجابو الدعوات(٧٩).

کردووە، واتە هەریەکەیان حەزی کردووە ئەوی تر پێش بخات و، ئەوی بە ئەهل تر زانیوە، یان ترساوە لەسەر خۆی کە دوچاری سەهو کردن و هەڵە ببێت و، دەشزانێت کە ئیمامەت زەمانەتی ئەو کەسانەیە کە بۆیان دەکەن، بەو شێوە بیریان دەکردەوە، کە ئەگەر پێی دانەهاتبن لەوانەیە نوێژەکەیشی لێ تێك بچێت و ئیخلاصەکەیشی لە دەست بدات.

لەبەر ئەوەی کە شەرم لە وانە دەکات کە پێشیان کەوتووە، بە تایبەتی لە نوێژە جەهریەکاندا، کەواتە ئەوانەی کە زیاتر خۆیان لە ئیمامەت دوور دەخستەوە بیانو و بەهانەیکی بەم شێوەیان هەبووە.(١)

**دەووهەم:** ئەگەر کەسێك ئارەزوو سەرپشككرا لە میانی بانگ دان و ئیمامەتدا، دەبێت ئیمامەت هەڵبژێرێت، چونکە هەریەکەیان جۆرە فەزڵ و خێرێکی تایبەتی هەیە، بەڵام ناپەسەندە هەردوکیان پێکەوە کۆبکاتەوە، بەڵکو پێویستە ئیمام کەسێکی جیاواز بێت لە بانگوێژەکە، کەواتە ئەگەر نەدەگونجا هەردوکیان پێکەوە بکات، ئەوا ئیمامەتەکە لە پێشترە، وە هەندێکی تر دەڵێن: بانگ دان لە پێشترە، لەبەر ئەو خێرو چاکە زۆرانەی لە گەورەیی بانگ داندا

---

(١) ئەوە زیاتر شیاوە کە بدرێتە پاڵ صەحابەکان، کە ترسی ضەمانەتی نوێژەکەیان لە دڵدا بووە و، حەزیشیان کردووە فەزیلەتی ئیمامەتەکە بەر یەکێکی تریان بکەوێت. لە قوت القلوب دا هاتووە٢/٢٠٢: بۆیە سەهلی کوری سەعدی ساعیدی ئیمامەتی پێ خۆش نەبو، کە گەنجەکانی پێش دەخست و پێیان دەووت: تۆ صەحابەیت و شیاوتری، بۆ چی ئیمامەت ناکەیت، ئیفەرموو: ئەی برازام: ئیمام ضامنە و منیش حەز ناکەم ئەو زەمانەتەم لەسەر بێت، هەروەها ئەبوطالیبی مەککی دەفەرموێت: ئەو صەحابانە کە یەك یەکیان پێش دەخست ،وەك ئیبن و مەسعود ئەبو زەری پێش دەخست و ئەویش عەممار و ئەویش حوزەیفە (خودایان لێ رازی بێت) کەسیان پێش نەکەوتن و بەندەو مەولایەکی خۆیانیان پێش خست. بنوارە: الإتحاف ٣/١٧٢.

باسمانکرد، وه لەبەر ئەوەش کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((الإمامُ ضامِنٌ والمُؤَذِّنُ مُؤتَمنٌ))**[1]، (پێشەوای نوێژ بەرپرسیارێتی هەڵدەگرێت، وە بانگوێژ ئەمینداره لە دیاری کردنی کاتەکانی نوێژ).

دەڵێن لە ئیمامەتدا مەترسی بەرپرسیارێتی تێدایە( واته سەهوکردنی مەئموومەکەیشی هەڵدەگرێت و خوێندنی سوورەت و تاد....)

**((الإمامُ أمينٌ، فإذا رَكَعَ فاركَعُوا، وإذا سَجَدَ فاسْجُدوا))**[2]،

(واته ئیمام ئەمینداری نوێژخوێنەکانە، ئەگەر ڕکوعی برد ئێوەش ڕکوع بەرن، وە ئەگەر سەجدەی برد ئێوەش سەجدە بەرن)،

(وە لە فەرموودەکەدا هاتووە: **((فإن أتمَّ فلهُ ولهُم، وإن نقَص فعليه ولا عليهم))**[3]، ئەگەر نوێژەکەی بە تەواوی بۆ کردن ئەوا خێرەکەی بۆ خۆی و بۆ

---

(١)قال العراقي أخرجه أبوداود(٥١٧) والترمذي(٢٠٧) من حديث أبي هريرة، وحكي عن ابن المديني كما في العلل المتناهية(٤٣٦/١)(٧٤٣) أنَهُ لم يُثبت. ورواه أحمد في مينده (٢١٧٣٥) من حديث أبي تمامة باسناد حسن اهـ ، قال الزبيدي الإتحاف ١٧٣/٣: وأخرجه كذلك ابن حبان في صحيحه٥٦٠/٤(١٨٧٠) والبيهقي في السنن والكلُ عندهم زيادة: **اللهُمَّ أرشِدِ الأئمَّة واغفر للمُؤذنين**. والمصنف رحمه الله قد فرق الحديث في موضعين. واخرج ابن ماجه(٩٨١) والحاكم في المستدرك(٣٣٧/١)(٧٨٥) من حديث سهل بن سعد رفعهُ: الامام ضامن.. وتقدم نقله عن القوت .

(٢)هكذا أورده صاحب القوت وقال العراقي رواه البخاري(٧٢٢) من حديث ابى هريرة دون قوله: **الامام أمينٌ**. وهو بهذه الزيادة في مسند الحميدى(٤٢٥/٢)(٩٥٨). وهو متفق عليه البخاري(٦٨٩) ومسلم(٤١١)حديث انس دون هذه الزيادة اهـ. قلت كانه يشير إلى حديث: **(إنَّما جُعل الإمام ليؤتم بهِ، فإذا ركع فاركعوا، وإذا سجد فاسجدوا)** الحديث

(٣)ولفظ القوت وفي الحديث: **إذا أتمَّ والباقي سواء**. قال العراقي أخرجهُ أبو داود وابن ماجه(٩٨١) والحاكم في المستدرك(٣٢٨/١)(٧٥٩)وصححه من حديث عقبة بن عامر. والبخاري(٦٩٤) من حديث أبي هريرة: **(يُصلون لكم فإن أصابوا فلكم وإن أخطئوا فلكم**

ئەوانیشە، وە ئەگەر کەموکوڕی تێدا هەبوو، ئەوا بۆسەر خۆی دەگەڕێتەوە نەك بۆ سەر ئەوان. چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(اللَّهُم أرشِدِ الأَئِمَّةَ واغْفِرْ للمُؤَذِّنِينَ)** خودایە ڕێنەمایی ئیمامەکان بکەیت و لە بانگوێژەکانیش خۆش ببیت،(وەك پێشتر باسی کرا)، لێبوردن لە پێشترە و داوای زیاتری لەسەرە، چونکە بۆیە ڕوشدو ڕێنومایی دەخوازرێت، تا لێبوردنی دەسبکەوێت. لە فەرموودەدا هاتووە: **((مَن أَذَّنَ في مَسجدٍ سَبع سنينَ وجَبتْ لهُ الجَنَّة، ومن أَذَّن أَربعينَ عاماً دخلَ الجنةَ بغيرِ حِساب))**[1]،

(واتە: ئەوەی حەوت ساڵ لە مزگەوتێدا بانگ بدات، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە، وە ئەوکەسەی چل ساڵ بانگ بدات، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە

---

**وعليهم)** اهـ. قال الزبيدي: ١٧٣/٣: ورواه ابن ماجه والحاكم من حديث سهل بن سعد: **(الإمام ضامن فان أتمَّ فلهُ ولَهم، وإن سها فعليهِ ولا عليهم)**. وحديث عقبة الذي اشار اليه فقد اخرجة احمد ايضا في مسنده(١٦٨٥٤)ولفظهم جميعا: **(من أم الناس فاصاب الوقت وأتم الصلاة فله ولهم، ومن انتقص من ذلك شيئا فعليه ولا عليهم)**، وأخرج الطبراني في الاوسط،٣٧٠/٧(٧٧٥٥) من حديث ابن عمر : **(مَن أَمَّ قوماً فليتقِ اللهَ، وليعلَم أنَّهُ ضامنٌ مسئول لما ضمنَ، وإن أحسَن كان لهُ من الأَجرِ مثل أجرِ مَن صَلَّى خلفهُ مِن غَيرِ أن ينتَقِصَ مِن أُجورهِم شَيء، وما كانَ مِنْ نَقص فهُو عَليهِ)**.

(١)قال العراقي أخرجه الترمذي(في فضل الأذان(٢٠٦) وابن ماجه (٧٢٧)من حديث ابن عباس بالشطر الأول قال الترمذي حديث غريب اهـ. وقد أورد صاحب القوت الجملتين معا وتبعه المصنف والجملة الأولى إلى عزاها لابن عباس، أخرجها كذلك أبوالشيخ في كتاب الأذان ولفظهم جميعاً: **(مَن أذن سبعَ سنين محتَسِبا كُتبت لهُ براءةٌ منَ النار)**، وزاد الترمذي بعد قولهِ غريبٌ ضعيف، فالحديث مذكور هنا بالمعنى، وأما لفظُ **(وجبتْ لهُ الجنَّةَ)**، فعند ابن ماجه والحاكم في المستدرك(٣٢٢/١(٧٣٦-٧٣٧)من حديث ابن عمر: **مَن أذن اثنتى عشرة سنة وجبت له الجنة**، وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية: ٢٩٥/٦) عن الترمذي وابن ماجه: **(من أَذَّنَ سبع سنين محتسباً، كُتبَت له براءةٌ من النار)**.

بەبێ هیچ لێ پرسرینەوەیەك). هەر لەبەر ئەمەیشە کە دەگێڕنەوە لە صەحابەکانەوە کە ئیمامەتیان بەیەکتر دەسپارد و هەرکەسە لە خۆیی دور دەخستەوە، ڕای درووست ئەوەیە کە ئیمامەت گەورەترە لە بانگ وێژی، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوامی لەسەر ئیمامەت بووە، هەروەها (حەزرەتی) ئەبوبەکر و (حەزرەتی) عومەریش (خوایان لێ ڕازی بێت) وە پێشەواکانی تریش دوای ئەوان بەردەوام بوون لەسەری.

بەڵێ ڕاستە لە ئیمامەتدا مەترسی ضەمان و لێپرسینەوەی لەسەرە، ئەو گەورەییەش لەگەڵ بوونی مەترسییەکەدایە، وەك چۆن پلەی فەرماندەیی و خەلافەت گەورەترە، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((لَيَومٌ مِن سُلطانٍ عادلٍ، أفضَلُ مِن عِبادَةِ سَبعينَ سنَة))**[1]

(واتە ڕۆژێك ی ژیانی سوڵتانێکی دادگەر، کە بە عەدالەت بیباتە سەر، گەورەترە لە بەندایەتی بەردەوامی حەفتا ساڵ). بەڵام لەبەر ئەوەی کە مەترسی تێدا هەیە، بۆیە پێویستە بۆ ئیمامەتکردن کامەیان مەزنترو لێزان و شەرعزان و باشخوێنەری قورئانن دەبێت ئەوەیان پێشبخرێت، بەڕاستی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((أئِمَّتُكم شُفَعاؤُكُم إلى الله، أو قال: وفُدُكم إلى الله، فإن أردتُم أنْ تُزكُّوا صَلاتَكُم فقَدِّمُوا أخْيارَكُم))**.[2] (واتە: ئیمامەکانتان

---

(١)قال العراق اخرجه الطبراني في الكبير(١١/٣٣٧)(١١٩٣٢)من حديث ابن عباس بسند حسن بلفظ ستين اهـ. وهو معنى الخبر المشهور الدائر على الالسنة: **عدلُ ساعةٍ خيرٌ مِن عِبادةِ ستينَ سَنة.**

(٢)ولفظ القوت وروينا في خبر غريب: **أئِمَّتُكم وفُودُكُم إلَى الله تَعالى** والباقي سواء وقال العراقي أخرجه الدارقطني (في سننه(٢/٨٧) والبيهقي في السنن الكبرى(٣/٩٠)(٤٩١٢)، وضعف إسناده من حديث ابن عمر والبغوي وابن قانع في معجم الصحابة(٣/٧٠)(١٠٢٣) والطبراني في

تکاکارتانن، یان وەفدو نێردەی پێوەندین بۆ حزوری خودا،کەواتە ئەگەر دەتانەوێت نوێژەکانتان زیاد بکات و بە پاڵفتەیی و وەرگیراوی بەرزبێتەوە بۆ حزوری خودا، باشترینتان لە پێشەواکانتان پێش بخەن با ئیمامەتتان بۆ بکەن). هەندێك لە زانایانی سەلەف (پێشینە صاڵحەکان) فەرموویانە:

لە دوای پێغەمبەران هیچ کەس لە زانایان گەورەتر نییە، وە لە دوای زاناکانیش هیچ کەس لە ئیمامەکانی نوێژخوێن گەورەتر نییە، چونکە ئەم ئیمامانە وەستاون لە میانی دوودەستەی قودرەتی خودا و خەڵکەکەدا، ئەمەیان بە هۆی پێغەمبەرایەتییەوە، وە ئەوەیشیان بە هۆی زانستەوە، ئەمەیشیان بە هۆی کۆڵەکەی دینەوەیە کە نوێژکردنە[1]،

وە هەر بەم بەڵگە بوو کە صەحابەکان (حەزرەتی) ئەبوبەکری صددیقیان پێشخست بۆ خەلافەت، ئەوەبوو دەیانووت: سەرنجماندا کە نوێژ کۆڵەکەی دینە، ئێمەش بۆ دینەکەمان کەسێکمان هەڵبژارد کە پێغەمبەرﷺ بۆ ئیمامەتی ئێمە هەڵی بژادووە[2]. **((وما قدَّمُوا بلالاً، إحتجاجاً بأنَّه رضِيَهُ للأذان))**،

---

معاجمهم والحاكم في المستدرك ٢٤٦/٣(٤٩٨١)، من حديث مرثد بن أبي مرثد نحوهُ وهو منقطعٌ وفيه يحيى الأسلمي وهو ضعيف ،أنظر المغني في الضعفاء للذهبي ٦٤٦/٢(٧٠٧٢).

(١) قوت القلوب ٢٠٨/٢.

(٢) كما روى ذلك ابن سعد في طبقاته، (١٦٧/٣)، وابن عبدالبر في التمهيد، ١٢٩/٢٢، عن علي (رضي الله عنه) وفيه يقول: **نظرتُ في أمري، فإذا الصلاة عُظمُ الإسلام، وقِوامُ الدين، فرضِينا لدينِما، )** والأثر المرفوع هو: رواه البخاري(٦٦٤)، ومسلم (٤١٨، **مُروا أبابكر فليُصَلِ بالنَّاس). وبهذه الحجة احتج عمر رضى الله عنه على الأنصار في بيعة أبي بكر رضي الله عنه فقال: أيُكم يطيبُ نفسهُ أن يتقدم من قدمهُ رسول الله ﷺ إمامة، وبهذا إحتج أبو عبيدة رضى الله عنة على أبى بكر كما أخذ بيده وبيد عمر وقال بايعوا أحد هذين، فقد رضيت لكم أحدهم فقال أبو عبيدة: ما كنت لأصلى أمام من صلى رسول الله ﷺ** خلفه، وقال العراقي تقديم الصحابة أبا بكر وقولهم إخترنا لديننا الخ أخرجه ابن

(واته : ئەوەش کە (حەزرەتی) بیلالیان پێشخست، لەبەر ئەوەبو کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە بانگدا پێشی خستبوو[1]،

ئەوەیش دەیگێڕنەوە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خودا کارێکم پێ نیشان بدە کە بە هۆیەوە بچمە ناو بەهەشتەوە، فەرمووی: (كُنْ مُؤَذِّناً) بانگوێژی بکە، فەرمووی: ناتوانم، فەرمووی: (كُن إماماً) پێشنوێژی بکە بۆیان، فەرمووی ناتوانم، فەرمووی: (صَلِّ بِإِذاءِ الإمامِ)[2]، کەواتە لە تەنیشتی ئیمامەوە نوێژ بکە، لەوانەیە وای گومان بردبێت کە بە ئیمامەتەکەی ڕازی نابن، چونکە بانگدانەکە بۆ خۆیەتی، بەڵام پێشنوێژییەکەی بۆ ئەوانیترە، کە ئەوان پێشی بخەن، لە پاشان وای گومان بردووە کە لە وانەیە بتوانێت ئەنجامی بدات.

---

شاهين في شرح مذاهب أهل السنة(ص/١٢٢/٩٢) من حديث علي قال: **لقد أمرَ رسول الله ﷺ أبا بكر أن يُصلى بالناس واني لشاهد ما أنا بغائب ولا بي مرض فرضينا لدنيانا مارضي به النبى ﷺ لدينا**، والمرفوع منه متفق عليه من حديث عائشة البخاري كتاب الأذان(٦٦٤)ومسلم كتاب الصلاة(٤١٨).

(١)قال العراقي أما المرفوع منه فرواه أبو داود والترمذي وصححه وابن ماجه وابن خزيمة وابن حبان من حديث عبد الله بن زيد فى بدء الاذان وفيه: قُم مَعَ بلالٍ فالق عَليه ما رأيت، فليُؤذن به. الحديث. واما تقديمهم له بعد موته ﷺ فروى الطبراني **(ان بلالاً جاء الى أبي بكر فقال يا خليفة رسول الله أردت أن أربط نفسي في سبيل الله حتى أموت، فقال أبو بكر أنشدك بالله يا بلال وحُرمتي وحَقِي ! لقَد كَبُرسِنِي وضعفت قوتي، واقترب أجلي، فأقام بلال معه، فلما توفى أبو بكر جاء عمر فقال له مثل ما قال أبو بكر، فأبى عليه، فقال عمر. فمن يا بلال؟ فقال إلى سَعدٍ فإنَّه قَد أذن بقُباء على عَهد رسول الله ﷺ فجعلَ عُمر الأذان إلى سعد وعقَبِهِ. وفى إسناده جهالة)**. الإتحاف ١٧٥/٣.

(٢)رواه البخاري في التأريخ الكبير (٤١٨)(٥٩/٣٧/١) والعقيلي في الضعفاء(١٥٧٦/٢١/٤)، والطبراني (في الأوسط—٣٦٨٣)(٧٧٣٧/٣٦٣/٧) من حديث إبن عباس بسند ضعيف.

**سێیەم:** دەبێت ئیمام چاودێری کاتەکانی نوێژ بکات و لە سەرەتای کاتەکانەوە نوێژیان بۆ بکات، بۆ ئەوەی بەر ڕەزامەندی خودا بکەوێت، چونکە گەورەیی ئەووەڵی وەختەکەی لە سەر ئاخرەکەی وەك فەزڵی ئاخیرەت وایە بەسەر دونیادا، بەم شێوەیە لە پێغەمبەری خودایان گێڕاوەتەوە ﷺ[1]،

وە لە فەرموودەدا هاتووە: ((**إنَّ العبْدَ ليُصلي الصَّلاة ولَم تَفُتْهُ، ولما فاتَه مِن أوَّلِ وقْتِها خيرٌ لهُ منَ الدُّنيا وَما فيها**))[2]،

( بەڕاستی لەسەرەتای وەختەکەیەوە کە نوێژەکەی دەکات و ئەووەڵی وەختی بە نسیب دەبێت، ئەوە نوێژێکی پڕ لە خێرە و، کاتێك کە سەرەتاکەی لە کیس نەچوبێت، ئەوە باشترە بۆی لە هەموو دونیا و ئەوەش وا لە دونیادایە).

وە نابێت نوێژەکەی دوا بخات بۆ چاوەنواڕی کردن و زیادبوونی مەئموومەکان،

---

(١أخرجه أبو منصور الديلمي في مسند الفردوس من حديث ابن عمر بسند ضعيف(لم أجده عند الديلميمن حديثابن عمر، وإنما هو فيه٣/١٣١/٤٣٥٣، من حديث أنس، و ٤/٤٢٨/ ٧٢٤٤، من حديث معاذ ) قال الزبيدي: وفي الباب عن أبن عمر وابن عباس وعلي وأنس وأبي محذورة وأبى هريرة. فحديث ابن عمر رواه الترمذي(١٧٢) والدارقطني في سننه(٢٤٩/١) وفيه يعقوب بن الوليد المدني كذاب. وحديث ابن عباس رواه البيهقي في السنن الكبرى(٤٣٣/١(١٨٨٤)، وفيه نافع أبوهرمز متروك، وحديث على رواه البيهقي في السنن الكبرى(٤٣٦/١(١٨٩٣) عن اهل البيت وقال أظن سنده أصح ما في هذا الباب، قال ابن حجر وهو مع ذلك معلول. ولهذا قال الحاكم لا أحفظ الحديث من وجه يصح وحديث أنس رواه ابن عدى في الكامل/٢(٧٧) والبيهقي وقد تفردبه بقية عن مجهول عن مثله وحديث أبى محذورة رواه الدار قطني قي سننه(٢٤٩/١) وفيه أبراهيم بن زكريا وهو منهم وجديث أبى هريرة ذكره البيهقي وقال هو معلول. الإتحاف ١٧٦/٣، وإحياء علوم الدين م/١تحقيق علي محمد مصطفى وسعيد المحاسبي دار الفيحاء ص/٥١٥-٥١٦.

(٢)قال العراقي أخرجهُ الدارقطني في السنن٢٤٨/١. من حديث أبى هريرة بنحوه بإسناد ضعيف اهـ. قلتُ: لفظُ الدَّارَقُطني: **خيرٌ لهُ مِنْ أهْلهِ ومالهِ**.

بەڵکو لەسەریانە خێرایی بکەن تا سەرەتای کات و گەورەییەکەیان لە کیس نەچێت، ئەوە خێری زیاترە لە کۆبوونەوەیەکی زۆر، یان لە درێژکردنەوەی سوورەتەکان، وەك وتوویانە: ئەوانەی پێشوو حاڵیان وابووە: ئەگەر دووکەس ئامادەبوونایە چاوەنواڕی سێیەمیان نەدەکرد، وە ئەگەر لە نوێژی مردوودا چوار کەس ئامادە بوونایە چاوەنواڕی پێنجەمیان نەدەکرد[1]،

وە دواکەوتنی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی (لە غەزای تەبوك)دا، بۆ تارەتگرتن بوو، لەبەر ئەوەی گەورەیی ئەووەڵی وەختیان لە دەست نەچێت (حەزرەتی) عەبدورەحمانی کوڕی عەوفیان پێش خست و پێغەمبەریش ﷺ ڕکاتێ لە گەڵیاندا نوێژی کردو، ڕکاتەکەی تر هەستایەوە و ئەنجامی دا، ترساین لەوەی کارێکی نابەجێمان کردبێت، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ نارەزایی دەرنەبڕی لێیان و فەرمووی: ((قَد أَحسَنتُم . هكَذا فافعَلوا))[2]،((وقد تأخر ﷺ **في صَلاةِ الظُّهر، فقَدَّموا أبا بكر (رضي الله عنه) حتى جاء ﷺ وهُم في الصَّلاة، فقامَ إلى جانبِهِ))**[3]. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆدواکەوتبوو (حەزرەتی)ئەبوبەکریان پێشخست، تاهاتەوەئەوان لە نوێژدابوون، ئەویش لە پاڵیدا نوێژەکەی دابەست. وە پێویستیش نییە لەسەر ئیمام کە چاوەنواڕی بانگوێژ بکات، بەڵام پێویستە لەسەر بانگوێژ کە چاوەنواڕی ئیمامەکەی بکات،

---

(١) بۆ جەماعەتەکە بۆ ئەوەیە کە گەورریی سەرەتای وەختەکەی لە دەس نەچێت، وە بۆ نوێژی مردوویش پەلە کردنەکە بۆ ئەوەیە کە سوننەتە خێرایی لە ئەسپەردەکردنی جەنازە بکرێت.

(٢)وقال العراقي متفق عليه البخاري(كتاب الوضوء/١٨٢)ومسلم (٢٧٤)من حديث المغيرة اهـ قلت صلاته ﷺ خلف عبد الرحمن بن عوف في غزوة تبوك من افراد مسلم فيها زيادات حسنةوكان ذلك في غزوة تبوك هو معنى السفر.

(٣)قال العراقي متفق عليه البخاري كتاب الوضوء.(٦٨٤) ومسلم(٤٢١)من حديث سهل ابن سعد اهـ قلت: **وهي صلاة ظُهر يومِ الإثنين.**

ئەگەر پێشنوێژ ئامادە بوو، با چاوەنوارِی کەسی تر نەکات.

**چوارەم:** دەبێ زۆر بە ئیخلاصەوە لە بەر ڕەزای خودا پێشنوێژی بکات، وە ئەمانەتی خودای بە جێگەیاندبێت لە تەهارەت و هەموو مەرجەکانی نوێژدا.

ئیخلاصیش ئەوەیە: کە هیچ کرێیەك لەسەر پێش نوێژی وەرنەگرێت، چونکە (حەزرەتی) پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی دا بە عوسمانی کوڕی ئەبی العاصی سەقەفی و فەرمووی: ((**واتَّخِذَ مُؤَذِّناً لا يَأخذُ عَلى الأَذانِ أَجراً**))[1]،

(تۆ ببە بە ئیمامی قەومەکەت)و بانگوێژێکیان بۆ پەیدا بکە، کە کرێ لەسەر بانگەکەی وەنەگرێت. بانگدان خۆش کردنی ڕێگایە بۆ نوێژکردن، لە ئیمامەت لە پێشترە کە کرێی لەسەر وەرنەگیرێت، ئەگەر ڕزق و ڕۆزییەکی لە ماڵی وەقفکراوی مزگەوت وەرگرت، کە بۆ ئیمامەتی ئەو مزگەوتە وەقفکرابوو، یان لە سوڵتانەوە یان لە یەکێکەوە جیرەی بۆ بڕابوویەوە ئەوە حوکم نادرێت بە حەرامی ئەو ماڵەیە، بەڵام کارێکی ناپەسەندە، وە ئەو کرێی وەری دەگرێت با لە جیاتی هاتنی بۆ مزگەوت و چاودێری کردنی کاروبار و بەرژەوەندییەکانی مزگەوت بێت، نەك لەسەر ئەصڵی نوێژەکە[1]،

---

(١)قال العراقي أخرجه أصحاب السنن (أبوداوود(٥٣١)،والترمذي(كتاب الصلاة٢٠٩)، والنسائي(٦٧٢) والحاكم في المستدرك(٣١٤/١)، وصححه من حديث عثمان بن ابى العاص قال الزبيدي:١٧٧/٣: وأخرجه البيهقي في السنن٤٢٩/١(١٨٦٥) عن عثمان بن أبي العاص قلت يارسول الله: إجعلني إمامَ قومي، قال: أنت امامُهُم فاقتَدِ بأضعَفهم واتَّخِذ مُؤذناً لا يأخُذُ عَلَى أذانهِ أجراً .زانایانی شوێنکەوتووی مەزهەبی شافیعی (خودایان لێ ڕازی بێت) فەتوایان داوە کە وەك فێرکردنی قورئان درووستە کرێی لەسەر وەربگرێت. بۆ بانگێش درووستە، وەك ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: لە چەرخی (حەزرەتی) عوسماندا جیرەیان بۆ بڕاوەتەوە، بۆ یە ئیمامی غەزالیش ئەو ڕایەی هەڵبژاردووە و وادەفەرموێت کە خۆی بپارێزێت باشترە، ئەینا درووستە.بۆ درێژی ئەم بابەتە بنواڕە: الإتحاف ١٧٧/٣.

**پارێزگاری له ئه‌مانه‌تیش ئه‌وه‌یه که:** ده‌روونی خۆی بپارێزێت له هه‌موو له‌رێلادان و گوناهێکی گه‌وره‌و سووربوون له‌سه‌ر گوناهی بچوك، که‌سێك هه‌ڵبژێررابێت بۆ ئیمامه‌ت، ده‌بێت هه‌وڵی خۆی بخاته کار و خۆی له‌و گوناهانه بپارێزێت، چونکه ئیمام وه‌ك که‌سێك وایه نێرده‌ی کۆمه‌ڵێك بێت یان تکا که‌ریان بێت، بۆیه ده‌بێت له له باشترین و هه‌ڵبژێرراوه‌کانیان بێت، بۆ ئه‌وه تکاو قسه‌کانی بخوات. هه‌روه‌ها ئیمام ده‌بێت ڕواڵه‌تی خۆیشی له هه‌موو پیسی و بێ ده‌ستنوێژییه‌ك بپارێزێت، چونه خۆی نه‌بێت که‌س ئاگادار نابێت به‌سه‌ر ئه‌و حاڵه‌تانه‌یدا، ئه‌گه‌ر له کاتی نوێژیشدا بیری که‌وته‌وه که بێ ده‌ستنوێژی به‌سه‌ردا هاتووه، یان بایه‌کی لێ به‌ربوویه‌وه، نابێت شه‌رم بکات ، به‌ڵکو ده‌بێت یه‌کسه‌ر ده‌ستی یه‌کێك بگرێت که لێیه‌وه‌نزیك بێت و بیخاته شوێنه‌که‌ی خۆی، چونکه پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ له ناو نوێژدا بیری که‌وته‌وه که (له‌شی قورسه)یه‌کسه‌ر که‌سێکی خسته‌شوێنی خۆی و ڕۆشت به‌ده‌م خۆشۆردنه‌وه، له‌پاشان گه‌ڕایه‌وه‌و چووه‌وه ناو نوێژه‌که‌وه [٢]، (حه‌زره‌تی) سوفیانی سه‌وری فه‌رموویه‌تی: نوێژ له پشتی هه‌موو که‌سێکی چاکو خراپه‌وه بکه، مه‌گه‌ر که‌سێك له‌سه‌ر ئاره‌ق خواردن مودمین بوبێت و وازی بۆ لێنه‌هێنرێت،یان خراپی و له ڕێلادانه‌که‌ی به ئاشکرا بکات، یان بێگوێی باوك و دایکی بکات و مافی

---

(١) نیشانه‌ی ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌یه که ئه‌گه‌ر شتێکیان نه‌دا پێی نابێت ڕوی گرژ بکات و ئیتر نوێژیان بۆ نه‌کات، یان بۆڵه‌یان بکات به‌سه‌ردا.

(٢)هكذا أخرجه أبو داود(٣٣) من حديث أبي بكرة باسناد صحيح وليس فيه ذكر الاستخلاف وانما قال: **ثم أومأَ إلَيهم أنْ مَكانَكُم**، نعم ورد الاستخلاف من فِعل عُمر وعلي، وعند البخاري استخلاف عمر في قصة طعنه ثم قال صاحب القوت_٢/٢٠٨( **فان كان الحادثة في الصلاة فعل ذلك، وإن كان ذكر أنه دخل في الصلاة على غير طهارة، خرج ولم يستخلف وابتدأ القوم الصلاة)**. الإتحاف ١٧٩/٣.

خۆيانيان بۆ جێبەجێ نەكات، يان بيدعەسازێك بێت و خاوەنيەتيشى بكات، يان بەندەيەك بێت لە گوێڕايەڵى گەورەكەى دەرچووبێت، وە ناهەقيش بێت[1].

**پێنجەم:** نابێت نوێژەكەى دابەستێت و الله أكبر بكات، تا هەموو ڕيزەكان ڕێك و پڕ دەبنەوە، با بەلاى ڕاست و چەپدا لابكاتەوە، ئەگەر كەموكوڕييەكى بينى فرمان بدات ڕێكى بكەن[2]، دەڵێن: ئەوانە شانيان دەدايە پاڵ شانى يەكتريەوە و لە پاڵ شانى يەكتردا دايانده‌نا، قولەقاپى پێيشيان بەرامبەر يەك دادەنا،[3]، (بەو شێوەى كە سەر لە يەكدى تێك نەدەن).

وەنابێت نوێژ دابەستێت، تا بانگدەر لە قامەت لێ دەبێتەوە، وە دەبێت بانگوێژەكە بە قەدەر ئەوەى كە خەڵكەكە ئامادەدەبن بۆ نوێژ، قامەتەكە دوا بخات، لە هەواڵ و فەرمووده‌داهاتووە:

**(( ليتمهَّلَ المُؤذنُ بينَ الأذان والإقامة بقدرِ ما يفرَغ الآكلُ مِن طَعامِه**

---

(١)وأخرج الدار قطني في سننه(٥٧/٢)والدرقطني في السنن الكبرى(١٩/٤)(٦٦٢٣)من حديث أبي هريرة : **صلُّوا خلفَ كلِّ برٍّ وفاجرٍ، وعلى كلِّ برٍ وفاجر.** وابن عدى في الكامل٤٣/٣)، والطبراني في المعجم الكبير (٤٤٧/١٢)(١٣٦٢٢)وابو نعيم في الحلي(١٠٣٢٠)من حديث ابن عمر: **صلُّوا على مَن قال لا اله الا الله. وصلُّوا خلفَ من قال لا اله الا الله وطرقه كلها ضعيفة.**

(٢)وقد أخرج أحمد والشيخان وأبو داود وابن ماجه من حديث أنس واللفظ للبخاري: **(سووا صفوفَكُم فإن تَسوية الصَّف مِنْ إقامةِ الصَّلاة.)** واتە: ڕيزەكانتان ڕێك بخەن، چونكە ڕێكخستنى ڕيزەكانتان بەشێكە لە هەستان و خۆئامادەكردن بۆ نوێژەكە. والجزء الثاني رواه اللاكلاني في إعتقاد أهل السنة ١٧١/١).

(٣) ئەم پێ دانان و شان ڕێكخستنە بە شێوەيەك كە ئەزێتى دراوسێكەى نەداو سەرقاڵى نەكات بە خۆيەوە، وەك حافيظى زوبەيدى فەرموويەتى: وهذا ما لم يؤذ جاره وروى مسلم من حديث جابر بن سمرة: خرج علينا رسول الله ﷺ فقال: **(ألا تصفون كما تصف الملائكة عند ربها. قلنا وكيف تصف عند ربها؟ قال: يتمون الصفوف الاول، ويتراصَّون في الصف. والمطلوبُ من تَسويتها مَحبة الله لعباده)**، الإتحاف ١٨٠/٣.

والمُعتَصر مِن اعتِصارِهِ)) [1]،

(واته: با بانگویژ پەلەنەکات ، لە میانی بانگ و قامەتدا، بە ئەندازەی کەسێك دەستی بە خواردن کردبێت و لێ بێتەوە، یان کەسێك کە سەرئاو زۆری بۆ هێنا بێت تا خۆی رِزگار دەکات و دێتەوە ئەوەندە بە دیارەوە بووەستێت)، چونکە نەهی کراوە لە نوێژێك هەردوو کاری دەست بە ئاوگەیاندن زۆری بۆ هێنابێت [2]، وە فەرمان دراوە کە نانخوارنی ئێوارە پێش بخرێت لەسەر نوێژی خەوتنان، کە ئەگەر کەوتنە یەکەوە، بۆ ئەوەی دڵی خاڵی بێت لە هەموو حەز و ویستێك و، تەنها روی بەلای نوێژەکەیەوە بێت [3].

شەشەم: دەبێت لە دابەستنی تەکبیرەی ئیحرامدا دەنگی بەرزکاتەوە، وەباقی تەکبیرەکانی تر، بەڵام مەئمووم بەو ئەندازە دەنگی بەرز بێت کە خۆی گوێی لە دەنگیەوە بێت، وە ئیمام نییەتی ئیمامەت بهێنێت، بۆ ئەوەی خێری پێشنوێژی بۆ بنوسرێت، ئەگەر نەیهێنا نوێژی خۆیشی و ئەوانەش ئیقتیدایان پێوە کردووە درووستە، وە خێری جەماعەتیشیان دەگات، بەڵام ئەو خێری ئیمامەتی ناگات، وە مەئمووم با دوای تەکبیرەی ئیمام نوێژەکەی دابەستێت.

---

(١)هكذا اورده صاحب القوت وقال العراق اخرجه الترمذي(١٩٥) والحاكم من حديث جابر يا بلال: **(إجعل بين اذانك واقامتك قدر ما يفرغ الآكلُ من أكله والشارب من شربه والمعتصر إذا دخل لقضاء حاجته)**. قال الترمذي اسناده مجهول، وقال الحاكم ليس في اسناده مطعونٌ فيه، غير عمرو بن فاند قال العراقي: بل فيه عبد المنعم الرياحي منكر الحديث، قاله البخاري وغيره اهالإتحاف ٢/١٨٠.

(٢)اخرج مسلم(٥٦٠) من حديث عائشة بلفظ: لا صلاة بحضرة طعام، ولا وهو يدافعه الأخبثان كذلك رواه أبو داود.

(٣)لحديث ابن عمر وعائشة: **(إذا حضر العشاء وأقيمت الصلاة فابدؤا بالعشاء)** ، متفق عليه، رواه البخاري(٥٤٦٥)، ومسلم (٥٥٧).

## وەزیفەو ئەرکەکانی خوێندن، کە سێ وەزیفەی هەیە:

**یەکەمیان:** دەبێت ئیمام بە دەنگی نزم وەك مەئموومەکانی دۆعای (ئیستیفتاح) و أعوذ بالله من الشیطان الرجیم بکات، وە بەدەنگی بەرز سوورەی فاتیحە و سوورەتەکەی دوای ئەو بخوێنێت، لە هەموو نوێژی بەیانیان و لە دوورکاتی نوێژی خەوتنان و ئێواراندا، هەروەها ئەو کەسەش کە بە تەنها نوێژ دەکات، بەو شێوە بکات. وە بە دەنگی بەرزیش لە نوێژە جەهرییەکاندا ئامین بکات ، هەروەها مەئمومیش، وە مەئمووم با ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی ئیمامدا بێت، نەك دوای بکەوێت[1] ،وە بەدەنگی بەرز **بسمِ اللهِ الرَّحمَن الرَّحیم** دەکات[2]، وە فەرموودەکان لەسەری پێچەوانی یەك هاتوون، وە ئیمامی شافیعی ئەو ڕایەی هەڵبژاردووە کە بە دەنگی بەرز بخوێنرێتەوە.

---

(١)اخرج أبو داود والترمزي عن سفیان عن سلمة بن کهیل عن حجر بن عنبس عن وائل بن حجر واللفظ لابي داود قال: **کان رسول الله ﷺ إذا قرأ ولا الضَّالِّین، قال: آمین. ورفعَ بها صوته ولفظ الترمذي ومدَّ بها صوته**، وقال حدیث حسن، وأخرجه الدارقطني في سننه(١/٣٠٣)، والحاکم في المستدرك(١/٣٢٦)(٧٥٠)، وصححه من حدیث ابن عباس.

(٢)بزانە کە لە خوێندنەوەی بیسمیللادا سێ قسەی لەسەرە: یەکەمیان دەڵێن واجبە، وەك فاتیحە، چونکە ئایەتێکە لە فاتیحەئەمەش مەزهەبی ئیمامی شافیعی و ڕیوایەتێکی مەزهەبی ئیمام ئەحمەدو هەندێك لە ئەهلی حەدیس، ڕای دووهەم دەڵێت: بە نهێنی و بە ئاشکرا مەکروهە بیخوێنێتەوە، کە مەشهوری مەزهەبی ئیمامی مالیکە، ڕای سوێیەم دەڵێت: دروستە بخوێنرێتەوە، بەڵکو سوننەتیشە، کە مەزهەبی ئیمام ئەبوحەنیفەو ڕای مەشهوری ئیمامی حەنبەلییە و زۆربەی ئەهلی حەدیس، بۆ خوێندنەوەکەیشی بە دەنگی بەرز سێ ڕا هەیە: شافیعی و هاوڕاکانی دەفەرموون سوننەتە، ئەبوحەنیفەو جمهوری ئەهلی حەدیس ئەفەرموون: سوننەت نییە بە دەنگی بەرز بیخوێنێتەوە، وە ڕایەکی تریش هەیە کە دەفەرموون: ئارەزوی خۆیەتی هەردوکیان

**دووهەم:** دەبێت ئیمام بۆ کاتی وەستانی بە پێوە سێ (سەکتەی) هەبێت، هەرجارەی ماوەیەك دەوەستێت، وەك سەمورەی کوڕی جوندوب و عیمرانی کوڕی حەصین دەیگێڕنەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ [1]

**بێدەنگی یەکەم:** لە دوای تەکبیرەی ئیحرام، ئەوەش بێدەنگییە درێژەکەیە، بە ئەندازەی ئەوەندەی کە هەتا ئەم دۆعای (کردنەوەی نوێژ) دەخوێنێت، مەئموم بتوانێت فاتیحەیەك بخوێنێت و لە پاشان بتوانێت گوێ لە خوێندنەکەی ئیمام بگرێت. ئەگەر ئیمام ئەو ئەندازە بێدەنگ نەبێت ئەوا ناتوانن گوێ لە قیرائەتەکە بگرن وئەو کەموکوڕییەی ئەوان دەکەوێتە سەر

---

دروستە، هەندێك لە زانایانیش دەفەرموون، بۆ ئەوەی بەهانەی خیلاف درووست نەبێت(سد الذرائع) ئەوا بە دەنگی بەرز بێت باشترە، وە بەڵگەکانیشیان بە درێژی لە کتێبە فیقهییەکاندا باسکراوەو. ئیمەی شافیعی مەزهەب لە بەر ئەوەی لای سەرمەزهەبەکەمان سەلماوە کە ئایەتێکە لە فاتیحەدا دەبێت بیخوێنین و، ئەگەر بە یەقین بشزانین کەسێك نایخوێنێت درووست نییە ئیقتیدای پێ بکەین، بۆیە ڕای هەندێك لە زانایان ئەوە بوو کە لە هەموو حاڵەتێکدا بخوێنرێت و، دەنگیشی بۆ جەهرییەکان بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەوەی یەکڕیزی موسوڵمانان تێك نەچێت و، هەمیشە بەڵگەی ئیسباتیش لە پێشترە لە بەڵگەی نەفی کردن. والله أعلم بۆ درێژەی ئەم بابەتە بنواڕە: الإتحاف ٣/١٨٣---١٩٥.

(١)قال العراقي: و روى الدار قطني من حديث ابي هريرة و ضعفه: **(من صلى صلاة مكتوبة مع الامام فليقرأ بفاتحة الكتاب في سكتاته)** ا هـ قلت و اخرجه الحاكم كذلك و زاد و **من انتهى الى ام القران فقد اجزاه** * (تنبيه) * اخر المحدثون لا يثبتون للحسن سماعا من سمرة الا في هذا الحديث و حديث العقيقة ذكره المنذري في مختصر السنن، ورواه الإمام أحمد في مسنده(١٩٥٧٧)وأبو داوود(٧٧٩) والترمذي( ٢٥١) وابن ماجه(كتاب إقامة الصلاة في باب سكتتي الإمام(٨٤٥)، وابن حبان في صحيحه( ١١٢/٥(١٨٠٧)، وتحدث عن تلك السكتات الإمام الزبيدي مفصلا فليراجع:٣: الإتحاف٣/١٩٦-١٩٧.

ئیمام. بەڵام لەو کاتی بێدەنگییەدائەگەر فاتیحەیان نەخوێنند ئەوا گوناهەکە لەسەر خۆیانە کە نەیانتوانیوە گوێ بۆ ئیمام بگرن، نەك لەسەر ئیمام بێت.

وەبێ **دەنگی دووهەم:** ئەگەر ئیمام لە خوێندنی فاتیحە لێبوویەوە،سەکتەیەك دەکات، بۆ ئەوەی ئەوکەسەی فاتیحەی تەواو نەکردووە لەو بێ دەنگییە دا تەواوی بکات، ئەمەش بە ئەندازەی نیوەی سەکتەی یەکەم دەبێت.

**بێ دەنگی سێیەم:** ئەگەر لە سوورەتێك لێ بوویەوە کە دوای فاتیحە دەیخوێنێت، پێش ئەوەی ڕکوع بەرێت، با سەکتەیەك بکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە خوێندنی بە پێوە جیا بێتەوە لە دابەزین بەرەو ڕکوع، چونکە نەهی کراوە لەوەی بە ڕێگەوە سوورەتەکە تەواو بکات و ڕکوع ببات.

وە مەئموومیش دوای ئیمام تەنها سورەتی فاتیحە دەخوێنێت، ئەگەر ئیمام لە سەرەتاوە سەکتەو وەستانی نەبوو، ئەوا با لەگەڵ ئیمامدا فاتیحەکە بخوێنێت، وە ئەوەی کەمتەرخەمی کردووە ئیمامەکەیە، بەڵام ئەگەر لەبەر دووری مەئمووم گوێی بە دەنگی ئیمامەوە نەبوو، یان لە نوێژە بێدەنگەکاندا بوو، ئەوە قەیناکە هەر لە سەرەتاوە ئەویش سوورەتی فاتیحە بخوێنێت.

**سێیەم:** دەبێت لە بەیانیاندا ئەو ئایەتانەی کە دەخوێنرێنەوەو دوبارە دەکرێنەوە کە لە صەد ئایەت کەمتر نەبێت بیانخوێنێت، چونکە بەیانیان بۆ ئەوەیە کە درێژە بە خوێندن بدات، کە سوننەتە کاتە تاریکەکان تێکەڵ بە سەرەتای ڕۆشنایی بەرەبەیان بکات، وە زیان بە نوێژەکەی ناگەیێنێت کە بچێتە کاتی سەرهەڵدانی گزنگی بەرەبەیانەوەو، بە دڵنیاییەوە نوێژی بەیانی بووبێت، ئەگەر سەرەتاکەی لە کاتە تاریکەکانەوە دەستی پێ کردبێت، وە ئاساییە ئەگەر ڕکاتی دووهەم کۆتایی سوورەتەکان بخوێنێت، نزیکەی سی یان بیست ئایەت تا خەتمی سوورەتەکە دەکات، چونکە کەمتر نوێژ خوێن ڕێی دەکەوێتە خوێندنەوەی ئەو سورەتانە و بەر گوێی دەکەوێت، کەواتە بە خوێندنەوەیان

زیاتر ئامۆژگاری بەهێز وەردەگرێت، وە باشتر لە ناوەرۆکی ئایەتەکان تێ دەگات و بیر دەکاتەوە، وە ئەوەی هەندێك زانا پێیان پەسەند نەبووە ئەوەیە، کە لە سەرەتای سوورەتێك دەست پێ بکات و بیپچڕێنێت و ڕکوع ببات،

وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە سوورەتی یونس ی خوێند، کە گەیشتە باسی (حەزرەتی) موسا و(سەلامی خودای لێ بێت) باسی فیرعەون، (کۆکەیەکی کرد) و خوێندنەکەی پچڕاند و ڕکوعی برد[1]،

وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئایەتێکی سوورەی بەقەرەی خوێندەوە لە نوێژی بەیانی دا، کە دەفەرموێت: ﴿قولوا آمَنَّا باللهِ﴾تاکۆتایی ئایەتەکە، وە لەڕکاتی دووهەمدا﴿رَبَّنا ءامَنَّا بِما أَنزَلْتَ﴾....تاد(٢)، وە پێغەمبەریش ﷺ بیستی کە بیلال (خودای لێ ڕازی بێت) لێرەو لەوێ قورئانی دەخوێند لە ناو نوێژەکاندا، پرسیاری لێ کرد بۆچی وا دەخوێنیت؟ فەرمووی: ئایەتە پاکەکان تێکەڵ بە پاکە بۆنخۆشەکان دەکەم، فەرمووی: (أَحْسَنْتَ)چاکت کردا[3].

(١)قال العراق رواه مسلم(٤٥٥) عن عبد الله بن السائب و قال: سورة المؤمنين و قال موسى و هرون و علقه البخاري ا هـ. قلت: لفظ البخاري و يذكر عن عبد الله بن السائب قرأ النبي صلى الله و سلم المؤمنون في الصبح (بمكة)حتى إذا جاء ذكر موسى و هرون، او ذكر عيسى أخذته سعلة فركع، ووصله مسلم من طريق ابن جريج، و عند ابن ماجه: فلما بلغ ذكر عيسى و امه اخذته شهقة او شرقة،وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية ٦//٢٩٦. المعروف سورة المؤمنون، وليس فيها ذكر فرعون، وإنما هو موسى وهارون. الإتحاف ١٩٩/٣. و قوت القلوب: ٢٠٩/٢.

(٢) رواه مسلم (٧٢٧)، واتە لە هەردوو سوورەتی بەقەرەو ئالی عیمرانی خوێندو، ئاساییش بوو.ورواه أبوداوود(١٢٦٠) من حديث أبى هريرة، قل آمنا بالله وما أنزل إلينا، آل عمران ٨٤، وفي الركعة الآخرة (ربنا آمنا بما أنزلت، آل عمران ٥٣)أو إنا أرسلناك بالحق، آل/١١٩.

(٣) رواه أبو داوود(١٣٣٠)، بنحوه.

وەلە نیوەڕواندا سوننەتە سوورەتە درێژەکانی نێواندار بخوێنێت، تا سی ئایەت، وە لە نوێژی عەسردا با نیوەی ئەمە بخوێنێت، وە لە مەغریبدا کورتەکانی نێواندار بخوێنێت، وە دوانوێژێك کە پێغەمبەر ﷺ کردی نوێژی ئێوارەبوو(مەغریب)، سورەی (المرسلات)ی تیا خوێند، لە دوای ئەوە نوێژی تری نەخوێند تا وەفاتی کرد،[1].

وە بە شێوەیەکی کورتی باسی بکەین، سوککردن و درێژنەکردنەوە باشترە، بە تایبەتی ئەگەر خەڵکە مەئموومەکە زۆر بوون، لەبارەی ئەم ڕوخصەتەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**إذا صَلَّى أحدُكُم بالناسِ فليُخَفِّفْ، فان فيهم الضَّعيفُ و الكَبيرُ وذا الحَاجَة، و إذا صلَّى لنَفسِهِ فَليُطوِّلْ ما شَاء**))[2]،

(ئەگەر یەکێك لە ئیوە بووبەئیمام با بەسووکی و ئاسانی نوێژیان بۆ بکات، واتە مەرج و ئەرکانەکانی نەفەوتێنێت، چونکە کەسانی لاواز و پیر و ئەوانەیان تێدایە کە کار و مەشغەڵتیان هەبێت، بەڵام ئەگەر بۆ خۆی نوێژی کرد، ئەوە چەندێك درێژی دەکاتەوە قەیناکە).

هەروەك دەزانرێت کە معازی کوڕی جەبەل نوێژی عیشای بە ئیمامەت بۆ کەسانێك دەکرد، سوورەی (البقرة) ی خوێند، یەکێك لە ناو نوێژەکەدا هاتە دەرەوە ، بۆخۆی تەواوی کرد، وتیان: فلان کەس وەرگەڕاوەتەوە، شکاتیان بردە خزمەت پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی معازی کرد وئەم کارە توڕەی کرد، وە فەرمووی: ئەرێ تۆ ئەی معاز خەڵکەکە وەردەگێڕیتەوە ئەی معاز؟!
سورەی ﴿سَبِّحِ اسمَ﴾ و﴿والسَّماء والطارق﴾، و ﴿الشَمسِ وضُحاها﴾ی بخوێنە[3]

---

(١) رواه البخاري (٧٦٣)، ومسلم (٤٦٢)

(٢) رواه البخاري (٩٠، ٧٠٣، ومسلم (٤٦٧).من حديث أبي هريرة.

(٣) رواه البخاري، (٧٠٥)، ومسلم (٤٦٥)، وليس فيها ذكر (والسماء والطارق)، وهي عند البيهقي(في السنن الكبرى) ٣(١١٢/).

# باسی وەزیفەی ئەرکانەکانی نوێژ

## ئیمام سێ ئەرکی لەسەرشانە:

**یەکەم**: دەبێت ڕکوع و سوجدەکانی درێژنەکاتەوە و لە سێ جار زیاتر تەسبیحات نەکات. لە (حەزرەتی) ئەنەس دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

**((ما رَأَيتُ أخَفَّ صَلاةً مِن رَسولِ اللهِ ﷺ فِي تَمامٍ))**[1].

واتە: هیچ کەسێکم نەدیوە بە قەدەر پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژەکەی بە تەواوی و بە سووکی و خێرایی ئەنجام بدات.

بەڵێ، دەگێڕنەوە کە (حەزرەتی) ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ ڕازی بێت) کاتێك لە دواى (حەزرەتی) عومەری کوڕی عبدالعزیز نوێژی دەکرد کە فەرماندەی مەدینە بوو، فەرمووی:

**((ما صلَّيتُ وراءَ أحدٍ أشبَهَ صَلاةً بصَلاةِ رسُولِ اللهِ صلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم مِن هَذا الشَّاب قال : فكُنَّا نُسبّحُ وَراءَه عَشْراً عَشْراً))**[2].

(واتە: بە دوای هیچ کەسێکەوە نوێژم نەکردووە کە زیاتر بشوبهێت بە نوێژی پێغەمبەری خودا ﷺ لە نوێژی ئەم گەنجە، ئێمەش لە دوایەوە لە ڕکوع و سوجدەکاندا دەجار دەجار تەسبیحاتمان کردووە)،

وە بە کورتی دەگێڕنەوە کە ئەوانە دەیانفەرموو:

ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ کە نوێژمان دەکرد لە ڕکوع و سوجدە

---

(١)أخرجه البخاري (٧٠٨)، ومسلم(٤٩٦)، من طريق شريك سمعت أنس بن مالك يقول:

**(ما صليت وراء امام قط أخف صلاة ولا أتم من النبي ﷺ وأن كان يسمع بكاء الصبي فيخفِّفُ مَخافةَ أنْ تَفتنَ).**

(٢)قال العراقي أخرجه أبو داود كتاب الصلاة باب مقدار الركوع والسجود (٨٨٨)، والنسائي باب عدد التسبيح في السجود(١١٣٥)، باسناد جيد وضعفه ابن القطان اه

کاندا دەجار تەسبیحاتمان دەکرد،[1]، ئەمە کارێکی باشە، بەڵام ئەگەر خەڵکەکە زۆر بوون، ئەوا باشتر وایە کە سێ تەسبیحات زیاتر نەکات، بەڵام ئەگەر ئامادە بووان خۆیان یەکلایی کردبوویەوە بۆ ئاین و بەندایەتی، ئەوە ئاساییە کە دەجار بیخوێنن. بەم شێوەیە دەتوانین هەموو ڕوایەتەکان پێکەوە کۆبکەینەوەو، ئاڵۆزیش نەکەوێتە میانیانەوە.

وە پێویستە ئیمام دوای ئەوەی لە ڕکوع سەری بەرز کردەوە بڵێت: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ**) خودای گەورە دەنگی سوپاسگوزارانی دەبیستێت و بەدەنگیانەوە دەڕوات.

**دووهەم:** پێویستە مەئمووم پەلە نەکات و پێش ئیمام نەکەوێت لە ڕکوع و سوجدەکاندا، مەگەر تەوێڵی ئیمام گەیشتبێتە سەر زەوی ئیمجا ئەمان بە خێرا دابەزن، بەم شێوە صەحابەکان لە پشتی پێغەمبەرەوە نوێژیان دەکرد، [2]

وە دەبێت ئیمام لە ڕکوع دا دامەزرابێت و، ئیمجا مەئمووم دابەزێتە خوارەوە بۆ ڕکوع، وەك وتراوە:

ئادەمییەکان کاتێك لە نوێژەکانیان دەردەچن لەسەر سێ بەشن :

تاقمێکیان خێری بیست و پێنج نوێژیان بۆ دەنوسرێت، ئەوانەن کە تەکبیر و ڕکوعیان دەکەوێتە دوای ڕکوع ی ئیمامەوە، وە کۆمەڵێکیش تەنها یەك نوێژیان بۆ دەنوسرێت، کە ئەوانەن لەگەڵ ئیمامدا تەکبیر و ڕکوع و سجودەکانیان

---

(١) كذا قاله أبو طلب في (قوت القلوب)٢/٢١٠، زیاتر سوود لە فەرموودەکەی پێشەوە وەردەگیرێت، کە باسکرا.

(٢)أخرجه البخاري(٨١١)، ومسلم(٤٧٤) من حديث البراء بن عازب، ولفظه:

**( فإذا رَفع من الركوعِ لَم أرَ أحداً يحْني ظَهرَهُ حتى يَضعَ رسول الله ﷺ جَبهَتهُ على الأرضِ، ثُمَّ يَخرُّ من وراءَهُ ساجداً).**

دەکەن، وە تاقمێکی تریش نوێژەکەیان بەتاڵ دەبێتەوەو بۆیان نانوسرێت کە پێش ئیمام دەکەون.|[1].

وە جیاوازییەك پەیدا بووە لە ڕای زانایان دەربارەی ئیمام کە لە ڕکوعدایەو کەسێك دێت و دەیەوێت پیایدا بگاتەوە. ئایا ئیمام ڕابووەستێت تا ئەوەی تازە هاتووە خێری ئەو ڕکاتەی لە کیس نەچێت یان نا؟

ڕەنگە ئەوە باشتر بێت کە بەدیاریەوە بووەستێت، بەمەرجێك ئیخلاصی هەبێت و مەبەستی ڕوپامایی یان ناسراوی کەسێکی دیار نەبێت، وە جیاوازی نەخرێتە میانی نوێژخوێنانەوە، وە مافی ئامادەبوانیش پێشێل نەکرێت، بە تایبەتی کەسانێك کە لەوانەیە بەرگە نەگرن، کە پێویستەڕەچاوی مافی ئەوانەش بکرێت و ئیمام نەوەستێت بە دیار کەسانێکی دواکەوتوودا.

**سێیەم:** لە تەحیاتدا نابێت دۆعاکانی زیاتر بێت لە ئەصڵی تەحیاتە کە، بۆ ئەوەی زیادەڕەوی نەکات و درێژی نەکاتەوە، وە نابێت ئیمام تایبەت دۆعا بۆ خۆی بکات، بەڵکو دەبێت بە شێوەی کۆ نزاکانی بکات و بڵێت: **(اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا)**، وە نەڵێت: **(اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)** چونکە بەڕاستی بۆ ئیمام کەراهەتی هەیە نزاکانی تایبەت بکات بە خۆیەوە[2]، وەکارێکی باش دەکات کە ئەو پێنج وشەی پیغەمبەر ﷺ لە نزاکاندا دەیفەرموو ئیمامیش بیانڵێت: خودایە پەنات پێ دەگرین لە سزای دۆزەخ و جەهەننەم، وە لە سزای گۆڕ و قەبر، وە لە هەموو فیتنە و تاقیکردنەوەکانی تر کە لە کاتی ژیان و دوای مردن دوچای هەموان دێت، وە لە فیتنەی مەسیحی دەججال،(واتە درۆزنی فێڵبازی ئەعوەری چاو

---

(١) قوت القلوب:٢/٢٠٩.

(٢) قال الإمام الشافعي في الأُم: ٢/٣٠٥: وروي من وجهٍ عن أبي أمامة قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: **(لايُصلِّ الإمامُ بِقومٍ فَيَخُصَّ نَفسَهُ بِدَعوَةٍ دُونَهُم)**

کوێر) وه ئەگەر ویستت تاقم و هۆزێك تاقی بکەیتەوه ئەوا پێشتر گیانم لێ بسێنەرەوه با تووشی ئەو فیتنەو نارەحەتیە نەبم،

**((نعُوذُ بكَ مِن عَذابِ جَهنَّم وعَذابِ القَبر، ونعُوذُ بكَ مِنْ فِتنَة المَحْيا والمَمَات، ومِنْ فِتنَةِ المَسيحِ الدَجَّال، وإذا أَردْتَ بقَومٍ فِتنَةً فاقْبِضْنا إلَيكَ غَيْرَ مَفْتُونينَ))**[1]،

( وه ئەگەر بە تاك بۆ خۆی نوێژی دەکرد، ئەوا با أعوذ بخوێنێت، واته پەنادەگرم به خودا).

وه دەڵێن: بۆیه پێی دەڵێن مەسیح: چونکه ڕوپێو و مەسحی هەموو سەر زەوی دەکات و، هەمووی به درێژی دەگەڕێت، وه لەماوەی چل ڕۆژدا هەموو سەرزەوی دەگەڕێت. وه هەندێکی تر دەڵێن:

بۆ یه پێی دەڵێن مەسیح: چونکه چاوێکی کوێرەو داپۆشراوه.

---

(١) ئەو دوعا مەنسور و سوننەتەیەش له تەحیاتدا بخوێنێت :

**(اللَّهُمَّ) أسألُكَ منَ الخيرِ كلِّهِ عاجلهِ وآجلهِ، ما عَلِمتُ منهُ ومالَم أعلَم، وأسألكَ مِمَّا سألكَ منهُ نبيُّكَ مُحمَّد ﷺ، وأعُوذ بكَ مِمَّا استَعاذَك مِنْه نبيُّكَ مُحمَّد ﷺ . وأسألك مِمَّا سألكَ بهِ عِبادُك الصَّالحُون، وإن قالَ: أسألُك الجَنَّة وما قَرُب إلَيها مِنْ قولٍ وعَملْ، ﴿لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً، إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ، رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ، إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾** (آل عمران/٩) **﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾** (البقرة/٢٠١) **ثم يستغفر للمؤمنين والمؤمنات الأحياء مِنهُم والأموات،** دوعا و نزا لەمه گەورەتر و مەئثور تر نییە، قال الزبيدي ٢٠٦/٣: هذا الحديث روي من طريق عائشة وأبي هريرة، فحديث عائشة أخرجه البخاري ومسلم(٥٨٨) وأبو داود والنسائي، وقوله: وإذا أردت: فهي في رواية الترمذي: (٣٢٣٣).

# وەزیفەی ئیمام لە کاتی لێبوونەوە لە نوێژدا

ئیمام لە کاتی سەلامدانەوەدا سێ ئەرکی لە سەرە:

**یەکەم:** بەسەلامدانەوەکانی نییەتی سەلامی لە نوێژخوێن و مەلائیکەکان بێت.

**دووهەم:** ماوەیەك دوای نوێژەکە بمێنێتەوەو دابنیشێت بۆ تەسبیحات و نزاکردن، وە پێغەمبەری خودا ﷺ هەر بەم شێوەی دەکرد، هەروەها (حەزرەتی) ئەبوبەکر و (حەزرەتی) عومەریش (خودایان لێ ڕازی بێت)[1].

وە نوێژە سوننەتەکانیشی لە جێگەیەکی تردابکات[2]، وەئەگەر لەپشتەوە ئافرەت هەبوون ئیمام هەڵنەستێت تا ئەوا هەڵدەستن و جێگاکە چۆڵ دەکەن.

لە فەرموودەیەکی مەشهودا هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە لە دوای سەلامدانەوەی دادەنیشت تا بڵێت: ((أنه ﷺ **لم يكُنْ يقْعُد إلاَّ قَدْرَ ما يقُولُ: اللَّهُمَ انْتَ السَّلامُ وَمِنكَ السَّلام تَباركْتَ ياذا الجَلالِ والإكرامُ**)) [3].

واتە پێغەمبەری خودا ﷺ دوای سەلامدانەوە هەر ئەوەندە دەمایەوە تا بڵێت: خودایە گیان هەر تۆ سەرچاوەی ئاشتی و سەلامی، وە لە تۆوە ئاشتی و سەلامەتی وەردەگیرێت، وە بۆ لای تۆیش دەگەڕێتەوە، بەرزی و پیرۆزی هەر شایستەی تۆیە ئەی خاوەنی ڕێز و جەلال و دەستەڵات.

---

(١)لە بوخاریدا هاتووە: (٨٤٩): عن أم سلمة (رضي الله عنها) **كان إذا سلَّم يمكثُ في مكانهِ يَسيراً. وحديث مكث الشيخين يسيراً عند أبي داوود.** (١٠٠٧) وقد اعتمد الحافظ العراقي في تخريجه على رواية (يثبت) وشاهِدها عِندَ المصنف قول الراوي: يسيراً. وسيأتي تفسيره.

(٢)أخرج البخاري (٨٤٨)من حديث أم سلمة قالت: **كان رسول الله ﷺ اذا سلَّم قام النساء حين يقضي. تسليمه ومكث يسيرا قبل أن يقوم.** الإتحاف٢٠٩/٣.

(٣)أخرجه مسلم والترمذى من حديث عائشة رضى الله عنها. هو مروى بالمعنى اذا لفظ مسلم كان يقعد مقدارا ما يقول: **اللهم أنت السلام ومنك السلام وإليك يعود السلام تباركت ياذا الجلال والإكرام ثم يقوم إلى السنة. الإتحاف ٢٠٩/٣.**

**سێیەم:** ئەگەر سەلامی دایەوە و لە شوێنی خۆی جولا، پێویستە بە ڕوخساری خۆی ڕو لە خەڵکەکە بکات، وە کەراهەتی هەیە کە مەئمووم هەڵبستێت و بڕوات پێش ئەوەی کە ئیمام جێگاکە بە جێ بهێڵێت، دەگێڕنەوە لە (حەزرەتی) طەڵحەو (حەزرەتی) زوبەیرەوە (خودایان لێ ڕازی بێت)کە لە دوای ئیمامێکەوە نوێژیان دەکرد، کاتێك سەلامیان دایەوە، بە ئیمامەکەیان فەرموو: بەڕاستی نوێژێکی جوان و تەواوتان ئەنجامدا، جگە لە یەك شت نەبێت، تۆ کە سەلامت دایەوە لات نەکردەوە و ڕوخسات نەکردە خەڵکەکەوە، لە پاشان بە خەڵکەکەیشیان فەرموو: بەڕاستی ئێوەیش نوێژەکەتان زۆر جوان و باش بوو، تەنها ئەوە نەبێت کە پێش ئەوەی ئیمام لە جێگەی خۆی هەڵبستێت، ئێوە شوێنەکەتان بە جێ هێڵا[1]، لە پاشان پێشەوا جێگاکە بە جێ دەهێڵێت، بەلای ڕاستابێت یان بەلای چەپدا یەکسانە بۆ ڕۆشتن، دیارە بەلای ڕاستدا باشترە، ئەمەش کە ڕونکرایەوە وەزیفەی نوێژەکانە. بەڵام نوێژی بەیانی (قنووتی) تیا زیاد دەبێت، ئیمام دەڵێت: **(اللَّهُمَّ اهدِنَا فيمَنْ هَدَيتَ)**.ناڵێت: **(اللَّهُمَّ اهدِني)**.خودایە لەناو ئەوکەسانەی کە ڕێنومایيت کردوون هیدایەتی ئێمەیش بدەیت، ناڵێت: خودایە هیدایەتم بدەیت، دەبێت نزاکە بۆ هەموان بێت و مەئموومەکانیش ئامین دەکەن، ئەگەر ئیمام گەیشتە **(إنَّكَ تَقضِي وَلا يُقضَى عَلَيكَ)**هەموو حوکم و بڕیارێك لای تۆیەو، کەس ناتوانێت فرمان و بڕیار بەسەر تۆدا دەر بکات، لەم نزایەدا شیاو نییە کە مەئموومەکان ئامین بکەن، چونکە ئەوە ستایش کردنی خودایەو دەبێت ئەوانیش لەگەڵ ئیمامدا بیخوێنن، یان بڵێن:

---

(١)قال البخاري في باب يستقبل الإمام النَّاس إذا سلَّم، عن سمرة بن جندب قال: **كانَ النبيُّ صلى الله عليه وسلم إذا صلَّى صلاةً أقبلَ عَلينا بوَجهِهِ**، کەواتە ئیمام لای ڕاستی دەکاتە خەڵکەکەو ڕوی چەپیشی لە قیبلەوە بێت، بنوارە: قوت القلوب٢/٢١٣.

بەڵێ بە دڵنیاییەوە من شایەتم. لەسەر هەموو ئەو ستایشکردنانە، **(بلَى وأنَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينْ)**یان دەڵێت:

**(صَدَقتَ وبَرَرتَ)**بەڕاستی ڕاست و دروستت فەرموو، یان هاووێنەکانی.

وە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە لە بارەی بەرزکردنەوەی دەستەوە لە (قنووتدا)، جا ئەگەر ئەم فەرموودە درووست بێت، ئەوە سوننەتە بەرزکرێتەوە[1]،هەر چەندە پێچەوانەی دۆعاکانە، کە لە کۆتایی تەحیاتدا دەخوێنرێت، چونکە لەوێدا دەستی بۆ بەرز ناکرێتەوە، بەڵکو چۆن لە خاوەنی شەرعەوە پێمانگەێنرابێت ئەوە دەکرێت، جیاوازییەکیش هەیە لە میانیاندا، چونکە لە تەحیاتدا دەست وەزیفەیەکی هەیە، کە بەشێوەیەکی تایبەت دەخرێتە سەر ڕان، بەڵام لە قنووتدا هیچ وەزیفەیەکی نییە، بۆیە دوور نییە کە بەرزکردنەوەی دەستەکان لە قنووتدا ئەو ئەرکە بێت کە پێویستە بیبینێت، وە لەگەڵ دۆعایشدا گونجاوە، وە خودایش زانایە بەسەر هەمووهێتییەکاندا.

ئەمەی باسمانکرد پوختەی ئادابی ئیمامەت و پێشەوایەتی بوو، والله الموفق.

---

(١)قال العراقي: رواه البيهقي من حديث انس بسند جيد، في قصة قتل القراء، **(فلقد رأيت رسول الله ﷺ كلما صلَّى الغداةَ رفعَ يدَيه يدْعُو علَيهم )** اهـ. قال الزبيدي:٢١٢/٣: وقوله بسند جيد ليس بجيد فان هذا الحديث أخرجه البهقي من طريق علي ابن الصفر السكرى بسنده عن أنس وقد قال الذهبي في مختصره المهذب قال الدار قطني (علي) ليس بالقوى وقال الحافظ في تخريج الرافعي:( **رفعُ اليدَين في القنُوت) رُوِى عن ابن مسعود وعمر وعثمان أما ابن مسعود فرواه المنذر والبهقي.** وأما عُمر فرواه البهقي وغيره وهو في رَفع اليدين للبخاري، وأما عثمان فلم أرهُ. وقال البهقي روى أيضا عن أبى هريرة اهـ. قلت الذى روى عن ابن مسعود وأبى هريرة في قنوت الوتر لا الصبح، وقد روى أيضا من حديث علي لكن سنده ضعيف، والذى صحَّ من ذلكَ حديث عُمر فقد أخرجَهُ البهقيُ مِن طريقَين عن أبي عثمان النَّهدي عنهُ وعَن أبي رافع وعن عُمر .**وروى ذلك الحسن البصري فلو استدلَّ العراقي بحديث عُمر كان أولَى. فحيث أنَّ الحديثَ صحَّ فيَستحِبُ ذلِكَ.**

# دەروازەی پێنجەم

## باسی گەورەیی جومعەو

## ئاداب سوننەت و مەرجەکانی

## (فەزیلەت و گەورەیی جومعە)

بزانە: بەڕاستی هەینی ڕۆژێکی زۆر گەورەیە، خودای گەورە ئیسلامی پێ بەرز کردۆتەوە، وە موسوڵمانانی پێ تایبەتمەند کردووە، وەك خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾ (الجمعة/٩) ئەی بڕوادارەکان، ئەگەر لە ڕۆژی هەینی دا بانگی خەڵکەکەیان کرد بۆ نوێژکردن، ئەوا بە خێرایی بچن بەدەم زیکر و یادی خوداوە، وازیش لە کڕین و فرۆشتن بهێنن. کەواتە حەرامی کردووە لە ڕۆژی جومعەدا خۆی سەرقاڵ بکات بە کاروباری دونیاییەوە، یان خۆی خەریك بکات بە هەرشتێکیش کە ببێتە ڕێگر بۆ ئەوەی بچێت بەدەم بانگی جومعەوە.

وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((إنَّ اللهَ (عَزَّ وجَلْ) فرَضَ عليكُمُ الجُمُعَةَ في يَومي هَذا في مَقامي هَذا))** [1]،

---

(١)قال العراقي أخرجَه ابن ماجه(١٨٠١) من حديث جابر باسناد ضعيف اهـ. قلتُ ولفظ ابن ماجه ان رسول الله ﷺ خطبَ فقال: **إنَّ الله افترَض عليكُم الجُمعَة في مَقامي هذا في شَهري هذا في عامي هذا الى يوم القيامة. فمن تَركها استخفافاً بها أو جُحودا بها فلا جمَع الله شملَه ولا باركَ له في أمْرِهِ إلاَّ ولا صلاةَ له ولا زكاةَ لهُ ولا حجَّ له ولا بَركة حتَّى يتُوب فمَن تابَ تابَ اللهُ عَليهِ.** الإتحاف ٣/٢١٤.

واته هەرلەم جێگەو مقامی منەدا و لەم ڕۆژەدا خوداﷻجومعەی لەسەر فەرز کردوون، هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺفەرموویەتی:

**((مَنْ تَركَ الجُمُعَة ثَلاثاً مِنْ غَيرِ عُذرٍ، طَبَعَ اللهُ عَلَى قَلْبِه))**[1]،

ئەوەی بەبێ بەهانەیەکی شەرعی سێ جار لەسەریەك نوێژی جومعە نەکات، ئەوا خودا مۆر دەنێت بەسەر دڵیەوە،

وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:

**((فقَدْ نَبَذ الإسلامَ ورَاءَ ظَهرِهِ))**[2]

(واتە ئیسلامی تۆڕداوەتە پشتی خۆیەوە.)

پیاوێك چووە خزمەتی (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عەباس و دەربارەی پیاوێك

---

(١)قال العراقي رواهُ أحمد في مسنده(١٥٠٧٢) واللفظ له وأصحاب السنن ، أبوداوود(١٠٥٢)، واترمذي(٥٠٠)، وانسائي(١٣٦٩)، وابن ماجه(١١٢٥)، والحاكم في المستدرك ٤١٥/١(١٠٣٤)وصححه من حديث ابي الجعد الضمري اهـ. قال الزبيدي:٢١٤/٣: وأخرجه كذلك ابن أبى شيبه في مصنفه(٤٧٩/١،(٥٥٣٣) و أبو يعلي في مسنده(١٧٥/٣(١٦٠٠)، والطبراني في المعجم الكبير(٣٦٥/٢٢(٩١٥)، والبغوى والباروى و أبو نعيم في المعرفة(٣٥٢/١) والبيهقي في السنن الكبرى(١٧٢/٣(٥٣٦٦)، وابن حبان في صحيحه(٤٩١/١(٢٥٨)، وحسنه الترمذي وأما الحاكم فأخرجه في كتاب الكنى وفي المناقب من المستدرك وليس لابى الجعد حديثا غيره كما نقل عن البخاري، كما نقل في تهذيب الكمال للمزي١٨٩/٣٣). الإتحاف ٢١٤/٣. وإحياء علوم الدين تحقيق علي مصطفى..٥٢٥/١.

(٢)قال العراقي رواه البيهقي في البعث من حديث ابن عباس اهـ. قال الزبيدي:٢١٤/٣ وكذا رواه أبو يعلي في مسنده(٢٧١٢)، من قول إبن عباس (رضي الله عنهما) ولفظه: **من تركَ ثلاثَ جُمَعٍ مُتواليات**، والباقي سواء قال الهيثمي رجاله رجال الصحيح. ورواه عبدالرزاق في المصنف١٦٦/٣.

پرسیاری لێ کرد:

که مردبێت و ئامادەی نوێژی جومعەو جەماعەت نەبوبێت، فەرمووی:

ئەوە لە ئاگردایە. (واتە: شیاوی چوونە ناو ئاگرە) ماوەی مانگێك دەهات و هەمان پرسیاری لێ دەکرد و هەمان وەڵامی دەبیست کە لە ئاگردایە [1]

وە لە هەواڵ و فەرموودەدا هاتووە:

((**أنَّ أهلَ الكتابينِ أُعطو يومَ الجُمعةِ فاختلفُوا فيهِ فَصُرِفوا عنهُ، وهَدانا اللهُ تعَالى لَه، وأخَّرَهُ لِهذِهِ الأُمَّة وجَعلَهُ عيداً لهُمْ، فَهُم أوَّلُ النَّاسِ بهِ سَبقاً وَأهلُ الكِتابينِ لهُمْ تَبعٌ**))[2]،واتە:

جولەکەو گاورەکان ڕۆژی جومعەیان پێدرا، بەڵام ڕای جیاوازیان پەیدا بوو لە بارەیەوە، بۆیە لێیان تێك چوو، وە خودا ڕجوای نەبینی پێیان، وە هێدایەتی ئەم ئوممەتەی دا بۆ ئەوەی پێی بگەین، نەیخستە ئیجتیاهدی خۆیانەوە، بەڵکو بە دەقێکی پیرۆز بۆی دیاری کردن، وە دوایخست بۆ ئەم ئوممەتی (حەزرەتی) پێغەمبەرە ، وە کردی بە ڕۆژی جەژن بۆیان، لەپێشەوە بە

---

(١) رواه الترمذي (٢١٨) وابن أبي شيبه في المصنف(٣٤٧٥).

(٢)رواه الشافعي في مسنده(٥٣٦/١، والطبراني في الأوسط(٢١٠٥). رواه ابن أبى حاتم عن السدي: **إنَّ الله فرضَ على الهود الجمعة، فقالوا يا مُوسى إنَّ الله لم يخلق يوم السبت شيئاً، فاجْعَلْ لَنا فَجعَل عَليهمْ** قال العراقي: الحديث متفق عليه البخاري(٨٩٨)، ومسلم(٨٥٥)، من حديث أبي هريرة بنحوه. قال الزبيدي:٢١٥/٣-٢١٤. وأخرجه النسائي كذلك وكلهم من طريق أبى الزناد عن الاعرج أنهُ سمع أبا هريرة يقول واللفظ للبخاري سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: **نحنُ الآخرون السابقون يوم القيامة، بيدَ أنَّهُم أوتُوا الكِتاب من قَبلنا ثمَّ هذا يومُهُم الذي فُرضَ عليهم فاختلفُوا فيهِ فهدانا اللهُ لهُ. فالناسُ لنا فيهِ تبع الهود غدا والنصارى بعد غد.**

ئەهلی کیتابییەکان درا ، ئەوان پێشکەوتووبون، دواتر ئوممەتی (حەزرەت) ﷺ بون بە پێشەنگ و ئەوانی تریش بوون بە شوێنکەوتەیان.

وە لە فەرموودەیەکی (حەزرەتی) ئەنەسدا هاتووە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((أَتاني جُبريل في كَفِّهِ مِرآةٌ بَيضاءُ، وقال: هذهِ الجُمعَة يَعْرِضُها عليكَ رَبُّكَ، لتكُونَ عيداً لكَ ولأُمَّتِكَ مِنْ بَعْدِكَ، قلتُ: فما لَنا فيها؟ قال: لكُم فيها خيرُ ساعةٍ، مَن دَعا فيها بخَيرٍ هُوَ لهُ قِسْمٌ أعطاهُ اللهُ سُبحانَهُ إيَّاهُ، أوْ ليسَ لهُ قِسمٌ ذُخِرَ لهُ ماهُوَ أَعْظمُ مِنهُ، أو تعوَّذَ مِنْ شَرٍ هُو مَكتوبٌ عَليهِ، أعاذهُ اللهُ تعَالى مِنْ أعظمَ مِنهُ، وهُوَ سيِّدُ الأيَّامِ عِندَنا، ونحنُ نَدعُوهُ في الآخِرَةِ يَومَ المَزِيدْ، قلت: وَلِمَ؟ قال: إنَّ ربَّكَ (عَزَّ وجَلَّ) إتَّخذَ في الجَنَّةِ وادياً أفْيحَ مِنْ مِسكٍ أَبيَض، فَإذا كان يومَ الجُمعَة نَزلَ (تعالى)مِنْ عِليِّين علَى كُرسِيِّهِ فيَتجَلَّى لَهُمْ حتَّى يَنظُروا إلى وَجْهِهِ))**[1]،

**واتە:** جوبرەئیل (علیه السلام) هاتە لام، ئاوێنەیەکی سپی لە ناولەپیدا بوو، فەرمووی: ئەم ئاوێنەیە جومعەیە، پەروەردگارت دەیخاتە بەردەمت، وە بۆت پێشنیار دەکات تا ببێتە ڕۆژی جەژن بۆتۆ و بۆ ئوممەتەکەیشت دوای تۆ، وتم: ئەی چی بۆ ئێمە هەیە لەم جومعەدا؟ فەرمووی:

باشترین سەعاتتان بۆ هەیە تیایدا، هەرکەسێك لەو سەعاتەدا دۆعای تێدا بکات، ئەوە ئەگەر بەشی هەبێت لەو داوایەدا، ئەوا خودای (عَزَّ وجَلْ) پێی دەبەخشێت، خۆ ئەگەر بەشی نەبوو لەو داوایەدا، لەوە زیاتر و گەورەتر کە داوای کردووە بۆی دەبێتە زەخیرە و توێشووی دوارۆژی، ڕۆژی جومعە لای ئێمە گەورەی هەموو ڕۆژەکانە، وە ئێمە لە ڕۆژی قیامەتدا بە ڕۆژی زیاد کردن

---

(١)قال العراقي رواه الشافعي في المسند(٥٣٦/١) والطبراني في الأوسط(٢١٠٥)، رواه باسنادين أحدهما جيد قوي والبزار و أبو يعلي مختصر أو رواته رواة الصحيح عن أنس من حديث طويل

ناوی دەبەین، وتم : بۆچی پێی دەڵێن (ڕۆژی مەزید)؟

فەرمووی: پەروەردگارت(عَزَّ وجَلْ) لە ناو بەهەشتدا شیوێکی تایبەت کردووە بەوەی کە بۆنی لە میسك خۆشتر و بۆندار ترە، هەرکە ڕۆژی جومعە هاتە پێشەوە، ڕحمەتی خودا لە شوێنە بەرزەکانەوە دێتە خوارەوە، بۆ سەر کورسی، خودای گەورە تەجەللیاتی خۆیان بۆ دەردەخات و ڕێگەیشیان پێ دەدات کە سەیری ڕوخساری پیرۆزی خودا ﷻ بکەن (بە بێ چەندێتی و چۆنیەتی).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((خيرُ يومٍ طلَعَتْ عَليهِ الشَّمسُ يومُ الجُمُعَة، فيهِ خُلِق آدَم عليه السَّلامُ، وفيه أُدخِلَ الجَنَّة، وفيه أُهبِطَ مِنها إلى الأَرضِ، وفيهِ تيبَ عَليه، وفيهِ تقُومُ السَّاعَةُ)** أي بين الصبح وطلوع الشمس **(وهُوَ عِندَ اللهِ)** يدعى **(يَومُ المَزِيدِ، كَذلِكَ تُسَمِّيهِ المَلائِكَةُ فِي السَّماءِ، وهُوَ يَومُ النَّظَرِ إلى اللهِ تَعالَى فِي الجَنَّة))** [1].

باشترین ڕۆژ کە خۆری لەسەر هەڵهاتبێت ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژەدا (حەزرەتی) ئادەمی تێدا لە دایك بوو، (سەلامی خودای لەسەر) وە لەو ڕۆژەدا چووە ناو بەهەشتەوە، وە هەر لەو ڕۆژەشدا دایانبەزاندە خوارەوە بۆ سەر زەوی، وە تیایدا تەوبەیشی لێ وەرگیرا، وە تیایدا وەفاتیشی کرد، وە هەر لە ڕۆژی جومعەشدایە کە قیامەت هەڵدەستێت، بەلای خوداوە ﷻ بە ڕۆژی زیادەو پڕ لە خیری زیاتر ناسراوە، هەروایش لە لایەن فریشتەکانی ئاسمانەوە ناویدەبرێت، وە ڕۆژی جومعە ئەو ڕۆژەیە کە تیایدا سەیری خودای گەورەی تیا دەکرێت.

وە لە هەواڵ و فەرموودەدا هاتووە:

---

(١) أخرجه مسلم من حديث أبي هريرة(كتاب الجمعة باب فضل يوم الجمعة (٨٥٤).

**(( إنَّ للهِ عزَّوجَل في كُلِّ يَومِ جُمُعَة سِتُمائةِ ألفِ عَتيقٍ مِنَ النَّار))** [1]،

كه خوداى (عَزَّ وجَلْ) له هەموو ڕۆژێكى جومعەدا شەش صەد هەزار ئازادكراوى هەيەو له ئاگريش دەپارێزرێن.

وه لەو فەرموودەى (حەزرەتى) ئەنەس (خوداى لێ ڕازى بێت) له پێغەمبەروه دەيگێڕێتەوه كه فەرمويەتى:

**((إذا سَلِمَت الجمُعَة سَلِمَتِ الأيَّام))** [2]

(واته: ئەگەر له ڕۆژى جومعەدا خۆت لەگوناه پاراست ڕۆژەكانى حەفته پارێزراو دەبيت)

**((إنَّ الجَحيمَ تسعرُ في كُلِّ يَومٍ قَبلَ الزَّوالِ عِندَ استِواءِ الشَّمسِ في كبَدِالسَّماءِ، فلاَ تُصَلُّوا في هذهِ السَّاعَة إلاَّ في يَومِ الجُمُعةِ فإنَّهُ صلاةٌ كلُّه، وإنَّ جهَنَّم لا تُسعَرُ فيه))** [3]،

(واته بەردەوام دۆزەخ گڕ دەستێنێت و گەرم داديێت له هەموو ڕۆژێك له پێش

---

(١) رواه أبو يعلي في مسنده(٣٤٣٤)، وأخرجه ابن حبان في الضعفاء (١٧٨/١)، والبهقي في الشعب، ١١٣/٣(٣٠٤٢)، من حديث أنس، قال الدارقطني في العلل: كما في الفيض القدير للمناوي، ٤٨١/٢)، والحديث غير ثابت.

(٢)أى أيام الاسبوع من المؤاخذه كذا في القوت وقال العراقي أخرجه بن حبان في الضعفاء (١٤٠/٢)و أبو نعيم في الحلية(١٤٠/٧) والبيهقي في الشعب(١١٣/٣)(٣٧٠٨) من حديث عائشة ولم أجده من حديث أنس اهـ . قال الزبيدي ٢١٦/٣: وأخرجه الدار قطني في الافراد(٤٩١/٥)(٦١٦٧) وتعقب الحافظ السيوطي في اللآلي المصنوعة ٨٨/٢ ابن الجوزى في ذكره اياه في الموضوعات(١٠٨/٢)، ورد دعواه تفرد عبد العزيز به وأورده من طريق آخر ليس في سنده من تكلم فيه والله أعلم.

(٣)، وقال العراقي أخرجه أبوداود في السنن(١٠٨٣) عن أبى قتادة وأعله بالانقطاع ا هـ قلت ولفظه: **إنَّ جهنَّم تُسجَر إلا يومَ الجُمعة**.وعند أبونعيم في الحلية(١٥٥/٥) بلفظ المصنف.

(زەوال) لادانی خۆر و لەکاتی ڕاوەستانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، جگە لە ڕۆژانی هەینی نەبێت) وەك مەناوی دەفەرموێت: چونکە لە جومعەدا گوناهی کەم تیا دەکرێت و لە هەموو ڕۆژەکانیش گەورەترە لەو ساتەدا نوێژ مەکەن تەنها لە ڕۆژی هەینی دا نەبێت، چونکە ئەو ڕۆژە هەمووی کاتی نوێژەو دۆزەخیشی تێدا تاو نادرێت.

کەعبی ئەحباریش فەرموویەتی:

خودای گەورە لە شارەکاندا مەککەی لە هەموان بە گەورەتر داناوە، وە لە مانگەکاندا ڕەمەزان، وە لە ڕۆژەکاندا ڕۆژی جومعە، وە لە شەوەکاندا شەوی قەدری پیرۆز[1]،

وە **دەڵێن:** پەلەور و حەشەرات و زیندەوەرە بچووکەکانیش لە ڕۆژی جومعەدا بەیەك دەگەن و بەیەکتری دەڵێن: سەلام سەلام، ڕۆژێکی باش و پەسەندە[2]، (چونکە لە ڕۆژی هەینیدا قیامەت هەڵدەستێت، کاتێك دەبینن هیچ ڕۆی نەداوە شوکری خودای تیا دەکەن و سەلام لە یەکتری دەکەن).

**((مَن ماتَ يومَ الجُمعَة كُتِبَ لَهُ أجرُ شَهيدٍ ووُقِي فِتْنَة القَبرِ))**[3].

واتە: ئەوەی لە ڕۆژی هەینی دا بمرێت، لە سزای قەبر دەپارێزرێت و پاداشتی شەهیدیشی بۆ دەنوسرێت.

---

(١) قوت القلوب٢/٦٤.

(٢) رواه أحمد في الزهد(١٣٧٧)، وأبونعيم في الحلية(٢/٢٠٥) من كلام مطرف الشخير.

(٣)قال العراقي أخرجه أبو نعيم في الحلية من حديث جابر وهو ضعيف، وللترمذي نحوه من حديث عبد الله بن عرموا وقال غريب وليس اسناده بمتصل، قال العراقي ووصله الترمذي الحكيم في النوادر بزيادة عياض بن عقبة الفهري بينهما، وأخرج الشيرازي في الالقاب من حديث عمر بن الخطاب **من مات يوم الجمعة أوليلة الجمعة عوفي من عذاب القبر وجرى له عمله**، الإتحاف ٣/٢١٧.

# ڕونکردنەوەی مەرجەکانی نوێژی هەینی

بزانە: نوێژی جومعەیش وەك هەموو نوێژەکانی تر وایە لە تەواوی مەرجەکانیدا، وە شەش مەرجی جیاوازیشی هەیە:

## یەکەم: کات،

ئەگەر سەلامدانەوەی نوێژی هەینی بکەوێتە سەرەتای کاتی نوێژی عەسرەوە، جومعەکەی دەفەوتێت و دەبێت نوێژەکەی وەك نوێژی نیوەڕۆ تەواو بکات، بەڵام ئەگەر کەسێك لە نوێژی جومعە دواکەوتبوو، وە ڕکاتێکی دوای سەلامدانەوەی ئیمام کەوت، ئەوە لەوەختی جومعە دەرچووەو دوو ڕای جیاوازی لەسەرە[1].

## دووهەم: جێگا؛

نوێژی جومعە لە سارا و شیوودەشت و ناو ڕەشماڵدا درووست نییە، بەڵکو دەبێت لە جێگەیەکدا بێت کۆمەڵە خانوویەکی کۆکردبێتەوەو کۆچەریش نەبن، چل کەسیان لێ پەیدا ببێت کە جومعەیان لەسەر واجب بێت، حوکمی گوندیش وەك شار وایە، وە مەرج نییە سوڵتان ئامادەبێت، یان ڕێگەی پێ بدات، بەڵام باشتر وایە ئیزنی فرمانڕەوای لەسەر بێت.

---

(١) غەزالی لە (الوسیط)دا٢٦٢/٢، فەرموویەتی: دوو ڕای لەسەرە: یەکەمیان: نوێژەکەی دروستە، چونکە تابیعە بۆ ئەو کۆمەڵەی کە لە گەڵیاندا نوێژی کردووە، وەك ئەوان درووستە، بۆ مەرجی ئەوەی لە ڕکاتی دووهەمدا دەبێت ئیقتیدای بە ئیمامەوە بێت لەسەری هەڵدەگیرێت. ڕای دووهەم: ئەوەیە کە درووست نییە چونکە کاتی جومعەکەی نەماوەو ، وەخت مەرجێکی سەرەکییە بۆ درووستی جومعە. وەك لە الخلاصة دا هاتووە ص/١٣٧-١٤٢.

## سێیەم: ژمارە:

جومعە لە کەمتر لە چل کەسی نێر پێك نایەت، وە دەبێت ئەهلی تەکلیف بن و سەربەست و دامەزراووموقیم بن، وە بەردەوام لەوێ بن و بە زستان و هاویندا بە جێی نەهێڵن، جا ئەگەر ئەوەندە تەکینەوە و مزگەوتیان لە کاتی وتار یان نوێژەکەدا بەجێهێڵا کە ژمارەیان کەم بووبێتەوە، ئەوە جومعەکەش درووست نابێت، بەڵکو دەبێت ئەو چل کەسە بەو مەرجانەی وتمان لە سەرەتای جەمعەوە تا کۆتایی نوێژەکەی بەردەوام بوونیان هەبێت.

## چوارەم: بوونی ئەو کۆمەڵ و جەماعەتە بەیەکەوە:

بۆیە ئەگەر ئەو کۆمەڵە لە گوندێکدا یان لە شارێکدا پێکەوە نەبوون و بە جیا نوێژیان کرد، ئەوە جومعەکەیان درووست نییە، بەڵام ئەوەی لە ڕکاتی یەکەمدا لە ئیمام دوا کەوتبێت ئەوا درووستە، ئەگەر لە ڕکاتی دووهەمدابە ئیمامدا گەیشت، ئەوا هەڵسێتەوەو ڕکاتی دووهەمی بە تاك بۆ خۆی تەواو بکات، بەڵام ئەگەر بە ڕکاتی دووهەمیشدا نەگەیشت، با ئیقتیدا بە ئیمام بکات و، نییەتی نوێژی نیوەڕۆ بهێنێت و، دوای سەلامدانەوەی ئیمام چوار ڕکاتی نیوەڕۆ تەواو بکات.

## پێنجەم:

**نابێت جومعەیەکی تری لە پێشەوە هەبێت لە هەمان شاردا.**

بەڵام ئەگەر نەدەتوانرا هەموو خەڵکەکە لە یەك مزگەوتدا کۆبکرێنەوە، یان جێگەیان نەدەبوویەوە، ئەوە بە پێی پێویست لە دوان و سیان و چوار و زیاتر درووستە، بەڵام ئەگەر جومعەی تر هەبوو بە بێ پێویستی، ئەوە ڕای درووست ئەوەیە کە: ئەو جومعەی (الله أکبر)ی دابەستنی نوێژەکەی یەکەمجار تێدا کرا بێت، ئەوە درووستە، بەڵام ئەگەر بە دڵنیاییەوە زانرا کە پێویستە

چەند جومعەیەك هەبێت، ئەوە باشتر وایە نوێژ لەو جێگە بکات کە ئیمامەکەیان باشترە، خۆ ئەگەر یەکسان بوون:

ئەوە کام مزگەوتیان کۆنترە لەوێ بیکات، ئەگەر ئەوەش یەکسان بێت، کامیان نزیکترە لەماڵی نوێژ خوێنەکەوە، وە زۆری خەڵکیش لە کامیاندا هەبێت، ئەوە فەزیلەتێکی زیادەیە و دەبێت ڕەچاو بکرێت.

**شەشەم:**

**دوو وتار دەخوێنرێتەوە:**

کە ئەو دوانە فەرزن، وە دەبێت بە هەڵسانەوەوە بێت، وە دانیشتنی میانی ئەو دوو وتارەیش پێویستەو فەرزە.

## وە لە وتاری یەکەمدا چوار ڕوکنی فەرزی هەیە:

**یەکەمیان:**

حەمدوسەنایە بۆ خودا،وەکەمترینی ستایش ئەوەیەبڵێت:الحمد لله.

**دووهەم:**

صڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ ، وەکەمترینی بەوە پێك دێت کە بڵێت: **(اللَّهُمَّ صَلِّ علَى مُحَمَّدٍ وآلهِ)**.

**سێیەم:**

وەسێت کردنە بە تەقوای خودای (عَزَّ وجَلْ) و خۆپارێزی لە گوناە، تەنها بەوەی بڵێت: **أوصيكم بتقوى الله**، مەرجەکە دێتە دی.

**چوارەم:**

خوێندنەوەی ئایەتێکە لە قورئانی پیرۆز تێیدا. هەروەها وتاری دووهەمیش هەمان مەرجی وتاری یەکەمی تێدایە، تەنها ئەوەی لە جیاتی خوێندنی ئایەتێکی قورئان لە وتاری دووهەمدا دۆعای خێر و نزای تێدا دەکرێت بۆ باوەڕداران، وە پێویستە هەموو ئەو چل کەسە گوێ لە وتارەکان بگرن.

## سوننەتەکانی جومعە:

کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا و بانگوێژ بانگی دا، وە ئیمام لەسەر میمبەرەکەی دانیشت، ئیتر نابێت لە مزگەوتدا کەس نوێژ بکات، جگە لەوانە نەبێت کە تازە دێن و نوێژی دیاری مزگەوت (تحية المسجد، کە درێژی نەکەنەوە) ئەنجامی دەدەن، بەڵام قسەکردن ناپچڕێت تا ئیمام دەست بەوتار دەکات، وە وتاربێژ کاتێك ڕوی دەکاتە خەڵکەکە و سەلامیان لێ دەکات، ئەوانیش وەڵامی سەلامەکەی دەدەنەوە.

کاتێك بانگوێژیش لێدەبێتەوە، وتار بێژ هەڵدەستێت و ڕو لە خەڵکەکە دەکات و، لا بەملاو لادا ناکاتەوەو، دەستی چەپیش دەگرێت بە مەچەکی شمشێرەکەیەوە، یان بە سەری گۆپاڵەکەی و، دەستی ڕاستیشی بە میمبەرەکەوە، بۆ ئەوەی یاریان پێ نەکات و بە بێ هۆ جوڵەیان پێ نەکات، یان بادەستێکی بخاتە سەر ئەوی تریان و دوو وتار دەخوێنێتەوە، لە میانیاندا دانیشتنێکی کەمی تێدا دەبێت، نابێت وشەی نامۆ و نەبیسترا و بەکار بهێنێت، وە نابێت وشەو پیتەکانی بە شێوەیەکی نەگونجاو درێژ بکاتەوە، وە نابێت بە صەداو ئاوازەوە بیخوێنێت، وە وتارەکەی کورت و پڕ لە ڕەوانبێژی بێت، وە هەموو مەبەستە پێویستەکان بگرێتەوە، وە سوننەتە لە وتاری دووهەمیشدا ئایەتێکیش بخوێنێتەوە.

ئەوەش کەدێتە ژوورەوەو ئیمام وتار دەدات، سوننەت نیيە سەلام بکات، ئەگەر سەلامیش بکات مافی نیيە و پێویست نیيە کەوەڵامی بدرێتەوە، وە بۆ وەڵامدانەوە بە هێما بێت باشترە، وە کەسێکیش کە کۆکی، سوننەت نیيە پێی بوترێت(خودا ڕەحمت پێ بکات). (مەگەر لە دڵی خۆیدا وەڵامیان بداتەوە).

ئەمانەی کە باسمانکردن، مەرجەکانی درووستی نوێژە، واتە ئەوانەی نوێژەکانیان درووست بێت کەبیکەن.

# مەرجەکانی

# پێویست بوون و

# واجب بوونی نوێژ بەم شێوەیە:

جومعە پێویست نییە مەگەر لەسەر نێر و باڵغ و ئاقڵ و موسوڵمان و سەربەست و، دامەزرا و بێت لە گوندێکدا یان شارێك کە چل کەسی تێدا بێت و ئەو مەرجانەیان تێدابێت، یان لە گوندێك لە کەناری شارەکەوە، کە دەنگی بانگەکەی پێ بگات، لە کاتێدا کە دونیا کش و مات بێت و بانگدەرەکەیش دەنگی زوڵاڵ بێت.

چونکە قورئان فەرموویەتی:

﴿إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾ (الجمعة/٩)

(کە گوێتان بە بانگەوە بوو بە خێرایی بچن بەدەم نوێژ و زیکری خوداوە)، وە درووستە نەیەن بۆ جومعە ئەگەر باران هەبوو، یان لیتاوو قوڕاو ڕێگەی گرتبوو، یان کاتی ترس و بیم، یان لەبەر نەخۆشین ، یان بەلای نەخۆشێکەوە بێت کە کەسی تری نەبێت بەلایەوە بێت.

ئەوانەش کە بەهانەی شەرعییان بەدەستەوەیە، سوننەتە بۆیان نوێژی نیوەڕۆ دوا بخەن، تا خەڵکەکە لە جومعە لێدەبنەوە، وە ئەگەر نەخۆش و کەسێکی سەفەری و بەندە و ژن ئامادەی نوێژی جومعەبوون، ئەوا جومعەکەیان دروستەو لە بری نوێژی نوێەڕۆ دەکەوێت بۆیان.

وە خودای گەور زانایە بەسەر هەمووشتێکدا.

# ڕونکردنەوەی ئادابەکانی جومعە
# بە پێی ڕیزبەندییەك کە لەسەری دامەزراوە
# کە لە دە(١٠) ڕستە دا کۆدەبنەوە

**یەکەم:** لە ڕۆژی پێنج شەممەوە دەبێت خۆیی بۆ ئامادە بکات، وە پێشوازی لە خێر و فەزیلەت و گەورەییەکانی بکات، خۆی سەرقاڵی دۆعا و پاڕانەوەو داوای لێخۆش بوون لە خودا و تەسبیحات بکات، هەر لە دوای نوێژی عەسری ڕۆژی پێنج شەممەوە، چونکە ئەوساتەیەش لە خێر و گەورەییدا وەك ئەو ساتە نادیارەی ڕۆژی جومعە دانراوە.

هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە: خودای گەورە جگە لە بەخشینی ڕۆزی بەسەر بەندەکانیدا، زیادە لوتف و فەزڵێکی هەیە نایدات بەهێچ کەسێك، مەگەر بەوانە نەبێت کە لە ئێوارەی پێنج شەممە و ڕۆژی جومعەدا داوا لە خودا بکەن.[1]

وە بۆ خۆئامادەکردن بۆ ڕۆژی جومعە، با بەرگەکانی بشۆرێت و سپییان بکاتەوە، وە بۆنی خۆش ئامادەبکات ئەگەر نەیبێت، وە دڵی خۆی لە کارو باری تر خاڵی بکات، تا بتوانێت بە زویی بڕوات بۆ نوێژی جومعە، وە لەشەوی جومعەدا نیيەتی ڕۆژوی ڕۆژی جومعە بهێنێت، چونکە بەڕاستی خێر و فەزڵێکی زۆری هەیە، بەڵام بیخاتە پاڵ ڕۆژوی پێنج شەممە یان شەممەوە، چونکە بەتەنها ڕۆژوگرتنی جومعە باش نییەو ناپەسەندە.

وە هەوڵبدات شەوەکەی بە بەندایەتی و شەونوێژ و خەتمی قورئان بەرێتە سەر چونکە خێرێکی زۆری هەیە و خێری ڕۆژی جومعەش ڕادەکێشێت بەسەری دا.

---

(١) قوت القلوب،١/٦٦.

وە باشترو وایە لە شەو و ڕۆژی جومعەدا دروست ببێت لە گەڵ خێزانیدا،

هەندێك لە زانایان ئەمەیان بەلاوە پەسەندە و ئەم فەرموودەی پێغەمبەرەیان بەو واتایە لێك داوەتەوە: ((**رَحِمَ اللهُ مَنْ بَكَّرَ وابتَكَر وغَسَّلَ واغتَسَلَ**))[1]، ڕەحمەتی خودا لەو كەسەی بەیانی زوو خۆی ئامادەدەكات و زوتر دەكەوێتە ڕێ بۆ جومعە و خۆی بشوات و بەرگی بشوات و دەستنوێژ بگرێت و خێزانەكەیشی هان بدات لە سەر خۆشۆردن و ئامادەباشی، وە هەندێكیش دەڵێن: بەواتای شۆردنی بەرگ و شۆردنی جەستەو لاشەیەتی.

بەم شێوە یە ئادابەكانی پێشوازی لە جومعە تەواو دەبێت، وە لە كۆمەڵی بێ ئاگا و غافلان دەردەچێت، كە ئەو ڕۆژەیان لەسەر هەڵدێت و دەڵێن: ئەمە چ ڕۆژێكە؟

هەندێك لە پێشینە صاڵحەكان دەفەرموون:

ئەو كەسە لە هەموان بەشی زیاتر هەیە لە ڕۆژی جومعەدا، كە هەر لە دوێنێوە چاوەنواڕی و چاودێری بكات و مافەكانی جێ بەجێبكات، وە ئەوەش لە هەموان بێ بەش ترە ئەو كەسەیە، كە بەیانی جومعەی لێداهات دەڵێت: ئەمە چ ڕۆژێكە؟، بۆیە هەندێك لە خودناسان شەوی جومعەیان تەرخان

---

(١)لم أجده بهذا اللفظ والذي عند أحمد بسند جيد وأرباب السنن أبوداوود(٣٤٥)، والنسائي(٩٥/٣)، وابن ماجه(١٠٨٧)، وابن حبان والحاكم وصححه وتعقب، والطبراني في الكبير وحسنه الترمذي(٤٩٦) والدارمي وابن أبي شيبه وابن سعد وابن زنجويه وابن خزيمه والطحاوي وابي يعلي والباوردي وابن قانع وابي نعيم والبيهقي والضياء عن أبي الاشعث الصنعاني عن اوس بن اوس الثقفي رضي الله عنه رفعه بلفظ:

**(مَن غسَل يوم الجمعه واغتسلَ ثم بكَّر وابتكَر ومشَى ولم يركَب ودنا من الامام واستمَع وانصتَ ولم يلْغَ، كان له بكلِّ خَطوةٍ يخطوها من بَيته إلى المسجد عملُ سنةٍ أجرُ سنةٍ صيامُها وقيامُها)**، الإتحاف٢٤١/٣.

دەکرد و لە مزگەوتدا دەمانەوە بۆ ئەوەی لە حاڵەتی ئامادەباشی دابن.[1]

**دووهەم:** کاتێك ڕۆژی لێ دەبێتەوە، با دوای گزنگی بەرەبەیان خۆی بشۆرێت، بەڵام ئەگەر زۆر زوو ناڕوات بۆ مزگەوت، با ئەو کاتە خۆی بشوات کە نزیکە لە ڕۆیشتنەوە، بۆ ئەوەی لە پاکترین کاتی دا بچێتە ناو مزگەوتەوە،خۆشۆردن زۆر باش و خێردارەو دووپاتی لەسەر کراوەتەوە، بەڵکو هەندێك لە زانایان بە پێویستیان داناوە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((غسْلُ يَومِ الجُمعةِ واجبٌ علَى كلِّ مُحتَلِم))** [2]،

واتە پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە باڵغ دەبێت خۆی بشوات.

وە ئەوەی لەحەدیسی نافیعەوە مەشهوورە: کە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەری گێڕاوەتەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) :

**((مَنْ أتَى الجُمُعةَ فليَغْتَسِل))**[3]،

ئەوەی کە بیەوێت بێت بۆ جومعە با پێشتر خۆی بشوات، وە هەروەها بەڵگە لەسەر پێویستی خۆشۆردن بۆ جومعە، ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

---

(١) قوت القلوب١/٧٠، بۆ هەردوو بابەتەکە هەمان سەرچاوە.

(٢)أخرجه البخاري(٨٥٨) ومسلم(٨٤٦) وأبو داود والنسائي إلا أنَّ البخاري قال: عن عمرو بن سليم قال أشهد على أبي سعيد قال: أشهد عَلى رسُول الله ﷺ قال: **الغسل يوم الجمعه واجب على كل مُحتلم** .

(٣)هذا لفظ ابن حبان، وأخرجَه الطبراني في الكبير من حديث ابن الزبير وأخرجه ابن ابى شيبه والترمزي وابن ماجه من حديث ابن عمر واخرجه البزار من حديث بريده، والخطيب من حديث انس واخرجه البخاري ومسلم بلفظ: **(من جاء منكم الجمعه فليغتسل)**، البخاري (٨٧٧) ومسلم (٨٤٤) الإتحاف٣/٢٤١، وإحياء علوم الدين تحقيق دار المنهاج.

((مَن شَهِدَ الجُمُعةَ مِنَ الرِّجالِ والنِّساءِ فليَغتَسِل))[1] (پیاوو ژن ئەگەر ئامادەی جومعە بوون با خۆیانی بۆ بشۆن) وە کاتی خۆی حاڵی ئەهلی مەدینەیی وابوو، ئەگەر دوو کەس قسەیان بەیەکتری بووتایە، یەکێکیان بەویانی دەووت: تۆ لەو کەسە خراپتریت کە بۆ نوێژی جومعە خۆی ناشۆرێت![2].

هەروەها (حەزرەتی) عومەر فەرمووی بە (حەزرەتی) عوسمان (خودایان لێ ڕازی بێت) کاتێك هاتە ژورەوە ئەو وتاری دەخوێندەوە، فەرمووی:

ئالەم کاتەدا دێیت؟ فەرمووی: هەرکە گوێم لێ بوو بانگی دا، دەستنوێژم گرت و دەرچووم، فەرمووی: دەستنوێژیشت گرتووە، ئەمەش یەکێکی تر، کە دەشزانیت پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بە خۆشۆردن داوە بۆ جومعە؟!

کەواتە بەوەشدا کە (حەزرەتی) عوسمان (خودای لێ ڕازی بێت) خۆی نەشۆردووە، کەواتە درووستە خۆی نەشۆرێت، وە بەوەش کە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی:

((مَنْ توَضَّأ يَومَ الجُمُعَةِ فبِهَا ونِعِمَّتْ، ومِنْ اغتَسَلَ فالغسلُ أَفضَلُ))[3]،

ئەوەی لە ڕۆژی جومعەدا دەستنوێژێکی بۆ بگرێت، ئەوا کارێکی باش و پیرۆزی کردووە، وە ئەو کەسەش کە خۆی بشوات ئەوە باشترەو خێری زیاترە.

---

(١)أخرجه ابن حبان في الصحيح والبيهقي في السنن الكبرى(١/٢٩٩) من طريق عثمان بن واقد عن نافع عن ابن عمر بلفظ: **من أتى** وفى اخره زياده **ومن لم ياتها فليس** ، وابن أبي شيبة في المصنف(٥٠٣٩) عن أبي البحتري رحمه الله،

(٢) رواه البخاري (٨٧٨)، ومسلم(٨٢٥).

(٣)أخرجه أحمد وابن أبي شيبه والدرامي وأبو داود(٣٥٤) والترمذي(٤٩٧) وحسَّنه والنسائي(٩٤/٣) وابن ماجه(١٠٩١) وابو يعلي وابن جرير في تهذيبه وابن خزيمه في صحيحه والطحاوي والبيهقي وابن النجار والطبراني في الكبير.

وە هەرکەسێك لەشی قورس بێت، با لەپێشەوە نییەتی وسڵی جەنابەت بهێنێت و، لە پاشان جارێکی تر ئاو بکات بە جەستەی دا، بە نییەتی خۆشۆردنی جومعە، ئەگەر ویستی بەیەك خۆشۆردن هەردوو وسڵەکە بکات، ئەوا یەکجار بەسیەتی، وە خێریشی دەست دەکەوێت ئەگەر نییەتی هەردوکیانی هەبێت، ئەوکاتە وسڵی جومعە دەچێتە ناو وسڵی جەنابەتەکەوە.

صەحابییەك چووە لای کوڕەکەی کە خۆی دەشۆرد، فەرمووی پێی:

ئەوە بۆ جومعەیە؟ دەڵێت: نەخێر بۆ خۆپاککردنەوەیە لە لەشپیسی، فەرمووی: دەی جارێکی تر خۆت بشۆرەوە (بە نییەتی وسڵی جومعە)، وە ئەو فەرموودەی بۆ گێڕایەوە دەربارەی خۆشۆردنی جومعە، کە پێویستە لەسەر هەرکەسێك کە ئیحتیلامی بوبێت، دیارە بۆیە ئەو فەرمانەی پێداوە کە دووبارە خۆی بشواتەوە، چونکە دەزانێت پێشتر ئەو نییەتەی نەبووە.[1]

وە دوور نەبوو کە بووترێت: مادەم مەبەست پاك وخاوێنییە، خۆ بەبێ نییەتیش هاتە دی، بەڵام ئەوە بەسەر دەستنوێژیشدا دێتەجێ، بەڵام دەستنوێژیش دەبێت مەبەستی نزیکبوونەوە لە خوداو دەسکەوتی خێر و چاکە بێت، نەك تەنها پاکو خاوێنی، کەواتە پێویستە بەدوای فەزیلەت و خێرەکەشدا بگەڕێت.

وە هەرکەسێك خۆی بشوات و لەپاشان بێ دەستنوێژی بەسەردا بێت، ئەوە دەستنوێژ دەگرێتەوەو وسڵەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام چاکتر وایە کە خۆی لەمە بپارێزێت.

**سێیەم: جوانکاری**، ئەمەش کارێکی باشە لەم ڕۆژەدا خۆی بە جوانی دەربخات، ئەمەش بە سێ شت دەبێت: بە پۆشاك و پۆشتەیی و پاکوخاوێنی و

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في المصنف(٥٠٩٧)، وە صەحابییەکە ئەبو قەتادە بووە.

بۆنخۆشی، پاکو خاوێنیش به سیواککردن و تاشینی مووەزیادەکان و نینۆککردن و، کورتکردنەوەو بەرسمێڵ کردن و، هەموو ئەوانەی تریش کە لە پەڕاوی تەهارەتدا باسیان کرا.

(حەزرەتی) عوبدوڵلای کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: هەرکەسێك نینۆکەکانی لە ڕۆژی جومعەدا بکات، خودای (عَزَّ وجَلْ) دەردو نەخۆشییەکی لێ دووردەخاتەوە و، شیفا و لەش ساغییەکیشی بۆ دەنێرێت[1]،

ئەگەر لە پێنج شەممە یان چوارشەممەدا چوبێتە ناو گەرماوەوە، ئەوە مەبەستەکەی هاتۆتەدی.

با لەو ڕۆژەدا بە بۆنخۆشترین عەتر خۆی بۆنخۆش بکات، بۆ ئەوەی زاڵ ببێت بەسەر بۆن و بەرامێکی نەخوازراودا ئەگەر هەیبێت، وە ئەو بۆن و بەرامە خۆشەیش بگەیێنێت بە لووت و دەماخی ئامادەبواندا، لەوانەی کە نزیکی دانیشتوون.

وە خۆشترین بۆنی پیاوان ئەوەیە: کە بۆنە خۆشەکەی بڵاو ببێتەو و ڕەنگەکەیشی شاراوە بێت(وەك میسك و عەنبەر)، بەڵام بۆنی خۆشی ئافرەتان ئەوەیە: کە ڕەنگەکەی دیار بێت و بۆنەکەیشی شاراوە بێت، (وەك زەعفەران و هاووێنەکانی)، ئەم باسەیە لە ئەثەری پیرۆزدا هاتووە [2]

لەم بارەوە ئیمامی شافیعی فەرموویەتی:

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في (المصنف) (٥٦١٦)، وهو عند عبدالرزاق في المصنف(١٩٩/٣ مرفوعا.

(٢)أخرجه أبوداود(٤١٧٤) و الترمذي(٢٧٨٧) في الاستئذان و حسنه و النسائي(١٥١/٨) عن أبي هريرة و العقيلي و العراقي و الضياء و البزار عن أنس و رجال البزار رجال الصحيح. و أخرجه ابن عساكر عن يعلي بن مرة الثقفي و العقيلي عن أبي عثمان مرسلا و قال هو أصح .و أخرجه أحمد و مسلم و أبو داود و النسائي من حديث أبي سعيد **أطيب المسك**، الإتحاف ٢٥٢/٣.

هەرکەسێك بەرگەکەی پاك کاتەوە، خەم و مەراقی کەم دەبێتەوە، وە ئەو کەسەی بۆنی خۆشی لێ بێت، ئەوە ئەقڵی زیاد دەبێت.[١]

دەربارەی بەرگ و پۆشاکیش سپییەکانیان لە هەموویان خۆشەویسترە، چونکە سپی بەلای خوداوە ﷻ لە هەموو ڕەنگەکان پێی خۆشترە.[٢] وە نابێت بەرگێك لەبەر بکات بۆ ناوبانگ و شۆرەت پەیداکردن، وە سوننەت نییە پۆشینی بەرگی ڕەش، وە هیچ فەزڵ و خێرێکی تێدا نییە، بەڵکو کۆمەڵێك لە زانایان بەلایانەوە کەراهەتی هەیە کە سەیری بەرگی ڕەشیش بکرێت، چونکە بیدعەیەکی پەیدابووی دوای چەرخی پێغەمبەرە ﷺ .

وە سوننەتە لەم ڕۆژی جومعەدا مێزەر(عەمامەی) لەسەر بێت.

واثیلەی کوڕی ئوسقوع گێڕاویەتیەوە کەوا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( إن اللهَ وملائكتَهُ يُصَلُّونَ علَى أَصْحابِ العَمَائم)) [٣]،

---

(١) رواه ابن الجوزي في (الصفوة)٢/١(١٥٢)، ورواه أبو نعيم في الحلية ١٨٤/٥) عن مكحول.

(٢)قد روي أحمد و النسائي(٢٠٥/٨) مرفوعا، و الحاكم من حديث سمرة بن جندب: **عليكم بالبياض من الثياب فليلبسها أحِبَّاؤُكم و كفِّنوا فيها مَوتاكم، فإنها من خير ثيابِكُم. و لفظ الحاكم عليكم بهذه الثياب البياض** و قال علي شروطها

(٣)هكذا أورده صاحب القوت ونصه: **واستحب العمامة يوم الجمعة**، وقدروينا فيها حديثا ساميا عن واثلة بن الأسقع فساقه وقال العراقي رواه الطبراني وابن عدوي وقال منكر من حديث أبي الداود ولم اراه من حديث واثلة، الإتحاف ٣/-٢٥٤٢٥٢. وقال: قد روي الطبراني في المعجم الكبير من طريق بشر بن عون عن بكار بن تميم عن مكحول عن واثلة رفعه: **أنَّ الله يبعث الملائكة يومَ الجمعة علي أبواب المساجد فساقة**. فيحتمل أن يكون هذا الحديث أيضا من طريقه، ثم قال المصنف تبعا لصاحب القوت في سياقة، **قال النووى ويستحب للإمام أن يزيد في حسن الهيئة، ويتعمم ويرتدى اهـ . وتحصل السنة بكورها على الرأس أو على قلنسوة تحتها، والأفضل كبرها، وينبغي طولُها وعرضها بما يليق بلابسها في زمانه**

(واته:خوداو مەلائیکەکانی ڕەحمەتی بەردەوام لە ڕۆژی جومعەدا دەڕێژن بەسەر خاوەن عەمامەو مێزەرەکاندا) ئەگەر گەرما زۆری بۆ هێنا ئەوە قەیناکات پێش نوێژ یان دوای نوێژ دایبکەنێت، بەڵام ئەو کاتە دای نەکەنێت لەسەری کە خەریکی ڕۆشتنە لەماڵەوە بۆ مزگەوت، هەروەها لە کاتی نوێژیشدا داینەکەنێت، وە نابێت ئیمامیش لەکاتی چوونە سەر میمبەردا لەسەری دایبکەنێت. وە لە کاتی وتاریشدا.

**چوارەم:** زوو ڕۆشتن بۆ مزگەوت، وە باشتر ئەوەیە کە لە فەرسەخێك ڕێوە (واتە نزیکە شەش کیلۆمەتر) یان دوو یان سێ فەرسەخەوە بکەوێتە ڕێ و لە سەرەتای ڕۆژەوە بڕوات، وە کاتی ڕۆشتن لە گزنگی بەرەبەیانەوە دەست پێ دەکات و ئەو زوو ڕۆشتنەش گەورەییەکی زۆری هەیە.

---

ومكانه. فان زاد على ذلك كره، وقد وردت في فضل العمائم آثار منها: أخرجهُ الديلمي في الفردوس من حديث ابن عباس: **العمائم تيجان العرب فاذا وضعوا العمائم وضعَ اللهُ عِزَّهم)**، وفي رواية: **فاذا وضعت العرب عمائمها وضعت عزها**، وفي طريقه عتاب بن حرب قال الغلاس ضعيف جدا، وأخرجه ابن السني ايضا وفي سنده عبدالله بن حميد وهو ضعيف ايضا واخرج ابو نعيم من حديث علي: **العمائم تيجانُ العرب، والاحتباءُ حيطانها وجلوس المؤمن في المسجد رباطه**. وفيه حنظلة قال الذهبي تركه القطان وضعفها النسائي، وأخرج البارودى من حديث ركانة بن يزيد: **العمامة على القلنسوة فصل ما بيننا وبين المشركين، يعطى يوم القيامة بكلّ كورة يدورها على رأسه نوراً**، وركانة من مسلمة الفتح وليس له إلاّ هذاالحديث كما في التقريب، وأخرج الطبراني في الكبير من حديث ابن عمر والبيهقي من حديث عبادة: **عليكم بالعمائم فانَّها سيما الملائكة، وأرخوا لها خلف ظهوركم**، وأخرج الطبراني في الكبير من طريق محمد بن صالح الوليد عن بلال بن بشير عن عمران بن تمام عن أبي حمزة عن ابن عباس رفعه: **اعتمُّوا تزدادوا حلماً، واخرجه الحاكم في اللباس من طريق عبيدالله بن أبي المليح عن ابن عباس وقال الحاكم صحيح**، وردّه الذهبي وقال عبيدالله تركه أحمد وغيره، وأورده إبن الجوزي في الموضوع. **وتعقبه الحافظ السيوطي في اللاني المصنوعة، وبالجملة فالحديث ضعيف وأما كونهُ موضوعاً ممنوع.**

وە پێویستە لە ڕۆشتنەکەیدا بە هێمنی و گەردنکەچی و خشووعەوە بچێت بۆ مزگەوت، نییەتی مانەوەی ناو مزگەوت بهێنێت، مەبەستی بە دەنگەوە چوونی بانگەوازی خودایی بێت، کە بۆ جومعە بانگی کردووە، وە خێرا بکات لە چوون بەدەم لێبوردەیی و ڕەزامەندی پەروەردگارەوە.

وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**مَن راحَ إلى الجُمُعةِ في السَّاعةِ الأولى فكأَنَّما قرَّب بدَنةً، و مَن راحَ في الساعةِ الثانيةِ فكأنَّما قرَّب بقرةً، و من راحَ في الساعة الثالثةِ فكأنَّما قرَّب كَبْشاً أقرَن، و منَ راحَ في الساعةِ الرابعةِ فكأَنَّما قرَّبَ دجاجةً، و مَن راحَ في الساعَة الخامِسة فكأنَّما أهدى بَيضةَ، فإذا خَرج الإمامُ طُويَت الصُّحُف و رُفِعَتِ الأقلامُ و اجتَمعَتِ الملائِكَة عند المِنبَر يَستَمِعُون الذِكرَ، فمَن جاءَ بعدَ ذلِكَ فإنَّما جاءَ لحَقِّ الصَّلاةِ لَيسَت لهُ مِنَ الفَضلِ شَئ**)).[1] (واتە: ئەوەی سەعاتی یەکەم بچێت بۆ جومعە وەك ئەوە وایە کە وشترێکی نێر یان مێی لەبەر ڕەزای خودا کردبێتی بە صەدەقە، ئەوەی کە لە سەعاتی دووهەمدا بچێت وەك ئەوەیە کە مانگایەکی کردبێت بە خێر، ئەوەی سەعاتی سێیەم بچێت، وەك بەرانێکی شاخداری کردبێت، ئەوەی سەعاتی چوارەم بچێت، وەك ئەوەیە کە مریشکێکی خێر کردبێت، ئەوەش کە سەعاتی پێنجەم بڕوات وەك ئەوەیە کە هێلکەیەکی کردبێت بە خێر، ئەگەر ئیمام دەرچێت بەرەو شوێنی مزگەوت،ئەوا پەڕاوو صەحیفەکان کە ناو نوسیان تێدا دەکرێت دەپێچرێنەوە، وە قەڵەمەکان هەڵدەگیرێن و مەلائیکەکانیش لای میمبەرەکەدا کۆدەبنەوەو، گوێ لە زیکرەکە دەگرن، هەرکەسێکیش دوای ئەمە بێتە ناو مزگەوتەوە، تەنها بۆ نوێژەکە دێت و، هیچ ماف و خێرێکی تری ناگات).

---

(١)اخرجه البخاري(٨٨١) و مسلم(٨٥٠) من حديث أبي هريرة و ليس فيه و رفعت الأقلام و هذه اللفظة عند البيهقي في السنن الكبرى. من رواية عمر بن شعيب عن ابيه جده، ولفظ المصنف من قوت القلوب١/٦٤.

کاتژمێری یەکەم تا هەڵاتنی خۆر. وەکاژێری دووهەم تا بەرزبوونەوەی ڕۆژە، وە سێیەم تا پەخش بوونەوەی خۆرە بەسەر زەویدا، بەو شێوەی کە پێکان بە تینی هەتاو گەرم دادێن، چوارەم و پێنجەم دوای چێشتەنگای باڵایە تا کاتی زەوال و ترازانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، وە خێری ئەم ساتەیە کەمە، وە کاتی زەوال سەرەتای کاتی نوێژە، وە ئیتر هیچ خێر و فەزیلەتێکی زیادەی تێدا نییە.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((ثَلاثٌ لَو يَعلَمُ الناسُ ما فيهِنَّ لرَكضُو الإبلَ في طَلَبِهِنَّ: الأذانُ و الصَفُّ الأوَّل و الغُدو إلى الجُمعَة))**[1]،

(سێ خەصڵەت و چاکە هەیە ئەگە خەڵکی بیانزانیبایە چەندێك خێریان تێدایە، ئەوا بە خێرایی بە سواری وشتریش بایە خۆیانیان پێ دەگەیاند، کە بانگ دان و ڕیزی یەکەمی جەماعەت و زوو ڕۆشتنە بۆ مزگەوت.

وە ئیمامی ئەحمەد (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

گەورەترینیان زورڕۆشتنە بۆ نوێژی جومعە .

وە لە فەرموودەدا هاتووە:

**((إذا كانَ يومُ الجُمعةِ قعدَتِ الملَائكةُ على أبوابِ المساجِد بأيديهِم صُحفٌ مِن فِضةٍ و أَقلامٌ مِن ذَهبٍ يكتُبونَ الأَوَّل فالأَوَّل علَى مَراتِبِهِم))**[1]

(واتە: ئەگەر ڕۆژی هەینی هاتە پێشەوە فریشتەکان لەبەر دەرگای مزگەوتەکان

---

(١)قال العراقي أخرجه أبو الشيخ في ثواب الأعمال من حديث ابى هريرة **ثلاثٌ لَو يعلمُ الناس مافيهنَّ ما أخذَت إلاَّ بالاستهامِ عليها للخير و البرّ الحديث** ، و قال: **و التهجير إلى الجُمُعة** . الإتحاف ٢٥٧/٣. وهو بلفظه عند صاحب القوت:٦٤/١. قال وروينا في خبر مقطوع عن النبي ﷺ . وذكره مع قول أحمد الآتي. وفي البخاري(٦١٥)، مسلم( ٤٣٧): **لو يعلم الناس ما في النداء والصف الأول، ثم لم يجدوا إلاَّ أن يستهموا لاستَهموا، ولو يعلَمون ما في التهجير لاستَبَقوا إليه**. قال الزبيدي٢٥٧/٣: هو في تأريخ ابن النجار كما في جامع الأحاديث للسيوطي ١٥٠/٤، من حديثه بنحوه.

دادەنیشن، چەندین پەڕاوی تایبەتیان پێیە لە زیو دروستکراون و، قەڵەمی ئاڵتونیشیان پێیە، بە پێی ڕیزبەندی هاتنەکانیان و بە پێی پلەکانیان یەکە یەکە ئەوانە دەنووسن کە دێن بۆ مزگەوت)

وە لە ئەسەر و هەواڵێك دا هاتووە:

**((إنَّ الملائكةَ يتفقَّدُون العَبدَ إذا تأَخَّر عَن وَقتهِ يَومَ الجُمعَة، فيَسألُ بعضُهُم بَعضاً عنه، مافعَلَ فُلانٌ، و ما الذي أخَّرَهُ عَن وقتهِ؟ فيَقولون: اللَّهُم إن كانَ أخَّرهُ فَقرٌ فاغْنِه، و إن كانَ أخَّرَه مَرَضٌ فاشفِه، وإن كانَ أخَّرهُ شغلٌ ففَرِّغهُ لعِبادَتِكَ، وإن كانَ أخَّرهُ لهْوٌ فاقبِلْ بِقَلْبِهِ إلى طاعَتِك))**[٢]،

---

(١)قال العراقي أخرجه ابن مردويه في التفسير من حديث علي باسناد ضعيف: **إذا كان يَومُ الجمُعةِ نزلَ جبريل فركز لواءه بالمَسجدِ الحَرام، و غَدا سائرُ الملائكةِ إلى المساجدِ التى يُجمَع فيها يوم الجمعة، فركَّزوا ألويتَهم وراياتَهُم بأبواب المَساجدِ، ثُمَّ نشَروا قَراطيس مِن فِضَّةٍ و أقلاماً مِن ذهَب** اهـ. قال الزبيدي:٣/٢٥٩: و أخرجه أبو نعيم في الحلية من حديث ابن عمر بلفظ: **إذا كان يوم الجمعة بعثَ الله ملائكةً بصحُفٍ مِن نور، و أقلامٍ من نُور**... الحديث، و أما صَدرُ الحديث ففي الصحيحين من حديث أبي هريرة بلفظ: **إذا كان يوم الجمعه قعدتِ الملائكةُ على باب المسجد يكتُبون الأَوَّلَ فالأَول، كما تقدَّم**..ورواية صحف من فضة ...عند ابن عساكر في تأريخ دمشق(٤٣/١٤٢).

(٢)هكذا نقلهُ صاحب القوت و قال العراقي أخرجهُ البيهقي في السنن الكبرى(٢/٢٢٦(٥٦٥٦) من رواية عمرو بن شعيب عن أبيه عن جدِّه مع زيادة و نَقص بإسناد حسن. واعلم أن المصنف ذكر هذا أثرا، فإن لم يرد به حديثا مرفوعاً فليس من شرطنا وإنَّما ذكرناه احتياطا اهـ . قال الزبيدي٣/٢٥٩: كذا في بعض نسخ الكتاب و في الآثار، ووجد في بعضها وجاء في الخبر ومثله في القوت (١/١١٨) و الحديث قد أخرجه ابنُ خزيمة في الصحيح(٣/١٣٤(١٧٧١)، من هذا الطريق بلفظ:

**(فيقول بعضُ الملائكةِ لبعضٍ ماحبسَ فلانا فتقولُ: اللَّهُم إنْ كانَ ضالاً فاهدِهِ وإن كانَ فقيراً فاغنهِ، وإن كانَ مريضاً فعافهِ.)**

(واتە: فریشتەکان لە ڕۆژی جومعەدا بەدوای ئەو بەندانەی خودادا دەگەڕێن، کە لەکاتی خۆی دوادەکەون، هەندێکیان پرسیار لە یەکتر دەکەن:

ئەوە فلان کەس چی بەسەرهاتووە، چی دوای خستووە لە هاتن؟ لە پاشان نزای بۆ دەکەن و دەڵێن: خودایە ئەگەر هەژاری ڕێگری کردووە لە هاتن دەوڵەمەندی بکە، وە ئەگەر نەخۆشی دوای خستووە چاکی بکەرەوە، وە ئەگەر سەرقاڵی و فرمانێك دوای خستووە، ئەوا دەستی بەتاڵ بکە بۆ ئەوەی کە بەندایەتیت بکات، وە ئەگەر گەمەو گاڵتە دوای خستووە، ڕوی دڵی بخەرە خۆت با گوێڕایەڵیت بکات).

کاتی خۆی لە سەدەی یەکەمدا و، لە سەحەر و گزنگی بەرەبەیاندا سەیری ڕێگات بکردایە، پڕی بوو لە خەڵکو بە چرای داگیرساوەوە جمەی دەهات، وەك ڕۆژانی جەژن ئەو ناوەیان ئاوەدانکردبوو، ڕێ بەر ڕێدارنەدەکەوت، تا مخابن ئەو قەرەباڵغییە نەماو پوکایەوە، وەك وتراوە یەکەمین بیدعە سەری هەڵدا لە ئیسلامدا، وازهێنانی ئەو خەڵکەبوو لە زوو هاتن بۆ مزگەوتەکان[1].

چۆن دەبێت بڕواداران شەرم لە خۆیان نەکەن، کە جولەکەو گاورەکان بەیانیان زوو دەڕۆن بۆ دێر و کڵێساو مەعبەدەکانیان و، دونیا ویست و بازرگانەکانیش چۆن بەیانیان زوو دەچن بۆ ناوەندی بازاڕەکان، بۆ کڕین و فرۆشتن و قازانجی دونیایی؟! ئەی بۆچی ئەوانەی کە ڕێگای ئاخیرەتیان گرتۆتەبەر هیچ کێ برکێ و پێشڕەوییەکیان لەگەڵدا ناکەن؟!

وەك دەڵێن: ئەو خەڵکە لە نزیکبونەوەیان بۆ ژێر سایەی نەزەری پەروەردگاریان ﷻ بە ئەندازەی خێرایی و زووڕۆشتنیانە بۆ جومعەکانیان. جارێکیان (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (خودای لێ ڕازی بێت) خێرایی

---

(١) قوت القلوب١/٧٠.

کردوو چووه ناو مزگەوتەوە، کە بینی سێ کەس پێشی کەوتوون، زۆر دڵگرانی بۆهات، ئیتر هەروا لۆمەی خۆی دەکرد و بە خۆیی دەوت:

چوارەمی چوار کەس، هەرچۆنێك بێت چوارەمیش ئەوەندە دوور نییە.[١]

**پێنجەم:** لە باسی چۆنیەتی چوونە ناو مزگەوت، کە نابێت بەسەر گەردن و شانی خەڵکیدا پێ هەڵبێنێتەوە، وە نابێت لەبەردەمیشیاندا بڕوات، خۆ ئەگەر زووتر بڕوات ئەم کارەی بۆ ئاسان دەکات، چونکە بەڕاستی هەڕەشەیەکی سەخت هەیە دژ بەو کەسانەی کە بەسەر ملی خەڵکی دا دەڕۆن، ئەویش ئەوەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەیکەن بە پردێك و بەسەری دا خەڵکەکە لە دوا ڕۆژدا تێدەپەڕن بە سەریدا[٢]،

---

(١)وهذه القصة والحديث ذكرهما ابن ماجه(١٠٩٤) في السنن فقال حدثنا كثير بن عبيد عن عبد المجيد بن عبد العزيز فوجد ثلاثة نفر سبقُوه فقال: رابع أربعة وما رابع أربعة ببعيد، إني سمعت رسول الله ﷺ يقول: **(إنَّ الناس يجلسُون من الله تعالى يوم القيامة قدر رواحهم إلى الجُمعة، الأول والثاني والثالث، ثم قال: رابعُ أربعةٍ وما رابعُ أربعَةٍ ببعيد)**. وعبد المجيد ابن أبي رواد ثقةٌ خرَّج له مُسلم، والأربعة، الإتحاف ٢٦٠/٣.

(٢) رواه الترمذي وابن ماجه، قال العراقي أخرجه الترمذي(٥١٣) وضعفه وابن ماجه(١١١٦) من حديث معاذ بن أنس اه قلت وأخرجه أيضا أحمد في مسنده(١٥١٨٢)والطبراني في الكبير (١٨٩/٢٠)((٤١٨)والبيهقي فيشعب الإيما(١٠١/٢)(٣٠٠٠) كلهم من طريق سهل بن معاذ بن أنس عن أبيه ولفظهم جميعاً: **(من تخطَّى رقابَ الناس يوم الجمعة اتخذ جِسراً إلى جنَّهم)**، وقال الترمذى بعد ما أخرجه سعد ،غريب ضعيف فيه رشدين بن سعد ضعفوه اهـ وتبعه عبد الحق وأورده الديلمي في الفردوس(٥٥٥/٣)(٥٧٤١)، بلفظ: **(من تَخطَّى رقبة أخيه المسلم جعلهُ الله يوم القيامة جسراً على باب جهنم للناس)**، و أخرجه أبو بكر بن أبى شيبة فى المصنف(٤٧٣/١)(٥٤٧٤)، عن القاسم بن مخيمرة قال: **(يتخطى رقاب الناس يوم الجمعة والامام يخطبُ كالرافع قدَمه في النَّار وواضعها في النار)** ، وأخرج الطبراني في الكبير (٦٣/٩)(٨٣٩٩)، من حديث عثمان بن الأزرق : **(من تخطى رقاب**

وه ئیبن و جورەیج حەدیسێکی (مورسەل) دەگێڕێتەوە:

کە پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك وتاری ئەدا لە ڕۆژی جومعەدا، بینی پیاوێك بەسەر شانی خەڵکەکەدا تێدەپەڕی و تا هاتە پێشەوەو دانیشت، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، خۆی خستە بەرامبەری پیاوەکەوە تا پێی گەیشت، فەرمووی: ئەی فلان؛

چی ڕێگری لێ کردیت کە ئەمڕۆ لە گەڵ ئێمەدا جومعە بکەیت؟

فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا: خۆ من جومعەم لە گەڵ ئێوە کرد، فەرمووی: ئەی من تۆم نەبینی بەسەر ملی خەڵکیدا تێدەپەڕیت؟![1] هێمای کرد بەوەی کە خێری هاتنەکەی بەتاڵ بووەتەوە، چونکە ئەزێتی خەڵکی داوە.

وە لە فەرموودەیەکدا کە سەنەدی خۆبی هەیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((ما مَنَعَك أَنْ تُصلى مَعَنا، قال: أَوَلَم تَرَني فقالَ: رأيتك تأَنَّيْتَ وآذَيْتَ))**[2]،

ئەوە چی ڕێگەی لێ گرتیت کە لەگەڵ ئێمەدا نوێژ بکەیت؟

فەرمووی: ئەی منت نەبینی ئەی پێغەمبەری خودا؟

---

**الناس بعد خروج الإمام أو فرّق بينَ اثنين كان كجار قصبه في النار)**، الإتحاف ٢٦٠/٣وانظر تحقيق الإحياء من قبل علي محمد و سعيد المحاسبيّ/٥٣٥.

(١)هكذا هو في القوت(٦٥/١) وقال الحافظ العراقي أخرجه ابن المبارك في كتاب الرقائق الإتحاف ٢٦١/٣،

(٢)قال العراقى أخرجه أبو داود والنسائى وابن حبان والحاكم من حديث عبد الله بن بسر مختصرا اه . قلت ورواه أيضا بن ماجه وصححه هو والحاكم وفي الطبراني:

**(قال لرجل رأيتك تتخطى رقاب الناس وتؤذيهم. من آذى مسلما فقد آذانى ومن آذانى فقد آذى الله).**

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بەڵێ تۆم بینی دواکەوتیت لەوەی کە زوو بێیت و ئامادە ببیت، وە ئەزێتی ئامادەبووەکانیشت دا.

وە هەرچەندێك کە ڕیزی یەکەمی جەماعەت ئەگەر بە خاڵی بمێنێتەوە، ئەوە کەسێك بۆی هەیە کە بەسەر خەڵکەکەدا بڕوات بۆ ئەوەی ئەو جێگایە پڕ بکاتەوە، چونکە ئەوانەی پێشوو مافەکەی خۆیانیان لە دەست داوە و زایەیان کردووە، بۆیە (حەزرەتی) حەسەنی بەصری فەرموویەتی:

بەسەر ئەو کەسانەدا بڕۆن کە لە ڕۆژی جومعەدا لە بەردەم دەرگاکاندا دادەنیشن، چونکە ئەوانە هیچ ماف و ڕێزێکیان بۆ خۆیان دانەناوە، تا پێویست بکات ڕێزیان لێ بگیرێت[1].

ئەگەر هەموو ئەوانەی لە ناو مزگەوتدا بوون، لە نوێژدا بوون، ئەوا با سەلامیان لێ نەکات، چونکە داوای وەڵامێکە کە لە جێگەی خۆیدا نییە و کەس ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە.

**شەشەم:**

نابێت لە بەردەم و ناوەڕاستی خەڵکەکەدا بڕوات، وە دەبێت لە پاڵ ستونێکدا یان دیوارێکدا دابنیشێت، بۆ ئەوەی کەس بەبەردەمی نوێژە کەیدا نەڕوات، واتە: لەبەردەمی نوێژخوێنەکە، خۆ ئەو ڕۆشتنە لە بەردەمیدا نوێژەکەی نابڕێت، بەڵام نەهی لێ کراوە، بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((لأَنْ يَقِفَ أربَعِينَ سَنَةً خَيرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَينَ يَدَيْ المُصَلِّي))**[1]، ئەگەرچل ساڵ بە پێوە ڕابووەستێت و چاوەنواڕی بکات، باشترە لەوەی

---

(١) رواه أبو داوود(١١١٨)، والنسائي(١٠٣/٣)، وابن ماجه(١١١٥)، بنحوه مختصرا، وهو عند ابن أبي شيبة في المصنف(٥٥١٥) بزيادة تفصيل.

بدات بەبەردەمی نوێژخوێنێکدا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((لأَن يَكونَ الرَّجُلُ رِماداً رِمْدِداً تَذروهُ الرِّياحُ، خيرٌ لَهُ مِن أَن يَمُرَّ بينَ يَدَيِ المُصَلِّي))**[2]، واتە:

( ئەگەر پیاو ببێتە خۆڵەمێشێکی ورد، وەك تۆزێك کە بە بەر ڕەشەباوە پرش و بڵاوببێتەوە، باشترە لەوەی کە بدات بەبەردەمی کەسێکەوە کە نوێژ بکات).

وە لە فەرموودەیەکی تردا، یەکسانی خستۆتە میانی ئەوەی بەبەر نوێژی یەکێکدا دەڕوات و، ئەوەش کە لە ڕێگەی خەڵکیدا نوێژ دادەبەستێت، یان کەمتەرخەمی بکات لەڕێگری لە کەسێك کە بەبەرنوێژەکەیدا بڕوات و دەفەرموێت: **((لَو يَعلمُ المارُّ بينَ يَدي المُصلِّي والمُصلِّي ماعَليهما في ذلكَ لكانَ أَن يَقِفَ أربعينَ، خيراً لَهُ مِنْ أَن يَمرَّ بينَ يَديهِ))**[3]،

واتە: ئەو کەسەی بەبەر نوێژدا دەدات و نوێژخوێنەکەش ئەگەر بیانزانیایە کە چ بەر پرسیارییەکیان لەسەرە، ئەوا (چل) ماوە بمایەتەوە باشتر بوو لەوەی

---

(١)قال العراقي رواه البزار من حديث زيد بن خالد وفي الصحيحين، البخاري (٥١٠)ومسلم (٥٠٧) أن يقف اربعين، وليس فيه سنة، قال ابن النضر: **لا أدري أربعين يوما أو شهرا أو سنة** ولابن ماجه(٩٤٦) وابن حبان(في صحيحه١٢٩/٦(٢٣٦٥) من حديث أبي هريرة مائةعام اهـ قال الزبيدي٢٦٢/٣: وحديث أبي جهم أخرجه الاربعة في السنن .

(٢)كذا في القوت، قال العراقى أخرجه أبو نعيم في تاريخ أصبهان ٤١٧/١، وابن عبد البر في التمهيد١٤٩/٢١، موقوفا على عبد الله بن عمروا وزاد **متعمدا** اهـ .

(٣) قال الزبيدي: أورده صاحب القوت (١٢٣/١، من حديث زيد بن خالد الجهنى رضي الله عنه وقال العراقي رواه هكذا أبو العباس محمد بن ا سحق في مسنده (٣٩١)من حديث زيد بن خالد باسناد صحيح ا هـ ولكن في المعجم الصغير للطبراني:٢٥٦/١(٩٢٠): **(لو يعلم المار بين يدي الرَّجل وهو يُصلى ماذا عليه، لكان أن يقف)**.... الحديث وهذا لا يُفهم منه التسوية بين المار والمصلي. الإتحاف ٢٦٢/٣.

بدات به بەردەمی نوێژ خوێنێکدا.

ئەوەش کە بە سنووری نوێژخوێنەکەدادەنرێت ستون و دیوار و دووگردو بەرماڵی نوێژکردنە، هەرکەسێك بیەوێت لەم جێگە نوێژەوە تێبپەڕێت، ئەوا پێویستە نوێژ خوێنەکە نەهێڵێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((لِيَدفَعَهُ، فَإنْ أَبَى فَليُقاتِلهُ فَإنَّهُ شَيطانٌ))**[1]،

یا دووری بخاتەوەو پاڵی پێوە بنێت ، ئەگەر ئەو نەگەڕایەوە و ئینکاری کرد، با شەڕی لە گەڵدا بکات چونکە ئەوە شەیتانە.

بۆیە (حەزرەتی) ئەبو سەعیدی خدری (خوای لێ ڕازی بێت) ئەوانە لادەدات کە دەهاتنە بەر نوێژەکەی، تا دەگەیشتە ئەوەی دەیدان بە ئەرزدا، لەوانەیە هەندێك جار پیاوەکەی پێوە بلکایە و، شکاتی لێ بکردایە، مەروانی کوڕی حەکەمیش بانگی دەکرد و سەرزەنشتی دەکرد، ئەویش دەیفەرموو:

کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەم شێوەیە پێ کردووە[2]،جا ئەگەر ستون و پایەیەکی دەست نەکەوت لەو جێگەیە، با شتێك لە بەردەمی خۆی دابنرێت درێژییەکەی با بە ئەندازەی زیراعێك بێت، بـۆ ئـەوەی ئـەم نیشـانەیە ببێتە

---

(١)كذا في القوت من حديث عبد الرحمن بن أبى سعيد عن أبيه مرفوعا والحديث متفق عليه عن أبى سعيد ولم يذكر المصنف الحديث بتمامه وهو في الصحيحين البخاري(٥٠٩)(٣٢٧٥) ومسلم(٣٩١)و أخرجه الطحاوي عن يونس عن ابن وهب أنَّ مالكاً أخبرهُ عن زيد بن مسلم عن عبد الرَّحمن بن أبي سعيد عن أبيه أنَّ رسول الله ﷺ قال:

**(إذا كانَ أحدُكم يُصلي فلاَ يَدعَنَ أحدٌ يمرُّ بينَ يَدَيهِ وليَدْرَأهُ ما استطاعَ. فَإن أبَى فليُقاتِلهُ فإنَّما هُو شيطانْ)**

(٢)أخرجه أحمد والشيخان والنسائي وابن حبان من حديث أبي هريرة: لَو يعلم الناس مافي النداء والصف الاول ثم لم يَجدوا إلا ان يستهموا عليه لاستهموا الحديث.

دیاریکردنی سنوورەکەی.

**حەوتەم:** دەبێ بەدوای ڕیزی یەکەمدا بگەڕێت، چونکە وەك باسمانکرد خێرەکەی زۆر زۆرە، وەك ئەو فەرموودەمان گێڕایەوە: (( **مَن غَسَّلَ واغتسَلَ وبكَّر وابتَكر ودَنا مِنَ الإمامِ واستَمَع، كانَ لهُ كَفَّارةٌ ما بينَ الجُمُعَتين، وزيادَةُ ثلاثةِ أيَّام**)) [1] ئەوەی خۆی بشوات و بەرگو پۆشاکیشی بشوات و خاوێنیان ڕابگرێت و، زووخۆی ئامادەبکات و، هەرزوویش بکەوێتە ڕێ و، نزیکیش ببێتەوە لە ئیمام و گوێ لە وتاریش بگرێت ، ئەوە بۆی دەبێتە کەفارەتی گوناهی میانی ئەو دوو جومعەیە، وە سێ ڕۆژ زیاتریش، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((**غَفَرَ اللهُ لهُ إلى الجُمعَةِ الأُخرى**))[2]، (واتە تا جومعەکەی تر خودا لێی خۆش دەبێت، وە لە هەندێکی دا ئەوەی بەمەرج گرتووە لەسەریان کە: نابێت بەسەر مل و گەردنی خەڵکیدا تێبپەڕن،((**ولَم يَتَخَطَّ رِقابَ النَّاس**))[3].

---

(١)كذا في القوت قال العراقي أخرجَه الحاكم في المستدرك(٤١٧/١(١٠٤٠)من حديث أوس بن أوس وأصله عند أصحاب السنن أبوداوود(٣٤٥)، والترمذي(٤٩٦)، والنسائي(١٣٨١)، وابن ماجه(١٠٨٧)اهـ قال الزبيدي٢٦٣/٣: وأخرجَه البَيهقي كذلِكَ وصححَه الحاكم، وتعقبه الذهبي ولفظ حديثهم: (**من غسل واغتسل وغدا وابتكر ودنا وأنصتَ واستمعَ غُفر لهُ ما بينه وبين الجمعة وزيادة ثلاثة أيام ومَن مَسَّ الحَصَى فقَد لَغا**).

(٢) رواه الخطيب في تأريخ بغداد،٦/(١٩٨).

(٣)كذا في القوت قال العراقي أخرجه أبو داود(٣٤٧) والحاكم في المستدرك(٢٨٣/١)، من حديث أبي سعيد وأبي هريرة وقال على شرط مسلم اه قلت وأخرجه الطحاوي كذلك من حديثهما قال حدثنا ابن أبي داود حدثنا الذهبي حدثنا ابن اسحق عن محمد بن ابراهيم عن أبي سلمه بن عبد الرحمن وعن أبي أمامه أنهما حدثاه عن أبي سعيد، وعن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال:(**من اغتسل يوم الجمعة واستن ومسَّ طيباً إن كان عنده، ولبس من أحسن ثيابه ثُم خرج حتى أتى المسجدَ، فلم يتخطَّ رِقاب النَّاسِ ، ثمَّ ركعَ ما شاء اللهُ أن يركَع وانصَتَ، إذا خرجَ الامام كانت كفارة ما بينهما وبين الجمعة التى قبلها**) الإتحاف٢٦٣/٣

# له گەڕان بەدوای ڕیزی یەکەمدا
# نابێت لە سێ شت بێ ئاگابێت.

**یەکەمیان:** ئەگەر لە نزیکی وتاربێژەکەوە شتێکی وای بینی کە ناپەسەند و ناڕەوا بوو، نەیشی دەتوانی لایبدات، یان بیگۆڕێت، لە پۆشینی بەرگی ئاوریشم، لە ئیمامەوە یان لە کەسێکی ترەوە، یان لە ناو کۆمەڵە چەکێکی زۆری قورسدا نوێژی دەکرد، کە دڵی لە نوێژەکە لادەدا ، یان جۆرە چەکێك کە لە زێر و ئاڵتون درووست کرابێت و چنرابێت، یان زڕکەفتدرابێتەوە، یان هەندێك شتی ناڕەوای تر کە دەبێت ئینکاریان لێ بکات و نەتوانێت، کەواتە لەم حاڵەتانەدا ڕیزی دواوە بۆ ئەو باشترە، وە زیاتر کۆیدەکاتەوە و ئاگای لە نوێژەکەی دەبێت، خەیاڵی بەملاولادا ناڕوات، کۆمەڵێ لە زانایان لە پێناوی پاراستنی خۆیاندا ئەم کارەیان بەمشێوە ئەنجامداوە.

وتیان بە بیشری کوڕی حاریس (خودای لێ ڕازی بێت) دەتبینین زویش دەچیت بۆ مزگەوت و نوێژەکەیشت لە دواڕیزەکاندا دەکەیت، فەرمووی:

ئەوەی مەبەستیانە لێمان، نزیك بوونی دڵەکانە نەك نزیکی تەن و جەستەکان[1]، وە هێمای بەوە کرد کە لەم دووریەوە سەلامەتترە.

وە (حەزرەتی) سوفیانی سەوری سەیری شوعەیبی کوڕی حەربی کرد، گوێی لە وتارێکی ئەبوجەعفەری مەنصور دەگرت، کاتێك لە نوێژەکەی

---

(١) رواه بنحوه الخطيب في (تاريخ بغداد) ٢٨٤/٧، وابن عساكر في تأريخ دمشق(١٠(٢٠٢)، وهو كذا في قوت القلوب٦٩/١، وە نابێت گوێ بە قسەکانی (ابن الجوزی)بدرێت، کە بێ ئاگایە لە مەرجەکانی ئیمامی غەزالی، کە حزوری دڵ و ئاگاداری و مەرجەکانی تری بە پێویست زانیوەو ئەو بە پێویستی نەزانیوە.

لێبوویەوە فەرمووی پێی: بەڕاستی دڵت سەرقاڵ کردم بەو نزیك بوونەت لەو کابراوە(سوڵتان)، ئایا ئەمین بویت لەوەی کە قسەیەکی وای لێ نابیستی کە پێویستی بە بەرپەرچدانەوە هەبوایە و تۆیش پێی هەڵنەستایتایە؟!

لە پاشان باسی ئەوەی کرد، کە بەرگی ڕەشیان داهێناوە و لەبەری دەکەن. شوعەیبیش فەرمووی: ئەی باوکی عەبدوڵلا؛ ئایا نەتبیستووە لە فەرموودەدا هاتووە: (**أُدْنُ فاسْتَمِعْ**)؟![1]،

واتە: نزیك بەرەوەو گوێیان لێ بگرە، سوفیان فەرمووی:

ئاگات لە قسەکانت بێت! ئەوە بۆ خولەفای ڕاشیدینە، کە لەسەر ڕەواو ڕێنمایی حەق کاردەکەن، بەڵام ئەم جۆرانەی تر، چەندێك زیاتر لێیان دوور بیت و سەیریان نەکەیت، ئەوە لە خودای (عَزَّ وجَلْ) نزیکتر دەبیت[2]،

سەعیدی کوڕی عامیر فەرموویەتی:

---

(١)قال العراقي اخرجه أبو داود(١١٠٨) من حديث سمرة: (**أحضروا الذكر وادنُوا من الإمام** وتقدم بلفظ :( **مَن هَجـرَ ودنـا واستمع**)، وهو عند أصحاب السنن(الترمذي(٤٩٦). والنسائي(١٣٨٤)، وابن ماجه(١٠٨٧)، من حديث شداد اهـ. قال الزبيدي(٣/٢٦٥. وأخرج من حديث سمرة أيضا أحمدفي مسنده(١٩٦٠٥)، والحاكم في المستدرك(١/٤٢٧)(١٠٦٨)، والبهقي في السنن الكبرى(٣/٢٣٨)(٥٧٢٤)، ولفظ البهقي: (**أحضروا الجمعة وادنوا من الإمام فان الرجل لا يزال يتباعد حتى يؤخر في الجنة وإن دخلها**، وفي رواية لأحمد: **فإن الرجل ليتخلف عن الجمعة حتى أنَّه يتخلف عن الجنة وإنه لمن أهلها**، وقال الحاكم صحيح وفي رواية لاحمد: **فإن الرجل ليتخلف عن الجمعة حتى انه يتخلف عن الجنة وانه لمن اهلها**). وقال الحاكم صحيح على شرط مسلم واقره الذهبي في التلخيص وسكت عليه أبو داوود ولكن تعقبه المنذري بأن فيه انقطاعا وقال الذهبي في تعقبه على البهقي فيه الحكم بن عبد الملك قال ابن معين ليس بشيء.

(٢) قوت القلوب (١/٦٩)،

لە پاڵ ئەبو دەردائدا نوێژم دەکرد، سەیرم دەکرد لە ڕیزەکانی پێشەوە خۆی دوا دەخست تا کەوتینە دواپین ڕیزەوە، کاتێ لە نوێژ لێبوینەوە، پێم وت: ئایا ڕاست نییە کە وتراوە: ((**خَيرُ الصُّفوفِ أَوَّلُها**))؟![1]،فورمووی:

بەڵێ، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم گرۆیە ڕەحمی پێکراوە، لە میانی ئوممەتەکانی تردا جیاکراوەتەوە، بەڕاستی خودا ﷻ ئەگەر لە نوێژدا سەیری بەندەیەکی بکات لێی خۆش دەبێت، وە لەوانەیش خۆش دەبێت کە لە دواوەی ئەون، منیش بۆیە دوا دەکەوم، بەو هیوایەی کە خودا سەیری یەکێك لەوان بکات لە نوێژدا و، بەهۆی ئەویشەوە لە من خۆش ببێت[2]

هەندێ کەس ڕیوایەتیان کردووە: کە بیستوویانە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ئەمەی فەرمووە کە باسمان کرد[3].

کەواتە ئەو کەسەی دواکەوتنەکەی لە ڕیزی یەکەم لەسەر ئەم نییەتە بێت، وە مەبەستی پێشخستنی کەسانێکی تر بێت و، حەزی لە قازانجی ئەوان بێت، وە بیەوێت ڕەوشتێکی بەرز نمایش بکات، ئەوە ڕێگەی لێ ناگیرێت، چونکە

---

(١)وشـرُّها آخِرها اهـ وهذا لم يتعرض له العراقي لكون المصنف أورده بلفظ: يقالُ، وقد أخرج مسلم(٤٤٠) وأبوداوود(٦٧٨)،والترمذي(٢٢٤)، وابن ماجه(١٠٠٠)، من حديث أبي هريرة والطبراني في الكبير١٦٥/٨(٧٦٩٢)، من حديث أبي امامة وابن عدي في الكامل(٦١/٣، والبزار من حديث فاطمة بنت قيس والطبراني في الكبير(٢٠٣/١١(١١٤٩٧). أيضا عن ابن عباس وابن ماجة عن انس والطبراني في الأوسط(١٥٧/١(٤٩٣)، عن عمر بلفظ: (**خير صفوف الرِّجال أولها، وشرها أخرها، وخير صفوف النساء أخرها، وشرها أولها**)، وأخرجه ابن أبي شيبة(٣٣٣/١(٣٨١٤)، من حديث جابر: (**خير صفوف الرجال مقدمها، وشرها مؤخرها، وخير صفوف النساء مؤخرها، وشرها مقدمها**).

(٢) قوت القلوب/٦٩/١.

(٣) واتە (حەزرەتی) ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خودا ﷺ بیستووە، وەك لە قوت القلوب دا هاتووە ٦٩/١.

کردارەکان وەك وتراوە: بە پێی نیەتی مرۆڤەکانە(**الأعْمالُ بالنِّيّاتِ**)[1].

**دووهەمیان:** ئەگەر لە پاڵ وتاربێژەکەدا شوێنێك تەرخان نەکرابێت بۆ سوڵتان و دەستەڵاتدارەکان، ئەوا ڕیزی یەکەم پەسەنتر و باشترە، ئەینا بە پێچەوانەوەیە، هەندێك لە زانایان بە ناپەسەندیان داناوە بچنە ناو ئەو شوێنە دابڕاو و تەرخانکراوەی بۆ سوڵتانەکان کراوە.

کاتی خۆی (حەزرەتی) حەسەنی بەصری و بەکری موزەنی (خودایان لێ ڕازی بێت) نوێژیان لەو شوێنە دابڕاوانەدا نەدەکرد، وایان دەبینی کە تەنها تایبەت کراوە بەوان و هاوڕازەکانیانەوە.

ئەمەش بیدعە و داهێنراوێکی نوێ بوو دوای پێغەمبەری خودا ﷺ لە مزگەوتەکاندا دایانهێنا، مزگەوتیش بەرەهایی بۆ تێکڕای خەڵکەکانە، ئەمەیش کە لێی دابڕاوە پێچەوانەی ئەو مەبەستەیە کە مزگەوتی بۆ درووست کراوە[2].

وە (حەزرەتی) ئەنەسی کوڕی مالیك و عومرانی کوڕی حوسەین (خودایان لێ ڕازی بێت) لەو جێگە تەرخانکراوەدا (المقصورة) نوێژیان دەکرد، وە مەبەستیشیان نزیکی بوو لە ئیمامەوە، [1].کەواتە لەوانەیە کەراهەتەکە بۆ ئەو

---

(١) هکذا رواه ابن حبان في صحيحه(١١٣/٣(٣٨٨) ومثله في مسند أبي حنيفة ص/٢٦٩) والمشهور (**إنَّما الاعمال بالنيات**)، وقد بينت طرقه في الجواهر المنفية.

(٢) ئەو جیگەیان بۆ پادشاو دەستەڵاتداران دیاری دەکرد لە ترسی ئەوەی کە دوژمن هێرشیان نەکاتە سەر، وە ئەم کارە ئیتر بوو بە سوننەتی دەسەڵاتدارەکان، وە شێخی زوبەیدی دەفەرموێت: نەمبینیوە کە حەسەن و بەکر نەچوبنەوە ناو ئەو جێگەوە، بەڵکو وتراوە کە حەسەنی بەصری چووەتە ناوی و نوێژی تێدا کردووە، الإتحاف ٢٦٦/٣، وە بنوارە: قوت القلوب ٦٨/١، وقد روى ابن أبي شيبة في المصنف (٤٦٥٢-٤٦٥٣)، عن أبي محيريز وابن عمر(أنهما كانا لايصليان في المقصورة).

حاڵەتەیە کە شوێنەکە تایبەت بێت بە دەستەڵاتدارانەوەو، ڕێگەی خەڵکی تر نەدرێت لەوێدا نوێژ بکات، ئەینا ئاساییە و کەراهەتی نابێت.

**سێیەمیان:** ئەگەر میمبەرەکە ئەوەندە گەورەبوو، کە هەندێك لە ڕیزەکانی پێشەوەی لەیەك دەبچڕاند، وە ڕیزی یەکەم کە لە تەنیشتی میمبەرەکەوەیە لەیەکەوە پچڕابێت، وە ئەوەی لەملاو لایشیەوە بێت لەیەك بپچڕێن، ئەوە باشتر وایە کە لە دواوە نوێژ بکات، چونکە (حەزرەتی) سوفیانی سەوری دەیفەرموو: ڕیزی یەکەم ئەوەیە کە لە دەرەوەی میمبەرەوە دەست پێ دەکات[٢] ئەمەش ڕایەکی پەسەندە، چونکە ڕیزەکە پێکەوە بەستراوو لێك نەپچڕاوە، وە ئەو کەسەش لەو ڕیزەدا دادەنیشێت، بەرامبەری خەطیبەو بەباشی گوێی لێیەتی، وە دوریش نییە کە بوترێت: نزیك ترین ڕیز لە قیبلەوە ڕیزی یەکەمە، ئیتر لێرەدا باسی بوون و نەبوونی میمبەرەکە ناکرێت.

وە ناپەسەندە و مەکروهە نوێژکردن لە بازاڕ و حەوشەو کۆڵانەکان کە

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في المصنف(٤٦٤٢) والسياق في القوت ٦٨/١، فقال أبو بكر بن أبي شيبة حدثنا حاتم بن اسمعيل عن عبد الله بن يزيد قال: **رأيت أنس بن مالك يصلي في المقصورة المكتوبة مع عمر بن عبد العزيز، ثم يخرج علينا من ههنا. ثم ذكر من كان يصلي في المقصورة جماعة منهم الحسن وعلي بن الحسين وأبو القاسم والسائب بن يزيد وسالم والقاسم ونافع** قال حدثنا ابن عليه عن يونس **أن الحسَن كان يصلي في المقصورة**، وحدثنا وكيع عن قيس بن عبد الله وكان ثقة قال: **رأيت الحسن يُصلي في المقصورة**، وحدثنا حفص بن غياث ن جعفر قال: **كانَ علي بن الحسين والقاسم يُصلون في المقصورة**، وحدثنا عمر بن هارون عن عبد الله بن يزيد يُصلي المكتوبة في المقصورة وحدثنا حفص عن عبد الله قال: **رأيت سالماً والقاسم ونافعاً يصلون في المقصورة** وحدثنا ابن ادريس عن حصين عن عامر بن ذؤيب قال: **سألت ابن عمر عن الصلاة من وراء الحجرة فقال إنهم يخافون أن يقتلوهم**. الإتحاف/١/٢٦٦.

(٢) قوت القلوب١/٦٩.

نەبسرابنەوە بە ڕیزی نوێژی جەماعەتەوە، تەنانەت هەندێك لە صەحابەكان، لە خەڵكیان دەداو هەڵیاندەستاندن، لەسەر ئەوەی لە دەرەوەی مزگەوتەوە نوێژیان دەكرد[١]،

**هەشتەم:** دەبێت نوێژەكەی ببڕێت ئەگەر ئیمام سەركەوت بەرەو میمبەر، وە بێدەنگیش بێت و قسەنەكات، بەڵكو خەریكی وەڵامدانەوەی بانگوێژەكە بێت، لە پاشان گوێ لە وتارەكە بگرێت.

هەندێك لە نەخوێندەوارەكان خویان بەوەوە گرتووە، لە كاتی هەستانی بانگوێژدا بۆ بانگدان، ئەوان سوجدەیەك دەبەن، كە هیچ بنەماو فەرموودەیەكی لە سەر نەهاتووە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ كاتی سوجدەی تیلاوەتدا هاتەوە، ئەوە ئاساییە كە دۆعاو نزاكانی درێژ بكاتەوە، چونكە كاتێكی زیادەیە، وە ناتوانرێت حوكم بدرێت بە حەرام بوونی ئەو جۆرە سوجدەیە، چونكە هیچ هۆكارێن نییە بۆ حەرامكردنی.

گێڕاویانەتەوە لە (حەزرەتی) عەلی و (حەزرەتی) عوسمانەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) كە فەرموویانە:

**((مَنِ استمَعَ وأنصَتَ فَله أَجران، ومَن لَمْ يَستَمِع وأنصَتَ فلَهُ أجْرٌ، ومَن سَمِع ولغَا فَعَليهِ وِزرانِ، ومَن لَم يستَمِع ولغَا فعَليهِ وِزرٌ واحِدٌ))**[٢]، واتە:

---

(١) قوت القلوب١/٦٩.

(٢)هكذا في القوت(١/٦٨) موقوفا عليهما، إلا أنَّ الطبراني قَد روى من حديث أبى إمامة بلفظ: **دَنا فاستَمَع وانصَت كانَ لَهُ كِفلان مِنَ الأجر.** وروى أحمدفي مسنده(١/٩٣)، عن علي (رضي الله عنه) قال: **فمن دنا من الإمام فأنصت واستمع ولم يلغ، كان له كفلان من الأجر، ومن نأى عنه فاستمع وأنصت ولم يلغُ كان له كفل من الأجر، ومن دنا من الإمام فلغا ولم ينصت ولم يستمع، كان عليه كفلان من الوزر، ومن نأى عنه، فلغا ولم ينصت ولم يستمع، كان عليه كفل من الوزر.** وبنحوه رواه أبوداوود(١٠٥١).

ئەگەر کەسێك گوێ بگرێت و بێ دەنگیش بێت، ئەوە پاداشتێکی هەیە، بەڵام ئەوەی گوێ نەگرێت و تەنها بێ دەنگ بێت، ئەوە یەك پاداشتی بۆ هەیە، بەڵام ئەوەی گوێ بگرێت و قرەو قاڵیش بکات، ئەوە دوو گوناهی بۆ دەنوسرێت، وە ئەوەیش کە گوێنەگرێت و قسەش بکات ئەوە تەنها گوناهێکی بۆ دەنوسرێت، **((مَن قالَ لِصاحِبهِ والإمام يَخطُبُ أنصِتْ أو.. مَه فقَد لغَا، ومَن لغا والإمامُ يَخطبُ فلاَ جُمعَة لَهُ))** [1]

(واتە: کەسێك وتی بە هاوڕێکەی بێ دەنگ بە، یان قسەمەکە و ئیمامیش وتاری دەخوێندەوە، ئەوە بە قاڵەو بشێوی بۆی دەژمێررێت، ئەوەیش قرەو قاڵە بکات و ئیمام وتار بدات، ئەوا خێری جومعەی بۆ نانوسرێت )

ئەمەش نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە بێدەنگکردنی یەکێکیش، دەبێت بە هێماکردن بێت، یان بە وە بێت پارچەبەردێکی بۆ فڕێ بدات، نەك بە قسە کردن، وە لە فەرموودەکەی ئەبی زەڕدا (خودای لێ ڕازی بێت) :

کاتێك کە پرسیاری لە (حەزرەتی) ئوبەی کرد لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، فەرمووی: ئەو سورەتە کەی هاتە خوارەوە؟ هێمای بۆ کرد کە بێدەنگ بە، کاتێك پێغەمبەر ﷺ دابەزی، ئوبەی فەرموی پێی: بڕۆ دەرەوە خێری جومعەت بۆ نەنوسراوە، ئەبو زەڕیش شکاتی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: **(صَدَقَ أُبَي)**[2]، ئوبەی ڕاستی کرد.

---

(١)هكـذا أورده صـاحب القـوت(١٠٨/١) بتمامـه. قـال العراقي أخرجـه الترمـذي(٥١٢) والنسـائي(١٠٣/٣) من حـديث أبي هريـرة دون قولـه: **من لغـا فـلا جمعـة لـه قـال الترمـذي حديث حسن صحيح وهو في الصحيحين إذا قلتَ لصاحبك**، ولابى داود من حديث علي: **مـن قـال صـهْ فقـد لغَـا ومـن لَغـا فـلاَ جمُعـة لـهُ**، الإتحـاف ٢٦٧/٣-٢٦٨. قـال صـاحب القوترواه أبو إسحق عن الحرث عن علي.

(٢)قال العراق أخرجه البيهقي وقال في المعرفة إسناده صحيح، ولابن ماجه (١١١١)من حديث

وە ئەگەر لە ئیمامەوە دور بوو، نابێت لە هیچ بابەتێکی زانستی و باسی ترەوە قسە بکات، بەڵکو دەبێ بێدەنگ بێت، چونکە ئەو جۆرە قسەکردنە ڕیزبەندییەك پەیدا دەکەن و، غەڵبەو و مینگەیەکی لێ پەیدا دەبێت، ئەوانەش کە گوێیان بەو غەڵبە غەڵبەیە گرتووە سەریان لێ تێك دەچێت، کەواتە نابێت لە ناو ئەو قسەکەرانەشدا دابنیشێت، هەرکەسێکیش نەیدەتوانی گوێی لە وتار و ئامۆژگارییەکانەوە بێت، با بێ دەنگ بێت، ئەوە بۆی باشە.

کەواتە لە جێیەك نوێژکردن لە کاتی وتاردا کەراهەتی هەبێت، دەبێ قسە کردن زیاتر ناپەسەندو نەشیاو بێت، وەك (حەزرەتی) عەلی (کرم الله وجهە) فەرموویەتی: ((**تُكرَهُ الصلاةُ في أربَعِ ساعاتٍ: بعدَ الفَجر ، وبعدَ العصْر، ونِصفَ النهارِ، والصلاةُ والإمامُ يَخطُبُ**))[1]، (واتە: لە چوار کاتدا نوێژ کردن کەراهەتی هەیە، دوای نوێژی بەیانی تا خۆر کەوتن، وە لە دوای نوێژی عەسرەوە، وە لە کاتی ڕاوەستانی هەتاو لە ناوەڕاستی ئاسمان تا لادەدات و تێدەپەڕێت، وە نوێژکردن لەکاتێکیشدا کە خەطیب وتار دەخوێنێتەوە.)

**نۆیەم:** دەبێت چاودێری ئیمام بکات و لێی پێشنەکەوێت، وەك لە پێشەوە باسمانکرد، ئەگەر گوێی بە خوێندنەوەی ئیمامەوە بوو، نابێت جگە لە فاتیحە هیچی تر بخوێنێت، کاتێکیش لە جومعە لێ بوویەوە، ئەوا با سوورەی (**الحَمْدُ**) حەوت جار بخوێنێت، پێش ئەوەی هیچ قسەیەك بکات، وە سوورەی ئیخلاص

---

أبي بن كعب باسناد صحيح، والسائل أبو الدرداء أو أبوذر.وجزم ابن خزيمة في صحيحه (١٨٠٧) أنه أبو ذر.

(١)قال صاحب القوت(١٠٨/١) رواه أبو إسحق عن الحرث عن علي قلت: **والمعنى بعد الفجر حتى ترتفع الشمس وبعد العصر حتى تغرب والمراد بنصف النهار حالة استواء الشمس فى كبد السماء حتى تزول والرابع الصلاة عند خطبة الامام.**

حەوت جار، هەروەها هەردوو سوورەتی فەلەق و ناس، واتە (قول ئەعوذووە کان) حەوت جار حەوت جار. هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە:
هەرکەسێك ئەم حەوت جار حەوت جارە بیانخوێنێت، تا حەفتەکەی تر دەپارێزرێت، وە دەبێتە قەڵغانێکی چاك بۆ لادانی شەیتان.[1]،

**(( اللَّهُمَ ياغَني يا حَميدُ، يا مُبدِئُ يا مُعيدُ، يا رَحيمُ يا وَدودُ، أغنِني بحَلالِكَ عَن حَرامِكَ و بطاعَتِكَ عَن مَعصِيتك و بفضْلِكَ عمَّن سِواكَ))**،
واتە: ئەی پەروەردگارم ئەی دەوڵەمەندێك کە پێویستیت بەکەس نییە و هەمیشە ستایشکراویت و شیاوی ستایشی، سەرەتای بوون و گێڕانەوەی هەموان بۆ نەمان و زیندوکردنەوەیان لە نوێ تەنها بە فەرمانی تۆ دەبێت، ئەی خاوەنی بەزەیی و سۆز و خۆشەویستی، بە ماڵی حەڵاڵی خۆت ئەوەندە دەوڵەمەندم بکە پێویستیم بە هیچ حەرامێك نەبێت، وە بە تاعەت و گوێڕایەڵی خۆت لە تاوانکاری و یاخی بوون بمپارێزە، وە بە فەزڵ و گەورەیی خۆت موحتاجی غەیری خۆتم مەکە. دەڵێن:

هەرکەسێك بەردەوام بێت لەسەر خوێندنی ئەم دۆعایە، نهێنی دەوڵەمەند بوون و بێ ئیحتیاجی دەڕژێنێت بەسەر دڵیدا، پێویستی بە دەستی کەس نابێت، وە بەو شێوەیەك حیسابی بۆ نەکردوە ئاوا دەوڵەمەندی دەکات [2] لە پاشان لە دوای جومعە شەش ڕکات نوێژ بکات، عەبدوڵلای کوڕی
عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ **((كان يُصَلِّي بعدَ الجُمعَةِ ركعَتَينِ))**[3]، واتە دوای جومعە دووڕکات نوێژی دەکرد.

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في المصنف،(٥٦٢١-٣٠٢١٨)، عن أسماء بنت الصدبق (رضي الله عنهما)
(٢) رواه البخاری(١١٦٩)، ومسلم (٨٨٢).
(٣)رواه الخاري(٩٣٧) و مسلم(٨٨٢) و أبو داود و الترمذي و ابن ماجه كُلُهم من طريق نافع عنه و لفظ البخاري و كان لا يصلي بعدَ الجمعةِ حتي ينصرفَ فيصلِيَ ركعتين.

وه لەڕیوایەتی ئەبو هورەیرەدا دەفەرموێت: (**أربعا**)[1] چوار ڕکات نوێژی دەکرد. وه دەگێڕنەوه لە (حەزرەتی) عەلی و (حەزرەتی) عەبدوڵلاوه کە (**سِتّاً**)[2].
واتە شەش ڕکات نوێژی دەکرد، وه هەموو ڕیوایەتەکان درووستن و لە چەندین حاڵەتی جیاوازدا هاتوون، وه کاملترینیان ئەوەیە کە بە تەواو تر بکرێت.

**دەیەم:** یەکێکی تر لە ئادابەکانی ئەوەیە کە مزگەوت بەرنەدات تا نوێژی عەسر دەکات، خۆ ئەگەر تا نوێژی ئێوارە بمێنێتەوە ئەوە باشترە.
دەڵێن: هەرکەسێك نوێژی عەسر لە مزگەوتدا بکات، پاداشتی حەجێکی بۆ دەنوسرێت، وه ئەوەی نوێژی ئێوارە بکات پاداشتی عەمرەیەکی بۆ دەنوسرێت[3]

---

(١) أي **بعد الجمعة لا يفصل بينهن بتسليم** أخرجه مسلم (٨٨١) و أبو بكر بن أبي شيبة و الترمذي و الطحاوي من طريق سهيل عن ابيه عنه بلفظ: (**من كان مصليا بعد الجمعة فليصلِ أربعاً**). **الإتحاف٣/٢٧٣.**

(٢)روى علي و عبد الله بن عباس) رضي الله عنهم أنه ﷺ كان يُصلي (سِتّاً) أي بعْدَ الجُمعة أي بتقديم ركعتَين على الأربع ركعات، أخرج أبوداود(١١٣٠) من حديث ابن عمر (**أنه كان بمكة فصلى الجمعة ركعتين، ثم تقدم فصلى أربعا، و إذا كان بالمدينة صلى الجمعَة ثم رجع إلى بيتهِ فصلَّى ركعتين ولَم يُصل في المسجد، فقيل له يا أبا عبد الرحمن فقال: كان النبي صلي الله عليه و سلم يفعل ذلك**). وقال صاحب الإتحاف ٢٧٤/٣: هو في المصنف لابن ابي شيبه ٤٦٤/١(٥٣٧٠)عن هشيم اخبرنا عطاء عن أبي عبد الرحمن قال قدم علينا ابن مسعود **فكان يأمرنا أن تصلي بعد الجمعة أربعاً فلما قدم علينا علي، امرنا أن نصلي ستاً فاخذنا بقول علي، وتركنا قول عبد الله. قال: كان يُصلي ركعتَين ثم أربعاً.**

(٣)كذا في القوت، قال الزبيدي٢٧٦/٣ و هذا قد ورد في المرفوع، أخرج الديلمي في مسند الفردوس كما في الجامع للسيوطي(٢٦١/٧)من حديث أنس: **من صلَّى المغربَ في جماعةٍ كُتبت له حجة مبرورة و عمرة متقبلة وكأنما قام ليلة القدر** . و أخرج أحمد(١٣٣٤٩) و البيهقي (٤٠٩/١(٥٦٠)من حديث أنس: (**من صلَّى العصر فجلس يملي خيراً حتى يُمسي كان أفضل ممَّن أعتقَ ثمانيةً مِن وُلد إسماعيل**، و اخرج الديلمي من حديث أبي الدرداء:

ئەگەر ئەمین نەبوو لە قسەو قسەڵۆکی خەڵکی و، کاری خۆدەرخستن و دوچار بوونی ئەو فیتنەو ئافەتەی کە لە وتی وتییەوە لە وانەیە توشی ببێت، کە سەیری بکەن ئەوەندە لە ناو مزگەوتدا دەمێنێتەوە، یان ترسا لەوەی کە توشی هەندێك بابەتی لابەلا ببێت، کە هیچ سودێکی پێ نەگەیێنێت، ئەوا چاکتر وایە بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی، بەدەم زیکر و یادی پەروەردگارەوە، وە بیر لە نیعمەتەکانی بکاتەوە، وە بە دڵ و زوبان شوکرانەبژێری بێت لە سەر ئەوەی ڕێنومایی کردووە و، بشترسێت لەوەی کەمو کوڕی زۆری هەیە لە حزوری پەروەردگاریدا، وە بەردەوام چاودێری دڵ و زوبانی بکات، تا خۆر دەنیشێت، بۆ ئەوەی ئەو ساتە پیرۆزەی کە لە میانی عەسر و خۆر نشیندا هەیە لە کیسی نەچێت. وە نابێت لە ناو مزگەوتی جومعەدا ، یان هەرمزگەوتێکی تر، قسە و باسی دونیایی بکات، وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((يأتي علَى النَّاس زمانٌ يكونُ حديثهُم في مَساجدِهِم في أمرِ دُنياهُم، ليسَ للهِ فيهم حاجَةٌ فلاَ تُجالِسُوهُم))**[1]، زەمانێك دێتە پێشەوە لەو خەڵکەیە، قسەو باسەکانیان لە بارەی دونیاوە لە ناو مزگەوتەکانیاندا دەبێت، خودای گەورە کاری بە مانەوەی ئەوانە نییە، لە گەڵیاندا دامەنیشن لە مزگەوتەکاندا.

---

**من صلَّى الجُمعة كُتب لهُ حجة متقبلة فإن صلَّى العصر كانت له عُمرة فإن يمسي في مكانهِ لم يسالِ اللهَ شيئاً إلاَّ أعطاه.)**

(١)قال العراقي أخرجه البيهقي في الشعب٣/٨٦(٢٩٦٢)(٢٧٠١) من حديث الحسن مرسلا و اسنده الحاكم في المستدرك(٣٩٥/٤)(٧٩١٦) حديث أنس و صحح إسناده و لا بن حبان (١٦٢/١٥)(٧٦٦١) نحوه من حديث ابن مسعود اهـ قال الزبيدي٣/٢٧٧: لفظ حديث ابن مسعود: **(سيأتي علي الناس زمان يقعدون في المجالس حلَقا حلقاً، إنَّما همَّتهم الدُّنيا، فلا تُجالِسوهم فإنَّه ليسَ لله فيهم حاجة،** و لفظ حديث انس عند الحاكم: **يأتي علي الناس زمان يتحلقون في مساجدهم و ليس همُّهم إلا الدُّنيا ليس للهِ فيهم حاجةٌ فلاَ تجالسوهم.**

## باسی ئەو ئاداب و سوننەتانەی کە لەدەرەوەی ئەو ڕیزبەندیانەیە کە باسمان کرد، وە هەموو ڕۆژەکە دەگرێتەوە کە حەوت فرمانە:

**یەکەم: دەبێت ئامادەی دانیشتنە زانستیەکان ببێت.**

بەیانیان یان بەرەبەیان زوو، یان دوای نوێژی جومعە، یان دوای نوێژی عەسر کە لەکارەکانی لێدەبێتەوە، وە لە مەجلیسی چیرۆکخوانەکاندا دانەنیشێت، چونکە خێر لە قسەیاندا نابینێت.

وە نابێت موریدی ڕێگای ئاخیرەت ڕۆژەکەی خاڵی بێت لە خێر و چاکەو نزاو دۆعاکردن تا دەگاتە کاتی سەعاتە پیرۆزەکە، کە خۆیشی لە ناو خێردابێت.

وە نابێت لە پێش نوێژی جومعەدا لەگەڵ ئەوانەدا دابنیشێت کە ئەڵقەیانداوەو باسی دونیادەکەن، وەك دەگێڕنەوە لە (حەزرەتی) عوبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) کە: پێغەمبەری خودا ﷺ نەهی کردووە لە وەی بە ئەڵقە دابنیشن لە ڕۆژی هەینی دا پێش نوێژەکە تەواو بکەن:

((أنَّ النبيَّ نَهىَ عَنِ التَّحلُّقِ يومَ الجُمعةِ قَبلَ الصَّلاةِ)) [1] مەگەر بۆخۆی زانابێت بە خودا، وە ڕۆژەکانی پێشویان وەبیر بهێنێتەوە، کە خودا نیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا، وە خەڵکی فێری دینی خودا بکات و، لەو ڕێبازە شارەزایان بکات، تا ئەوەی بتوانێت پێش نوێژ یان دوای نوێژ قسە بۆ ئەو خەڵکەیە بکات، ئەوانیش لە پاڵیدا دابنیشن، بۆ ئەوەی هەردوو خێرەکە کۆبکاتەوە لە خۆیدا، هەم زوو بێت بۆ نوێژ، وە هەم گوێیش بگرێت، وە

---

(١)قال العراقي أخرجه أبو داود(١٠٧٩) والنسائي(٤٧/٢)والترمذي(٣٢٢) وابن ماجه(١١٣٣) من روايه عمرو ابن شعيب عن أبيه عن جدِّه ولم أجده من حديث ابن عمر

گوێگرتنیش لە زانستێك کە سوودی دوارۆژی پێ بگەیێنێت، باشترە لەوەی خۆی بە سوننەتەکانەوە خەریك بکات، وەك ئەبوذەڕی غەفاری فەرموویەتی:

((إنَّ حُضورَ مجلِسِ عِلمٍ أفضَلُ مِن صَلاة ألفِ رَكعَةٍ))[1]،

(واتە: ئامادەبوون لە دانیشتنێکدا فێری زانستی لێ ببن، گەورەترە لە هەزار ڕکات نوێژی سوننەت)

(حەزرەتی) ئەنەسی کوڕی مالیك فەرموویەتی: دەربارەی فەرموودەی خودا: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ﴾ (الجمعة/١١)(کاتێك کە نوێژی جومعە لێدەبێتەوە بڵاو ببنەوە بە زەوی دا، وە بە دوای فەزڵی خودادا بگەڕێن) ئەوە گەڕان نییە بە دوای دونیادا، بەڵکو سەردانی نەخۆش و ئەسپەردەکرنی جەنازەی مردووە و، فێربوونی زانستە و، سەردانی برایەکی دینییە لەبەر خودا.[2] ،بۆیە خودای گەورە لە چەندین شوێندا ناوی زانستی بە فەزڵ و خێری زۆر ناو بردووە، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾ (١١٣/النساء)

زانست و فەزڵی خودا زۆر گەورەیە بەسەرتەوە.

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلًا﴾ (سبأ/١٠) (بەڕاستی لە لایەنی خۆمانەوە زانستمان داوە بە داوود)[3] ،کەواتە لەو ڕۆژەدا فێربوون و فێرکردنی زانست، لە هەموو شتێك باشتر بەندە لە خوداوە نزیك دەخاتەوە.

وەنوێژ کردنی سوننەت گەورەترە لە دانیشتنی چیرۆکخوانەکان، چونکەزانایانی

---

(١) قوت القلوب١/٦٧، وانظر الإتحاف ١/٩٩.

(٢) رواه الطبري في تفسيره: ٢٨/١٤(١٢٦) عن أنس مرفوعاً.

(٣) بەبەڵگەی ئەوەی کە خودای (عَزَّ وجَلْ) دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ عِلْمًا﴾ (النمل/١٥)الإتحاف ٣/٢٧٨.

سەلەف بە بیدعەو داهێنراویان دەزانی، وە چیرۆکخوانەکانیان لە مزگەوت دەردەکرد.

(حەزرەتی) عوبدوڵلای کوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) ئامادەی یەکێك لە دانیشتنەکانی بوو لە مزگەوتدا کە جومعەی لێ دەکرا، سەیری کرد کابرایەك لە شوێنەکەی ئەودا چیرۆك بۆ ئەو خەڵکە دەگێڕێتەوە، فەرمووی پێی: هەستە لە جێگاکەی من، وتی: هەڵناستم، من پێش تۆ لێرە دانیشتووم، ئەویش ناردی بۆ لای دادوەر و، یارمەتی دەرەکانی هاتن و دووریان خستەوە، خۆ ئەگەر ئەو چیرۆك خوێندنەوەیە سوننەت بوایە، دەرکردنی حەڵاڵ نەدەبوو، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(لا يُقيمَنَّ أحدَكُم أخاهُ مِنْ مَجلِسِهِ، ثمَّ يَجلِسَ فيهِ، ولكِن تفسَّحُوا و توسَّعُوا )**(١)

با یەکێك لە ئێوە براکەی هەڵنەستێنێت و لە جێگەی دانیشتنەکەیدا خۆی دابنیشێت، بەڵام جێگاکە فراوانتر بکەن و ڕێگایان بۆ بکەنەوە.

بۆیە (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عومەر حاڵی وابوو ئەگەر یەکێك هەستایە و شوێنەکەی خۆیی بۆ چاك بکردایە، دانەدەنیشت تێیدا، هەتا نەگەڕایەتەوە و دانەنیشتایەتەوە.

وە دەگێڕنەوە کە چیرۆکخوانێك لە دەرەوەی حوجرەکەی (حەزرەتی) عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) چیرۆکی بە دەنگی بەرز باس دەکرد، ئەویش ناردی بۆ خزمەتی (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی مەسعود، کە ئەو کابرایە بە

---

(١)أخرجه مالك والبخاري(٩١١)(٦٢٧٠)ومسلم(٢١٧٧)والترمذي وأخرجه أحمد والبخاري بلفظ:**لا يقيم الرجلُ الرَّجلَ مِن مقعدِه ثمَّ يجلس فيه** وأخرج الطبراني فيالكبير عن أبي بكر:**لا يقومُ الرَّجلَ للرَّجلِ من مكانهِ ولكن ليوسِّعَ الرَّجلُ لاخيهِ المُسلم**. الإتحاف ٢٧٨/٣.

چیرۆکەکانی ئەزێتم دەدات و، ناهێڵێت تەسبیحاتەکەم تەواو بکەم، ئیبن و عومەر ئەوەندەی لێ دا تا عەصاکەی دەستی لە پشتیدا شکاندەوە، لە پاشان دەری کرد[1]،

**دوهەم: دەبێت چاودێری باشی ئەو سەعاتە زێرینە پیرۆزە بکات،** وەك لە هەواڵێکی مەشهوردا هاتووە: **((إنَّ في الجُمُعة ساعَةٌ لا يوافِقُها عبدٌ مسلمٌ يَسالُ اللهَ تعالىَ فيها شَيئاً إلاَّ أعطاهُ إيَّاهُ))،**[2]،

واتە: بە ڕاستی لە ڕۆژی جومعەدا ساتێکی تێدایە، هەر بەندەیەکی موسوڵمان یەك بگرێتەوە لەگەڵ ئەوکاتەدا و، بەورییاییەوە دۆعا و نزای تێدا بکات، ئەوا هەر داوایەکی هەبێت خودا پێی دەدات.

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: کە لە نوێژدا هەرداوایەکی هەبێت خودا لێی وەردەگرێت: **((لا يُصادِفُها عَبدٌ يُصَلِّي))**[3]،

وە ڕای جیاواز هەیە لە بارەی ئەو ساتە وەختەوە، هەندێك دەڵێن:

لە کاتی هەڵاتنی خۆردایە، وە ڕایەکی تر کاتی ترازان و زەوالی خۆری لە ناوەڕاستی ئاسمان داناوە، وە ڕایەکی تر دەڵێت:

لە گەڵ بانگی جومعەدایە، یان لە کاتی سەرکەوتنی خەطیبە بۆ سەر میمبەر، وە دەستپێکردنی بە وتار، وە ڕایەکی تریش دەڵێت: ئەو کاتەیە کە خەڵکەکە هەڵدەستنەوە بۆ نوێژکردن، وە ڕایەکی تر کاتی ئیختیاری داناوە، واتە دوا کاتی

---

(١) قوت القلوب ٦٨/١.

(٢)قال العراقي أخرجه الترمذي(٤٩٠) وحسنه، والنسائي(١١٥/٣)،وابن ماجه(١١٣٨) من حديث عمرو بن عوف المزني لكن لفظه: **(لا يسألُ الله العبد فيها شيئاً إلاّ أتاه إيَّاهُ)**، وهو في صحيح مسلم من حديث أبي هريرة دون ذكر الصلاة، وبزيادة **(وهوَ قائمٌ يصلي)**وفي مسند أحمد من حديث جماعه من الصحابة.

(٣) متفق عليه، البخاري(٩٣٥)، ومسلم(٨٥٢)من حديث أبي هريرة.

نوێژی عەسر،[1]، وە ڕایەکی تر پێش نوێژی خۆرئاوای دیاری کردووە، وە (حەزرەتی) فاطیمە (خودای لێ ڕازی بێت) چاودێری ئەو کاتەی کردووە، وە فرمانی دەدا بە بەردەستەکەی کە سەیری کاتی ئاوابوونی خۆر بکات و هەواڵی پێ بدات، ئەویش دەستی دەکرد بە نزاو پاڕانەوەو داوای لێبودنی خودایی، تا خۆرئاوا دەبوو، وە هەواڵی دەدا کە ئەو ساتە وەختەیە کە دەبێت چاوەنواڕی بکرێت، وە ئەم هەواڵەی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕایەوە[2]، هەندێك لە زانایانیش دەفەرموون: ئەوساتەیە نادیارە، لە تەواوی ڕۆژەکەدایە وەك شەوی قەدری پیرۆز، بۆ ئەوەی هاندەرێکی زیاتر بێت کە خۆیی بۆ ئامادەبکات و چاودێری ئەو ساتە وەختە بکات.

هەندێك دەفەرموون:

کە ئەو ساتەیە لە ڕۆژی جومعەدا دەگوازرێتەوە وەك گواستنەوەی شەوی قەدر، ئەمەش ڕایەکی نزیکترە لە ڕاستی، وە ئەمە نهێنییەکی تایبەتی

---

(١)وقال العراقي في شرح الترمذي أكثر الاحاديث يدل على أنها بعد العصر: فمن ذلك حديث أنس وعبد الله بن سلام وجابر بن عبد الله وأبي سعيد وأبي هريرة وفاطمة صح منها حديث عبد الله بن سلام وجابر وأبي سعيد وأبي هريرة اهـ. وروي إبن أبي شيبة في مصنفه هذا القول عن ابن عباس وأبي هريرة وطاوس ومجاهد وحكاه ابن بطال عن مجاهد وقال المهلب وحُجَّةُ مَن قال إنها بعد العصر، قوله ﷺ : **(يتعاقبون فيكم ملائكة الليل والنهار يجتمعُون في صلاه العصر ، ثم يعرج الذين باتوا فيكم، فهو وقت العروج وعروض الأعمال على الله تعالى، فيوجبُ الله تعالى مغفِرتَه للمصلين من عباده).** الإتحاف٣/٢٨٠.

(٢)ذكر الدار قطني في العلل إنَّها رضي الله عنها قالت: (قلت للنبي ﷺ **أي ساعةٍ هي؟ قال: إذا تدلي نصف الشمس للغروب، فكانت فاطمة تقول لغلام لها: إصعد إلى الظراب فإذا رأيتَ الشَّمس قد تدلي نصف عينها فأخبرني حتي أدعُو)**.وأخرجه أيضا البيهقي في الشعب وهذا هو القول السابع، الإتحاف٣/٢٨٠.وهي عند البيهقي في الشعب(٢٧١٦).وقوت القلوب١/٦٦. وإسحق بن راهويه في مسنده (الشعب) ٢١٠٩).

تێدایە کە ناکرێت لە عیلمی موعامەلەدا باسی لێوە بکەین، بەڵام ئەوەندە هەیە کە دەبێت باوەڕ بکەین بە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ :

**((إنَّ لِرَبِّكمْ فِي أيام دَهْرِكُم نفَحات، ألاَ فتعَرَّضُوا لَها))**[1]

(واتە: لە ڕۆژگارەکانی ژیانتاندا نەفەحات و بەخشندەیی و بۆن و بەرامێکی پڕ لە میهرەبانی خوداتان بۆ دێت، بێداربن و خۆتانی بدەنەبەر و لێی بەهرەمەند ببن)

وە ڕۆژی جومعەیش بەشێکە لەو ڕۆژە تایبەتیانە، پێویستە بەندەی ڕاستەقینە لە هەموو ڕۆژەکەدا خۆی بۆ ئامادەبکات و، دڵی بۆ ئامادەباش بکات و، بەردەوام ئاواشتەی بکات بە زیکر و یادی خودا، وە خۆی لە خەتەرەو وەسوەسە دونیاییەکان لابدات و، دڵی لێیان هەڵبکەنێت، بەڵکو بەری ئەو بەخشین و ڕەحمەتە تایبەتیانە بکەوێت.

لەم بارەیشەوە کەعبی ئەحبار فەرموویەتی: ئەو ساتەیە لە دوا ساتەکانی ڕۆژی جومعەدایە، کاتی خۆرئاوابوون[2].

(حەزرەتی) ئەبوهورەیرەیش فەرموویەتی:

چۆن دەکرێت لە دوا ساتەکان بێت، کە من بیستوومە لە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەندەیەك نییە کە لە کاتی نوێژکردندا پێی بگات، وە لەدوای نوێژی عەسرەوە تا خۆر ئاوابوون نەهی کراوە لە نوێژ کردن؟

کەعب فەرمووی: ئایا پیغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە: **((مَنْ قَعَدَ ينتَظِرُ الصَّلاةَ فَهُوَ**

---

(١)قال العراقي أخرجه الترمذي الحكيم في النوادروالطبراني في الكبير(٢٢٣/١٩) وفي الأوسط من حديث محمد بن مسلمه ولابن عبدالبر في التمهيد(٣٣٩/٥) بنحوه من حديث أنس.

(٢)وهو قول عبد الله بن سلام كما هو عند أبي داود(١٠٤٦) والنسائي(١١٤/٣) والحاكم وروي سعيد بن مصور في سننه من روايه أبي سلمة بن عبد الرحمن ناساً **من أصحاب رسول الله ﷺ إجتمعوا الساعة التي في يوم الجمعة فتفرقوا ولم يختلفوا إنها آخر ساعة من يوم الجمعة فتذكروا** وهذا هو القول العاشر.

**في صَلاةٍ))**[1] ئەبو هورەیرە فەرمووی: بەڵێ وایە، کەعبیش فەرمووی: کەواتە ئەوە نوێژە و، چاوەنواڕی نوێژیش هەر بە نوێژ حیسابە، ئیتر ئەبو هورەیرە بێدەنگ بوو، وەك ئەوەی ڕازی بێت بە قسەکەی.

ڕای کەعب وابوو کە ئەو ساتەیە ڕەحمەتێکە تایبەتییە لە لایەنی خودای (عَزَّ وجَلَّ) وە، بۆ ئەوکەسانەی کە ماڤی ئەو ڕۆژەیە دەدەن، وە کاتێکیش

---

(١)أخرج ابن جرير من حديث أبي هريرة **من جلَس في المَسجدِ ينتَظِرُ الصَّلاة فهُوَ في صَلاةٍ** الإتحاف ٢٨١/٣. وقد روي حديث الانتظار من وجه آخر من حديث أبي هريرة وعبد الله بن سلام و سهل بن سعد عن أحمد والنسائي وابن حبان والطبراني والبيهقي والضياء بالفاظ مختلفه، ثم هذه القضية هكذا أوردها صاحب القوت(٦٦/١) والمصنف تبِعَه على عادته، وقد قال العراقي: وقع في الاحياء إنّها في كلِّ سنةٍ مرةً ثمَّ رجعَ، والحديث رواه أبو داود(١٠٤٦) والترمذي والنسائي(١١٤/٣) وابن حبان من حديث أبي هريرة، ولابن ماجه نحوه من حديث عبد الله بن سلام اهـ قلت: وجدتُ بخط الشيخ شمس الدين الداوودي مانصُّه: صحح أبو زرعه الدمشقي أنَّ أبا هريرة إنَّما روى الحديث كله عن كعب اهـ . فعلَى هذا لِذكرِ كعْبٍ في القصَّةِ أصلٌ. وأمَّا حديث عبد الله بن سلام فأخرجَه مالك وأبو داود والترمذي والنسائي وابنُ خزيمة وابن حسان والحاكم في المستدرك من طريق محمد بن ابراهيم عن أبي سلمة عن أبي هريرة بلفظ: (**خير يومٍ طلعت فيه الشمس يومُ الجمعةِ، وفيه ساعةٌ لا يوافِقها عبدٌ مسلمٌ يُصلِّي يَسألُ الله فيها شيئاً إلا أعطاهُ.**) قال أبو هريرة فلقيتُ عبد الله بن سلام فذكرتُ له هذا الحديث فقال: (**أنا أعلمُ تلكَ الساعة، فقلت أخبرني بها ولا تضن بها عليَّ، قال هي بعد العصر إلى أن تغربَ الشمس، قلت: وكيف تكونُ بعد العصر، وقال قال رسول الله ﷺ لا يوافقها عبدٌ مسلمٌ وهو يُصلي، وتلك الساعة لا يُصلِّي فيها، قال عبد الله بن سلام اليس قد قال رسول الله صلي الله عليه وسلم من جلس مجلسا ينتظر الصلاة فهوَ في صلاة. قلتُ: بلَى، قال فهو ذاك**، لفظ الترمذي وقال حسن صحيح وفي روايه ابي داود والنسائي والحاكم قال عبد الله بن سلام: **هي آخرُ ساعةٍ من يَوم الجمعةِ وقال الحاكم صحيحٌ على شرط الشيخين)**، ينظر لتفصيل أكثر الإتحاف ٢٨١/٣_٢٨٢.

بەخشینەکەیان پێ دەدرێت و، ڕەحمەتەکەیان لەسەر والآ دەکرێت، کە کاری ئەو ڕۆژە بە کۆتا بگات، کەواتە بە کورتی ئەو ساتەیە وەختێکی زۆر پیرۆز و گرنگە، لە کاتی بەرزبوونەوەی ئیمامەوە دەست پێدەکات، با لەو کاتەدا زۆر نزاو پاڕانەوەی خۆی بکات.

**سێیەم:** سوننەتە لەم ڕۆژەدا زیاترین و زۆرترین صلاوات لە دیداری پێغەمبەر ﷺ بدات، بەڕاستی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَنْ صلَّى عليَّ في يَوم الجُمعَةِ ثمانينَ مَرةً، غَفَرَ اللهُ لهُ ذنُوبَ ثمانينَ سنَةٍ، قيل يا رسولَ اللهِ كيفَ الصلاةُ عليكَ؟ قال: تقولُ: اللَّهُم صَلِّ علَى مُحمَّدٍ عَبدِكَ ونبيِّكَ ورسُولِكَ النَّبيِّ الأُمِيِّ وتَعقِدُ واحدةً))**[1]،

واتە: ئەوەی لە ڕۆژی جومعەدا هەشتا کەڕەت صەڵەواتم لێ بدات، خودای گەورە لە گوناهی هەشتا ساڵی خۆش دەبێت، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا چۆن صلاواتت لێ بدەین؟ فەرمووی بڵێن: خودایە صلاوات و ڕەحمەتی خۆت بڕژێنە بەسەر (حەزرەتی) موحوممەد، بەندەو پێغەمبەر و نێرراوی نەخوێندەوارو پێغەمبەری تۆ، وە ئەگەر بڵێیت:

**((أَللَّهُمَ صَلِّ علَى مُحَمَّد وعَلَى آلِ مُحَمَّد، صَلاةً تَكونُ لَكَ رِضاً ولِحَقِّهِ أَداءً، وأعطِهِ الوَسيلَةَ (والفضيلَة)، والمَقامَ المحمُودَ الذي وعَدْتَه)، واجْزِهِ عَنَّا ما هُوَ أَهلُهُ، واجْزِهِ أَفضَلَ ما جَزيتَ نَبياً عَنْ أُمَّتِهِ، وصَلِّ عَلَى جَميعِ إِخوانِهِ مِنَ النَّبيِّينَ والصَّالِحينَ ياأَرحَمَ الرَّاحِمينَ))** واتە:

خودایە ڕەحمەتی خۆت بڕژێنە بەسەر گەورەمان (حەزرەتی) موحەممەد و ئال

---

(١)قال العراقي أخرجه الدارقطني من رواية ابن المسيب قال وأظنُّه عَن أبي هُريرَة وقال حديث غريب وقال ابن النعمان حديث حسَن اهـ رواه ابن شاهين في فضائل الأعمال(٢٢) والخطيب في تأريخ بغداد(٤٦٣/١٣).وينظر الإتحاف٢٨٦/٣.

و بەیتی (حەزرەتی) موحەممەد، صڵاواتێك كە مایەی ڕەزامەندی تۆ بێت، وە مافی ئەو زاتەمان لەسەر لابدات و، پلە و مقامی پیرۆزی وەسیلە و فەضیلەیشی پێ ببەخشە، وە مقامی شایستەو پەسەند كراویشی پێ ببەخشە، كە بەڵێنت پێ داوە، وە ئەوەندەی كە شایانیەتی پاداشتی لە بری ئێمەوە بدەرەوە، وە ئەوەندە پاداشتی بدەرەوە، باشتر و گەورەتر لەوەی كە پاداشتی هەر پێغەمبەرێكت داوەتەوە لە جیاتی ئوممەتەكەی، وە ڕەحمەتی خۆیشت برڕێنە بەسەر براكانی، لە پێغەمبەران و پیاوچاكان ، ئەی لە هەموو كەسێك بەسۆز و میهرەبان بەڕەحم و بەسۆز تری.

ئەو صڵاواتە حەوت جار بیڵێیت، لە حەوت جومعەدا، لە هەموو جومعەیەكدا حەوت جار، ئەوا شەفاعەتی پێغەمبەری ﷺ بۆ واجب دەبێت. وە ئەگەر ویستی صڵاواتی زیاتریش لێ بدات، ئەوا صڵاواتە مونسوورەكان دەهێنێت و دەیانخوێنێت و دەڵێت:

**((اللَّهُمَ اجْعَل فَضائِلَ صَلَوَاتِكَ، ونَوَامِيَ بركاتِكَ، وشَرائِفَ زَكَواتِكَ، ورَأفَتِكَ ورَحمَتِكَ وتَحِيَّتِكَ، علَى(سَيِّدِنا) مُحَمَّدٍ) سَيِّدِ المُرسَلينْ وإمامِ المُتَّقينْ، وخاتَمِ النَبيّين، ورَسُولِ رَبّ العَالَمين، قائدِ الخَيرِ، وقائِدِ الغُرِّ المُحَجَّلينْ، وفاتِحِ البِرِ، وَنبِيِ الرَّحمَةِ وسَيِّدِ الأُمَّةِ، اللهم: ابعَثهُ مَقاماً مَحمُوداً تُزلِفُ بِهِ، قُربَهُ وتَقُرُ بهِ عَيْنُهُ، يَغبِطُهُ بهِ الأَوَّلونَ والآخِرونَ، اللَّهُمَ أعطِهِ الفَضْلَ والفَضِيلَةَ وَالشَّرَفَ والوَسيلةَ، والدَّرَجَةَ الرَّفيعَةَ، والمَنزِلَةَ الشَّامِخَةَ المُنيفَةَ، اللَّهُمَ اعْطِ مُحمَّداً سُؤلَهُ، وبَلِّغْهُ مأمُولَهُ، واجْعَلْهُ أَوَّلَ شافِعٍ وأوَّلَ مُشَفَّعْ، اللَّهُمَّ عَظِّمْ بُرهانَهُ، وثَقِّلْ مِيزانَهُ، وأفلِجْ حُجَّتَهُ، وارْفَعْ في أعلَى المُقرَّبينَ دَرجَتَه، اللَّهُم احشُرنا في زُمرَته، واجْعَلنا في أهْلِ شَفاعَتِهِ واحْيِنا، علَى سُنَّتِه، وتَوفَّنا عَلَى مِلَّتِهِ، واسقنا بكأسِه غَيْرَ خَزايا، ولا نادِمينَ، ولا شَاكِّينَ، ولا مُبَدِّلينَ، ولاَ فاتِنينَ، ولاَ مَفتُونِينَ،**

آمينْ يا رَبَّ العَالمين)[1]

واتە: خودایە؛ ڕەحمەت و صەڵاواتە گەورەکانت، وە پیت و بەرەکەتە زیادبووەکانت، وە زیادەی خێر و چاکە پاڵفتەکراوەکانت، وە نەرمی و بە سۆزی و میهر و سەلامکردنت، هەمووی بڕژێنە بەسەر (حەزرەتی) موحەممەددا ﷺ، گەورەی نێرراوانی خودا، وە پێشەوای خواپەرستە تەقواکارەکان، وە کۆتای پێغەمبەران و، نێرراوی پەروەردگاری هەموو عالەم، سەرکردەی چاکەکاران و بکەرەوەی گشت چاکە داخراوەکان و، پێغەمبەری خاوەنی ڕەحمەت و، گەورەی ئوممەت، ئەی خودایە دیسان زیندووی بکەرەوە، بەو مقامە بەرزە پەسەندکراوەی کە بۆی دانراوە، کە نزیکتری بکەرەوە لە خۆت و، چاوی پێ ئاسوودەو دڵنیا بکە، کە هەموو خەڵکە سەرەتایی و کۆتاییەکان ئاواتی پێ دەخوازن، دەی خودایە گیان، گەورەیی و جۆرەکانی کەماڵ و شەرەفمەندی پێ ببەخشە، لەگەڵ مەقامی شەرەف و، ڕێز و نزیکی و وەصڵی حەقیقی، وە پلە بەرز و باڵاکان، وە مەنزڵگای پڕ لە شکۆمەندی و باڵا و بەهادار، ئەی خودایە؛ ببەخشە بە (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ ئەوەی داوای دەکات، وە بیگەیێنە بە هەموو ئاواتەکانی، وە بیگێڕە بە یەکەم تکاکار و، یەکەم تکا قەبوڵکراوێك، ئەی خودایە؛ ئەو بەڵگانەی کەبە دەستیەوەیەتی، گەورەو بەهێزتری بکە، وە بارسەنگی کێشانەی کردەوەکانی قورستر بکە، وە بە ڕون و ئاشکرایی بیگەیێنە بە هەموو بەڵگەکانی، وە پلەی بەرزکەرەوە بۆ باڵاترینی پلەکان، ئەی خودایە؛ لە ناو تاقم و ڕیزەکانی ئەودا زیندوومان بکەرەوە، وە بمانگێڕە لە وانەی بەری شەفاعەت و تکاکانی دەکەون، وە بمانژێنە لە سەر سوننەتەکانی، وە بمانمرێنە

---

(١) رواه ابن أبي عاصم في (الصلاة على النبي)(٢١) مرفوعاً، و (٢٣) موقوفا على علي (رضي الله عنه) بنحوه، وهو في القوت (٦٦/١).

لەسەر میللەتەکەی، وە بمانخەرە سەر حەوزەکەی و، ئاواشتەمان بکرەوە لە ناوی کەوسەری دەستی پیرۆزی خۆی، کە هەرگیز سەرشۆڕ و پەشیمان نەبین و، گومان و دوودڵی و گۆڕانمان بۆ پەیدانەبێت، نەهیچ شتێك وەرمانگێڕێت و فریومان بدات و، نە کەسی تریش هەڵبفریوێنین. داواکانمان وەربگرە ئەی پەروەردگاری هەموو جیهان ئامین. کەواتە بە کورتی هەرجۆرە صڵاواتێك بهێنێت و بیدات و بەکاری بهێنێت، با ئەوەش بێت کە مەشهوورە لە ناو تەحیاتدا، ئەوە بە صڵاواتدەر دادەنرێت. وە پێویستە لە گەڵ صڵاواتدا داوای لێبوردنیش بکات لە خودا. بەڕاستی ئەمەیش کارێکی باشە بۆ ئەم ڕۆژەیە.[1]

---

(١) بەڕاستی لە بارەی چۆنیەتی صڵاواتدان لە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ دەبێت هەڵوەستەیەك بکەین، لە کتێبی (القول البدیع للحافظ أبي الخیر السخاوي)(خودای لێ ڕازی بێت) زۆر بە جوانی لەمبارەوە دەفەرموێت: قاضی عەیاض لە ئیبراهیمی التجیبی دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: واجبە لەسەر هەموو باوەڕدارێك کە ناوی پێغەمبەر ﷺ ببات، یان ناوی ببرێت لەلایدا، دەبێت ملکەچ و گەردن کەچ و بێدەنگ و بێ جوڵە بێت و، ئەو پەڕی گەورەیی بۆ بڕیار بدات، وە سام و هەیبەتی پێغەمبەر ﷺ لە دڵیدا جێگیر ببێت، وەك چۆن لە خزمەتی دا بێت، دەبێت ئاوا بجوڵێتەوە، زانایانی سەلەف و صاڵحانی پێشوو، پێشەوایانی ئیسلام بەمشێوە دەجوڵانەوە، ئیمامی مالیك (خودای لێ ڕازی بێت) ئەگەر ناوی (حەزرەتی) ببردایە، ڕەنگی دەگۆڕاو خۆی دادەنەواند و دەیفەرموو : ئەوەی من دیومە ئێوەش بتانبینیایە، ئەوا ئینکاریتان لێ نەدەکردم، بەڕاستی محەممەدی کوڕی مونکەدیرم دەبینی، کە سەییدی قورئان خوێنەکان بوو، ڕێنەکەوتووە پرسیاری حەدیسێکت لێ بکردایەو ئەو نەگریایە، وە جەعفەری کوڕی موحەممەدم دەبینی، ناوی (حەزرەتیان لا ببردایە، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕاو

## چوارەم: خوێندنەوەی قورئان

با زۆر بیخوێنێتەوە، وە با لە ڕۆژی جومعەدا بە تایبەتی سوورەی کەهف بخوێنێت، وەك ئیبن و عەباس و ئەبو هورەیرە (خودایان لێ ڕازی بێت)لە

---

هەرگیز بەبێ دەست نوێژ ناوی نەبرد، عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسم (خودای لێ ڕازی بێت) باسی (حەزرەتی) بکردایە، وەك خوێن تەزبێتە دەموچاویەوە ناوابوو، زوبانی لە دەمیدا وشك دەبوو، ئەوەندە سامی لە ناوی ئەو زاتە دەکرد، کاتێك دەچووم بۆ خزمەتی عامیری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر کە ناوی (حەزرەتیان لەلایدا ببردایە، ئەوەندە دەگریا فرمێسك لەچاوی دا نەدەما، ئیمامی زوهەریم دەبینی، لە هەموو کەس ڕوخۆش و کراوە تربوو، کەناوی پێغەمبەرﷺ یان لەلادا ببردایە، وای لێ دەهات وەك نەتناسێت و نەیناسیت، دەچوومە لای صەفوانی کوڕی سەلیم ، کەناوی پێغەمبەر یان لا ببردایە ئەوەندە دەگریا تا هەموو بە جێیان دەهێلا، هەروەها سەختیانی دەبوایە بە جێمان بهێڵایە، ئەکەر بەوردی سەرنجی حاڵی سەلەفی صاڵیحین بدەیت، ئەو کاتە دەزانیت کە ئەوانە سەلەفین، ئەوانە پێغەمبەرناسن، ئەوانە گەوهەر ناس و شارەزاو زاناو خوداناسن، نەك ئەوانەی ناویخۆیان ناوە بەو ناوە پیرۆزەوەو قورئان دەخوێننەوە و لاقیان بۆ دیوارەکان بەرز دەکەنەوەو ناوی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ دەبەن، وەك ناوی منداڵێکیان بردبێت و بە ئەندازەی بەرپرسێکی سادە ڕێزی لێ ناگرن، یەك زەڕە ئەدەب و خشوع و تەوازوع و سام و هەیبەتی خوایش لە دڵیاندا نییە، تا بە پێغەمبەرەکەیدا دەگات، خودا کۆمەڵگای ئیسلام لە شەڕو فیتنەی ئەو جادووانە بپارێزێت و، گرۆی موسوڵمانیش لە بێ ئەدەبی ئەوانەو هاوڕازەکانیان بپارێزێت ئامین. بنوارە الإتحاف ٣/٢٩٠-٢٩١. وە قوت القلوب ١/٦٧

پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەیگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

**((من قرأ سورة الكهف ليلةَ الجمعةِ أو يومَ الجُمعةِ أُعطيَ نوراً مِن حيثُ يقرؤُها إلى مكة، وغُفرَ لهُ إلى الجمعةِ الأُخرى، وفَضلَ ثلاثةِ أيَّام، وصلَّى عليهِ سَبعُونَ ألفَ مَلَك، حتَّى يَصبحَ، وعُوفيَ مِن الدَّاءِ والدُّبَيلةِ وذاتِ الجَنبِ، والبَرصِ والجُذامِ وفِتنَةِ الدَجَّال))**[1]،

واتە: ئەوەی سوورەی کەهف لە شەوی جومعەدا بخوێنێت یان ڕۆژەکەی، نوورێکی پێ دەدرێت، لەو جێگەوە کە دەیخوێنێتەوە تا شاری مەکە، وە تا ڕۆژی جومعەی داهاتوو لە گوناهەکانی خۆش دەبن، وە زیادەی سێ ڕۆژیش، وە

---

(١)لفظ القوت (٦٧/١) وذكره الحافظ المناوي في(فيض القدير) وقال: رواه الديلمي عن أبي هريرة يرفعه، وأصل الحديث مروى عند عبدالرزاق في المصنف(١٨٦/١، والدارمي في سننه (٣٤٥٠) والحاكم في المستدرك(٥٦٤/١) عن أبي سعيد. وروي ابن جريج عن عطاء عن ابن عباس وابي هريرة قال: قال رسول الله ﷺ كم قرأ فساقَه والمصنف تبعه في هذا السياق بتمامه، وقال العراقي لم أجده في حديثهما والبيهقي نحو من حديث أبي سعيد اهـ قلت اما حديث ابي هريره فوجدته عند الديلمي في مسند الفردوس أخرجه من حديثه يرفعه بلفظ: **(من قرأ سورةالكهف في ليلة الجمعة أعطي نوراً من حيث مقامه إلى مكة وصلَّت عليهِ الملائكةُ حتى يصبَح وعوفي مِن الداء والدُبيلَةِ وذاتِ الجَنب والبَرص والجُنون والجُذام وفتنه الدَّجال،)** قال الحافظ ابن حجر فيه اسمعيل بن أبي زياد متروك كذَّبهُ الدارقطني، وأما حديث ابن عباس فاخرجه أبو الشيخ الأصهاني لكن لفظه يخالف سياق المصنف قال: **(من قرا عشر آيات من سورة الكهف ملئَ من قرنهِ إلى قَدمِه إيماناً، ومن قرأها في ليلة جمعة كان له نور كما بينَ صنعاءَ وهذي، ومن قرأها في يوم جمعة قدَّم أو أخر حُفظ إلى الجمعةِ الأُخرى)**. فان خرج الدجال فيما بينهما لم يتبعه، وأما حديث أبي سعيد الذي أشار اليه العراقي وقال روي نحوه فلفظه عند الحاكم في التفسيروالبيهقي في السنن بلفظ: **(من قرأسورة الكهف في يوم الجمعة أضاء له من النور ما بين الجمعتين)** . وقال الحافظ بن حجر في تخريج الاذكار هو حديث حسن وهو اقوي ما ورد في قراءة سورة الكهف، ينظر للمزيد الإتحاف ٢٩١/٣-٢٩٢.

حەفتــا هەزار مەلائــیکە تــا بەیــانی داوای ڕەحمەتــی بــۆ دەکەن، وە لە دەردو دومبەڵی گەورە، کە لە ناوەوەی جەستەی توش دەبێت و، لە دومبەڵی تر کە لە تەنیشــتەوە توشــی دەبێــت و، لە ئــازاری کەلەکەو، گــولی و گەڕی و بەڵەکـی فیتنەی دەجالیش ڕزگاری دەبێت.

وە ئەگەر بتوانێت واچاکە لە شەوو ڕۆژی جومعەدا خەتمی قورئان بکات، وە ئەگەر بە شەو خوێندی، با خەتمەکەی لە نوێژی بەیانیدا تەواو بکات، یان لە دووڕکاتی مەغریبدا ، یان لە میانی بانگ و قامەتی ڕۆژی جومعەدا، ئەوە فەزڵێکی زۆری دەسدەکەوێت[1]

وە حــاڵی عابیــدو خوداناســەکان وابــووە، کە پێیــان خــۆش بــووە لە ڕۆژی جومعەدا هەزار جار سوورەی ﴿**قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ**﴾ بخوێنن[2]، وە دەڵێن: ئەوەی لە دە ڕکاتدا، یان لە بیست ڕکاتدا هەزار جار سوورەی ئیخلاص بخوێنێت، لە خەتمەیەکی قورئان خێری زیاترە، وە کاتی خۆی هەزار جار صڵاواتیان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێ دەدا[3].وە دەیانووت: (**سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ ولا إلهَ إلا اللهُ واللهُ أكبر**) وە ئەگەر هەر شەش سوورەتەکەی تەسبیحاتی تێدایە (**المُسبِّحات السِّتُ**) لە شەوو ڕۆژی جومعەدا بخوێنێت، ئەوە زۆر چاکە.[4]،

---

(١)قوت القلوب ٦٧/١.

(٢)رواه الرافعي في (تأريخ قزوين) ٢٠٦/٢، مرفوعا، **من قرأ قل هو اللهُ أحد ألفَ مرَّةٍ فقَدِ اشترى نَفسَهُ مِنَ اللهِ.**

(٣)واخرج أبو الشيخ من حديث أنس **من صلَّى علَيَّ في يومٍ ألفَ مَرةٍ لَم يمُت حتَّى يُبشِّر بالجنَّة**، الإتحاف ٢٩٤/٣، وانظر (جلاء الأفهام) ص/٥٧.

(٤) ئەو سورەتانەی (سَبَّح و يُسَبِّحُ) یان لە ئەووەڵەوە تێدایە، وەك سوورەتەکانی: **حديد، حشر، الصف، الجمعة، التغابن، الأعلى.**

باسی ئەوە نەکراوە کە پێغەمبەر ﷺ سورەتێکی تایبەتی خوێندبێت جگە لە شەوو ڕۆژی جومعە نەبێت، لە نوێژی ئێوارانی شەوی جومعە ﴿**قُلْ يا أَيُّها الكافُرون**﴾ و ﴿**قلْ هُو اللهُ أحَد**﴾ی دەخوێنند، وە لە شەوی جومعەدا لە نوێژی خەوتنان سوورەی(جومعەو مونافقین) ی دەخوێنند[1]،

وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕۆژی جومعەیشدا سوورەتەکانی جومعەو مونافقین ی دەخوێنند، وە لە نوێژی بەیانیانی ڕۆژی جومعەدا سوورەی (سەجدەی لوقمان)ی دەخوێنند، لەگەڵ سوورەتی ﴿**هل أتى على الإنسان**﴾دا[2].

## پێنجەم: نوێژەکان:

سوننەتە ئەگەر چووە ناو مزگەوتەوە دانەنیشێت تا چوار ڕکات نوێژ دەکات، ئەم سوورەتانەیان تێدا بخوێنێت:

﴿**قل هو الله أحد**﴾ دووصەد جار، لەهەموو ڕکاتێدا پەنجا کەڕەت، وەك گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە هەرکەسێك بیکات، نامرێت تا شوێنی خۆی لە بەهەشتدا نەبینێت، یان یەکێکی تر شوێنەکەی ببینێت[3].

---

(١) رواه ابن حبان في (صحيحه) (١٨٤١).

(٢)سورەی سەجدە، کە خراوەتە پاڵ لوقمان تالە وانی تر جودا ببێتەوە، رواه مسلم(٨٧٩).

(٣)قال العراقي أخرجه الخطيب في الرواة عن مالك من حديث ابن عمر وقال غريب جداً اهـ قال الزبيدي٣/٢٩٦: وأخرجه الدار قطني في غرائب مالك، وقال لا يصح إنتهى، وأمافضل من قرأ قل هو الله أحد مائتي مرة في صلاة او غيرها فقد أخرج البزار وابن الضريس في فضائل القران وسمويه من حديث أنس: (**من قرأ قل هو الله أحد مائتي مرة غُفر له ذنوب مائتي سنةٍ**)، وعن ابن عساكر من روايه ابان عن أنس،( **كفَّر عنهُ ذنوب خمسين سنةً ما خلا الدِّماء والأموال**).

وه نابێت واز له دووڕكاتی نوێژی (دیاری مزگەوت) بهێنێت، تەنانەت ئەگەر ئیمامیش وتاری دەدا، با دوو ڕكاتی سووك و خێرا بخوێنێت، بەم شێوه پێغەمبەر ﷺ فرمانی داوه[1]

وه له فەرمووده‌یەكی (غەریب)نامۆدا هاتووه كه پێغەمبەری خودا ﷺ بێدەنگ بووه له وتارەكەی بۆ كەسێك كه تازەهاتووه، تا له دووڕكاتەكەی لێ بووەتەوه، [2]،

وه زانا كوفییەكان دەفەرموون: ئەگەر ئیمام بێدەنگ بوو بۆ ئەو كەسەی كه تازه دێته ژورەوه ئەوا با ئەو دوڕكاته بخوێنێت[3]

هەروەها سوننەته لەو ڕۆژەدا یان له شەوەكەیدا چوار ڕكات نوێژ بكات به چوار سوورەتەوه، سورەتی ئەنعام و كەهف و طاها و یاسین، ئەگەر نەیزانی جوان بیانخوێنێتەوه، با یاسین بخوێنێت و سەجدەی لوقمان و سورەتی دوخان و سورەتی مولك، با واز له خوێندنی ئەم چوار سوورەته نەهێنێت له شەوی جومعەدا، چونكه خێر و فەزڵێكی زۆری هەیه.

---

(١) رواه مسلم (٨٧٥).

(٢)رواه ابن أبي شيبة في (المصنف) (٥٢٠٦)، وقال العراقي أخرجه الدارقطني(في سننه(١٦/٢) من حديث أنس وقال أسنده عبيد بن محمد ووهم فيه، والصواب عن معتمر عن أبيه مرسلاً اهـ، قلت قال ابو بكر بن ابي شيبة في المنصف(٤٤٧/١)(٥١٦٣) حدثنا هشيم اخبرنا ابو معشر عن محمد بن قيس **(أن النبي ﷺ حيث أمره أن يصلي ركعتين أمسك عن الخطبة حتى فرغ من ركعتيهِ ثم عاد إلى خطبته)** اهـ ثم اخرجه عن احمد بن حنبل حدثنا معتمر عن أبيه قال جاء رجل... الخ وفيه: **ثم انتظرهُ حتى صلَّى** قال وهذا المرسل هو الصواب اهـ الإتحاف٢٩٩/٣.

(٣) قوت القلوب!/٦٧، وه دەفەرموێت: ڕەنگه بێدەنگییەكەی پێغەمبەر ﷺ تایبەت بێت بەوەوه، لەبەر پێویستی فەرموودەكەی.

وه ئەوەش کە قورئانی ڕەوان نییە، ئەوسوورەتانە بخوێنێت کە جوان دەیانزانێت، وەك ئەوە بۆ دەنوسرێت کە خەتمەیەکی کردبێت،[١] با زۆر سوورەی ئیخلاص بخوێنێت.

وه سوننەتە نوێژی (صَلاةُ التَّسبيحْ) بخوێنێت، وەك لەمەودا لە باسی چۆنیەتییەکەی لە باسی عیبادەتی (خۆبەخشیدا) باسی دێت.

وه دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ بە (حەزرەتی) عەباسی مامی خۆی فەرموو:

(صَلِّها في كلِّ جمُعةٍ)[٢]، واتە لە هەموو جومعەیەکدا ئەو نوێژە بکە.

بۆ یە (حەزرەتی) عوبدوڵلای کوڕی عەباس لە ڕۆژی جومعەدا وازی لەو نوێژە نەهێناوە، لە دوای زەوالی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، وە هەمیشە هەواڵی دەدا کە چەندێك نوێژێکی بە نرخ و پڕ بەهایە[٣]،

---

(١) قوت القلوب١/٦٧: وقال: فذلك له ختمةٌ، فقيل: ختمة من حيث علمه).

(٢)وقال العراقي أخرجه أبو داود(١٢٩٧) وابن ماجه (١٣٨٧) وابن خزيمه(٢/٢٢٣(١٢١٦) والحاكم في المستدرك ١/٤٦٣(١١٩٢) من حديث ابن عباس وقال العقيلي في (الضعفاء) (١/١٣٤) وغيره ليس فيها حديث صحيح اهـ وقال الحافظ ابن حجر في تخريج الرافعي أما صلاة التسبيح فرواه أبو داود(١٢٩٧) والترمذي(٤٨١) وابن ماجه وابن خزيمة كلُّهم عن عبدالرحمن بن بشر بن الحكم عن موسى بن عبدالعزيز عن الحكم بن أبان عن عكرمة عن عباس قال قال رسول الله ﷺ للعباس **يا عباس يا عماه ألا أمنحُك ألاَ أحبوكَ** الحديث بطوله، وصححه أبو علي بن السكن والحاكم وادعى النسائي أخرجه في صحيحه عن عبد الرحمن بن بشر. الإتحاف٣/٣٠٠. وقال النووي في تهذيب الأسماء واللغاة ٣/١٣٦: في كتاب الترمذي وغيره، جاء في صلاة التسبيح حديث حسن وذكرها المحاملي وغيره من أصحابنا ، وهي سنة حسنة، ومال في الأذكار ص/١٤٨، إلى إستحبابها، بل قوَّاهُ واحتج به.

(٣) قوت القلوب ١/٦٧.

وە باشتر وایە کاتەکەی بخاتە میانی چێشتەنگاو، تا کاتی زەوال، وە لە دوای جومعەیشەوە تا کاتی عەسر، بۆ ئەوەی بتوانێت دوای عەسر گوێ لە دەرسەکانی بگرێت، وە دوای عەسریش تا خۆرئاوابوون، کاتی تەسبیحات و داوای لێبوردن بێت لە خودا[1]،

## شەشەم: خێر و صەدەقە

بەتایبەتی لەم ڕۆژی جومعەیەدا خێری زۆرە، ئەوە چەندین جار خێری بۆ دەنوسرێت، مەگەر بۆ کەسێك کە پرسیار بکات و ئیمام وتار بدات، ئەویش باسی لە قسەکانی ئیمام دەکرد، ئەوە مەکروهو ناپەسەندە.

صاڵحی کوڕی ئەحمەد فەرموویەتی:

هەژارێك لە ڕۆژی جومعەدا داوای لە خەڵکی دەکرد، ئیمامیش وتاری دەدا، لە تەنیشتی باوکمەوە بوو، پیاوێك هات پارەیەکی دا بە باوکم، (کە نەیشی دەناسی) بۆ ئەوەی بیدات بە دەستیەوە، بەڵام باوکم لێی وەرنەگرت.[2]، ئەگەر کەسێك لە مزگەوتدا داوای شتی کرد و سواڵی دەکرد، ئەوە شیاوی ئەوەیە کە هەر پێی نەدرێت، وە ئەگەر لە سەر خوێندنەوەی قورئان داوای شتی کرد، ئەوە نابێت بیدرێتێ.[3]

---

(١) قوت القلوب١/٦٥، بەم شێوە پێشینەکان ڕۆژی جومعەیان تەرخان دەکرد بەم سێ بەشەوە، تا زەوال بۆ نوێژی تەسبیحات، لە پاشان تا عەسر بۆ خوێندن و زانست وەرگرتن، وە لە سێیەم جار دا بۆتەسبیحات و داوای لێ خۆشبوونی خودا.

(٢) قوت القلوب١/٦٩ئەگەر سوننەت بوایە ئەحمەد (خودای لێ ڕازی بێت) ئەو کارەی دەکرد.

(٣) قوت القلوب ١/٦٩.

وه هەندێك لە زانایان ڕایان وایە كە ناپەسەندە خێرو یارمەتی كەسانێك بدەیت كە سواڵ دەكەن و لەسەر ملی خەڵكی دەڕۆن، مەگەر بە پێوە یان بە دانیشتنەوە داوا بكات و بەسەر كەسیشدا نەڕوات.

كەعبی ئەحبار فەرموویەتی: ئەوەی بێتە ناو جومعەوە و، لە پاشان بچێتە دەرەوە و، دوو صەدەقە بكات بە دوو شتی جیاواز لە چاكە، لە پاشان بگەڕێتەوەو، دوو ڕكات نوێژ بكات، ڕكوع و ملكەچی و خشوع و سوجدەكانی تەواو بكات ، لە پاشان بڵێت:

**((اللَّهُم إني أسألكَ بإسمِكَ بسم اللهِ الرَّحمَن الرَّحيم، وباسمِكَ الّذى لا إلهَ إلاّ اللهُ، هُو الحَيُّ القيُّومُ، لا تأخذُه سِنَةٌ ولا نَومٌ) لَم يسألِ اللهَ تعالَى شَيئاً إلاّ أعطاهُ))**[1]، خودایە من داوات لێ دەكەم بە ناوی پیرۆزت، بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان و دلۆڤان، كە زیندووە و هەموو شتێك بەو زاتە وە ڕاوەستاوە، داوات لێ دەكەم كە لێم خۆش ببیت، وە ڕەحمم پێ بكەیت و

(١)كذا فى القوت وفى القول البديع للحافظ السخاوى عن أبى موسى المدينى والنميرى موقوفا:

**(من غَدا إلى المسجد فتصدق بصدقة، قلَّت أو كثُرت، فاذا صلّى الجمعةَ قال: اللهم إنِّي أسألكَ باسمِك بسم الله الرحمن الرحيم الذى لا اله الا هو عالم الغيب والشهادة الرّحمنِ الرحيمِ، وأسألك باسمك بسم الله الرحمن الرحيم الذى لا اله الا هو الحيُّ القيوم، لا تأخذه سنة ولا نوم، الذى ملأت عظمتهُ السموات والأرضُ، وأسألك باسمك بسم الله الرحمن الرحيم الذى لا اله الا هو الذى عنَتْ لَه الوُجوهُ وخشعَت لهُ الأبصارُ ووَجِلتْ القلوبُ من خَشيتهِ أَن تُصليَ على مُحمَّد صلى الله عليه وسلَّم وأن تَقضِيَ حاجَتى وهيَ كذا وكذا، فإنَّه يُستجابُ لهُ إن شاء الله تعالى، قال: وكان يقالُ: لا تُعلِّمُوها سُفَهاءكُم لئلاً يدعُوا بهِ في مأثم أو قطيعَةِ رحَمٍ).** الإتحاف ٣٠٢/٣.

بەزەیت پێمدا بێتەوە، وە لە ئاگری دۆزەخ بمپارێزیت و، لێم ببوریت. ئەگەر ئەم نزایە بکات و داوا لە خودا بکات، ئەوا خودا دێت بەدەم داواکەیەوە.

**هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە:**

هەرکەسێك لە ڕۆژی جومعەدا هەژارێك تێر بکات و، خۆراکی پێ بدات، لە پاشان لە ماڵی خۆی بچێتە دەرەوەو، بە زوویی بچێت بۆ مزگەوت و، لەپاشان لە کاتێدا ئیمام سەلام دەکات بڵێت:

**(بسم الله الرحمن الرحيم الحَيِّ القَيُّوم، أَسألُكَ أَن تَغفِرَ لِي وتَرحَمَني وأَن تُعافِيَني مِنَ النار)**، بە ناوی خودای مەزن و دلۆڤان و بەخشندە، دوات لێ دەکەم لێم خۆش ببیت، وە ڕەحمم پێ بکەیت، وە لە ئاگریش ئازادم بکەیت.

لە پاشان هەرچی مەبەست بێت و بیەوێت داوای بکات خودا بۆی جێ بەجێ دەکات.[1]

**حەوتەم: کارێ بکات ڕۆژی جومعە تەرخان بێت بۆ ئاخیرەتی:**

واز لە هەموو سەرقاڵییەکی دونیایی بهێنێت، ویرد و زیکری زۆری تێدا بخوێنێت، سەرەتای سەفەر و گەشتی لە ڕۆژی جومعەوە دەست پێ نەکات، وەك ڕیوایەتکراوە: ئەوەی لە شەوی جومعەدا سەفەر بکات، مەلائیکەکانی سەرشانی دۆعای لێ دەکەن[2]،

---

(١) قوت القلوب ٦٩/١.

(٢)قال العراقي رواه الخطيب في الرواة عن مالك من حديث أبي هريرة بسند ضعيف جدا قال الزبيدي: وأخرجه الدار قطني في الإفراد من حديث ابن عمر بلفظ: **دعَت عليه الملائكة أن لا يصحب**، وأوردهُ الضياء في احكامه وقال في سنده ابن لهيعة. وقال أبو بكر بن أبي شيبة(في المصنف) (٥١٥٨) حدثنا عيسى بن يونس عن الاوزاهي عن حسان بن علية قال: **( إذا سافر يوم الجمعة دعى عليه أن لا يصحب ولا يعان على سفره)**، وأبي نعيم في الحلية:٧٥/٦.

وه گەشت و سەفەر لە ڕۆژی جومعەدا حەرامە، مەگەر ترسی ئەوەی هەبێت کە هاوڕێکانی بە جێی بهێڵن.

وەهەندێك لە زانایان بە ناپەسەندیان زانیوە کە لە مزگەوتدا ئاو لە ئاوگێڕ بکڕێت و بیکات بە خێر، بۆ ئەوەی حەرەمی مزگەوت نەبێتە جێگەی کڕین و فرۆشتن، چونکە شت کڕین و فرۆشتن لە مزگەوتدا کەراهەتی هەیە، بەڵام فەرموویانە قەیناکە ئەگەر پارەکەی لە دەرەوەی مزگەوت پێ بدات و، لە ناو مزگەوت بیخواتەوە، یان بیکات بە ئاوی خێر و بیگێڕێت[1]،

**وە خۆلاصەی قسە ئەمەیە:**

پێویستە لە ڕۆژی جومعەدا خێر و ئەوراد و چاکەکانی زیاتر بکات، چونکە ئەگەر خودای (عَزَّ وجَلْ) یەکێکی خۆش ویست، لە کاتە باش و پڕ خێرەکاندا بەکاری دەهێنێت، کە کردەوە چاك و پڕ لە خێرەکان ئەنجام بدات، بەڵام ئەگەر ڕقی لە بەندەیەکی بوو، لە کاتە باش و پڕ لە خێرەکاندا وای لێ دەکات کە کردەوەی خراپەی تیا ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی شیاوی سەخت ترین و بە ئازار ترین سزا بێت کە بەری بکەوێت، وە زیاتر لێی تورە ببێت، چونکە لە بەرەکەتی ئەو کاتە پڕ لە خێر و پیرۆزیانە بێ بەش بووە، وە لەو کاتە پڕ لە خێر و بەرەکەتانەدا سنووری بەزاندووە و، کاری خراپی تێدا ئەنجامداوە.

وە لە جومعەدا کۆمەڵە دۆعاو نزایەك سوننەتن کە بینکات، وە لەمەودوا لە پەڕاوی نزاو دۆعاکاندا پشت بەخودا باسیان دێت، ئەگەر خودا یارمەتی داین.

**وصلَى اللهُ علَى كلِّ عَبدٍ مُصْطَفَى**

صەڵات و ڕەحمەتی خودا لەسەر هەموو بەندە پاڵێوراوو پاڵفتەکراوەکان.

---

(١) قوت القلوب ٦٩/١.

# دەروازەی شەشەم

## باسی چەندین پرسی جیاواز، کە هەموانی تێوە گلاوە، وە پێویستی مورید لە شارەزابوونیان

باسی ئەو پرس و مەسەلانەی کە زۆر بەدەگمەن ڕودەدەن، ئەوە سەرژمێرمان کردوون و لە کتێبە فیقهییەکاندا باسمان کردوون.

## بابەتێك

### پەیوەندارە بە جوڵەو کردارەکانی نوێژخوێنەوە کە دەیانکات، لەڕوی دروستی و بەتاڵییانەوە:

هەرکارێکی کەم، با نوێژیش بەتاڵ نەکاتەوە، ئەوە بە کارێکی ناپەسەند دادەنرێت، مەگەر لە بەر پێویستی، وەك ڕێگەنەدان بە کەسێك کە بیەوێت بچێت بەبەردەم نوێژەکەتدا، یان دوپشکێك بکوژیت کە لێی بترسیت و، بە لێدانێك یان دووجار لێدان بتوانیت بیکوژیت، خۆ ئەگەر بوو بە سێ جار ئەوە زۆر دەبێت و نوێژەکەی پێ بەتاڵ دەبێتەوە، هەروەها کێچ و ئەسپێ، هەرچەندێك ئازار بکێشێ لێیان، بۆی هەیە دوریان خاتەوە، هەروەها ئەگەر ئەندامێکی پێویستی بە خوراندن هەبوو، کە خشووعی نوێژەکەیشی لێ تێك دەدا، ئەوە کەراهەتی هەیە، مەگەر جارێ دووجار ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە.

(حەزرەتی) معاز (خودای لێ ڕازی بێت) کێچ و ئەسپێی لە نوێژدا دەگرت، وە (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عومەریش (خودایان لێ ڕازی بێت) جاری وا

هــەبووكە كێچــەكەی دەكوشت لە نوێژەكەیدا خوێنەكەیشی بە دەستیەوە دیاردەبوو.[1]

نەخەعی دەفەرموێت: دەتوانێت بیگرێت و بیپرووێنێت، خۆ ئەگەر بیشی كوژێت هیچی لەسەر نییە.[2] ،

سەعیدی كوڕی موسەیب دەفەرموێت:

با بیگرێت و گێژی بكات و لە پاشان توڕی بدات[3] ،

موجاهید دەفەرموێت: ئەوەم بەلاوە باشە وازی لێ بهێنێت، مەگەر ئەزێتی بدات و لە نوێژەكەی بێ ئاگای بكات، ئەوا با لاوازی بكات و توڕی بدات[4].

ئەمەش بەیانكراوە وەك ڕوخصەتێك، ئەینا چاكتر وایە نەجوڵێت، با كەمیش بێت، بۆیە هەندێك لە خواناسان تەنانەت مێشیشیان دوور نەدەخستەوە لە خۆیان، وە دەیانفەرموو: خۆم فێری جوڵەیە ناكەم نوێژەكەم لێ تێك بدات، بیستوومە پیاو خراپەكان لە بەردەمی پادشاكاندا لە ناسۆر و نارەحەتی زۆریش خۆیان ڕادەگرن و جوڵەیش ناكەن.

وە هەرچەندێك باوێشك بدات قەیناكە با پشتی دەستی بخاتە سەر دەمی، ئەمەش باشترە، وە ئەگەر پژمی، با تەنها لە دڵی خۆیدا (الحمدلله) بكات و بە زوبان دەری نەبڕێت، وە ئەگەر قرقێنەیدا(قرپی هاتەوە) پێویستە سەری بەرز كاتەوە بەرەو ئاسمان، وە ئەگەر عاباو كراسەكەی بەری، لەسەر شانی كەوت، نابێت هەڵی بگرێتەوە، هەروەها ئەملاولای عەمامەكەیشی نابێت چاكی بكاتەوە مەگەر لە بەر حاڵەتێكی پێویست، ئەینا مەكروهە دەسكاریان بكات.

---

(١)رواه ابن أبي شيبة في المصنف(٧٥٥٥)، ٧٥٦٠). و(٧٥٥٦)عن عمر (رضي الله عنه) .

(٢)رواه ابن أبي شيبة في المصنف(٧٥٥٩)

(٣) نفس المصدر (٧٥٥٧)

(٤) نفس المصدر(٧٥٦٣). بمعناه.

# بابەتێك

## حوكمی داكەندنی سەرپایی لە نوێژدا

## ئایا بەتاڵی دەكاتەوە یان نا؟

## وە نوێژ درووستە بە نەعلەكانەوە بكرێت یان نا؟

نوێژ كردن بە هەردوو نەعلەكانەوە درووستە، وە ئەگەر داكەندنی سەرپاو نەعلەكان ئاسان بێت، ئەوە دەتوانێت لە نوێژدا دایكەنێت، بەڵام ئەو ڕوخصەتە بۆ (خوف) نییە، چونكە داكەندنیان ئاسان نییە، بەڵكو ئەگەر پیسییەكیشی پێوە بێت عەفوی لێ دراوە، سەرپاكانیش كە دەخرێنە سەر زەوی و بەر پیسی دەكەوێت، ئەوانیش بە شێوەی خوففەكانە، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی بە نەعلەكانیەوە كرد و لە پاشان دایكەندن، خەڵكەكەش كە بەم شێوە بینیان هەموو نەعلەكانیان داكەند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

**((لِمَ خَلَعتُم نِعالَكُم))**

بۆچی نەعلەكانتان داكەند؟ فەرموویان بینیمان تۆ داتكەندن ئێمەیش دامانكەند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

**((إنَّ جِبريل أتاني فأَخبرني أنَّ بِهما خُبثاً، فإذا أرادَ أحدُكم المَسجِدَ فَليَقلِبْ نَعْلَيهِ، ولْيَنظُر فيهما، فَإنْ رأَى خُبثاً فَليَمسَحهُ بالأرضِ، وليُصلِّ بِهِمَا))**[1]

---

(١)قال العراقي رواه أحمد في مسنده(١٠٧٦٩) واللفظ له وأبو داود(٦٥٠) والحاكم في المستدرك(٣٩١/١)(٩٥٥) وصححه من حديث أبى سعيد قال الزبيدي٣٠٨/٣: وكذا أبو بكر بن أبى شيبة في المصنف(١٨١/٢)(٧٨٩٠)من طريق أبى نضرة عنه بطوله هكذاوأخرج أيضا

بەڕاستی جوبرەئیل هات بۆ لام و هەواڵی پێدام کە پیسیەکی پێوەیە، هەریەکێك لە ئێوەیش ویستی بێت بۆ مزگەوت، با نەعلەکەی هەڵگێڕێتەوە و سەیریان بکات، ئەگەر پیسی پێوە بوو، ئەوا بیهێنێت بەسەر زەویدا و بیساوێت پیایداو ئیتر نوێژیان پێوە بکات.

هەندێك لە زانایان فەرموویانە:

بە نەعلەوە نوێژ بکەیت خێری زیاترە، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(**لِمَ خَلَعتُم نِعالَكُم**) بۆچی نەعلەکانتان داکەند؟

ئەمەش موبالەغەیە لە نەکردن، چونکە دەزانێت کەچاویان لەو کردووە بۆیە دایانکەندووە، بۆیە پرسیاریان لێ دەکات، تا هۆکاری داکەندنەکەیان بۆ بەیان بکات.

عەبدوڵلای کوڕی صائیب گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەرﷺ(**خَلعَ نَعْلَيْهِ**)[1]، سەرپاکانی داکەند، کەواتە هەردوکیانی داکەندووە، ئەوەش دەیەوێت لایان ببات، نابێت لەلای ڕاستی یان لای چەپی دایان بنێت، ڕێگەکەیش بەرتەنگ بکاتەوەو ڕیزەکەیش بپچڕێنێت، بەڵکو دەبێت لەبەینی دوودەستەی خۆی دایان بنێت، لە پشتی خۆی دایاننەنێت کە دڵی لای بێت و پێیەوە سەرقاڵ بێت.

لەوانەیە ئەوەی ڕای وابووبێت کە بە نەعلەکانەوە نوێژ بکات خێری زیاترە، ئەوەی لەیەکدابێتەوە، کە ئیتر دڵی لای بەلادا ناکاتەوەو پێیانەوە خەریك نابێت.

---

١٨١/٢(٧٨٩١):من طريق يزيد بن إبراهيم اليسرى عن الحسن رفعه: (**تعاهدوا نعالكم فإن رأى أحدكم فيهما أذىً فَلْيُمِطْهُ ، وإلاً فَلْيُصَلِّ فيهما**).

(١) رواه النسائي(١٧٦/٢).

ئەبوهورەیرەیش (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا ﷺ کە فەرموویەتی:

(إِذا صَلَّى أحدُكم فَلْيَجعَلْ نَعلَيهِ بينَ رِجلَيهِ)[1]،

ئەگەر یەکێ لە ئێوە نوێژی کرد، با نەعلەکانی بخاتە میانی پێکانیەوە.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی بەیەکێکی تر:

هەردوو نەعلەکانت بخەرە میانی پێیەکانتەوە و ئەزێتی هیچ موسوڵمانێکی پێ مەدە[2].

پێغەمبەری ﷺ نەعلەکانی خستە لای چەپیەوە، چونکە ئیمام بووە و کەس لای چەپیدا نەبووە،[3].

کەواتە بۆ ئیمام هەیە کە لە هەرلایەکدا دایبنێت، چونکە کەس لای چەپیدا نییە، باشتر وایە لەبەردەم پێی خۆیدا داینەنێت کە مەشغوڵی بکات، بەڵام لە پێش پێی خۆی دایان بنێت.

لەوانەیە واتای فەرموودەکەیش ئەمە بێت، هەر بەم شێوەیەش بوو کە جوبەیری کوڕی موطعیم دەفەرموێت:

دانانی نەعلەکان لە میانی پێکانی دا بیدعەو داهێنراوێکە[4]،

---

(١) رواهُ أبو داوود(٦٥٥).

(٢) رواه إبن أبي شيبة(في المصنف) (٧٩٨٠).

(٣) رواه أبو داوود (٦٤٨) والنسائي (٧٤/٢) وابن ماجه(١٤٣١).

(٤) والخبر عند أبي شيبة في المصنف(٧٩٨١) عن نافع بن جبير بن مطعم.

**بابەتێك:حوكمی تف و بەڵغەم ئەگەر زۆری بۆ هێنا لە نوێژدا چی بكات**

ئەگەر لە نوێژەكەیدا تفێكی هەڵدا، ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ نابێتەوە، چونكە بە كردارێكی كەم دەژمێررێت، ئەو دەنگەیش بە هۆی توڕدانەكەوە پەیدا دەبێت ئەوەیش بە قسە دانانرێت، وە لەسەر شكڵ و شێوەی قسە كردن نییە، بەڵام ئەوەندە هەیە كە كارێكی ناپەسەندە، پێویستە خۆبی لێ بپارێزێت، مەگەر بەو شێوەی كە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێ داوە، هەروەك و هەندێك صەحابە (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕنەوە كە پێغەمبەری خودا ﷺ بینی لە ڕوی قیبلەوە بەڵغەمێك توڕ دراوە، زۆر بە توندی توڕە بوو، لە پاشان بەلاسكی دار خورمایەك كە بە دەستیەوەبوو سڕیەوە، وە فەرمووی: (**إِئْتُونِي بعَبيرٍ**) واتە: بۆنێكی عەبیرم بۆ بهێنن، لەپاشان زەعفەرانیشی كرد بەسەریدا و، لای كردەوە بە لاماندا و فەرمووی: ((**أَيُّكُم يُحبُّ أنْ يُبزَقَ في وَجهِه، فقُلنا لاَ أَحَد، قالَ: فَإنَّ أحدَكُم إذا دخلَ في الصَّلاةِ،فإنَّ اللهَ عزَّوجَل بينَهُ وبينَ القِبلَةِ**، وفي لفظ آخر: **واجَهَهُ اللهُ تَعالى فَلا يَبزقَنَّ أَحَدُكُمْ تِلقاءَ وَجهِهِ، ولاَ عَن يَمينهِ ولكِنْ عَن شِمالِهِ، أوْ تَحتَ قَدمهِ اليُسرى فَإن بَدَرَتْهُ بادِرَةٌ..فَليَبصقْ في ثَوبهِ وليَقُل بهِ هَكَذا) ودلَكَ بعْضَهُ ببَعضٍ**))[1]

واتە: كامتان حەز دەكەن تفێ بكرێت ڕوبەڕوتان ، وەتمان: كەسمان حەز ناكەین، فەرمووی:یەكێك لە ئێوە ئەگەر چووە ناو نوێژە وە، ئەوە خودای گەورە لە میانی ئەوو قیبلەدایە، وە لە وتەیەكی تردا هاتووە: ئەو كاتە خودا ڕوی تێ دەكات، كەواتە با هیچ كەسێك لە ئێوە تف نەكاتە بەرامبەری خۆی، وە تف نەكاتە لای ڕاستیشی، بەڵام یان بیكاتە لای چەپی یان ژێر پێی چەپی، كەواتە ئەگەر تف كردن زۆری بۆ هێنا، با تف بكاتە بەرگەكەی خۆیەوە و بەم

(١) رواه مسلم(٣٠٠٨) ضمن حديث جابر الطويل، وسياق المصنف من القوت(٩٩/١).

شێوەی لێ بکات، واتە بەهەسوێت بەیەکدیدا و بیسڕێتەوە.

# بابەتێك

## باسی چۆنیەتی وەستانی مەئمووم لە پشتی ئیمامەوە

### بۆ وەستانی مەئموم لە پشتی ئیمامەوە سوننەت و فەرزیش هەیە

### باسی سوننەتەکە:

ئەگەر مەئمووم تەنها یەك کەس بێت، ئەوە لە لای ڕاستی ئیمام رادەوەستێت و، تۆزێك لە دوایەوە دەبێت، وە تەنها یەك ئافرەتیش لە دوای ئیمامەوە ڕادەوەستێت، ئەگەر ئافرەتەکە لە تەنیشتی ئیمامەوە ڕاوەستا، زیانی نییە، بەڵام پێچەوانەی سوننەتی کردووە، جا ئەگەر لە گەڵ ئافرەتەکە پیاوێکیش هەبوو، ئەوا پیاوەکە لە لای ڕاستی ئیمام دەبێت و ژنەکەیش لە دوای پیاوەکەوە.

وە نابێت یەکێکیان لە دوای ڕیزەوە بە تەنها بووەستێت، بەڵکو دەبێت بچێتە ناو ڕیزەکەوە، یان کەسێك لە ڕیزەکە ڕاکێشێت بۆ لای خۆی، بەڵام ئەگەر بە تەنها وەستا، ئەوە نوێژەکەی درووستە و کەراهەتی هەیە.

### باسی نوێژی فەرز:

دەبێت ڕیزەکان پێکەوە بن، کە دەبێت لە میانی مەئموم و ئیمامدا پەیوەندییەك هەبێت کۆیان بکاتەوە بەیەکەوە، چونکە ئەو دوانە وان لە جەماعەتدا، جا ئەگەر لە مزگەوتدا بوون، ئەوە بەسە کە کۆیان بکاتەوە، چونکە بۆ ئەم مەبەستە درووست کراوە، کەواتە پێویستی بە پێکەوە لکاندنی ڕیزەکان نییە، بەڵکو تەنها ئەوە پێویستە کە ئاگای لە هەڵس و کەوتەکانی ئیمام بێت، وەك ئەوەی کە (حەزرەتی) ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە

سەربانی مزگەوتەکە نوێژی کرد و، ئیمامەکەیشی لە خوارەوەبوو[1]،

وە ئەگەر مەئمومەکە لە دەرەوەی مزگەوت بوو، لە ڕێگەیەك یان سارایەكی هاوبەش، وە لە میانیاندا بینایەکی جیاکەرەوە نەبوو، لەیەکیان بترازێنێت، ئەو کاتە ئەوەندە نزیکی بەسە کە بە ئەندازەی هاوێشتنی تیرێك، کە سێصەد یان چوارصەد زیراعە.

ئەوەش دەبێتە هۆکاری بەیەکەوە بەستنەوەیان، چونکە کاری هەرکامیان بگریت بەوی تریان دەگات، وە لە کاتێکدا ئەوە بەمەرج گیراوە کە پێکەوە بلکێن، ئەگەر (مەئمووم) ڕاوەستابێت لە سەربانی خانوویەکدا، کە ئیمامیش لە ناو خانووەکەدا بێت، کە خانوەکە لای ڕاستی مزگەوتەوە کەوە بێت، یان لەلای چەپیەوە بێت، وە دەرگاکەیشی لکابێت بە زەویی مزگەوتەکەوە.

کەواتە مەرجەکە ئەوەیە:

کە ڕیزەکە درێژ بێتەوە تا مەدخەلی ئەو جێگای کە نوێژی تێدا دەکرێت، بێ ئەوەی پچڕانێك کەوتبێتە میانی مزگەوت و سەربانەکەوە، لە پاشان ئەوەش بزانە، کە نوێژی هەموو ئەوانەی لەو ڕیزەدا ڕاوەستاون یان لە دوایەوە، نەك ئەوەی کە پێشی ئیمام کەوتبێت، کە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەمەیش کە باسم کرد حوکمی خانووە جیاوازەکانە، ئەینا ئەوانەی کە یەك بیناو خانوون، یان پارچەیەکی زەوین و ساحەیەکن، ئەوە حوکمی سەحرایەکیان هەیە.

---

(١)رواه إبن أبى شيبة في المصنف)٦٢١٥) وهو من معلقات البخاري (باب الصلاة في السطوح والمنبر والخشب)

## بابەتێك: حوكمی نوێژی دواكەوتوو لە ئیمام

ئەو مەئمومەی لە ئیمام دوادەكەوێت، ئەگەر گەیشت بە دوا ڕكاتی ئیمامدا، ئەوە دەبێتە سەرەتای نوێژەكەی، با لەگەڵ ئیمامدا بێت و بینای نوێژەكەی لەو كاتەوە دەست پێ بكات، وە بۆ نوێژی بەیانیان با لە دوا ڕكاتدا بۆ خۆیشی قنووت بخوێنێت، با لە پێشەوە لەگەڵ ئیمامیشدا قنووتی خوێند بێت، وە ئەگەر لە گەڵ ئیمامدا فریای هەندێك لە هەستانەوەكە كەوت، ئەوا خۆی بە دۆعاو نزاوە خەریك نەكات، بەڵكو یەكسەر دەست بە خوێندنی فاتیحەكە بكات، وە بە سووكی و خێرایی بیخوێنێت، جا ئەگەر ئیمام پێشتر ڕكوعی برد، وە توانی پێش ئەوەی ئیمام لە ڕكوع ڕاست بێتەوە، ئەمیش فاتیحەكە تەواو بكات و ڕكوع ببات ئەوا با بیخوێنێت، بەڵام ئەگەر نەیدەتوانی، ئەوا با یەكسەر بیبڕێت و لەگەڵ ئیمامدا ڕكوع ببات، ئەو هەندەی كە فاتیحەی خوێندووە حوكمی هەمووی هەیە، بەهۆی پێشكەوتنی ئیمامەوە لەسەر مەئمومەكە دەكەوێت، وە ئەگەر ئیمام ڕكوعی بردو مەئمووم لەناو سورەتەكەدابوو، ئەوا با بیپچڕێت و شوێنی بكەوێت. بەڵام ئەگەر لە سەجدەو تەحیاتدا گەیشتەوە بە ئیمام، ئەوا با نوێژەكەی دابەستێت و، یەكسەر دابنیشێت بە بێ ئەوەی(الله أكبر)ی بۆ بكات، بەپێچەوانەی ئەوەی كە ئەگەر مەئموم لە ڕكوعدا بە ئیمام گەیشت، ئەوە پێویستە لە دابەزیندا بۆ ڕكوع (الله أكبر)بكات، چونكە ئەو گواستنەوەیەی بۆ حیسابدەكرێت، وە(تەكبیر)ەكان تایبەتن بە گواستنەوە ئەصڵییەكانەوە لە نوێژەكاندا، نەك لەبەر شتێكی پەیدابوویێت، بە هۆكاری پێشەوایەتی ئیمامەت. وە دەبێت ئەوەش بزانێت:

كە مەئمووم ناگات بەو ڕكاتەدا، ئەگەر لە ڕكوعدا بە حاڵەتی ئارامی تەواو فریای ئیمام نەكەوتبێت، خۆ ئەگەر كاتێك مانەوەو ئارامییەكەی تەواو بوو كە ئیمام لە سنوری ڕكوع بەرزبووبێتەوە، ئەوە فریای ئەو ڕكاتە نەكەوتووە.

# بابەتێك

## باسی پرسە جیاوازەکان لە نوێژە فەوتاو و جەماعەتەکان

ئەوەی نوێژی نیوەڕۆی فەوتاو وەختی عەسریش هاتە پێشەوە، با لە پێشەوە نوێژی نیوەڕۆ بگێڕێتەوە، لە پاشان نوێژی عەسری بکات.

بەڵام ئەگەر نوێژی عەسری پێش خست ئەوا فەرزەکەی لەسەر نامێنێت، بەڵام باشترەکەی نەکردووە، وە خۆی خزاندۆتە ناو شوبهەیەکی ڕای جیاوازەوە.[1].

بەڵام ئەگەر ئیمامی دەستکەوت، با لە پێشەوە نوێژەکەی عەسری بکات، لە پاشان نوێژی نیوەڕۆ بگێڕێتەوە، چونکە جەماعەتەکە بە حازری و لە کاتی خۆیدا خێری زیاترە.

بەڵام ئەگەر لە سەرەتای کاتەکەوە بە تاکی نوێژی دەکرد، لە پاشان گەیشت بە ئیمامەتدا، ئەوە نوێژە جەماعەتەکە دەکات، وە نیيەتی نوێژی ئەو کاتە دەهێنێت، وە خودای گەورەش ئەوەیانی بۆ دەژمێرێت کە تەواوتریانە، ئەگەر لەو نوێژەیش نیيەتی نوێژێکی فەوتاو یان خۆبەخشی هێنا ئەوە درووستە.

وە ئەگەر لە جەماعەتدا نوێژی کردبوو، وە گەیشت بە جەماعەتێکی تردا، ئەوە با نیيەتی گێڕانەوەی نوێژێکی فەوتاو، یان کردنی نوێژێکی سوننەت بهێنێت، چونکە کردنەوەی نوێژێکی حازر کە ئەنجامدرا بێت، هیچ ڕویەکی شەرعی و پاڵپشتێکی نیيە، تەنها لە کاتێکدا ئەوە ئەو ئەگەرە لە ئارادایە، کە بیەوێت گەورەیی نوێژی جەماعەتی دەست بکەوێت.

---

(١) چونکە بەلای ئیمامی حەنەفیيەوە تەرتیب لە کردنی نوێژەکاندا واجبەو لە نوێژە فەوتاوەکانیشدا هەر بەو شێوەیە، بنواڕە: مراقي الفلاح)ص/٣٧٧).

# بابەتێك

## حوكمی ئەو كەسەی

## لەسەر بەرگەكەی پیسییەك دەبینێت

## ئایا نوێژەكەی تەواو دەكات یان دەستپێدەكاتەوە؟

ئەگەر كەسێك نوێژی كرد و، لە پاشان بینی پیسییەك بە بەرگەكەیەوە بووە، باشتر وایە نوێژەكەی دووبارە بكاتەوەو، پێویستێش نییە كە بە واجبی بیكاتەوە.

بەڵام ئەگەر لە كاتی نوێژەكەدا ئەو پیسییەی بینی، ئەوا با لیباسەكەی فڕێبدات و، نوێژەكەی بەردەوام بێت، وە باشتریش وایە كە بیبڕێت و، دەست پێ بكاتەوە.

ئەصڵی ئەم فەتوایەش چیرۆكی داكەندنی هەردوو نەعلەكەی پێغەمبەرو ﷺ كە (حەزرەتی) جوبرەئیل (سەلامی خودای لەسەر)هەواڵی پێدا، كە پیسیەكی پێوەیە، وە پێغەمبەریش ﷺ نوێژەكەی نەبڕی و دەستی پێ كردبێتەوە، بەڵكو بەردەوام بوو لەسەری

# بابەتێك

## حوكمی شەرعی لە بارەی سەجدەی سەهو

هەركەسێك تەحیاتی یەكەم نەكات، یان قنووتی بەیانی نەخوێندبێت، یان صڵاواتی لە دیار پێغەمبەر ﷺ لە تەحیاتی یەكەمدا نەخوێندبێت، یان بە سەهو كارێكی كرد و، ئەو كارە ئەگەر بە عەمدی بكرێت، ئەوا نوێژەكەیشی بەتاڵ دەبێتەوە.

**یان گومانی بۆ پەیدابووبێت:**

ئایا سێ ڕكات نوێژی خوێندووە یان چوار؟

ئەوە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا بە یەقین و متمانەی تەواوەوە كار بكات و پێش سەلامدانەوەی ئیمام، با دوو سەجدەی سەهو ببات، ئەگەر لە بیری چوو، ئەوە دوای سەلامدانەوە هەركاتێك بیری كەوتەوە مادەم زۆری پێنەچووبێت با سەجدە ببات.

ئەگەر بڕیاری دا سەجدە ببات و بێ دەستنوێژی بەسەردا هات، ئەوە وەك ئەوە وایە كە لە ناو نوێژدابێت و نوێژەكەی بەتاڵبوبێتەوە، چونكە بە گەڕانەوە بۆ سەجدەكەی وەك ئەوە وایە كە سەلامەكەی بە شێوەی لەبیرچوون دابێتەوە، بۆیە نوێژەكە بەردەوام دەبێتەوە و گەڕاوەتەوە بۆی، بۆیە دوبارە سەلامێكی تر دەداتەوە.

بەڵام ئەگەر دوای چوونەدەرەوەی ناو مزگەوت سەجدەی سەهووی بیر كەوتەوە یان بەینی زۆری كەوتبوو، ئەوا مافی دەفەوتێت و بۆی نییە بیكات.

# بابەتێك

## ڕۆنکرنەوەی چۆنیەتی چارەسەری وەسوەسە لە نیەتهێنانی نوێژدا

ئەو وەسوەسەو خەتەرە خراپەی کە لە نییەتی نوێژدا تووشی دەبێت، هۆکارەکەی بۆ تێکچوونێکە لە ئەقڵیدا. یان نەزانینیەتی بە ئادابی شەرع، چونکە بەڕاستی ئامادەباشی بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خودا، وەك بەجێ هێنانی فرمانی کەسێکی تر وایە، وە بەگەورەزانینی وەك بە گەورەزانینی کەسێکی تر وایە لە ڕوی نییەت هێنانەکەوە،[1] چونکە ئەگەر کەسێك زانایەکی ناوداری مەزن بێت بۆلای، ئەمیش هەستێتەوە لەبەری، ئەگەر بڵێت:

ئەوا نییەتمە بە پێوە ڕابووەستم بۆ ڕێزو بەگەورەزانینی فلان کەس، لەبەر فەزڵەکەی، کە هەڵسانەکەم لەگەڵ هاتنەکەیدابێت و، ڕوی خۆیشم ڕو بەو زاتە بێت! ئەم جۆرە قسەکردن و نییەتە بە کارێکی نەفامی سەرلێ تێکچوون دادەنرێت، بەڵکو وەك چۆن گەورەیی و فەزڵی دەزانێت، یەکسەر زانینەکە دەخوازێت بەدەمیەوە هەڵبستێت، بێ ئەو باس و خواسانە تەعزیمی بۆ بڕیاربدات، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە بۆ کارێکی تر هەستابێتەوەو، ئەوی بینیبێت کە هاتبێت، یان خۆی لە بێ ئاگایی و غەفڵەتدابێت، ئەوا ئاساییە کە نییەتەکە بەو شێوە بهێنێت.

وە بەمەرج گرتنی ئەوەی کە نوێژەکە نیوەڕۆیە عەسر نییە، حازرە قەرز نییە، فرمانی خودا بەجێ دەگەێنێت، هەروا هەستانەوەکەی هەڕەمەکی نییە، ئەو مەرجانە وەك ئەوەیە کە لەبەر کابرا هەڵدەستێتەوە لە کاتی

---

(١) ئەم نموونە هێنانەوەی ئیمامی غەزالی بۆ تێگەیاندنی خوێنەرە، ئەینا ناکرێت بەراوردی بەگەورەزانینی خودا و خەڵکێکی تر لە پاڵ یەکدا باس بکرێت.

هاتنەژورەوەیدا، وە ڕولێکردنی و نەبونی هیچ هۆکارێکی تر لەو هەستان و بەرەو ڕوچوونە، وە بە نییەتی بەگەورە دانانیشی بێت، ئەم نییەتانە بە خۆڕسکی دێنە پێشەوە، خۆ ئەگەر هەستاو پشتی لە کابرا کردبوو، یان ئەو هات و پاش ماوەیەك ئەم بۆی جولاو چوو بەدەمیەوە، ئەوە نیشانەیە لەسەر ڕێز نەگرتنی.

لەپاشان دەبێت ئەم صیفەتانەی ڕونمانکردەوە دیار و ئاشکرا بێت لەزیهن دا، وە بەمەبەستێکی ڕاستەقینە بێت، وە نابێت هێنانی ئەم نییەتە درێژە بکێشێت، هەموو مەبەستەکان لە چرکەیەکدا کۆتایی بێت، بەڵام بە داڕشتنەوەی وشەکان درێژە دەکێشێت، یان بە زوبان بوروژێنرێت، یان بە بیری دابێت و بەدڵ ئەو نییەتە بهێنێت، کەواتە ئەوەی نییەتهێنانی نوێژ کردن بەم شێوە لێی تێ نەگات، کەواتە لە نییەتەکە حاڵی نەبووە، کەواتە شتێکی گران نییە، تۆ بانگ کراویت، ئەو نوێژە لەو کاتەدا بکەیت، تۆیش ئامادەییت تێدایەو چوویت بەدەم داواکەوە، کەواتە ئیتر بوونی ئەو خەتەرەو وەسوەسانە تەنها بە نەزانین دەدرێتە قەڵەم، بەڕاستی ئەو هەموو مەرام و مەبەستانەو ئەو زانین و زانستانە هەمووی لە یەك حاڵەتدا لە ناو نەفس ودڵی دا کۆدەبنەوە، نەك بەو شێوەی کە بە شێوەیەکی درێژەپێدان و یەك لەدوای یەك بێت و پێویستی بە سەرنج و تێڕامانی زۆر هەبێت.

جیاوازی زۆرە لە میانی ئەوەدا کەشتێك خودی خۆی لە دڵدا بوونی هەبێت، یان لە ناو بیرو هزردا بیری لێ بکرێتەوە، ئامادەبوونی دڵیش دژایەتی هەیە لەگەڵ بێ ئاگایی و غەفڵەت و ئامادەنەبووندا، با ئەو بێ ئاگاهییەش زۆر نەخایەنێت، چونکە بەڕاستی ئەگەر کەسێك بۆ نموونە بە حدوس و پەیدابوونی شتێك ئاگاداربێت، ئەوە بە تەنها یەك زانین و لەیەك حاڵەتدا زانینەکە جێگربووە لە دڵدا، ئەم زانینە بۆ خۆی چەندین زانینی تر لە خۆ دەگرێت، کە بە ئامادەدادەنرێت، با بە شێوەی درێژەپێدانیش نەبێت، چونکە

ئەگەر یەکێك بزانێت مانای پەیدابوون چییە، دەشزانێت بوون و نەبوون چین، دەزانێت ئەوەی بوونی هەیە و بوونەکەی دواکەوتووە لە حاڵەتی نەبوونی پێشتری، واتە لە زەمان و پێش کەوتن و دوا کەوتن دەزانێت، کە پێشکەوتنەکە بۆ نەبوونەکەیەو، دواکەوتنەکەیش بۆ ئەو حاڵەتی پەیدابوونەیە کە ڕوی داوە.

ئەم هەموو زانستانە لە ژێر ئەوەدا جێگەی دەبێتەوە کە واتای حادیس بوون و پەیدابوونی شتێك بزانیت، بەو بەڵگەی کە ئەگەر یەکێك زانا بێت بە پەیدابوونی جەستەیەك و شتی تری نەدەزانی، ئەگەر پرسیاری لێ کرا:

ئایا تۆ پێشتر واتای پێشکەوتن و دواکەوتن و زەمان و جێگات زانیوە ؟ ئایا زانیوتە مانای نەبوون چییەو نەبوون پێش بوون کەوتووە و، بوون دوای نەبوون پەیدابووە؟ یان زانیوتە کە زەمان کراوە بە زەمانی پێشوو، وە زەمانی داهاتوو؟ ئەگەر وتی : هەرگیز ئەمانەم نەزانیوە، ئەوە درۆدەکات، وە قسەکەی پێچەوانەی قسە پێشووەکەیەتی کە دەڵێت: من دەزانم حادیس و پەیدابوو چییە. بەڕاستی بە جەهل و نەزانین دادەنرێت: کە لەو کاتە بەرتەنگەدا شۆڕشی خەتەرەکانی بۆ پەیدابێت و، مێشکی پێ سەرقاڵ بکات، چونکە کابرای خاوەن وەسوەسە، زۆر لە خۆی دەکات کە واتای نوێژی نیوەڕو بوون و حازری کاتەکەی و فەرزی بوون، لە یەك حاڵەتدا بخاتەناو دڵیەوە، وە بەدرێژی بیر لە هەمویان بکاتەوە و سەرنجیشیان بدات، ئەمەش کارێکی محاڵ و نەگونجاوە، ئەگەر زۆر بکات لە خۆی هەمان نییەت و خەتەرەی بۆ پەیدا ببێت لە پێشوازی کردنی زاناکەوە ئەمەیشی بۆ ناکرێت.

کەمادەم ئەو ڕاستییەی زانی، وە لێی حاڵی بوو، ئیتر وەسوەسەی نامێنێت و دەزانێت کە هەستاوە فەرمانی خودا بە جێ دەگەیێنێت و ،ئەو فەرمانبەرداریە وەك بەجێهێنانی فرمانی کەسێکی ترە و لەوە زیاتر نییە.

بەڵام ئەگەر کەسێك بەمەش حاڵی نەبوو، ئەوا بۆ زێدە ئاسانکاری بەیانی

ڕوخصەتی شەرعی دەڵێم:

ئەگەر ئەوەی وەسوەسەی هەبوو بەمەش حاڵی نەدەبوو چۆن نییەت بهێنێت، تا هەموو ئەو فرمانانە بە درێژی نەخاتە مێشکیەوەو، لە دڵی دا بەیەکجار ئامادەو جێگیر نەبێت، ئەوا با هەوڵبدات پوختەی ئەو فرمانانە لە کاتی سەرەتای نوێژدابەستنەکەوە تا کۆتایی ڕێی تەکبیرەکە بە جیاجیا بێت بە خەیاڵیدا، بە شێوەیەك کە لە (الله أكبر) ێ نەبەبێتەوە، تەواوی بەشەکانی نییەتەکەی بۆ هاتبێت، ئەوە بەسیەتی و بەم شێوەیەش نییەتەکەی دادەمەزرێت، ئەوەندەش ئەرکی گران ناکەین کە بڵێین: دەبێت تەواوی هەموو نییەتەکە بەرامبەر بێت لەگەڵ سەرەتای تەکبیرەکەی تا کۆتایی (الله أكبر)ەکە، چونکە ئەمە ئەرکێکی گران و ئەستەمەو بۆی نارەخسێت.

خۆ ئەگەر ئەم نییەتە بەم شێوەبوایە، دەبوو یەکێك لە ئەصحاب گومانێکی بۆ درووست ببوایەو، پرسیارێکی لەسەر بکردایە، ڕونەدانی ئەو وەسوەسەو گومان و پرسیارنەکردنە، نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە هێنانی نییەت لەسەر ئاسانکاری دامەزراوە، جا ئەو کەسەی وەسوەسەی هەیە، نییەتەکەی هەرچۆنێك بۆ جووت ببێت، پێویستە متمانەی پێ بکات، زیاتر بەدواداچوونی بۆ نەکات، تا بەو شێوە دادێت و، وردەوردە وەسوەسەکەی لێی جودا دەبێتەوە، چونکە چەندێك زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، ئەوەندە زیاتر دەکەوێتە ناو وەسوەسەوە.

وەك چۆن لە فەتواکانمادا باسی ئەم بابەتەمان کردووە، وە لایەنەکانی باسی نییەت و لێکۆڵینەوەکانمان لەمبارەوە ڕونکردۆتەوە، کە زاناکان پێویستییان بە فێربوونی هەیە، بەڵام لەوانەیە کەسێکی عامی و نەخوێندەوار بە بیستنی زیانی بەر بکەوێت نەك قازانج، بەڵکو دەروازەی وەسوەسەیشی لەسەر واڵا دەکات، بۆیە وازمان لەو وردەکاریانە هێنا.

## بابەتێك باسی مەرجی درووستی ئیقتداکردن بە ئیمام

نابێت مەئمووم پێشی ئیمام بکەوێت، لە ڕکوع و سەجدەکان و بەرزبوونەوەکاندا، وە لە هەموو کردارەکانی تریشدا، وە نابێت لەگەڵ ئەویشدا بیانکات، بەڵکو دەبێت شوێنی ئیمام بکەوێت و شوێنەواری ئەو هەڵبگرێت، ئەمەیە واتای شوێن کەوتنی ئیمام. ئەگەر بە قەصدی لەگەڵ ئیمامدا هەڵس و کەوتی دەکرد(جگە لە نییەتی نوێژ دابەستن)، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، وەك ئەوەی کە لە پاڵیدا وەستابێت و لێیشی دوا نەکەوتبێت. بەڵام ئەگەر لێی پێش کەوت، ئەوە دەربارەی نوێژەکەی ئایا باطیلە یان نا، ڕای جیاواز هەیە؛ وە دورنییە کە حوکم بدرێت بە بەتاڵبوونەوەی نوێژەکە، وەك ئەوەی کە ئەگەر مەئمووم لە پێشی ئیمامەکەیەوە بێت، بەڵکو ئەمەیان لە پێشترە بۆ بەتاڵ بوونەوەی نوێژەکەی، چونکە جەماعەت ئیقتیداو شوێنکەوتنی ئیمامە بە کردار، نەك لە جێگەدا، کەواتە شوێن کەوتنی ئیمام لە جێگەدا گرنگترە، وە بۆیە بەمەرجگیراوە کە ئیمام لە شوێنی وەستاندا پێش مەئمووم بکەێت، تا ئاسانتر بێت بۆی شوێنی بکەوێت، وە ئەو مەرامەش بێتە دی کە ئەوە شوێنی کەوتووە، چونکە کەسێك ئیقتیدای پێ بکرێت، ئەوە شیاویەتی کە لە پێشەوە بێت، کەواتە پێشکەوتنی مەئمووم بەسەر ئیمامەکەیدا هیچ ڕوویەکی پەسەندی تێدا نییە مەگەر بە سەهو کردن بێت.

بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر بەتوندی ناڕەزایی دەربڕیوە لەسەری و فەرموویەتی: ((**أمَا يَخشَى الَّذي يَرفعُ رأسَهُ قبلَ الإمامِ، أنْ يُحَوِّلَ اللهُ رأسَهُ رأسَ حِمَارِ**)) [١]،ئایا ئەوەی پێش ئیمام سەر بەرز دەکاتەوە ناترسێت کە خودا

---

(١)قال العراقي متفق عليه.(البخاري٦٩١)، من حديث أبي هريرة ومسلم(٤٢٧)، قلت: إتفق عليه الستة، ولفظ البخاري: **أما يخشى أحدكم أو لا يخشى أحدكم إذا رفعَ رأسه قبل الإمام**

سەری بۆ بگۆڕێت بە سەری گوێدرێژ. بەڵام دواکەوتن لە ئیمام بە ئەندازەی ڕوکنێك، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە، وەك ئەوەی کە ئیمام لە ڕکوعەکەی بەرز بێتەوەو ڕێك ڕابووەستێت و مەئمووم هێشتا لە ڕکوعدا بێت، بەڵام ئەو ئەندازە دواکەوتنە کەراهەتی هەیە، بەڵام ئەگەر ئیمام تەوێڵی خستە سەر زەوی، مەئموومەکە هێشتا نەگەیشتبوە سنووری ئەوانەی کە ڕکوع دەبەن، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، وە هەروەها ئەگەر ئیمام سەری خستە سەر زەوی بۆ سەجدەی دووهەم و ،مەئمومیش هێشتا سەری بۆ سەجدەی یەکەم دانەنەواندبوو، ئەمیش نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

## بابەتێك: لەبارەی فرمان بەچاکەوە، وەك ڕێك ڕاوەستان لە ڕیزدا و، باسی گەورەیی جەماعەت و لای ڕاستی ئیمام

پێویستە لەسەر ئەوەی کە ئامادەی نوێژ دەبێت، ئەگەر کارێکی خراپی بینی لە یەکێکی تر، ئەوا پێی بگۆڕێت و نارازی بوونی خۆیی نیشان بدات، با لە نەزانینیشەوە بووبێت، بەڵام دەبێت بەنەرمی بدوێت لەگەڵ نەزانێکدا و فێریشی بکات، لەو بابەتانە: فرمانکردنە بە ڕێك ڕاوەستاندن، وە ڕێگری لە کەسێك بە تاکی لە دەرەوەی ڕیزەکانی نوێژ ڕابووەستێت، وە نارەزایی دەرببڕێت بەرامبەر ئەوانەی کە سەریان پێش ئیمام بەرز دەکەنەوە، وە فرمانە هاوشێوەکانی تر، بەڕاستی لەمبارەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**وَيْلٌ لِلعَالِمِ مِنَ الجَاهِلِ حَيثُ لاَ يَعْلَمُهُ**))[1] وەیل و خەسارەتمەندی وهەرەشەی چوونە ناو دۆزەخ بۆ ئەو زانایە، لەو نەزانەوە کە ئادابی دینی فێر نەکردووە.

---

**أن يحول الله رأسه رأس حمار أو يجعل الله صورته صورة حمار. الإتحاف ٣/٢٢٤.**

**(١)قال العراقي أخرجه الديلمي في مسند الفردوس من حيث أنس بسند ضعيف قلت: لفظه عنده: (وويل للعالم من الجاهل، وويلٌ للجاهل من العالِم ) وينظر الإتحاف ٣/٣٢٧.**

وه‌(حه‌زره‌تی) عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر فه‌رموویه‌تی:

((مَنْ رأى مَن يُسيئُ بِصَلاتِهِ، فَلَم يَنهَهُ فهُو شَرِيكُه في وِزرِهَا)) [1]

(ئه‌وه‌ی یه‌کێکی تر ببینێت که‌ نوێژه‌که‌ی به‌ ناڕه‌وانی و خراپی ده‌کات، وه‌ نه‌هی لێ نه‌کات، ده‌بێته‌ هاوبه‌شی ئه‌و له‌ گوناهو تاوانه‌که‌یدا)

ده‌گێڕنه‌وه‌ له‌ بیلالی کوڕی سه‌عیده‌وه‌ (خودای لێ ڕازی بێت) که‌ فه‌رمویه‌تی: هه‌ڵه‌و تاوان ئه‌گه‌ر شارایه‌وه‌ ته‌نها زیان له‌ خاوه‌نه‌که‌ی ده‌دات، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئاشکرای کرد و پێیان نه‌گۆڕی و چاکیان نه‌کرد پێی، ئه‌وا زیان به‌ هه‌موان ده‌گه‌یێنێت.[2] وه‌ له‌ فه‌رمووده‌دا هاتووه‌:

(حه‌زره‌تی) بیلال ڕیزه‌کانی ڕێك ده‌خست و به‌ دارێك له‌ پاژنه‌ی پێیانی ده‌دا، [3]

وه‌ (حه‌زره‌تی) عومه‌ر (خودای لێ ڕازی بێت) ده‌یفه‌رموو:

بگه‌ڕێن به‌ شوێن براکانتاندا، ئه‌گه‌ر بۆ نوێژی جه‌ماعه‌ت دیار نه‌بوون، ئه‌گه‌ر نه‌خۆش بوون، ئه‌وا سه‌ردانیان بکه‌ن و عیاده‌یان بکه‌ن، وه‌ ئه‌گه‌ر ساغ و ته‌ندوروست بوون، ئه‌وا سه‌رزه‌نشتیان بکه‌ن له‌سه‌ر نه‌کردنی جه‌ماعه‌ت، که‌ نابێت ئاسانکاری له‌ هاتن بۆ مزگه‌وت بکرێت.

---

(١)والأصل في هذا حديث أبي سعيد عند أحمد في مسنده(١٠٧٦٦)( والأربعة، وأبوداود(٤٣٤)واترمذي (٢١٧٢) والنسائي)٥٠٠٨)ومسلم(٤٩) وابن حبان في صحيحه(١/٥٤٠(٣٠٦) **(من رأى منكم منكرا فلغيريه بيده، فإن لم يستطع أن يغيره بيده فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان).**

(٢) رواه أبو نعيم فى الحلية(٥/٢٢٢.

(٣)وجاء في الحديث: **أن بلالا** رضي الله عنه **(كان يسوي الصفوف)** في عهد النبي صلى الله عليه وسلم **(ويضرب عراقيهم بالدرة)**، قال العراقي لم أجده ا هـ قال الزبيدي٣/٣٢٨ ووجدت في (المصنف) لأبي بكر بن أبي شيبة ما نصه : حدثنا ابن نمير عن الأعمش عن عمران عن سويد عن بلال قال: **(كان يسوي مناكبنا بأقدامنا في الصلاة).**

ئەوانەی جیلی یەکەم زۆر بە توندی گرنگییان بە هاتن بۆ مزگەوت دەدا، تەنانەت هەندێکیان جەنازەی مردوویان هەڵدەگرت و دەیانبردە بەردەم ماڵی ئەوانەی کە نەدەهاتن بۆ جەماعەت، هێما بەوەی تەنها مردوو دوادەکەوێت لە جەماعەت نەك زیندوو.

وە هەرکەسێك چووە ناو مزگەوتەوە، دەبێت لای ڕاستی نوێژخوێنان بگرێت، بۆیە لە چەرخی (حەزرەتی) پێغەمبەردا ﷺ خەڵکەکە قەرەباڵغییان لەلای ڕاست دەکرد، تاوای لێ هات عەرزی پێغەمبەریان کرد ﷺ کە ڕێگە گیراوەو لەولایەوە جێگە نابێتەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَنْ عمَّرَ مَيسَرةَ المَسجِدِ كانَ لهُ كِفلانِ مِنَ الأَجرِ))**[1]،واتە:

ئەوەی لای چەپی مزگەوت ئاوەدان کاتەوە، ئەوە دوو پاداشتی بۆ دەنوسرێت.

وە هەرکاتێك هات بۆ مزگەوت و ڕیزی یەکەمی دەست نەکەوت و، بینی منداڵێك وا لە ڕیزی یەکەمدا، بۆی هەیە کە ئەو منداڵە بهێنێتە دواوە و، خۆی بچێتە شوێنەکەی، بەمەرجێك مناڵەکە باڵغ نەبوبێت.

ئەمەی سەرەوە ئەوە بوو کەویستمان باسی بکەین، لەو مەسەلەو بابەتە تایبەتیانەی کە هەموانی گرتۆتەوەو، پێویستە هەموو لێی شارەزا ببین، وە لەمەودا باسی ئەحکامی نوێژە جیاجیاکان دەکەین، لە پەڕاوی ویردەکان (الأوراد) پشت بە خوای گەورەو مەزن.

---

(١)قال العراقي أخرجه ابن ماجه(١٠٠٧) من حديث ابن عمر بسند ضعيف ا هـ . قال الزبيدي:٣٢٩/٣: ولفظ ابن ماجه: (**كتب الله له كِفلين من الأجر**)، وأخرج الطبراني في الكبير من حديث ابن عباس: (**من عمَّر جانب المسجد الأيسر لِقلةِ أهلهِ فلهُ أجران**).
**.(وە دروستیشە منداڵ لە میانی پیاوەکاندا نوێژ بکەن، بۆ ئەوەی فێری ئادابی نوێژەکە بە تەواوی بن، وەك ئیمامی ڕافیعی فەرمویەتی)**

# دەروازەی حەوتەم

## باسی سوننەتی نوێژەکان

**بزانە:**

ئەوەی غەیری فەرزەکان بێت، لە نوێژەکاندا دەکرێن بە سێ بەشەوە: سوننەتەکان، وە نوێژە چاك و موستەحەببەکان، وە تەطەووع وخۆبەخشەکان.

### مەبەستمان بە سوننەتەکان:

ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیشتبێت:

کە بەردەوام بووبێت لەسەری، وەك سوننەتە ڕاتیبەکانی دوای نوێژە فەرزەکان، وە نوێژی چێشتەنگا و ویتر و، نوێژی تەهەجود (شەو نوێژ)و ئەوانی تر، چونکە سوننەت بریتییە لەو ڕێگەی لەسەری ڕۆشتووە.

### وە مەبەستمان لە موستەحەببەکان:

ئەوەیە کە فەرموودە لەبارەی گەورەییەوە هاتبێت، بەڵام ئەوەمان پێنەگەیشتبێت کە پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بووبێت لەسەری، وەك چۆن باسی ئەو نوێژانە دەکەین، کە لە ڕۆژ و شەوەکانی حەفتەدا دەکرێن، هەروەها ئەو نوێژانەی کە لە چوونەدەرەوەو هاتنە ماڵەوەدا دەکرێن، وە هاووێنەکانیان[1]،

---

(١) هەروەها ئەو نوێژانەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداوە و خۆی نەیکردووە، وەك دوڕکاتی نوێژی پێش مەغریب، بنوارە: الإتحاف٣/٣٢٩.

## وە مەبەستمان لە نوێژە خۆبەخشەکان:

ئەوانەی ترە، کە نە ئەسەر و نەفەرموودەیەکیان لەسەر نەهاتووە، بەڵام بەندەی خودا بە گیانی خۆبەخشیەوە ئەنجامی دەدات، کە بیەوێت موناجات و پاڕانەوەی تایبەتی لە حزوری خودادا بکات، بەو نوێژەی کە بە شێوەیەکی ڕەها لە شەرعەوە فرمانی کردنی پێ دراوە، وەك ئەوەی بیەوێت بەزیادەوە بیانکات، چونکە هان نەدراوە لەسەر ئەو نوێژە بە شێوەیەکی تایبەتی، هەرچەندە هانی ئەوە دراوە کە بە ڕەهایی و موطڵەقی نوێژ بکات[1]،

نوێژی خۆبەخشیش بەواتای نوێژێکە کە ببەخشرێت و پێشکەشی خودای بکرێت.

وە هەرسێ بەشەکەی نوێژ ناو براوە بە (نەوافیل)، لەو ڕووەوە کە نەفل بە واتای زیادە دێت، وە هەموویشیان لە فەرزەکان زیادن.

کەواتە وشەی نافیلەو سوننەت و موستەحەب و خۆبەخشی مەبەستمان پێیان زاراوەکانیان بوو، بۆ ئەوەی هەر یەکەیان ئەو مەبەستەی بۆی دیاری کراوە ئەوە بگەیێنێت، وە ئاساییشە کە کەسێکی تر ئەو زاراوانە بگۆڕێت، هیچ ڕێگرییەك نییە لە بەکارهێنانی زاراوەی جیاجیا، گرنگ ئەوەیە لە مەبەستەکان حاڵی ببین.

وە هەریەکێك لەو بەشانە جیاوازی لە میانیاندا هەیە، لەڕوی فەزڵ و گەورەیی و خێرەوە، بەپێی ئەو وتەو فەرموودەو ئەسەرانەی لەسەریان هاتووە، یان بە پێی بەردەوام بوونی پێغەمبەرﷺ لەسەریان، وە لە ڕوی دروستی و بە

---

(١) فقد روى الطبراني في الأوسط(٢٤٥)، مرفوعاً: (الصلاة خيرٌ موضوع، فَمَنِ استَطاعَ أن يَستَكثِرَ..فَلْيَستَكثِر). واتە نوێژ خێرێکە و دانراوە و پێتان بەخشراوە، ئەوەی دەیەوێت لەو خێرە زۆرتر بەهرەمەندبیێت، با زیاتر لەو نوێژەیە بکات و خێری زیادی دەستکەوێت.

هێزی و مەشهوری ئەو فەرمودانەی لەسەر سوننەتەکان هاتوون.

**بۆیە دەڵێین:**

**ئەو سوننەتانەی بە کۆ ڕادەپەڕێنرێن:**

گەورەترن لەو سوننەتانەی بە تەنها دەکرێن.

**وە گەورەترین سوننەت کە بە جەماعەت دەکرێن:**

نوێژەکانی جەژن و خۆرگیران و مانگ گیرانەو نوێژی بارانبارینە.

**وە گەورەترین سوننەتی تاك:**

سوننەتی ویتر و دووڕکاتی بەیانی و پاشان ڕاتیبەکانی تر، بە پێی جیاوازی و پلەو پایەکانیان.

**وەبزانە:**

سوننەتە زیادەکان(نوافل) بەو پێیەی کە بدرێتە پاڵ پەیوەندارەکانیان دەکرێن بەم بەشانەوە:

ئەوەی پەیوەندی بە هۆکارێکەوە هەبێت؛

وەك نوێژەکانی خۆرو مانگ گیران و باران بارین.

وەئەوەی پەیوەندار بێت بە کاتەکانەوە:

ئەوەش کە پەیوەنداری کاتەکان بێت، دەکرێت بەم بەشانەوە:

بەشێکیان بە دووبارەوە بوونی شەوو ڕۆژەکان تازە و نوێ دەبنەوە،

وە هەندێکیشیان بە دووبارەوەبوونی حەفتەکانە.

یان بە دووبارەوە بوونەوەی ساڵەکانە.

## کەواتە پوختەی هەموویان چوار بەشە:

## بەشی یەکەم:

ئەو سوننەتانەیە بە دووبارە بوونەوەی شەوو ڕۆژەکان دووبارە دەبنەوە. ئەمەش شەش دانەیە:

پێنجیان بریتییە لە ڕاتیبەی پێنج نوێژە فەرزەکان، وە سیانیشیان لە دوای ئەوانەوەیە، کە بریتییە لە نوێژەکانی (ضوحا)وچێشتەنگا، وە زیندووکردنەوەی نێوانی نوێژی ئێوارە و خەوتنان، وە نوێژی شەونوێژ(تەهەجود).

**یەکەم: ڕاتیبەی بەیانی:**

کە بریتییە لە دوو ڕکات،پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

**(رَكعَتا الفَجْرِ خيرٌ مِنَ الدُنْيا وَمَا فِيها)**[1]،

(واتە: دووڕکاتی نوێژی بەیانی پاداشتەکەیان باشترە لە دونیاو هەموو ئەو نیعمەتانەی لە دونیادا لێیان بەهرمەند دەبێت).

وە کاتی ئەم سوننەتە لەگەڵ هەڵاتنی گزنگی بەرەبەیانە، سپیایی درووستی کەناری ئاسمان، ئەو سپیاییە نا کە درێژ دەبێتەوە و ماوەیەك دەڕوات و لەپاشان نامێنێت، کە بە فەجری درۆزن ناسراوە، بەڵکو مەبەست(فەجری صادیق)ە، کە بە پانایی ئاسمان بەرز دەبێتەوەو ئیتر تا بێت زیاد دەکات، وە هەست کردن بەمە، لە سەرەتاوە بە تەنها بینین زۆر ئەستەمە، چونکە پەیوەندی هەڵاتنی گزنگی بەرەبەیان بەو ئەستێرانەوە دەزانرێت کە بە چاو دەبینرێن، کەواتە بەهۆی ئەستێرەکانەوە کاتی گزنگی بەرەبەیان دەزانرێت، وە بە هۆی مانگەوە لە دوو شەوەی ئەو مانگەدا کاتی بەیانی پێی دەزانرێت، چونکە مانگ لە گەڵ بەیانیدا هەڵدێت لە شەوی بیست و شەشدا ، هەروەها گزنگی

---

(١) قال العراقي أخرجه مسلم(٧٢٥) من حديث عائشة ا هـ قلت وأخرجه كذلك الترمذي والنسائي، الإتحاف ٣/٣٣١.

بەیانی (فەجر) لەگەڵ خۆرنشینی شەوی دوانزەی مانگ دەبێت، زۆربەی گۆڕانەکان بەمشێوەیە، وە هەندێك جار جۆرە جیاوازییەك پەیدا دەبێت بەهۆی گۆڕانی هەندێك لە بورجەکاندا، وە باس و ڕاڤەکردنی ئەم بابەتە درێژ دەکێشێت.

وە فێربوونی جێگاو مەنزڵگاکانی مانگ و، ماوەی مانەوەی لەو جێگایانە، لەو فرمانە گرنگانەیە کە موریدی ڕێگای ئاخیرەت پێویستە بیانزانێت، تا شارەزاببێت لەسەر ئەندازەی کاتەکانی شەو ڕۆژو، وەختی گرنگی بەرەبەیان.

وە ئەو دووڕکاتی بەیانییە، تا نوێژی بەیانی بمێنێت ئەویش دەمێنێت، بە نەمانیشی کە خۆر هەڵدێت کاتی ئەو نوێژەیش نامێنێت.

بەڵام سوننەت ئەوەیە لە پێش فەرزەکەوە بیانکات، ئەگەر چووە ناو مزگەوتەوەو قامەتی نوێژ دەکرا، با خەریکی نوێژە فەرزەکە بێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی **((إذا أقيمَتِ الصَّلاةُ فلَا صَلاةَ إلاَّ المكتُوبَة))**[1]،

واتە: ئەگە دەستی کرد بە قامەتی نوێژ، نابێت نوێژ بکرێت، جگە لە نوێژی فەرز نەبێت. لەپاشان ئەگەر لە فەرزەکە لێ بوویەوە، هەڵدەستێتەوە بۆ دوو ڕکاتەکەی بەیانی و دەیانکات.

**وە ڕای درووست ئەوەیە:**

کە ئەو دووڕکاتە بە حازر بۆی دەنوسرێت، مادەم کاتی نوێژی بەیانی مابێت. چونکە بە بەشێك لە نوێژی فەرز دادەنرێن، وە کاتێك ڕیزبەندی لە میانیاندا بە مەرج گیراوەو سوننەتە، لە دواخستنی نوێژەکان یان پێشخستنیان

---

(١)قال العراقي أخرجه مسلم (٧١٠)من حديث أبي هريرة ا هـ ، قال الحافظ الزبيدي٣/٣٣٣.
وأخرجه أحمد بلفظ: إلا التي أقيمت وابن حبان بلفظ: **(إذا أخذ المؤذن في الإقامة)**
وأخرجه الأربعة مثل لفظ مسلم

ئەگەر لەگەڵ نوێژێکی جەماعەت یەك نەگرنەوە، وە ئەگەر یەکبگرنەوە ئەوا تەرتیب و ڕیزبەندی نامێنێت و، نوێژەکەیش کە دەیانکات بە حازر دەزانێت.

وا موستەحەب و خێرداره کە نوێژەکە بباتەوە ماڵی خۆی و بیکات، وە بە سووکی و خێرایی بیانکات و نابێت بفەوتێت.

له پاشان دەچێته ناو مزگەوتەوە، دووڕکاتی دیاری مزگەوت دەکات.

له پاشان کە دانیشت، نابێت نوێژبکات جگە لە نوێژی بەیانی نەبێت. جا لە میانی بەرەبەیان و خۆرهەڵاتن دا، باشتر وایە کە خەریکی زیکر و بیرکردنەوە بێت، وە تەنها ئەو دوو ڕکاتەی کە باسمان کرد بیانکات و پاشماوەی کاتەکەی بە زیکر و فیکر بیباتەسەر.

**دووهەم: نوێژی ڕاتیبەی نیوەڕوان،**

ئەمەش شەش ڕکاتە، دووڕکاتی لە پێش نوێژ، وە چوار ڕکاتیش لە دوای نوێژەکەوە بیانکات، هەروەها ئەمەیش سوننەتە، هەرچەندە لە خێردا لە دووڕکاتە دواییەکە کەمترە.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**مَنْ صلَّى أربعَ رَكعاتٍ بعْدَ زوَال الشَّمس يُحْسنُ قِراءتَهُنَّ ورُكوعَهنَّ وسجُودَهُنَّ صلَّى مَعهُ سَبعُون ألفَ مَلكٍ يَستَغفِرونَ لهُ حتَّى اللَّيل**))[1]، (واتە: دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، (زەوال) ئەوەی چوار ڕکات نوێژ بکات و بە جوانی بیخوێنێت و ڕکوع وسەجدەکانی ببات، حەفتاهەزار

(١)قال العراقي: ذكره عبد الملك بن حبيب بلاغاً من حديث ابن مسعود ولم أره من حديث أبي هريرة اهـ قال الزبيدي٣/٣٣٥: وفي المصنف لأبي بكر بن أبي شيبة حدثنا يحيى بن آدم حدثنا شريك عن الأعمش عن المسيب بن رافع عن علي بن الصلت عن أبي أيوب عن النبي صلى الله عليه وسلم نحوه، حدثنا وكيع عن سفيان عن أبي اسحق عن عبد الرحمن بن بديل قال حدثني أبطن الناس بعبد الله بن مسعود **أنه كانَ يصلِّي في بيتهِ إذا زالت**

مەلائیکە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن تا کاتی شەو).

وە حاڵی پێغەمبەر ﷺ وەها بوو کە هەمیشە ئەو چوار ڕکاتەی دوای زەواڵی وازلێ نەهێناوە، وە درێژی دەکردنەوەو دەیفەرموو:

**((أن أبوابَ السماءِ تُفتَح في هذهِ السَّاعةِ فأحبُّ أَن يُرفَع لي فيها عَمَلٌ))**[1]،

(واتە: دەرگاکانی ئاسمان لەم ساتەدا دەکرێنەوە، پێم خۆشە لەو ساتەدا کردەوەیەکی باشی منی تێدا بەرزبێتەوە)

---

**الشمس أربع ركعات، يُطيل فيهنَّ فإذا تجاوبَ المؤذنون خَرج فجلَس في المسجد حتى تُقام الصلاة.**

(١)رواه أحمد في مسنده(١٤٩٧٠) بسند ضعيف بنحوه، وهو عند أبو داوود(١٢٧٠)، وابن ماجه(١١٥٧)مختصرا، وللترمذي في الشمائل(ﷺ٢٤٣)٢٩٦، نحوع من حديث عبدالله بن السائب، وقال حسن، قال الزبيدي٢٣٦/٣: أخرج ابن أبي شيبة في مصنفه (١٦/٢(٥٩٤١) **قال أبو أيوب الأنصاري يا رسول الله ما أربع ركعات تواظب عليهن قبل الظهر فقال رسول الله ﷺ أن أبواب الجنة تفتح عند زوال الشمس، فلا ترتجعُ حتى تقام الصلاة، فأحب أن أقوم.** وأخرج الطحاوي في شرح معاني الآثار٣٣٥/١، بسنده عن أبي أيوب الأنصاري قال: **( أدمن رسول الله ﷺ أربع ركعات بعد زوال الشمس نقلت يا رسول الله أنك تدمن هؤلاء الأربع ركعات فقال يا أبا أيوب إذا زالت الشمس فتحت أبواب السماء فلم ترتج حتى تصلي الظهر فاحب أن يصعد لي فيهن عمل صالح قبل أن ترتج فقلت يا رسول الله أفي كلهن قراءة قال نعم قلت بينهن تسلم فاصل، قال لا إلا التشهد)**، وحدثنا عن عبد العزي بن معاوية القرشي حدثنا فهد بن حيان حدثنا شعبة عن عبيدة عن ابراهيم عن سهم بن منجاب عن قزعة عن القرثع عن أبي أيوب عن النبي ﷺ قال: **(أربع ركعات قبل الظهر لا تسليم بينهن تفتح لهن أبواب السماء)** اهـ قلت: وهذا السياق الأخير هو الذي أخرجه أبو داود والترمزي في الشمائل وابن خزيمة في الصلاة من حديث أبي أيوب كلهم من طريق عبيدة وهو ابن معتب الكوفي ضعفه أبو داود وقال المنذري لا يحتج بحديثه وقرثع قال الذهبي في المغني(٥٢٤/٢(٥٠٣٩) ذكره ابن حبان في الضعفاء٢١١/٢(٨٧٥) ولذا قال يحيى القطان وغيره أن الحديث ضعيف. الإتحاف ٢٣٧/٣.

که ئەبو ئەیوبی ئەنصاری بەتەنها ڕیوایە کردووە[1]،

هەروەها ئەوەش کە (أم حبیبه) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە هەمان واتا دەبەخشێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**مَن صلَّى في يَومٍ اثنتَي عشَرةَ ركعةً غيرَ المكتوبَة، بنَى اللهُ له بيتاً في الجنَّة: رَكعتَينِ قبلَ الفَجر، وأَربعاً قبلَ الظُّهر، ورَكعتَين بعدَها، وركعتَيَن قبلَ العَصرِ ورَكعَتينِ بعدَ المَغربِ**))[2]،

(ئەوەی جگە لە نوێژە فەرزەکان هەمو ڕۆژێك دوازدە ڕکات نوێژی سوننەت بکات خودای گەورە خانویەکی لە بەهەشتدا بۆ درووست دەکرێت، دووڕکاتی

---

(١) رواه الترمذي(٤٧٨) عن عبدالله بن السائب (رضي الله عنه) وقال: وفي الباب عن علي (رضي الله عنه) وأبي أيوب (رضي الله عنه) وهو عن أبي أيوب عند أحمد في مسنده ٤١٦/٥.

(٢)رواه النسائي ٢٦٢/٣، بتأخير ركعتي الفجر، وأصله عند مسلم (٧٢٨). هكذا أخرجه مسلم مختصرا، وقال أبو بكر بن أبي شيبة في المصنف حدثنا يزيد بن هرون أخبرنا إسماعيل بن أبي خال عن المسيب بن رفاع عن عنيسة بن ابي سفيان عن أم حبيبة بنت أبي سفيان عن النبي ﷺ (**من صلى في يوم وليلة اثنتي عشرة سجدة سوى المكتوبة بنى الله له بيتا في الجنة**) وقد روى بهذا اللفظ أيضا من حديث عائشة وأبي هريرة قال أبو بكر بن أبي شيبة حدثنا وكيع عن مصرف بن واصل عن عبد الملك بن ميسرة عن عائشة قالت: (**من صلى أول النهار ثنتي عشرة ركعة بنى له بيتا في الجنة** وأخرجه النسائي والعقيلي من حديثه بلفظ: **من صلى في اليوم والليلة اثنتي عشرة ركعة تطوعا بنى الله له بيتا في الجنة**)، وأخرج الطبراني في الكبير من حديثها بلفظ (**من صلى في يوم ثنتي عشرة ركعة بنى الله له بيتا في الجنة ومن بنى لله مسجدا بنى الله له بيتا في الجنة**) وقد ورد تعيين أوقات الركعات في حديث أم حبيبة عند النسائي والحاكم وصححه وقال على شرط مسلم فقالا (رضي الله عنهما) وعند ابن جرير وابن حبان(٢٠٥/٦(٢٤٥٢) والطبراني(٢٣(٢٠٣)(٤٣٢) وابن عساكر ٦٠(٤).في حديثهما: (**أربع ركعات قبل الظهر واثنتان بعدها واثنتان قبل العصر واثنتان بعد المغرب واثنتان قبل الصبح وهذا التفاوت في السياق لا يضر ولعل الحكمة في ابتداء أربع الظهر لأنها أول صلاة صليت بعد الافتراض، والسنة تبعٌ للفرض**)، ولذلك إختاره صاحب المبسوط.الإتحاف٣٣٦/٣-٣٣٩.

پێش نوێژی بەیانی، چوار یش پێش نیوەڕۆ، دوورکاتیش دوای نیوەڕۆ، وە دوو ڕکاتیش پێش عەسر، وە دوو ڕکاتیش دوای مەغریب.)

وە (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: **((حَفظتُ عَن رسُول اللهِ ﷺ في كلِّ يَوم عَشرَ رَكعاتٍ))**[1]، واتە: لە پێغەمبەری خودام ﷺ وەرگرتووە کە هەموو ڕۆژێك دە ڕکات نوێژی دەکرد، ئەوەی (أم حبیبە) باسی کردووە، هەمان سوننەتەکان دەفەرموێت: جگە لە دوڕکاتی بەیانیان، چونکە ئەوکاتانە نەدەچووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بەڵام (حەفصە) ی خوشکم بۆی باس دەکردم، **((أنه ﷺ كانَ يُصَلي في بَيتِها رَكعتينِ ثُمَّ يَخرُج))** پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەی خۆی دا دوڕکات نوێژی دەخوێند و، لە پاشان دەچوو بۆ مزگەوت، هەروەها ئبن و عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوورکاتی پێش نیوەڕۆ و دوڕکاتی دوای خەوتنان: **((رَكعَتينِ قَبلَ الظُّهرِ ورَكعتَينِ بعدَ العِشاء))**[2]،کەواتە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆ دەبێتە سوننەتی (مؤكدة)و دووپاتکراوە.

وەختی سوننەتی نیوەڕۆ ڕاستەوخۆ لە پاش زەوالەوە دێت، بەوەشدا دەزانرێت کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایداوە، بە زیاد بوونی سێبەری هەموو کەسێك کە بە پێوەیە، کە لار بێتەوە بەلای ڕۆژهەڵاتدا،چونکە هەر کەسێك

---

(١) متفق عليه واللفظ للبخاري ولم يقل في كل يوم(١١٨٠)(١١٨١).

(٢)قال البخاري في الصحيح باب التطوع بعد المكتوبة حدثنا مسدد حدثنا يحيى بن سعيد عن عبيد الله أخبرني نافع عن ابن عمر قال: **(صليت مع النبي صلى الله عليه وسلم سجدتين قبل الظهر، وسجدتين بعد ا لظهر، وسجدتين بعد المغرب، وسجدتين بعد العشاء وسجدتين بعد الجمعة، فاما المغرب والعشاء ففي بيته،** وحدثتني أختي حفصة أن النبي **صلى الله عليه وسلم كان يصلي سجدتين خفيفتين بعدما يطلع الفجر، وكانت ساعة لا أدخل على النبي صلى الله عليه وسلم فيها)**، الإتحاف ٣/٣٣٩.

خۆری لەسەر هەڵبێت، لە لای ڕۆژئاواوە سێبەرێکی دەبێت، وە درێژدەبێتەوە، بەردەوام خۆر بەرزدەبێتەو و سێبەرەکە کەمدەکات، وە لەلای ڕۆژئاواوە لادەدات، تا دەگاتە کۆتایی بەرزبوونەوەی، کە پێی دەوترێت کەوانەی نیوەڕۆ، ئەمەش ئەوپەڕی کەم بوونەوەی سێبەرەکەیە، کەواتە ئەگەر خۆرەکە لە لوتکەی بەرزکردنەوەکەی دابەزی، سێبەرەکەی زیاد دەبێت ، لەوکاتەوە کە هەست بە زیادبوونی سێبەرەکە دەکرێت، کاتی نیوەڕۆ دێتە پێشەوە، وە بە دڵنیاییەوە دەزانرێت کە لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لە عیلمی خودادا پێشتر ڕوی داوە. بەڵام تەکلیفەکان کاتێك پەیوەندای بەندەکان دەبێت، کە هەستیان پێ کردبێت.

ئەو ئەندازەیش لە سێبەرەکە ماوە کە لەوەوە زیادبوونەکەی دەست پێ دەکات، لە زستاندا درێژ دەبێتەوە و لە هاویندا کورت دەبێت.

وە ئەوپەڕەکەیشی درێژبوونی گەیشتنی خۆرە بە بورجی(الجدْيِ)، وە ئەوپەڕی کورتییەکەیشی گەیشتنیەتی بە سەرەتای بورجی(السَّرطان)[1] .وە ئەو ئەندازەو کاتانەش بە سەرنج و قەدەم و پێوەر پێوانەکان دەزانرێت.

وە یەکێك لەو ڕێگایانەی کە نزیکە لە لێکدانەوەی ڕاستییەوە، بۆ ئەوکەسانەی بە چاکی چاودێریان کردبێت، ئەوەیە: کە بەشەو سەرنجی قوطبی شیمالی بدات، وە لەوحەیەکی چوارگۆشە زۆر بە ڕێکی و یەکسانی بخاتە سەر زەوی، بە شێوەیەك کە یەکێك لە پەل و لایەکانی لە تەنیشتی قوطبەکەوە

---

(١) واتە: هەشتەمینی بورجەکانە کە لە شازدەی کانونی دووهەمی ڕۆمییەوە دەست پێ دەکات.وە بورجی سەرەتان: کە بورجی چوارەمە و لە دوای نیوەی ڕۆژی حەفدەی مانگی حوزەیرانی ڕۆمی دەست پێ دەکات، بنوارە: الإتحاف ٣٤١/٣-٣٤٤. بە درێژی باسی بورجەکان و کاتەکانی کردووە.

بێت، به شێوەیەك ئەگەر بە خەیاڵ وات دانا کە بەردێك لە چەقی قوطبەوە دەکەوێتە سەر زەوی، لە پاشان وات دانا کە هێڵێکت ڕاکێشاوە لەو سەرچاوەی کە بەردەکەی لێ کەوتۆتە خوارەوە، بۆ ئەو سەرە پەلەی کە دێت بەشوێنیدا لەلەوحەکە. ئەوکاتە هێڵەکە لەسەر پەل و جەمسەرەکە ڕادەوەستێت بە دوو زاویەی قائیم، واتە: گۆشەستوون. (شکڵێك کە گۆشەی نەوەد پلەیی هەبێت) واتە: نابێت هێڵەکە بەلای یەکێك لە پەل و (ضیلع)ەکاندا لابداتەوە، لە پاشان ستوونێکی ڕاست بە دانانێکی ڕێك لەسەر لەوحوکە دادەنرێت، لە شوێنی نیشانەی (ە~) لە تەنیشت و لای قوطبەوە، ئەوکاتە سێبەرەکەی لە سەرەتای بەیانی و ڕۆژبوونەوەوە دەکەوێتە سەر لەوحەکە، کە بۆ لای ڕۆژئاوا مەیلانی هەبێت، بەرەو هێڵی (آ)، لە پاشان بەردەوام لاردەبێتەوە تا دەکەوێتە سەر هێڵی (ب~)، بە شێوەیەك ئەگەر سەری هێڵەکە درێژ بکرێتەوە، ئەوا هەر بەڕاستی هێڵەکە دێتە خوارەوە بۆ سەر ئەو شوێنەی کە بەردەکەی لێ کەوتۆتەخوارەوە. بە شێوەیەك کە لە ئاستی هەردووپەلی لای ڕۆژهەڵات و لای ڕۆژئاوادا دەبێت، بەبێ ئەوەی بەلایەکیاندا لار بێتەوە، ئەگەر مەیل و لادانی بەلای ڕۆژئاوادا بەتاڵ و پوچ بوویەوە، ئەوا لەو کاتەدا خۆر لە ئەوپەڕی ئاستی بەرزیدا دەبێت، وە ئەگەر سێبەرەکە لەو هێڵەی کە لەسەر لەوحەکەیە لایدا و بەرەو لای ڕۆژهەڵات خوار بوویەوە، ئەوکاتە ئیتر خۆر زەوالی بۆ پەیدا دەبێت و، لە ناوەڕاستی ئاسمان دەترازێت و لادەدات.

ئەم زانیاریانەش بە دڵنیاییەوە بە هۆی حاسسە هەستیارەکانەوە پەیدا دەبێت و پێی دەزانێت، لە کاتێکدا کە سەرەتای ئەو کاتەیە کە خەریکە زەوال لە عیلمی خودادا پەیدا دەبێت، لە پاشان لەسەر سەری سێبەرەکە لە کاتی سەرەتای لادانەکەیدا نیشانەیەك دابنێت، جا ئەگەر ئەو سێبەرە لەو نیشانەوە کە دایناوە، بە قەدەر ستوونێکی ڕاوەستاو ببێت ، ئەوە کاتی نوێژی عەسر دێتە

پێشەوە، ئەم ئەندازەی کە باسمان کرد ئاساییە، ئەگە بزانرێت لە زانستی زەوال، کە ڕونکرایەوە.

**ئەمەش وێنەیەکی کێشراوە بۆ ڕونکردنەوەی سەرەتاو کۆتای زەوال:**




## ئەستێرەی قوطب

هێڵێکی ڕاست لە ئەستێرەی قوطبەوە بۆ چەقی ناوەندی سەر زەوی.

شوێنی سێبەری زەوالی خۆر........ شوێنی سێبەرەکە پێش زەوال.

لای ڕۆژئاوا ........ لای ڕۆژ هەڵات

جێگەی ستوونەکە ناوەندی هەمووی.

## سێیەم: ڕاتیبەی عەسر:

بریتییە لە چوار ڕکات لە پێش نوێژی عەسردا، ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە لە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((رحِمَ الله عَبداً صلَّى أَربعاً قبلَ العَصر))[1]

(ڕەحمەتی خودا لەو کەسەی پێش نوێژی عەسر چوار ڕکات نوێژ دەکات)

کردنی ئەم نوێژە بەو هیوایەی بەری ئەو نزای (حەزرەتی) پێغەمبەرە ﷺ بکەویت، کارێکی باش و زۆر پەسەندو شیاوە، بێگومان دۆعای پێغەمبەر ﷺ وەرگیراو دەبێت.

بەڵام ئەوەندە هەیە بەردەوام بوونی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ لە کردنی سوننەتی پێش عەسر، وەك بەردەوامی ئەو نەبووە بۆ دووڕکاتی پێش نیوەڕۆ.

**چوارەم: ڕاتیبەی نوێژی ئێوارە:**

ئەوەش دووڕکاتی دوای نوێژی مەغریبە(ئێوارە). هیچ ڕیوایەتێکی جیاوازی لەسەر نەهاتووە.

بەڵام ئەو دوو ڕکاتەی کە لە پێش نوێژی ئێوارە بکرێت، لە میانی بانگ و قامەتدا، بە شێوەیەکی خێرا، ئەوە لە کۆمەڵێك لە صەحابەوە گێڕاویانەتەوە، وەك ئوبەیی کوڕی کەعب، وە عوبادەی کوڕی صامیت، وە ئەبی زەڕ، وە زەیدی کوڕی سابیت و ئەوانی تر (خودایان لێ ڕازی بێت)[2]

---

(١)قال العراقي أخرجه أبوداد(١٢٧١) والترمذي(٤٣٠) وابن حبان من حديث ابن عمر وأعله ابن القطان ولم أره من حديث أبي هريرة أهـ. قال الحافظ الزبيدي ٣٤٨/٣: حسنه الترمذي وصحيحه ابن حبان ولفظهم جيمعا: **(رحم الله امرأ صلَّى قبل العصر أربعاً).**

(٢) فعند إبن أبي شيبة في المصنف(٧٤٥٦) عن زرٍّ قال: رأيت عبدالرحمن بن عوف وأبي بن كعب: **(إذا أذَّن المؤذنُ المغربَ قاما فَصَلَّيا رَكعَتَينِ)** وورد فِعلها عنده(٦٤٥٧)(٧٤٦٤) عن أنس وسعد بن أبي وقاص (رضي الله عنهما) .وفي المسند(٢٠٦٩٥)،

عوباده یان ئەنەس دەفەرموێت: **((كانَ المُؤذن إذا أذَّنَ لِصَلاةِ المَغْرِبِ ابتَدرَ أصحابَ رسُولِ الله ﷺ السَّوارِيَ، يُصلُّونَ ركعتينِ))**[1]،

کاتێك بانگوێژ له بانگەکەی لێدەبوویەوە، ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ له پاڵ ستونەکاندا بە خێرایی دووڕکات نوێژیان دەکرد.

وە هەندێکی تریان فەرموویانە: **((كُنَّا نُصَلِّي الرَّكعتَينِ قَبلَ المَغربِ حَتَّى يَدخُل الدَّاخِلَ فَيَحْسِبُ أنَّا قَد صلَّينا، فيسأَل أَصَلَّيتُم المَغرِبَ))**[2]،

ئێمە دووڕکات نوێژمان دەکرد، ئەوەی کە تازە دەهاتە ژورەوە وای دەزانی نوێژی ئێوارەمان کردووە، دەیپرسی ئەرێ نوێژتان کردووە؟

ئەمەیش دەچێتە ژێر ناوەرۆکی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

**((بينَ كلِّ أذانَينِ صَلاةٌ لِمَنْ شاءَ))** [3]،

(واتە: لە میانی بانگ و قامەتدا نوێژی سوننەت هەیە بۆ هەرکەسێك مەیلی لە نوێژ کردن بێت.)

(ئیمام)ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەو دووڕکاتەی دەکرد، خەڵکەکە لۆمەیان کرد، وازی لێ هێنان، وتیان بۆ چی وازت لێ هێنا، فەرمووی: نەمبینی خەڵکەکە ئەو دووڕکاتە بکەن منیش وازم لێ هێنا، وە فەرمووی:

---

(١)قال العراقي متفق عليه. (مسلم(٨٣٧) وفي البخاري(٥٠٣) و (٦٢٥) من حديث أنس لا عُبادة اهـ قلت وقال أبو بكر بن أبي شيبة حدثنا الثقفي عن حميد عن أنس قال: **سُئل عن الركعتين قبل المغرب؟ قال: (رأيتهم إذا أذَّن المُؤذن ابتَدروا السَّواريَ فصلّوا)**.

(٢)قال العراقي أخرجه مسلم (٨٣٦)من حديث أنس أهـ وقال البخاري في الصحيح باب الصلاة قبل المغرب حدثنا أبو معمر حدثنا عبد الوارث عن الحسين عن ابن بريدة حدثني عبد الله بن مغفل المزني عن النبي ﷺ قال: **(صَلُّوا قَبلَ صَلاةِ المَغربِ قال في الثالثة لمن شاءَ كراهيةَ أنْ يَتَّخِذَها النَّاسُ سُنَّة)**.

(٣) رواه البخاري(٦٢٤)، ومسلم(٨٣٨)

ئەگەر خەڵکەکە لە ماڵەوە بیکەن، یان لە جێگەیەکدا کە نەکەونە بەرچاوی خەڵکەوە ئەوە کارێکی باشە.[1]

سەرەتای کاتی نوێژی خۆرئاوا لە زەویە رێکەکاندا، بە نیشتن و دیارنەمانی خۆرە لەبەر چاو، کە بە چیاکان چواردەوریان لێ نەگیراوە، بەڵام ئەگەر لە لای رۆژئاواوە بە چیا و شاخەکان چواردەویان درابێت، با بووەستێت تا ڕەشایی دەبینێت لە لای رۆژهەڵاتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

**((إذا أقْبَلَ اللَّيلُ مِن هَهُنا، وأَدبَر النَّهارُ مِن هَهُنا، فقَد أفْطَر الصَّائِم))** [2]

واتە: ئەگەر تاریکایی شەو داهات لێرەوە (لەلای رۆژهەڵاتەوە)، تیشکی ڕۆژیش نەماو پشتی هەڵکرد لێرەوە (لەلای ڕۆژئاواوە)ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ڕۆژووەوان ڕۆژوەکەی بشکێنێت.

ئەوەی باشترە خێراییە لە نوێژی مەغریبدا بە تایبەتی، وە ئەگەر دواخراو ئەنجامدرا لە پێش ئەوەی سورایی کەناری ئاسمان بنیشێت، ئەوە نوێژەکەی بە حازر بۆی دەنوسرێت، بەڵام کارێکی ناپەسەند و مەکروهە.

وە (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) شەوێکیان نوێژی مەغریبە دواخست، تا ئەستەرەیەك هەڵات و دەرکەوت، لەبەر ئەو دواخستنی نوێژە، گەردنی بەندەیەکی ئازاد کرد.

هەروەها(حەزرەتی)عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودای لێیان ڕازی بێت) نوێژی ئێوارەی دواخست تا دوو ئەستێرە دەرکەوتن، ئەویش دوو بەندەی ئازاد کرد[3]،

---

(١) قوت القلوب٢/١٤٧.

(٢)قال العراقي متفق عليه البخاري(١٩٥٤) ومسلم(١١٠١) من حديث عمر اهـ قال الزبيدي ٣٥٢/٣: أخرجه الستة سوى ابن ماجه ،

(٣) قوت القلوب ٢٦/١.

## پێنجەم: ڕاتیبەی دوانوێژی خەوتنان:

ئەم سوننەتەیش چوار ڕکاتە، لەدوای فەزی خەوتنانەوە دەکرێت، (حەزرەتی) عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

((كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بعدَ العِشاءِ الآخِرَةِ أَربَعَ رَكَعاتٍ ثُمَّ يَنام))[1]

(پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێك لە دوای نوێژی خەوتنان چوار ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد و لە پاشان دەنوست).

وە هەندێك لە زانایان، لە کۆمەڵێکی زۆر لە هەواڵ و فەرموودەکان ئەوەیان هەڵبژاردووە، کە ژمارەی سوننەتە ڕاتیبەکان حەڤدە ڕکاتە، وەك ژمارەی ڕکاتی نوێژە فەرزەکان، دووڕکاتی پێش نوێژی بەیانی، وە چوار ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆ، وە دوو ڕکات لە دوای نوێژ، وە چوار ڕکات پێش عەسر، وە دوو ڕکات دوای نوێژی ئێوارە، وە سێ ڕکات دوای نوێژی عیشای دوایی، کە یەکێکیان پێی دەوترێت ویتر، وە هەرچەندێك لەو فەرمودانەی لەم بارەوە هاتوون بیانزانیت، ئیتر هیچ واتایەك نامێنێتەوە بۆ دیاری کردنی، ئەوەی بزانرێت کە بەڵگەی دروستی هەیە، ئەوە کاری پێ دەکرێت، تەنانەت ئەگەر بەڵگەکەیش ڕیوایەتێکی (حەسەن) بێت، چونك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((الصَّلاةُ خَيرٌ مَوْضُوعٌ، فمَنْ شاءَ أَكثرَ وَمَنْ شاءَ أَقَلَّ))[1]،

---

(١)أخرجه أبو داود(١٣٠٣) في سننه بلفظ: **ما صلي رسولُ الله ﷺ (العشاء قطُّ، فدخل عليَّ إلا صلَّى أربعَ ركعات أوست ركعات)**، الحديث وفي صحيح البخاري(١١٧) وغيره عن ابن عباس قال: **(بتُّ عند خالتي مَيمونة بنت الحرث زوجة النبي ﷺ وكان النبي ﷺ عندها فصلّى النبي ﷺ العشاء ثم جاء إلى منزله فصلى أربع ركعات ثم نام)**... الحديث. الإتحاف ٣٥٢/٣.

(واته: نوێژ خێرێکی دانراوه بۆتان، ئەوەی ئارەزوی لێیەتی، با زۆر خۆی لێ بەهرمەند بکات، وە ئەوەیش ئارەزوی لێی نییه با کەم لەو خێره هەڵبگرێت).

کەواتە: هەڵبژاردنی هەر یەکێك لەم نوێژانە، لەوانەی کە ئیرادەی خێریان هەیە، بە پێی ئەوەی کە چەندێك ئارەزوی خێری هەیە، لەو بەڵگانەش کە ڕونمان کردنەوە بۆماندەرکەوت، کە هەندێکیان بەڵگەکەیان بەهێزترە لە هەندێکیان، وە وازهێنان لە سوننەتە دوپاتکراوەکان دوور ترە، کە دەشزانین کەموکوڕیی فەزەکان بە سوننەتەکان تەواو دەکرێن، دەی ئەگەر کەسێك سوننەتی زیادەی زۆر نەکات، لەوانەیە نوێژە فەرزەکانی پارێزراو نەبێت لە کەمی، بێ ئەوەی بتوانێت پڕیان بکاتەوەو بۆشاییەکانیان پڕ بکاتەوە.

**شەشەم: ویتر:**

(حەزرەتی) ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمویەتی: کاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی خەوتنان بە سێ ڕکات نوێژی ویتری دەخوێند، لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی ﴿**سَبِّحِ اسمَ ربِّكَ الأَعلى**﴾ ی دەخوێند، وە لە ڕکاتی دوهەمدا ﴿**قُلْ يا أيُّها الكافِرُون**﴾ ولە ڕکاتی سێیەمدا ﴿**قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ** ﴾ ی دەخوێند[2].

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە:

(**أنَّهُ ﷺ كانَ بعدَ الوَترِ جالِساً رَكعَتَينِ**) [3]، وە لە هەندێك ڕیوایەتی تردا هاتووە: (**متربعاً**)[1]، کە بەچوار مشقی دادەنیشت.

---

(1)قال العراقي أخرجه أحمد في المسند(١٧٨/٥) و ابن حبان و الحاكم و صححه من حديث أبي ذر اهـ. قال الزبيدي٣/٣٥٣: قال الحافظ هو خبرٌ مشهور رواه أحمد والبراز من حديث عبيد بن الحسحاس عن أبي ذر بلفظ: (**فمن شاء استقل و من شاء استكثر**).

(2) رواه ابن عدي في الكامل(١٣٣/٦)، وهو عن غيره عند أبي داوود(١٤٢٣)، والترمذي(٤٥٠) والنسائي(٢٣٥/٣، وابن ماجه(١١٧١).

(3) رواه أبو داوود(١٣٤٠)، والترمذي(٤٧١)، وابن ماجه(١١٩٥).

وه له هەندێك هەواڵدا هاتووە:

((إذا أرادَ أنْ يَدخُل إلى فِراشهِ زحفَ إليهِ وصلَّى فَوقَهُ ركعتَينِ قَبلَ أن يَرقَد. يقْرأ فيهما)) ﴿إذا زُلزلَت الأرضُ زِلزَالَها وسُورة الهَاكُمُ﴾ [٢].

ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بیویستاته بچێته ناو جێگاکەی، خۆی بۆ ڕادەکێشا و لەسەر جێگاکەی دووڕکات نوێژی دەخێند، پێش ئەوەی خەو بیباتەوە، لەو دوو ڕکاتەدا ئەم سوورەتانەی دەخوێند، ﴿إذا زلزلت الأرض زلزالها.﴾ وه سوورەتی (الْهاكُمُ التَّكاثُر)یان له ڕیوایەتێکی تردا ﴿قل يا أيها الكافرون﴾ ی دەخوێند.[٣]

وه درووسته ویتر بکرێت به مەفصولی و جیاکراوەیی، یان به مەوصولیی، واته: بەیەك سەلامدانەوە، یان به دوو سەلامدانەوە.

وه پێغەمبەریش ﷺ بەیەك ڕکات ویتری کردووه، وه به سیان و پێنج و بەم شێوه به تاکەکان تا یازده، وه ڕیوایەتەکەیش گومانی هەیه تا سیازده بێت، وه له حەدیسێکی ناوازەو شازدا دەیگەیێنێته حەڤده ڕکات ویتر.[٤]

---

(١) رواه النسائى٣/٢٢٤: كه باسی نوێژی پێغەمبەر ﷺ کردووه به چوارمشقی که دادەنیشت.

(٢)قال العراقي أخرجه البيهقي من حديث أبي امامة وأنس نحوه وضعفه وليس فيه زحف اليه ولا ذكر ألهَاكُم التكاثر اهـ قلت وأخرجه كذلك أحمد (وفي رواية أخرى: (**قل يا أيها الكافرون**) أى بدل ألهاكم وهذا أخرجه الطحاوى من حديث سعد بن هشام عن عائشة.

(٣) كذا في القوت٢/١٤٧)، وورد قراءة السور الثلاث المذكورة معا في الوتر، عند أحمد في مسنده، ١/٨٩)والبيهقي في (السنن الكبرى) ٣/٣٣، ولم يذكر الزحف إلى فراشة.

(٤) فالإيتار بركعة عند البخاري(٩٩٥)، ومسلم(٧٤٩) وبثلاث قد سبق، وبخمس عند مسلم، ٧٣٧)، وبسبع عند مسلم(٧٤٦)، وبتسع عند مسلم(٧٣٨)، والنسائي(٣/ ٢٤٠)، وبإحدى عشر عند النسائي، ٣/٢٤٣، وبثلاث عشر عند مسلم(٧٦٥)، والنسائى ٣/٢٣٧، وبسبعة عشر عند عبدالله بن مبارك، في الزهد١٢٧٣، والحافظ الزبيدى قام بتفنيد الروايات فلما وصل إلى رواية التردد، قال: تبع المصنف فيه، أي التردد، شيخه إمام الحرمين، حيث روى ترددا في ثبت النقل في الإيتار بثلاث عشرة، ثم ذكر وجه التردد في الروايات والكلام فيه.

وە کاتی خۆی ئەم ڕکاتانە، مەبەستم ئەوانەی کە بە کۆمەڵ ناو دەبرێت، نوێژەکانی شەوی بووە و شەو نوێژی دەکرد.

## تەهەججود لە لوغەتدا:

سوننەتێکی دوپاتکراوە و باسی گەورەییشی لە پەڕاوی ئەوراد دا دێت.

لە بارەی ئەوەی کامیان گەورەترە، جیاوازی ڕاکان هەیە، وتراوە:

بەڕکاتێکی تاك نوێژی ویتر بکات، ئەوە خێری زیاترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بووە لەسەری بەم شێوەیە.

وە دەڵێن: بەیەکەوە بیانکات و بەیەك سەلام بێت گەورەترە، بۆ ئەوەی لە شوبهەو گومانی خراپ دەرچیت، بە تایبەتی بۆ ئیمام، چونکە لەوانەیە کەسانێکی تر نوێژی لە پشتەوە بکەن، وە لە وانەیە کە کەسانێکی تر شوێنی بکەون و ئیقتیدای پێ بکەن، کە ڕایان وانەبێت یەك ڕکات بە تەنهایی نوێژە، (واتە : بە سوننەتی دانانێن)،

ئەگەر نوێژەکانی پێکەوەو بەیەکەوە ئەنجامدا، ئەوا با نیەتی هەمووی بە ویتر بهێنێت، وە ئەگەر لە دوای نوێژی خەوتنان تەنها یەك ڕکات نوێژی خوێند، یان دوای فەرزی نوێژکردن، نیەتی تەنها بە ویتر هێنا، ئەوە درووستە، چونکە مەرجی درووستی ویتر ئەوەیە کە لە خودی خۆیدا ویتر بێت، وە غەیری خۆیشی لە نوێژەکانی پێشوو بکاتە ویتر، لە ڕکاتەکانی پێشتر، ئەگەرنا ویتری دوای فەرز درووست نییە، واتە:

دوای نوێژی عیشا تەنها ڕکاتێك ویتر بکات و سوننەتی دوای نوێژی خەوتنانی نەکردبێت ئەوە بە ویتر ناژمێررێت.

وە ئەگەر لە دوای عیشا نوێژی ویتری خوێند، ئەوە درووست نییە، واتە:

گەورەیی ویتری دەستناکەوێت، ((**لا يَنالُ فضيلةَ الوَترِ الذي هُو خَيرٌ مِنْ حُمُر النِّعَم**)) ،[1]

واتە ئەم نوێژی ویترە، لە هەمووشتێك شیرینترە، تەنانەت لەوەی کە عەرەب بە(**حُمْرالنَّعَم**) (واتە وەك بەنرخی وشترە نایاب و سوور و بە نرخەکان)ناوی دەبەن و، زۆر بەهادارە لەلایان، وەك فەرموودەی لەسەر هاتووە، وە ئەگەر بەم شێوە نەبێت، ئەوە تەنها ڕکاتێکی تاکی درووستی وەرگیراو لە هەر کات و

(١)قال العراقي أخرجه أبو داود(١٤١٨) والترمذي(٤٥٢) وابن ماجه (١١٦٨)، من حديث خارجة بن حذافة : **إن الله أمدَّكم بصلاة وهي خير لكم من حمُر النعم**، وضعفه البخاري وغيره اهـ قال الزبيدي٣/٣٦٠: وأخرجه أحمد في مسنده(٢١٥٩٠) وأبو بكر بن أبي شيبة في مصنفه،٩٢/٢(٦٨٥٧)،والدار قطني في سننه(٣٠/٢)، والحاكم في المستدرك (٤٤٨/١ (١١٤٨)، وصححه وقال: إنما تركاه لتفرد التابعي عن الصحابي قال أبو بكر بن أبي شيبة في المصنف(٦٨٥٨) بسنده عن خارجة بن حذافة العدوي قال: خرج علينا رسول الله ﷺ صلاة الغداة فقال: (**لقد أمدكم الليلة بصلاة هي خير لكم من حمر النعم. قال قلنا ما هي يا رسول الله؟ قال الوتر. فيما بين صلاة العشاء الى طلوع الفجر**)، وحدثنا أبو خالد الاحمر عن حجاج عن عمرو ابن شعيب عن أبيه عن جده قال قال رسول الله ﷺ **إن الله زادكم صلاة إلى صلاتكم وهي الوتر**، وحدثنا وكيع عن سفيان عن حماد قال أخبرني مخبر عن عبد الله بن عمر قال: **ما أحب إني تركت الوتر ولا إن لي حُمر النعم** ، قال الدار قطني : كما في تلخيص الحبير لابن حجر(١٠٩/٢)، عبد الله بن راشد وعبد الله بن مرة لا يحتج بهما ولايعرف سماع لابن مرة عن خارجة وقال ابن عدي في الكامل(٥٠/٣)، ليس له الا هذا الحديث وفي الميزان الذهبي ١٩٧/٤):حديثه عن خارجة لم يصح وقال ابن حبان منقطع ومتن باطل ، قال الزبيدي: وذكر الذهبي في الكاشف ٥٤٩/١(٢٧١١)عبد الله بن راشد الحميري الزوفي عن ابن أبي مرة في الوتر، وعنه يزيد بن أبي حبيب وخالد بن يزيد وقال أيضا٥٩٦/١(٢٩٧٧): عبد الله بن مرة أوابن أبي مرة الزوفي شهد فتح مصر ونزلها سمع من خارجة بن زيد في الوتر وعنه عبد الله بن راشد ورزين الزوفيان سنده منقطع..

جێگایەك بکرێت بە ویتر بۆی دەژمێرێت، [1]، وە بۆیە نوێژی ویتر پێش نوێژی عیشا نەهاتووە، چونکە ئیجماعی خەڵکەکە تێك دەدات، لەوەدا کە هەموویان بە فیعلی لە دوای عیشا ئەنجامیان داوە.

وە نوێژێکی تر نەکەوتۆتە پێشیەوە کە بە هۆیەوە بگەڕێت بۆی بە ویتر.

بەڵام ئەگەر ویستی بە نوێژێکی سێ ڕکاتی ویتر بکات کە دووسەلامدانەوەی تێدا بێت و پێکەوە نەبن، ئەوکاتە سەرنجێك ڕو دەکاتە نییەتەکەی بۆ دوو ڕکاتی یەکەم، ئەگەر نییەتی نوێژی شەو نوێژ و سوننەتی خەوتنانی پێ هێنابێت، ئەوە بە نوێژی ویتر بۆی ناژمێررێت، وە ئەگەر نییەتی ویتری لێ هێنا بێت، خۆ لە ئەصڵی خۆیدا ویتر نییە، چونکە ویتر ئەو کاتەیە کە لە داوای ئەو دەیکات، بەڵام ئەو فەتوای کە ڕونترە لە مەزهەبدا ئەوەیە: با لە دووڕکاتی یەکەمیشدا نییەتەکەی هەر بە ویتر بێت، وەك چۆن ئەگەر سێ ڕکاتەکەی بە یەکجار بکردایە بە نییەتی ویتر دەیکردن.

**بەڵام ئەوەندە هەیە ویتر دوو واتای هەیە:**

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە لە بنەماو نەفسی خۆیدا هەر ویتر بێت و تەنها ڕکاتێك بێت.

**ئەوی تریان ئەوەیە:** کە بۆی دروست دەکرێت و بەزیادکردنی ڕکاتێکی تر کۆی هەمووی دەکات بە ویتر، بەڵام ئەوەندە هەیە، ویتربوونی ئەو نوێژە وەستاوە و بەسراوە بە ڕکاتی سێیەمەوە. ئەگەر ئەو نییەت و عەزمی ئەوەی هەبوو کە بیکات بە سێ ڕکات، بۆی هەیە کە هەر لە سەرەتاوە نییەتی ویتری لێ بهێنێت.

---

(١) نوێژی خۆبەخشی بەیەك ڕکاتیش لای ئیمامی شافیعی درووستە، کەواتە ئەم ڕکاتە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ناودەبرێت بە تەطەوع و خۆبەخشیەکی ڕووت.

کەواتە ڕکاتی سێیەم لە خودی خۆیدا ویترەو، ڕکاتەکانی پێشویش دەکات بە ویتر، بەڵام دووڕکاتەکەی پێشوو غەیری خۆیان ناکەن بە ویتر، وە خودی خۆیشیان بەویتر دانانرێن، بەڵام بە هۆی ڕکاتی سێیەمەوە بوون بە ویتر.

ویتر دەبێت لە دوایین ڕکاتەکانی نوێژی شەو دابێت، واتە کەوتبێتە دوای شەو نوێژەوە، وە پشت بە خودا لەمەودوا لە پەڕاوی ویردەکاندا باسی گەورەیی و خێری ویتر و نوێژی تەهەجود و چۆنیەتی ڕێکخستنیان دەکرێت.

## حەوتەم نوێژی چێشتەنگا(ضوحا):(چێشتە نوێژە)

بەردەوامی لە کردنی نوێژی ضوحا (کە لە دوای خۆر کەوتن ئەنجام دەدرێت) لەو کارانەیە کە نیشانەی عەزم و ئیرادەو بڕوای بە هێزی خاوەنەکەیەتی، وە نوێژێکی زۆر گەورەیە، ڕکاتەکانی زۆرترین ڕیوایەتی لەسەر بێت هەشت ڕکاتە.[1]

(دایکی هانیئ)خوشکی(حەزرەتی)عەلی کوڕی ئەبی طالیب (خودایان لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگای بە هەشت ڕکات کردووە، کە بە درێژی و جوانی دەیکردن.

وە جگە لەو، کەسی تر ئەم ژمارەی باس نەکردووە[1]، بەڵام (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کە پێغەمبەر ﷺ

---

(١)وقد ورد فيها أحاديث كثيرة صحيحة مشهورة حتى قال محمد بن جرير الطبري كما في نظم المتناثر للكتاني(ص/١٠٧) إنها بلغت حد التواتر وفي مصنف ابن أبي شيبة عن ابن عباس، كما في شرح صحيح البخاري لأبن بطال١٧٣/٣: **(إنها في كتاب الله ولا يغوص عليه إلا غوّاص. ثم قرأ: في بيوت أذن الله أن ترفع ويذكر فيها اسمه، يسبح له فيها بالغدو والآصال. وقال القاضي ابن العربي وهي كانت صلاة الأنبياء قبل سيدنا محمد صلوات الله عليهم)** . ينظر للمزيد الإتحاف ٣٦٦/٣.

((**كانَ يُصلِّي الضُّحَى أربَعاً ويَزيدُ ماشاءَالله**))[2]،

چوار ڕکات نوێژی ضوحای دەکرد(چێشتەنگا) وە هەرچەندیش خودا ئارەزوی لێ بوایە زیادی دەکرد.

زیادەکەی دیاری نەکرووە، بەڵام ئەوەندە هەیە لەسەر چوارەکە بەردەوام بووە و لێی کەم نەکردۆتەوە، وە هەندێك جار زۆر زیادی دەکرد.

وە لە فەرموودەیەکدا کە بە تاکی ڕیوایەتکراوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ (**كانَ يُصَلِّي الضُّحىَ سِتَّ رَكَعاتٍ**)[3]، نوێژی چێشتەنگای بە شەش ڕکات دەکرد، کاتەکەیشی دەگێڕنەوە بە (حەزرەتی) عەلی یەوە (خودای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگای بەشەش ڕکات دەکرد لە دووکاتدا:

**یەکەمیان:** ئەگەر خۆر هەڵات و بەرزبوویەوە و دونیا ڕوناك بوویەوە، هەڵئەستاو دوو ڕکاتی دەکرد.

---

(١) قال العراقي رواه(البخاري)١١٠٣)ومسلم(٣٢٦) دون زيادة أطالهن وأحسنهن، وهي منكرة، قال الزبيدي ٣٦٨/٣: لفظ البخاري: عن عبدالرحمن بن أبي ليلى يقول ما حدثنا أحد أنه رأى النبي ﷺ يصلى الضحى غير أم هانئ فانها قالت: (**إن النبي ﷺ دخل بيتها يوم فتح مكه فاغتسل وصلى ثمان ركعات فلم أر صلاة قط أخف منها غير أنه يتم الركوع والسجود.**)

(٢)أخرجه مسلم (٧١٩)من حديث معاذة أنها سألت عائشة: (**كم كان النبيُّ ﷺ يُصلي الضحى؟ قالت: أربع ركعات، ويزيد ما شاء الله.**) وكذلك رواه أحمد والنسائي وابن ماجه والترمذي في الشمائل. الإتحاف ٣٦٩/٣.

(٣)قال العراقي أخرجه الحاكم في فضل صلاة الضحى من حديث جابر ورجاله ثقات اه قال الزبيدى٣٦٩/١: وأخرجه الترمذي في الشمائل ص/٢٣٧(٢٩٠)من حديث أنس وأخرجه الترمذي والنسائي وابن ماجه من حديث على كما سياتى فى الذى بعده، وقد روى ايضا من فعل عائشة رواه ابن أبي شيبة في المصنف١٧٥/٢(٦٨١٢) من طريق تميمة بنت دهشم انها رأت عائشة صلت من الضحى ست ركعات

**((كانَ يُصلِّي الضحَى سِتّا في وَقتَينِ: أذا أشْرَقَتِ الشَّمسُ وأرتَفَعَتْ قامَ فَصلَّى رَكعتَينِ))**[1]،

ئەمەیش سەرەتای دووهەم ویردی سبەینیانە له ویردەکانی بەرەبەیان،

**وە دوهەمیان:**

**(إذا انبَسَطَتْ الشَّمسُ وكانَت في رُبعِ السماءِ مِن جانبِ الشَّرقِ صلَّى أربعَاً)**[2].

واتە: ئەگەر خۆر پەلی هاوێشت و لەڕوی ڕۆژهەڵاتەوە تا چوار یەکی ئاسمان بەرز بویەوە، ئەوا هەڵدەستێت و چوار ڕکاتی تری دەکرد.

**یەکەمیان:** کاتێك دەکات کە خۆر بە ئەندازەی نیو ڕم بەرز بوو بێتەوە.

**دووهەم:** ئەگەر لەو ڕۆژە چوار یەکێکی ڕۆشتبێت، بەئەندازەی ئەوەندەی کە نوێژی عەسر بۆ ئێوارە دەیمێنێت، چونکە ئەویش چواریەکێکی کاتی دەمێنێت تا ئێوارە، وە نیوەڕۆش لە نیوەی ڕۆژەکەدایە، کەواتە: وەك چۆن عەسر لە میانی نیوەڕۆو خۆر نشیندایە، هەرواش نوێژی ضوحا لە میانی نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدایە، [3]،ئەمەی کە باسکرا، باشترین و خێردارترین کاتەکانە کە نوێژی تێدا بکرێت، لە کاتی بەرز بوونەوەی خۆر تا پێش زەوال و لادانی لە ناوەڕاستی ئاسمان، ئەم ماوەیە هەموی کاتە بو نوێژی ضوحا.

---

(١) وەك گەورەیانی نەقشبەندی بە نوێژی ئیشراق ناوی دەبەن. قوت القلوب الإتحاف ٣٦٩/٣.

(٢) قال العراق أخرجه الترمذي(٤٢٩) والنسائي في السنن الكبرى ١٤٧/١(٣٣٧) وابن ماجه(١١٦١) من حديث علي (رضي الله عنه): **(كان النبي ﷺ إذا زالت الشمس من مطلعها قيدَ رِمحٍ أو رمحين، كقدر صلاة العصر من مغربها صلّى ركعتين، ثم أمهل حتى إذا ارتفع االضُحى، صلَّى اربعَ ركعات)** لفظ النسائي، وقال الترمذى حسن اه. قال الزبيدي ٣٧٠/٣: وفى المصنف لأبى بكر ابن أبى شيبة نحوه.

(٣) بنوارە (بداية النهاية) ی ئیمامی غەزالی ل:١٠٧، کە لەمەودوا بە درێژتر باسی دەکات.

## هەشتەم: زیندووکردنەوەی میانی خۆرئاواو خەوتنان:

بەینی نوێژی مەغریب و عیشا، کە بە نوێژ زیندووبکرێتەوە سوننەتێکی دووپات لەسەر کراوی (حەزرەتی) پێغەمبەرە ﷺ، ئەوەش کە پێمان گەیشتووە، لە ژمارەی ئەو ڕکاتانەی لەو کاتەدا دەیکردن شەش ڕکات بووە.[١]

ئەم نوێژانە گەورەییەکی زۆر بەرچاویان هەیە، وەك وتوویانە مەبەست لە فەرموودەی خودا: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾(سجدة١١)

واتە: لەسەر جێگاکانیان هەڵدەستن و ئیسراحەت لە خۆیان تێك دەدەن بۆ ئەو نوێژانە[٢]،

وە بەڕاستی دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن صَلَّى ما بينَ المَغربِ والعِشاءِ فإنَّها مِن صَلاةِ الأوابين))**[٣]

ئەوەی میانی مەغریب و خەوتنان بە نوێژ زیندوو بکاتەوە بەوانە دەژمێررێت، کە زۆر گەڕاوەن بۆ حزوری خودا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن عكفَ نفسهُ ما بينَ المَغربِ والعِشاءِ في مَسجِدِ جماعَةٍ، لَم يَتكَلَّم إلاَّ بصَلاة، أَو قُرآنٍ، كانَ حقّاً علَى اللهِ أنْ يَبنيَ لَهُ قَصرَينِ في الجَنَّة**[٤]،

---

(١) رواه الترمذي (٤٣٥) وابن ماجه (١١٦٧)مرفوعا: **(من صلى بعد المغرب ست ركعات لم يتكلم فيما بينهن بسوء، عدَلنَ لهُ بعبادة ثنتي عشرة سنة)**.

(٢) رواه أبو داود(١٣٢١)، والترمذي(٣١٩٦).

(٣)قال العراقي رواه ابن المبارك في الزهد و الرقائق(١٢٥٩) من رواية ابن المنكدر مرسلةً، قال الزبيدي ٣٧٢/٣: وكذا رواه محمد بن نصر المروزى في قيام الليل عَنه مرسلاً. وفي القوت أبو صخر سمع من محمد بن المنكدر يحدث عن النبى ﷺ قال: من صلَّى.. ثم ساقه اه

(٤)کۆشکێکیان چونکە ئامادەی نوێژی ئێوارە بووە بە جەماعەت، ئەویشیان لەبەر ئەوەی کە ماوەتەوە تا نووێژی خەوتان بۆ بەندایەتی،

مَسيرَةُ كلِّ قَصرٍ مِنهما مائةَ عَام. ويَغرِسُ لهُ بينَهُماغراَسَةً. لوْ طافَهُ أَهلُ الدُّنيا لوَسِعَهُم))[1].

ئەوەی خۆی بهێڵێتەوە و ئیعتیکاف بکات لە میانی نوێژی ئێوارەو خەوتناندا، لەمزگەوتێکدا کە جەماعەتی تێدا بکرێت، جگە لە نوێژ و قورئان هیچ قسەیەکی دونیایی تێدا نەکات، ئەوە خودا لە ڕوی فەزڵ و لوتفی خۆیەوە پێویستی کردووە لەسەر خۆی، کە دوو کۆشکی لە بەهەشتدا بۆ درووست بکات، نێوانی هەریەکێ لەو کۆشکانە ڕێگای صەد ساڵ بێت، وە لە میانی ئەو دوو بەهەشتەدا ئەوەندە درەخت و میوەهاتیان بۆ دەچێنێت، ئەگەر هەموو ئەهلی دونیا بەدەوری دا بگەڕێن بەشی هەمویان دەکات. وە پاشماوەی بە درێژی باسکردنی خێرو گەورەیی ئەو نوێژانە، لە پەڕاوی (الأوراد) داباسی دەکەین پشت بە خودا.وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی اله وصحبه وسلم.

## بەشی دووهەم:

ئەو نوێژانەی هەمو حەفتەیەك جارێك دووبارە دەبنەوە، ئەوەش نوێژەکانی شەوان و ڕۆژانی حەفتەیە. بۆ هەموو شەوو بۆ هەموو ڕۆژێك.

**باسی ڕۆژەکان با لە یەك شەممەوە دەست پێ بکەین**[2]:

### یەك شەممە:

ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە کە

---

(١) رواه ابن شاهين في الترغيب في فضائل الأعمال(٧٥).

(٢) یەکەم ڕۆژی حەفتە لە یەکەوە دەست پێ دەکات، واتە یەك شەممە!الإتحاف٣/٣٧٣.

فەرموویەتی:

**((مَن صلَّى يومَ الأَحد أربعَ ركَعاتٍ يَقْرأ في كُلِّ رَكعَةٍ فاتِحَة الكِتاب وآمَن الرَّسولُ مَرَّة، كتبَ اللهُ لهُ بِعَدَد كلِّ نَصرانيٍ ونَصرانيَّة حَسَنات، وأَعطاهُ اللهُ ثوابَ نبيٍّ، وكتَب لهُ حجَّةَ وعَمرةً، وكتَبَ لهُ بكلِّ رَكعَةٍ ألفَ صَلاةٍ وأَعطاهُ اللهُ في الجنَّة بكلِّ حَرفٍ مَدينَةً مِن مِسكٍ أَذْفَرَ))**[1]،

ئەوەی ڕۆژی یەکشەممە چوار ڕکات نوێژ بکات، لە هەموو ڕکاتێدا سورەی فاتیحەی تێدا بخوێنێت و ، **آمَنَ الرَّسُولُ** یش لە هەموو ڕکاتەکاندا بخوێنێت تا کۆتاییەکەی . خودای گەورە بە ژمارەی هەموو پیاوو ژنێکی نەصرانی گاور چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە پاداشتی پێغەمبەرێکی دەداتێ، وە خێری حەج و عەمرەیەکی بۆ دەنوسێت، وە بە هەموو ڕکاتێك خێری هەزار نوێژی بۆ

---

(١)قال صاحب القوت روى سعيد عن أبى هريرة عن النبى ﷺ فساق هكذا او المراد بسعيد هو المقبرى وقال العراقي رواه ابو موسى المدينى فى كتاب وظائف الليالى والايام من حديث ابى هريرة بسند ضعيف، قال الزبيدى: أورده ابن الجوزي في الموضوعات ، واورده الحافظ السيوطي في الآلئ المصنوعة من طريق الجوزقاني أخبرنا محمد بن الحسن العلوي بالسند والمتن، إلا إنه قال فى شيخ ابن وهب أبو صخر حميد بن زياد، وزاد في المتن بعد عمره وألف غزوة، وأقرَّ على قوله أنه موضوع، وفيه مجاهيل، قلت: الحكم على هذا الحديث بالوضع ليس بسديد، وغاية ما يقال أنه ضعيف، وأبو صخر حميد بن زياد روى له الجماعة إلا البخاري والنسائي وهو حميد بن زياد أبي المخارق المدني ويعرف بالخرائط سكن مصر ويقال فيه أيضا حميد بن صخر سئلَ عنه أحمد فقال: ليس به بأسٌ، واختلف فيه قول ابن معين فقال مرة هو ثقةٌ لا بأس به، وقال مرة أبو صخر حميد بن زياد ضعيف، وقال النسائي حميد بن صخر ضعيف فالقول ما قاله الحافظ العراقي إن سنده ضعيف، لا قول ابن الجوزى إنهُ موضوعٌ ، وشتان بينَ الموضوع والضعيف فافهم. الإتحاف ٣٧٣/٣.

دەنوسێت، وە بە هەموو پیتێك خودای گەورە شارێکی لە بەهەشتدا لە میسکی بۆندار بۆ درووست دەکات.

وە دەگێڕنەوە لە (حەزرەتی) عەلی کوڕی ئەبی طالیبەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**(وَحِّدُوا اللهَ بكثرةِ الصَّلاة يومَ الأحدِ فإنَّه سُبحانَه واحِدٌ لا شَريكَ لهُ فمَن صلَّى يَومَ الأَحدِ بَعدَ صَلاةِ الظُّهرِ أربعَ رَكعاتٍ بعدَ الفَريضَةِ والسُّنةِ، يَقرأُ في الرَّكعَةِ الأولَى فاتِحَةَ الكتابِ وتَنزيلَ السَّجدَةِ وفي الثانِيَة فاتِحَة الكِتاب و﴿تَبارك الذي بيَدِه المُلكُ﴾، ثُمَّ يتشَهَّد ويُسَلِّمُ، فيُصَلِّيَ رَكعَتَينِ أُخرَيَيْنِ يَقرَأ فيهما بفاتِحَة الكِتابِ وسُورةِ الجُمُعةِ، ويَسْألُ حاجَتَه، كانَ حقّاً علَى اللهِ أنْ يَقضِيَ حَاجَتَه)**[1]،

واتە: بڕیاری یەکتایی خودا بدەن و ڕایبگەیێنن، بە نوێژکردنی زۆر لە ڕۆژی یەك شەممەدا، (نوێژیش پڕیەتی لە یەکتا پەرستی، وادیارە گرنگی دان بەبەندایەتی و یەکتاپەرستی لە ڕۆژێکدا کە گاورەکان هاوبەشیان بۆ خودا بڕیارداوە، کارێکی زۆر خێردارەو، بەرپەرچدانەوەی ئەوانیشە، ئەمەش یەکێکە لە حیکمەتەکانی ڕۆژی یەك شەممە سەرەتای حەفتەیەو، بەیەك دەست پێدەکات و، ئەو نوێژانەش بۆ تەوحیدی خودا دەکرێن، بۆیە ئەوەندە خێریان بۆ دەنوسرێت، بە تایبەتی لە ڕۆژێکدا گاورەکان هاوبەش بۆ خودا بڕیار دەدەن و باوەڕیان بە چەن خودایەك هەیە)

---

(١)هكذا أورده صاحب القوت ٢٧/١.. قال في أوله: وروينا عن علي كرم الله وجهه عن النبي ﷺ فساقَه.. وفيه: **(ثمَّ تشهدَ وسلَّم فقام فصلى ركعتين، وفيه: وسأل اللهَ حاجتَهُ، وزاد في أخره ويُبرئهُ مِما كانت النصارى عليه)**، وقال العراقي: هذا الحديث أيضا ذكره أبو موسى المديني بغير إسناد اه ولم يورده إبن الجوزى ولا السيوطي. الإتحاف٣/٣٧٣.

كەواتە ئەوەی لە ڕۆژی یەك شەممەدا دوای نیوەڕۆ چوار ڕكات نوێژ بكات، دوای نوێژە فەرزو سوننەتەكان، لە ڕكاتی یەكەمدا دوای فاتیەی قورئان سوورەتی (**تَبارَكَ الَّذي**) و (**أَلَمْ**) ی تەنزیلی سەجدە بخوێنێت، وە لە ڕكاتی دووهەمدا، فاتیحەو سورەتی تەبارەكی مولك بخوێنێت، لە پاشان تەحیات بخوێنێت و سەلام بداتەوە، لە پاشان هەڵسێتەوەو دوڕكاتی تر بخوێنێت، لەهەردوكیاندا فاتیحەو سورەتی جومعە بخوێنێت، وە چ كارێكی هەیە داوا لە خودا بكات ، ئەوە خودا پێویستی كردووەو كردوویەتی بەماف لەسەر خۆی كە كارەكەی بۆ جێ بەجێ بكات.

## ڕۆژی دووشەممە:

(حەزرەتی) جابیر لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:

((**مَنْ صَلَّى يَومَ الإثنَينِ عندَ ارتفاعِ النَّهارِ رَكعتَين: يقرأُ في كُلِّ رَكْعَةٍ فاتِحَةَ الكِتابِ مَرَّةً وآيةَ الكُرسِيِّ مَرَّةً، وقُلْ هُوَ اللهُ أحَدْ والمُعَوِّذَتَين مَرةً، فاذا سلَّم إستغفَرَ اللهَ عَشْرَ مَرَّاتٍ، وصلَّى عَلَى النَبِيِّ ﷺ عشرَ مَرَّاتٍ، غفَرَ اللهُ لهُ ذنُوبَهُ كُلَها**)) [(١)]، واتە: ئەوەی لەڕۆژی دووشەممەدا لەكاتی بەرزبوونەوەی ڕۆژدا دووڕكات نوێژ بكات، لە هەموو ڕكاتێكدا سورەی فاتیحەو ئایەتەلكورسی و (**قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ**) و هەردوو (**قُلْ أعُوذُ**)ووەكان یەك یەك بیانخوێنێت، وە كەسەلامی دایەوە دە جار داوای لێ خۆشبوون لە خودا بكات، خودا لە هەموو تاوانەكانی بە گشتی خۆش دەبێت.

---

(١)قال صاحب القوت(١/٢٧) رواه أبو الزبير عن جابر وساق الحديث كما هنا وقال العراق رواه أبو موسى المديني من حديث جابر عن عمر مرفوعا وهو حديث منكر . وانظر الإتحاف ٣٧٤/٣ إذ رأى ضعفه.

**((مَنْ صَلَّى يومَ الإثنَين اثنَتَي عَشَرةَ ركعَة، وَ يقرأُ في كُلِّ ركعَةٍ فاتِحَةَ الكِتاب وآيةَ الكُرسيِّ مَرَّةً، فإذا فَرَغ قرأَ، قُل هُوَ اللهُ أحَد اثنَتَي عشَرَة مرَّةً، واستغفَرَ اللهَ اثنَتَي عشَرَة مَرَّة، يُنادَى بهِ يومَ القِيامَةِ، أينَ فُلانُ ابنُ فلانٍ لِيَقُم فليَأخُذ ثَوابَهُ مِنَ اللهِ ، فأَوَّلُ ما يُعطَى مِنَ الثَّوابِ ألفُ حُلَّةٍ، ويُتَوَّجُ، ويُقالُ لهُ أدخُلِ الجَنَّةَ، فيَستَقبِلُه مِائَةُ ألْفِ مَلَكٍ، مَع كُلِّ مَلَكٍ هَديَّةٌ يُشيِّعُونَه، حَتَّى يَدورَ علَى ألفِ قَصْرٍ مِنْ نورٍ يَتَلألأُ))**[1].واته:

ئەوەی ڕۆژی دووشەممە دوانزە ڕكات نوێژ بكات، لەهەموو ڕكاتێدا فاتیحە بخوێنێت و، یەك جار **آيةَ الكُرسِيِّ** بخوێنێت و، كە لە نوێژەكەی لێ بوویەوە دوانزە جار (**قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ**)بخوێنێت، وە دوانزە جار داوای لێ خۆش بوون لە خودا بكات، لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەكرێت، ئەوە فڵانی كوڕی فڵان لە كوێیە؟ با هەڵسێت و پاداشتی خۆی لە خودای (عَزَّ وجَلَّ) وەربگرێتەوە، یەكەم

---

(١)هكذا أورده صاحب القوت، وقال ثابت البناني عن أنس قال قال رسول الله ﷺ فساقه وقال العراقي: رواه أبو موسى المديني بغير اسناد وهو منكر ،وقال الزبيدي:٣٧٥/٣: ورأيت طرة بخط الامام شمس الدين الحريري ابن خال القطب الخيضري على هامش نسخة الاحياء ما نصه: قد صنف الشيخ أبو الحسن علي بن يوسف الهكاري المعروف بشيخ الاسلام، كتاباً أسماه بفضائل الاعمال، وأوراد العمال، ذكر فيه عجائب وغرائب من هذه الاحاديث ومن غيرها مرتبة الليالي والايام، بأسانيد مظلمة إذا نظر العارف فيها قضى العجب، وساقها بأسانيد له وقد ذكره الذهبي في ميزانه، وذكر ابن عساكر أنه لم يكن موثوقا به، وذكره ابن السمعاني في الأنساب وذكر شيوخه ووفاته بعد الثمانين وأربعمائة فلعل الغزالي نقل عنه اهـ. قلت هذا الرَجل قد ذكره الذهبي ايضا في العبر فقال: شيخ الاسلام الهكاري أبو الحسن على بن أحمد بن يوسف الأموى من ذرية عتبه بن سفيان بن حرب، وكان صالحا زاهدا ربانيا ذا وقار وهيبة واتباع ومريدين، دخل في الحديث وسمع من أبي عبدالله بن نطيف الفراء، وأبى القاسم بن بشران، وطائفة، قال ابن ناصر توفي في اول سنة ٤٨٦ وقال ابن عساكر لم يكن موثقا في روايتة قال الذهبى مولده ٤٠٩ اه

شت له پاداشت كه پێی دەدرێت؛ هەزار كراس و بەرگی تايبەتی، له پاشان تاج دەخەنە سەری، وە پێی دەڵێن: برۆ ناو بەهەشتەوە، صەد هەزار مەلائيكه پێشوازی لێ دەكەن و، هەر فريشتەيەك بە دياريیەكی تايبەتييەوە بە ڕێی دەخەن، تا دەيگێڕن بەسەر هەزار كۆشكدا كه له نوری پرشنگدار دروستكراون.

## ڕۆژی سێ شەممە:

يەزيدی ڕەققاشی دەيگێڕێتەوە له (حەزرەتی) ئەنەسی كوڕی ماليكەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی :

((**مَن صلَّى يومَ الثُّلاثاء عَشرَ ركعاتٍ عِندَ انتِصافِ النَّهارِ** (وفي حديث آخر )**عندَ إرتفاعِ النَّهار ،يَقرأ في كُلِّ رَكعَةٍ فاتِحةَ الكِتابِ وآيةَ الكُرسِيِّ مرَّةً، وقُل هُوَ اللهُ أحَد ثلاثَ مَرَّاتٍ، لَم تُكتَب عَليهِ خَطيئةً إلى سَبعينَ يوماً، فان ماتَ إلَى سَبعينَ يوماً، ماتَ شَهيداً، وغُفرَ لهُ ذنوبُ سبعينَ سَنةً**))[1].

ئەوەی ڕۆژی سێشەممە له كاتی نيوەی ڕۆژدا دە ڕكات نوێژ بكات، وە له ڕيوايەتێكی تردا :له كاتی بەرزبوونەوەی ڕۆژدا، له هەموو ڕكاتێدا فاتيحه و (**آيةَ الكُرسِيِّ**) و، سێ جار (**قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ**) بخوێنێت، تا حەفتا ڕۆژ گوناهی لەسەر نانوسرێت، ئەگەر تا ئەو حەفتا ڕۆژە مرد ئەوا بە شەهيدی دەمرێت، وە گوناهی حەفتا ساڵی لێ خۆش دەبن.

## ڕۆژی چوار شەممە:

ئەبو ئيدريسی خەوەلانی دەيگێڕێتەوە له (حەزرەتی) معازی كوڕی جەبەلەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی :

---

(١)هكذا أورده صاحب القوت، والعراقي رواه أبو موسى المديني بسند ضعيفٍ ولم يقل عند انتصاف النهار ولا عند ارتفاعه اه الإتحاف ٢٧٥/٣.

**((مَن صلَّى يومَ الأربعاء اثنَتي عشرَةَ ركْعةً عِندَ ارتفاع النَّهار، يَقرأ في كلِّ ركعَةٍ فاتحةَ الكِتاب وآيةَ الكُرسيِّ مَرَّة، قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ ثلاثَ مرَّاتٍ ، والمُعَوِّذَتينِ ثلاثَ مرَّاتٍ، نادَى به مَلكٌ عِندَ العَرشِ يا عبْدَالله، استأنِفِ العَمَلَ، فقَد غفَرَ اللهُ لكَ ما تقدَّمَ مِن ذَنبكَ، ورَفَع عَنكَ عَذابَ القَبْر وَضيقَهُ وظُلمتَه، و رَفعَ عنكَ شَدائِدَ القِيامَةِ، ورُفِعَ لهُ مِن يَومهِ عَمَلُ نَبي))**[1].

(ئەوەی ڕۆژی چوار شەممە لەکاتی بەرزبوونەوەی ڕۆژدا دوانزە ڕکات نوێژ بکات، لە هەموو ڕکاتێدا سوورەی فاتیحەو وآيةَ الكُرسِيِّ جارێك و، قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ سێ جار بخوێنێت، وە (قُلْ أعُوذُ) ووە کانیش سێ جار بيانخوێنێت، لە پاڵ عەرشدا مەلائیکەیەك بانگی دەکات، ئەی بەندەی خودا! سەر لەنوێ دەست بە ژیانت بکەرەوە، خودا لە گوناهەکانی پێشووت هەمووی خۆش بوو، وە سزای قەبر و تەنگی و تاریکی گۆڕی لەسەر لادایت ، وە ناڕەحەتیەکانی دوارۆژی لەسەر هەڵگرتیت، بە ئەندازەی کردەوەی پێغەمبەرێك چاکەی بۆ بەرز کرایەوە.

## ڕۆژی پێنج شوممە:

دەگێڕنەوە لە عیکریمەوە کە عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

**(( مَن صلَّى يومَ الخَميس ما بينَ الظُّهر والعَصرِ ركعَتَيْن، يَقرأُ في الأولى فاتحَة الكِتاب مَرَّة، وآيةَ الكُرسيِّ مِائَةَ مرَّة، وفي الثانيةِ فاتِحةَ الكِتابِ وقُلْ**

---

(١)أورده صاحب القوت من غير ذكر المعوذتين وقال العراق رواه أبو موسى المديني وقال: رواته ثقات والحديث مركب قال العراق قلت: بل فيه ابن حميد غير مسمى، وهو محمد بن حميد الرازى أحد الكذابين اهـ.

**هُوَ اللهُ أحَد ثلاثَ مرَّاتٍ، وقُلْ هُوَاللهُ أحَدْ مائةَ مَرَّةً، ويُصَلِّي علَى مُحمَّدٍ مائة مَرَّة، أعْطاهُ الله تَعالَى ثوابَ مَن صَامَ رجَبَ وشَعبانَ و رَمضانُ، وكان له من الثوابِ مثلُ حاجِّ البَيتِ، وكُتِبَ لهُ بعَدَد كلِّ مَن آمَن باللهِ سُبحانَهُ وتَوَكَّلَ علَيهِ حَسَنَةً))** [١]،

(واته: ئەوەی ڕۆژی پێنج شەممە لە میانی نیوەڕۆ و عەسر دا دوڕكات نوێژ بخوێنێت و، لە ڕكاتی یەكەمدا سوورەی فاتیحەو وآيةَ الكُرسِيِّ صەد جارو، لە ڕكاتی دووهەمدا فاتیحە جارێك و قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ صەد جار بخوێنێت، وە صڵاوات لە دیداری (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ بدات صەد جار، خودای گەورە پاداشتی ئەوەی دەداتەوە وەك ئەوەی كە مانگەكانی ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزان بە ڕۆژوو بوبێت، وەك پاداشتی ئەو كەسەش وەردەگرێت كە حەججی ماڵی خودای كردبێت، وە بە ژمارەی هەموو ئەوانەی بڕوایان هێناوە و چاكەیان كردووە چاكەی بۆ دەنوسرێت.

## ڕۆژی جومعە:

دەگێڕنەوە لە (حەزرەتی) عەلی كوڕی ئەبو طالیبەوە (خودای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ فەرموویەتی:

**((يومُ الجُمعَةِ صلاةٌ كُلُّه، ما مِنْ عبدٍ مُؤمنٍ قامَ إذا استَقلَّتِ الشَّمْسُ قَدْرَ رِمحٍ أوْ أكثَرَ مِنْ ذلِكَ، فتوَضَّأ فأسبَغَ الوُضوُءَ، فصَلَّى سَبْحَةَ الضُّحَى رَكعتَينِ إيماناً واحْتِساباً، كتَبَ اللهُ لَهُ مِئَتَي حَسَنة، ومَحَا عَنهُ مِئَتَيْ سَيئَة، ومَن صلَّى أربَع ركعَاتٍ، رفعَ اللهُ لهُ في الجَنَّةِ أربعَمِائَةِ دَرجَةٍ، وَمَن صلَّى ثَمانيَ رَكَعاتٍ، رفَعَ اللهُ لهُ في الجنَّةِ ثَمانَمائَةِ دَرجَةٍ، وغَفَرلهُ ذنوبَه كُلَّها، ومَن صلَّى**

---

(١)كذا أورده صاحب القوت وقال العراقي رواه أبو موسى المديني بسند ضعيف اهـ

**اثنَتَي عشَرةَ ركعةً، كتبَ اللهُ لهُ ألفاً ومِائَتي حَسنَةٍ، ومَحا عنهُ ألفَاً ومائتي سيئَةٍ، ورَفع لهُ في الجنَّةِ ألفاً ومائِتَي درَجَةٍ)** [1]،

(واته: ڕۆژی جومعه هەمووی نوێژه، هیچ بەندەیەکی بڕوادار نییه که خۆر به قەدەر ڕمێك بەرزبوبێتەوه یان زیاتر و، ئەویش هەستابێت و دەستنوێژێکی به تێرو تەسەلی گرتبێت و، سوننەتی ضوحای ئەنجام دابێت و، دووڕکات به بڕوای تەواو به خودا و به تەمای پاداشت و، بێ مەرامی سومعەو ڕیاکاری ئەم کارەی ئەنجام دابێت، ئەوه خودا دووصەد چاکەی بۆ دەنوسێت و، دووصەد خراپەی لەسەر ڕەشدەکاتەوه، وه ئەوەی چوار ڕکات نوێژ بکات، خودای گەوره له بەهەشتدا چوارصەد پله بەرزی دەکاتەوه، وه ئەوەی هەشت ڕکات نوێژ بکات، خودای گەوره له بەهەشتدا هەشت صەد پله بەرزی دەکاتەوه، وه له هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێت، وه ئەوەی دوانزه ڕکات نوێژ بکات، خودای گەوره هەزار و دووصەد چاکەی بۆ دەنوسێت، وه هەزارو دووصەد خراپەی لەسەر دەکوژێنێتەوه، وه له بەهەشتیشدا هەزار ودووصەد پله بەرزی دەکاتەوه).

هەروەها نافیع له عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوه (خوایان لێ ڕازی بێت)که پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :

---

(١)أورده في القوت وقال روينا عن علي بن الحسن بن علي بن أبي طالب عن أبيه عن جده رضي الله عنه و عنهم قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: **يوم الجمعة صلاة كله.** فساقَ الحديث، وقال العراقي: لم أجد له أصلا وهو باطل اهـ ، ووجدت في طرة الكتاب ما نص، هو فى قربان المتقين لابى نعيم بمعناه واسناده متروك اهـ الإتحاف ٣٧٦/٣، أما القطعة الأولى منه: **يوم الجمعة صلاة كله.** فقد راواها عبد الرزاق في المصنف،٢٠٤/٣، عن طاووس، وكذا ابن أبي شيبة في المصنف(٥٤٧١).

**((مَنْ دخَلَ الجامِعَ يومَ الجُمعةِ، فصلَّى أربَع ركعاتٍ قبلَ صَلاةِ الجُمعَةِ، قرأَ في كُلِّ رَكعَةٍ الحمَدْ، وقُل هُوَ اللهُ أحَد خَمسينَ مرَّة، لَم يَمُت حَتَّى يَرى مَقعَدَه مِنَ الجنَّة أوْ يُرَى لَهُ))**

(ئەوەی لەڕۆژی هەینی دا بچێتە مزگەوتەوە، پێش نوێژی جومعە چوار ڕکات نوێژ بکات، لە هەموو ڕکاتێکدا (الحمد) جارێك و **قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ** پەنجا جار بخوێنێت، نامرێت تا شوێنی خۆی لە بەهەشدا چاو پێ نەکەوێت، یان پیشانی یەکێکی تر نەدرێت.[(١)] ،

## ڕۆژی شەممە:

دەگوێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

**(( مَن صلَّى يومَ السَّبت أربعَ ركَعاتٍ، يقرأُ في كُلِّ ركعةٍ فاتِحَةَ الكِتابِ مَرَّةً، و قَل هَوَ اللهُ أحَدْ ثلاثَ مَرَّاتٍ، فإذا فَرغَ قَرأَ آيةَ الكُرسِيِّ، كتبَ اللهُ لهُ بِكُلِّ حَرفٍ حجَّةً وعَمْرةً، ورفَع لَهُ بكُلِّ حَرفٍ أجْرَ سنَةٍ، صِيامَ نَهارِها وقِيامَ ليْلِها، وأعطاهُ اللهُ عزَّوَجَل بكلِّ حَرفٍ ثوَابَ شَهيدٍ، وكانَ تَحتَ ظلِّ عَرشِ اللهِ مَع النَّبيِّنَ والشُّهَداء))** [(٢)] ،

ئەوەی ڕۆژی شەممە چوار ڕکات نوێژ بکات، لە هەموو ڕکاتێکدا دوای فاتیحە **(قل يا أيها الكافرون)** سێ جار بخوێنێت، ئەگەر لە نوێژەکەی لێ بوویەوە **(آيةَ الكُرسِيِّ)** بخوێنێت، بە هەموو پیتێك خودا حەج و عەمرەیەکی بۆ دەنوسێت، وە بە هەموو پیتێك پاداشتی ساڵێکی بۆ بەرز دەکرێتەوە، کە بەڕۆژ

---

(١) أورده صاحب القوت هكذا وقال العراقي رواه الدارقطني في غرائب مالك وقال لا يصح وعبدالله بن وصيف مجهول ورواه فى الرواه عن مالك وقال غريب جدا لا أعلم له وجها غير ذلك اه وانظر للمزيد الإتحاف ٢٧٧/٣.

(٢)أورده صاحب القوت٢٨/١. فقال سعيد عن أبى هريرة قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم فساقه ولم يتعرض له العراقي في كتابه. وانظر الإتحاف ٣٧٧,٣٨٢/٣.

به ڕۆژو بوبێت و بەشەو شەو نوێژی کردبێت، وە بەهەمو پیتێك خودای گەورە پاداشتی شەهیدێکی پێ دەبەخشێت، وە لە ژێر سێبەری عەرشی خودادا دەبێت ، لە خزمەتی پێغەمبەران و شەهیدەکاندا.[1] ،

---

(١) بۆ ڕەوینەوەی هەندێك گومان، کە لەوانەیە کەسێکی سەرەتایی لەم ئادابانەدا بۆی دروست ببێت، پێویستە بڵێن: هێنانەوەی ئەم فەرمودانە کە هەندێکیان لە ڕوی سەنەدەوە لاوازن، بەڵام لە فەزائیلی ئەعمالدا درووستە کاریان پێ بکرێت، ئەم جۆرە پاداشتانە لای ئێمە زۆرن، بەڵام لای خودا، وە بەبەراورد لە مانەوەی موسوڵمان بە ملیارەها ملیار ساڵ لە بەهەشتدا، کە هێشتا بە ئەندازەی چرکەیەکیش نابێت بە بەراورد لەگەڵ مانەوەی هەتا هەتاییدا، باشە ئەگەر خودای بە ڕەحم بە هۆی ڕەزامەندی خۆیەوە، لەسەر کردەوەیەکی ئاسایی ئەوەندەت پاداشت نەداتەوە، ئەی لە بەرامبەری چیدا تۆ پاداشتی هەتاهەتایی وەردەگریت، هەرچی کردەوەی چاکەی ئێمە هەیە، کە هەموویشی بە لوتف و تەوفیقی خودا بووە و ، بەو ئەندامانەش کردومانن کە بە بێ موقابیل خودا پێی بەخشیون، کەواتە بەڕاستی هیچمان ناکەوێت، ئەگەر بەرامبەر کردەوەی ئێمە شتێکیشمان بە پێی فەزڵی خودا بۆ دیاری بکرێت، خۆ پەنجا ساڵی عیبادەتی ڕاستەقینەیش ناگاتە ئەوەی کە ملیارێك ساڵ لە بەهەشتدا بژینەوە، ئەی ملیۆنەها ملیار ملیار ساڵەکانی تر چی؟! خۆ ئەو ژمارەیەش بە نیسبەت ڕۆژی قیامەت و مانەوەی بەهەشتەوە، وەك قەترەیەك بە دەریا نییە، کەواتە خوێنەری بەڕێز: زاناکانی پێش ئێمە، ئەوەیان لەیەکداوەتەوە کە فەرموویانە: درووستە کار بەم فەرموودانە بکرێت، خۆ ئەم پاداشتەیش ناکاتە ئەوەی هەزار ساڵ بەهەشتی پێ دابین بکەیت، ئەی بۆ باقیەکی چی بکەین؟! واباشە بەرامبەر فراوانی ڕەحمەتی خودا گومان بۆ خۆت دروست نەکەیت، خۆ ئەو کەسەی هەرکردەوەیەك ئەنجام بدات و (إحتسابا) نەیکردبێت و، بڕوای لەسەر پاداشتەکەی دامەزراو نەبێت، هیچی بەرناکەوێت، لەلایەکی ترەوە؛ کێن ئەوانەی ئەمڕۆ بەم کردەوانە هەڵدەستن؟ ڕەنگە یان هەر نەبن، یان زۆر بە دەگمەن، کە دەبێت ئەو کەسە ئەو مەرجانەی هێنابێتەجێ

# کردەوەی شەوەکان:

## شەوی یەك شەممە

(حەزرەتی) ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی: **(مَنْ صلَّى لَيلةَ الأَحَد عِشرينَ رَكعةً، يَقرأ في كُلِّ رَكعَةٍ فاتِحَةِ الكِتابِ مرَّةً، وقُلْ هُوَ الله أَحَدْ خَمْسِينَ مَرَّةً، والمُعَوِّذَتَينِ مَرَّةً مَرَّةً، واستَغفَرَاللهَ مِائةَ مرَّةٍ، واستَغفَرَ لِنَفْسِهِ وَلِوالدَيهِ مِائةَ مَرَّة، وَصَلَّى عَلَى النَبيِّ صلَى اللهُ علَيهِ وسَلَّم مِئَةَ مَرَّةَ ، وَتَبرَّأَ مِنْ حَولِهِ وقُوَّتِهِ والتَجأ إلَى اللهِ، ثُمَّ قالَ: أشهَدُ أَنْ لا إلَهَ إلاَّ الله، وأشهَدُ أَنَّ أدَمَ صَفوَةُ اللهِ وَفِطرَتُهُ، وَإبراهيمَ خَليلُ اللهِ، ومُوسَى كَليمُ اللهِ، وَعِيسَى روحُ اللهِ، وَ مُحمَّداً (صلواتُ اللهِ وسَلامُهُ عَليْهم)حَبيبُ اللهِ، كانَ لهُ منَ الثَّوابِ بعَدَدِ مَنِ دَعَا للهِ ولَداً، ومَن**

---

کە ئیمامی غەزالی باسیان دەکات، واتە نوێژخوێنێکی حزوری بێت و، لە خودا غافڵ نەبێت، هەموو سوننەت و ڕاتیبەکانی تەواو بێت، لە پاشان ئەم کردارانە بکات، وەك لە دەقەکانەوە وەردەگیرێت. دەی کەسێك ئەوەندە موقەڕەبی بارەگای خودا بێت، هەر چەندێك کردەوەی کەمیش بکات، چونکە خودا خۆشی دەوێت، بە زۆر بۆی دەنوسێت، هەندێك کەسابەت هەیە یەك بە حەوتصەد دەیبڕێت، **(والله يضاعف لمن يشاء)**، ئەمەش بازرگانییەکە بە نیيەتی پاکەوە لە گەڵ خودای (عَزَّ وجَلَ) دا، **(تجارة لن تبور)** دوکانداری واهەیە لە بەیانیەوە تا ئێوارە چەند دینارێك قازانجی دەست ناکەوێت، کەسانی پسپۆڕ و بازرگانی مەزنیش هەیە، کە لە چرکە ساتێکدا مەلایین دینار چۆتە سەر حیسابەکەی، ئەگەر بۆ دونیا ئەمە دروست بێت، کە مانەوەی ئەو شەخصە تیایدا تەنها صەد ساڵییش ئەگەر بخایەنێت، ئەی بۆ دوارۆژی هەتا هەتایی، دەبێت بۆ دروست نەبێت لە پاداشتی وتنی: (لاإلە إلا الله) یەکدا، بە صیدق و ئیخلاص و بڕوای تەواوەوە . ئەوەندەی خێر پێ ببڕێت، ئەویش نەك لە بەرامبەر کردەوەی عەبد، بەڵکو بەرامبەر لوتف و فەزڵی خودا؟!

**لَم يَدعُ للهِ وَلَداً، وبَعَثَهُ اللهُ عَزَّ وجَلَّ يومَ القِيامَةِ معَ الآمِنِين، وكانَ حَقّاً على اللهِ أن يُدخِلَهُ الجنَّةَ مَعَ النبيِّينَ)**[1].

(واته: هەرکەسێك شەوی یەکشەممە بیست ڕکات نوێژ بکات، لە هەموو ڕکاتێك سوورەی (فاتیحە )یەکجار بخوێنێت، وە (**قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ**) پەنجا جار، وە (**قُلْ أعُوذُ**)ووە کان یەکجار بیانخوێنێت، وە صەد جار (**أستَغفِرُ اللهُ**)(داوای لێ خۆش بوون بکات)، وە داوای لێخۆش بوون بکات بۆ خۆی و بۆ باوك و دایکی صەد جار، وە صەد صەلاواتیش بدات لە دیاری (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ ، وە خۆی بەری بکات لە هەموو تواناو تاقەتێکی خۆی و، تەنها پشت و پەنای بە خودای مەزن بێت، وە بڵێت: شایەتی بە یەکتابوونی خودا دەدەم، وە شایەتی دەدەم کە (حەزرەتی) ئادەم هەڵبژێرراوی پاڵفتەکراوی خودایە و، (حەزرەتی) ئیبراهیم خەلیل و دۆستی خودایە و، (حەزرەتی) موسا کەلیموڵلایە و، (حەزرەتی) عیسا ڕوحوڵلایە، وە (حەزرەتی) موحەممەدیش خۆشەویستی خودایە، ئەوە بە ژمارەی ئەو کەسانەی منداڵ بۆ خودا بڕیار دەدەن و (پەنا دەگرم بە خودا)، وە بەقەدەر ژمارەی ئەوانەش کە منداڵی بۆ بڕیار نادەن، ئەوە خودای (عَزَّ وجَلَّ) لە دواڕۆژدا لەگەڵ ئەوانەدا حەشری

---

(١)أورده صاحب القوت هكذا فقال عن مختار بن فلفل عن أنس بن مالك مرفوعاً فساقه، وفيه: (**وصلى عليَّ مائة مرة وفيه بعدد من دعا بدل أدعى**) وقال العراقي: رواه أبو موسى المديني بغير إسناد، وهو منكر، وروى أيضا من حديث أنس في فضل الصلاة فيها (ست ركعات) و( أربع ركعات) وكلاهما ضعيف جدا اه قال يحيى: وسلمه بن وردان ليس بشئ وقال احمد بن حنبل هو منكر الحديث وقال ابن حبان لا يحتج به، قال ابو حاتم الرازي واحمد بن محمد بن عمر كان يضع الحديث كذباً اهـ قال الزبيدي٣٧٨/٣ سلمه بن وردان من رجال الترمذي وابن ماجه .

دەكات، كە ئەمینن و ترس و بیم نایانگرێتەوە و، خودایش پێویستی كردووە لە سەر خۆی كە لە گەڵ پێغەمبەرەكاندا بیانخاتە ناو بەهەشتەوە).

## شەوی دووشەممە

ئەعمەش گێڕاویەتیەوە لە (حەزرەتی) ئەنەسەوە كە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((مَن صلَّى ليلةَ الإثنَين أربعَ ركعاتٍ، قرأ في الرَّكعَة الأولى الحمْدُ لله مرَّةً، وقُلْ هُوَ الله أحدَ عشَر مَرات ، وفي الركعَةِ الثانيَة الحمْدُ للهِ مَرَّة وقلْ هُوَ اللهُ أحَدْ عِشرينَ مَرَّة، وفي الثالِثة الحَمدُ للهِ مرَّة وقُل هُوَ اللهُ أَحد ثلاثينَ مرَةً، وفي الرَّابعَةِ الحَمدُ للهِ مرَّةً وقُلْ هُوَ اللهُ أحَدْ أربَعينَ مَرَّةً، ثُمَّ سَلَّمَ، وقَرأَ قُل هُوَ اللهُ أحَدْ خَمساً وسَبعينَ مرَّةً، واستَغفَرَ الله لِنَفسِهِ ولِوالِدَيهِ خَمساً وسَبعينَ مَرَّةً، وصلَى علَى مُحَمَّد صلَى اللهُ عليهِ وسَلَّمَ خَمساً وسَبعينَ مَرَّة، ثُمَّ سَئَل اللهَ تَعَالى حاجَتَهُ، كانَ حقّاً علَى اللهِ تَعالَى أَن يُعْطِيَه سُؤْلَهُ مَا سَألَ))، وهيَ تسَمَّى صلاةَ الحاجَة)**[1]،

واتە: ئەوەی شەوی دوو شەممە چوار ڕكات نوێژ بكات، لە ڕكاتی یەكمدا **(الحمْدُ للهِ )**یەك جارو **(قلْ هُوَ اللهُ أحَدْ)**دەكەڕەت بیخوێنێت، وە لە ڕكاتی دووهەمدا **(الحمْدُ للهِ )**یەك جار و **(قلْ هُوَ اللهُ أحَدْ)**بیست كەڕەت بیخوێنێت، وە لە ڕكاتی سێیەمدا **(الحمْدُ للهِ )** و **(قلْ هُوَ اللهُ أحَدْ)** سی جار، وە لە ڕكاتی چوارەمدا **(الحمْدُ للهِ )** و **(قلْ هُوَ اللهُ أحَدْ)**چل جار، لە پاشان سەلام بداتەوەو حەفتاو پێنج جار **(قلْ هُوَ اللهُ أحَدْ)** بخوێنێت، وە داوای لێ خۆش بوون بۆ خۆی و دایك و باوكی حەفتاو پێنج جار بكات، وە صڵاوات لەسەر (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ حەفتاو پێنج جار لێ بدات، لە پاشان

---

(١)هكذا أورده صاحب القوت١/٥٦ وقال العراقي كذا رواه ابو موسى المديني عن الاعمش بغير اسناد واسند من رواية يزيد الرقاشي عن انس حديثا في صلاة ست ركعات فيها، وهو منكر.

داواکاریەکەی عەرزی خودا بکات، دەبێتە حەقێك لەسەر خودا، کە بەفەزڵی خۆی پێویستی کردووە، کە ئەوەی داوای کردووە بۆی جێ بەجێ بکات، ئەمەش ناو دەبرێت بە نوێژی پێویستی _حاجەت_.

## شەوی سێ شەممە

دوورکات نوێژ بکات و لە هەموو ڕکاتێکدا فاتیحە بخوێنێت و، وە (**قُلْ هُوَ الله أَحَدْ**) و (**قُلْ أعُوذُ**)ووە کان پازدە جار بیانخوێنێت، وە دوای سەلامدانەوە پانزە جار (**آيةَ الكُرسِيِّ**) بخوێنێت، وە داوای لێ خۆش بوون لە خودا بکات پانزە جار، ئەجر و پاداشتێکی گەورەو بەرجەستەی بۆ دەنوسرێت[1]،

هەروەها (حەزرەتی) عومەر لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەوەی شەوی سێشەممە دوورکات نوێژ بخوێنێت و لەهەر ڕکاتێکدا فاتیحەی قورئانی تێدا بخوێنێت، وە (**إنَّاأَنْزَلْنَاهُ**) وە (**قُلْ هُوَ الله أَحَدْ**)حەوت جار بیانخوێنێت، خودای گەورە گەردنی لە ئاگر ئازاد دەکات، وە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو نوێژە دەبێتە پێشڕەو و دەستگیری.

## شەوی چوار شەممە

(حەزرەتی) فاطیمە دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی:

**((مَنْ صَلَّى ليلَةَ الأربعاء ركْعتَين، يَقرأُ في أوَّلِ رَكعَةٍ فاتحةَ الكِتابِ مرَّةً، وقل أعوذُ بِرَبِّ الفَلقِ عَشْرَ مَرَّات، وفي الرَّكعَةِ الثانية فاتحةَ الكِتابِ مرَّةً، قُلْ أعُوذ بِربِّ النَاسِ عَشرَ مرَّاتٍ، ثُمَّ إذا سَلَّمَ إستَغْفَر اللهَ عَشرَ مَرَّاتٍ، ثمَّ**

---

(١) كذا في القوت١/٢٩، وقال الحافظ العراقي:هكذا رواه أبو موسى المديني حكاية عن بعض المصنفين، وأسند من حديث ابن مسعود وجابر حديثا في صلاة أربع ركعات فيها، وكلها منكرة، إتحاف ٣/٣٨٠.

**يُصلِّي عَلَى مُحمَّدٍ صَلَى اللهُ عَليهِ وسَلَّم عَشرَ مَراتٍ، نزَلَ مِن كُلِّ سَماءٍ سَبعُونَ أَلفَ مَلَك، يكتُبونَ ثَوابَهُ إلى يَومِ القِيامَة))**[1]،

(ئەوەی شەوی چوار شەممە دورکات نوێژبکات و، لە ڕکاتی یەکەمدا دوای سوورەی فاتیحە دە جار (**قل أعوذُ بِرَبِّ الفَلقِ**)بخوێنێت و، لە ڕکاتی دووهەمدا دوای فاتیحە دە جار (**قُلْ أعُوذ بِربِّ النَاسِ**) ی بخوێنێت، لە دوای سەلامدانەوە دە جار (أستغفرالله) بکات، وە دەجار (صلاوات لە دیارە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ لێ بدات، لە هەر یەکە لە ئاسمانەکانەوە حەفتا هەزار مەلائیکە دێنە خوارەوە، تا ڕۆژی قیامەت خەریکی نوسینی پاداشتەکەی دەبن).

وە لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە:

**((ستَّ عَشرَة ركعة، يقرأ بعد الفاتحة ما شاء الله، ويقرأ في آخر الرَّكعتَين آيةَ الكرسيِّ ثَلاثينَ مَرَّةً، وفي الأولَيينِ ثَلاثينَ مَرَّةً (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ) يشفَع في عَشرةٍ مِنْ أَهلِ بَيتهِ، كُلُّهُمْ وجَبَت عَليهِم النَّارُ)).**

واتە: شانزە ڕکات نوێژ بکات، لە دوای فاتیحە ئەوەندەی خودا بیەوێت قورئان بخوێنێت، وە لە دوایی دورکاتی ئەخیر دا سی جار (آيةَ الكرسيِّ) بخوێنێت و، لە یەکەمینیشیاندا سی جار (**قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدْ**) بخوێنێت، دەبێتە شفاعەتکار بۆ دە کەس لە خزم ئال و بەیتی خۆی کە هەموبان ئەهلی ئاگربن.

هەروەها (حەزرەتی) فاطیمە ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی **((مَن صلَّى ليلةَ الاربعاءِ ستَّ ركعاتٍ، يَقرأُ في كلِّ ركعَةٍ بعْدَ الفاتحةِ: قُلِ اللَّهمَّ مالِكَ المُلكِ إلى آخر الآية، فاذا فَرغَ مِن صَلاتهِ يَقول: سَبعينَ مرَّةً: جَزى اللهُ مُحمَّدا) صلى الله عليه وسلم (عَنَّا ما هُو أهلُهُ، غفَرَ اللهُ لهُ ذنوبَ سَبعينَ سَنةً وكُتِبَ لَهُ بَراءةً مِنَ النَّار))**[1]،

---

(١) كذا في القوت،٢٩/١،ولم يذكر لهذه الليلة حديثا غيره زانظر الإتحاف ٣٨٠/٣.

ئەوەی شەوی چوار شەممە شەش ڕکات نوێژ بکات، لە دوای خوێندنی فاتیحە ئایەتی: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (ال عمران/٢٦) بخوێنێت، کە لێ بویەوە لە نوێژەکەی حەفتا جار بڵێت: خودایە لەبری ئێمە ڕەحمەت و پاداشتی خۆت بڕژێنە بەسەر (حەزرەتی) موحەممەددا ﷺ ، ئەوەندەی کە ئەو شایستەیەتی، خوای گەورە لە گوناهی حەفتا ساڵی خۆش دەبێت، وە بەرائەتێکی ئازاد بوونیشی پێ دەدات لە ئاگری دۆزەخ.

## شەوی پێنج شەممە

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **((من صَلَّى ليلةَ الخميسِ ما بينَ المَغربِ والعِشاءِ رَكعتَينِ، يَقرأُ في كلِّ رَكعَةٍ فاتِحَةَ الكتابِ وآيةَ الكُرسيِّ خمسَ مَرَّاتٍ، و قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ خمسَ مَرَّاتٍ والمُعَوذَتَينِ خَمسَ مَرَّاتٍ، فإذا فَرِغَ مِنْ صَلاتهِ إستَغفَرَ اللهَ (عَزَّ وجَلَّ) خمسَ عشَرةَ مرَّةً، وجَعَلَ ثَوابَهُ لِوالِدَيهِ فقَدْ أدَّى حَقَّ والِدَيهِ عَليهِ، وإن كانَ فاعِلَها عاقّاً لهُمَا، وأعطاهُ اللهُ مَا يُعطي الصِّدِّيقينَ والشُّهَداء))** .

(واتە: هەرکەسێك شەوی پێنج شەممە لە نێوانی مەغریب و عیشادا دوڕکات نوێژ بکات و، لە هەر ڕکاتێکدا فاتیحە بخوێنێت و، پێنج جار (**آيةَ الكُرسيِّ**) بخوێنێت و پێنج کەڕەتیش (**قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ**) بخوێنێت وە (**قُلْ أعُوذُ**)ووەکانیش پێنج جار بیانخوێنێت، وە کە لە نوێژەکەی لێ بوویەوە داوای لێ خۆش بون لە خودا پانزە جار(أستغفرالله)بکات، وە پاداشتەکەی بنێرێت بۆ باوك و دایکی، ئەوە مافی ئەوانی داوەتەوە کە لەسەریەتی، با بێگوێ و خراپیش بووبێت

---

(١)وقال العراقي رواه أبو موسى المديني بسند ضعيف جدا انتهى إتحاف٣/٣٨١.

له گەڵیاندا، وە خودای گەورە لەو پاداشتەی پێ دەبەخشێت کە داویەتی بە صددیق و شەهیدەکان.(١)

## شەوی جومعە

**((من صَلَّى ليلةَ الجُمعَةِ ما بينَ المَغربِ والعِشاءِ اثنَتَي عَشَرَةَ رَكعةً يَقرأُ في كلِّ رَكعَةٍ فاتِحَة الكتابِ و قُلْ هُوَ اللهُ أحَدْ إحدى عشَرَ مرَّةً. فَكأنَّما عبَدَ اللهَ تعالىَ اثنتَي عشرَة سنَةً صِيامَ نَهارِها وَقِيامَ لَيلِها))**(٢).

(واتە: هەرکەسێك شەوی هەینی لە نێوانی مەغریب و عیشادا دوانزەڕکات نوێژ بکات و، لە هەر ڕکاتێکدا فاتیحە بخوێنێت و یانزە جار **(آيةَ الكُرسيِّ)** بخوێنێت، ویازدە کەڕەتیش **(قُلْ هُوَ اللهُ أحَدْ)** بخوێنێت، وەك ئەوەی بۆ دەژمێررێت کە دوانزەساڵ بەندایەتی خودای کردبێت و، بەڕۆژ بەڕۆژو بووبێت و بەشەو شەونوێژی کردبێت).

---

(١)هكذا هو في القوت٢٩/١ عن أبى صالح عن أبى هريرة وفيه فقد ادى حقهما وقال العراقي رواه أبو موسى المديني وأبو منصور والديلمي في مسند الفردوس بسند ضعيف جدا وهو منكر اهـ . الإتحاف ٣٨١/٣.

(٢)أورده صاحب القوت٢٩/١ وقال روينا عن كثير بن سليم عن أنس بن مالك قال قال رسول الله ﷺ فساقه مثله وقال الحافظ السيوطي في الجامع الكبير أخرجه أبو سعد الإدريسي في تاريخ سمرقند وابن النجار عن أنس اه وقال الحافظ العراقي في المغني والحافظ السيوطي في اللالئ المصنوعة ورواه المظفر بن الحسين اللارجانى في كتاب فضائل القرآن، وابراهيم بن المظفر في كتاب وصول القرآن للميت، إلا إن ابن المظفر قال في حديثه خمسين مرةً عن ابن عباس رفعه: **(من صلى ليلة الجمعة ركعتين يقرأ فى كل واحدة منهم بفاتحة الكتاب مرة و إذا زلزلت الارض خمس عشرة مرَّة هوَّن اللهُ عليه سكرات المَوت ويسَّر له الجوزاء على الصراط يوم القيامة)**، أورده السيوطي في اللالئ المصنوعة ثم قال: وأورده الحافظ ابن حجر في أماليه من هذا الطريق وقال غريب وسنده ضعيف وفيه من لا يُعرف والله أعلم.

وه (حەزرەتی) ئەنەس فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

**((مَنْ صلَّى ليلةَ الجُمعةِ صَلاةَ العِشاءِ الأخِرة في جَماعَةٍ وصَلَّى رَكعَتَي السُّنَّةِ، ثُمَّ صلَّى بعدَهَا عَشرَ ركَعاتٍ قرأَ في كُلِّ رَكْعَةٍ الحَمْدُلله و قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ والمُعَوذَتَينِ مَرَّةً مَرَّةً، ثُمَّ أوتَر بثلاثِ رَكعَاتٍ، ونامَ علَى جَنبهِ الأيمنِ و وجهُهُ إلى القِبلَةِ، فَكأنَّما أحيَا لَيلَة القَدْرِ))**[1]،

(ئەوەی لە شەوی جومعەدا نوێژی عیشای بە جەماعەت کرد، وە دووڕکاتی سوننەتی کرد، لەپاشان دەڕکات نوێژی کرد، لەهەر ڕکاتێکدا **(الحَمْدُلله)** و **(قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ)** و **(قُلْ أعُوذُ)**ووەکانیش یەکجار بخوێنێت، لە پاشان سێ ڕکات ویتری خوێند، وە لەسەر لای ڕاستی و ڕو بە قیبلە نوست، وەك ئەوە وایە شەوی قەدری زیندو کردبێتەوە).

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((أكثِرُوا مِنَ الصَّلاةِ عَلَيَّ في اللَّيلَةِ الغَرَّاء واليَومِ الأزهَرِ) ليلةَ الجُمُعَةِ ويومَ الجُمُعَةِ))**[2]، (زۆر صلاواتم لەسەر بدەن لە شەوە بەنرخ و پڕ بەهاکەدا و، لەڕۆژە ڕۆناك و پرشنگدارەکەدا، شەوی جومعە و ڕۆژی جومعە).

## شەوی شەممە

(حەزرەتی) ئەنەس(خوای لێ ڕازی بێت) دوفەرموێت:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

(١)أورده صاحب القوت٢٩/١ وقال روينا عن كثير بن سليم عن أنس بن مالك قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم فساقه مثله، و انظر الإتحاف ٣٨١/٣.

(٢)أورده صاحب القوت وقال العراقي رواه الطبراني في الاوسط من حديث أبي هريرة وفيه عبد المنعم بن بشير ضعفه ابن معين وابن حبان اه

((مَن صلَّى ليلةَ السَّبتِ بينَ المَغربِ والعِشاءِ اثنَتَي عشَرَة ركَعَةً، بُنِيَ لَه قَصرٌ فِي الجَنَّة، وكانما تصدَّقَ علَى كلِّ مُؤمنٍ ومُؤمنَةٍ، وتَبرَّأ مِنَ اليهودِ وكان حقّاً علَى اللهِ أَن يَغفِرَ لَه))[1]،

(ئەوەی شەوی شەممە لە میانی مەغریب و عیشادا دوانزە ڕکات نوێژ بکات، کۆشکێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکرێت، وەك ئەوەی کە بەسەر هەموو بڕوادارێکی نێر و مێدا خێر و صەدەقەی پێ کردبن و، خۆی لە جولەکە بەری کردبێت، خوایش پێویستی کردووە لەسەرخۆی کە لێی خۆش ببێت).

---

(١)أورد صاحب القوت٢٩/١ عن كثير ابن شنظير عن أنس بن مالك مثله وقال العراقي لم أجد له أصلا قلت: وأورده ابن الجوزي في الموضوعات من وجه أخر عن يزيد الرقاشى عن أنس فقال: أخبرنا أبو القاسم ابراهيم بسنده عن أنس بن مالك مرفوعا: **من صلى ليلة السبت أربع ركعات يقرأ في كل ركعة فاتحة الكتاب مرة واحدة وقل هو الله أحد خمسا وعشرين مرة حرم الله جسده على النار** ثم قال هذا حديث لا أصل له وغالب رواته مجهولون ويزيد الرقاشى ضعيف والهيثم متروك قال الحميدى وبشر بن السرى لا يحل أن يكتب عنه وأحمد بن عبد الله هو الجويبارى الكذاب الوضاع، وأقره السيوطي في اللالئ المصنوعة٤٢/٢، قلت لكن بشر بن السري أبو عمرو الأفوء نزيل مكة، قال الحافظ ابن حجر في فتح الباري٤/١٣، هو ثقه من رجال الصحيح وإنما تكلم فيه الحميدى لاجل المعتقد، وقد رجع عنه هو يعني بالمعتقد التجَهُم، وقال أحمد في العلل٥٧/٢(١٥٤٠) حدثنا بشر بن السرى وكان متقنا للحديث عجبا عن سفيان الثورى، وذكر عنه حديثا ثم ذكر حديث ناضرة فقال ماأدرى ما هذا ليش هذا، فوثب به الحميدي وأهل مكة واسمعوه كلاما شديدا فاعتذر بَعْد، فلم يُقبل منه، وزهَّد الناسُ فيه. قال ابن معين في تأريخه٧٩/١(١٩٥) ثقة، وقال أبو حاتم ثبت صالح وقال ابن عدي في الكامل١٧/٢، له غرائب من الحديث عن الثورى ومسعر وغيرها وهو حسنُ الحديث، ممن يُكتب حديثه وتقع في أحاديثه من النكرة، لانه يروى عن شيخ محتمل، فأما هو نفسهِ فلا بأس به روَى له الجماعة والله اعلم

# بەشی سێیەم

## ئەو نوێژانەی بە هاتنەوەی ساڵەکان دووبارە دەبنەوە

### کە چوار نوێژن: نوێژی جەژنەکان و تەراویح و ڕەجەب و نیوەی شەعبان

### یەکەمیان: نوێژی جەژنەکان:

جەژنی ڕەمەزان و قوربان، کە سوننەتێکی دووپاتکراوەن، دروشمێکن لە دروشمەکانی ئیسلام، کە پێویستە حەوت خاڵیان تێدا ڕەچاو بکرێت:

**یەکەم:** سێ جار یەك لەدوای یەك تەکبیر بکرێت و بڵێت:

**((أَللهُ أَكْبَرُ  أَللهُ أَكْبَرُ أَللهُ أَكْبَرُ كبيراً، والحَمدُلله كَثيراً، وسُبحانَ اللهِ بُكرَةً وأَصيلاً، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهْ، مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينْ ولَوْ كَرِهَ الكَافِرُونْ) لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، صَدَقَ وَعدَهُ، وَنَصَرَ عَبدَهُ، وهَزَمَ الأَحزابَ وَحْدَهُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ واللهُ أَكْبَرُ))**[1]،

وە لە شەوی جەژنی ڕەمەزاندا لە دوای خۆرنشینەوە دەست دەکەن بە أَللهُ أكبَر کردن، تا دەست دەکرێت بە نوێژی جەژن، وە لە جەژنی قورباندا دەست دەکرێت بە أَللهُ أكبَر ی جەژن لە بەرەبەیانی جەژنەوە تا دوا ڕۆژی سیازدەی

---

(١)إلى هنا الزيادة المذكورة متفق عليها عند الرافعي والنووي والمصنف ذكر التكبير الى الكافرون، ولم يميز بين التكبير وزيادته، واقتصر على بعض الزيادة وعلى القديم يقول بعد الثلاث: **الله اكبر كبيرا والحمد الله كثيرا الله اكبر ما هدانا، والحمدلله على ما أبلانا وأولانا**، قال صاحب الشامل فاذا ثبت هذا، فعلى ما اقتصر من ذلك جاز، والذى يقوله الناس لا باس به وهو أن يقول: **الله أكبر الله أكبر الله اكبر لا اله إلا الله والله أكبر ولله الحمد** قال النووي هذا الذى ذكر صاحب الشامل نقله صاحب البحر عن نص الشافعي رحمه الله تعالى في البويطي وقال: والعمل عليه واللهُ أعلم اهـ .

مانگی (ذی الحجة)، دوا ڕۆژەکانی (أيام التشريق)، ئەمەش تەواو ترینی ئەو ڕایانەیە لەم بارەوە هاتووە.

وە لەدوای نوێژە فەرزەکان و سوننەتەکانەوە أَللهُ أَكبَرُ بکات و لە دوای فەرزەکان زیاتر دووپاتی لەسەر کراوەتەوە.

**دووهەم:** کە بەیانی ڕۆژی جەژنی لێ داهات، خۆی دەشوات و خۆی دەڕازێنێتەوەو، جوانترین پۆشاکی لەبەر دەکات و، بۆنی خۆش لە خۆی دەدات، وەك بۆ جومعە باسمانکرد، بۆ پیاو عەبا و جبەو مێزەر وعەمامە باشترە بۆیان، وە منداڵانیش با خۆیان لە ئاوریشم بپارێزن، وە پیرەژنیش خۆی لە جوانکاری بپارێزێت لە کاتی چوونە دەرەوەدا،

**سێیەم:** با لەڕێگەیەکەوە بڕوات و لە ڕێگەیەکی ترەوە بگەڕێتەوە، بەم شێوەیە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ دەجوڵایەوە،[١]

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمانی دەدا کە ئافرەتە باڵغ و داپۆشراوەکانیش کە ناچنە دەرەوە ئامادەی نوێژی جەژن بن[٢]

**چوارەم:** باشترە کە بچنە دەرەوە بۆ سارایەکی پان و بەرین، مەگەر لە مەککە و (بيت المقدس) دا بن، وە ئەگەر ڕۆژێکی باراناوی بێت، ئەوا ئاساییە لە مزگەوتدا بمێننەوە، وە لە ڕۆژی هەور وهەڵادا ئیمام فەرمان بدات بە یەکێك نوێژبکات بۆ لاوازوخاوەن عوزرەکان، وە بەهێزەکانیش بباتە دەرەوە بە تەکبیر و أَللهُ أَكبَر کردنەوە.

**پێنجەم:** دەبێت چـاودێری کاتەکان بکات، وەختی نوێـژی جەژن لـە میـانی هەڵاتنی خۆرە، تا لادانی خۆرلە ئاسمان، وە کاتی سەربڕینی قوربانی لە

---

(١) رواه البخاري(٩٨٦).

(٢) رواه البخاري(٣٢٤)، ومسلم(٨٩٠).

بەرزبوونەوەی خۆرەوەیە و بە ئەندازەی دورکات و دوو وتار، تا کۆتایی سێیەمین ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان (أيام التشريق) .

وە باشتر وایە نوێژی قوربان خێرایی لێ بکرێت، لەبەر ئەوەی بچێت بەدەم سەربڕین و قوربانییەکەوە، وە باشتر وایە نوێژی جەژنی رەمەزان دوا بخرێت، بۆ ئەوەی زیاتر فریای دابەشکردنی سەرفیترە بکەوێت، ئەمە سوننەتی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ[1] .

**شەشەم:** باسی چۆنیەتی نوێژکردن: با خەڵکەکە بە دەم (أَللهُ أَكبَرْ) ەوە بچنە دەرەوە بە ڕێگەکاندا، وە کاتێك ئیمام دەگاتە جێگای نوێژەکە، دانەنیشێت و سوننەتیش نەکات، بەڵام خەڵکەکە بۆیان هەیە کە سوننەت بکەن، لە پاشان یەکێك بانگ بکات بۆ ئامادەبوون بۆ نوێژی جەژن بە وتنی: **(الصلاة جامعة)**، وە ئیمام دورکات پێشنوێژیان بۆ بکات، لە ڕکاتی یەکەمدا جگە لە **(أَللهُ أَكبَرْ)** ی دابەستنی نوێژ و تەکبیرەی ڕکوع، حەوت **(أَللهُ أَكبَرْ)** دەکات، لە میانی تەکبیرەکاندا (شەش جار) بڵێت : **سُبحانَ اللهِ والحَمدُللهِ ولاَ إلَهَ إلَّا اللهُ واللهُ أَكبَرُ**، وە یەکسەر دوای تەکبیرەی ئیحرام دەڵێت:

**(( وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ. إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ))** .

لەدوای هەشتەمین تەکبیرەوە أَعوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم دەخوێنێت و، دوای خوێندنی فاتیحە لە ڕکاتی یەکەمدا سوننەتە سوورەتی (ق) بخوێنێت، وە لە دووهەم ڕکاتدا سوورەتی (إقتربت) ، وە تەکبیرە زیادەکانی ڕکاتی دووهەم

---

(١) رواه الشافعي بسنده في الأ(٤٨٩/٢) أن النبي ﷺ كتب إلى عمرو بن حزم وهو بنجران: أن عجل الغدوَ إلى الأضحى، وأخر الفطر، وذكر الناس، رواه البيهقي في السنن الكبرى(٢٨٢/٣).

جگه له تهكبيرهى دابهستنى نوێژ و تهكبيرهى ڕكوع پێنج (أَللّه أَكْبَرُ) دهكرێت، وه لهميانى ههردوو(أَللّه أَكْبَر)ێكدا ئهو تهسبيحاتهى وتمان دهخوێنرێت، له پاشان ئيمام دوو وتار دهخوێنێتهوه، دانيشتنێكيان له ميياندا دهبێت، وه ههركهسێك نوێژى جهژنى فهوتا و فريا نهكهوت، با بيگێڕێتهوه و قهزاى بكاتهوه.

## حهوتهم:

قوربانى بكات به بهرانێك، وهك چۆن پێغهمبهرى خودا ﷺ بهرانێكى كردووه به قوربانى، وه بهدهستى خۆى سهرى بڕيوه، وه فهرمويهتى: (باسم الله أَللّه أَكْبَرُ ) ئهم قوربانييه له بريتى خۆم و ههموو ئهوانهى كه له ئوممهتهكهم قوربانيان نهكردووه.[1]،

وه پێغهمبهرى خودا ﷺ فهرموويهتى:

**مَن رأى هِلالَ ذي الحِجَّةَ وأرادَ أَنْ يُضَحِّيَ فَلاَ يَأْخُذَنَّ مِنْ شَعْرِهِ ولاَ مِنْ أَظفَارِهِ)** [2]،

---

(١) پێغهمبهر ﷺ فهرموويهتى: (بسم الله والله أكبر هذا عني وعمَّن لم يضح من أمتي) وفي بعض النسخ ضحى بكبش، وقال العراقي متفق عليه دون قول هذا عني، الخ من حديث انس وهذه الزيادة عن أبي داود(٢٨١٠) والترمذي(١٥٢١) من حديث جابر وقال الترمذي غريب منقطع اهـ قال الزبيدي٣/٤٠٥. والذى في المتفق عليه بزيادة أقرنين بعد أملحين. وأصله عند مسلم: عن عائشة (رضي الله عنها) أن رسول الله ﷺ أمر بكبش أقرن، يطأُ في سوادٍ، ويبركُ في سَوادٍ، وينظر في سواد، كناية عن سواد قوائمه وبطنه وعينه، فأُتِيَ بهِ لِيُضحيَ بهِ، فقال لها: يا عائشة: هلمي المدية، ثم قال: اشحذيها بحجر، ففعلت، ثم أخذها ، وأخذ الكبش فأضجعه ثم ذبحه، ثم قال: بسم الله اللهم تقبل من محمد وآل محمد ومن أمة محمد، ثم ضحَّى به.

(٢)قال العراقي رواه مسلم من حديث أم سلمه اهـ قال الزبيدي٣/٤٠٥، وفي لفظ لمسلم: إذا دخل العشر وأراد أحدكم أن يُضحى فلا يمس شعره وبشره شيأً.

واتە: ئەوەی مانگی (ذی الحجة)ەی بینی هاتە پێشەوە، ئەگەر بیەوێت قوربانی بکات، با مووی گیانی نەقرتێنێت و، نینۆکی خۆیشی نەکات تا قوربانییەکەی تەواو دەکات.

ئەبو ئەیوبی ئەنصاری: (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

لە چەرخی پێغەمبەر دا ﷺ پیاو قوربانی دەکرد بە کاوڕێك لە بریتی خاوخێزانەکەی، هەموویان لێیان دەخوارد و دەرخواردی خەڵکشیان دەداو دەیانبەخشییەوە[1]،

وە ئەوەی قوربانی دەکات، بۆی هەیە تا سێ ڕۆژو زیاتریش لێی بخوات، ئێستە ڕوخصەتی پێ دراوە کە پێشتر نەهی لێ کرابوو.[2]،

وە(حەزرەتی) سوفیانی سەوری فەرموویەتی:

دوانزە ڕکات نوێژ بخوێنێت، وە لە دوای نوێژی جەژنی قوربان شەش ڕکات بکات، وە فەرموویەتی : ئەوە بەشێکە لە سوننەت.[3]

---

(١) فەرمودەی دروست ئەوەیە کە قوربانی بە کاوڕێك بۆ تەنها یەك کەس دەکرێت، بەڵام دەتوانێت پاداشتەکەی بدات بە هەموو خێزانەکەی یان هەرکەسێکی تر تیایدا بەشدار بکات.والحدیث رواه: الترمذی(١٥٠٥)، وابن ماجه(٣١٤٧)، هەندێك لە زانایان ئەو دوو فەرموودەی باسمانکردن بۆ ئەوەیان گێڕاوەتەوە کە هەموویان ئەو شیعارە جێبەجێ بکەن با یەکێکیش بیکات و ئەوانیش لە خێرەکەی بەشدار بکات. ئەینا کاوڕێك تەنها بۆ یەك کەس دەکرێت بە قوربانی، بنوارە:الإتحاف٣/٤٠٦.

(٢)وقد اشار به الى ما رواه الترمذي عن بريدة رضي الله عنه رفعه: **(كنتُ نهيتكم عن لحوم الأضاحي فوق ثلاث، ليتسع ذو الطول على مَن لا طول له، فكلوا مابدا لكم وأطعموا وادَّخروا)**، وفي رواية مسلم:٩٧٧)مرفوعا: **(ونهيتكم عن لحوم الأضاحي فوق ثلاث، فأمسكوا ما بدا لكم).**

(٣)اخرج ابو بكر بن ابى شيبه في المصنف(٥٧٩٩) عن جماعة من السلف أنهم كانو يصلون بعد العيد أربعاً منهم ابن مسعود وعلي وبريدة رضي الله عنهم وسعيد بن جبير وابراهيم وعلقمة

## دووهەمیان: نوێژی تەراویح:

تەراویح بیست ڕکاتە، بە دەسەلامدانەوە، وە چۆنیەتیەکی هەموان دەیزانن، کە سوننەتێکی دووپاتکراوەیە، با بە ئەندازەی نوێژی جەژنەکانیش نەبێت، وە ڕای جیاواز هەیە، ئایا بە جەماعەت خێری زیاترە یان بە شێوەی تاك.

وە پێغەمبەر ﷺ دووشەو یان سێ شەو تەشریفی هێنایە ناو مزگەوتەوە بۆ ئەوەی بە جەماعەت بیکەن، لە پاشان دەرنەچوو بۆ ناویان و فەرمووی: ((**أخَافُ أَنْ تُوجَبَ عَلَيكُمْ**))[1].

(نەوەکو لەسەرتان واجب بکرێت، بۆیە نایەم بۆ ناوتان.

وە (حەزرەتی) عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) خەڵکەکەی کۆ کردەوە لە یەك جەماعەتدا، کاتێك ئەمین بوویەوە کە ئیتر وەحی پچڕاوەو واجب ناکرێت لەسەریان، بۆیە هەندێك فەرموویانە:

جەماعەت گەورەترە، چونکە (حەزرەتی) عومەر کردی بە جەماعەت، وە گۆبوونەوەیش بۆخۆی فەزڵ و بەرەکەتێکی زیادەی تێدایە. بە بەڵگەی نوێژە فەرزەکان، وە لەوانەیشە بە تەنهایی تەمبەڵی بیگرێت و نەیکات، وە بە بینینی

---

والأسود ومجاهد وعبد الرحمن ابن أبى ليلى والحسن وابن سيرين وقد تقدم شى من ذلك عنهم، وعندة(٥٨٠٦) عن عاصم قال: رأيت الحسن وابن سيرين يصليان بعد العيد ويُطيلان القيام، قال الحافظ إبن الحجر في فتح الباري(٤٧٦/٢): والحاصل أن صلاة العيد لم تثبت لها سنة قبلَها ولا بَعدَها، خلافاً لِمَن قاسها علَى الجمعَة، وأما مطلق النَّفل فلم يثبت فيه منعٌ بدليل خاص، إلا إذا كان في الوقت الكراهة، الذي في جميع الأيام. والله أعلم.

(١) رواه البخاري (٩٢٤) ومسلم (٧٦١) بلفظ: (**لكِنِّي خَشيتُ أن يُفرضَ عَليكُم**).

کۆمەڵێکی زۆر زیاتر چالاك دەبێت و شەوق لەسەری زیاد دەبێت.(١)

---

(١)وقد روى البيهقي باسناد صحيح أنهم كانو يقومون على عهد عُمر بعشرين ركعة، وعلى عهد عثمان وعلي بمثله، فصار إجماعا وقال ابن الهمام من أصحابنا: **(كونها عشرين ركعة سنة الخلفاء الراشدين والذى فعله النبي ﷺ بالجماعة إحدى عشرة بالوتر)** ،وما روى **(أنه ﷺ كان يصلي في رمضان عشرين ركعة سوى الوتر فضعيف)** اهـ والحكمة في تقديرها بعشرين ركعة عند أصحابنا، لتوافق الفرائض العملية والاعتقادية، فإنها مع الوتر عشرون ركعة، وتكون السنن شُرعت مكمِّلاتٍ للواجب، فتقَع المساواة بين المكمِّل والمُكمَّل كذا في مجمع الروايات، قال الزبيدي٤٤١٨/٣: لفظ المتفق عليه من حديث عائشة **(أن رسول الله ﷺ خرج ليلةً في جوف الليل، فصلى في المسجد وصلى رجال بصلاته، فاصبح الناس فتحدثوا، فاجتمع أكثر منهم فصلوا معه، فاصبح الناس فتحدثوا ، فكثر أهل المسجد من الليلة الثالثة فخرج رسول الله ﷺ فصلوا بصلاته، فلما كانت اليلة الرابعة عجز المسجد عن أهله، حتى خرج لصلاة الصبح، فلما قضَى الفجر، أقبل على الناس فتشهَّد ثم قال: أما بعدُ فإنه لم يخَف عليَّ مكانكم، ولكنّي خشيتُ أن تُفرض عليكم فتعْجزوا عنها، فتوفى رسول الله ﷺ والأمر على ذلك). وفي البخاري(٢٠١٠) عن عبدالرحمن بن عبدٍالقارئ قال: (خرجت مع عمربن الخطاب (رضي الله عنه) ليلة في رمضان إلى المسجد، فإذاً الناس أوزاعٌ متفرقون، يصلي الرَّجل لنفسه، ويصلي الرجل فيصلي بصلاته الرهط، فقال عمر: إني أرى لو جُمعت هؤلاء على قارئ واحد، لكانَ أمثل، ثم عَزمَ، فجمعهم على أبيِّ بن الكعب، ثم خرجت معه ليلة أخرى، والناس يصلون بصلاة قارئهم، قال عمر: نِعم البدعَة هذه، والتي ينامون عنها أفضل من التي يقومون، يريدُ آخِرَ الليل، وكان الناس يقومون آخر الليل).**

وه هه‌ندێك فه‌رموویانه: به ته‌نها بكرێت خێری زیاتره، چونكه ئه‌م سوننه‌ته وه‌ك نوێژی جه‌ژنه‌كان له شه‌عائیر و دروشمه‌كان نین، بۆیه بلكێنرێن به نوێژی چێشته‌نگا (چێشته نوێژه) و دیاری مزگه‌وته‌وه باشتره، وه له‌م دوو نوێژه‌دا جه‌ماعه‌تیان تێدا سوننه‌ت نییه.

وه هه‌روا باوه كه كۆمه‌ڵێك پێكه‌وه بچنه ناو مزگه‌وته‌وه، به‌ڵام نه‌بینراوه نوێژی دیاری مزگه‌ت به جه‌ماعه‌ت بكرێت، وه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی :

**((فَضْلُ صَلاةِ التَّطوُّع فِي بَيتهِ عَلى صَلاتهِ فِي المَسجِدِ كَفَضلِ صَلاةِ المكتُوبَة فِي المَسجدِ عَلى صَلاتهِ فِي البَيتِ))**[1]،

واته: گه‌وره‌یی و خێری نوێژی خۆبه‌خشی له ماڵه‌كانتان له نوێژكردنی له ناو مزگه‌وتدا، وه‌ك خێری نوێژه فه‌رزه‌كانه به‌سه‌ر نوێژی ماڵه‌وه‌دا.[2]،

---

(١)قال العراقي رواه آدم بن أبي اياس في كتاب الثواب من حديث ضمرة بن حبيب مرسلا ورواه ابن أبي شيبة في المصنف جعله عن ضمرة بن حبيب عن رجل من أصحاب النبي ﷺ موقوفا وفي سنن أبى داود باسناد صحيح من حديث زيد بن ثابت: (**صلاة المرء في بيته أفضلُ من صلاته في مسجدي هذا إلاّ المكتوبة** أهـ قال الزبيدي:٤١٩/٣: ولفظ أبى يعلي في مسنده: **صلُّوا أيها الناس في بيوتكم، فإن أفضل الصلاة صلاة المرء في بيته إلاّ المكتوبة** ). ورواه الطبراني في الكبير٤٦/٨): والبخاري(٧٣١) ومسلم(٧٨١)...

(٢)ومما يناسب لما أورده المصنف مارواه أبو بكر بن أبى شيبة (٧٧١٦)عن حفص بن غياث عن عاصم عن أبى عثمان قال: (**اشترى رجل حائطا في المدينة فربح فيه مائة نخلة كاملة، فقال النبي ﷺ ألا أخبركم بأفضل من هذا، رجلٌ توضأ فاحسنَ الوضوءَ وصلَّى ركعتَين في غار أو سَفح جبل أفضلُ ربحاً من هذا**). الإتحاف ٤١٩/٣.

**((صَلاةٌ في مَسجِدي هَذا أفْضلُ مِن مِائَةِ صَلاةٍ في غَيرِهِ مِنَ المَساجِدِ، وَصَلاةٌ في المَسجدِ الحَرامِ أفضَلُ مِنْ ألْفِ صَلاةٍ في مَسجِدي، وأَفْضَلُ مِنْ ذلِكَ كُلِّهِ رَجُلٌ يُصلِّي في زاوِيةِ بَيتِهِ رَكعتَينِ لا يَعْلَمُهما إلاَّ الله))**[١].

(نوێژێك له مزگەوتەکەی من( له مەدینه)خێری زیاتره له مزگەوتەکانی تر به صەدجار، وه نوێژێك له مزگەوتی حەرام (بیت الله)خێری له مزگەوتەکەی من زیاتره له هەزارنوێژی مزگەوتەکەی من، وه لەمانەیش هەمووی گەورەتر پیاوێکه له سووچێکی ماڵەکەی خۆیدا دوورکات نوێژ بکات، که کەس پێی نەزانێت جگه له خودا نەبێت)

چونکه ڕیاکاری و خۆدەرخستن له بەرچاوی خەڵك لەوانەیه که لەناو کۆمەڵدا زیاتر توش ببێت و تێوەبگلێت، بەڵام به تەنهایی پارێزراو دەبێت، ئەوەندەی له بارەوه وتراوه، وه هەڵبژاردەی ڕا ئەوەیه که جەماعەتەکه گەورەترەو خێری زیاتره، وەك چۆن (حەزرەتی)عومەر بینیویەتی و بڕیاری لەسەر داوه، چونکه هەندێك له سوننەتەکان جەماعەتیان بۆ دانراوه، ئەمەش بەسه بۆ ئەوەی که بکرێته شەعائیرێك وبه ئاشکارا ڕابگەیەنرێت،[٢].

---

(١)ذكره الحافظ المنذري في الترغيب والترهيب:١/٤٨٤) بنحوه، وقال: رواه أبو الشيخ ابن حيان في كتاب الثواب، وأما صدره فمتفق عليه. و قال العراقي أخرجه أبو الشيخ الأصبهاني في كتاب الثواب من حديث أنس صلاة في مسجدي تعدل بعشرة آلاف صلاة:

**(وصلاة في المسجد الحرام تعدل بمائة ألف صلاة، والصلوات بأرض الرِّباط تعدِل بألفَي صَلاةٍ وأكثَر مِن ذلِكَ كلِّهِ الرَّكعتانِ يُصلِّيهما العَبدُ في جوفِ الليل لا يريد بهما إلا ما عندِالله عزَّوجَل)**، وإسناده ضَعيف

(٢) ئیمامی نەوەی له (المجموع)دا دەفەرموێت: ٤/٤٠: ڕای دروست لای ئێمه : کردنی تەراویح به جەماعەت خێری زیاتره، وه جمهوری زانایانی ئیسلام ڕایان وایه، تەنانەت عەلی کوڕی موسای قومی ڕایگەیاندووه که ئیجماعی لەسەر درووست بووه، که

ئەوەش کە لابکاتەوە بەلای ئەوەدا کە لەوانەیە توشی ڕیاکاری و سومعە ویستی ببێت، ئەوە لادانە لە مەبەستی سەرەکی بۆ دروست بوونی جەماعەت، کە خودی خۆی دارای ئەو فەزیلەتەیە، وەك ئەوە وایە کە ئەو کەسە بڵێت:

خێری نوێژ کردن زیاترە لەوەی کە لەبەر تەمبەڵی نەیکەیت، وە بوونی ئیخلاص چاکتر و خێر ترە لەوەی بە ڕیاوە بیکەیت، کەواتە گریمان ئەو کەسەی کە بە تەنها نوێژەکە دەکات، ئەگەر متمانەی بە خۆی هەبێت بە تەنهایش توشی خەوە نوچکەو تەمبەڵی نابێت، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکیشدا بوو توشی ڕیایی نابێت، ئایا بۆ ئەو کەسەیش کامیان خێری زیاترە؟

کەواتەسەرنجەکە لەو بازنەدا دەسوڕێتەوە: لەمیانی بەرەکەتی جەماعەت کردن و زۆر بوونی زیادەی ئیخلاص و حزوری دڵ لە نوێژی تەنهاییدا، کەواتە لەم حاڵەتەیشدا درووستە و دەگونجێت لەوەدا کە یەکێکیان بەگەورەتر بزانیت بەسەر ئەوی تریاندا گومان و دوودڵییەکت بۆ درووست ببێت، وە ئەوەی کەباش و موستەحەبە قنووتی ناو نوێژی ویترە لە نیوەی دووهەمی مانگی ڕەمەزان.

---

جەماعەت خێری زیاترە لە نوێژی تاك، وە ڕەبیعەو مالیك و أبویوسف ڕایان وایە بە ئینفیراد بکرێت خێری زیاترە، بەڵام بەڵگەی ئێمە بوونی ئیجماعی صەحابەیە، بێ ئەوەی کە کەسێکیش ئینکاری کردبێت.

# باسی نوێژی ڕەجەب[1]،

دەگێڕنەوە بەسەنەدی خۆیانەوە لە پێغەمبەرﷺ کە فەرموویەتی:

هیچ کەسێك نییە کە یەکەم پێنج شەممەی مانگی ڕەجەب بەڕۆژو بێت و لە میانی نوێژی ئێوارەو شەوی جومعەدا دوانزە ڕکات نوێژ بکات لە میانی هەموو دو ڕکاتێکدا سەلامێك بداتەوە، وە لە هەموو ڕکاتێکدا فاتیحە بخوێنێت و سێ جار﴿إنَّا أنزلَناهُ فِي لَيلَةِ القَدْرِ﴾ بخوێنێت، وە دوانزە جار ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أحَدْ﴾ بخوێنێت، کە لە نوێژەکەی ڵێ بوویەوە حەفتا جار صڵاوات لە دیاری من بدات، وە بڵێت: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَبيِّ الأُميِّ وَعَلى آلِهِ)، لە پاشان سەجدە ببات و لە سوجدەکەیدا حەفتا جار بڵێت: ((سُبُّوحٌ قدُّوسٌ، ربُّ الملائِكةِ والرُّوحِ))، لە پاشان سەری بەرزکاتەوەو حەفتا جار بڵێت: ((رَبِّ اغْفِرْ وارْحَمْ وتَجاوَز عَمَّا تَعلَمْ، إنَّكَ أنتَ الأعَزُّ الأكرَمُ،)) لە پاشان سەجدەیەکی تر ببات و وەك ئەوەی لە سەجدەی یەکەم وتی ئاوا بیڵێتەوە، لە پاشان داواو خواستەکانی لە سەجدەکەدا بڵێت، ئەوا داواکاریەکانی جێ بەجێ دەبێت،

((ما مِن أحدٍ يصومُ أوَّلَ خَميسِ مِنْ رَجَب، ثُمَّ يُصَلِّي بينَ العِشاءِ وَالعَتَمَةِ اثْنتَي عشَرَة ركعَةً، يفصِلُ بينَ كُلِّ رَكعَتينِ بتَسلِيمَةٍ، يَقرأ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بفَاتِحَةِ الكِتابِ مَرَّة، وإنَّا أنزلَناهُ فِي لَيلَةِ القَدْرِ ثَلاثَ مَرَّاتِ، وقُلْ هُوَ اللَّهُ أحَدْ اثنَتَي عَشَرَةَ مرَّةً، فإذا فَرَغَ مِنْ صَلاتهِ صَلَّى عَلَيَّ سَبعينَ مَرَّةً ويَقول: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَبيِّ الأُميِّ وَعَلى آلهِ، ثُمَّ يَسجُدُ ويَقُولُ فِي حالِ سجودهِ سَبعينَ مرَّةً: سُبُّوحٌ قدُّوسٌ، ربُّ الملائِكةِ والرُّوح، ثُمَّ يَرفَعُ رأسَهُ ويَقول: سَبعينَ مَرَّةً رَبِّ اغْفِرْ وارْحَمْ وتَجاوَز عَمَّا تَعلَمْ، إنَّكَ أنتَ الأعَزُّ الأكرَمُ، ثمَّ يسجُد سَجْدَةً أُخرَى وَ يَقولُ فيهَا مِثلَ ما قَالَ فِي السَّجدَةِ الأُولَى،

---

(١) وهي المسمات بصلاة الرغائب. إتحاف ٤٢٢/٣.

**ثُمَّ يَسأَلُ اللهَ حاجتَهُ في سُجُودهِ فإِنَّها تُقضَى)).**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : بەوەی گیانی منی بەدەستە هەرکەسێك ئەو نوێژە بکات و ئەو دۆعایە بکات، خودا لە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێت، با وەك کەفی دەریا و، ڕملی سەحراو، قورسایی کێوەکان و، گەڵای درەختەکانیش زۆربن، وە ئەو کەسە دەبێتە شافیع و تکاکار بۆ حەفتا کەس لە ئال و بەیتەکەی خۆی با ئەهلی ئاگریش بن).

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((والَّذي نَفسي بِيَدِهِ لايُصَلِّي أحَدٌ هذهِ الصَّلاةَ إلاَّ غَفَرَ اللهُ لهُ جميعَ ذُنوبِهِ، ولَوْ كانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحرِ وَعَدَدِ الرَّملِ ووزنِ الجِبال ووَرَقِ الأَشجَارِ ويَشفَعُ في سَبعِمِائَةٍ مِنْ أهلِ بيتهِ، ممَّن قَد استَوجَبَ النَّار))**[1]،

ئەمە نوێژێکی باش و پەسەندە، بۆیە لەم بەشەدا باسمان کردووە، چونکە لەگەڵ هاتنەوەی ساڵەکاندا ئەویش دووبارە دەبێتەوە، هەرچەندە ناگات بە پلەی نوێژەکانی تەراویح و جەژنەکان، چونکە ئەم نوێژە لەلایەنی تاکەکانەوە ڕیوایەت کراوە، بەڵام بینیومە لە ئەهلی قودسەوە بە گشتی کە بەردەوام بوون لەسەر ئەم نوێژە، وە هەرگیز ڕازی نەدەبوون بە نەکردنی و واز لێ هێنانی، بۆیە پێم خۆش بوو کە منیش بیهێنمەوەو باسی بکەم.

---

(١)لە کتێبی(تنزیە الشریعة ٩٢/٢ دا هاتووە لە حافیزی عێراقییەوە لە (الأمالی) دەڵێت: قد تساهل الحافظ أبو الفضل محمد بن ناصر في إيراده هذا الحديث في المجلس الرابع عشر من أمالي إبن حصين وقوله أنه حسن غريب. والإمام الغزالي نزل بهذا الأثر وعرف أنه لا يرقى للإحتجاج أصلا حين ذكر علة إيراده لصلاة الرغائب، بأنها من إستحباب الصالحين، كما رآه في القدس، بەڕاستی قسەی زۆری لەسەر کراوەو زیاتر بە حەدیسێکی لاواز دەدرێتە قەڵەم هەرچەندە زۆربەیان بە دروستکراوی دادەنێن.بۆ بە شێخی زوبەیدی بەدرێژی لەسەری دەڕوات وەڵامی هەندێك گومان دەداتەوە الإتحاف ٤٢٥/٣.

# نوێژی شەعبان

شەوی پازدەی شەعبان صەد ڕکات نوێژ دەکات، هەموو دووڕکاتێك بە سەلامدانەوەیەك، لە هەموو ڕکاتێکدا دوای خوێندنی فاتیحە دە جار (**قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ**) بخوێنێت، وە ئەگەر ئارەزویشی هەبێت با دە ڕکات نوێژ بکات و، لە دوای فاتیحە لە هەر ڕکاتێکدا صەد جار (**قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ**) بخوێنێت، ئەم نوێژەیش لە ناو نوێژەکاندا ڕیوایەت کراوە، وە ناویان بردووە بە نوێژی خێر(**صلاة الخیر**)، وە تیایدا کۆدەبوونەوە، وە لەوانەیش بوو کە بە جەماعەت بیانکردایە.

دەگێڕنەوە لە (حەزرەتی) حەسەنی بەصریەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە فەرموویەتی: سی کەس لە ئەصحابی پێغەمبەرﷺ بۆیان باس کردووم:

ئەوەی لە شەوی نیوەی شەعباندا ئەم نوێژە بکات، خودای گەورە حەفتا جار (بەچاوی مەرحەمەتەوە) سەیری دەکات، وە بە هەموو سەیرکردنێك بڕیاری داوە کە حەفتا کاری بۆ جێبەجێ بکات، نزمترینیان لێخۆش بوونی خودا بووە[1]،

---

(١)ثم زاد صاحب القوت٦٢/١ فقال: وقد قيل هذه الليلة هي التي قال الله فيها (بفرق كل أمر حكيم) وأنه ينسخ فيها أمر السنة وتدبير الاحكام إلى مثلها من قابل، والله أعلم والصحيح من ذلك عندي أنّه في ليلة القدر وبذلك سميت لأنَّ التنزيل يشهدُ بذلك إذ في أول الآية: **إنا أنزلناه في ليلة مباركة**، ثم وصفها فقال: **فيها يفرق كلُ أمر حكيم**، فالقرأن إنما أنزل في ليلة القدر، فكانت هذه الآية بهذا الوصف في هذه الليلة مواطئة لقوله تعالى: إنا انزلناه في ليلة القدر، وقال العراقي : حديث صلاة ليلة النصف باطل ولابن ماجه من حديث علي: (**إذا كانت ليلة النصف من شعبان فقوموا ليلها وصوموا نهارها** واسناده ضعيف، قلت: وأخرجه عبد الرزاق في مصنفه وزاد : **فان الله عزوجل ينزل فيها لغروب الشمس الي**

السماء فيقول الا مستغفر اغفر له ألا مسترزق ارزقه حتى تطلع الفجر) وفي احياء ليلة النصف احاديث وردت من طرق كثيرة، أمافضيلة هذه الليلة فقد ثبت بالحديث الصحيح الذي رواه ابن حبان(في صحيحه٥٦٦٥) والطبراني في الكبير(١٠٨/٢٠)، وأبو نعيم في الحلية ١٩١/٥: (يَطلع الله على خلقه في ليلة النصف من شعبان، فيغفر لجميع خلقه إلا لمشرك أو مشاحن. وكان الإمام الشافعي يقول: بلغنا أنه كان يقال: إن الدعاء يستجاب في خمس ليال، ليلة الجمعة، وليلة الأضحى وليلة الفطر، وأول ليلة من رجب، وليلة النصف من شعبان). الأم: ٤٨٥/٢)، ورواه عنه البيهقي في السنن الكبرى، ٣١٩/٣.

قال الحافظ الزبيدي: وقد ذكر التقي السبكي في تفسيره (إن إحياء ليلة النصف من شعبان يكفر ذنوب السنة، وليلة الجمعة تكفر ذنوب الاسبوع، وليلة القدر تكفر ذنوب العمر، اهـ وقد توارث الخلف عن السلف في إحياء هذه الليلة بصلاة ست ركعات بعد صلاة المغرب كل ركعتين بتسليمة، يقرأ في كل ركعة منها بالفاتحة مرة والاخلاص ست مرات، بعد الفراغ من كل ركعتين يقرأ سورة يس مرة، ويدعو الدعاء المشهور بدعاء ليلة النصف من شعبان ويسأل الله تعالى البركة في العمر، ثم في الثانية البركة في الرزق، ثم في الثالثة البركة في حسن الخاتمة، وذكروا أن من صلَّى هكذا بهذه الكيفية أعطى جميع ماطلبَ،) وهذه الصلاة مشهورة في كتب المتأخرين من الساده الصوفية، ولم أرلها ولا لدعائها مستندا صحيحا في السنة، إلاَّ أنه من عمل المشايخ، وقد قال أصحابنا أنهُ يكره الإجتماع على إحياء ليلة من هذه الليالي المذكورة في المساجد وغيرها، وقال النَّجم الغَيضي في صفة إحياء ليلة النصف من شعبان بجماعة، أنه قد أنكر ذلك أكثر العلماء من أهل الحجاز، منهم عطاء وابن أبي مليكة وفقهاء أهل المدينه، وأصحاب مالك وقالوا ذلك كلُّه بدعة، ولم يثبت في قيامها جماعةً شيء عن النبي صلى الله عليه وسلم ولا عن أصحابه واختلف علماء الشام على قولين أحدهما إستحباب أحيائها بجماعة في المسجد ومن قال بذلك من أعيان التابعين خالد بن معدان وعثمان بن عامر و وافقهم إسحق بن راهويه، والثاني كراهة الإجتماع لها في المساجد للصلاة وإليه ذهب الأوزاعي فقيه الشام ومفتيهم اهـ .الإتحاف٤٢٢/٣.

# بەشی چوارەم

## لە سوننەتەکان، کە پەیوەنداری چەند هۆکارێکی پەیدابووە، وە پەیوەندی بە کاتەکانەوە نییە، کە نۆ نوێژە:

وەك نوێژی خۆرگیران و، مانگ گیران و، باران بارین و، دیاری مزگەوت و، دوڕکاتی دەست نوویژگرتن و، دوڕکاتی میانی بانگ و قامەت و، دوڕکاتی کاتی چوونەدەرەوە لە ماڵ و، هاتنە ژوورەوە بۆ ماڵەوە، وە هاو وێنەکانیان، کەواتە ئەوانە باس دەکەین کە لەزیهنماندایە:

### یەکەم: نوێژی خۆر و مانگگیران:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

**((إنَّ الشَّمسَ والقَمَر أيَتانِ مِنْ آياتِ اللهِ لا يَخسِفَانِ لِمَوتِ أَحَد)) من العظماء ولا (لِحَياتِهِ) فاذا رأيتُم ذلكَ (فافزَعُوا) اي فالجؤا (إلى ذِكرِ الله) واستغفاره (وإلىَ الصَّلاةِ)) اي بادروا اليها (قالَ ذلكَ: لمَّا ماتَ ولدُه إبراهيم وكَسَفَتِ الشَّمسُ فقالَ النَّاسُ إنَّما كُسفَت لِمَوتِهِ** [1]،

(بەڕاستی خۆر و مانگ دوو بەڵگەو نیشانەن لە سەر دەستەڵاتی خودا، نە بۆمردنی هیچ کەسێك دەگیرێن و نەبۆ ژیانی، ئەگەر بینیتان کە خۆر و مانگ گیران، پەنابەرن بۆ زیکری خودا و بۆ نوێژکردن) کاتێك ئەمەی فەرموو کە سەیید ئیبراهیمی کوڕی وەفاتی کرد و خۆریش گیرا، خەڵکەکە وتیان لەبەر مردنی ئەو خۆر گیراوە.

**چۆنیەتی نوێژەکەو کاتەکەی:** لەبارەی چۆنیەتی یەوە بزانە: هەرکاتێك خۆر

---

(١) رواه البخاري (١٠٤٣)، ومسلم (٩٠٤).

گیرا، له وەختێکدا بێت نوێژکردن کەراهەتی هەبێت یان کەراهەتی نەبێت، دەبێت بانگدەر بانگ بکات: کۆبنەوە بۆ نوێژ(**الصَّلاةُ جَامِعَةٌ**)، وە ئیمام دوڕکات نوێژ بە خەڵکەکە دەکات، وە لە هەموو ڕکوعێکدا دوو ڕکوع دەبات، یەکەمەکانیان درێژ تر بێت لە دووهەمەکانیان، وە دەنگیش بەرز نەکاتەوە تیایاندا، لە وەستانی ڕکاتی یەکەمدا دوای خوێندنی فاتیحە سوورەی (**البَقَرة**) بخوێنێت، (وە ڕکوع دەبات و دیسان هەڵدەستێتەوە و لە ڕکاتی دووهەمدا فاتیحە و (**آل عِمْرانْ**) بخوێنێت، (لەپاشان سەجدە ببات و لە دواییدا هەڵسێتەوە) وە لە ڕکاتی سێیەمدا فاتیحە و سوورەی (**نساءْ**) بخوێنێت، (ئیمجا ڕکوع دەبات و هەڵدەستێتەوە بۆ )ڕکاتی چوارەم، سوورەی فاتیحەو سورەی(**مائیدە**) ی تیا بخوێنێت، یان ئەندازەی ئەو سوورەتانەی کە باسمان کردن لە قورئان بخوێنێت لە هەر شوێنێك بیەوێت.

وە ئەگەر لە هەموو وەستانێکدا تەنها فاتیحەی خوێند، ئەوە بۆی دەنوسرێت و نوێژەکەی کردووە، وە ئەگەر سوورەتە بچووکەکانیش بخوێنێت درووستە، وە مەبەست لە درێژکردنەوەکە ئەوەیە کە بەردەوام لە نوێژەکە دا بێت، تا خۆر و مانگەکە وەك خۆیانیان لێ دێتەوە.

وە لە ڕکاتی یەکەمدا بەئەندازەی خوێندنەوەی صەد ئایەت تەسبیحات بکات، وە لە ڕکاتی دووهەمدا بە قەدەر هەشتا ئایەت، وە لە ڕکوعی سێیەمدا بە ئەندازەی حەفتا ئایەت تەسبیحات بکات، وە لە ڕکوعی چوارەمدا بە قەدەر پەنجا ئایەت، وە لە هەموو ڕکاتێکیشدا سەجدەکانی بە ئەندازەی ڕکوعەکانی بێت. لەپاشان کە نوێژەکەی تەواو کرد دوو وتار دەخوێنێتەوەو سەجدەیەك دەبات لە میانیاندا، وە فەرمان بدات بە خەڵکەکە بە تەوبەکردن و بەندە ئازاد کردن و صەدەقە و چاکەکردن.

وە بە هەمان شێوە نوێژی مانگ گیرانیش دەکات، بەڵام ئەوەندە هەیە بە

دەنگی بەرز دەیخوێنێتەوە، چونکە نوێژی شەو بەدەنگی بەرزە.

## کاتی نوێژ:

لەوکاتەوە دەست پێدەکات کە مانگ و خۆر دەست بەگیران دەکەن، تا ئەو کاتەی بە تەواوی بەردەبن، وە هەروەها وەختەکەی نامێنێت، بەوەی خۆر بە گیراوی بنیشێت، وە کاتی نوێژی مانگ گیران نامێنێت، کە خۆر هەڵبێت، ئیتر سوڵتان و دەستەڵاتی شەو نامێنێت.

بەڵام کاتی نوێژی مانگ گیران بەوە کۆتایی نایەت کە مانگەکە بە گیراوی بنیشێت، چونکە شەو بە تەواوی لە ژێر سوڵتانی مانگدایە، وە ئەگەر لە کاتی نوێژکردنەکەدا دەرکەوتەوە، با نوێژەکە بە سووکی و خێرایی تەواو بکات، وە هەرکەسێك فریای ڕکاتی دووهەم بکەوێت لە گەڵ ئیمامدا، ئەوە فریای ڕکاتی یەکەم نەکەوتووە، چونکە ئەصڵ لە نوێژەکەدا ڕکاتی یەکەمە.

## دووهەم: نوێژی باران بارین:

ئەگەر ڕوبارەکان ڕۆچوون بەزەویداو، باران براو، دواچۆڕی هات و نەما و، جۆگەلەکان ڕمان و وشك بوون، ئەوا کارێکی موستەحەبب و باشە کە ئیمام فرمان بدات بە خەڵکەکە تەوبە بکەن، سێ ڕۆژ بە ڕۆژووبن و، چەندێك لە توانایاندا هەیە صەدەقەو خێر بکەن و، خۆیان دەرباز بکەن لە زوڵم و ستەمێك لە خەڵکییان کردبێت و، تەوبە بکەن لە گوناهەکانیان و، لە ڕۆژی چوارەم بیانباتە دەرەوە و، وە پیرو پەککەوتەو منداڵەکانیش بباتە دەرەوە، خۆیان پاك بکەنەوەو خۆیان بۆنخۆش بکەن و، سیواك بەکارهێنن و، لە بەرگێکی شڕو کۆندا بە گەردن کەچی و زیللەت و ملکەچییەوە بۆ حزوری خودا، بە پێچەوانەی دەرچوونیان بۆ ڕۆژی جەژنەکان.

وە هەندێك زانا دەڵێن:

کارێکی باشە کە ئاژەڵ و گیانلەبەرانیش پێش خۆیان بخەن، چونکە ئەوانیش

پێویستیان بە بارینی باران هەیە، وە لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((لَولاَ صِبيانٌ رُضَّعْ، ومَشَايَخُ رُكَّع، وبَهائِمُ رُتَّعٌ، لَصُبَّ عليكُم العَذابُ صبّاً)) [1].

(واتە: ئەگەر منداڵی شیرەخۆر و پیری نوێژخوێنی ڕکوع بەر و، لەوەڕین ی گیانلەبەر نەبوایە، ئەوا جامی ڕق و غەزەبی خودا دەڕژا بەسەرتاندا).

وە ئەگەر ئەوانەش کە لە ژێر زیممە و پاراستنی موسوڵمانەکاندان بێنە دەرەوە، ئەوا ڕێگەیان لێ ناگیرێت، ئەگەر جیاکراوەبن لەوانی تر.

ئەگەر کۆبوونەوە لە نوێژگایەکی سارای فراواندا، بانگی هەموان دەکرێت: (الصَّلاةُ جَامِعَةْ) وە ئیمام دوورکات نوێژیان بۆ دەکات، وەك نوێژی جەژن بە بێ جیاوازی [2].

لەپاشان دوو وتاریان بۆ دەدات و، دانیشتنێکی کەمیان لە بەیندا دەکات، وە با زۆربەی وتارەکانی داوای لێخۆش بوون لە خودا بگرێتەوە [3].

وە پێویستە لە ناوەڕاستی وتاری دووهەمدا، پشت بکاتە خەڵکەکەو ڕوبکاتە قیبلەوە، وە بەرگ و عەباکەی لەم ساتەدا بەهەڵگەڕاوی لەبەر کات و بەو هێوایەی خودا حاڵەکەیان بۆ بگۆڕێت، وەك (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیەی دەکرد ، بە شێوەیەك کە لای سەرەوەی بخاتە خوارەوە و، لای خوارەوەی بۆ سەرەوە، ئەوەی لای ڕاستی بۆسەر لای چەپی و، ئەوەی لای

(١)رواه الطبراني في الكبير(٣٠٩/٢٢)قال العراقي أخرجه البيهقي في السنن الكبرى ٣٤٥/٣) بنحوه، وضعفه من حديث أبي هريرة ا هـ

(٢) واتە لە تەكبیر و قورئان خوێندن و مانەوەی بەینی تەکبیرەکان و تەسبیح و حەمدوسەناو لاإله إلا الله كردنەكاندا، الإتحاف٣/٤٤٠.

(٣) واتە لەبری تەکبیراتی جەژن با (أستغفرالله) بکات.وە لەوتارەکەیشدا زۆر ی بکات.٤٤٢/٣.

چەپیشی بۆ لای ڕاستی، وە خەڵکەکەش بەم شێوە بکەن، وە لەم ساتەدا بە نهێنی و بەکوڵ دۆعا بکەن.

لەپاشان دیسان ڕویان تێ بکاتەوەو، وتارەکەی تەواو بکات، وە عەباکەیان بە هەڵەوگەڕاوی دەهێڵنەوە، تا ئەو کاتەی بەرگەکانیان دادەکەنن، وە لە نزاو دۆعاکاندا دەڵێن:

**((اللَّهُمَّ إنَّكَ أَمَرتَنَا بِدُعَائِكَ وَوَعَدْتَنا إجابَتَكَ، فَقَد دَعَوْناكَ كَما أَمَرتَنا فَأَجِبْنَا كَمَا وَعَدْتَنا، اللَّهُمَ فامُنُنْ عَلَينَا بمَغفِرَةِ مَاقَارَفْنَا، وإجابَتِكَ في سُقيانَا وَسِعَةِ أَرزاقِنا))**(١)

(خودایە تۆ فرمانت پێداوین دەستی دۆعا بەرزکەینەوە بۆ حزورت، وە بەڵێنت داوە کە بێیت بەدەممانەوە، ئەوا وەك فرمانت پێداین دۆعاکانمان کرد، تۆیش بۆمان جێبەجێ بفەرمو وەك بەڵێنت پێ داوین، لێمانخۆش ببە لەو تاوان و گوناهانەی کردوومانە، وە ئاواشتەمان بکەرەوەو بارانمان بۆ ببارێنەو، ڕۆزی و بژێوی ژیانمان زیاد بکە)

وە ئاساییە کە پێش ئەوەی دەربچن بۆ نەێژو نزاکان، کە لەو سێ ڕۆژەدا لە دوای نوێژە فەرزەکان دۆعای تیا بکەن ، کە ئەو نزایانەش ئاداب و مەرجی باطینی و شاراوەی تێدایە، لە تەوبەکردن و گەڕاندنەوەی مافی خەڵکی کە بەسەریەوەیەتی و، هەر مافێکی تر بەسەریەوە بێت، کە لە پەڕاوی نزاو دۆعاکاندا بەیان دەکرێت.

---

(١)هذا الدعاء منقول عن الشافعي ما في الأم ٢/٥٤٦، ثم المتبادر من سياق المصنف ان هذا الدعاء محله بعد ختم الخطبة وليس كذلك ففي الروضة قال الشافعي: **وليكن من دعائهم في هذه الحالة اللهم أنت أمرتنا الخ ثم قال فإذا خرج من الدعاء أقبل بوجهه على الناس وحثهم على طاعة الله وصلى على النبي ﷺ ودعا للمؤمنين والمؤمنات وقرأ آية أو آيتين ويقول استغفر الله لي ولكم .**

## سێیەم: نوێژی مردو.

که چۆنیەتیەکەی ئاشکرایە[1] وەکۆترین دۆعای مەئسوور ئەوەیە کە لە فەرموودەیەکی درووستەوە گێڕاویانەتەوە لە عەوف ی کوڕی مالیکەوە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر مردوویەك کرد، منیش لەو دۆعایانەی کردی ئەمەم لێ وەرگرت:

**(اللَّهُمَّ اغفِر لِي ولَهُ وارحَمْني وارحَمْهُ، وعَافِهِ واعفُ عَنه، وأكرِم نُزلَهُ وَوَسِّع مدخَلَهُ، واغْسِلْهُ بالماءِ والثَّلجِ والبَرَد، ونَقِهِ مِنَ الخَطَايَا كَما يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبيضُ مِنَ الدَنَسِ، وأَبدِلْهُ داراً خَيراً مِنْ دارِهِ، وأَهلاً خَيراً مِنْ أَهلِهِ، وزَوْجاً خَيراً مِنْ زَوجِهِ، وأَدْخِلهُ الجَنَّةَ وأَعِذْهُ مِنْ عَذابِ القَبْرِ وَمِنْ عَذابِ النَّار))** [2]

خودایە لە من و لەویش خۆش ببیت و ڕەحم بە من و و بەویش بکەیت و، چاکی بکەیتەوەو لێیشی خۆش ببیت، میواندارییەکی باشی بکەیت و ڕێزی لێ بگریت، گۆڕەکەی بۆ فراوان بکەیت و، بە ئاوو بەفرو تەرزە پوخت و پاك بیشۆریتەوە، وە لە هەڵەوگوناهەکانی پاکی بکەیتەوە، وەك چۆن بەرگێکی سپی لە پیسی و چڵك پاکدەکرێتەوە، وە ماڵێکی تری پێ ببەخشیت باشتر لە ماڵە پێشووەکەی، وە ئەهلو کەسێکی تری پێ ببەخشیت، باشتر لە ئەهل و خزمەکانی خۆی، وە بیپارێزە لە سزای قەبر و عەزابی ئاگری دۆزەخ، عەوف

---

(١) قال المصنف: في الخلاصة ص/١٦: وأركانها تسعة: النية، ولا يضر إن لم يعرف الميت ذكرا أو أنثى، والتكبيرات الأربع أركانٌ. فإن زاد خامسة بطلت الصلاة. وفاتحة الكتاب ركنٌ بعد التكبيرة الأولى، والصلاة على رسول الله ﷺ ركن بعد الثانية، ودعاء الميت ركن بعد الثالثة، ويقول:**(اللهم لاتحرمنا أجره، ولا تفتنا بعده، واغفر لنا وله،)** والدعاء معروف، وليس بعد الرابعة مفروض، ولكن يسلم إن شاء تسليمة واحدة وهي الركن الأخير، وإن شاء تسليمتين.

(٢) رواه مسلم(٩٦٣.

فەرموویەتی: ئەوەندی دۆعای بۆ کرد، تا وام لێ هات ئاواتە خوازم من ئەو مردووە بوومایە.

وە ئەو کەسەی بگات بە (اَللهُ أَكبَرْ) ی دووهەمدا، لە نوێژێك بەسەر مردوودا دەخوێنرێت، پێویستە چاودێری ڕیزبەندی نوێژەکەی خۆی بکات، وە لەگەڵ (اَللهُ أَكبَرْ) ی ئیمامدا تەکبیرەکانی بکات، ئەگەر ئیمام سەلامی دایەوە با ئەمیش کە دواکەوتووە ئەو (اَللهُ أَكبَرْ) ەی کە نەیکردووە بیکات و، وەك دواکەوتوو لە نوێژ تەواوی بکات، چونکە ئەو دوا کەوتووە، ئەگەر بە خێرایی تەکبیرەکانی بکات و، وەك ئیمامەکەی لێ بێتەوە، ئیتر هیچ واتایەك نامێنێت بۆ ئیقتیداو شوێنکەوتنی ئیمامەکە، کەواتە تەکبیرەکان بریتین لە ئەرکانە زاهیری و ئاشکراکان، وە شیاوی ئەوەیە کە لە شوێنی ڕکاتەکانی نوێژ دابنرێن لە نوێژەکانی تردا، ئەمە ڕای پەسەندو شیاوترە لەلای من لەو بارەوە، هەرچەندە لەوانەیە کە لێکدانەوەی تریش هەڵبگرێت .

وە هەواڵ و فەرموودەکان کە لەسەر گەورەیی خێری نوێژی مردوو بۆ بەڕێکردنی تەرم و جەنازەی مردوو هاتووە زۆرن، پێویست ناکات درێژە بەباسکردنیان بدەین[1]،ئەی چۆن خێرێکی گەورەی نییە کە بە فەرزی کیفایە ژمێرراوە، وە کاتێك بە سوننەت دادەنرێت کە کەسێکی تر هەبێت و ئەو بەتەنها لە مەیدانەکەدا نەبێت، وە خێری فەرزی کیفایەیشی بۆ دەنوسرێت، با ئەویش بە تایبەتی دیاری نەکرابێت بۆ کردنی ئەو نوێژەیە، چونکە کۆی هەموویان بەوە هەستاون کە کردنەکەی فەرزە، وە ئەو کۆمەڵەی پێی هەستاون ئەرکەکەیان لەسەر ئەوانی تر لابردووە، کەواتە ئەمە بەراورد ناکرێت لەگەڵ سوننەتێکدا

---

(١) ومن أشهرها مارواه البخاري(١٣٢٥) ومسلم (٩٤٥)، مرفوعا: **(من شهد الجنازة حتى يصلي عليها، فله قيراط، ومن شهدها حتى تدفن، فله قيراطان، قال: مثل الجبلين العظيمين.**

که هیچ فەرزێکی لە سەر یەکێکی تر لانەبردبێت.

وە باشتر وایە خەڵکێکی زۆری لەسەر کۆبکرێتەوە، بۆ ئەوەی بە هۆی زۆری ئەو کەسانەوە کۆمەڵە هیممەتێکی زیادی لەسەر کۆبێتەوە، وە نزای زۆری بەربکەوێت، بەڵکو دۆعای قەبوڵکراوی یەکێکی بۆ بکەوێتە کار، وەك ئەوەی کورەیب (خودای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) کە منداڵێکیان مرد و فەرمووی: ئەی کورەیب؛

بنوارە چەندێك خەڵکی بۆ کۆبووەتەوە، فەرمووی: منیش چوومە دەرەوە بینیم کەسانێك بۆی کۆبوونەتەوە، هەواڵم پێدا، فەرمووی: دەڵێیت ئەوانە چل کەسن؟ دەفەرموێت: وتم بەڵێ، فەرمووی: دەری بکەن، من بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی:

**((ما مِن رَجُلٍ مُسلِمٍ يَموتُ فيَقومُ علَى جَنازتِهِ أَربَعُونَ رَجُلاً، لاَ يُشرِكُونَ باللهِ تَعَالَى شَيئاً، إلاَّ شَفَّعَهُم اللهُ تعالَى فيهِ))** (١).

هەر پیاوێکی بڕوادار کە بمرێت و، چل کەس ئامادەی جەنازەو ئەسپەردەکردنی ببن، ئەوا دەبنە شفاعەتکارو، خودای گەورە تکای ئەوانەی لە حەق وەردەگرێت.

ئەگەر مردووەکەیان بەرێ کردو، جەنازەکەی گەێنرایە گۆڕستان، یان گەیشتە سەرەتاکەی، دەڵێت:

**((السلام على أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، ورحم الله المستقدمين منا والمستأخرين، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون))**

---

(١)قال العراقي أخرجه مسلم(٩٤٨) ا هـ قا الزبيدي٤٥٦/٣. ورواه كذلك أحمد وأبو داود والبيهقي في السنن وفي رواية لهم خلا مسلم : ما من مُسلم يموتُ، وفي آخره: **إلا شفِعوا فيه** وفي معناه ما أخرجه أحمد والطبراني في الكبير من حديث ميمونة: **ما من مسلم يصلي عليه أمةٌ إلا شُفعوا فيه**

((اللَّهُم: عَبدُكَ رُدَّ إليكَ. فارْؤُفْ بهِ وارْحَمْهُ، اللَّهُمَ جَافِ الأَرضَ عَنْ جَنبَيهِ، وافتَحْ أَبوابَ السَّماءِ لرُوحِهِ. وتَقَبَّلهُ بقَبُولٍ حَسَنٍ، اللَّهُمَّ إنْ كانَ مُحسِناً فَضاعِفُ لَهُ في حَسَناتهِ، وإنْ كانَ مُسِيئاً فَتَجاوَز عَنْ سَيِّئاتِهِ)) [1]،

واته: خودایه بەندەکەت گەڕێنرایەوە بۆلای خۆت، بەنەرمی و لوتف و بەزەییەوە لەگەڵیدا بجوڵێرەوە، وە زەوییەکەی بۆ فراوان بکەیت، تا بەئاسوودیی تیا بحەوێتەوە، وە دەروازەی ئاسمان بکەرەوە بۆ ڕۆحەکەی، وە بە شێوەیەکی جوان وەری بگرە، ئەی خودایە؛ ئەگەر کەسێکی باشە، چاکەکانی بۆ زیاتر و دووچەندانەبکەرەوە، وە ئەگەر خراپیشە ئەوا لێی ببورەو بیبەخشە. [2]،

## چوارەم : دیاری مزگەوت (تحية المسجد):

دووڕکات یان زیاتر بکات، کە بچیتە مزگەوتەوە، ئەوە سوننەتێکی دوپاتەکراوە، تەنانەت ئەگەر وتاربێژیش لە وتارداندا بێت، کە پێویستیشە گوێ لە خەطیب بگیرێت، کەچی ئەو دووڕکاتە ناکەوێت و حوکمی هەر دەمێنێت.

وە ئەگەر سەرقاڵی کردنی نوێژێکی فەرز بێت، یان گێڕانەوەی قەزایەك بێت، ئەوا بە (تحية المسجد) دیاری مزگەوت بۆی دەنوسرێت و، فەزڵ و

---

(١)وقال في الروضة: ويُستحب أن يُدخله القبر وأن يقول: (بسم الله وعلى ملة رسول الله صلى الله عليه وسلم ثم يقول: اللهم أسلمه إليك الأشحاء من ولده وأهله وقرابته وإخوانه وفارقَه من كان يُحبُّ قُربهُ وخَرج مِن سعةِ الدنيا والحياة إلى ظلمةِ القبر وضيقته، ونزل بك وأنتَ خيرُ مَنزولٍ بهِ إن عاقَبتَه فبِذَنبِهِ. وإن عفوتَ عَنهُ فأنتَ أهلُ العَفوِ. أنتَ غنيٌ عَن عَذابهِ وَهُو فَقيرٌ إلى رحمَتِكَ. اللَّهُم تقبَّل حَسنتَه وأعِذهُ من عَذاب القَبر وأجْمعْ لهُ برحمَتكَ إلا من عذابك يا أرحم الراحمين)، وهذا الدعاء نص عليه الشافعي رحمه الله في المختصر.

(٢) رواه ابن أبي شيبة في المصنف(١١٨٢٧).

خێرەکەیشی بۆ دەنوسرێت، چونکە مەبەستەکەئەوەیە کە هاتە ناو مزگەوتەوە هاتنەکەی لە عیبادەتێك کە تایبەتی مزگەوت بێت خاڵی نەبێت، بۆ ئەوەی مافی مزگەوت بدات، بۆیە ناپەسەندە کە بەبێ دەست نوێژ بچێتە ناو مزگەوتەوە، تەنانەت ئەگەر بە مەبەستی تێپەڕبوون، یان دانیشتن بچێتە ناو مزگەوتەوە، با چوار جار بڵێت: ( **سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ ولاإلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَر**)دەڵێن: ئەو تەسبیحاتە بە ئەندازەی خێری دووڕکات نوێژ دەبێت کەبۆی بنوسرێت[1] .

وە مەزهەبی ئیمامی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) ئەوەیە: کە لە کاتی کەراهەتیشدا نوێژی دیاری مزگەوت بە ناپەسەن دانانرێت، کە کاتەکان: دوای عەسر و، دوای بەیانی و، وەختی زەوال و، کاتی خۆر هەڵاتن و خۆرنشینە، کە نوێژ کەراهەتی هەیە لەم کاتانەدا بکرێت، بەڵام (تحية المسجد) ئاساییە، چونکە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ دووڕکات نوێژی کرد لە دوای عەسر، پێیان وت: ئایا ڕێگریت لێ نەکردین لە کردنی نوێژ لەکاتی کەراهەتدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((**هُما رَكعَتانِ كُنتُ أصَلِيهِما بَعدَ الظُّهرِ، فَشَغَلَني عَنهُما الوَفدُ**))،واتە ئەوە دووڕکات بوو لە دوای نیوەڕۆ دەمکردن، بەڵام ئەو وەفدە سەرقاڵیان کردم، کەواتە ئەم فەرموودەیە دوو سوودی لێ دەبینرێت:

**یەکەم:** کەراهەتەکە تایبەتە بە نوێژێکەوە کە هۆکارێکی نەبێت، گێڕانەوەی نوێژی سوننەتیش کە فەوتابێت لە بەهێزترینی هۆکارەکانە، چونکە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی سوونەتەکان، ئایا دەگێڕرێنەوە یان نا؟

وە ئەگەرنوێژە فەوتاوەکەی وەك خۆی کردەوە، ئایا بە قەزاکردنەوە حیساب دەکرێت؟ کەواتە ئەگەر بە لاوازتریت هۆ کەراهەتەکە نەمێنێت، باشتر ئەو کەراهەتە نامێنێت بۆ کەسێك کە بچێتە ناو مزگەوتەوە، کە چوونە

---

(١) كذا ذكره أبو طالب المكي في قوت القلوب(١/٢٣).

ناو مزگەوت بۆ خۆی هۆکارێکی بەهێزە، هەر لەبەر ئەمەیشە، لە وەختی کەراهەتدا ئەگەر نوێژێك لەسەر مردوو هاتە پێشەوە ئەوا دەکرێت و کەراهەتیشی نییە، هەروەها نوێژی خۆر و مانگ گیران و باران بارین لەو کاتانەدا، چونکە ئەمانەش هۆکاری تایبەتین.

**سوودی دووهەم:** دروستە فەوتاوی سوننەت بگێڕرێتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ سوننەتی فەوتاوی گێڕاوەتەوە، وەك (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

**((كانَ رسولُ اللهِ ﷺ إذَا غَلبَه نومٌ أوْ مَرضٌ، فَلَم يقُم تِلكَ اللَّيلَةَ صلَّى مِنَ النَّهارِ اثنتَي عشَرةَ ركْعَةً))** [1]

واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خەو یان نەخۆشی زۆری بۆ بهێنایە و، ئەو شەوە هەڵنەستایەتەوە بۆ شەو نوێژ، ئەوا بە ڕۆژدا دوانزە ڕکات نوێژی دەکرد.

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: ئەگەر کەسێك لە نوێژدابوو، نەیدەتوانی وەڵامی بانگوێژ بداتەوە و وەڵامەکەی فەوتا، ئەوا کە سەلامی دایەوە با قەزای بکاتەوەو وەڵامەکەی بداتەوە، با بانگوێژەکەیش بێدەنگ بوبێت.

ئیتر هیچ واتایەك نامێنێت بۆ قسەی ئەوکەسەی کە بڵێت:

ئەم وەڵامدانەوەیە وەك یەکەمجارەکەوایە و بە قەزاکردنەوە ناژمێررێت، چونکە ئەگەر وابوایە، ئەوا پێغەمبەر ﷺ لە کاتی کەراهەتدا نەیدەکردەوە!

بەڵێ: هەرکەسێك ویردێکی هەبێت، بە هۆی بەهانەیەکەوە نەیتوانی بیڵێت، نابێت هەروا بە ئاسانی ڕێگە بە خۆی بدات کە ئیتر بۆیەکجاری وازی لێ بهێنێت، بەڵکو دەبێت بە خێرایی بیکاتەوەو، ڕێگە نەدات نەفسی فێری تەمبەڵی و ئیسراحەت و ڕەفاهییەت ببێت، وە کردنەوەی ئەو ویردو سوننەتانە کارێکی

(١)قال العراقي أخرجه مسلم(٧٤٦). ا هـ

باشەو بە جیهادی نەفسیش بۆی دەنوسرێت، وە پێغەمبەری خودایش ﷺ فەرموویەتی:

((أَحبُّ الأَعمالِ إلى اللهِ تَعالى أدوَمُها وإن قَلَّ))[1]،

(واتە: خۆشەویسترین کردەوە لای خودا ئەوەیە، کە بەردەوام بێت لەسەری با کەمیش بێت)، بۆیە بە گێڕانەوەی ئەو فەوتاوە، مەبەستی ئەوە بێت کە بەردەوامی ئەو کارە خێرە نەپچڕێنێت.

وە (حەزرەتی) عائیشە گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خوداوە کە ﷺ فەرموویەتی:

((مَنْ عَبدَ اللهَ (عَزَّ وجَلَّ) بِعِبادَةٍ، ثُمَّ تَرَكَها مَلالَةً، مَقَتَهُ اللهُ (عَزَّ وجَلَّ)) [2]، (ئەوەی بە جۆرێك عیبادەت بەندایەتی خودا بکات ، لە پاشان لەبەر ماندویی وازی لێ بهێنێت، خودای گەورە لێی توڕەدەبێت و غەزەبی لێ بگرێت).

کەواتە با بێدار بێت لەوەی خۆی بهاوێتە ناو ئەو هەڕەشەوە، وە کارێك نەکات ئەو فەرموودەی لەسەر جێبەجێ ببێت، کە خودا لێی ڕەنجاوە بە هۆی ئەوەی کە لەبەر ماندوویی و تەمبەڵی وازی لێ هێناوە، خۆ ئەگەر توڕەبوون و

---

(١) رواه البخاري (٦٤٦٤) ومسلم(٧٨٢)، واتاکەی ئەوەی ماوەیەك لە سەر کارێکی خێر بەردەوام بێت، ئەوا نەفسی خوی پێوە دەگرێت و، بەو هۆیەوە زیاتر ڕوی لە هەق دەبێت. وە کەسێك کە واز لەکارێك بهێنێت، دوای ئەوەی کە ڕوی لێ کردبوو، وەك ئەوە وایە کە دوای وەصڵ و بەیەك گەیشتن پشت لەو کەسە بکات. ئەوەی بەردەوام بێت، وەك ئەو کەسەوایە سوورو بەردەوامە لەسەر کارەکانی. دیارە کەسێك کە بەردەوام لەبەردەرگابێت، وەك ئەو کەسە نییە کە هەوڵی دابێت و پچڕاندبێتی، تەنانەت ئەگەر بشزانێت کە وەرنەگیراوە، نابێت ئینسانی دانا بەردەرگا بەجێ بهێڵێت!!

(٢) قال الحافظ العراقي : رواه ابن السني في (رياضة المتعلمين)موقوفا على عائشة، ووجدت في حاشية كتاب المغني، مانصه: مصلح من نسخة(من عوَّد اللهَ تعالى)بالواو بدل (عبد) الإتحاف ٤٧٢/٣، وفي القوت ٢٢/١، ٨٤) باللفظين(عبد، ثمَّ (عوَّدَ).

دوورخستنەوەی خودایی نەبوایە، ئەو بێزاری و ماندوبوونە زاڵ نەدەبوو بەسەریدا، کە نەتوانێت عیبادەتەکەی ئەنجام بدات.

## پێنجەم: دووڕکاتی سوننەتی دەست نوێژ:

ئەو دوو ڕکاتە کارێکی زۆر باشە، چونکە دەست نوێژ بۆخۆی هۆکاری نزیك بوونەوەیە، وە مەبەستی دەست نوێژ نوێژکردنە، بێ دەستنوێژیش حاڵەتێکی پەیدابووە، لەوانەیە حاڵەتی بێدەستنوێژی بێت بەسەردا لە پێش نوێژەکەدا، دەستنوێژەکەیشی بەتاڵ دەبێتەوەو، هەوڵەکەیشی زایە دەبێت، کەواتە بە خێرایی هەوڵدان بۆ دەستنوێژگرتنەوە، بژاردنەوەی ئەومافی دەستنوێژەیە کە لەسەریێتی، پێش ئەوەی کاتەکەی بفەوتێت وە دەستی بهێنێتەوە، بە فەرموودەکەی (حەزرەتی) بیلال ئەمە دەزانرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

**((دخَلتُ الجَنَّةَ، فَرأيتُ بِلالاً فيها، فَقُلتُ لِبلاَل: بِمَ سَبَقتَني إلَى الجَنَّة، فقَالَ لاَ أَعْرِفُ شَيئاً، إلاَّ أَنِّي لا أحدثُ وضُوءاً إلاَّ أصَلِّي عَقيبَهُ رَكعَتَينِ أوْ كَما قَال)**[1]،( واتە چوومە ناو بەهەشتەوە بینیم بیلال لەوێ یە، بە بیلالم وت: بەچی پێشی من کەوتیت بۆ بەهەشت، فەرمووی: هیچ نازانم ، بەڵام ئەوەندە هەیە هەر کە بێدەست نوێژی دێت بەسەرمدا، یەکسەر دەست نوێژ دەگرم و دووڕکات نوێژ دەکەم.)

---

(١)قال العراقي أخرجاهُ من حديث أبي هريرة ا هـ قلت أخرجاه من طريق أبي زرعة عن أبي هريرة أن النبي ﷺ قال لبلال عند صلاة الفجر: **( يا بلال أخبرني بأرجي عَمل عملته في الإسلام فإني سمعت دف نعليك بين يدي في الجنة. قال: ما عملت أرجى عندي من أني لم أتطهر طهورا في ساعة ليلٍ أو نهار إلا صلَّيت بذلك الطهور تاماً).**. الحديث الإتحاف٤٦٤/٣. رواه الترمذي(٣٦٨٩) وأصله في البخاري(١١٤٩) ومسلم(٢٤٥٨) وقوله: أو كما قال، هي زيادة حسنة يؤتى بها للتأدب مع كلام رسول الله ﷺ الإتحاف٤٦٤/٣.

**شەشەم: دووڕکات لەکاتی چوونەماڵەوە و هاتنە دەرەوە لە ماڵەوە :**

ئەبوسەلەمە دەیگێڕێتەوە لە ئەبوهورەیرەوە (خودای لێ ڕازی بێت) کە دەفەرموێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((إذَا خَرجْتَ مِن مَنزلك فَصَلِّ رَكعَتَينِ تَمنَعانِكَ مَخْرَجَ السُّوءِ، وإذا دَخَلتَ إلىَ مَنزِلكَ فَصَلِّ رَكعَتَينِ تَمنَعانِكَ مَدخَلَ السُّوءِ))** [1]،

واتە: ئەگەر ویستت لەماڵی خۆتان دەربچیت، دووڕکات سوننەتی دەرچوون لەماڵ بکە دەتپارێزێت لە وەی کە تووشی خراپەو نارەحەتی ببیت، وە ئەگەر ویستت بێیتەوە بۆ ماڵەوەت، ئەوا دووڕکات سوننەت بخوێنە، لەهاتنە ژوورەوەیەکی خراپ دەتپارێزێت)

لە واتای ئەمەشدا هاتووە: ((**كُلُّ أَمرٍ يَبتَدِئُ بِهِ مِمَّا لَهُ وَقعٌ**)) ،

واتە: هەرفرمانێکی گرنگ و بایەخدار کە دەستی پێ دەکات، دوو ڕکاتی بۆ بکات، وەك: (**رَكعَتان عِندَ الإحرام**) [2]،دووڕکات لە کاتێکدا کە ئیحرام بە حەج یان عەمرە دەبەستێت، (**ورَكعَتان عِندَ إبتداءِ السَّفَر**)[3]، وە دووڕکاتیش لەکاتی خۆئامادەکردن و دەست پێکردنی سەفەر ((**ورَكعَتانِ عندَ الرُّجُوعِ مِنَ السَّفَر فِي المَسْجِدِ قَبلَ دُخُولِ البَيتِ**))[4]

---

(١)قال العراقي رواه البيهقي في الشعب(٢٨١٤)بزيادة(**إذا خرجت من منزلك إلى الصلاة**) من رواية معاذ بن فضالة الزهراني عن يحيي بن أيوب عن بكر بن عمرو عن صفوان بن سليم قال بكر حسبته عن ابي سلمة عن أبي هريرة فذكره ا هـ

(٢)كما في البخاري(١٥٥٤).

(٣)فقد روى ابن أبي شيبة في المصنف (٤٩١٤).مرفوعا: (**ما خلف عبدٌ على أهله أفضل من ركعتين يركعُهما عندهم حين يُريد السفر**).

(٤)كما في البخارى ٤٤١٨)، ومسلم(٧١٦)، (**أنه ﷺ كان لايقدم من سفر إلا نهاراً في الضحى، فإذا قدِمَ بدأ بالمَسجِدِ فصلّى فيهِ ركعتينِ ثم جلس فيه**).

وه دووڕكاتیش له كاتی گه‌ڕانه‌وه له‌سه‌فه‌ر، كه له‌مزگه‌وت لابدات و بیكات، پاشان بگه‌ڕێته‌وه بۆ ماڵه، ئه‌مانه هه‌مووی له كرداری (حه‌زره‌تی) پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ وه‌رگیراوه.

وه حاڵی هه‌ندێك له پیاوچاكان وابووه، كه ئه‌گه‌ر پارووپه‌ك نانی بخواردایه دوڕكات نوێژی ده‌كرد، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر قومێك ئاوی بخواردایه‌ته‌وه دووڕكاتی ده‌كرد، یان هه‌ركردارێكی تازه كه‌ده‌ستی پێ ده‌كرد[1].

وه سه‌ره‌تای هه‌موو فرمانێك، پێویسته به پیرۆزی ناوو زیكری خودا ده‌ست پێ بكات،

## ئه‌مه‌یش له‌سێ پله‌دایه:

**هه‌ندێكیان زیاتر دووباره ده‌بنه‌وه، وه‌ك خواردن و خواردنه‌وه، كه‌ده‌ستی** بۆ ده‌بات، ده‌بێت به ناوی خودای (عَزَّ وجَلْ)وه بێت.

وه‌ك پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی:

**((كلُّ أمرٍ ذِي بالٍ لا يَبدَأُ فيهِ ببسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحيم فهو أبتر))**[2]، هه‌رفرمانێكی گرنگ و بایه‌خدار به ناوی خوداوه ده‌ستی پێ نه‌كات ئه‌وه به‌ره‌كه‌تی نابێت و خێری تێدانییه.

---

(١) **يصلي عنه ركعتين** ، واته ئه‌وه‌نده ڕۆچووه له ناو نیعمه‌ته‌كانی خودادا، هه‌موو هه‌نگاوێكی به شوكرێكی تازه به دووڕكات نوێژ نوێی ده‌كاته‌وه و ته‌عبیری لێ ده‌داته‌وه، الإتحاف٣/٤٦٦.

(٢)الكلام علي هذا الحديث من وجوه الأول رواه أبو داود(٤٨٤٠) والنسائي(في السنن الكبرى١٠٢٥٨) وابن ماجه(١٨٩٤) وابن حبان في صحيحه وأبو عوانه في مسنده والبيهقي والبغوي كلهم من حديث أبي هريرة ولفظهم: **(كل أمر ذي بال لا يبدأ فيه بالحمد لله أقطع)**، وعند ابن ماجه: بالحمد، وعند البغوي: بحمد الله، وعند عبد القادر الرهاوي في الأربعين له بلفظ: **(لا يبدأ فيه ببسم الله الرحمن الرحيم أقطع)** وينظر كتاب الأقاويل المفصلة لبيان حديث الإبتداء بالبسملة، ص/٨٢،وما بعدها.

**دووهەم:** ئەوەیە کە زۆر دووبارە نابێتەوە بەڵام گرنگی خۆی هەیە، وەك مارەبڕین و عەقدی نیکاح، وە سەرەتای هەموو ئامۆژگاری و کارێکی ڕاوێژکاری، چاکتر وایە لە هەمەمو کردارێکی لەو شێوانەدا بە حەمدو سەنای خوداوە ﷻ دەست پێ بکات، ئەوەی کچەکە دەدات بە شوو بڵێت: (**الحمد لله والصلاة على رسول الله ﷺ**) ، ئەوا کچەکەمم پێدایت و کردمە ئینکاح و تەزویجی تۆ، وە ئەوەیش قەبوڵی دەکات بڵێت: (**الحمد لله والصلاة على رسول الله ﷺ**) قبوڵی نیکاحی کچەکەتم کرد، نەریتی ئەصحابی کیرام (خودایان لێ ڕازی بێت) بۆ سەرەتای هەر ئامۆژگاری و ڕاوێژو کارێکی خێر حەمدوسەنایان پێش دەخست.

**سێیەم:** ئەوەیە کە زۆر دووبارە نابێتەوە، وە ئەگەر ڕوی دا بەردەوامی دەبێت، وەکاریگەری خۆیشی هەیە، وەك سەفەر و کڕینی خانوویەکی نوێ و ، ئیحرام بەستن و هاووێنەکانی، موستەحەببە لە پێشەوە دورکات نوێژ بکات و نیەتی دەرچوون لەماڵ و هاتنەوەبۆی بهێنێت، چونکە ئەوە جۆرێکە لە سەفەر.

## حەوتەم: نوێژی ئیستیخارە:

هەرکەسێك کارێکی بەلاوە گرنگ بوو کە بیکات، وە نەیدەزانی داهاتووی ئەو کارەی باشە، کەوازی لێ بهێنێت یان بیکات ، ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداوە، کە دووڕکات نوێژ بکات و، لە ڕکاتی یەکەمدا فاتیحەی قورئان بخوێنێت و، سوورەی(**قل يا أيها الكافرون**) بخوێنێت و، لە دووهەمدا فاتیحەو(**قل هو الله أحد**) ، کە لێ بوویەوە لە نوێژەکەی، دۆعا بکات و بڵێت:

((**اللَّهم إني أستَخِيرُكَ بعِلمِكَ، وأستَقدِرُكَ بقُدرَتِك، وأسأَلُكَ مِنْ فَضلِكَ العَظيمْ، فإنَّكَ تَقدِرُ ولا أَقدِرْ، وتَعلَمُ ولاَ أَعلَمْ، وأنتَ عَلاَّمُ الغُيُوبْ ، اللَّهم إنْ كُنتَ تَعلَمُ هَذا الأَمر**)) الَّذى تَحركْتُ لأجلهِ ويُسمِّي حاجتَه حينئذ (**خَيرٌ لِي**) فى فعلهِ وظهور عينهِ (**فِي دِيني ودُنيَايَ فَقَدِّرهُ لِي**) اى فاخلقه من اجلى ((**ثُمَّ**

**يَسِّرْهُ لِي، وإنْ كُنتَ تَعلَمُ هَذا الأمْر شَرٌّ لِي في دِيني ودنياي وعَاقِبَةِ أمْري وعاجِلِهِ، فاصْرِفْهُ عَنِّي واصْرِفْني عَنْهُ، واقْدِرْ لِيَ الخَيْر أينَما كَانْ))**

ئەی خودایە؛ تۆ زاناو شارەزایت و داوات لێ دەکەم ئەوەی خێری تێدایە بۆ من ئەوەم بۆ هەڵببژێرە، وەئەوەی من ناتوانم بۆخۆمی بکەم پەنام بە تەوانایی تۆ هێناوە، بە قودرەتی خۆت بۆم جێ بەجێ بکە، داوات لێ دەکەم بە فەزڵ و گەورەیی خۆت، تۆ دەتوانیت و من هیچم پێ ناکرێت، وە دەزانیت چی بۆمن باشەو من هیچی لێ نازانم، تۆ زانای بەسەر هەموو پەردە شاراوە و نهێنییەکاندا، ئەی خودایە؛ تەنها تۆ دەزانی ئەم کارەی لە پێشمە خێر دەداتەوە بۆ دین و دونیا و، داهاتووی ژیانم ئەوەی ئێستا، یان لە داهاتوودا دێتە ڕێگام، ئەوا بۆم ساز بکەو، بڕیاری لەبارەوە بدە و کارئاسانیم بۆ بکە، لەپاشان بەرەکەت بخەرە ئەوکارەمەوە.

وە ئەگەر ئەو کارە شەڕی لێ دەکەوێتەوەو، مایەی بەدبەختییە بۆ دین و دونیام و، بۆ پاشەڕۆژی ئێستاو داهاتووم، ئەوا لێمی دووربخەرەوەو، ئەو کارەیش لەمن دوور بخەرەوە، وە لەهەموو حاڵەتێکی تریشدا خێر بێنەرە ڕێگام لە هەرکوێ بێت، بەڕاستی تەنها تۆی کە قودرەت و تەواناییت هەیە بەسەر هەموو شتێکدا.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە نوێژی ئیستیخارەی فێر دەکردین، کە بۆ هەموو کاروبارەکانمان ئەنجامی بدەین، وەك چۆن فێری سوورەتەکانی قورئانی دەکردین.[1]، وە دەفەرموێت:

---

(١) رواه البخاري (١١٦٢)، وفيه(فاقدرهُ) بدل(فقَدِّرْهُ). وهذا يشعر بان تسمية الامر قبل الدعاء، والصحيح أنه بعده، كما هو في رواية الجماعة، والإستخارة في الحج والجهاد وجميع

((إذا هَم أحَدُكُم بأَمرٍ فَليُصَلِّ رَكعَتَيْنِ ثُمَّ يُسَمِّي الأَمرَ وَيَدعُوا بما ذَكَرنا))[1]

ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە ویستی کارێك بکات، با دوورکات نوێژ بکات، لە پاشان داواکەی بەیان بکات و، ئەو دۆعایانەی کە وتمان ئەنجامی بدات.

**وە هەندێك لە حەکیم و پەندیاران فەرموویانە:**

هەر کەس چوار خەصڵەتی پێ بەخشرابێت، ئەوا چوار شتیشی لێ ناگیرێت: ئەوەی شوکرانەبژێری خودای پێ بەخشرا، زیادبوونی نیعمەتەکانی لێ ناگیرێت، ئەوەی تەوبەی پێدرا، دەست نانرێت بەڕوویەوەو لێی وەردەگیرێت، ئەوەی ئیسیخارەو پرسی خێری پێ درا، ئەوا ڕێگەی باشترو هەڵبژێرراوی لێ ناشارڕێتەوە، وە ئەوەی ڕاوێژو پرس و ڕای پێ بەخشرا، ڕێگەی ڕاست و درووستی لێ نادیار نابێت و، هەمیشە لەسەر ڕێگەی ڕاست دەبێت[2] .

---

أبواب الخير تُحمل على تَعيين الوقت لا علَى نفس الفعل، **وإذا استخار مَضَى لما ينشَرحُ لهُ صَدره، وينبغي أن يُكرِرها سَبعَ مرَّات، ثُم انظُر الذي سبق إلى قلبك، فهو الخير**، قال العراقى رواه البخاري(١١٦٦) من حديث جابر وقال احمد كما في فتح الباري لإبن حجر(١٨٣/١١)حديث منكر ا هـ قال الزبيدي٤٦٩/٣: رواه الجماعه إلاَّ مسلِما، وأبوداوود(١٥٣٨)، والترمذي(٤٨٠)، والنسائي(باب كيفية الإستخارة(٣٢٥٣)، وابنماجه(١٣٨٣)، وروى الديلمي في عمل يوم والليلة في الفردوس(٣٦٥/٥)(٨٤٥١)، من حديث انس: إذا هممت بأمر فاستخر ربك فيه سبع مرات، ثم انظر إلى الذي يسبق إلى قلبك، فان الخيرَةَ فيه . قال الحافظ ابن حجر في الفتح(١٨٧/١١)، بعد ما عزَّاه لابن السني١/٥٥٠(٥٩٨)، هذا الحديث لو ثبت لكان هو المعتمد لكن سنده واه جدا ا هـ

(١) رواه ابن أبي أبي شيبة في المصنف(٣٠٠١٦).

(٢) رواه الدينوري:في المجالسة وجواهر العلم، ٥٩٥، عن أبي بكر بن عياش، عن بعض الحكماء، ونقل الحافظ الزبيدي عن بعض العارفين، أنه قال: يفعل ذلك في كل حاجة مهمة، يريد فعلها أو قضاءها، ثم يشرع في حاجته، وإن كان له فيها خيرة، سهل الله أسبابها

## نوێژی پێویستی(صلاة الحاجة):

هەرکەسێك ڕێگاو کارێکی لەبەر تەنگ و تەسك بوویەوە، وە زۆر پێویستی بە فرمانێ هەبوو لەڕوی دینی یان دونیاییەوە، بەڵام بۆی نەدەهاتە پێشەوە، با دووڕکات نوێژ بکات.

دەگێڕنەوە لە وەهبی کوڕی وەرد، کە فەرموویەتی:

بەڕاستی هەندێك نزا هەیە نادرێتەوە بەسەریدا ئەگەر بەمشێوە بێت کە: دوانزە ڕکات نوێژبکات، لە هەموو ڕکاتێکدا فاتیحە کە بە (أُمُّ القُرآن)یش ناسراوە لەگەڵ ئایەتەلکورسی و (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد) بخوێنێت و، کاتێك لە نوێژەکەی لێ بوویەوە، با بەڕوودا بکەوێت و سەجدە ببات و بڵێت:

((سُبحانَ الذي لَبِسَ العِزَّ وقالَ بهِ. سُبحانَ الذي تَعطَّفَ بالمَجدِ وتكَرَّمَ بهِ، سُبحانَ الَّذي أَحْصَى كُلَّ شَئٍ بعِلمِهِ، سُبحانَ الَّذي لا يَنبَغي التَّسبيحُ إلاَّ لهُ، سُبحانَ ذي المَنِّ والفَضلِ، سُبحانَ ذي العِزِّ والتَكَرُّمِ، سُبحانَ ذي الطَّوْلِ. أسأَلكَ بمَعاقِدَ العِزِّ مِنْ عَرشِكَ، ومُنتَهى الرَّحمَةِ مِنْ كِتَابِكَ، وبإسمِكَ الأعظَم، وجدِّكَ الأَعلَى، وكَلِمَاتِكَ التَّامَّاتِ التَّي لاَ يُجاوِزُهُنَّ بَرٌّ وَلاَ فَاجِر، أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى(سيِّدِنا) مُحَمَّدٍ وعَلَى آلِ(سيِّدِنا) مُحمَّدٍ، ثُمَّ يسأَلُ اللهَ حَاجَتَهُ التي لا مَعصِيَةَ فيها)) [1].

پاکو مونەززەهی بۆ خودا، کە بەرگی عیززەتی پۆشیوەو فەرمانیشی پێ کردووە، پاکی بۆ ئەوزاتەی بەمەجدو شەهامەتی خۆیەوە سۆزداری کردووە و، ڕێزی بەخشیوە بە شایستەکان، بەرزی و پاکی بۆ ئەوەی کە سەرژمێری هەموو

---

إلى أن تحصل، فتكون عاقبتها محمودة، وإن تعذرت الأسباب ولم يتفق تحصيلها، فيعلم أن الله إختار تركها فلا يتألم لذلك، وسيحمد عاقبتها تركا كان أو فعلاً.الإتحاف ٤٦٩/٣.

(١) رواه أبو نعيم في الحلية ١٥٨/٨.

شتێکی به زانستی خۆی کردووه، هیچ کەس شیاوی تەسبیح و بەرزی و شکۆمەندی نییه، جگه له زاتی خودا نەبێت، بەرزی و بڵندی شایستەی ئەو زاتەیە کە خاوەنی لوتف و مننەتی بەخشینی ژیان و ئیمانە، دارای عیززەت و ڕێزلێنان و پیرۆزییە، دەستی میهرەبانی و بەخشندەیی دەگات بە هەموو کەسێك، پاکی بۆ تۆیە ئەی خودا؛ داوات لێ دەکەم بە هەموو خاوەن ڕێزو شکۆمەندەکانت لە ناو عەرشی بەرینتدا، وە بە ئەوپەڕی سۆز و میهرەبانیت لە دووتوێی کیتاب و قورئانەکەت، وە بە ناوی پیرۆزو ئیسمی ئەعزەمی خۆت، وە گەورەیی و عەزەمەتی بەرزی خۆت، وە هەموو ئەو وشەو کەلیماتە پیرۆزو تەواوانەی کە هیچ چاك و خراپێك نابوێرێت، دوات لێ دەکەم کە صڵاواتی خۆت بڕژێنە بەسەر (حەزرەتی) موحوممەد و ئالی موحەممەد ﷺ، لە پاشان داواو پێداویستییەکانی پێشکەش بە خودا بکات، دوایەك بکات کە گوناهی تێدا نەبێت، پشت بە خودای گەوەرە داواکانی جێبەجێ دەکرێت.

وەهیب دەفەرموێت: پێمان گەیشتووە کە دەیانفەرموو: ئەم دۆعایە فێری نەفامەکانی مەکەن، با نەبێتە ئەوەی تاوان و گوناهی پێ بکەن.

ئەم نوێژەیش عەبدوڵلای کوڕی مەسعود لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە[1]

(١) عزاه الحافظ المنذري في الترغيب والترهيب١/٥٣٧)، للحاكم، وقال: قال أحمد بن حرب :

قد جربته فوجدته حقاً، وقال إبراهيم بن علي الديبلي: قد جربته فوجدته حقاً، وقال الحاكم: قال لنا أبو زكريا: قد جربته فوجدته حقاً، قال الحاكم: قد جربته فوجدته حقاً، تفرد به عامر بن خداش، وهو ثقةٌ مأمون، ولصلاة الحاجة صور أخرى رواها جمعٌ من المحدثين، منهم الترمذي(٣٥٧٨) وابن ماجه(١٣٨٥) وهذه كيفيه أخرى منقولةٌ من كتاب آداب الفقراء للشيخ أبي القاسم القشيري رحمه الله: يتوضأ لها

وضـوءاً جديـداً ثـم يُصـلي أربـع ركعـات بتشـهدين وتسـليمين، يقـرأ في الأولى بعـد الفاتحة: ( رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا. عشـراً) وفي الثانية بعـد الفاتحـة: (رَبِّ اشْـرَحْ لِي صَـدْرِي، وَيَسِّـرْ لِي أَمْـرِي، وَاحْلُـلْ عُقْـدَةً مِـنْ لِسَـانِي ، يَفْقَهُـوا قَـوْلِي) عشـراً، وفي الثالثة بعـد الفاتحـة:( فَسَـتَذْكُرُونَ مَـا أَقُـولُ لَكُـمْ وَأُفَـوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ .وفي الرابعة بعد الفاتحة: (رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) عشـراً، ثم يسجُد بعد الفَراغ ويقول في سجوده: (لَا إِلَـهَ إِلَّا أَنْتَ سُـبْحَانَكَ إِنِّي كُنْـتُ مِـنَ الظَّـالِمِينَ. فَاسْـتَجَبْنَا لَـهُ وَنَجَّيْنَـاهُ مِـنَ الْغَـمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ ) إحدىَ وأربعينَ مرَّةً، ثمَّ يسأل اللهَ حاجتَه، تُقضَى بإذن الله تَعالى. وأخـرج البهيقي في الـدلائل، والنسـائي في اليـوم والليلـة والنميرى من طريـق أبي إمامـة عـن سـهل بـن حنيـف عـن عمـه عثمـان بـن حنيـف: أنَّ رجـلاً كـان يختلـف إلى عثمـان بـن عفـان رضـي الله عنـه في حاجـةٍ فكـانَ عثمـان لا يلتفـتُ إليـه ولا ينظـر في حاجتـهِ، قـال عثمان بن حنيـف: فشـكا ذلك إليه فقال: ائتِ الميضأة فتوَضَّأ ثمَّ ائتِ المَسجد فصلِّ فيه ركعتين، ثم قُل:( اللَّهُم إني أسالكَ وأتوجَّه إليك بنبيِّكَ محمَّد ﷺ ، نبيِّ الرَّحمةِ يا مُحمَّد إنِّي أتوجَّه بكَ إلى ربِّي فتقْضى لي حـاجَتي، واذكر حاجتَك ثمَّ رُح حتَّى أروح، فـانطلق الرَّجل فَصنعَ ذلك، ثم أتى بـاب عثمـان ابن عفـان فجاءَه البَـوَّاب فـأخـذ بيـدهِ وأدخلـهُ علَـى عثمـان، فأجلسـه معـه على الطِّنفسـة فقـال حاجتك؟ فذكر حاجتهُ فقَضاها له ثُمَّ قـال مـا فهمْتُ حاجتكَ حتَّى كان السـاعة، ومـا كانـت لـكَ مـن حاجـةٍ فسَـل، ثُمَّ إن الرَّجـل خَـرج مـن عنـدهِ فلقِيَ عُثمـان بـن حنيـف فقـال لـه: جـزاكَ الله خيـراً، مـا كـان ينظـر إلى حـاجتى ولا يلتفِـت إليَّ حتَّى كلَّمتَهُ، فقال له عثمان بن حنيف: ما كلمتُه ولا كلَّمني، ولكِني شهدْتُ رسولَ اللهِ ﷺ واتاهُ رجلٌ ضَرير البَصر فشَكا إليهِ ذَهـابَ بصَره فقال له النبيُّ ﷺ ائتِ الميضأةَ، فتوضأ، ثُم ائتِ المسجدَ فصَلِّ ركعَتين ثمَّ قُل اللَّهم إنِّي أسالُك وأتوجَّه إليكَ بنبيِّكَ نبيِّ الرَّحمَةِ يا مُحمَّد إنِّي أتوجَّهُ بكَ إلىَ ربِّي فتجلي لي عَن بصري، اللَّهُم شـفِّعهُ فيَّ وَشـفِّعني في نفسـي، قـال عثمـان: فـوالله ماتفرقْنـا ولاَ طـالَ بنـا الحـديث حتَّى دَخَـل الرَّجُــل كأَنَّــه لَــم يكُــن بــه ضــرر)، ورواه أيضــا الترمــذي والنســائي وابــن

## نۆیەم: نوێژی تەسبیحات(صلاه التسبیح) :

ئەم نوێژە وەك خۆی لە ئەو پەڕی پیرۆزییەوە هاتووە، تایبەت نییە بە کاتێکەوە یان هۆکارێکەوە، وە واباشە کە هەموو حەفتەیەك جارێك ئەم نوێژەی تێدا بکات، یان مانگی جارێك.

وەك عیکریمە دەیگێڕێتەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) کە (حەزرەتی) پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی :

**((عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ: " يَا عَبَّاسُ، يَا عَمَّاهُ، أَلَا أُعْطِيكَ، أَلَا أَمْنَحُكَ، أَلَا أَحْبُوكَ، أَلَا أَفْعَلُ بِكَ عَشْرَ خِصَالٍ، إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِكَ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ ذَنْبَكَ، أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، قَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ، خَطَأَهُ وَعَمْدَهُ، صَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ، سِرَّهُ وَعَلَانِيَتَهُ، عَشْرَ خِصَالٍ: أَنْ تُصَلِّيَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ وَسُورَةً، فَإِذَا فَرَغْتَ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ وَأَنْتَ قَائِمٌ، قُلْتَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً، ثُمَّ تَرْكَعُ، فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ رَاكِعٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ الرُّكُوعِ، فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَهْوِي سَاجِدًا، فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ سَاجِدٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَسْجُدُ، فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ، فَتَقُولُهَا عَشْرًا، فَذَلِكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ تَفْعَلُ ذَلِكَ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ، إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ شَهْرٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي**

---

ماجه(١٣٨٥)ونص الدعاء: **اللهم إني أسألك وأتوجه إليك بمحمد نبي الرحمة، يا محمد إني قد توجَهتُ بكَ إلى ربي في حاجَتي هذهِ لِتُقضى، اللَّهُم فشفعه فيَّ**. زاد النسائي في السنن الكبرى(١٠٤٢١)) : فرجع وقد كشف له عن بصره. قال الترمذي حسن صحيح غريب وأحمد وابن خزيمه والحاكم وصححه عن طريق عماره بن خزيمة بن ثابت عن عثمان بن حنيف نحوه والله اعلم. الإتحاف٣/٤٧٢ــــ٤٧٣.

**كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ، فَفِي عُمُرِكَ مَرَّةً))** [1] .

واته: ئەی مامە ئەرێ پێت نەدەم پێت نەبەخشم ئەم دیارییەت نەدەمێ؟ کە ئەگەر بیکەیت و ئەنجامی بدەیت، خودا لە گوناهەکانت خۆش دەبێت، سەرەتاو کۆتاکانی، کۆن و نوێکانی، هەڵەو ئەنقەصدەکانی، نهێنی و ئاشکراکانی؟ دە خەصڵەت و چاکەیە: چوار ڕکات نوێژ بکەیت، لە هەموو ڕکاتێکدا دوای خوێندنی فاتیحە و سوورەتێك، کاتێك لە یەکەم ڕکاتدا لە خوێندنەوەی قورئان ڵێ بوویتەوە، لە حاڵێکدا کە بە پێوەی پانزە جار بڵێ:

**(سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ)**، لە پاشان ڕکوع دەبەیت و دەجار ئەو تەسبیحاتە دەخوێنیت، لە پاشان سەرت بەرز دەکەیتەوە لە ڕکوع و دە جار دەیڵێیت، لە پاشدا سەجدە دەبەیت و دە جار تەسبیحاتەکە دەخوێنیت، لە بەینی سەجدەکانیشدا دەجار، وە کە هەڵدەستیتەوە دەجاری تر، ئەوە حەفتاو پێنج جار لە هەموو ڕکاتێکدا.

بەم شێوە لە هەر چوار ڕکاتەکەدا دەیخوێنێت، ئەگەر توانیت هەموو ڕۆژێك بیخوێنە، ئەگەر نا لە هەموو جومعەیەکدا، ئەگەر ئەمەیشت نەتوانی ئەوا با هەموو مانگێك جارێك بێت، ئەگەر ئەمەیشت بۆ نەکرا ئەوا با لە ساڵێکدا جارێك بکرێت.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە لەسەرەتای نوێژەکەیدا بڵێیت:

**((سبحانك اللهم وبحمدِكَ، وتبارك اسمُكَ وتعَالى جَدُّكَ، ولا إلَه غَيرُكَ، ثمَّ يُسبِّحُ خَمسَ عَشرَةَ تَسبيحةً قبلَ القِراءةِ .والباقي كَما سَبقَ عَشراً عَشراً، ولا يُسَبِّحُ بعدَ السَّجدَةِ الأُخرىَ قاعِداً))**

پاك و بێگەردی بۆ تۆیە، خودایە ناوت بەرزو بڵندەو عەزەمەتت گەورەو باڵایە،

---

(١) رواه أبو داوود(١٢٩٧)، وابن ماجه(١٣٨٧).

وه هیچ خودایەكی بەحەق نییە شیاوی پەرستن بێت جگە لە تۆ، لە پاشان پانزەجار تەسبیحات دەكات، پێش خوێندنی فاتیحەو سوورەتەكە، وە دەجاریش دوای خوێندنەكە، وە ئەوانی تر هەروایە دە دە كە باسمان كرد، وە لە دوای سەجدەی دووهەم بە دانیشتنەوە تەسبیحات نەكات، ئەمەش زۆر جوانترەو هەڵبژاردەی عەبدوڵلای كوڕی موبارەكە،[(١)]،

وە كۆی هەردوو ڕیوایەتەكە سێ صەد تەسبیحاتە، ئەگەر بە ڕۆژدا خوێندی، ئەوا با بەیەك سەلامدانەوە بێت، وە ئەگەر بەشەودا كردی، ئەوا بە دووسەلامدانەوە جوانترە، چونكە وا هاتووە كە نوێژی شەو دووڕكات دوو ڕكات بێت [(٢)]،وە ئەگەر لە دوای تەسبیحاتەكە ئەم زیادەیەش بڵێت: **((لاحَولَ ولا قوَّةَ إلاَّ باللهِ العَلِيِّ العَظيم))** ئەوە باشە، وەك لە چەند ڕیوایەتێكدا هاتووە، ئەمەی باسمان كردن كۆی ئەو نوێژە مەئثورانەیە كە باسمانكردن.[(٣)]،

وە هیچ یەكێك لەم سوننەتانە لە كاتی مەكروهو ناپەسەندا دروست نییە ئەنجام بدرێت، جگە لە نوێژی (دیاری مزگەوت) نەبێت، وە نوێژەكانی تر كە باسمان كردن (وەك نوێژی خۆرو مانگ گیران و، باران بارین و نوێژی مردوو).

وە لە دوای (تحية المسجد) نوێژەكانی تر، وەك دووڕكاتی دەستنوێژ گرتن و، نوێژی سەفەر و، چوونە دەرەوە لە ماڵ و، هاتنەوە بۆ ماڵ و، ئیستیخارە، ئەوانە نابێت لە كاتی كەراهەتدا بكرێن، چونكە نەهیكردنەكە زۆر دوپاتی لەسەر كراوەتەوە و، ئەو هۆكارانەش كە ببنە هۆی كردنیان لاوازن و، ناگەنە پلەی نوێژی خۆر گیران و مانگگیران و باران بارین و دیاری مزگەوت، كە لە

---

(١) رواها عنه حاكياً الترمذي(٤٨١).

(٢) رواه البخاري(٤٧٢)، ومسلم ٧٤٩) وهذا إختيار ابن المبارك في حديث الترمذي المشار إليه

(٣)قوت القلوب١/٤٤: وقد عقد الحافظ الزبيدي فصلا، في الإتحاف٣/٤٧٧: لدراسة أسانيد الرواية لصلاة التسبيح، ......

کاتی کەراهەتیشدا درووستە بکرێن.

بەڕاستی لە هەندێك لە صۆفیەکانەوە بینیومە، کە لە کاتە مەکرووهەکاندا دووڕکات نوێژی دەستنوێژگرتنیان کردووە، کە ئەمە ئەوپەڕی دووریە، چونکە دەست نوێژ نابێتە هۆکاری نوێژکردن، بەڵکو نوێژکردن هۆکاری دەستنوێژگرتنە، پێویستە دەستنوێژ بگرێت بۆ ئەوەی کە نوێژ بکات، نەك ئەوەی کە نوێژدەکات، چونکە دەستنوێژی گرتووە، وە هەموو کەسێکی بێدەست نوێژ ویستی نوێژ بکات لەوەختی کەراهەتدا، هیچ ڕێگەیەکی نیە جگە لە دەست نوێژگرتن و نوێژکردن نەبێت، کەواتە هیچ مانایەك بۆ کەراهەت نامێنێتەوە، وە پێویست ناکات نیەتی دووڕکاتی دەستنوێژگرتن بهێنێت، وەك چۆن نیەتی دووڕکاتی دیاری و (تحیه المسجد) ی هێناوە، بەڵکو ئەگەر دەستنوێژی گرت، ئەوا دووڕکات دەکات، بە نیەتی تطوع و خۆبەخشی، بۆ ئەوەی دەستنوێژەکەی بێکارنەمێنێت و، ئەرکی خۆی ئەنجام بدات، وەك (حەزرەتی) بیلال ئەنجامی دەدا.

کەواتە ئەو نوێژەیە خۆبەخشێنێکی ڕووتەو، بەدوای دەست نوێژدا دێت و ناوی تری لێ نانرێت.

وە فەرموودەکەی بیلال ئەو واتایەی نەگەیاندووە، کە دەستنوێژەکە هۆکارە بۆ دووڕکات نوێژ، وەك چۆن خۆرگیران و مانگ گیران و باران بارین و تحیة المسجد، بۆ خۆیان هۆکان بۆ دووڕکات نوێژکردنەکە.

کەواتە هەرگیز ناگونجێت نیەتی نوێژکردن بهێنێت بە دەست نوێژەکە، بەڵکو پێویستە کە نیەت بهێنێت بە دەست نوێژ گرتن بۆ نوێژکردن.

دەی چۆن ڕێك دەکەوێت کە لە دەستنوێژەکەیدا بڵێت:
نوێژدەکەم بۆ دەست نوێژەکەم؟! بەڵکو هەرکەسێك ویستی پاسەوانی دەست

نوێژەکەی بکات و، بێکاری نەکات، لە کاتی کەراهەتی نوێژکردنیشدا با نیەتی قەزاو گێڕانەوەی نوێژ بهێنێت، کە لە زیممەیدایە، قەزای نوێژێك، کە بەیەکێك لە هۆکارەکانەوە کەموکوڕییەکی تێکەوتووە، چونکە گێڕانەوەی نوێژ لە کاتی کەراهەتیشدا ناپەسەندو مەکروە نییە. بەڵام نیەتی خۆبەخشی، ئەوە هیچ ڕێگەیەکی درووستی بۆ نییە کەبەو نیەتەوە بیکات.[1] ،

**لە ڕێگە نەدان بە نەکردنی نوێژ، لەکاتی ناپەسەند و کەراهەتدا سێ گرنگی هەیە:**

**یەکەمیان:** خۆ پاراستن لە شوێنکەوتن و لێکچواندنی خۆرپەرستەکان، بۆیە لە کاتی خۆر هەڵاتندا کەراهەتی هەیە نوێژی تێدا بکرێت.

**دووهەم:** خۆپاراستن لە بڵاوبوونەوەی شەیتانەکان، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : **((إنَّ الشمسَ لتطلعُ، ومَعَها قَرنُ الشَّيطانِ، فإذا طلعَت قَارَنَها، فإذا ارتفَعَت فارَقَها، فإذا استَوتْ قَارنَها، فإذا زالَت فَارقَها، فإذا تَضيَّفَت لِلغُروبِ قَارَنَها، فإذَا غربتْ فَارَقَها، فنَهى عَنِ الصَّلاةِ في هذهِ الأَوقاتِ، ونبَّهَ بِهِ عَلَى العِلَّة))**[2]

واتە: خۆر هەڵدێت و لەگەڵیدا شاخەشەیتانیش هەڵدێت، هێز و سەرباز و

---

(١) **ئەمەی باسمان کرد ڕای هەڵبژاردەی ئیمامی غەزالییە، هەرچەندە بە پێی مەزهەبی شافیعی لە کاتی کەراهەتیشدا نوێژی دەستنوێژگرتن درووستەو دەکرێت.**

(٢)قال العراقي رواه النسائي من حديث عبد الله الصنابحي وهو مرسل ومالك هو الذي يقول عبد الله الصنابحي، ووهم فيه وإنما هو عبد الرحمن ولم يرَ النبيَّ ﷺ ، المعنَى مقارنة الشيطان الشمسَ في هذهِ الأوقات، وعليه حَمل الخطابي مارواه البخاري في صفة إبليس وجنودهِ من رواية عبدة عن هشام بن عروة عن أبيه عن ابن عمر: فإنَّها تطلع بينَ قرني شَيطانٍ أو الشَّيطان وكذلك عند مسلم من رواية هشام بلفظ فانها تطلع بقرني شيطان واشار بذلك الى العلة في النهي عن الصلاة في هاتين الحالتين. ينظر للمزيد٣/٤٨٤.

تاقمەکەیشی لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا ئەوانیش بڵاو دەبنەوەو، لەگەڵ بەرزبوونەوەی خۆر دا ئەوانیش لێی جودا دەبنەوە، ئەگەر خۆر کەوتە ناوەڕاستی ئاسمان ئەوانیش دێنەوە، ئەگەر لایدا لادەدەن و جیادەبنەوە، کاتێك بەرەو خۆرئاوابوو و ڕۆشت، ئەویش دێتەوەو بڵاودەبنەوە، ئەگەر نیشت ئەویش جودادەبێتەوە، بۆ یە نەهی کراوە لەو ساتە وەختانەدا نوێژ بکات.

**سێیەم:** بەڕاستی ڕێبواران و هاوڕێبازانی ڕێگەی ئاخیرەت، بەردەوامن لەسەر ئەو نوێژانە لە هەموو کاتەکاندا، وە بەردەوامیش لەسەر یەك جۆر و شێوەی بەندایەتی تووشی بێتاقەتی دەکات، وە هەرکاتێك سەیری کرد چەندساتە وەختێکی لێ قەدەغە کراوە کە نوێژیان تێدا بکات، ئەوا چالاکی زیاد دەبێت، وە هۆکاری هەوڵدان و حەزلێ بوونی بۆ زیادە نوێژ زیاتر دەبێت، وەك وتراوە: مرۆڤ سوورە لەسەر شتێك کە لێی قەدەغە کرابێت، کەواتە لە مۆڵەت نەدانی ئەو کاتانەدا، زیادە هاندانێك درووست دەکەن، وای لێ دەکەن کە چاوەنواڕی کاتەکانی درووست بوونی نوێژ بکات، کەواتە ئەم کاتانە تایبەت کراوە بۆ داوای لێبوردن لە خوداو تەسبیحات و حەمدوسەنای خودا، نەوەك تۆۆشی ماندو بوون ببێت، لە بەردەوامی کاتی نوێژەکان، وە بۆ ئەوەی دەروازەیەکی تریشی لەسەر کراوە بێت، لە گواستنەوەی بۆ جۆرێکی تری بەندایەتی، لە چاوگێڕان و بەدوادا گەڕان و تازەبوونەوەی بابەتەکان، جۆرە تام و چێژێکی تری تێدا دەبێت.

وە لەبەردەوام بوونیش لەسەر جۆر و حاڵەتێکی تایبەتی، قورسی و بارگرانی و بێتاقەتی تێدا پەیدا دەبێت، بۆ یە دەبینین نوێژ کردن تەنها سوجدە بردنی ڕووت نییە، وە تەنها ڕکوعی ڕووت نییە، بەڵکو بەندایەتیەکە، لە چەندین کرداری جیاواز ڕێکخراوە، لە زیکر و یادی جیاواز لەیەکتری، وە دڵی مرۆڤیش لە هەر یەکەیان کە دێتە سەری، جۆرە تام و چێژێکی نوێی لێ دەبینێت، ئەگەر

تەنها لەسەر شێوەو جۆرێکیان بەردەوامی هەبوایە، ئەوا بەرگەی نەدەگرت و لێی بێتاقەت دەبوو.

کەواتە ئەمانەی ڕونمان کردنەوە، کۆمەڵە فرمانێکی گرنگ بوون، کە نەهی کراوە لەو کاتە تایبەتیانە نوێژیان تێدا بکرێت، جگە لە چەندین ئەسرار و نهێنی زۆری تر، کە لە توانای ئادەمیزاددا نییە شارەزای هەموویان ببێت، خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ زانا ترن بەسەریاندا.

کەواتە ئەو کارە گرنگانە نابێت وازیان لێ بهێنرێت، مەگەر بە هۆکارێکی گرنگ نەبێت، ئەویش لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، وەك گێڕانەوەی نوێژەکان و ، نوێژی باران بارین و خۆر گیران و مانگ گیران و دیاری مزگەوت، بەڵام هەر هۆکارێکی تر نەگەیشتە هێزی ئەم هۆکارانەوە، لاواز خۆی نیشان دەدا، ئەوە نابێت بەرنگاری ئەو مەبەستە پیرۆزە شەرعییە بکاتەوە، کە لە پێناوی دا نەهی لێ کراوە لەو ساتانەدا ئەو جۆرە بەندایەتییە ئەنجام بدرێت ، ئەوە ڕای پەسەندترە لە لامان، خودای گەورەیش زاناو ئاگادارە بەسەر ڕای درووستدا وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم

تەواو بوو پەڕاوی نهێنییەکانی نوێژو کارە گرنگەکانی، کە کتێبی چوارەمی چوار یەکی بەندایەتییە، لە کتێبەکانی:

**إحياء علوم الدين (ژیانەوەی زانستەکانی ئاین)**

**حەمدو سەنا تەنها بۆ خوداوەندی بەرز و باڵا، داوای تەوفیق و ڕەزامەندی لێ دەکەین، وە صەلات و سەلام لەسەر گەورەی پێغەمبەران (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ وە لەسەر ئال و بەیتی پاڵفتەکراوو صەحابە بەرزەکانی**

**کە پشت بە خودا نۆبەی پەڕاوی ئەسرار و نهێنییەکانی زەکات دێت.**

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.**

# پێرستیەکان

# یەکەم : پێرستی ئایەتەکان

| الآية | الصفحة |
| --- | --- |
| لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا | ٥٨ |
| وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوابِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ | ٥٨ |
| قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ | ٥٨ |
| وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ | ٥٩ |
| يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ | ٦٠ |
| فابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا | ٦٠ |
| النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُم | ٦١ |
| كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنْسَى | ٨٤ |
| وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ | ٨٦ |
| اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ | ٨٨ |
| وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ | ٩٢ |
| وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا | ٩٩ |
| سبّحِ اسمَ رَبّكَ الأعلى | ١٠١ |
| كلاً إنّهم عَن ربّهم يومَئِذ لمحجوبون | ١٠٤ |
| إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ | ١١٢ |
| أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً، فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا | ١١٣ |
| فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ | ١١٥ |
| وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ | ١١٦ |
| وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ | ١١٧ |

| الصفحة | الآية |
|---|---|
| ١١٨ | وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ |
| ١١٨ | وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنْطَقَنَا اللَّهُ |
| ١١٨ | أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ |
| ١٢٢ | ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ |
| ١٢٢ | الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى |
| ١٢٢ | وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا |
| ١٢٧ | إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ |
| ١٢٧ | وربُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ |
| ١٣٢ | أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا. وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا |
| ١٣٣ | إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ |
| ١٣٣ | أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا |
| ١٣٤ | أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ. أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ |
| ١٣٦ | أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ |
| ١٣٦ | وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ |
| ١٣٦ | فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا. |
| ١٤٦ | لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ |
| ١٥١ | وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ |
| ١٥١ | الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى |
| ١٥٢ | ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ |

| الآية | الصفحة |
| --- | --- |
| وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ | ١٥٣ |
| وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ | ١٥٨ |
| لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ | ١٥٨ |
| وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي | ١٥٩ |
| فلما تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا | ١٥٩ |
| وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّ نَاظِرَةٌ | ١٦٠ |
| إِنِّي أَعِظُكَ أَنْ تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ | ١٦٠ |
| قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ | ١٦٠ |
| لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا | ١٦٢ |
| وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير | ١٦٣ |
| لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ | ١٦٣ |
| وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ] [أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ | ١٦٤ |
| يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا | ١٦٧ |
| وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ | ١٦٧ |
| وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ | ١٧١ |
| اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ الزمر | ١٨٣ |
| وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ | ١٨٣ |
| وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ | ١٨٣ |
| أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ | ١٨٣ |

| الآية | الصفحة |
| --- | --- |
| لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ | ١٨٨ |
| ماشاءَ اللهُ كانَ، وما لَم يَشَأْ لَمْ يَكُن) | ١٩٠ |
| أَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعًا | ١٩٠ |
| وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفسٍ هُدَاهَا | ١٩٠ |
| قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى | ١٩٢ |
| رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ | ١٩٥ |
| سيصلى نارا ذات لهب | ١٩٦ |
| لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ | ١٩٨ |
| لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ | ٢١٣ |
| الم. غُلِبَتِ الرُّومُ. فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ. | ٢١٤ |
| قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ. قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ | ٢١٥ |
| مَا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ | ٢١٥ |
| النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ | ٢١٧ |
| مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا | ٢١٧ |
| وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ | ٢١٨ |
| فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ. وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ | ٢١٨ |
| فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ. وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ | ٢١٩ |
| وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ | ٢٢٠ |
| وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ | ٢٣٠ |

| الآية | الصفحة |
|---|---|
| فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ | ٢٣١ |
| إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُسْلِمِينَ | ٢٣١ |
| قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا | ٢٣٤ |
| الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ | ٢٣٨ |
| فَمَنْ يُؤْمِنْ بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا | ٢٤٤ |
| وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ أُولَئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ | ٢٤٦ |
| كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ، قَالُوا بَلَى | ٢٤٦ |
| لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى، الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى | ٢٤٦ |
| [مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا وَهُمْ مِنْ فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ | ٢٤٦ |
| وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ | ٢٤٦ |
| إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا | ٢٤٧ |
| وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا | ٢٤٧ |
| [وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ | ٢٤٧ |
| وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا..... أَلَا إِنَّ الظَّالِمِينَ فِي عَذَابٍ مُقِيمٍ | ٢٤٧ |
| لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا | ٢٤٧ |
| لَايَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى--- كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ | ٢٤٨ |
| ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا | ٢٤٩ |
| وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى | ٢٥٠ |
| وَالْعَصْرِ. إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ. إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ | ٢٥٠ |

| الآية | الصفحة |
| --- | --- |
| وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا<br>[ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا]. | ٢٥٠ |
| وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ | ٢٥٠ |
| [وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى]<br>وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا<br>ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا ---وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ<br>وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا<br>وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ | ٢٥٠ |
| إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا<br>[إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ]<br>[وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا | ٢٥١ |
| فَزَادَهُمْ إِيمَانًا]. [فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا] [لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ | ٢٥٦ |
| كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ | ٢٦٢ |
| فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى] [أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنْفُسَهُمْ]<br>انْظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ | ٢٦٦ |
| وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا. إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ ----<br>لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ. مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ | ٢٦٨ |
| [أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا] | ٢٧٠ |
| إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ<br>وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ]<br>[وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ]<br>أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ]. | ٢٧٢ |
| [يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ] | ٢٧١ |

| الآية | لاپہره |
|---|---|
| لا يَسْتَوِي مِنكُمْ مَنْ أَنفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً | ٢٧١ |
| هُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ اللَّهِ | ٢٧٢ |
| وَبَدَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ | ٢٧٩ |
| وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ | ٢٨٣ |
| وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا | ٢٨٥ |
| وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ | ٢٨٥ |
| فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ] | ٢٩٠ |
| مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ ] | ٢٩٠ |
| قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ | ٢٩١ |
| فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ | ٣٢٤ |
| فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ | ٣٥٥ |
| وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ | ٣٦٥ |
| قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ | ٣٨٠ |
| إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى | ٣٨٠ |
| [وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا] | ٣٨٠ |
| يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ | ٣٨٤ |
| وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً | ٣٩٤ |
| إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا | ٣٩٧ |
| وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا | ٤٠٣ |

| الآية | الصفحة |
|---|---|
| واسْجُدْ وَاقْتَرِبْ]        [سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُود | ٤١٤ |
| [وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي] [وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ] [لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ] | ٤١٧ |
| يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ] | ٤١٩ |
| [وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ] | ٤١٩ |
| وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي] | ٤١٩ |
| وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ مُلَاقُوهُ | ٤٢٠ |
| إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا | ٤٢٣ |
| إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ | ٤٢٦ |
| فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ | ٤٣٢ |
| الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ | ٤٣٤ |
| قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ | ٤٣٥ |
| وَالسَّاءِ ذاتِ البُروج) (قُل ياأَيُّها الكافِرونَ)ه و (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد | ٤٤٣ |
| فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ | ٤٥٥ |
| وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي، وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ، حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ | ٤٧٢ |
| اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ | ٤٧٦ |
| لَنْ يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُمْ | ٤٧٦ |
| وَما أَنا مِنَ الْمُشْرِكِين] | ٥١٥ |
| فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا | ٥١٥ |
| فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُور | ٥٢٢ |

| الآية | لاپہرہ |
| --- | --- |
| إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ | ٥٢٢ |
| مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ | ٥٢٣ |
| الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ، وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ | ٥٢٦ |
| لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ، يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ | ٥٣٩ |
| قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ | ٥٣٩ |
| وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ | ٥٣٩ |
| مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ. قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ | ٥٤٠ |
| يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ | ٥٧٧ |
| [إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ | ٥٨٨ |
| فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ | ٦١٩ |
| وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا | ٦١٩ |
| وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلًا | ٦١٩ |
| وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ عِلْمًا | ٦١٩ |
| تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ | ٦٨٣ |

# دووەم: پێرستی فەرموودەکان

